# شەریعەتی ئیسلام

## بە پێی پەیرەوی ئیمامی شافیعی
## خوای لێ رازی بێ



منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
للكتب ( كوردى . عربي . فارسي )

دانراوی
مەلا عبدولکەریمی مودەڕڕیس

بەرگی: ٢-١

| | |
|---|---|
| سرشناسه | :مدرس، عبدالکریم، ۱۹۰۵ – ۲۰۰۵م |
| عنوان و نام پدیدآور | :شەریعەتی ئیسلام: بە پێی پەیرەوی ئیمامی شافیعی ـ خوای لێ رازی بێ/ دانراوی عبدالکریم مدرس ؛ بەراوردکاروهەلەگر: محەممەد عوسمان نەقشبەندی... |
| مشخصات نشر | :سنندج: پرتوبیان، ۱۳۸۵ |
| مشخصات ظاهری | : ٤ ج:(در ۲ مجلد). |
| شابک | : 964-9926-10-0: (دوره) |
| یادداشت | :فیپا |
| یادداشت | :چاپ قبلی: محمدی، ١٣٦٦ |
| موضوع | :فقه شافعی |
| رده بندی کنگره | :BP۱۷۷م٤ش۹ |
| رده بندی دیویی | :۲۹۷/۳۳۳ |
| شماره کتابشناسی ملی | :م۲۳۰۳۹-۸۵ |

# شەریعەتی ئیسلام

بە پێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی

- خوای لێ رازی بێ -

دانراوی:

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

«بەرگی یەکەم»

بڵاوکردنەوەی کوردستان و پەرتەو بەیان

انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنه ـ پاساژی عیززەتی ـ تەلەفوون ـ ٢٢٦٥٣٨٢

بڵاو کردونەوەی پەرتەو بەیان
سنه ـ پخشانگای ئیمام غەزالی
تەلەفون: ٢٢٥٦١٠٠

# شەریعەتی ئیسلام



| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | شەریعەتی ئیسلام (١) |
| ✓ دانراوی (تألیف): | مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ١٣٨٨ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ٣٠٠٠ دەورەی دوو بەرگی (دورەی دو جلدی) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ٢٨٤ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان)<br>بڵاوکردنەوەی پەرتەو بەیان (انتشارات پرتو بیان) |

| | |
|---|---|
| شابک دوره: ٠ - ١٠ - ٩٩٢٦ - ٩٦٤ - ٩٧٨ | ISBN: 978 - 964 - 9926 - 10 - 0 |
| شابک ج ٢و١: ٢ - ٢٩ - ٩٩٢٦ - ٩٦٤ - ٩٧٨ | ISBN: 978 - 964 - 9926 - 29 - 2 |

نرخی دەورەی دوو بەرگی: ١٨٠٠٠ تمەن

# ناواخن

# چەند وتەیەك

## خوێنەری بەڕێز!

ئەم کتێبەی بەردەستت، کتێبی «شەریعەتی ئیسلام»ی مامۆستای زانای کەموێنە، خوالێخۆشبوو مەلا «عەبدولکەریمی مودەڕڕیس» (١٤٢٦ ـ ١٣٢٣ ك. و ١٣٨٤ ـ ١٢٨٤ هـ. و ٢٠٠٥ ـ ١٩٠٥ ز)، یەکێکە لە ئاسەوارە هەرەگرنگەکانی مامۆستا و بەڵگەی روونی پلە و پایەی زانیاری ئەوە لە «عیلمی فیقه» و شەرعی ئیسلامدا، هەروەك هەوەڵین کتێبی فیقهی کوردی و سەرەتای فیقه نووسینی وێژەی کوردیشە.

هەر لەو ساڵانەوە کە ئەم کتێبە بایەخدارە کەوتە بەردەست و چاوی خوێنەران، چاوی ئۆگرانی شەرع و زمانی کوردی پێ روون بووەوە و زانایانی دین و موسوڵمانانی بە ئاگا بە شیاوی، چوونە پیرییەوە و بە نۆبەرێکی نایابیان زانی و لە راستیشدا وابوو.

مامۆستا نامی، شەریعەتی ئیسلامی بە ماوەی دووساڵ شتێ کەم، لە نێوان ساڵانی $\frac{١٣٨٠}{١٩٦١}$ ـ $\frac{١٣٧٨ \text{ ك}}{١٩٥٩ \text{ ز}}$ نووسیوە؛ کەواتە، ئەم کتێبە بەرهەمی چل پەنجا ساڵ خوێندەواری و موتاڵا و دەرس‌وتنەوەی مامۆستا بووەو چل و شەش ساڵ پێش کۆچی دوایی ئەوان نووسراوە.

مامۆستا مەلاکەریم، لە ناو جەنگەی ئەم کتێبەدا، وەکوو پاڵەوانێك بەڵکوو وەکوو بلیمەتێکی هێدی و لەسەرخۆ دەرئەکەوێ کە چوون بڕوای پتەو ومتمانەی تەواوی بە خۆی و زانیاری و توانایی خۆی هەیە، ئیتر هیچ‌ترس و لەرز و گیر و وەستان و مانەوەیەك ناهێنێتە ناو کار و ئازایانە و زانایانە ئەڕواتە پێشەوە؛ مەلایەك کە لە لایەکەوە، قورئان و تەفسیر و عولوومی قورئانی و حەدیس و عولوومی حەدیس و فیقه و ئوسوولی فیقهی بە باشی خوێندووە و ئەیزانێ و زۆربەی ـ خۆی واتەنی ـ: «کتێبە گەورەکان»ی فیقهی شافیعی خوێندووەتەوە و

منتدى اقرأ الثقافي

وتوویەتیەوە و لە لایەکی تریشەوە، ئاگاداریی جوان و رەوانی لە زمان و نەریت و فەرهەنگی کوردیی سەردەمی خۆی هەیە و خودایش بیرێکی تیژ و پیاوماتکەری پێ بەخشیوە و سەرەڕای ئەم ئامرازە پێویستانەیش، ئیمان و لە خودا ترسی و باوەڕ و ئەوینێکی راستەقینەی کەمپەیا دڵ و جەسەو دەروونی ئەوی گشت داگرتووە؛ بەر و بەرەی ئەم بەش و بارە گەورانەیە کە مامۆستای کردووە بە زانایەکی تاقانەی بێ هەڤاڵی سەردەمی خۆی و کردوویەتە هەوەڵین کەس و رچەشکێن لە زۆرمەی کار و بەرهەمەکانیدا و شەریعەتی ئیسلامی کردووە بە کتێبێکی بێ هاوتای متمانە پێکراو لە فیقهی ئایینی ئیسلامدا بۆ کوردان بە کوردی کە هەروەکوو زانایان و هۆگرانی دین پاڵی پێوە ئەدەن، نووسەران و وێژەوانان و دڵبراوانی زمان و وێژە و فەرهەنگ و نەریتی کوردیش، کەڵکی خۆیانی لێ وەرئەگرن، چونکە وێڕای ئەو زمانە پاراوەی کە هەیەتی، بە هەزاران، وشەی رەسەن و جوان و لە بیرکراوی کوردی تێدا هەیە و ئاوێنەیەکی باڵا نوێنی بڕوا و کردەوە و ژیانی کوردیشە.

## ئەم چاپە

لەبەر ئەوەی لە مێژەوە چاپە کۆنەکەی کتێبی شەریعەت و ئوفسێتی ئەو چاپەیش تەواو بوو بوو، و پێویست بە چاپکردنەوەی هەست پێ ئەکرا، خانەکانی بڵاوکردنەوەی «پڕتەو بەیان و کوردستان»ی شاری سنە بڕیاری چاپێکی دووبارە و نوێیان دا و لە «جەنابی مامۆستا موحەممەدی کوڕی مامۆستا مەلا کەریم» داوای ئیجازەی لە چاپ دانەوەی ئەم کتێبە لەگەڵ ئاسەوارەکانی تری مامۆستایان کرد و ئەویش بە لوتف و نەجابەتەوە ئیجازەی دان و پاش ئیجازەکەی ئەوان پیت‌چنینەوەی کتێبەکە، پیاچوونەوە و هەڵەگری و بەراوردیان خستە ئەستۆی من، کە بەراستی، نیعمەتێکی گەورەبوو کە خودا بە نسیبی خوێندەوارێکی ساکاری وەك منی کرد کە فەقێی فەقێیانی مامۆستایە و شوکرا منیش، هێڵ بە هێڵ و وشە بە وشەی پیت‌چنییە تازەکەم لەگەڵ چاپە ئەسڵیەکە (چاپی کۆڕی زانیاریی کورد و چاپخانەی شەفیق و چاپخانەی «سلمان الأعظَمی» بەغداد) بەراورد کرد و ئەوەی لە توانامدا بوو، بۆ لابردنی هەڵە چاپییەکانی ئەو چاپە و ئەم چاپەیش هەوڵمدا.

ئەم چاپە، لەگەڵ چاپە ئەسڵییەکەیدا، تەنیا لە دووشتدا فەرقی هەیە؛

١ـ لەو چاپەدا هەموو وشە عەرەبییە بە کوردی نەنووسراوەکانی کتێبەکە، خراونەتە ناو دوو کەوانەوە ( ) کە من ئەمەم گۆڕیوە و لەو شوێنانەدا نەبێ کەواکەوانە پێویستە، لە جێگایدا « »م داناوە؛

٢ـ لە چەند شوێنێکدا کە بە پێویستم زانیوە وشەیەك یا چەند وشە یا خەتێکم تێ بردووە و هەڵبەت دیارە کە ئەمانەم لە دوو قولاو [ ]دا داناوە و بەو شێوە لە ناوەرۆکی کتێبەکە جیام کردووەتەوە.

٣ـ لە چەند شوێنی پێویستدا پەراوێزمان بۆ داناوە کە ئەوانیش هەر لە قولاودان و لە ئاخریانەوە نووسراوە: بڵاوکردنەوە.

هیوادارین ئەم چاپە تازەیە، ببێ بە هۆی رەزامەندی خودا و پێغەمبەر و رۆحانەتی مامۆستا و هەروەها، ببێ بە جێگای کەڵك و دوعای بەخێری زانایانی دین و خەڵکی موسوڵمانی کوردستان.

لە

دواییدا، لە هەموو زانایان و خوێنەران داواکارین «ئەگەر هەڵەیەکی ئێمەیان بۆ دەرکەوت»، لوتف بفەرموون و ئاگادارمان کەن.

وَلِلّٰهِ الْحَمْدُ في الأُولى وَالآخِرَة

**عوسمان نەقشبەندی**

سنە ـ هاوینی ١٣٨٥ی هەتاوی

بسم اللّه الرّحمن الرّحيم

## پێشەکی نووسەر

**الحمد للّه الذي هدانا بفضله لدين الإسلام، و ما كنا لنهتدي لولا أن هدانا بإحسانه العام، و الصلوة و السلام على الأنبياء و المرسلين الكرام، خصوصاً سيدنا و مولانا محمد المبعوث برسالة عامّةٍ شاملة لجميع الأنام و على جميع آله و أصحابه الذين قضوا حياتهم في بثّ تعاليم الإسلام، و على جميع أتباعهم بإحسان إلى يوم القيام.**

لەپاش سوپاس و ستایشی پەروەردگاری میهرەبان و پێشکەش کردنی سەلام بە هەموو پێغەمبەران و بە رەهبەری گەورەی ئاخر زەمان و بە ئال و یارانی فیداکاری، عەرزم ئەمەیە:

لەبەر ئەوە کە قیمەتی هەر شتێ ئەوەندەی قازانجیەتی و باشترین قازانجیش ئەوەیە پایەدار بێ و تەمێ و ئامۆژگاری لە ئادابی ئایینی ئیسلامی پیرۆزا شتێکی زۆر بە سوودە، ویستم نووسراوێ بە زمانی گەلەکەی خۆم لە ئادابی ئایینی ئیسلاما بنووسم بە ئومێدی ئەوە کە ببێ بە بەشێکی گەورە لەو خزمەتانە کە بۆ گەل سوودیان هەیەو ناوم نا **«شەریعەتی ئیسلام»**.

هیوام وایە ببێ بە هۆی رووناکی بۆ دڵیان و دۆزینەوەی رێگەی رزگاری و فەرمانبەرداری خودای عالەم لە ماوەی ژیانا و بە ئەساسی سەعادەت و بەختیارییان لە پاشەڕۆژا.

## ئیمان

خودای تەعالا لە قورئانی پیرۆزا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللّٰهِ الإِسْلامُ﴾، واتە: «بەڕاستی ئایین و ڕێگای ڕاست بە لای خواوە، بریتییە لە فەرمانبەرداری خودا و پێغەمبەری خودا.»

ئەو شتانە و ئەو ئادابانەی کە خوا قەراری داون بۆ هەموو خاوەن بیرو هۆشێ لە ئادابی دیناو پێغەمبەری گەورە حەزرەتی موحەممەدﷺ گەیاندوونی بە ئێمە، بریتین لە دوو بەش:

یەکەم: شتێکی پەنامەکییە و لە دڵایە غەیری خوا و خاوەنەکەی کەس ئاگای لێ نییە؛ ئەم بەشە ئیمان و باوەڕە بە شەش شت وەکوو حەزرەتی پێغەمبەر فەرموویەتی: «الإِيمانُ أَنْ تؤمِنَ باللّٰهِ وَ مَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَ رُسُلِهِ وَ بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَ شَرِّهِ»، واتە: ئیمان، ئەوەیە بە دڵ باوەڕت بێ بە خوداو بە فریشتەی خوداو بەو کتێبانەی خودا ناردوونی بۆ پێغەمبەران بۆ تەمێ کردن و ئامۆژگاری کردنی خەڵك و بە پێغەمبەران و بە ڕۆژی قیامەت و بە قەزار و قەدەر.

دووهەم: شتێکی دیارییە خەڵکیش پێی ئەزانن؛ ئەمە بریتییە لە پێنج کردەوە، وەکوو پێغەمبەر فەرموویەتی: «اَلإِسْلامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلٰهَ إلّا اللّٰهُ وَ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسولُهُ، وَ تُقِيمَ الصَّلاةَ و تُؤتيَ الزَّكاةَ و تَصومَ رَمَضانَ و تَحِجَّ البَيْتَ إِنِ اسْتطعْت إليهِ سبيلاً» واتە: ئیسلامەتی، بریتییە لەوە کە شایەتی بدەی کەوا هیچ کەسێ نییە بۆ ئەوە بشێ عیبادەتی بۆ بکرێ مەگەر ئەو زاتە کە ناوی «اللّٰه» یەو کەوا «مُحَمَّد» بەندە و پێغەمبەری خودایە و نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت ئەگەر توانیت حەج بکەیت.

جا بەشی یەکەم ئەسڵی دین و ئایینە. لە بەر ئەوە کە بریتییە لە باوەڕو کەسێ باوەڕی بە شتێ بوو لەسەری ئەڕوا.

بەشی دووهەمیش فەرعی دین و ئایینە. وەك چۆن لە داری میوە بەر و سەمەر وەرئەگیرێ، هەروەها یەكێ ئیمان و باوەڕی بوو ئەوە سەمەری فەرمانبەرداری خودای دەست ئەكەوێ و ئەم پێنج ئادابە بەجێ ئەهێنێ.

بەڵام لەبەر ئەوە كە ئیمان و باوەڕ دیار نییە و تا یەكێ بە دەم ئیقرار نەكا، كەس پێی نازانێ، لە دینی ئیسلاما بڕیار دراوە كەوا ئەم دوو كەلیمەی شەهادەتە ببێ بە هۆی ئەوە ئینسان بڕواتە ریزی ئەوانەوە كە بە خاوەن ئایین ئەناسرێن؛ جا با لەبەر رووناكی ئەم دوو فەرموودە پیرۆزەدا قسە بكەین و ئادابی موسوڵمان كە یازدە بەشە ـ شەشی ئەسڵ و ئەساسە و پێنجی فەرع و سەمەر و بارەیە ـ بەیانیان بكەین.

ئیمان، لای ئەهلی دین، باوەڕە بە هەرچی كە حەزرەتی پێغەمبەر (موحەممەد)ﷺ هێناویەتی لە لای خوداوە لە بەشی بیرو باوەڕ و لە رەفتار و كردەوە.

ئیمان بە خودای تەعالا، ئەوەیە ئینسان بە دڵ باوەڕی ببێ ئەم جیهانە، بەرز و نزمی، رووناك و تاریكی، وشك و تەڕی، دیار و پەنهانی، پەروەردگارێكی وای هەیە هەرچی سیفەتی چاكە هەیە هەیەتی، لە هەرچی سیفەتی خراپە هەیە دوورە و ئەو پەروەردگارە، بە عەرەبی، ناوی «اللّٰه»یە و بە كوردی، ناوی «خودا»یە.

خوای گەورە بۆیە چاوی داوە بە ئینسان رێگەی راست لە چەوت جیا بكاتەوە؛ بۆیە عەقڵ و بیر و هۆشی داوەتێ شتی مومكین لە مەحاڵ، حەق لە بەتاڵ، راست لە درۆ جیا بكاتەوە و نەكەوێتە دوای شتی بێسوود و خەیاڵی بێقیمەت.

دەی هەروەكوو خاوەن بیرو رای بە هێز باوەڕ ناكا بەوە نەخشێ بە بێ نەخش گەر و خانوویێ بێ بەننا دروست كرابێ، باوەڕیش ناكا ئەم جیهانە خاوەن نەخشە جوانە و ئەم دەشت و كۆسارانە و ئەم سارای پڕ لە گیا و گوڵ و دارانەو ئەم رۆژ و مانگ و ئەستێرە پڕتەودارانە كە هەریەكی یاسایەكی تایبەتی هەیە و رێگەی هاتوچۆی خۆی گرتووە، خاوەن و پەروەردگارێكی زیندووی زانای بە توانای نەبێ دەستی بڕوا بەسەر هەموویا و ئاگای لە هەمووی بێ و دەستوور و یاسایان بە راستی رابگرێ و هەر كەسێ بیری وا نەبێ، یا شێتە یا لەبەر مەبەستێ خۆی شێت كردووە.

لەسەر ئەم بیرو باوەڕەیە خوای تەعالا، لە قورئانی پیرۆزا ئەم ئادەمیزادە شارەزا ئەکا بۆ تەماشای عالەم و بۆ بیرکردنەوە لە وەزعی شەو و رۆژ و ئەرز و ئاسمان و مانگ و رۆژ و ئەستێرەکان و کەژ و کێو و رووبار و دەریا و کەشتی و غەیری ئەمانە کە هەریەکی نەوعە دەلیلێکن لەسەر ئەوە کەوا ئەم چەرخ و فەلەکە خاوەنێکی وای هەیە رای بگرێ.

هەموو خاوەن هۆشێ ئەزانێ دارو بەرد، خاك و خۆڵ، ئەرزو ئاو، ئەستێرە و هەوا، شتێکی بێ گیان و بێ شوعوور و ناتەوانن و هیچیان پێ ناکرێ و لە ناو هەموو دروستکراوەکاندا، ئادەمیزاد ـ کە بە عەقڵ و بیرو باوەڕ خاوەن پایەیە ـ مایە و هێزی ئەوەی نییە گیانلەبەرێ دروست بکاو شتێ ماددەی نەبێ پەیدای بکا، تەنانەت بەرابەر بە مردن و ژیانی خۆی و بەرابەر بە غەمباری و رزگاریی خۆی، دەسەڵاتی نییە و لەپاش سەد ساڵ عەقڵبازی و خوێندن و بەراوردی بە سەرهات و تەماشاکردنی کارەسات، حەیران و سەرگەردانە.

کەواتە، بە ئاشکرا پێویستە ئینسان باوەڕی ببێ و دانبەوەدا بنێ کە خاوەن هێزێکی بەرزی نەبەزی وا هەیە لە رستەی ئەم جیهانە بەدەرە و ئەو خاوەن هێزە، پەروەردگاری هەموو عالەمەو موحتاج نییە بە کەس و هەموو عالەم موحتاجی ئەوەو لە هەرچی عەیب هەیە دوورە و هەرچی سیفەتی گەورەیە، هەیەتی؛ ئەو زاتە «خودا»یە.

ئەم خاوەن هێزە قەدیمە، هەر بووە و نەبوونی نەبووە و ئەبەدییە، هەر ئەبێ و نەبوونی بە سەرا نایەت؛ ئەم زاتە، ماددەیێ نییە پێویستی بە جێگە بێ و ئەندامێ نییە لە ئەعزا و ئەجزا پەیدابووبێ و پێویستی بە غەیر ببێ و وێنە و رەنگێ نییە بە شتێکەوە بێ و پاکە لە تەرەف و لای ژوور و خوار و راست و چەپ و سوورەت و شێوەی نییە و هەموو عالەم وا لە قەبزەی تەوانای ئەوا؛ خاوەنی عەرش و ئەرز و ئاسمانە و ئەتوانێ دەسبدا لە هەموو وەزعێکی ئەم عالەمە و بە هەر نەوعێ مەیلی ببێ، ئیشی تیا بکا؛ لەگەڵ ئەوەشدا کە سوورەت و شێوەی نییە، لە رۆژی قیامەتا هەموو خاوەن ئیمانێ بە چاوی سەر ئەیبینێ وەك چۆن لەم دنیادا یەکێ مانگی چواردە ئەبینێ، بەڵام وەزعی ئەو

چاو پێکەوتنە وا لە عیلمی خودادا؛ لەگەڵ ئەمەشدا، دوور و نزیکی بۆ ناوترێ و تەرەف و راست و چەپ و خوار و ژووری نییە؛ هەر کەسێ لە هەر شوێنێکا بێ، خوا لە گەڵیایە و نزیکترە بە ئینسان لە رەگی لاملی.

بە کورتی، زاتی خوای تەعالا، لە هیچ شتێ ناچێ‌و هیچ وێنەی نییە و لە هەرچی نەقس و عەیبە دورە و هەرچی سیفەتی گەورە و کەماڵە هەر لە ئەزەلا بوویەتی و ئێستەش هەیەتی و هەروا بەو کەماڵەوە ئەمێنێ هەتا ئەبەد. ئەم زاتی خودایە، زاتێکی تەنیایە، بێ‌شەریکە؛ لە بەر ئەوە کە خاوەنی هەموو کەماڵێکە و لە هەموو عەیبێ دوورە، ئەتوانێ بە هەموو نەوعێ تەسەڕوف بکا لە عالەما، ئیتر پێویستی بە ئیعتیبارکردنی کەسێکی‌تر نییە . وە ئەگەر رەفیقێکی وای ببوایە کە لە دەس‌دان لە عالەما شەریکی بوایە، شۆرش و نیزاع لە ناو بەینا پەیدا ئەبوو و یاساکانی جیهان، وەك هاتوچۆی رۆژ و مانگ و ئەستێرە و وەزعی سەیارەکان و وەزعی زەوی و هێرش و خۆکێشانەوەی دەریاکان و یاسای مەوسیمی وڵاتەکان، لەسەر نیزامی خۆیان نەئەمان و عالەم بە فەنادا ئەچوو.

## سیفاتی زاتی خودا

زاتی خوای تەعالا، زیندووە و زیندوویی، بە لەش و ئەعزا و ئەندام نییە، زیندوویی هەموو شتێ بەوە، بەڵام زیندوویی خودا بە خۆیەتی؛ لە ئەزەل هەتا ئەبەد، زیندووە و قەت نامرێ.

ئەم زاتە، «عالم»: زانایە بە هەموو شتێ و ئەم زانستەی ئەزەلییە و ئەبەدییە؛ عالمە بە هەموو شتێ کە قابیلی ئەوە بێ‌خەیاڵی لێ بکرێ لە ئەرز و ئاسمانا، لە گەورە و بچووك، لە ئاشکرا و پەنهان، تەنانەت ئەگەر مێروولەیێ لە بنی زەوییا بڕوا بە رێدا، دەنگی پێی ئەو مێرووله لە لای زانستی خودا ئاشکرایە؛ هەر کەسێ هەر خەیاڵێ بە دڵیا بێ، بەر لە خەیاڵەکە، ئەو لە ئەزەلا زانیویەتی و ئێستەیش ئەیزانێ و لەمەولایش هەر ئەیزانێ؛ «بلاتشبیە»، وەکوو یەکێ ئاوێنەیێ لە بەرابەری لاپەڕە کاغەزێکی نووسراوەوە بگرێ،

چۆن ئەو ئاوێنە سوورەتی ئەو لاپەڕە و ئەو دێڕ و حەرفانە بە ریز وەرئەگرێ، وەها، خوای تەعالا هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەر شتێ لە هەر شوێنێ و لە هەر وەختێکا بێ، وا بە تەرتیبی خۆی لە بەر ئاوێنەی عیلمی ئەوا دیارە و هیچ کەم و زۆرێکی لێ ون نابێ.

ئەم زاتە، خاوەن «ارادة»: خواهیش و خواستە، هەرچی لەم عالەما بووە و ئێستە هەیە و لەمەولا ئەبێ، هەمووی لەسەر ئیرادە و خواستی ئەوە و هەرشتێ خواستی ئەوی لە سەر بێ، ئەبێ ببێ و هەرشتێ خواستی ئەوی لەسەر نەبێ، قەت نابێ؛ هەرچی ئەسباب هەیە بۆ شتێ هەمووی حازر بکرێ، مادام هەوێنی مەیلی ئەوی تیا نەبێ ناگیرسێ و نابێ و ئیرادەی ئەو لازمە بۆ بوونی هەموو شتێ؛ لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی لەسەر یاسای ئەمری ئەو بێ، وەکوو ئیرادەی کردووە پێیشی رازییە و هەرچی لەسەر یاسای ئەمری ئەو نەبێ، ئەوە پێی رازی نییە.

«بِلاتّشبیه»، یەکێ بیستی دۆستێکی لە شوێنێ نەخۆشە، ئەوە لەبەر دۆستایەتی ئەو کەسە ئەڕوا بۆ لای و چاوی پێئەکەوێ و لەم رۆیشتنەدا خاوەن ئیرادە و خواستە و کەس زۆری لێ نەکردووە، لەگەڵ ئەوەیشا لەو رۆژەدا ئارەزووی ئەو سەفەرەی نییە و بە دڵ حەز ناکا بڕوا بۆ ئەو شوێنە و ئیشەکەی خۆی بەجێبێڵێ.

زاتێکی «قادر»ە: قودرەتی هەیە، یانێ هەر لە ئەزەلا سیفەتی تەوانایی و دەسڕۆیشتنی هەیە بەسەر هەموو شتێکیوادا کە مومکین بێ، ئەتوانێ بە ماوەیێکی کەم هەرچی گیانلەبەرە گیانی بکێشێ و هەرچی مردوو هەیە زیندووی بکاتەوە؛ پاشاییێکی جیهانگیر بکا بە لات و داماو داماوێ بکا بە پاشای جیهان؛ وەکوو بلاتشبیە، رەئیسی دەستگای کارە با، بە ئانێ ئەتوانێ چرای ملیۆنێ شوێن دابگیرسێنێ یا بکوژێنێتەوە، وەها دەستی بە سەر هەموو کردەوەیێکا هەیە و ئەتوانێ جێبەجێی بکا.

«سمیع»ە، یانێ هەرچی دەنگ هەیە ئاشکرا یا پەنامەکی ئەیبیسێ.

«بصیر» و بینایە، هەرچی شت هەیە لەبەر چاوا بێ یا لە بەرچاو نەبێ ئەیبینێ، گەورە و بچووك، ورد و درشت، ئاشکرا و پەنهان لای خوای تەعالا وەکوو یك وایە؛ زەڕڕەیێ

تۆز لە فەزادا لە لای خوا وەکوو کێوێ دیارە؛ «بلاتشبیە»، نووسراوێکی زۆر ورد کە چاو دەرکی نەکا، ئەگەر یەکێ زەڕەبینێ هەڵگرێ کە شت بکا بە ملیۆنێ قات چۆن ئەو حەرفە وردانە لەلایا گەورەن و دیارن، ئەو شتەی کە لەلای ئێمە دیار نییە لەلای چاوی دەرکی خودا بە چەند هەزار قات گەورەیە و دیارە.

زاتی خودا، «متكلّم»: خاوەن کەلامە، حاڵی بوون لە سیفەتی کەلامی خوا بۆ ئێمە ئەوەندە قابیلە کە بە وێنە، بڵێین: «بلاتشبیە»، ئینسانێ بە خۆیا ئەزانێ هێزێ هەیە لە وجوودیا ئەساسە بۆ ئەوە کە بتوانێ مەقسەد و مەبەستی خۆی بێنێتە خەیاڵەوە، ئەوسا بۆ ئەو خەیاڵاتە لەفز و حەرف بڕیار بدا، پاش ئەوە بە زمان دەریان بخا، خوای تەعالایش هەر لە ئەزەلا سیفەتێکی وای هەیە ئەساسە بۆ ئەوە هەر شتێ مەیلی بێ دەری ببڕێ، لەفزی بۆ دابنێ و ئەو لەفزانە بە هێزی پیرۆزی بگەیەنێ بە فریشتەی قسە گەیاندن کە ناوی «جبرائیل»ە و ئەویش بە عەینی ئەو وتارە کە خوای عالەم پێی گەیاندووە بیگەیەنێ بە پێغەمبەران، ئیتر بە بێ ئەوە کە ئەو فریشتە دەخڵی ببێ بەو وتار و قسانەوە، ئەخرێتە دڵیەوە، ئەویش لەسەر عەینی فەرمانی خودا تەبلیغی ئەکاو ئەیگەیێنێ بە پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ.

## چۆنیەتی سیفاتی خودا

زاتی خوای تەعالا، وەك چۆن حەقیقەتی لای عەقڵ و هۆشی ئێمە بە تەواوی دەرناکەوێ، سیفەتەکانیشی هەروەها بۆ ئێمە بە تەواوی دەرناکەون؛ وەك چۆن ئەزانین زاتی خودا هەیە و زاتێکە «واجبُ الوجود»ە، ئەبێ ببێ و موحتاج بە کەس نییە، وەها ئەیشزانین ئەم سیفەتانە هەر لە ئەزەلا بوون و ئەبێ هەر ببن؛ ئێمە چاومان ناکەوێ بە هێزی «ئەلکتریك»، بەڵام لە کاتێکا کەسێکی گرت و کوشتی، بە بێ گومان ئەزانین هێزێکی زۆر تەوانا بوو بە ئانێ ئەو ئینسانە زەلامەی گرت و کوشتی؛ یا هەر کاتێ چاومان کەوت بە قەسرێ کە بە یاسایەکی بەرزی هەندەسە بە پارچە بەردی نەخشکراو و بە قاڵبی داڕێژراو، دروست کرابوو، بێ گومان ئەزانین ئەو وەستایە

زیندوو بووە، چونکە مردوو شتی پێناکرێ، ئەزانین زۆر زانا بووە، چونکە نەزان عەقڵی بە هەندەسە ناشکێ‌و ئەزانین عەممەلەکان زۆر تەوانا بوون، چونکە بێ‌هێز، بەرد و شێڵمانی گەورە هەڵناگیرێ و ئەزانین چاو وگوێیان بووە، لەبەر ئەوەکە کرێکاری کەڕ قسە نابیسێ و لە فەرمانی وەستا باش حاڵی نابێ و کرێکاری کوێر بەرد و خشتی مەقسوود نابینێتەوە؛ لەسەر ئەم ئەساسە، ئەزانین پەروەردگاری ئەم جیهانە جوانە ڕەنگاوڕەنگە، ئەبێ زیندوو و زانا و تەوانا و خاوەن خواست و بیسەر و بینا و خاوەن گوفتار بێ‌و بە بێ ئەم سیفەتانە، ئەم دەسگایە دروست ناکرێ.

خیلافی ئەم سیفەتانەکە بریتییە لە مردوویی‌و ناچاری و نەزانی و ناتەوانی و کەڕی و کوێری و لاڵی، هەموو عەیب و نەقسن و بۆ زاتی پەروەردگار ناشێن؛ هەتا ئەگەر ئینسانێکی عادەتی ئەم عەیبانەی پێوە بچەسپێ، زۆر عاری لێ‌دێ و نارەزایە؛ کەوابێ، بۆ زاتی خودا قابیل نین ـ **تَعالیَ اللّٰهُ عَن ذٰلك** ـ.

## ئیمان بە مەلائیکە (فریشتە)

مەلائیکە (فریشتە): لای ئەهلی دین، بریتین لە ئەجسامێکی لەتیف، خوای تەعالا دروستی کردوون لە ئەسڵی نوور و ماددەی ڕووناك، نە نێرن و نە مێن؛ ئەتوانن بە هەموو وێنەیێ خۆیان دەربخەن و بە سوورەتی عادەتی، بە چاو نابینرێن، بەڵام پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێ بێ ـ ئەیانبینن.

ئیمان بە مەلائیکە ئەوەیە ئینسان باوەڕی بێ کەوا ئەمانە وجوودیان هەیە و مەعسوومن لەگوناه و هەرچی خوا ئەمریان پێ‌بکا ئەیکەن و هەرچی مەنعی بکا لێیان نایکەن؛ کردەوەیان هەموو فەرمانداریی خوایە و ژیانیان بە هەناسەدان و خواردن نییە، بەڵکوو بە زیکری خودایە.

ئیمان بە مەلائیکە، ئەوەیە ئەوانەی خوا بە تەفسیل باسی کردوون، ئێمەش بە تەفسیل باوەڕمان پێیان بێ و ئەوەی بە ئیجمال وکورتی باسی کردوون، ئێمەش هەر بەو نەوعە باوەڕمان پێیان بێ.

بینا لەسەر بەیانی قورئان، ئەم مەلائیکەتانە زۆر زۆرن؛ ﴿وَ مَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾، واتە: «لە خوا بەولاوە کەس ژمارەی سوپای خودا بە تەواوی نازانێ».

بەپێی نەسسی ئایەت و فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ، ئەم مەلائیکەتانە مەئمووری خودان و گەلێ بەشن؛ هەر بەشێ ئیشێکیان پێ سپێرراوە، لە ئاسمان و ئەرزا، لە بەڕ و بەحرا؛ بەعزێکیان، عەرشی خودا هەڵئەگرن؛ ئەمانە، لە دنیادا چوارن و لە قیامەتا هەشتن؛ بەعزێکیان، «مُقَرَّبين» نزیکانی بارەگای خودان، یانێ خاوەن پایەن؛ ئەمانە، چواریان ناویان دیارییە؛ یەکەم «جبرائیل»، مەئمووری هێنانی وەحیە لەلای خوداوە بۆ لای پێغەمبەران؛ دووەم «میکائیل»، مەئمووری رزقی گیانلەبەرە؛ سێهەم «عزرائیل»، مەئمووری گیان کێشانە؛ چوارم «اسرافیل»، مەئمووری نەفخی سوورە بۆ وێران کردنی دنیا و مراندنی گیانلەبەر و زیندوو کردنەوەیان لە پاشەڕۆژا.

بە عزێکیان، مەئمووری نووسینی کردەوەن لە خێر و شەڕ؛ بەعزێکیان مەئمووری با و هەور و بەفر و بارانن؛ بەعزێکیان مەئمووری پرسیاری ئینسانن لە قەبرا، ئەمانە مەشهوورن بە «نکیر و مُنكَر»؛ بەعزێکیان مەئمووری عەزابی قەبرن؛ بەعزێکیان مەئمووری عەزابی دۆزەخن؛ ئەمانە یانۆزدە تائیفەن یا نوزدە کەسن گەورەکەیان ناوی «مالك»ە، بەعزێکیان مەئمووری بەهەشتن و گەورەی ئەمانە، ناوی «رضوان»ە؛ بینا لەسەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، شوێن نییە لە ئاسمانا مەلائیکەی تیا نەبێ.

بزانن! هەروەکوو مەلائیکە هەیە، «جنّ»یش هەیە؛ ئەمانە لەلای ئەهلی دین، لە ماددەی ئاگرین دروست کراون؛ خوا لە قورئانا فەرموویەتی: ﴿وَ الْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ﴾، یانێ: «بەر لە ئادەمیزاد جنۆکەمان لە ئاگرێکی تیژ دروست کردووە».

«جن»، بە کوردی «پەری»یە؛ نێر و مێیان هەیە وەکوو ئادەمیزاد خودا تەکلیفی ئەحکامی شەرعی لێ کردوون و پێغەمبەری ئێمەﷺ هەروەکوو رەوانە کراوە بۆ پەروەردە کردن و تەمێ کردنی ئادەمیزاد، رەوانە کراوە بۆ پەروردە کردن و تەمێ کردنی ئەوانیش، وەکوو لە قورئانا لە سوورەتی «جن»دا باسی ئەکا.

لە گەلێ شوێنا لە قورئانا، خودا باسی جینی کردووە؛ «شَـیْطان» کە دوژمنی ئادەمیزادە یەکێکە لەوان؛ خودا لە قورئانا فەرموویەتی: ﴿كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾، یانێ: «شەیتان لە جینییەکان بوو، لە فەرمانی خودا دەرچوو»؛ هەر جینێك زۆر شەروور و نابار بێ، بە شەیتان ناو ئەبرێ، ئەمانە، لە زمانی کوردییا ناویان «دێو»ە.

ئێمە لە دنیادا ئەمانە بە چاو نابینین، تەنها پێغەمبەران ئەیانبینن، بەڵام لە قیامەتا ئەیانبینین. ئەمانە بە بێ ئەمری خودا و بە بێ تەقدیری ئەو، ناتوانن زیان بە کەس بگەیێنن؛ بۆ پارێز لە شەڕی ئەمانە، ئەبێ ئینسان پەنا بەرێتە بەر خوا و لەکاتی وەسوەسە و خەیاڵی خراپا، «أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ» بخوێنێ و لەکاتی خواردنی تەعاما، «بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحمٰنِ الرَّحيم» بکا، هەروا لەکاتی دەس کردن بە هەر ئیشێکا کە پیرۆزییەکی تیا بێ بۆ ئەوەکە ئەو شتە بەبەرەکەت بێ و لە نزیکی شەیاتینیەوە دوور بێ.

ئەگەرچی لەپاش ئەوەکە ئایەتی قورئان باسی شتێکی کرد پێویستە موسوڵمان باوەڕ بکا و تەسلیمی ببێ، بەڵام هەر بە بیرو هۆش ئەبێ ئینسان بیر کردنەوەی ببێ، نابێ هەر شتێ ماددەی لە بەر چاوا دیار نەبێ ئینکاری بکا؛ ئێمە، با و مەوجەی هەوا بە چاو نابینین، لەگەڵ ئەوەشا داری گەورە لە بن هەڵئەکەنێ؛ هێزی کارەبا لە پێش چاوا نییە، کەچی ئەم هەموو کارەساتە عەجایبانە ئەکا لە دنیادا، بە ئانێ هەزاران گیانلەبەر ئەگرێ و ئەیسووتێنێ؛ رۆحی خۆمان بە چاو نابینین، لەگەڵ ئەوەشا ئەزانین ئێمە خاوەن رۆحین و بەشمان لە گیان هەیە. چاوی عەقڵ لە چاوی سەر بەهێزترە، خوای تەعالا قسە لەگەڵ خاوەن عەقڵ و بیرو باوەڕا ئەکا.

## ئیمان بەو کتێبانە کە خوا ناردوونی بۆ پێغەمبەران

ئیمان بە کتێب بریتییە لەوە ئینسان باوەڕی ببێ بەوە کە خودای گەورە بە هۆی مەلائیکەوە ـ کە حەزرەتی جبرائیلە ـ دەستوور و یاسای ناردووە بۆ لای پێغەمبەران بۆ ئەوەکە تەمێ و تەربییەی ئادەمیزادی پێ بکەن؛ ئەم دەستوورەکە هاتووە بۆیان وەحیە لە تەرەفی خوداوە، بەو نەوعە خودا ناردوویەتی گەیشتووە بە پێغەمبەران و بە قەتعی،

نە مەلائیکە نە جینی نەیانتوانیوە دەستی بۆ ببەن و پێغەمبەرانیش بەعەینی وەزع بە بێ‌زیاد و کەم گەیاندوویانە بەوانە کە لەلای خوداوە ئەمریان پێ‌کراوە.

لەسەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، دە کتێب بۆ حەزرەتی ئادەم و پەنجا بۆ حەزرەتی شیس و سی بۆ حەزرەتی ئیدریس و دە کتێب بۆ حەزرەتی ئیبراهیم نازڵ بووە، تەورات بۆ حەزرەتی مووسا و زەبوور بۆ حەزرەتی داوود و ئینجیل بۆ حەزرەتی عیسا و قورئان بۆ حەزرەتی «محمّد المصطفی» ـ علیهم الصّلوة و السّلام ـ رەوانە کراوە.

حوکمی ئەم کتێبانە، ئەوەی کە غەیری حوکمی قورئان بێ، نەسخ کراوەتەوە. قورئان تا قیامەت فەرمانڕەوایە و بە قەراری قەتعی، ئایەتێ یا جوملەیێ یا لەفزێ لە قورئان زیاد و کەم نەکراوە و بەو تەرتیبە کە لەلای خودای تەعالاوە هاتووەتە خوارەوە ماوە و پارێزراوە؛ لە قورئانا هەر ئایەتێ یا هەر جوملەیەکی مەعناکەی روون نەبێ بۆ ئێمە پێویستە لەسەر یاسای ئایەتە دیاریە روونەکانی‌تر مەعنا و مەبەستەکەی ئیعتیبار بکەین؛ هەروەها پێویستە بە دەست نوێژەوە نەبێ دەستی پێوە نەدەین و بە رۆح و دڵ حورمەتی بۆ قەرار بدەین.

## ئیمان بە پێغەمبەران

پێغەمبەر، بە پیاوێ ئەڵێن لە ئادەمیزاد کە خوای تەعالا بە هۆی حەزرەتی جبرائیلەوە شەرع و دەستوور و یاسایەکی بۆ ناردبێ بۆ ئەوە بیکا بە رێگەی رزگاری بۆ دنیا و بۆ قیامەت؛ جا ئەگەر ئەم دەستوورە هەر بۆ ئەو کەسە خۆی بوو، یانێ ئەمری پێ‌نەکرابوو کە تەمێ و تەربییەتی خەڵکی پێ‌بکا، ئەوە ئەو پێغەمبەرە نامورسەلە؛ ئەگەر ئەمریشی پێ‌کرابوو کە تەمێ و تەربییەتی خەڵکیشی پێ‌بکا، ئەوە ئەو پێغەمبەرە پێغەمبەری مورسەلە.

ژمارەی پێغەمبەران، ئەگەرچی وا مەشهوورە کە سەد و بیست و چوار هەزار یا دو سەد و بیست و چوار هەزارە، بەڵام باش‌وایە ئینسان ژمارەی تایبەتییان بۆ دانەنێ. ژمارەی ئەمانە هەر وا لە عیلمی خودادا.

خودا له قورئانا فەرموویەتی: ﴿وَ إِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾، یانیٚ: «هیچ کۆمەڵیٚ له ئادمیزاد نەبووە ئیللا کەسیٚکمان بۆ ناردوون تەمیٚ و تەربییەتیان بکا»، پێغەمبەریٚکی وا بیانترسیٚنیٚ له ئەنجامی نافەرمانیی خودا و موژدەیان پیٚبدا له پایەی فەرمانبەرداریی خودا.

هەروەها، فەرموویەتی: ﴿مِنْهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَ مِنْهُمْ مَنْ لَمْ نَقْصُصْ﴾، یانیٚ: «بەعزیٚ لەو پێغەمبەرانە باسی ئەوانمان گێڕاوەتەوە بۆ تۆ و بەعزیٚکیانمان ناو نەبردووە بۆت و باسیانمان نەکردووە»؛ کەوابیٚ حەق وایە ئیٚمە باسی ژمارەی ئەوانە نەکەین؛ ئەوەندە هەیە پێویستە باوەڕمان وابیٚ ئەوەی پێغەمبەری مورسەلە گەورەترە لەوەی کە پێغەمبەری نامورسەلە، لەبەر ئەوەکە ئەرك و ئازاری مورسەلەکان زۆرتر بووە لەوانەی غەیرە مورسەل بوون.

ئەو پێغەمبەرە مورسەلانە لەسەر فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ، سیٚسەد و حەڤدە کەس بوون؛ لەم ژمارەیە، له قورئان و حدیسا، ٢٨یان ناویان دیاری کراوە: «آدم، شيث، إدريس، نوح، هود، صالح، إبراهيم، لوط، إسماعيل، إسحاق، يعقوب، يوسف، شُعيب، موسى، يوشَع، هارون، إلياس، إليَسع، ذو الكِفل، أيوب، يونُس، إشمويل، داود، سليمان، زكريا، يحيى، عيسى، محمّد المُصطفى، عليهم الصلاة و السلام»؛ لەناو ئەمانەشا، پێنج کەسیان بە پێغەمبەری «أُولوالعَزم»، یانیٚ خاوەن [هیممەت و] زەحمەت و ئازار ناسراون: «نوح، ابراهيم، موسى، عيسى، محمد المصطفى» ـ سەلامی خوایان لیٚبیٚ ـ؛ له ناو هەمووشیانا، حەزرەتی موحەممەدﷺ، لەوانیتریان گەورەترە و دینی تا رۆژی قیامەت دەوام ئەکاو له دوای ئەو هیچ پێغەمبەریٚ نابیٚ؛ پێغەمبەرایەتی و یاساکەی و دینەکەی، بۆ گشت ئادەمیزادی سەرزەوییە.

ئیمان و باوەڕ بە پێغەمبەران، بریتییە لەوە ئینسان باوەڕی بیٚ کە ئەم کۆمەڵەی پێغەمبەرانە هەرکام له زەمانی خۆیانا پوختە و خولاسە و هەڵبژێرراوی ئادەمیزادی ئەو زەمانە بوون له بیر و هۆش و خوو و رەوشتی بەرزا؛ ئەمانە، بە مەحزی فەزڵ،

خودای تەعالا بە جبرائیلا کتێب و شەریعەت و دەستووری بۆ ناردوون؛ ئەم پێغەمبەرانە، بێ قوسوور و درێغی‌کردن وەریان گرتووە و رەفتاریان پێ کردووە و بە هەر نەوعێ ئەمریان پێ کراوە، بێ زیاد و کەم، گەیاندوویانە بە خەڵك؛ ئەمانە، مەعسوومن لە گوناە و لە مەلائیکە و لە باقی مەخلووقی خودا گەورەترن و پایەیان بەرزترە، لە ناو خۆیشیانا مورسەل لە غەیرە مورسەل و لەناو مورسەلەکانا «أُولوالْعَزم»ەکان لە غەیری ئەوان گەورەترن و لەناو ئەمانیشدا، حەزرەتی موحەممەد لە باقییەکان گەورەترە. ئێمە لە سیفەتی پێغەمبەرایەتییا فەرقیان ناکەین، یانێ هەموویان بە پێغەمبەری خوا ئەزانین، با بەعزێکیشیان لە بەعزێکیان گەورەتر بن.

## دین پێویستە

دین و ئایین پێویستە بۆ ئادەمیزاد. ئینسان کەمێ بیر بکاتەوە، ئەزانێ ئەم ئادەمیزادە بە تەنیا ناژی و پێویستی بە یارمەتی خەڵك هەیە؛ کەواتە گردەوە بوون لەگەڵ خەڵکدا، پێویستی ناچاریی ژیانە و هەر کەسێ لە هەر کۆمەڵەیێکا، ئەگەرچی عەقڵ و بیر و هۆشی هەیە کە تا ئەندازەیەك چاك لە خراپ جیا بکاتەوە، ویجدانیشی هەیە کە بۆ ئازاری خەڵك دڵی ئازاری پێ بگاو بە ئاسایشی ئەوان دڵی ئاسوودە بێ، بەڵام جێگەی ئینکاریش نییە کەوا هەر کەسێ، سوودی خۆی و ئاسایشی خۆی لە پێش هەموو کەسێکی ترا دڵخوازیەتی و لەسەر ئەم ئەساسە، ئەغلەب هەرا و شۆڕش و کێشە پەیدا ئەبێ لەناویانا؛ کەوابێ، پێویستە یاسا و دەستوور و نیزامێکیوا ببێ لەسەری بژین؛ ئەم دەستوور و یاسایە، ئەگەر هەر ئادەمیزاد خۆی دای‌بنێ، لە زۆر رووەوە کەم و کووڕ دەرئەچێ، چونکە عەقڵی ئادەمیزاد لە هەر زەمانێکا تەنیا بەوەدا ئەگا کە لەو زەمانەدا لەئارادایە و ناگا بە گەلێ شتی پاشەڕۆژا کە بەپێی چەرخ و هەڵسوڕانی زەمان پەیدا ئەبن؛ ئەگەر ئەو دەستوورە خۆیان دای‌بنێن، پێویستە هەموو چەند ساڵێ جارێ دەستی بۆ ببەن بیگۆڕن، بەڵام دەستووری ئاسمانی، هێزی زۆرترە و بۆ هەمیشە لەسەر عیلمی خاوەنی جیهان کە خودایە، بەکاردێت.

ئەگەر فەرز بکەین دەستووری دەستکاری ئـادەمیزاد بـەکـاردێت، چـونکە ئـەم دەستووره لەسەر ئەساسی هێزێکی ماددی بەڕێوه ئەڕوا، هەرساتێ ئەو هێزه کـەم و کوور بوو، خەڵك موبالاتی پێ‌ناکەن. بەڵام ئەو پێغەمبەرانه که دەستووری ئاسمانی دێنن، هێزێکی رۆحی وایان هەیه دڵی ئادەمیزاد داگیر ئەکا و ئەیبرژێنێ و ئەوانەی که بەراستی ئەو دەستووره وەرئەگرن، حاڵیان وای لێ‌دێ و دڵیان وا به خوداوه ئەبەسرێ ئەگەر هێزی ماددیش نەبێ، هەر خۆیان لەبەر شەرم و حەیا لەو خاوەن دەستووره به دڵ و رۆح فەرمانبەرداری ئەکەن و خودا به حازر ئەزانن.

کەوابێ، ئەگەر یاسا، یاسای حوکوومەت و فەرمانڕەوای دنیایش بێ، هەر پێویسته هێزێکی رۆحی مەعنەوی ببێ ئادەمیزاد پێیەوه ببەسرێ. ئینسانێکی خاوەن ئارەزوو، کاتێ دەستی رۆیشت بەسەر ئارەزووی خۆیا، له شوێنێکی پەنامەکیدا، غەیری هێزی رۆحی هیچ نییه مەنعی بکا لەو ئارەزووی نەفسەو ئینسانێ دوژمنێکی ببێ و دەستی بڕوا به سەریا به ناحەق بیکوژێ، ئەوه غەیری هێزی مەعنەوی و ترسی خودا هـیچ شتێ نییه مەنعی بکا لەو گوناه و جەریمەیه؛ کەواته، شەریعەتی سـەماوی و هـێزی رۆحی، پێویستی مانەوەی نیزامی ژیان و رزگاری ئادەمیزاده.

## پێغەمبەران پیاوی بەرزی جیهانین

ئینسان تۆزێ بڕوانێ به عائیله و به کـۆمـەڵەی نـاوشار و دێهـاتا، ئـەزانـێ ئـەم ئادەمیزاده ئەگەرچی هەموو هەر ئادەمیزادن و هەموو قابیلی ئـەوەن تـەمێ و تـەربیه بکرێن و به ئامۆژگاری بەرز بینەوه، باوەڕیش ئەکا بەوەکه ئادەمیزاد له پایەی قابیلەت و خووی تەبیعەتی و هێزی نەفسیدا، فەرقیان گەلێ زۆره؛ گەلێ کەس به بێ مامۆستا هەر به بیری خۆی، سەنعەتی نایاب دەرئەکا؛ زۆر کەسیش، لەگەڵ رەنجی مامۆستاشدا، فێری هیچ شتێکی بەقیمەت نابن؛ گەلێ کەس لەپاش ئامۆژگـاریی زۆر، هـیچ تـەمێ وەرناگرن؛ گەلێ کەسیش، به بێ ئامۆژگاری، خۆیان روو ئەکەنه بیروباوەڕی پـاك و رەوشتی بەرز و ئاسایش خواهی و برایەتی لەگەڵ ئادەمیزادانا و شەرەف و ناموس و دڵسۆزیی ئەمانه بۆ خاوەن ئینساف، دیاره.

لەسەر ئەم ئەساسە، خوای تەعالا لەو ڕۆژەوە ئادەمیزادی لەسەر زەوی داناوە، لە هەر زەمانێکا، لە هەڵبژێرراوی بەشەرا، یەکێ یا چەند زاتێکی ئەخلاق بەرزی بە هۆی مەلائیکە تەمێ و تەربیەکردووە و ناردوونی بۆ ئامۆژگاری ئادەمیزاد؛ ئەمانە، پێغەمبەرانی خودا بوون، تا دەوری ئاخری کە خوا حەزرەتی «محمّد»ی ناردووە بۆ تەربیەی هەموو ئادەمیزادی جیهان.

ئەم زاتە، ناوی «محمد»ە کوڕی «عبداللّه»ی کوڕی «عبدالمطلّب»ی کوڕی هاشمی کوڕی «عبدالمناف»ە؛ دایکی، ئامینەی کچی وەهبی کوڕی زەهرەیە؛ ئەم زاتە، لە نەتەوەی حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە.

ئەم زاتە، چواردە قەڕن پێش ئیمڕۆ، لە شاری مەککە لە دایك بووەو لە عومری چل ساڵیدا هەر لە شاری مەککە، خەڵاتی پێغەمبەرایەتی وەرگرتووە؛ پاش ئەوە، سیانزە ساڵ لە مەککە ماوەتەوە؛ جا بە فەرمانی خودا، تەشریفی بردووە بۆ شاری مەدینەی مونەووەرە و دە ساڵیش لە مەدینە ئیرشادی ئادەمیزادی کردووە بۆ ئەوە کە پەروەردگاری جیهان و شایانی بەندەگی بۆ کردن و پەرستیاری «واجبُ الوجود»، یەك زاتە کە ناوی «اللّه»یە.

لە ماوەی بیست و سێ ساڵا، وردەوردە، قورئانی پیرۆزی بۆ هاتووە کە بریتییە لە شەش هەزار و شەش سەد و شەست و شەش ئایەت؛ ئەم قورئانە پیرۆزە، تەمێی ئادەمیزادی کردووە بۆ خودا بە یەك زانین و بۆ فەرمانبەرداریی خودا لە ئەمر و نەهیا و، بانگی کردوون بۆ هەموو ئەخلاقێکی بەرز کە بۆ دین و دنیا سودی بێ‌و [پێغەمبەر]لە عومری شەست و سێ ساڵیدا لە شاری مەدینەی مونەووەرە وەفاتی کردووە؛ مەرقەدی موبارەکی، لە شاری مەدینەیە.

## موعجیزەی پێغەمبەران

ئەم پێغەمبەرانە کە ئەمریان وەرگرت لەلای خوداوە بۆ تەمێ‌و تەربیەکردنی ئادەمیزاد و دەستیان کرد بە ئامۆژگاری، بە تەبیعەت، بەعزێ کەس هەر بە تەماشا کردنی ئەخلاق و ڕەوشتی بەرزی ئەوان باوەڕ ئەکا و ئیمان دێنێ؛ بەڵام بەعزێ

کەسیش داوای ئەوەیان کردووە کە ئەو پێغەمبەرە کاری عەجایبی وایان بۆ بنوێنێ کە لەسەر خیلافی عادەت بێ تا ببێ بە هۆی باوەڕکردنیان یا بە هۆی هێزی باوەڕیان.

جا لەسەر یاسای ئەو زەمانە، هەر شتێ رەواجی بووبێ، خوا لەو بابەتە موعجیزەی پێداون؛ مەسەلا، لە زەمانی حەزرەتی مووسادا، سیحر و جادوو شافەیێکی بەرزی بووە، خوا بەهێزی خۆی عاسای داری کردووە بە مارێکی گەورە بۆ مووسا کە بووە بە هۆی داگیرکردنی هەموو جادووەکان؛ لە زەمانی حەزرەتی عیسایشدا، فەننی دوکتۆری زۆر باو بووە، خوا ئەوەی کردووە بۆ حەزرەتی عیسا کە مردوو زیندوو بکاتەوە، کوێری سکوما بینا بکاتەوە، بەڵەك چاك بکاتەوە؛ هەروا، لە زەمانی حەزرەتی موحەممەددا ﷺ، فەساحەت و بەلاغەت و خوتبە و وتاری بەرز باو بووە، بۆیە خودا قورئانی ناردووە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئەوەندە پایەی بەرزە بە هەموو جین و ئینس، بەرابەرییان پێناکرێ؛ خوا بانگی کردووە لە عالەم بێن یا قورئانێکی وەها، یا دە سوورەت، یا سوورەتێك بڵێن و کەس نەیتوانیوە و هەموو سەریان بۆ شۆڕ کردووە، هەندێکیان لە عەنادا لە وتارو قسە دەرچوون بۆ جەنگ و شەڕ و ئاژاوە.

ئەم قورئانە، بەڕاستی موعجیزەیە لەبەر چەند دەلیل:

(یەکەم)، ئەو نوکتەی وردە و ئەو ریعایەتی مەقام و مەجلیسە کە لە قورئانا هەیە، لە هیچ کتێبێکی ئاسمانی و ئەرزیدا دەست ناکەوێ و ناشتوانن لەم مەقاما نزیکی ببنەوە، کەسیش ناتوانێ وێنەیان بڵێت.

(دووەم)، باسی غەیبی زەمانی رابوردوو و گەلێ کارەساتی پاشەڕۆژی تیایە و گەلێ باسی ئاسمان و ئەرزو بەڕ و بەحر و باسی ئەستێرەو هەوا و باران و ئەوزاعی وای تیایە کە لە تاقەتی ئادەمیزادا نییە بە بێ خوێندن و فێربوون بیانزانێ.

(سێهەم)، ئەم قورئانە لەهەر بابەتێکەوە باس ئەکا هەمووی بە وێنەیەکی راست دەرئەخا و بەقەتعی، درۆ و موبالەغاتی نارەوا و قسەی بێ ئەساسی تیا نییە.

(چوارەم)، ئەم قورئانە رەوشت و داڕشتن و تەرتیبی لە وتاری ئینسان ناچێ، بەڵکوو هەر کەسێ ورد ببێتەوە، ئەزانێ ئەم تەرتیبە شیرینە و ئەم دڵگرتن و

رۆحڕاکێشانەو ئەم فەرمانڕەواییە بەسەر تەبیعەتدا، بە وتارێکی غەیبی قودسی نەبێ، قابیل نییە.

(**پێنجەم**)، ئەوەی ئەسبابی سەعادەت و بەرزی ئادەمیزاد بێ بۆ تەنیا و بۆ کۆمەڵ و بۆ دنیا و پاشەڕۆژ، تیا هەیە؛ ئەمر ئەکا بەوە کە گەورەیەکیان بێ فەرمانی گەورەکە وەربگرن؛ ئەگەر نیزاع و شۆڕشێکیان لە ناوا پەیدابوو، لەبەر ڕووناکی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرا دەفعی بکەن و ئیشیان لەسەر راوێژ بێ و عەداڵەتی ئیجتیماعی بەجێبێنن و فەرق لەبەینی کەسا نەخەن لە هەر عونسورێ بێ و هەر رەنگ و هەر زمانێکی هەبێ، مەگەر بەهۆی ئەخلاقی بەرز و مەنفەعەت و سوودی فەردی و کۆمەڵایەتییەوە؛ ئەمر ئەکا بە مەشغووڵ بوون بە عیلم، بە سەنعەت، بە دین، بەئەخلاق، بە دڵسۆزی، بە راستی، بە غیرەت، بە ناموس، بە کۆمەکی داماو، بە ئیرشادو ئامۆژگاریی نەزان، بە یارمەتیدانی یەکتر لەسەر چاکە، بە عیززەتی نەفس، بە پەیوەندی بە زاتی خوداوە؛ ئەمر ئەکا بەوە کە باوەڕیان بێ ڕۆژێ ئەبێ و دنیایەکی تازەیوەها دێت هەر کەسێ تۆڵەی رەفتاری خۆی وەربگرێ؛ جا، قورئانێ کە ئەمە دەستووری بێ، دیارە لە هەموو چەرخێکا و بۆ هەموو چینێ و بۆ هەموو ڕۆژێ بەکارە و هەر لە دائیرەی قودسی ولە بارەگای بەرزی خوداوە دەرچووە و قسەی ئادەمیزاد نییە وکەس ناتوانێ بەرابەرکێی لەگەڵ بکا.

بێجگە لە قورئان، ئەم پێغەمبەری ئێمەیە، موعجیزەی زۆریتری بووە کە لە کتێبی عالمان و ئەهلی تەئریخا نووسراوە [و] لە هەموو موعجیزەیەك گەورەتر موعجیزەی ئەخلاقە.

ئەم زاتە عالی جەنابە، بێئەوە لە مەکتەب و مەدرەسەیەکا خوێندبێتی و بێ ئەوە لەناو باوك و باپیرەیا پاشایی و دەستوور و نیزامی ئیدارەی عالەم بووبێ، هاتووە لەناو قەومێکی نەزانی خاوەن عەنادی ماددەپەرستا ئیعلانی پێغەمبەری خۆی کردووە و ئامۆژگاری کردوون بە عیلم و حیکمەت و ئەوەندە ئەخلاقی بەرز بووە هەر بە رەفاقەت، بێجگەلە بەیانی قسە، ئەخلاقی ئەو قەومەی هەڵسووڕاندووە لە نەزانینەوە بۆ

زانیاری و لە عەنادەوە بۆ ئارامی و ئیدارە و لە غەزەب گرتنەوە بۆ حیلم و حەوسەڵە و لە ماددە پەرستییەوە بۆ خودا ناسین و غەیب پەرستی، بە نەوعێ کە ئەو رەفیقانەی بە ماوەیەکی کەم، بوون بە پارچە ئاگرێکی رۆحی و بە چرایەکی خاوەن پرتەوکە لە ئەرزا وەکوو رۆژی چەرخی بەرز پرتەویان بڵاوئەکردەوە بەسەر پانایی جیهانا و ئادەمیزادیان لە پەستی مەشرەب و ئەخلاقەوە ئەگەیاند بە لووتکەی بەرزی ئەخلاق.

ئەم زاتە، لە هەموو کاتێکا، لە خۆشی و ناخۆشیا خۆگر و راستبووە. پەیمان راگر بووە، ئەوەندە ئیعتیمادی لەسەر خودای خۆی بووە لە هیچ کارەسات و پێشهاتێکا دڵی نەلەرزیوە و توانیویە ریسالەتی خۆی بباتەسەر؛ ئەم خوو و رەوشتە دامەزراوە، لای پیاوی هۆشیار لە هەموو موعجیزەیێ بەرزترە، لەبەر ئەوە کە موعجیزە، بەس بە خەلقی خودایە و شەخس عەلاقەی پێوە نییە و هونەر لەوەدایە ئینسانی مەرد لە نەفسی خۆی و لە ئەخلاق و کردەوی خۆیا دامەزراو بێ.

کۆمەڵی ئوممەتی ئەم زاتە، لە کۆمەڵی هەموو پێغەمبەرەکان گەورەترە و دینەکەی لە هەموو دینێ میانەترە و بۆ رۆژ، رێك و پێکترە و هەمیشە موناسەبەی لە بەینی دین و دنیادا راگرتووە.

لە ئوممەتی ئەم زاتە، لەپاش وەفاتی خۆی، پێنج کەس لە ماوەی سی ساڵا جێگەنشینی ئەویان بە راستی کردووە: ئەبووبەکری سیدیق، عومری فارووق، عوسمانی «ذي‌النورین»، عەلی کوڕی ئەبووتالب کە مەشهوورە بە «اسدُاللّه»، حەسەنی کوڕی عەلی، عالمانی ئوممەتەکەی، قورئان و فەرموودەی ئەویان بەڕاستی راگرتووە، عالمی زۆریان تیا هەڵکەوتووە؛ لەناو ئەمانە لە ئادابی شەریعەتا، چواریان مەزهەبیان کۆ کراوەتەوە: ئیمامی ئەعزەم ئەبوحەنیفە نوعمانی کوڕی سابت، ئیمامی مالك، ئیمامی شافعی، ئیمامی ئەحمەد؛ لە ئیعتیقادیشدا، دوو ئیمامی گەورە مەشهوورن؛ یەکەم، ئەبولحەسەنی ئەشعەری، دووهەم ئەبوومەنسووری ماتوریدی؛ ئێمە کە موسوڵمانی کورد زمانین، لە شەرعا تابیعی ئیمامی شافعی و لە ئیعتیقادا تابیعی شێخ ئەبولحەسەنی ئەشعەریین ـ خوا لەوان رازی بێ ـ و لە ئێمەیش بە پیرۆزیی کۆششی ئەوانەوە.

## ئەو موسوڵمانانەکە پایەیان لە دنیادا بەرزە

وتمان لە دینی ئیسلاما ئەوکەسە زۆر گەورەیەکە تەقوای زۆر بێ؛ تەقوا سێ پایەی هەیە؛ یەکەم، بریتییە لە خۆپاراستن لە کوفر؛ دووەم، خۆپاراستنە لە هەر کردەوەیێ کە ئینسانی پێ فاسق ببێ، بەم مەعنا ئینسان بە دەستووری ئایینی ئیسلام عادڵ بێ؛ سێهەم، خۆپاراستنە لە غەیری خودا، یانێ: هەر وتار و رەفتار و «تصوّرات» و باوەڕێکی دەروونی هەیە، هەموو، پاك لەبەر رەزای خودا بێ و بە تەواوی، لە دۆستی و فەرمانبەرداریی خودادا بتوێتەوە.

لەسەر ئەم یاسایە گەلێ لەم ئوممەتە مەشهوور بوون بە ئەهلی تەقواو لە عورفا بە «وەلی» ناو ئەبرێن، و بە کۆمەڵ پێیان ئەڵێن: ئەولیاء.

لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر کەسیوا بوون ئەم پایە گەورەیانە نەبووە و بە هۆی وەزع و رۆژەوە و بە دەورگرتنی کۆمەڵێ لە نەزان و ئەهلی دنیاوە مەشهوور بوون بە وەلی؛ ئێمە حیسابی ئەمانە حەواڵە ئەکەین بە خوداو بە رۆژی حیساب وکیتابی خۆیان و باوەڕمان وایە گەلێ لەم ئوممەتەیش هەن پایەی بەزریان هەیە و بەڕاستی ئەهلی تەقوان و فەرمانبەرداری خوای تەعالا ئەکەن.

ئەمانە پێویستە چەند شەرتێ هەیە تیایاندا بێتەجێ:

(یەکەم)، زانا بن بە ئادابی دینی خۆیان و بە ئەحکامی شەریعەتی ئیسلام، ئەوەی کە پێویستە بە ناچاری رەفتاری پێبکەن؛

(دووەم)، بەڕاستی لە ئیتاعە و فەرمانبەرداری شەریعەتدا بن؛

(سێهەم)، ئەوەیە ئەو کەسە کە رەفیق و هاومەشرەبیانە لەسەر فەرمانبەرداری شەریعەت دەوام بکا؛ ئەم نەوعە ئینسانانە لە هەر وەختێك و لە هەر شوێنێکا بن، باوەڕمان هەیە لە ئەولیای خودان و خاوەن کەرامەتن.

زۆر پێویستە ئینسانی موسوڵمان بەرچاوی رووناك بێ و خاوەن بیرو هۆشی راست بێ؛ هەروەکوو لازمە حورمەتی پیاوی خاوەن تەقوا بگرێ و لە رەفاقەت و

ڕۆژی خوو و ڕەوشتی سوود وەربگرێ، هەروا پێویستە ئاگای لە خۆی بێ، لە خۆیەوە بە هەوا و ئارەزووی نەفس نەکەوێتە دوای پیاوێ کە بە غروور داوای پایەی بەرز بکاو خۆی لە شەڕی هاوڕێیەتی ئەوانە بپارێزێ و بەڕاستی، نیشانە و شەرتە پێشووەکان تەماشا بکا.

ئێمە کە موسوڵمان و ئەهلی سوننەتین، عەقیدە و باوەڕمان وایە کە تەرتیبی جێگەداریی پێغەمبەرﷺ، لەسەر ئەو ریزەیە کە بەیانمانکرد؛ یەکەم، ئەبووبەکری سیددیق؛ دووەم، عومەری کوڕی خەتاب؛ سێهەم، عوسمانی کوڕی عەففان؛ چوارەم، عەلی کوڕی ئەبووتالب؛ پێنجەم، حەسن ـ خوایان لێ ڕازی بێ ـ.

عەقیدەشمان وایە ئەهلی هەموو قەڕنێ لە زەمانی پێغەمبەرەوە تا ڕۆژی قیامەت، لە ئەهلی قەڕنی دوایی باشترن و هەموو ئەسحابەکانی پێغەمبەرﷺ لە چینی تابیعین و چینی ئەمان لە چینی تابیعی تابیعین گەورەترن و هەروا بەم تەرتیبە.

هەروا، عەقیدەمان وایە پێویستە ئەم ئوممەتی ئیسلامە ئیمام، یانێ سەرۆك و فەرمانڕەوای ببێ بۆ ئەوە کە ئیدارەی واجباتی ئەم ئوممەتە بکاو مەسڵەحەتیان جێبەجێ بکاو ئەبێ ئەم سەرۆکە لە تایفەی قورەیش بێ، مادام لە ئیتاعەی خوداو فەرمانی شەریعەتا بن؛ ئەگەر ئەمە ڕێنەکەوت، دروستە کەسێکی تر بێ بەو شەرتە بتوانێ ئیدارەی پێویستی موسوڵمانان بکاو فەرمانبەرداریيان واجبە بەو شەرتە لەسەر دەستووری قورئان ڕەفتار بکەن کە یەکێ لە ڕەفتارەکان ئەوەیە لە دەستووری حوکما، دان بنێن بە مەجلیسی شوورای ئیسلامیدا.

## ئیمان بە ڕۆژی ئاخیرەت

ئیمان بە ڕۆژی ئاخیرەت ئەوەیە ئینسان بە دڵ باوەڕی ببێ وەك چۆن خودا ئەم دنیایەی لە نەبوون خەلق کردووە، ئەم ئادەمیزادەی دروست کردووە، هەروەهاش ئەم دنیا تێك ئەدا و ئەم گیانلەبەرانە ئەمرێنێ و لەپاش ماوەیەك، دووبارە ئەم مردووانە زیندوو ئەکاتەوە و لەپاش حیساب هەرکەس لەسەر وێنەی ڕەفتاری لە دنیادا، تۆڵەی خۆی دەست ئەکەوێ.

بەر لە هاتنی رۆژی قیامەت، وەزعی مردوو لە قەبرا و نیعمەت و زەحمەتی قەبر هەیە. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، کە کەسێ مرد، ئەو کەسە لەپاش مردن رۆحەکەی عەلاقەی بە لەشەکەیەوە هەیەو بەر لە هەموو شتێ، مەلائیکەی پرسیاری قەبر حازر ئەبن لای و پرسیاری لێ ئەکەن ئاخۆ باوەڕی بەرامبەر بە خودا و پێغەمبەر و قورئان و ئیسلامەتی چۆنە؟! ئەگەر بەباشی جوابیان بداتەوە، ئەوە لەو زەحمەتە رزگار ئەبێ، ئەگەر وانەبێ، گیرۆدەی ئازار و عەزاب ئەبێ لە قەبرا.

باشترین نموونە بۆ خۆشی و ناخۆشی مردوو لە قەبرا، وەزعی نوستنی ئینسانە؛ تەماشا ئەکەین لە وەختی نوستنا، گەلێ وەخت وەزعی زۆر خۆش ئەبینین یا وەزعی نابار و دیشوارمان بەسەرا دێت بە جۆرێ کە نزیکە شێت ببین، لەگەڵ ئەوەیشا ئەو کەسانەکە وان بەدەورمانا بەقەتعی، لە وەزعی ئێمە ئاگادارنین؛ کەواتە، نابێ ئینسان لەم مەسئەلەدا تەماشای ئەوە بکا کە ئینسان وائەبێ ئەسووتێ یا ئەکەوێتە دەریاوە یا پارچە پارچە ئەکرێ یا لە قەبرا جووڵەو حەرەکەی نییە، چونکە عەزابی قەبر یا خۆشی قەبر، بەر لە هەموو شتێ، عائیدی رۆحەو شەرت نییە وەك عەزاب و خۆشی ئینسانێکی زیندوو بێ و هەموو لەشی بەشداربێ لەو خۆشی و ناخۆشییەدا و ئەبێ حەقیقەت و تەفسیلی ئەم وەزعە حەواڵە بکەین بە عیلمی خودا.

پێویستە ئینسانی موسوڵمان باوەڕی ببێ بەوە کە خودا ئەم دنیا ئەگۆڕێ و ئەم گیانلەبەرانە ئەمرێنێ، جا زیندوویان ئەکاتەوە، یا لەسەر عەینی ئەجزا رزیوەکان لەهەر شوێنێ ببن، یاخود وێنەی ئەو ئەجزایانەیان بۆ خەلق ئەکاتەوە بە جۆرێ کە هەر شەخسێ ئەزانێ خۆی کێیە و ناوی چیە و کۆری کێیە و خەڵکی کام شوێنە و خوای تەعالا هەموویان گرد ئەکاتەوە و حسێبی کردەوەیان لەگەڵا ئەکا.

ئەبێ باوەڕی ببێ کە ئینسان هەر کردەوەیەکی ببێ لە چاکە و خراپە، بە ترازوو (میزان)، مەعلووم ئەکرێ. پێویستە باوەڕی ببێ بەوە کە پردی «صراط» راستە و ئەم عالەمە ئەبێ بەسەریا رابوورن، جا ئەو کەسەی کە ئەهلی نەجاتە بە وەزعێکی زۆر ئاسان رائەبوورێ، بەعزێ وەکوو بەرق، بەعزێ وەکوو با، بەعزێ وەکوو سوارێکی تیژ، بە گوێرەی پایەی رەفتاریان؛ جا هەر کەسێ رزگار بوو لەوە، حەواڵەی بەهەشت

ئەکرێ، ئەو کەسەش کە موستەحەقی عەزابە، ئەکەوێتە دۆزەخەوە، ئەگەر کافر بێ، بە ئەبەدی. وە ئەگەر موسوڵمانێکی گوناهبار بێ، ئەوەندەی گوناهەکەی عەزاب ئەدرێ، جا لەوێ دەرئەکرێ بۆ بەهەشت؛ خودا لە قورئانا فەرموویەتی: ﴿فَاهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْجَحِيمِ، وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْؤُولُونَ﴾، یانێ: ئەو «بەدڕەفتارانە ڕێنموونی بکەن بۆ سەر ڕێگەی دۆزەخ و ڕایان بگرن لە بەر ئەوە کە پرسیاریان لێ ئەکرێت».

پێویستە باوەڕی بێ بەوە کە بەهەشت و دۆزەخ ئێستە هەن، بەڵام بە وەزعێکی دیاری مەعلووم نییە جێگەیان لە کوێیە و پێویستە حەواڵەی عیلمی خودا بکرێت.

پێویستە باوەڕی بێ بەوە کە «شەفاعەت»: تکاکردن لەلایەنی پێغەمبەرەوەﷺ، هەیە لە چەند شوێنێکا:

(یەکەم)، بۆ ئەوە کە زوو حیسابی ئەعمال بکرێت و مەخلووقات ڕانەگیرێن؛

(دووەم)، بۆ عەفوی گوناهی هەندێ گوناهکار؛

(سێهەم)، بۆ بەرز کردنەوەی پایەی هەندێ کەس؛

(چوارەم)، بۆ سووك کردنی عەزابی بەعزێ. هەروا، شەفاعەت بۆ سەرپاکی پێغەمبەران و بۆ ساڵحان و شەهیدان هەیە. قەبووڵی شەفاعەت لەبابەتی فەزڵی خودایە و ئایەتی قورئان لەسەر ئەمە هەیە و حەدیس ئەیفەرموێت.

هەروا پێویستە باوەڕی بێ بەوە کە لەپێش داخڵ بوونی بەهەشتا، ئەوانەی کە لە عەزاب ڕزگار بوون لەسەر «حوضُ المَورود» کۆ ئەبنەوە؛ ئەم حەوزە، مەشهوورە بە حەوزی پێغەمبەرﷺ و ئەندازەی جامی ناو ئەم حەوزە، لە عیلمی خوادایە، هەرکەسێ لە ئاوی ئەم حەوزە بخواتەوە، قەت تینووی نابێ و هەرچیش لە بەهەشتا بخواتەوە، هەر بۆ لەزەت و خۆشییە.

## ئیمان بە قەزا و قەدەر

ئیمان بە قەزا و قەدەر، بریتییە لەوە کە ئینسان باوەڕی بێ هەرچی لە عالەما پەیدا ئەبێ، هەمووی ئیشی خودایە و بە خەلق و ئیرادە و دروست کردنی ئەوە و زاتی خودا نەبێ کەس خالق نییە.

ئەبێ باوەڕی ببێ بەوە ئەگەرچی ئەوانەی لە عالەما پەیدا ئەبن مەخلووقی خودان، بەڵام هەرچی لە دەستی عەبدا بێ کەسبی عەبدیشی تیا هەیە، یانێ: خوای تەعالا خەلقی عەبدی کردووە و خەلقی قودرەت و هێزی عەبدی کردووە و ئەو شتەیش کە عەبد ئەیکا هەر خودا دروستی ئەکا، بەڵام عەلاقەی عەبدیشی پێوەیە، ئەو عەلاقەیە ناوی کەسبە، چونکە بە ئاشکرا ئەزانین یەکێ لەرز بیگرێت و بە ناچاری بجووڵێتەوە فەرقی هەیە لەگەڵ یەکێ کە خۆی خۆی بلەرزێنێتەوە، لەبەر ئەوە کە یەکەم، عەلاقەی عەبدی تیا نییە و دووەم، عەلاقەی تیا هەیە.

قەراردانی ئەم عەلاقەیە، پێویستە بۆ راگرتنی نیزامی عالەم؛ ئەگەر ئەم عەلاقەیە نەبێ، ئەبێ هیچکەس لە هیچ کردەوەیەکی باشا تاریف نەکرێ و جەزای خەیری نەبێ و لە هیچ کردەوەیەکی خراپا زەمی نەکرێ و تۆڵەی لێنەسەنرێتەوە، ئەمەیش خیلافی نیزامی عەقڵ و هۆشی ئینسانە.

پێویستە باوەڕی ببێ بەوە کە هەرچی کەسبی عەبدیشە، هەر وا لەژێر دائیرەی ئیرادەی خوادا، کەواتە، بە بێ خواستی خودا لەم عالەمەدا هیچ ئیشێکی گەورە یا بچووك ناکرێ، چ خێر و چ شەڕ، چ قازانج و چ زەرەر؛ بەڵام ئەبێ بزانین کەوا ئیرادە و خواستی خودا، تابیعی عیلمی خودایە و خودا عیلمی رابوردووە بەوە کە ئیمرۆ ئێمە چ شتێ ئیختیار ئەکەین و چی ئەکەین بە مەیلی خۆمان، ئەویش لەسەر وەزعی ئەو عیلمە ئیرادەی شتەکەی کردووە، کە وابێ، ئێمە مەسئولین لە ئیختیار و کەسبی خۆمانا و بە هەر نەوعێ ئیختیارمان هەڵسووڕێ، خودا وەها خەلق ئیجاد ئەکا.

بزانن! مەعنای قەزا و قەدەر، ئەمە نییە ئینسان راوەستێ و هیچ شتێ نەکاو بڵێت قەزا چۆن بووە هەروا ئەبێ، چونکە ئێمە، ئاگامان لە قەزای خودا نییە چۆنە، بەڵام ئاگامان لەوە هەیە کە هەرشتێ ئەسبابێکی هەیە کە وا لە میزانی تەوانا و تاقەتی ئێمەدا و ئاگایشمان لەوە هەیە کە خودا فەرمانی داوە بەوە کە ئەسبابی چاکە جێبەجێ بکەین و خۆمان لە ئەسبابی خراپە بپارێزین؛ بەڵێ لەپاش کۆشش کردن، ئەگەر شتێ بەدڵخوازی ئینسان رێنەکەوت، ئینسان بۆ دڵخۆشی دانەوەی خۆی، ئەتوانێ بڵێ ئەمە قەزای خودایە پێویستە جێبەجێ ببێ.

پێویستە ئینسان باوەڕی وابێ هەر چی خودا ئەیکا بە مەحزی ئیختیار و فەزڵی خۆیەتی و هیچشتێ لەسەر خودا واجب نییە.

پێویستە باوەڕی ببێ کە خوا ئەتوانێ هەموو تەکلیفێ بکا لە عەبدی خۆی، بەڵام قەت نەبووە و نابێ تەکلیف بە شتێ بکا لە تاقەت و تەوانای عەبدا نەبێ.

پێویستە باوەڕی ببێ بەوە کە خودا خاوەن تەسەڕوفی موتڵەقە، ئەتوانێ ئینسانی باش عەزاب بدا و ئەشتوانێ پیاوی گوناهبار عەفو بکا، ئەگەرچی لەسەر فەرمانی خۆی تۆڵەی چاکەی هیچ کەسێ نافەوتێنێ. پێویستە باوەڕی ببێ بەوە ئەگەرچی هەموو ئیشێکی خودا حیکمەتی تیایە و خاڵی نییە لە حیکمەتێ کە خۆی ئەیزانێ، بەڵام واجب نییە لەسەر خودا ئەوەی مەسڵەحەتە بۆ هەر کەسێ ئەوە بکا، ئەگینا هەرگیز کافرێکی نەخۆشی لاتی ناشیرینی بێعەقڵی دروست نەئەکرد.

پێویستە باوەڕی ببێ بەوە کە فەرمان لە عالەما هەر بۆ خودایە، هەر ئەو ئەتوانێ شتێك واجب یا حەرام یا سوننەت یا مەکرووە یا موباح بکاو تەسەڕوفی گشتی حەواڵەی خودایە.

پێویستە باوەڕی ببێ بەوە کە هەموو رزقێ هەر لە خوداوەیەو ئەجەل یەکێکە کە خودا دایناوە: ﴿وَ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ وَ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتابٌ﴾.

عەقیدەی ئەهلی سوننەت، ئەوەیە کە ئایینی ئیسلام بریتییە لە قورئان و حەدیس کە فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ؛ روون کردنەوەی مەعنای قورئانیش، حەواڵەی پێغەمبەرەﷺ؛ بەپێی بەیانی قورئان و حەدیس، ئیجماعی عالمانی بەرزی ئیسلام، یانێ «مُجتهدین»، جێگەی باوەڕە [و] هەروا ئەو قیاس و دەلیلانەش کە موجتەهید بەکاریان بێنێ. کەواتە، بناغەی ئەحکام لەسەر پێنج شتە: قورئان، حەدیس، ئیجماع، قیاس، ئیستیدلال.

لەهەر شوێنێکا خیلاف لە بەینی عالمە بەرزەکانا ببێ، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئایەت و حەدیس لەو شوێنەدا نییە، یاخود هەیە بەڵام چەند مەعنایێ هەڵئەگرێ و هەر عالمێ لەسەر مەعنایێ ئەڕوا؛ جا ئەوانەیان کە گەیشتن بە حەق، دوو ئەجریان هەیە؛ ئەوانەشیان بە حەق نەگەیشتن، یەك ئەجریان هەیە کە بریتییە لە ئەجری زەحمەت کیشانەکەیان.

هەر موسوڵمانێ ئیشێکیوا هاتە ڕێگەی کە شوێنی ئیختیلافی ئیمامەکان بێ، پێویستە یا بڕوا بۆ لای قازیی شەرعی کە حوکمی بۆ بدا، یا خۆی تەقلیدی ئەو عالمە بکا کە ئەو شتەی بەڕەوا زانیوە و قابیل نییە بە بێ یەکێ لەم دوو ڕێگەیە ئەو شتە بکا.

ئێمە، عەقیدەمان وایە هەروەکوو ئەووەڵی ئەم دنیا وا لە عیلمی خودادا، هەروا ئاخرەکەیشی هەر لە عیلمی ئەوایە و کەس نازانێ کەی تەواو ئەبێ؛ عەقیدەشمان وایە هەر نیشانەیەکی ئاخر زەمان کە حەزرەتی پێغەمبەر فەرمووبێتی، هەمووی ڕاستە.

ئەمانەی کە بەیانم کردن، بە کورتی، هەموو عەقیدەی موسوڵمانانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن کە لەسەر ڕەوشتی حەزرەتی پێغەمبەر و یارەکانی ئەڕۆن بەڕێدا.

ئەمجار باسی پێنج بەندەی فەرعی دینە.

## بەندی یەکەم: دووکەلیمەی شەهادەت

بەندی یەکەم: دوو کەلیمە شەهادەت «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلٰهَ إِلاّ اَللّٰه، وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اللّٰه»، پێویستە هەموو موسوڵمانێ بە کورتی مەعنای ئەم دوو کەلیمەیە بزانێ کە ئەمەیە: بە زمان ئەڵێم و بە دڵ باوەڕم هەیە کەوا هیچ زاتێ نییە بەڕاستی بەندەیی بۆ بکرێ مەگەر ئەو زاتە کە ناوی «اللّٰه»یە [وە] بە زمان ئەڵێم و بە دڵ باوەڕم هەیە کەوا حەزرەتی موحەممەدی عەرەبی ـکە دایکی ناوی ئامینەیە و باوکی ناوی عەبدوڵڵایە و باپیرەی ناوی عەبدولموتەلیبە و باپیرە گەورەی ناوی هاشمە، پێغەمبەری خودایەو خودا ڕەوانەی کردووە بۆ تەمێ و تەربییەکردنی جین و ئادەمیزادو لەپاش ئەو هیچ پێغەمبەرێ نابێ تا ڕۆژی قیامەت و هەرچی ئەو فەرموویەتی و کردوویەتی، ڕاستە.

## بەندی دووهەم: نوێژ

کە بریتییە لە پێنج فەرز لە هەموو شەو و ڕۆژێکاو لە شاری مەککە لەو شەوەدا کە حەزرەتی پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت بۆ ئاسمان بۆ میعراج، خوا فەرزی کردوون لەسەر حەزرەت و لەسەر هەموو فەردێ لە ئوممەتی ئەو کە عاقڵ و باڵغ و پاك بێ. لە بەعزێ شوێنیشا لەباتی نوێژی نیوەڕۆ نوێژی جومعە ئەکرێ کە دوو ڕکاتە لەگەڵ دوو خوتبەدا.

جا لەبەر ئەوەکە شەرتی نوێژ پاکییە لە بێ‌دەس نوێژی و لەش پیسیو پاکی ئەندام و جێگەی نوێژ، بەر لە باسی نوێژ، باسی «طَهارت» ئەکەین. مەبەست لە تەهارەت، لابردنی بێ دەس نوێژییە کە پێی ئەڵێن «حەدەسی ئەسغەر»و لابردنی لەش پیسییە کە پێی ئەڵێن «حەدەسی ئەکبەر» و پاك کردنەوەی هەرشتێکە کە پیس‌بووبێ، بەوجۆرەی کە شەرع بڕیاری داوە.

پێویستە بۆ لابردنی ئەم دوو حەدەسە و بۆ پاك کردنەوەی هەر شتێ پیس بـووبێ ئاوێکی وەها کە بە ئاوی رووت ناو ببرێ، یانێ بە بێ ناتۆرەیەکی پێویست، پێی‌بڵێن ئاو؛ «مُسْتَعْمَل»یش نەبێ، یانێ جارێکی‌تر بەکار نەهێنرابێ لە لابردنی حەدەس و پاك کردنەوەی شتی پیسا.

ئاوی رووت، رەوایە بەکار بهێنرێ بۆ تەهارەت، خواهـ ئاوی باران بێ یا تەرزە یا بەفر یا دەریا یا رووبار یا کارێز یا بیر؛ جا ئەم ئاوە، یا رەوانە و لەبەری ئەڕوا یا راوەستاوە.

یەکەم ـکە ئاوی رەوانە ـ پاکە و پاکەوەکەرە مادام یەکێ لە سیفەتەکانی ـکە تام‌و رەنگ‌و بۆنە ـنەگۆڕابێ، خواهـ زۆر بێ یاکەم و خواهـ پیسی تیابێ یا نە، چونکە لە ئاوی رەوانا ئیعتیبار بە گۆڕانی یەکێ لە سیفەتەکانیەتی بینا لەسـەر فـەرموودەی قـەدیمی ئیمامی شافیعی ـخوای لێ رازی بێ ـکە لە فەرموودە هەڵبژێرراوەکانە لەم شوێنەدا. خۆ ئەگەر بەهۆی شتێکی پیسەوە گۆڕابێ، ئەوە ئەو ئاوە پیس ئەبێ و هیچ شتێك پاك ناکاتەوە و بۆ تەهارەت ناشێ؛ ئەگەر بەهۆی شتێکی پاکیشەوە گۆڕابێ، مەسەلا ئاردی تێکەڵ بووبوو یا زافەران یا شتێکی بۆن‌دار، ئەوە خۆی پـاکـە، بـەڵام بـۆ تـەهارەت بەکارنایێ.

بەشی دووەم ـکە ئاوی راوەستاوە ـ یا گـەیشتووە بـە ئـەندازەی «قـوللەتەین» یـا نەگەیشتووە؛ قوللەتەین، بە کێشانە، پێنج سەد رەتڵە بە رەتڵی بەغدا و بە پـێوانـە، لە شوێنی چوار گۆشەدا، زیراعێك و چارەکێکە لە درێژی و پانی و قووڵیدا بە زیراعی دەستی ئادەمی کە ئەکاتە دوو بست و نیوبە بستی ئینسانی عادەتی، چونکە زیراعەکەی نزیکەی دوو بستە و چارەکەکەیش نیو بستەو لە شوێنـی خـڕدا، یـانێ لە شـوێنـی

گردەواریدا، بریتییە لە ئەندازەی دوو زیراع بە زیراعی نەجاڕ لە باری قوولّیداکە ئەکاتە پێنج بست بە بستی ئینسانی عادەتی، چونکە زیراعی نەجاڕ زیراع و چارەکێکە بە زیراعی ئادەمی؛ لە باقی بارەکانی تریشا، بریتییە لە زیراعێ بە زیراعی ئادەمی کە ئەکاتە دوو بست وەکوو «ابنُ حَجَر» فەرموویەتی. ئەگەر رێکەوت بە بارێ لەم بارانەدا لە ئەندازەی پێویست زۆرتر بوو و لە بارەکانی تراکەمتر بوو، ئەوە لە باری زۆرییەکەی ئەخرێتە سەر بارە کەمەکە و بەو میزانە ئەندازەی پێویست تەواو ئەکرێ. جا ئاوی راوەستاو ئەگەر لە قوللەتەین کەمتر بوو و شتێکی پیسی تێ کەوت، ئەوە بە پیس دائەنرێ خواه بگۆڕێ یا نەگۆڕێ؛ ئەگەر شتێکی پاکیشی تێ کەوت و گۆڕیی، ئەوە خۆی پاکە بەڵام شت پاك ناکاتەوە و بۆ تەهارەت ناشێ، ئەگەر نەشی گۆڕی، ئەوە هیچ قەید ناکا.

ئەگەر گەیشتبوو بە قوللەتەین، ئەوە پاکە و پاکەوەکەرە، با شتی پیسیشی تێ کەوتبێ مادام یەکێ لە سێ سیفەتەکەی نەگۆڕێ، بەڵام ئەگەر گۆڕا بەهۆی شتی پیسەوە، ئەوە پیس ئەبێ؛ ئەگەر بەهۆی شتی پاکیشەوە گۆڕا، ئەوە خۆی پاکە، بەڵام شت پاك ناکاتەوە.

**بزانن!** زەرەری نییە بۆ ئاو ئەو شتە پیسە کە چاو دەرکی ناکا یا ئەو مردارەوە بووەی کە خوێنێکی رەوانی نەبێ، وەك مێش و زەردەواڵە، ئەمانە ئاوی کەمتر لە قوللەتەین پیس ناکەن؛ هەروەها زەرەری نییە گۆڕانێ بەهۆی زۆر وەستانەوە، یا بەهۆی شتێکەوە کە پێویستی ئاوەکە بێ وەك گڵ و قەوزە، یا بەهۆی شتێکەوە کە لە شوێنی وەستانی ئاوەکەدا یا لە گوزەرگایا بێ وەك گۆگرد و نەوت، یا بەهۆی شتێکەوە کە نزیکی بێ وەك دارێکی بۆندار یا مردارەوەبوویەکی واکە لەو دەوروبەرەدا بێ؛ هەروەها زەرەری نییە گەڵادارێ کە وەربێتە ناو ئاوەکە مادام بەتەواوی نەرزابێ و تێکەڵی نەبووبێ.

ئەگەر ئاوێ گۆڕاو گۆڕانەکەی هەر لەخۆیەوە نەما، یا بەهۆی ئاوێکی ترەوە کە بێتە سەری، ئەوە لەم کاتەدا بە پاکەوەکەر ئەناسرێ مادام لە قوللەتەین کەمتر نەبێ. ئەگەر ئاوی پیس گردەوە بوو تا گەیشت بە قوللەتەین و لەم کاتەدا گۆڕانی نەبوو، ئەوە بە پاك و پاکەوەکەر ئەناسرێ.

هەر ئاوێ «مُسْتَعْمَل» بووبێ، یانێ بەکار هێنرابێ لە فەرزی دەس‌نوێژ و غوسلا، ئەگەر کەمتر بێ لە قوللەتەین، ئەوە جارێکی‌تر بۆ دەس‌نوێژ و خۆپێ‌شۆردن ناشێ؛ ئەگەر ئەوەندەش زۆر بووگەیشت بە قوللەتەین و نەگۆرابوو، ئەوە بۆ تەهارەت ئەشێ؛ هەروا ئەگەر ئاوی‌تری بێتە سەر و بگا بە قوللەتەین.

کە ئاوی بەکارهێنراو رژایە ناو ئاوی دەس‌نوێژ و غوسڵ، ئەوە ئەگەر ئەوەندە زۆر بوو ئەگەر دای‌بنێی بە ئاوێکی موخالیف بۆ ئاوی دەس‌نوێژ و غوسڵەکە ئەیگۆڕی، ئەوە پەکی ئەو ئاوە ئەخا و بۆ تەهارەت ناشێ، ئەگەر لەو ئەندازەش کەمتر بوو، زەرەری نییە، مەسەلا ئەو ئاوە موستەعمەلە لە ڕەنگا بە ئاوی «عَصیر: ترێی گوشراو» و لە تاما بە هەنار و لە بۆنا بە گیای بۆژانە دابنرێ.

هەر کەسێ دەس‌نوێژی گرت بە ئاوێکی وەستاوی کەمتر لە قوللەتەین، پێویستە لەپاش نییەت و شۆردنی دەم و چاو، بەنیازی ئاو هەڵگۆزتن، مشتێ ئاوی لێ‌دەربێنێ و دەستەکانی پێ بشۆرێ، جا باقی دەس‌نوێژەکەی تەواو بکا. ئەگەر غوسڵیشی پێ کرد، ئەبێ لەپێشا بەر لە نییەت هێنان، مشتێ ئاو دەربێنێ جا لەگەڵ نییەتی ڕەفعی جەنابەت هەردوو دەستی بشۆرێ، پاش ئەوە ئیتر زەرەری نییە دەس بکا بە ئاوەکەدا و ئاو دەربێنێ بۆ شۆردنی لەش؛ ئەگینا، ئەگەر دەس‌نوێژگر پاش نییەت و شۆردنی دەم‌وچاو، بە بێ نیازی ئاو هەڵگۆزتن دەس بکا بە ئاوێکی کەما، یا ئەو کەسەی کە غوسڵ ئەکا لەپێشا نییەتی ڕەفعی جەنابەت بێنێ‌و دەس بکا بەو ئاوە کەمەدا، ئەوە لەم دوو حاڵەدا، ئاوەکە «مُسْتَعْمَل» ئەبێ و بۆ دەس‌نوێژ و غوسڵ‌کردن ناشێ.

ئەگەر یەکێ کەوتە (ئیشتیباه) دوودڵییەوە لە ئاوێکی پاك و ئاوێ کە پیس بووبێ، ئەوە ڕەوایە ئیجتیهاد بکاو تێبکۆشێ بەهۆی بەڵگە و نیشانەوە پاکەکەیان بدۆزێتەوەو بەکاری بهێنێ. ئەگەر کەوتیشە ئیشتیباهەوە لە بەینی ئاوی ڕووت و گوڵاوا، هەردووکیان بەکار بێنێ، یانێ دوو جار دەس‌نوێژ بگرێ بەم دوو ئاوە. بەڵام ئەگەر کەوتە ئیشتیباهەوە لە بەینی ئاوێکی پاك و ئاوێکا کە خۆی پیس بێ وەکوو میز، ئەوە نابێ ئیجتیهاد بکا بەڵکوو هەردووکیان تێکەڵ بکا بۆ ئەوەی کەڵکی تەهارەتیان پێوە نەمێنێ، جا تەیەمموم بکا.

ئەگەر یەکێکی قسە وەرگیراو خەبەری دا بە یەکێ کە ئەو ئاوە پیسە و هۆی پیسییەکەی بۆ دەرخست، یاخود خەبەردەرەکە زانایەکی هاومەزهەب بوو، پێویستە باوەڕ بە قسەکەی بکا.

دروستە بەکارهێنان و ڕاگرتنی هەموو جۆرە قاپ و قاچاخێ کە پاك بێت مەگەر ئەوەی کە لە ئاڵتوون و زیو دروستکرابێ، یا پینەیەکی گەورەی زیو یا ئاڵتوونی پێوەبێ لەبەر جوانی یا پینەی بچووکی ئاڵتوون بۆ ناچاری. بەڵام زەرەری نییە پینەی گەورەی زیو بۆ ناچاری، یا پینەی بچووکی زیو هەرچۆن بێ، هەروەها قاپێکیش کە بەمانە رووکەش کرابێ.

خشڵی ئاڵتوون حەرامە بۆ پیاو با لە ئەسبابی جەنگیشا بێ وەکوو شیرو تیرو هەڵقەو دانەی ئەنگوستیلە؛ بەڵام ڕەوایە هەر شوێنێ لە وردە ئەعزای کە نەمابێ، شوێنی بگیرێ بە ئاڵتوون وەك سەرپەنجە و لووت و لێوو ددانێ کەوتبێ، هەروەها بەرگی ددان لە ئاڵتوون کە بۆ پاراستنی ددانەکە بێ.

ڕەوایە بۆ پیاو ـ بە بێ ئیسراف و زیادەڕەوی ـ ئەسبابی جەنگیی جوان بکا بە زیو، وەك تفەنگ و دەمانچە و شیرو نێزە و خەنجەر و قەسەتۆرەو غەیری ئەمانە، جا خوا کابرا ئامادە بێ بۆ غەزا یا نە؛ چونکە قابیلە لە ڕۆژێکا پیاو بکەوێتە جیهادەوە، ڕەوایە ئەنگوستیلەی زیو با لە یەکێ زیادتریش بێ، بەڵام چەقۆی بەردەست و قەڵەم بڕ، ئەمانە ڕەوا نییە بە زیو جوان بکرێن.

ڕەوایە بۆ ژن و منداڵ ـ با نێرینەش بێ ـ هەموو جۆرێ لە خشڵی ئاڵتوون و زیو، وەکوو ئەنگوسیلە و بازن و خڕخاڵ وگەردنبەندو گوارە و قۆڵەوانەو گەردانە و غەیری ئەمانە بەپێی عادەت، هەروا ڕەوایە جوانکردنی قورئان و بەرگی قورئان بۆ پیاو و ژن بە زیو و بۆ ژن بە ئاڵتوون.

حەرامە بۆ پیاو بەکارهێنانی پارچەی هەورێشم بۆ پۆشاك و نوێن و فەرش (ڕایەخ)، مەگەر لەبەر ناچاری؛ هەروەها پارچەیەك کە تێکەڵ بێ لە هەورێشم و غەیری هەورێشم ئەگەر هەورێشمەکەی زیاتر بێ؛ بەڵام حەڵاڵە پینەکردنی جل بە هەورێشم

لەبەر جوانی و نەخش کردن بە خەیاتەی هەورێشم بۆ پۆشاکی وەکوو سەڵتە و کەواو چمك زیاد کردن لەسەر مێزەرە و بوغچەو دەستەسڕو پەراوێزکردن ئەگەر لە چوار پەنجە بە باری پانیدا زیاتر نەبن؛ هەروەها ڕەوایە بەرگی قورئان و بەرگی سەعات و کیسەی پارە و بەندەخوێن لە هەورێشم بۆ پیاو و بەندی سەعات و بەندی کلیل و بەندی چەقۆو بەندی تەزبێح و گوڵەنگەیشی لە هەورێشم بێ بەو شەرتە لە ئەسڵی بەندی تەزبێحەکە بێ. جلێکیش کە بە زەعفەران ڕەنگ کرابێ، ئەویش وەکوو هەورێشم وایە و حەرامە لە غەیری شوێنە جیاکراوەکانا.

هەرکام لەم پارچانە کە بۆ پیاو حەرامن، بەکارهێنانیان بۆ ژن حەڵاڵە، هەروەها بۆ منداڵی نێرینەی نابالغیش، یانێ مەنعی باوك ناکرێ لەوەی جلێکی هەورێشم بۆ منداڵی نێرینەی نابالغی خۆی بکا.

## باسی ئەسبابی بێدەس‌نوێژی

ئەو شتانەی ئەبن بەهۆی بێدەس‌نوێژی، چوارن:

(یەکەم)، دەرچوونی شتێ لەپاش یا لە پێش، غەیری «مەنی» واتە ئاوی ئینسان، با ئەو شتە عادەتییش نەبێ وەك کرم یا خوێن یا ماددەیەکی وشك؛ هەروەها ئەگەر شوێنی عادەتی گیرابوو و ئەو شتە لە خواری مەعیدەوە بێتە دەرەوە. بەڵام ئەگەر شوێنی عادەتی گیرابوو و شتەکە لە ژووری مەعیدەوە هاتە دەرەوە، یا شوێنی عادەتی کرابووەوە و شتەکە لە هەر شوێنێکی‌ترەوە لە ژوور یا لە خواری مەعیدەوە هاتەدەر، ئەوە زەرەری نییە.

**بێداری!** سوودی جیاکردنەوەی مەنی، ئەوەیە ئەگەر کەسێکی خاوەن دەس‌نوێژ مەنی لێ‌دەرچێ، ئەوە لەپاش غوسڵی لەش پیسی پێویستی بە دەس‌نوێژ نییە، بەپێی ئەو قسەیە کە وتراوە گوایە دەس‌نوێژ بە غوسڵ جێ‌بەجێ نابێ.

(دووەم)، نەمانی هۆشە بە نووستن یا بە شێتی یا بە سەرخۆشی، مەگەر نووستنی کەسێ کە قنگی خۆی لەسەر جێگاکەیا دامەزراندبێ بە جۆرێ کە هیچی لێ دەرنەچێ.

(سێهەم)، بەیەك گەیشتنی پێستی نێر و مێیەکی نامەحرەمە، مەگەر منداڵێکی وا تەمەنی لە وادەی ئارەزووی ئادەمیزادی عادەتی کەمتر بێ ئەوە دەس‌نوێژ ناشکێنێ؛ هەروەها دەس‌دان لە مووی نامەحرەم و نینۆك و ددانی زەرەری نییە.

(چوارەم)، گەیشتنی بەری دەستی یەکێکە بە پێستی پاش و پێشی خۆی یا کەسێکی تر؛ جا ئەگەر ئەمانە نێرو مێیەکەی نامەحرەمن، ئەوە دەس‌نوێژی هەردووکیان ئەشکێ، ئەگینا هەر دەس‌نوێژی خاوەن دەستەکە ئەشکێ؛ هەروەها دەس‌نوێژ ئەشکێ بە دەس‌دان لەپاش و پێشی ئینسانی مردوو و منداڵی بچووك و جێگەی بڕینی زەکەری منداڵ و بە دەس‌دان لە زەکەری شلەپەتکە با بە دەستێ کە شەل بێ، بەڵام زەرەری نییە دەس‌دان لەپاش و پێش بەسەری پەنجە یا بە ناوبەینی پەنجەکان یا دەس‌دان لە بەر و دوای حەیوانات و پەلەوەر.

حەرامە لەسەر بێ‌دەس‌نوێژ نوێژ کردن و تەوافی ماڵی کەعبە و هەڵگرتنی یا دەس‌لێ‌دانی قورئانی پیرۆز یا قایشی بەرگەکەی یا کیف یا سندووقەکەی لەکاتێکا کە قورئانەکەی تیابێ، هەروەها ئەو پارچەیە کە بۆ دەرس‌خوێندنی منداڵ [قورئانی تیا] نووسراوەتەوە، وەکوو تەتەڵەی دار، نەك ئەوەی بۆ دوعا نووسراوەتەوە؛ بەڵام دروستە هەڵگرتنی قورئان لە ناو ئەشیادا، وەکوو پارچەو پۆشاك و شت‌ومەکی عادەتی؛ هەروا دەس‌دان لەو قورئانە کە لە کتێبی تەفسیرا بە تێکەڵی نووسراوەتەوە و هەڵگێڕانەوەی پەڕەکانی بەدار؛ بەڵام منداڵی بێ‌دەس‌نوێژ مەنع ناکرێ لە هەڵگرتن و دەس‌دان لە قورئان.

ئەگەر کەسێ بەتەحقیق ئەیزانی لەمەوپێش دەس‌نوێژی بووە، بەڵام ئێستە گومانی هەبوو لەوەدا کە بێ‌دەس‌نوێژی بەسەرا هاتووە، یاخود بەتەحقیق ئەیزانی لەمەوپێش بێ‌دەس‌نوێژ بووە و ئێستە گومانی هەبوو لەوەدا کە لەدواییدا دەس‌نوێژی گرتبێ، ئەو کەسە، یەقینە پێشووەکەی حسێبە.

ئەگەر بەتەحقیق ئەیزانی لەمەوبەر دەس‌نوێژ و بێ‌دەس‌نوێژی بەسەراهاتووە، بەڵام نەیئەزانی کامیان لەپێشەوە بووە، ئەوە ئەبێ تەماشای حاڵی پێش ئەم دوو حاڵەتە بکا:

ئەگەر لەو کاتەدا بێدەسنوێژ بووە ئێستە بە خاوەن دەسنوێژ ئەناسرێو ئەگەر دەسنوێژی بووە، ئێستە بێدەسنوێژە، بەو شەرتە عادەتی لەسەر تازە کردنەوەی دەسنوێژ بێ، ئەگینا لەم سوورەتا، ئێستە بە خاوەن دەسنوێژ ئەناسرێ.

## ئوسوولّی چوونە سەر ئاو

سوننەتە ئینسان لەو کاتەدا کە ئەڕواتە ناو ئەدەبخانەوە، بڵێت: «**بِسْمِ اللّٰهِ، اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الخُبْثِ و الخَبائِثِ**»، لەو کاتەشا کە دێتە دەرەوە، بڵێت: «**اَلحَمْدُ لِلّٰهِ الذي أَذْهَبَ عَنِّى الْأَذىٰ و عٰافٰاني**»؛ سوننەتیشە کە ئەچێتە ماڵەوە، پێی چەپی بخاتە پێشەوە و کاتێ دێتە دەرەوە، پێی راستی بخاتە پێشەوە و لەکاتی دانیشتنا، هێز بداتە لای چەپی.

کەراهەتی هەیە هەڵگرتنی شتێ کە ناوی خوای لێ نووسرابێ یا ناوی پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران بەو شەرتە مەبەست ئەو زاتە گەورەیە بێ، بەڵام هەڵگرتنی ئەوەی کە قورئانی لێنووسراوە بە قەسدی نووشتە، ئەوە کەراهەتی نییە بەو شەرتە لە شتێ گیرابێ وەکوو موشەمما[1] وەك «ئیمامی نەوەوی» لە کتێبی «المجموع»دا نووسیویەتی.

کەراهەتی هەیە قسەکردن لەسەر ئەدەبخانە بە ناوبردنی خوا و غەیری ئەوەش لەکاتی دەرچوونی پیسایی و لە غەیری ئەو کاتەیشدا[2]. حەرامە رووکردن و پشتکردن لە قیبلە لەسەر قەزای حاجەت لە سەحرادا و کەراهەتیان هەیە لەناو بینادا بەو شەرتە ئەو شوێنی قەزای حاجەتە بەتایبەتی دروست نەکرابێ، ئەگینا بە هەر وەزعێ دابنیشێ ئەوە دروستە و عەیبی نییە. سونەتە ئەوەندە دوور بکەوێتەوە لە خەڵك کە دەنگ و بۆنی نەبیسن. سونەتە خۆی داپۆشێ بە شتێ کە عەورەتی دابگرێ بەو شەرتە کەس نەبێ لەوێ بۆی بڕوانێ ئەگینا خۆداپۆشین واجبە. کەراهەتی هەیە میز کردن لەناو ئاوی راوەستاوا ئەگەرقوللەتەین بێ و حەرامە ئەگەر کەمتر بێ لە قوللەتەین،

---

١. ئەم مەسئەلە لە لاپەڕە ٧٦ی «حاشیەی شێخ سلێمانی مەدەنی»دا لەسەر شەرحی موقەدیمەی «بافضل» باس کراوە.

٢. ئەم مەسئەلە، «إعانه» نەقڵی ئەکا لە «بُجیرمی»یەوە لە لاپەڕە ١٠٩دا.

بەو شەرتە ئەو ئاوە موڵکی خۆی بێ یا موباح بێ، ئەگەر موڵکی یەکێکی تر بێ، ئەوە میز تێ کردنی بە هەموو جۆرێ حەرامە؛ هەروا کەراهەتی هەیە قەزای حاجەت لەسەر رێگایێ کە هاتوچۆی پیابکرێ و لەژێر داری خاوەن بەردا، چ لە کاتی بەر و چ لە غەیری ئەو کاتەدا، هەروا لە شوێنی گردبوونەوە و قسەکردنی خەڵکا بەو شەرتە موڵکی خۆی بێ یا موباح بێ، ئەگەر شوێنەکە موڵکی غەیر بێ، ئەوە بە قەتعی حەرامە تیا دابنیشێ، مەگەر باوەڕی وابێ ئەو خاوەن ئەرزە رازییە. کەراهەتی هەیە میزکردن بە کونی ئەرزا و لە بەرەوڕووی بادا.

واجبە «إستِنجا»: (خۆ پاك کردنەوە لە پیسی) بە ئاو یا بە بەرد و بە هەردووکیان باشترە. ئەگەر بە هەردووکیان بوو، لە پێشا بەرد بەکار بهێنێ، دوای ئەوە بە ئاویش بەرو دوای بشۆرێت. وەك بەرد وایە بۆ ئیستینجا هەرشتێ کە وشك و پاك بێ و پیسی هەڵبکەنێ و حورمەتی نەبێ، نەك بەردی تەڕ و پشقڵ و تەپاڵە و قامیشی ساف و پێستێ کە دەباخی کرابێ.

شەرتی بەکارهێنانی بەرد، ئەوەیە شوێنە پیسەکە وشك نەبووبێتەوە و پیسییەکە لە شوێنی عادەتی لای نەدابێ و شتێکی بێگانەی تری نەهاتبێتە سەر؛ ئەگەر پیسییەکە وشك بووبووەوە، یاخود لە ئەندازەی جێگەی عادەتی لایدابوو، مەسەلا لایدابوو لە تەختەی ئەم بەرەوبەری لاقنگی و تەڕی لەسەری زەکەری تەجاوەزی کردبوو، یاخود شتێکی بێگانەیان بەسەرا هاتبوو، ئەوە پێویستی بە ئاوە.

واجبە سێ جار بەرد بێنێ بەو شوێنەدا بە سێ بەرد یا بە سێ گۆشەی تاقە بەردێ. ئەگەر بەم سێ جارە پاك نەبووەوە، واجبە پاکی بکاتەوە هەرچەندێکی بوێ؛ سوننەتە ژمارەی بەرد پیاهێنانەکان لەم کاتەدا تاق بێ. سوننەتە بە دەستی چەپ ئیستینجا بکا. ئیستینجا پێویست نییە بۆ کرم و بۆ ماددەیێ کە بە وشکی بێتە دەرەوە، هەروا ئیستینجا نییە لە دەرچوونی «با» ئەگەرچی شوێنی دەرچوونیشی تەڕ بێ.

## باسی دەس‌نوێژ

ئەو شتانە کە پێویستن لە دەس‌نوێژا شەش شتن:

(یەکەم)، قەسد و نییەت، مەسەلا لە دڵیا بڵێ: نییەتم هەیە بێ‌دەس‌نوێژی لە خۆم لائەبەم یا نییەتم هەیە ئەو شتانە کە موحتاجی دەس‌نوێژن حەڵاڵیان ئەکەم لە خۆم، یا نییەتم هەیە فەرزی دەس‌نوێژ بەجێ‌بێنم. بەڵام یەکێ کە هەمیشە بێ‌دەس‌نوێژ بێ، وەکوو ژنی «مُسْتَحاضة» کە هەمیشە خوێنی لێ بێ، نابێ نییەتی لابردنی بێ‌دەس‌نوێژی بێنێ، چونکە هەمیشە بێ‌دەس‌نوێژە. ئەگەر یەکێ لەگەڵ قەسدی لابردنی بێ‌دەس‌نوێژیدا نییەتی خۆ فێنك کردنەوەیشی بێ، عەیبی نییە؛ بەڵام ئەگەر نییەتی ئەو شتانەی هەبوو کە دەس‌نوێژ گرتن سونەتە بۆیان، وەکوو قورئان خوێندن، ئەوە کافی نییە. پێویستە ئەم قەسد و نییەتەی ببێ لەگەڵ شۆردنی ئەووەڵ بەشی روخساری، بەم‌مەعنا نییەتەکە لەگەڵ شۆردنی هەرشوێنێکا هەبوو، ئەوە بە ئەووەڵ شوێنی روخساری دائەنرێ لەم دەس‌نوێژەدا. دروستە بڵاوکردنەوەی نییەت بەسەر یەکەیەکەی ئەعزای دەس‌نوێژا، مەسەلا ئەووەڵ جار بڵێ: نییەتم هەیە بێ‌دەس‌نوێژی لە رووم لائەبەم، هەروا تا مەسحی سەر و شۆردنی پێ.

(دووەم)، شۆردنی روخسارە کە بەدرێژی ناوبەینی سەوزبوونی مووی سەرە بە ئەغڵەب و بڕانەوەی هەردوو شەویلەیەتی لە ئاخری چەناکەدا و بە پانییش ناوبەینی هەردوو گوێیەتی؛ جا لەسەر ئەم قەرارە، تەختی تەوێڵی ئینسان، لە دەم و چاوە نەك «نَزَعَتان»، واتە: ئەو دوو شوێنە بێ‌مووە کە بەلای پێشی سەرا بەرز ئەبنەوەو نەك «تَحذیف»، واتە: ئەو دووگوڵە مووە کە وان لە راست و چەپی تەوێڵەوە و هەرزەکارەکان ئەیتاشن. پێویستە لەکاتی شۆردنی روخسارا شۆردنی هەموو ئەجزای برۆ و برژانگ و گێسوو کە بریتییە لە دوو بەستەموو کە بە لای گوێچکەکاندا دێنە خوارەوە؛ کوڵم و سمێڵ و چاڵی چەناکە بە پێست و بە مووەوە، دەر و ناویان واجبە بشۆررێ، بەڵام مووی «عارض»، واتە: روو ـ کە وا لە خواری گێسووەوە ـ هەتا چەناکە و مووی «لِحیة»:

ریش -کە بریتییە لە مووی چەناکە - ئەگەر تەنك بوون، واجبە دەر و ناویان بشۆررێ، ئەگەر پڕیش‌بوون هەر رووی دەرەوەیان واجبە بشۆررێ، تەنانەت ئەوەیشی کە لە ئەندازەی روخسار و چەناکە چووەتە دەرەوە.

(سێهەم)، شۆردنی هەردوو دەستە لەگەڵ هەردوو ئەنیشکا، جا ئەگەر بەعزێ لە دەستی کابرا بڕابو، پێویستە ئەوەی کە ماوە بیشۆرێ؛ ئەگەر لە ئەنیشکابڕابوو، پێویستە سەری ئێسقانی قۆڵی بشۆرێ، بەڵام ئەگەر لە ژوورترەوە بڕابوو، ئەوە شۆردنی باقییەکەی فەرز نییە بەڵکوو سونەتە.

(چوارەم)، مەسحی سەرە، واتە بە دەستێ کە تەڕ کرابێ بە ئاوێکی تازە دەست بهێنێ بەسەریا چ بەسەر پێستەکەیا یا بەسەر مووەکەیا بەو شەرتەکە ئەو مووە لەسەر سنووری سەر لای‌نەدابێ؛ ئەگەر لەباتی مەسحی سەر سەری بشۆرێ، ئەوە باشترە؛ کافیشە ئەگەر دەستێکی تەڕ دانێ لەسەر مووەکان بێ‌ئەوەی دەستی بەم‌لاولادا بجووڵێنێتەوە.

(پێنجەم)، شۆردنی هەردوو پێیە لەگەڵ هەردوو قاپەکانا.

بزانن! پێویستە لەگەڵ شۆردنی ئەم ئەعزایانە کە بەیانمان کردن بە قەد موویێ لە ئەعزا دراوسێکانیش بشۆررێن بۆ ئەوە کە شۆردنی ئەمانە بەشەرع جێ‌بەجێ بێ.

(شەشەم)، تەرتیبە، یانێ بەجێ‌هێنانی ئەم ئادابە بەپێی ئەم ریزەی کە بەیانمان کرد. بەڵام ئەگەر کەسێکی بێ‌دەس‌نوێژ بە نییەتی رەفعی حەدەس، خۆی کرد بە ئاوێکا و هەموو لەشی تەڕ بوو و گورج هاتەدەرەوە، ئەوە لە باتی دەس‌نوێژ کافییە بۆی. ئەگەر یەکێ لەم ئەعزایانەی لەبیر چوو، پێویستە بگەڕێتەوە بۆی بیشۆرێ و هەرچی کەوتووەتە دوای تەرك کراوەکە، ئەبێ ئەوەش بشۆرێتەوە. ئەگەر لەناو دەس‌نوێژەکەیا شکی کەوت لە تەرك‌کردنی فەرزێکا لە فەرزەکانی دەس‌نوێژ، پێویستە بیکاتەوە و هەرچی‌وا لە دوای ئەوەیشەوە، ئەگەر کردوویە بیکاتەوە؛ ئەگەر ئەم گومانەی لەپاش تەواوکردنی دەس‌نوێژەکە بوو، ئەوە ئیعتیباری پێ‌ناکرێ، مەگەر شك لە تەرکی نییەتا، ئەوە گەرەکە بۆی بگەڕێتەوە و سەرلەنوێ دەس‌نوێژەکەی بگرێتەوە.

سوننەتە بۆ دەس‌نوێژگر لە ئەووەڵەوە، «بسم اللّه» بکا، ئەگەر لە ئەووەڵەوە تەرکی کرد. لەناو دەس‌نوێژەکەدا بیکا. سوننەتە بەر و پشتی هەردوو دەستی بشۆرێ بەر لە دەس‌نوێژ، بەڵکوو ئەگەر شکی بوو لە پاکی دەستیا، کەراهەتی هەیە بیکا بە ناو ئاوی دەستاوی کەمتر لە قوللەتەیندا. سوننەتە سیواك بکا بە شتێکی زبر بەو شەرتە شتەکە پاك بێ، هەر پەنجەی خۆی نەبێ. ئەبێ ئەم سیواکە بهێنێ بە باری پانی دانەکانیا لە دەر و ژوورەوە و بە باری درێژیی زمانیا، هەروا سیواك سوننەتە لەکاتی نوێژکردن و لەکاتی هەستان لە خەو و لەکاتی گۆڕانی تامی دەمدا مەگەر بۆ کەسێ بەڕۆژوو بێ لەپاش نیوەڕۆ، ئەوە کەراهەتی هەیە.

سوننەتە ئاو لە دەم و لووت رادا بە سێ لالەوێچ بە هەر لەوێچێکیان جارێ ئاو رادا بە دەمی و لەپاش ئەوە، ئاو رادا لە لووتیشی سوننەتە پەنجە بخاتە بەینی مووی ریشیەوە ئەگەر پڕ بێ و دەست بخاتە بەینی پەنجەکانی دەست و پێی و لە هەموو غوسڵ و کردەوەیەکی دەس‌نوێژا لای راست بخاتە پێشی لای چەپەوە و موبالەغە بکا لە ئاورادانی دەم و لووتیا، مەگەر لە وەختی رۆژوودا و درێژە بدا بە شۆردنی ناو چاوی و هەردوو دەست و هەردوو پێی. سوننەتە مەسحی هەموو سەری بکاو هەردوو گوێچکەیشی لەپاش سەر مەسح بکا، ئەگەر لابردنی کڵاوەکەی گران بوو، مەسحەکە بەسەر کڵاوەکەیا تەواو بکا.

سوننەتە سێ جار کردنەوەی شۆردن و مەسحی ئەعزای دەس‌نوێژ. سوننەتە زۆر مولاحەزەی چرچ و لۆچی روخسار و دەست و پێ و پاژنەو ئەنیشك و سەر و قنگی چاو و بەری لووتی بکا. ئەگەر لە ژمارەی غوسڵ و مەسحا کەوتە شکەوە باوەڕ بەو بارە بکا کە بەلایەوە راستە. سوننەتە بە بێ‌بەهانەی شەرعی، یارمەتی لە کەس وەرنەگرێ لە دەس‌نوێژ گرتنا. هەروەها سوننەتە رووی تیا بکاتە قیبلە و قسەی دنیایی تیا نەکا. سوننەتە لە دەس‌نوێژا ئاوی دەستی هەڵنەوەشێنێ و بە بێ‌بەهانە خۆی وشك نەکاتەوە.

سوننەتە لەپاش دەس‌نوێژەکەی روو بکاتە قیبلە و هەردوو دەستی بەرزەوە بکا و بڵێت: «أَشْهَدُ أَنْ لاٰ إِلٰهَ إِلّااللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَ أَنَّ سَيِّدَنا مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ

رَسُولُهُ؛ اَللَّهُمَّ اجْعَلْني مِنَ التَّوّابينَ وَاجْعَلْني مِنَ المُتَطَهِّرِينَ، سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وَ بِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاٰ إِلٰه إِلّا أَنتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَ أَتوبُ إليكَ» و هەر لە حـاڵی بـەرەو قیبلەدا سوورەتی «إِنّا أَنْزَلْنا» بخوێنێ، بەڵام دەستی بەرز نەکاتەوە.

## باسی دەس‌هێنان بە تەڕی بەسەر خوفدا لەباتی شۆردنی پێ

دروستە مەسحی خوف لە دەس‌نوێژدا لەباتی شۆردنی پێ لەماوەی شەوو ڕۆژێکدا بۆ نیشتەجێو، بۆ ماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژ بۆ سـەفەریی (ڕێبـوار). ئـەم مـاوەیە، حیساب ئەکرێ لە ئاخری ئەو بێ‌دەس‌نوێژییەوە کە لەپاش لە پێ‌کردنی خوفەکانەوە بەسەریا دێت. ئەگەر بە نیشتەجێیی خوفی لە پێ‌کرد جا بوو بە ڕێبوار، یا پێچەوانەی ئەمە، ئەوە لەم دوو وەزعەدا نابێ ماوەی ڕێبوار تەواو بکا، بەڵکـوو ئـەو مـاوەیە کـە خوفەکەی تیا پۆشیوە: ئەگەر کەمترە لە شەو و ڕۆژێ، ئەوە شەو و ڕۆژەکە تەواو بکاو ئەگەر ڕێکە ئەوە تەواوە. وە ئەگەر زیاترە ئیتر خوفەکە فڕێبداو ئەو ماوە زیادەیەی بۆ قەبووڵ ئەکرێ چونکە بە عەزمی ڕێبواری لە پێیدا بووە، وەکوو لە «تُـحفە»دا بـەیان کراوە.

شەرتی خوف ئەوەیە:

(یەکەم)، پاك بێ؛

(دووەم)، شایانی ئەوەبێ کە یەك لە شوێنی یەك هاتوچۆی پێ‌بکرێ بۆ ئەو ئیشانە کە پێویستی ڕێبوارن وەکوو بارخستن و دارچنینەوە لەو ماوەیەدا کە خوفەکانی وا لە پێدا؛

(سێهەم)، داپۆشەر بێ بۆ هەر شوێنێکی پێی کە شۆردنی فەرز بێ؛

(چوارەم)، ئەگەر ئاو بکەی بەسەریا دای‌نەدا بۆ پێی لە غەیری جێگە تەقەڵ و کونی قۆپچەوە، یانێ ئەگەر تەنراوە، ئەبێ ئەوەندە سفت بێ ئاو دانەدا. وە ئەگەر نەتەنراوە، ئەبێ قایم بێ وەکوو قایش و لباد و موشەممایێ کرابێ بە خوف. ئەگەر پارچە قایش بپێچێ بە پێیەوە و بە بەن قایمی بکا، ئەوە دروست نییە، چونکە ئەوە لە عورفا ناوی

خوف نییە، بەڵام دروستە مەسحی خوفێ کە پاژنەکەی لەت بووبێ و بە دەزوو یا بە قۆپچە قایم کرابێتەوە؛

(پێنجەم)، لەپاش تەواوبوونی دەسنوێژەکە بکرێتە پێ؛

(شەشەم)، لە ماوەی ناوبراو لانەدا؛

(حەوتەم)، لە ناوەندی ماوەکەدا دانەکەنرێ لە پێ؛

(هەشتەم)، مانیعێکی وەکوو لەش پیسی بەسەرا نەیێ.

ئەگەر ئینسانێ دوو خوفی یەك لەسەر یەك کردە پێ، ئەوە یا هەردوو خوفەکان زەعیفن یا هەردوو ئەستوورن یا سەرووەکە زەعیفە و ژێرووەکە ئەستوورە یا پێچەوانەی ئەمەیە؛ لە یەکەم حاڵا مەسحی هیچیان بەکار نایێ، لە دووەم و سێهەما پێویستە مەسحی ژێرووەکەیان بکرێ، لە چوارەما مەسحی سەرووەکەیان ڕەوایە و مەسحی ژێرووەکەیان بەکار نایێ.

کافییە بۆ مەسحی خوف ئەوەندەکە ناوی مەسح بێ لەسەر ئەو شوێنەکە شۆردنی فەرزە، مەگەر ژێرپێ و لاپێ و پاژنە، ئەوە مەسحی ئەمانە بەکار نایێ و سوننەتە مەسحی پشت و بەری پێ بە چەند خەتێ.

## باسی غوسڵ

ئەو شتانەکە ئەبن بەهۆی فەرزبوونی غوسڵ، یانێ شۆردنی هەموو لەش، شەش شتن:

(یەکەم)، مردنە، هەرکەسێ کە مرد، گەرەکە بشۆررێ مەگەر شەهیدی ناو شەڕی کافران؛

(دووەم)، رزگاربوونی ژنە لە خوێنی حەیز؛

(سێهەم)، رزگاری بوونیەتی لە خوێنی «نِفاس» منداڵ بوون؛

(چوارەم)، منداڵ لێبوونە هەرچەند تەڕی و خوێنی لەگەڵا نەبێ؛

(پێنجەم)، لەش پیسییە کە پەیدا ئەبێ بە تێچوونی سەری زەکەری ئینسانێ یا حەیوانێ، ئەوەی کە لە خەتەنەدا پێستی پێوە نامێنێ یا ئەندازەی ئەوە لە باقی زەکەری

یەکێ کە سەری نەمابێ بۆ ناو پێش یا پاشی ئینسانێ یا حەیوانێ، زیندوو بێ یا مردوو، چ ئەو زەکەرە بە خاوەنەکەیەوە بێ یا بڕابێ؛ بەڵام ئەگەر بڕابێ ئەوە غوسڵ لەسەر خاوەن زەکەرەکە نییە. جا ئەگەر هەردوولا موکەللەف بن، ئەوە غوسڵ بۆ هەردوو پێویستە، ئەگینا هەر لەسەر ئەویانەیە کە موکەللەفە؛

(شەشەم)، دەرچوونی «مەنی» تۆوی خۆیەتی لە ئەووەڵ جارا لە ڕێگەی عادەتی و غەیرە عادەتییەوە بەو جۆرە کە باسی دێت؛ دەرچوونی مەنی بە چوار جۆرە:

یەکەم، ڕێگەی عادەتی گوشاد بێ و مەنییەکە لەوێوە دەرچێ؛ ئەمە، ئەبێ بەهۆی غوسڵ هەرچۆن بێ، واتە ڕەنگی مەنییەکە عادەتی بێ یا سوور بێ وەکوو خوێن، لەبەر نەخۆشی دەرچێ یا لەگەڵ ساغی لەشدا، بەو شەرتە یەکێ لە نیشانەکانی تیابێ؛

دووەم، ڕێگەی عادەتی گوشاد بێ، بەڵام مەنییە کە لە ڕێگایەکی ترەوە دەرچێ؛ ئەمە ئیعتیباری نییە بە هیچ نەوعێ؛

سێهەم، ڕێگەی عادەتی گیرابێ و مەنییەکە لە خوار پشتی پیاو و لەژێر ئێسقانی سنگی ژنەوە دەرچێ، ئەمە ئەبێ بەهۆی غوسڵ، بەو شەرتە «مُسْتَحكم» بێ یانێ لەبەر نەخۆشی نەبێ و ڕەنگیشی عادەتی بێ؛

**چوارەم**، ڕێگەی عادەتی گیرابێ و مەنییەکە لە غەیری ئەو دوو شوێنەوە وتمان بێتەدەرەوە، یا لەبەر نەخۆشی بێ یا ڕەنگی عادەتی نەبێ، ئەمەیش ئیعتیباری نییە.

وتمان مەنی خۆی، لەبەر ئەوە ئەگەر یەکێ بڕواتە لای ژنی خۆی و ژنەکە مناڵ بێ، ئەوە لەدوای ئەوە کە ژنەکە غوسڵی ئەو جیماعەی کرد، مەنی مێردەکەی لە عەورەتی بێتەدەرەوە، نابێ بەهۆی ئەوە کە جارێکی تر غوسڵ بکا؛ وتیشمان لە جاری ئەووەڵا، لەبەر ئەوە ئەگەر یەکێ لەپاش ئەوەی مەنی لێ‌دەرچوو ئەو مەنییە بە ئەسبابێ بکاتەوە ناو زەکەری و جارێکی تر بێتە دەرەوە، ئەوە نابێ بەهۆی غوسڵێکی تر.

پێویستە بزانین ئەگەر ئینسانێ مەنی هاتەدەرەوە و خۆی شۆری، لەدوای ئەوە میزی کرد و بەهۆی میزەکەوە مەندەی ئەو مەنییە لە زەکەری بێتەدەرەوە، ئەوە پێویستە غوسڵێکی تر بکا؛ جا لەبەر ئەوە، سوننەتە ئینسان لەپاش دەرچوونی مەنی میز بکا بۆ ئەوە کە زەکەری لە مەنی پاك ببێتەوە، وەکوو لە «إعانة»دا بەیانی کردووە.

نیشانەی مەنی، سێ شتە:

یەکەم، ئەوەیە کە هەڵقوڵێ؛

دووەم، ئەوەیە بە دەرچوونی مەنییەکە خاوەنەکەی لەزەتی پێبگا؛

سێهەم، ئەوەیە لەکاتی تەڕیدا بۆنی هەویر و لەکاتی وشکیدا بۆنی سپێنەی هێلکە بدا؛ ئەگەر هیچکام لەم سیفەتانەی تیا نەبوو، ئەوە غوسڵ واجب نابێ. حەرامە بە لەش‌پیسییەوە هەرچی کە بە بێ‌دەس‌نوێژی حەرام بوو؛ هەروەها راوەستان و مانەوە لە مزگەوتا، بەڵام رێبواری بەناو مزگەوتا رەوایە؛ هەروەها حەرامە قورئان خوێندن، بەڵام ئەوەی کە زیکر بێ، دروستە بە قەسدی زیکر نەك بە قەسدی قورئان، وەکوو: ﴿سُبحانَ الَّذي سَخَّرَ لَنا هذا﴾، لە کاتێکا کە سواری وڵاخ ئەبێ.

غوسڵ، لای کەم و زۆری هەیە؛ لاکەمەکەی ئەوەیە لە ئەووەڵەوە نییەتی لابردنی، لەش پیسی یا حەڵاڵ کردنی نوێژ یا بەجێ‌هێنانی فەرزی غوسڵ بێنێ [و]هەموو لەشی بە پێست و مووەوە بشۆرێ، ئیتر واجب نییە ئاو لە دەم و لووتی رادا؛ لازۆرەکەشی ئەوەیە لەپێشا هەرچی چڵك و چەپەڵییە لە لەشی خۆی لابدا، پاشان دەس‌نوێژێکی تەواو بگرێ، جا دەس بخاتە چرچ و لۆچی لەشی، جا ئاو بکا بەسەریا و دەس بخات لەسەری، ئەوجا ئاو بکا بەلای راستیا، پاش ئەوە ئاو بکا بەلای چەپیا و باش دەس بخا لە ئەعزای لەشی و سێ جار ئەم بەکارهێنانی ئاوە بەجێ‌بێنێ.

ئەگەر ئەوکەسەی خۆی ئەشۆرێ، ژنی خاوەن حەیز بوو، شتێکی بۆن خۆشی وەك میسك بپێچێ لە لۆکەوە و بیخاتە فەرجیەوە. تازەکردنەوەی غوسڵ سوننەت نییە، بەڵام تازەکردنەوەی دەس‌نوێژ سوننەتە.

پێویستە بۆ غوسڵ بەینی هەرچی موو وا لە ئەعزای ئینسانا وەکوو برۆو گێسوو و ریشی پڕو مووی سەر و سنگ و مووی بەر، هەمووی بشۆرێ. پەلکەی ژن ئەگەر ناوەکەی تەڕ نەدەبوو بە بێ‌کردنەوە، فەرزە بیکاتەوە بۆ ئەوەی ناوەکەی بشۆرێ. هەر موویێ خۆی لەخۆیەوە لوول بوو، شۆردنی دەرەوەی بەسە. عەفو ئەدرێ لە شوێنی رشك یا چنگنەیێ لکابێ بە بێخی مووەکانەوە ئەگەر تاشینی ئەو مووە عەیبی تیابێ

وەکوو ریشی پیاو و سەری ژن، ئەگینا فەرزە بتاشرێن بۆ ئەوەکە ئەو شوێنانە هەموو تەڕ ببن. واجبە شۆردنی بنی نینۆك و هەرچی بەدەرەوەیە لەکڕاکەی گوێ و ئەو شوێنانەی بەرودواکە لەکاتی دانیشتنا دەرئەکەون و ژێری ئەو پێستەی وا بەسەری زەکەرەوە بۆ کەسێ کە خەتەنە نەکرابێ، بەڵام ناوی چاوو دەمو لووتو ئەوەی کە دیار نییە لە کڕاکەی گوێ، شۆردنیان واجب نییە، هەرچەند ئەگەر پیس بن نوێژیان پێ بەتاڵ ئەبێتەوە.

ئەگەر یەکێ لەوانەی غوسڵیان لەسەر فەرزە پیسی بە لەشیەوە بوو و بە یەكجار ئاو بەلەشاکردن ئەو پیسییە لائەچوو، ئەوە بەسە یەكجار ئاو بکا بە خۆیا بۆ لابردنی لەشپیسی و لابردنی ئەو پیسییە؛ ئەگەر بە جارێکیش لانەئەچوو، گەرەکە لەپێشا پیسییەکە لا ببا جا بە نییەتی لابردنی لەش پیسی ئاو بکا بە خۆیا.

ئەگەر کەسێ غوسڵی کرد بە قەسدی لابردنی لەشپیسیو بەجێ هێنانی سوننەتی غوسڵی جومعە، ئەوە هەردووکیانی بۆ بەجێدێت، ئەگەر تەنیا بە نییەتی یەکێکیان خۆی شۆری، هەر ئەوەی بۆ بەجێدێت.

ئەگەر یەکێ بێدەسنوێژ بوو و جەنابەتیشی بەسەرا هات یا بە پێچەوانەوە، ئەوە یەك غوسڵ بە نییەتی لابردنی جەنابەت بۆ هەردووکیان بەسە.

## باسی ئەو شتانەکە پیسن

هەرشتێکی ئاوەکی کە ئینسان سەرخۆش بکا، لە شەرعدا بە پیس ئەناسرێ، وەك هەموو ئەنواعی شەراب. لەگیانلەبەری زیندووشدا، سەگ و بەراز و بەچکەیان پیسن، هەروەها هەموو مردوویەك تەنها مردووی ئادەمی و ماسی و کولە نەبێ. هەرچی لە پێش و پاشی گیانلەبەر دەرچێ، وەکوو شیاکە و پشقڵ و میز و مەزی ـکە ئاوێکی تەراوی لینجە و لەکاتی هێرشی ئارەزووەدا پەیدا ئەبێ ـ و وەزی ـکە ئاوێکی خەستی سپییە لەکاتی وشکی میزاج و هەڵگرتنی شتی گرانا پەیدا ئەبێ ـ پیسن، بەڵام مەنی هەموو گیانلەبەرێ پاکە، تەنها مەنی سەگ و بەرازو بەچکەیان نەبێ. شیری هەر گیانداری گۆشتی نەخورێ پیسە، شیری ئینسان نەبێ.

هەروەها هەر پارچەیێ لە زیندوو جیابیێتەوە، وەکوو مردووەکەی وایە، ئەگەر مردووەکەی پاك بێ ئەو پارچەیشە پاکە، وەکوو پارچەی کوللە و ماسی و ئینسان؛ ئەگەر مردووەکەی پیسە، ئەو پارچەیشە پیسە، وەکوو پارچەیێ لە دووگی مەڕ کە بە زیندوویی لێی جیابیێتەوە؛ کەوابێ، عەرەقی هەموو وڵاخێ پیسە، هەروا مووی کەر و هێستر کە جیا بووەوە پیسە، بەڵام مووی حەیوانێ گۆشتی بخورێ، وەکوو مەڕ و بزن و وشتر و پەڕی پەلەوەرێ گۆشتی بخورێ، وەکوو کەو و قاز و مریشك، ئەوە پاکە.

ماددەی منداڵ ـ کە هێشتا پارچە خوێن یا پارچە گۆشت بێ ـ ئەگەر لە سکی ژن داکەوێ، بە پاك ئەناسرێ. هەروا تەڕایی فەرجی ژن ئەوەی لەکاتی دانیشتنا دەرکەوێ، پاکە.

هەرشتێ خۆی پیس بێ، بەقەتعی، پاك نابێتەوە، مەگەر دوو شت:

(یەکەم)، شەرابێ کە ببێ بە سرکە بێ ئەوەی شتێکی تێبخرێ، ئەگەر ماددەیەکی بێگانەی تێکەوت، ئەوە سرکەکەی پیسە، هەرچەند نەشبێ بەهۆی پێگەیشتنی سرکەکە، بەڵام زەرەری نییە بۆ پاکی ئەو شەرابەکە ئەبێ بە سرکە، لقە وردە و گەڵای مێو و چرۆی بۆڵەترێکان و ناوکی دەنکەترێ و ناوکی خورما و مێوژو ئاوێکی وا کە پێویست بێ بۆ گوشینی خورما و مێوژ یا بۆ زۆر گوشینی دەنکەترێ، ئەمانە سرکە پیس ناکەن لەسەر ئیختیاری «امامُ الحرمین»[1] و «قاضي حُسین» و «بغوي» و «بلقیني» و گەلێکی تر لە ئیمامانی شەرع لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا و تەقلیدی ئەم ئیمامانە و شوێن کەوتنیان دروستە:

(دووەم)، پێستی حەیوانی مردوو، غەیری سەگ و بەراز؛ ئەمە دەر و ناوی پاك ئەبێتەوە بەهۆی دەباخەوە، بەڵام پێویستە دەباخەکەی بە دەرمانێکی وابێ هەموو گۆشتی زیادەی ئەو پێستە بڕزێنێ و لای ببا، کەوابێ، دەباخ بە هەتاو و خۆڵەمێش و گڵ ئیعتباری نییە و کاتێ کە پێست دەباخیی وەرگرت، وەکوو جلێ کە پیس بووبێ، پێویستە بشوررێ، ئیتر بەتەواوی پاك ئەبێتەوە.

---

١. ئەم حوکمە، «شیروانی» نەقڵی ئەکا.

هەرشتێ پیس بووبێ بەهۆی لێکەوتنی سەگ و بەراز و بەچکەیانەوە بە تەڕی، پێویستە حەوت جار بشۆررێ و جارێ لەمجارانە بە گڵاو بێ و شەش جاریان بە ئاوی رووت؛ پێویستە گڵێکی پاکیوا بهێنرێ پێشان بەکار نەهێنرابێ لە تەیەمموم‌دا، ئەوەندە کە ئاوەکە لێڵ بکاو بگەیێ بە هەموو ئەجزای شتە پیسەکەدا؛ ئاوێ کە خۆی لێڵ بێ وەکوو لافاوی چەمەکان، لەباتی گڵاو بەسە. کەوابێ، گڵێ کە پیس بێ یا بەکار هێنرابێ لە تەیەمموم‌دا، بەکار نایێ، هەرواگڵێ کە تێکەڵی شتێکی تەڕ بووبێ غەیری ئاوی رووت، بێ‌سوودە. ئەگەر ماددەیەکی پیس بە شوێنەکەوە بوو، ئەوە لابردنی ئەو ماددەیە بە هەر چەند جار بێ، هەر بە جارێ ئەژمێررێ. ئەگەر ئەو ئاوەکە ئەکرێ بە شوێنە پیسەکەدا، پاش لێکەوتنی، پرژی پەڕی و دای لە شوێنێ، ئەوە ئەگەر لە جاری یەکەمایە، پێویستە شەش جار بشۆررێ، ئەگەر لە جاری دووەمیشایە، هەر بەم شێوەیە پێنج جاری ئەوێ. ئەگەر ئەم پرژە لەپاش جاری گڵاوەکە بوو، ئیتر بۆ ئەم شوێنە گڵاو پێویست نییە، ئەگینا گڵاوی ئەوێ.

هەرچی پیس بووبێ بە میزی مناڵێکی نێرینەی کەمتر لە دوو ساڵ کە بۆ خواردەمەنی غەیری شیر هیچی نەخواردبێ، ئەوەندە ئاوی لێ ئەپرژێنرێ کە شوێنی میزەکە دابگرێ، ئیتر جاری بوونی ئاو بەسەر شوێنەکەدا پێویست نییە، ئەگینا پێویستە ئاو بەسەریا جاری ببێ؛ هەروا هەرشتێ پیس بووبێ بە غەیری سەگ و بەراز و بە غەیری میزی ئەو منداڵە نێرینە؛ جا ئەگەر ئەو پیسییە عەینی هەیە، پێویستە ئەو عەینە لابرێ و تامی نەمێنێ، بەڵام زیانی نییە مانەوەی رەنگێ یا بۆنێ کە لاچوونیان گران بێ، بەڵێ ئەگەر تام و رەنگ بەیەکەوە بمێنن، ئەوە زیانی هەیە و ئەو شوێنە هەر بە پیس ئەناسرێ.

هەر ئاوێ جیا ببێتەوە لەو ئاوەکە شتی پیسی پێ شۆراوە، ئەگەر نەگۆڕابێ و شوێنە پیسەکە پاك بووبێتەوە، ئەوە ئەو ئاوە پاکە، ئەگینا پیسە.

ئەگەر شتێکی پیس کەوتە ناو رۆنێ یا ماستێکی توندەوە، ئەوە هەر ئەوە پێویستە کە شتە پیسەکە لابرێ و هەر جوزئێ لەوەکە لکاوە بە پیسییەکەوە فڕێ بدرێ؛ ئەگەر

ڕۆنەکە ئاوەکی بێ، ئەوە هەمووی پیس ئەبێ و قابیل نییە پاك بکرێتەوە؛ تونـد ئەوەیە ئەگەر بەعزێکی لێ لابرێ، زوو جێگەکەی پڕ نەبێتەوە.

## باسی چاوپۆشی شەرع لە هەندێ پیسی

بە شەرعی پیرۆز، هەرشتێ کە بە زاهیر پیس بێ و لە ئەسڵا پاك بێ، وەکوو بەرگی مەیچی و زبڵچی و کافری بەرازخۆر، ئەوە بە پاك ئەناسرێ تا بەراستی لە پیسیی ئەو شتە خەبەردار ئەبین؛ لەسەر ئەم ئەساسە، ئەگەر یەکێ چاوی کەوت بە سەگێ دەمی لە کاسەیەك هەڵبڕی، مادام دەمی تەڕ نەبێ، نابێ ئەو کەسە ئەو کاسەیە بە پیس بزانــێ؛ ئەگەر پشیلەیێ دەمی پیس بوو و ماوەیێ لەپێش چاو ون بــوو کــە مــومکین بــێ‌لەو ماوەیەدا دەم بکا بە ئاوێکی زۆرا، ئەوەکاتێ هاتەوە و دەمی خستە ئاوێکەوە، ئەو ئاوە بە پیس ناناسرێ.

هەروا، لە ئوسووڵی شەرعە: «کاتێ ئیش کەوتە تەنگانەوە، ئەبێ چاوپۆشی بــێتــە مەیدانەوە»؛ لەسەر ئەم ئەساسە، هەندێ شتی‌وا هەیەکە پیسن لە لەش و بەرگی ئینسانا یا لە خواردەمەنیدا یا لە ئاو و مزگەوت و شوێنی عیبادەتا، لەگــەڵ ئــەوەیشا شــەرع سەرفی نەزەر لەو پیسییانە ئەکا.

مەسەلا، لە بەشی یەکەم، ئەو خوێنەی بلکێ بە بەرگی ئینسانەوە بەهۆی جوانەزەوە و برین‌و دومەڵ‌و شوێنی خوێن گرتن‌و کەڵەشاخ گرتنەوە و ئەو ئاو و کیمەی لەم برینەدا پەیدا ئەبێ و ئاوی بلۆقێ کە بۆگەن بووبێ، کەم بێ یا زۆر بێ، با بە دەسکاری خۆیشی بێ لەبەر ناچاری بۆ خوراندن و دەس تێ‌خستن لەبەر نووستن و هەڵسووڕان، ئــەوە سەرفی نەزەری لێ ئەکرێ‌و عەفوی لێ ئەدرێ.

هەروا عەفو ئەدرێ لەو خاڵانە کە لەسەر دەست و دەم و چاو کوتراون، بەو شەرتە ئەگەر هەڵبکەنرێن یا بسووتێنرێن، لەکەیەکــی نــاشیرین لە روخســارا دەرکــەوێ یــا برینێکی نابار لە شوێنەکەیا پەیدا ببێ. عەفویش ئەدرێ لە ئێسقانی پیس کە دەســتی شکاوی پێ بگیرێتەوە، بەو شەرتە ئێسقانی پاك دەس‌نەکەوێ و دوکتۆرێکــی بــاوەڕ پێ‌کراو بە مەسڵەحەتی بزانێ.

هەروا، خوێنی پووك بۆ ئەو کەسەی کە موبتەلا بێ، عەفوە و مـانیعی نـوێژ نـییە، تەنانەت ئەگەر رۆژووەوان لەگەڵ تفا قووتی بدا، رۆژووەکەی پێ ناشکێ. عەفو ئەدرێ لە تەڕی پێ وگۆرەوی کە بەهۆی ناوی کەوشەوە ئاوی پیس وەربگرێ لە زستانا، مادام بە ئاسانی چار نەکرێ؛ هەروا، عەفو ئەدرێ لە ئاوی دەمی ئینسان کە لە مەعیدەوە بێتە دەرەوەو لە کەمێ خوێن کە لە فەرجی ژنی «مُسْتَحاضة» وە دەرچێ لەپاش ئاخنین و بەستنی و لە کەمێ لە میز بۆ یەکێ موبتەلای میزەچرکێ بێ بەردەوام و لە ئاساری پیسی شوێنی «استنجاء» ئەگەر بەهۆی عارەقەوە بڵاو بێتەوە.

عەفو ئەدرێ لە کەمێ بوخار یا دووکەڵی شتی پیس کە بدا لە لەش و بەرگی ئینسان بە تەڕی؛ هەروا، لە خوێن و پیسی کێچ و ئەسپێ بە لەش و لیباسەوە با زۆریش بووبن بەهۆی عارەقەوە؛ عەفویش ئەدرێ لە عارەق و تووکی وڵاخ کە ئەلکێ بە لەش و لیباسی سوارەوە لەکاتی سواریداو لە مەمکی دایك کە ئەیخاتە دەمی منداڵێکی شیرەخۆریوا کە بڕشێتەوە؛ هەروا، لە سنگ و بەرۆکی ئەو ژنە کە منداڵە پیسەکەی دەمی لێ ئەکوتێ.

عەفو ئەدرێ لە قوڕ و چڵکاوی رێگەیێ کە بە مەعلوومی پیس بێ بەهۆی هاتوچۆی سەگەوە یا بەهۆی شیاکە و پشقڵ و میزو شتی پیسیترەوە؛ هەروەها، لە پرژی ئاوی لاپاساری بان و پلووسکی لاکۆڵان لە شارو دێهاتەکانا ولە شوێنی پێی سەگ و بەراز لە کەژو کێوا لەو شوێنانەدا کە ئینسان بە ناچاری پێیان پیا ئەنێ لە هاتوچۆدا بۆ دار و بۆ راوو ئیش و کاریتری ژیان.

بەڵام، هەموو ئەمانە ئەگۆڕێن بەپێی وەخت و زەمان و بەگوێرەی شوێنی پیسییەکە لە لەش و بەرگی ئینسانا؛ مەسەلا، ئەوەی عەفوی لێ ئـەدرێ لەسـەر داوێنـی ئـینسان، عەفوی نییە لەسەر سەرو ئەوەی عەفوی لێ ئەدرێ لە زستان و بەهاری تەڕو تووشدا، عەفوی لێ نادرێ لە هاوین و کاتی خۆشیدا.

لە بەشی دووەما، عەفو ئەدرێ لە کەمێ خوێنێ مابێتەوە بەسەر گۆشتی حەیوانـی سەربڕاوەوە و رەوایە بە بێ شۆردن ئەو گۆشتە بخرێتە مەنجەڵەوە. عەفو ئەدرێ لە کرمێ کەوا لەناو سەوزەو میوەدا بێ وەکوو کاڵەك و سێوو هەرمێ و میوەیتر ئەگەر لە میوەکە

جیا نەبووبێتەوە؛ هەروا، لەو هەنگوینەکە لەناو دووبەرەدا ئەلکێ بە تەپاڵەی پوورەکەوە و لە میزو شیاکەی حەیوانی گێرە کە ئەکەوێتە ناو خەرمانەوەو لە پشقڵی بزنو مەڕ و مانگا کە ئەکەوێتە ناو کاسەی شیر لەکاتی حەیوان دۆشینا.

عەفو ئەدرێ لەو پیسییە کە وا بە پێی ئەو مێشانەوە ئەنیشنەوە لەسەر خواردەمەنی تەڕو لەو دەعبایانە کە خوێنی ڕەوانیان نییەو ئەمرن لەناو خواردەمەنیدا وەك چایی‌و دۆو دۆشاوو چێشتی تەڕ، وەکوو مێش‌و مێشوولە و هەنگ و زەردەواڵە و پەپوولە، نەك وەك مشك و مار و قرژانگ و بۆق، ئەمانە عەفویان لێ‌نادرێ.

عەفو ئەدرێ لەو پیسییە کە وا بە پێ و پاشی مشکەوە کە بکەوێتە ناو خواردەمەنییەکی تەڕ و بە زیندوویی لێی دەرچێ؛ عەفو ئەدرێ لە دووکەڵی تەپاڵە و پشقڵ کە لە تەنوورا بەرز ئەبێتەوە و ئەدا لەو نانەی ئەدرێ بە تەنوورەکەوە [و] لەو گۆشتەی بەو تەنوورە ئەبرژێت ئەگەر بە شتێکی وشك رووی تەنوورەکە بماڵرێ [و هەروەها] لەو گۆشتەی کە بە ئاوی پیس بکوڵێ و ئاوە پیسەکە هەڵمژێ بەو شەرتە لەپاش کوڵان ئاوێکی پاکی پیا بکرێت؛ عەفو ئەدرێ لە هێلکەی هەموو پەلەوەر و گیانلەبەرێ کە گۆشتی نەخورێ مەگەر هێلکەی ئەو شتانە کە ژاریان هەیە، وەکوو مار؛ عەفو ئەدرێ لەو پەنیرە کە بە ژێلاوکی کارژەلە ئەگیرسێ.

لە بەشی سێهەما، عەفو ئەدرێ لە پیسی مشك و شەمشەمەکوێرە کە ئەکەوێتە ناو ئاوی ئاودەستخانە یا ئەکەوێتە ناو بیرەوە؛ لەو ریقنە چۆلەکەیە کە ئەکەوێتە سەر بەردە نوێژ و بەرماڵ و فەرشی مزگەوت؛ لەو قوڕە کە بە ئاوی پیس ئەگیرێتەوە و دیواری خانووی عادەتی یا دیواری مزگەوتی پێ‌دروست ئەکرێ؛ عەفو ئەدرێ لەوە کە ئینسان بە تەڕی بکەوێ لەو دیوارانە.

ئەمانە نموونەیێ بوون لەو شتە پیسانە کە عەفویان لێ‌دراوە. درێژەی ئەم باسە لە کتێبە گەورەکانا نووسراوە. (مع العلم) ئایینی پیرۆزی ئیسلام، گەلێ ئەمر و فەرمانی داوە بە تێکۆشان بۆ پاکی لەش و بەرگ و خواردەمەنی و فەرش و نوێن و ئەو قاپ و قاپخانەی کە ئینسان ناچارە بۆ بەکارهێنانیان.

## باسی «تەیەمموم»

تەیەمموم، لە شەرعا ئەوەیە ئینسان لەباتی ئاو، دەستبدا لە تۆزێکی پاکو بیهێنێ بە دەم و چاوو هەردوو دەست و قۆڵیا لەگەڵ ئەنیشکەکانیا. ئینسانی لەش پیس و بێدەسنوێژ، تەیەمموم ئەکا لەکاتێکا کە ئاو نەبێ، یا ئاو ببێ بەڵام لەبەر ناساغی یا لەبەر برینێ کە بە لەشیەوە بێ نەتوانێ بەکاری بهێنێ، یاخود ئاوەکەی پێویست بێ بۆ خواردنەوە.

لە بەشی ئەووەڵا ـ کە کاتی نەبوونی ئاوە ـ ئەگەر کابرا بە یەقین ئەیزانی ئاو لەو شوێنەدا نییە، ئەوە پێویستە تەیەمموم بکا بێ ئەوەی بگەڕێ بە شوێن ئاودا؛ بەڵام ئەگەر گومانی وابوو ئاو لەو شوێنەدا هەیە، ئەبێ لە بارو بنەی خۆی و لە ناو هاوڕێکانیدا، ئەوە بگەڕێ بۆ ئاو و بەس نییە کە بانگ بکا بڵێ: کێ ئاوی هەیە بە خۆڕایی یا بە پارە من ئەمەوێ. جا ئەگەر دەستی نەکەوت و شوێنەکەش سارایەکی تەخت بوو، ئەبێ بە هەر چوار دەوری خۆیا بڕوانێ؛ ئەگەر بەرز و نزمیش بوو، پێویستە بگەڕێ بەو دەورەدا تا مەسافەیێ چاوی ئینسانی عادەتی فەرق بە شت ئەکا کە بریتییە لە مەیدانی سێسەدگەز تا چوارسەدگەز و ناو ئەبرێ بە «حَدُّالغَوْث» واتە: «ماوەی بانگ و بەهاوارەوە هاتن»، بەو شەرتە ئەو کابرا ئەمین بێ لە زەرەرو زیانی گیانو ماڵ و «اِختِصاصات»، وەکوو سەگی تەمێ کراوی راوی؛ هەروەها بەو شەرتە ئەمین بێ لەوەکە لە رەفیقەکانی بپچڕێ؛ جا ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت، تەیەمموم بکا. ئەگەر کابرا هەر لەو شوێنەدا مایەوە، پێویستە بۆ فەرزێکی تریش هەر بگەڕێ بۆ ئاو تا بەڕاستی حاڵی ئەبێ کەوا ئەو شوێنە ئاوی تیا نییە. ئەگەر کابرا ئەیزانی بە یەقین ئاو هەیە لە مەسافەیەکا رێبوار و کاروانی تا ئەو مەسافەیە بەدەوری بارو مەنزڵی خۆیانا ئەگەڕێن بۆ پێویستی خۆیان، کە ئەم مەسافەیە شەرع ناوی ئەبا بە «حَدُّ القُرب» و بریتییە لە نیو فەرسەخ، پێویستە بڕوا بۆ ئەو ئاوە بەو شەرتە ئەمین بێ لە زیانی گیانو ماڵێ کە لە قیمەتی ئاوی دەسنوێژ زیاتر بێو ئەمین بێ لەوەکە لە رەفیقانی ببڕێ؛ ئەگەر ئەیزانی ئاو لە مەسافەیەکی زۆرتر لەم مەسافەیەدا دەست ئەکەوێ ـ کە لە شەرعا ناوی «حَدُّ البُعد»ە ـ ئەوە پێویست نییە بڕوا

بۆی و ڕەوایە تەیەممومم بکا؛ ئەگەر بە یەقین ئەیزانی لە دوادوایی وەختەکەدا ئاوی دەس ئەکەوێ، ئەوە باشتر ئەوەیە چاوەڕێی ئاوەکە بکا؛ ئەگەر هەر بە گومان بوو لە دەس کەوتنی ئاو، ئەوە زووتر تەیەممومم بکا باشترە. ئەگەر ئاوی دەست کەوت بەڵام بەشی دەسنوێژی نەئەکرد، پێویستە تا ئاوەکە تەواو ئەبێ بەکاری بێنێ، ئەوجا تەیەممومم بکا. ئەگەر ئاو بە فرۆشتن بە قیمەتی عادەتی دەست ئەکەوت، پێویستە بیکڕێ مەگەر قەرزار بێ بە قەرزێکی وەها هەموو ماڵەکەی دابگرێ، یاخود ئەو پارەیەی پێویست بێ بۆ خەرجی ئەو سەفەرە لە هەردوو سەرەوە بۆ خۆی و ئەوانەی کە مەسرەفیان لەسەر ئەوە. ئەگەر یەکێ ئاوی پێ بەخشی، واجبە وەری بگرێ، بەڵام ئەگەر قیمەتی ئاوەکەی پێ بەخشی، واجب نییە وەری بگرێ چونکە منەتی پارە بارێکی گرانە.

لە بەشی دووهەمدا، کە ئەوەیە کابرا ئاوی هەبێ، بەڵام نەخۆش بێ یا بریندار بێ بە جۆرێکی وا ئەگەر ئەو ئاوە بەکار بێنێ، هێزو قازانجی پارچەیێ لە ئەندامەکانی لەشی بفەوتێ، یاخود نەخۆشییەکەی درەنگ چاك بێتەوە، یاخود لەکەیەکی ناهەموار لە ئەندامێکی بەدەرەوە بوویا دەرکەوێ، ئەوە لەمکاتەدا فەرزە تەیەممومم بکاو بەکارهێنانی ئاوگوناهێکی گەورەیە، وەکوو لە توحفەدا نووسراوە. ساردیی ئاویش ئەگەر توند بێ و هەواش سارد بێ، وەکوو ناساغی وایە و ئەبێ لەمکاتەیشدا هەر تەیەممومم بکا، مادام بە بەکارهێنانی ئاو لەوکاتی سەرمایەدا زیانێ لە زیانە پێشووەکانی لەوانەبێ تووش ببێ؛ بەڵام ئەگەر قابیل بوو ئاوەکە گەرم بکا، واجبە گەرمی بکا با وەختەکەشی لەدەس دەرچێ و نوێژەکەی بکەوێتە قەزا؛ ئەگەر ئاوەکە ئەوەندە گەرمیش بوو نەیئەتوانی بەکاری بهێنێ، ئەبێ زوو تەیەممومم بکا، چونکە سارد کردنەوەی ئەو ئاوە لە وڵاتی گەرمو هاوینی گەرما، لە ئیختیاری ئێمەدا نییە.

لە بەشی سێهەمدا، کە ئەوەیە ئاو ببێ، بەڵام پێویستی بێ بۆ خواردنەوەی گیاندارێکی بە حورمەت با بۆ لەمەولاش بێ، چ خۆی، چ ئەوکەسانە و ئەو حەیوانانە کە مەسرەفیان لەسەریەتی، ئەوە پێویستە لەسەری تەیەممومم بکاو نابێ ئاوەکە بەکاربێنێ، بەڵکوو ئەبێ هەڵی بگرێ بۆ پاراستنی گیانی گیاندارەکان.

**بزانن!** هەموو لەشی ئینسان بۆ غوسڵی جەنابەت بە یەك ئەندام ئەژمێررێ، بەڵام ئەندامی دەس‌نوێژ، چوارن: ١) دەم و چاو، ٢) هەردوو دەست لەگەڵ ئەنیشکەکانا، ٣) سەر، ٤) هەردوو پێ لەگەڵ قولاپەکانا. ئەگەر بەکارهێنانی ئاو مەمنووع بوو لە ئەندامی لەش‌پیسا، ئەوە یەك تەیەمموم پێویستە؛ بەڵام بۆ بێ‌دەس‌نوێژ، ئەگەر لە یەکێ لەو ئەندامانەدا مەمنووع بوو، یەك تەیەمموم و لە دوانیانا، دوو تەیەمموم و لە سیانیانا، سێ تەیەمموم و لە چواریانا، چوار تەیەمموم پێویستە. تەیەمموم، بۆ برین یا ناساغی هەرکام لەم چوار ئەندامە لەکاتی شۆردنی ئەو شوێنەدا ئەکرێ و نابێ بەر و دوای ببێ؛ مەسەلا، ئەگەر برین لە دەم و چاوا بوو، لەکاتی شۆردنی دەم و چاوا. وە ئەگەر لە دەستا بوو، لەکاتی شۆردنی دەستا تەیەمموم ئەکرێ، بەم جۆرە: هەر شوێنێ ساغە لە دەستەکەی ـ مەسەلا ـ بیشۆرێ، جا دەستی وشك بکاتەوە و تەیەمموم بکا، لەپاش ئەوە مەسحی سەری بکاو پێکانی بشۆرێ هەروا بەو جۆرە.

هەر ئەندامێ لە ئەندامەکانی دەس‌نوێژ کە ئاوی تیا بەکارنەهێنرێ، یا داپۆشەری بەسەرەوەیە، وەکوو موشەمما، یا بەسەریەوە نییە؛ ئەگەر داپۆشەری بەسەرەوە نەبوو، واجبە ئەوەی ساغە بیشۆرێ جا تەیەمموم بکا؛ ئەگەر داپۆشەریشی بە سەرەوە بوو و قابیلی لابردن نەبوو، پێویستە لەگەڵ شۆردنی ساغەکەیا هەموو موشەمماکەیش بە دەستێکی تەڕ مەسح بکا جا تەیەمموم بکا؛ ئەمە بۆ فەرزێ، هەروەها بۆ فەرزێکی دواییش، ئەگەر لەم‌بەینەدا دەس‌نوێژی شکا؛ بەڵام ئەگەر دەس‌نوێژەکەی نەشکا، ئەوە، هەر ئەوەندە پێویستە بۆ فەرزی دوایی تەیەمموم بکاتەوە، ئیتر شۆردنی ساغ و مەسحی داپۆشەری ناوێ.

## تەیەمموم بە چی ئەکرێ؟

تەیەمموم ئەکرێ بە هەموو گڵێ کە پاك بێ و جارێکی تر تەیەممومی پێ‌نەکرابێ، با دەرمانیش بێ، وەکوو گڵەسەرو گڵەئەرمەنی، هەروا بە لمێکیش تۆزی هەبێ، نەك بە قسڵ و گەچ و نوورەو لەتە سواڵەتی هاڕاوە یا بە گڵێ کە ئاردی تێکەڵ بێ یا بە گڵێ کە

پیس بێ یا جارێکی تر بەکار هێنرابێ لە تەیەمموم کردنا، وەکوو ئەو گڵە کە ماوەتەوە بە دەم و چاو و دەستەوە یا ئەوەی کە لەمانە داوەریوە لەکاتی تەیەممومدا.

## پێویستیی تەیەمموم

شەش شت پێویستە بۆ تەیەمموم:

یەکەم، قەسدی هێنانی گڵ، کەواتە، ئەگەر با گڵێکی کوتا بە ناوچاویاو کابرایش نییەتی هێنا و بەو گڵە مەسحی دەم و چاوی کرد، ئەوە بەکار نایێ؛

دووەم، نەقڵی گڵەکەیە، با بەسەر دەستیشیەوە بێ و بیهێنێ بۆ مەسحی دەم و چاو لەگەڵ نییەتدا، یا گڵێکی پاکی بەکار نەهێنراو بەسەر دەم و چاویەوە پەیدا ببێ و کابرا بیهێنێ مەسحی دەستی پێ بکا، ئەوە مەقبووڵ و دروستە؛

سێهەم، نییەتی حەلاڵ کردنی نوێژە، نەك لابردنی بێدەس نوێژی، چونکە تەیەمموم تارەتی ناچارییە و بێدەس نوێژی لانابا، کەواتە، ئەگەر وتی: نییەتم هەیە بێدەس نوێژی لە خۆم لائەبەم یا فەرزی تەیەمموم بەجێ ئەهێنم، ئەوە بەتاڵ و بێ سوودە؛

چوارەم، ئەوەیە نییەتەکەی لەگەڵ نەقڵ و هێنانی گڵەکەدا هەبێ و دەوام بکا تا شتێ لە روخساری مەسح ئەکا؛

پێنجەم، مەسحی دەم و چاو و هەردوو دەستە لەسەر پەنجەکانەوە تا لای ژووری هەردوو ئەنیشك؛ فەرزە لەکاتی مەسحی دەستا ئەنگووستیلە لە پەنجەی داکەنێ بۆ ئەوەی تۆز بگا بە شوێنەکەی؛

شەشەم، ئەوەیە ژمارەی دەس بە زەویدا دان و تۆز وەرگرتنەکەی لە دوو جار کەمتر نەبێ، هەرچەند مەسحی دەم و چاوو دەستەکانیشی بەجارێ مومکین بێ بەهۆی دەستەسرێکەوە کە بیدا بە زەویداو بە لایەکی دەم و چاوی و بە لایەکی تری دەستەکانی مەسح بکا.

ئینسان، لەگەڵ تەیەمموم کردنا، ئەگەر نییەتی کردنی نوێژی فەرز یا فەرز و سوننەتی بوو، هەردوو نوێژەکەی دروستە [و] ئەگەر نییەتی نوێژی رووت یا نوێژی سوننەتیشی بوو، ئەوە دروست نییە نوێژی فەرز بکا.

سوننەتە تۆزی مەسح و تەیەممومم سووك بێ و لەلای ژووورووی دەم و چـاوەوە بیهێنێتە خوارەوە؛ پێویست نییە ئەم تۆزە بگەیەنێ بە هەموو بنی تەڵە موویێکا؛ سوننەتە لە مەسحا لای راست بخاتە پێش لای چەپەوە، هەروا سوننەتە مەسحی دەم و چاو و دەست، بەینیان نەکەوێ و لە ئەووەڵی هەردوو جارەکانەوە کە دەست ئەدا بەزەویدا، پەنجەکانی بڵاو بکاتەوە بۆ ئەوەی تۆزی زۆر وەربگرێ.

ئەگەر یەکێ تەیەمومی کرد لەبەر نەبوونی ئاو و پاش ئەوە ئاوی دەس کەوت، ئەوە ئەگەر هێشتا دەستی نەکردووە بە نوێژ، تەیەممومەکەی بەتاڵ و بـێسـوودە، مـادام ئاوەکەی پێویست نەبێ بۆ خواردنەوەی گیاندارێکی بەحورمەت. هەروا ئەگـەر لەو کاتەدا لە نوێژدا بێ و نوێژکەی بەو تەیەممومە لەسەر لا بچێ، واتە نوێژەکەی قەزای پێویست بێ؛ ئەگەر نوێژەکەشی لەکۆڵ ئەکەوت، ئەوە تەیەممومەکەی دائەمەزرێ و ئەو نوێژەی کە ئەیکا دروستە، فەرز بێ یا سوننەت، بەڵام ئەگەر نوێژەکەی بـبڕێ و دەس‌نوێژ بگرێ ئەوە باشترە. بەڵێ نوێژی سوننەت ئەگەر نییەتی عەدەدێکی هێناوە، تەواویان بکا، ئەگینا، نابێ لە دوو رکات سەرکەوێ.

ئینسان بە تەیەممومێ هەر فەرزێکی بۆ ئەکرێ با فەرزەکەیش بە نەزر بێ، بـەڵام ئەتوانێ یەك نوێژی جەنازە یا زیاتر لە یەك نوێژ لەگەڵ ئەو فەرزەدا بکات. ئەگەر کەسێ یەکێ‌لەم پێنج فەرزەی لەسەر بوو و لە بیری نەمابوو کام فەرزە، ئەوە ئەتوانێ بە یەك تەیەممومم هەموو پێنج فەرزەکە بکات؛ ئەگەر دوو فەرزی جیاوازی لەسەر بـوو و لە بیری نەمابوو کامەن، ئەتوانێ بە پێنج تەیەمموم پێنج فەرزەکە بکاو ئەشتوانێ دوو جار تەیەمموم بکا، بە جاری یەکەم چوار فەرز لەو پێنج فەرزە بکا و بە جاری دووەم چوار فەرزبکا یەك لەشوێنی یەك، بەو شەرتە ئەووەڵ نوێژی جاری پێشووی تیا نەبێ؛ ئەگەر دوو نوێژی هاوناوی لەسەر بوو، ئەوە دوو جار تەیەمموم بکاو بە هەر تـەیەممومێ جارێ هەموو پێنج فەرزەکان جێ‌بەجێ بکا.

ئەگەر کەسێ تەیەمومی کرد بۆ حەدەسی ئەکبەر و پاشان دەس‌نوێژی شکا، ئەوە تەیەممومی تەنها بۆ حەدەسی ئەسغەر پێویستە. ئینسان نابێ بەر لە هـاتنی وەخـتی فەرزەکە تەیەمموم بکا، هەروا بەر لە هاتنی وەختی سوننەتێکیش کە خاوەن وەخت

بێ، وەکوو سوننەتی پێش نیوەڕۆ؛ مەسەلا ئەگەر کەسێ نە ئاو و نە گڵی دەس نەکەوت، پێویستە بۆ حورمەتی وەخت ئەو فەرزە لەو کاتەدا بکا، بەڵام لەوەدوا قەزای بکاتەوە.

## ئەو نوێژانەی بە تەیەمموم ئەکرێن کامەیان قەزای ئەوێ؟

ئەو کەسەی تەیەممومەکەی لەبەر نەبوونی ئاو کردبێ، مادام نیشتەجێ بێ، قەزای لەسەرە. چونکە نەبوونی ئاو بۆ نیشتەجێ نایابە، هەروا موسافیرێکیش کە سەفەرەکەی گوناه بێ. لەسەر ئەساسی پێشوو، ئەگەر کەسێ ئاوی لەناو باری خۆیا ونکرد، ئەوە قەزای لەسەرە، بەڵام ئەگەر باری لەناو باری رەفیقەکانیا ون کرد، قەزای لەسەر نییە.

هەر کەسێ تەیەممومەکەی لەبەر ساردیی ئاو و هەوا بێ، ئەوە قەزای لەسەرە، چونکە ئاو گەرم کردن بە عادەت ئاسانە؛ بەڵام ئەگەر تەیەممومەکەی لەبەر زۆریی گەرمی ئاوەکە بێ، ئەوە قەزای لەسەر نییە.

هەر کەسێ تەیەممومەکەی لەبەر نەخۆشییەك بێ [کە] مەنعی بەکار هێنانی ئاوی لێ بکا لە هەموو لەشیا یا لە یەك ئەندامیا و ئەو ئەندامە داپۆشەری بەسەرەوە نەبێ، ئەوە قەزای لەسەر نییە، مەگەر برینەکەی خوێنێکی زۆری پێوەبێ؛ ئەگەر داپۆشەری بەسەرەوە بوو، ئەوە، ئەگەر لەسەر ئەندامی تەیەممومە ـ کە بریتییە لە دەست و دەم و چاو ـ ئەوە، هەمیشە قەزای لەسەرە، چونکە نە شۆردنەکەی تەواوە، نە تەیەممومەکەی لەبەر داپۆشەرەکە تەواوە؛ ئەگەر داپۆشەرەکە لە غەیری ئەندامی تەیەمموما بێ، ئەمجار ئەگەر ئەو داپۆشەرە لەسەر پاکی دانرابوو و غەیری ئەندازەی راوەستانی لە شوێنی ساغی نەگرتبوو، ئەوە قەزای لەسەر نییە؛ ئەگەر لە شوێنە ساغەکە زیاد لە پێویستی داگرتبوو یا لەسەر بێ دەس نوێژی دانرابوو، واجبە داپۆشەرەکە لا ببرێ؛ ئەگەر قابیل نەبوو لابیرێ، ئەوە قەزای نوێژەکانی لەسەرە.

## باسی حەیز

حەیز لەشەرعا بەو خوێنە ئەڵێن لە هەندێ کاتی تایبەتیدا، بە بێ نەخۆشی و منداڵ بوون لە رەگێکەوە دەرئەچێ کە وا لەلای ژووررووی منداڵدانەوە. «نفاس»یش بریتییە

لەو خوێنەی لەپاش منداڵبوون لە منداڵدانەوە دەرئەچێ و بە کوردی، پێی ئەڵێن خوێنی «زەیسانی»؛ چونکە لەکاتێکا ژن سکی هەبێ، سکەکەی نایەڵێ خوێن لە منداڵدانیەوە بێتە دەرەوە، بەڵکوو ئەمێنێتەوە تا مناڵەکەی ئەبێ. «اسْتِحاضة»یش بریتییە لە خوێنێ کە بەهۆی نەخۆشییەوە لە ژن دەرئەچێ.

لای خوارووی ساڵی حەیز، نۆ ساڵە، یانێ مێیینە تا نۆ ساڵ تەواو نەکا قابیل نییە حەیزی پیابێ؛ لای ئەغڵەبیشی بیست ساڵە و لای ژوورووی شەست‌ودوو ساڵە.

لای خوارووی ماوەی جاری بوونی خوێنی حەیز، بیست و چوار سەعاتە لەسەر یەك، بەمەعنا ئەگەر [ژن] لەو ماوەدا لۆکەیێ بخاتە فەرجیەوە بە خوێن تەڕ ببێ؛ ئەگەر خوێنەکەی لەسەر یەك نەبوو، ئەوە پێویستە ماوەیەکی وەها ئەو خوێنە پچڕپچڕە دەوام بکا ئەگەر زەمانی هاتنی خوێنەکان ـ بکەونە سەر یەك ـ بگا بە بیست و چوار سەعاتەکە؛ ئەگینا، ئەگەر لە ماوەی چوار ڕۆژا ـ مەسەلا ـ ناوبەناو، هەر لەپاش چوار سەعات دوو سێ دەقیقە خوێنی لێ‌ئەهات، ئەوە بە حەیز ناناسرێ بەڵکوو بە نەخۆشی دائەنرێ.

لای ژووروی حەیز، پازدە شەو و پازدە ڕۆژ و لای ئەغڵەبی، شەش یا حەوت ڕۆژە؛ کەمتر ماوەی پاکی لە بەینی دوو حەیزا، پانزە شەو و ڕۆژە، ئیتر ئەندازە بۆ لای ژووروی نییە، چونکە قابیلە پاش ئەوە کە ژن لە حەیز پاك ببێتەوە تا عومری ماوە خوێنی حەیز نەبینێ؛ بەڵام، ماوەی پاکی لە بەینی حەیز و نیفاس (زەیسانی)دا، قابیلە کەمتر بێ لە پازدە ڕۆژ، خوا حەیزەکەی لەپێش زەیسانیدا بێ یا لەپاشیا؛ تەنانەت ئەگەر ژنێکی دووگیان (حامله)، ماوەی شەو و ڕۆژێ لەپێش ژانی منداڵ بوونا خوێنی بڕوا، ئەوە بە حەیزدار ئەزانرێ.

هەرچی بە لەش پیسییەوە حەرام بوو، بە حەیزیشەوە حەرامە، بێجگە لەوانە، هاتوچۆ بە مزگەوتیشا حەرامە ئەگەر ترسی پیس‌کردنی مزگەوتەکەی هەبێ؛ نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن لەسەر حەیزدار حەرامە، بەڵام قەزای ڕۆژووەکە فەرزە نەك قەزای نوێژەکان؛ حەرامە لەزەت وەرگرتن لە مابەینی ناوك و ئەژنۆی بە رووتی، خوا بە «جیماع» بێ یا نە؛ حەرامە تەڵاق لە ماوەی حەیزا، جا کاتێ خوێنەکەی نەما و خۆی

شۆرد، هەموو ئەم شتانە کە مەنع کراون حەڵاڵ ئەبنەوە، بەڵام بەر لە خۆشۆردن، هەر ڕۆژوو گرتن و تەڵاق‌دان دروستە.

«اسۡتِحاضة» کە خوێنێکە لەبەر نەخۆشی جاری ئەبێ، حوکمی وەکوو درێژەکێشانی میزەچرکە وایە، کەواتە مەنعی نوێژ و ڕۆژوو ناکا، بەڵام پێویستە بۆ هەموو فەرزێ کە وەختی نوێژەکە هات، فەرجی بشۆرێ و لۆکەی تێبخا و توند بیبەستێ، جاگورج دەس‌نوێژەکەی بگرێ و نوێژەکەی بکا. ئەگەر هات و نوێژەکەی دواخست بە بێ مەسڵەحەتی ئەو نوێژە، ئەوە بەتاڵە، چونکە ئەو پیس بوونە زیادە بە بێ‌عوزر زیانی هەیە؛ ئەگەر لەبەر مەسڵەحەتی نوێژەکەش بوو، مەسەلا بۆ پەیداکردنی شتێ بوو عەورەتی پێ‌داپۆشێ یا چاوەڕوانی جەماعەتی ئەکرد، ئەوە زەرەری نییە.

پێویستە بۆ هەموو فەرزێ فەرجی بشۆرێ و لۆکەی تازەی تێبخا و ئەو شتەی پێی بەستووە تازەی بکاتەوە و دەس‌نوێژ بگرێ؛ جا ئەگەر پاش ئەوەکە دەس‌نوێژی گرت خوێنەکەی نەما و عادەتی وابوو هەر کاتێ خوێنەکەی ئەبڕایەوە تا ماوەیەکی زۆر نەئەهاتەوە، یا ئەهاتەوە بەڵام پاش ماوەی ئەوەکە دەس‌نوێژ بگرێ و نوێژ بکا، ئەوە لەم وەختەدا فەرزە سەرلەنوێ فەرجی بشوا و دەس‌نوێژ بگرێ و نوێژەکەی بە پاکی لەشەوە و بە تارەتی ڕاستیەوە بکات.

## باسی بەش‌بەشی وەزعی ژنی حەیزدار

ئەگەر ژنێ لە تەمەنی حەیزدا خوێنی دی و ئەو خوێنە لە ئەندازەی لای خواروو کەمتر نەبوو و لە ئەندازەی لای ژووررویش زیاتر نەبوو، ئەوە ئەو ماوەیە هەمووی بە ماوەی حەیز ئەناسرێ. خوێنی زەرد و لێڵیش، وەکوو خوێنی گەش و ئاڵ، هەر حەیزە. ئەگەر هات و لە ماوەی لای ژوورووی حەیز لایدا، ئەوە لەم وەختەدا چەند وەزع هەڵئەگرێ؛ چونکە ئەو ژنە یا «مُبۡتَدِئة» (نەوجار)ە و ئەمە یەکەم خوێن لێ‌هاتنیەتی یا «مُعتادة» (فێرەکار و خوودار)ە؛ موبتەدیئەی نەوجاریش یا «مُمَیِّزة»یە، واتە: خوێنەکەی بە چەند ڕەنگ ئەبینێ، هەندێ‌جار ئاڵەو هەندێ‌جار کاڵە و ئاڵەکەی لە شەو

و رۆژێ کەمتر نییە و لە پازدە شەو و پازدە رۆژ زیاتر نییەو کاڵەکەشی لە پازدە شەو و پازدە رۆژ کەمتر نییە، یاخود «غەیرە مُمَیِّزة»یە، واتە: خوێنەکەی یەك رەنگە یا رەنگاو رەنگە، بەڵام ئەو شەرتانەی تیا نییە؛ موعتادە (فێرەکاریش) یا مومەییزەیە یا غەیرە مومەییزەیە؛ موعتادەی غەیرە مومەییزەیش یا عادەتەکەی جۆرجۆرە یا یەك جۆرە و نەگۆڕاوە؛ ئەو موعتادەیەش کە عادەتەکەی ئەگۆڕێ یا دەورەی دووبارەی هەیە یا نییەتی؛ ئەوەش کە دەورەی دووبارەی هەیە یا دەورەی دوایی لەسەر ریزی دەورەی پێشووە یا لەسەر ئەو ریزە نییە؛ ئەم موعتادانەش یا وەزعی پێشوویان لە بیرە یا لە بیریان نییە؛ ئەو کەسەش کە وەزعی پێشووی لە بیر نییە یا بەتەواوی، کات و ئەندازەی لەوەوپێشی فەرامۆش کردووە، یا تەنیا کاتی لە بیرچووە، یا تەنیا ئەندازەی لەبیرچووە. جا با بە کورتی بەڕیز باسی ئەم بەشانە بکەین، بۆ ئەوەی بەڕۆشنی سوود لەمباسە وەربگیرێ:

یەکەم، «موبتەدیئەی مومەییزە»، یانێ ئەو ژنەی یەکەم جاریەتی و ئەو خوێنەی کە لای داوە لە ئەندازەی لای ژوورووی، چوار رۆژ ـ مەسەلا ـ زۆرگەش و ئاڵە و بیست و شەش رۆژ ـ مەسەلا ـ زۆر کاڵە، ئەمە هەموو خوێنە ئاڵەکەی حەیزە و هەموو خوێنە کاڵەکەی «إسْتِحاضة»یە و خوێنی نەخۆشییە؛ حوکمی موستەحازەیش لەمەوبەر بە تەفسیل بەیان کراوە.

دووەم، «موبتەدیئەی غەیری مومەییزە»، نەوجارێ کە فەرق ناخا یانێ هەموو خوێنەکەی بە یەك رەنگ ئەبینێ، یا رەنگاوییە ئاڵەکەی لە شەو و رۆژ کەمترە، یا کاڵەکەی لە پانزە رۆژ زیاترە، ئەمە لەم سوورەتەدا لە هەموو مانگێکا شەو و رۆژێکی بۆ دائەنرێ بە حەیز و باقی رۆژەکانی بە ئیستیحازە (نەخۆشی) دائەنرێ.

سێهەم، «موعتادەی مومەییزە»، فێرەکاری فەرق خەر، مەسەلا، لەمەوپێش لە هەموو مانگێکا چوار رۆژ لە ئەووەڵیەوە خوێنی بووە ئیتر پاك بووەتەوە، بەڵام لەم مانگەدا دە رۆژ خوێنی گەشی دی و بیست رۆژ خوێنی ئاڵ، ئەوە، دە رۆژەبەهێزەکەی بە حەیز دائەنرێ و بیست رۆژە بێهێزەکەی ئیستیحازە (نەخۆشی)یە.

**چوارەم،** «موعتادەی غەیرە مومەییزە»، بەڵام عادەتەکەی نـەگـۆڕاوە ـ مـەسەلا ـ لەمەوپێش هەموو مانگێ لە ئەووەڵیەوە چوار ڕۆژ حەیزی بووە و لەم مانگەدا چوار ڕۆژ خوێنی ئاڵی بوو و شەش ڕۆژ خوێنی کاڵ، هەروا دوو ڕۆژی‌تر خوێنی ئاڵی بوو و شەش ڕۆژی‌تر خوێنی کاڵ؛ ئەوە هەر لەسەر عادەتە پێشووەکەی ئەڕۆیـن و چـوار ڕۆژی ئەووەڵی بۆ قەرار ئەدەین بە حەیز و باقی ڕۆژەکان بە ئیستیحازە (نەخۆشی).

**پێنجەم،** «موعتادەی غەیرە مومەییزە» کە عادەتەکەی وەختی خۆی گۆڕاوە بەڵام دەوری دووبارەی نەدیوە، مەسەلا، لەمەوپێش، لە یەکەم مـانگی سـاڵا دوو ڕۆژ و لە دووەم مانگا سێ ڕۆژ و لە سێهەم مانگا چوار ڕۆژ و ئێستە لەم مانگا کەوتە حەیزەوە و تا بیست ڕۆژ خوێنی دەوامی کرد، ڕۆژێ ئاڵ و ڕۆژێ کاڵ تا دوایی، لەم وەزعەدا ئەو ژنە ئەگەر نۆبەی دوایی لەبیرە ـ وەکوو چوار ڕۆژەکە کە لەم وێنـەدا وتـمان ـ ئـەوە ژمارەی ئەو نۆبەیە دائەنرێ بە حەیز و مەندەکەی بە «ئیستیحازە». وە ئەگـەر ئـاخر نۆبەشی لە بیر نەمابوو، ئەوە بیر بکاتەوە کام نۆبە لە هەموان کەمتر بووە ئیعتیباری بکا و ئێستە لەسەر ئەوە بڕوا و ئەو ژمارەیە بە حەیز دانێ، بەڵام بۆ ماوەی نۆبە زۆرەکەیان پارێزگاری بکا، یانێ لە عیبادەتێکا پێویستی بە نییەت بێ خۆی بە پـاك بـزانـێ و لە غەیری ئەوەدا خۆی بە خاوەن حەیز دابنێ؛ کەواتە، گەرەکە نوێژبکا و ڕەفتاری ژنی «مُسْتَحاضة» بەجێبێنێ، بـەڵام لە غـەیری نـوێژا قـورئان نـەخوێنـێ و لە مـزگەوتا ڕانەوەستێ و مەیدانی مێردەکەی نەدا بۆ جیماع و تەڵاقدان و تەڵاق وەرگرتنیش لەم ماوەدا حەرامە بەپێی ئەو بەیانەی لەمەولا دێ.

**شەشەم،** «موعتادەی غەیرە مومەییزە» کە لەکاتی خۆیا عـادەتەکـەی گـۆڕاوە و دەوری دووبارەشی لەسەر ڕیزی پێشوو هەیە، مەسەلا، لەمەوپێش، لە یەکەم مـانگی ئەووەڵی ساڵا شەو و ڕۆژێ حەیزی بووە و لە دووهەم مانگا دووڕۆژ و لە سێهەم مانگا سێ ڕۆژ، جا دەورگەڕایەوە، لە چوارەم مانگا شەو و ڕۆژێ و لە پێنجەم مانگا دوو شەو و ڕۆژ و لە شەشەم مانگا سێ شەو و ڕۆژ حەیزی بووە و لە مانگی حەوتەمەوە وەزعی لێ تێچکوو و کەوتە خوێنەوە، ڕۆژێ ئاڵ و ڕۆژێ کاڵ، تا ماوەی بیست ڕۆژ، هەروا ئەم

تێك‌چوونە لە مانگە دواییەکانا دەوامی کرد، ئەوە لەسەر ڕێزی وەزعی پێشـوو، لە حەوتەم مانگا شەو و ڕۆژێ و لە هەشتەم مانگا دوو شەو و ڕۆژ و لە نۆهەم مانگا سێ شەو و ڕۆژی بۆ دائەنرێ بە حەیز و باقی‌مەندەی ماوەی خوێنەکەی لە مانگەکانا بۆ دائەنرێ بە «ئیستیحازە» واتە بە خوێنی نەخۆشی و پێویستە ڕەفـتاری مـوستەحازە بەجێ‌بێنێ. ئەمەی کە وتمان لەم وێنەدا، ئەگەر ژنەکە ریزی دەوری حەیزەکەی لەبیر مابێ؛ ئەگەر ریزەکەی فەرامۆش کردبوو، ئەوەکام نۆبە لە هەموویان کەمترە دای‌بنێ بە حەیز و بۆ نۆبە زیادەکان، ئیحتیات (پارێزگاری) بکا، وەکوو لە ماددەی پێنـجەما بەیانمان کرد.

**حەوتەم**، «موعتادەی غەیرە مومەییزە» کە وەختی خۆی عادەتەکـەی گـۆڕاوە و دەوری دووبارەشی دیوە، بەڵام ئەم دەوری دوایـیە لەسـەر ریـزی پـێشـووی نـییە ـ مەسەلا ـ وەختی خۆی، لە یەکەم مانگی ئەووەڵ ساڵا شەو و ڕۆژێ حەیزی دیوە و لە دووەم مانگا دوو ڕۆژ و لە سێهەم مانگا سێ ڕۆژ، جا لە چوارەم مانگا دوو ڕۆژ و لە پێنجەم مانگا چوار ڕۆژ و لە شەشەم مانگا سێ شەو ڕۆژ و لەدوای ئەم شەش مانگە، ئەگەر وەزعی خراپ بوو و کەوتە خوێنەوە و خوێنەکەی، ڕۆژێ ئاڵ و ڕۆژێ کاڵ، گەیشت بە بیست ڕۆژ، ئەوە ئەگەر نۆبەی دوایی لە بیرە، وەکوو سێ ڕۆژەکە کە لەم وێنەدا وتمان، ئەوەی بۆ دائەنرێ بە حەیز و باقی‌مەندەکەی بە ئیستیحازە (نەخۆشی) دائەنرێ؛ ئەگەر نۆبەی دوایشی لە بیر نییە، ئەوە نۆبەی کەمتری ئەم نۆبەتانە بە حەیز دابنێ و بۆ نۆبە زۆرەکان ئیحتیات، یانێ پارێز بکا لەسەر ئـەو نـەزمەی لە مـاددەی پێنجەما بە درێژی بەیانم کرد. ئەمە تا ئێستە، قسـە لەو مـوعتادەیە بـوو کـە کـات و ئەندازەی حەیزی پێشووی لەبیرماوە، ئەمجارە باسی ئەو موعتادەیە ئەکەین کەکات و ئەندازەی هەردووکیان یا یەکێکیانی لەبیرچووە.

**هەشتەم**، «موعتادەی غەیرە مومەییزە» کە کات و ئـەندازەی پـێشـووی هـەموو فەرامۆش کردووە مەسەلا نازانێ لەمەوبەر ئەو حەیزەی چۆن بووە و لە چ وەختێکـا دەستی پێ‌کردووە و کەی دوایی هاتووە و ماوەی حەیزەکەی چەند بووە، ئەمە، ناوی

«موتەحەییرەی موتڵەقە» سەر گەردانی نەزانە؛ ئەم ژنە، وەکوو پاك وایە لە هەر عیبادەتێکا نییەتی بۆ لازم بێ، یانێ بە موستەحازە ئەزانرێ و لە غەیری ئەوەدا بە خاوەن حەیز دائەنرێ، کەوابوو، پێویستە نوێژ و رۆژووی بە تەواوی بەجێبێنێ و حەرامە قورئان بخوێنێ لە غەیری نوێژدا و نابێ لە مزگەوتا بمێنێتەوە یا پیا رابووری ئەگەر ترسی تەڕکردنی بوو، هەروا حەرامە تێکەڵی مێردەکەی ببێ بە جیماع کردن؛ جا ئەگەر لە بیری مابوو ئەوسا لە چ وەختێکا خوێنی حەیزەکەی بڕاوەتەوە، هەموو رۆژێ لە فەرزی ئەوکاتەدا خۆی بشۆرێ و رەفتاری موستەحازە بەجێبهێنێ؛ ئەگەر ئەویشی فەرامۆش کردبوو، ئەوە پێویستە بۆ هەموو فەرزێ غوسڵ بکا چونکە هەڵئەگرێ ئەو کاتە کاتی تەواو بوونی خوێنی حەیزی بووبێ، مەگەر دوکتۆرێکی وا کە بە شەرع باوەڕی پێبکرێ، ئەو دەوامی خۆشۆردنە بە خەتەر بزانێ بۆ سەلامەتی ژنەکە، ئەوە لەو حاڵەدا لەباتی غوسڵ. بۆ هەموو نوێژێ تەیەممومێ بکا.

کە گەیشتە مانگی رەمەزانی پیرۆز، ئەبێ بە تەواوی بەڕۆژوو بێ چونکە ئیحتیمالی هەیە پاك بێ لە حەیز و ئەم خوێنە خوێنی ئیستیحازە (نەخۆشی)بێ و ئەبێ پاش رەمەزانیش مانگێکی‌تر بە رۆژوو بێ، چونکە قابیلە مانگی رەمەزان لە حەیزا بووبێ؛ جا ئەگەر وەختی خۆی، عادەتی وابوو بە شەو خوێنەکەی ئەبڕا، ئەوە رۆژووی بەسەرەوە نامێنێ چونکە لە مانگی رەمەزان پازدە رۆژ و لە مانگی دوایی پازدە رۆژی بۆ ئەژمێررێ؛ ئەگەر عادەتیشی وابوو بە رۆژ خوێنی حەیزەکەی ئەبڕایەوە یا لە گومانا بوو بۆ وەختی بڕانەوەی حەیزەکەی، ئەوە پێویستە دوو رۆژی‌تر بە رۆژوو بێ، چونکە قابیلە حەیزەکە لە رۆژی شازدەدا تەواو بووبێ، کەواتە لە هەر مانگێ چواردە رۆژی بۆ ئەمێنێتەوە. بۆ قەزای ئەم دوو رۆژە دوو ئوسووڵ هەیە؛

(یەکەم)، ئەو ژمارەیە وا بەسەریەوە دووقاتی بکاتەوە و دوو رۆژیشی لەسەر زیاد بکا لە بەینی ئەو رۆژانەدا؛ بۆ وێنە، لەم شوێنەدا کە دوو رۆژی لەسەرە، لە ئەووەڵی مانگی «ذِي القَعدة»وە دوو رۆژ بەڕۆژوو بێ و لە رۆژی حەڤدەهەمی رۆژی ئەووەڵەوە دوو رۆژ بەڕۆژوو بێ و دوو رۆژەکەیش کە زیادی ئەکا لە بەینی رۆژی دووهەم و رۆژی

حەڤدەهەما بەرۆژوو بێ، مەسەلا، ئەیەوێ رۆژێکیان ببەستێ بە دوو رۆژی ئەووەڵەوە و رۆژێکیان ببەستێ بە رۆژی حەڤدەهەمەوە، یانێ رۆژی شازدەهەم بەرۆژوو بێ، بەم تەرتیبە، لەو دوو رۆژە رزگار ئەبێ، چونکە ئەگەر حەیز لە رۆژی ئەووەڵی مـانگەوە دەس پێبکا، ئەوپەرەکەی تا شازدەی مانگ ئەگا و رۆژی حەڤدە و هەژدەی بە ساغی ئەمێنێتەوە، ئەگەر لە رۆژی دووهـەمیشەوە دەس پـێبکـا، رۆژی ئـەووەڵ و رۆژی هەژدەهەمی بۆ ئەمێنێتەوە، ئەگەر لە رۆژی سێهەمیشەوە دەس پێبکا، رۆژی ئەووەڵ و دووەم بە ساغی ئەمێنێتەوە؛ ئەگەر رۆژی ئەووەڵی مانگ، ئـاخری حـەیزێکـی زوو بووبێ، ئەوە رۆژی دووهەم و سێهەمی بۆ ئەمێنێتەوە، ئەگەر رۆژی دووهەم ئـاخری حەیز بووبێ، ئەوە ئەو رۆژەی کە زیاد کراوە لەپێش هەژدەهەمەوە ئەمێنێتەوە؛ ئەگەر رۆژی شازدەهەم دەستی پێ کردبێ، ئەوە دووهەم و سێهەم لە سەرەوە ئەمێننەوە؛ ئەگەر لە رۆژی حەڤدەهەمیشا دەستی پێ کردووە، ئەوە رۆژی سێهەم و شازدەهەم ئەمێنێتەوە. وە ئەگەر رۆژی هەژدەهەمیش دەستی پێ کردبێ، ئەوە رۆژی شازدە و حەڤدە بە ساغی ئەمێنێتەوە. ئەم ئووسوڵە، هەموو مانگێ لە قەزای چواردە رۆژ و کەمتر لە چـواردەدا دەس ئەدا؛

(دووەم)، ئەوەیە ئەو ئەندازەی لەسـەریەتی، بـە بـڵاوی، لە مـاوەی پـازدە رۆژا بەرۆژوو بێ و رۆژێکی تر بە جیا لەو ئەندازە زیاد بکا، ئەم جارە لە رۆژی حەڤدەهەمی رۆژی ئەووەڵەوە ئەندازەی ئەسڵی رۆژووە پێشووەکە بە بێزیادە بەرۆژوو بـێ؛ بـۆ وێنەی قەزای تاقە رۆژێ، رۆژی ئەووەڵی مانگ و رۆژی سێهەم و رۆژی حەڤدەهەمی، رۆژی ئەووەڵ بەرۆژوو بێ کافییە، چونکە ئەگـەر حـەیز لە رۆژی ئـەووەڵا دەسـتی پێ کردبێ، رۆژی حەڤدە ئەمێنێ؛ ئەگەر لە رۆژی سێهەمیشا دەستی پێ کردبێ، رۆژی ئەووەڵ ئەمێنێ؛ ئەگەر رۆژی ئەووەڵ ئاخری حەیزێکی پێشوو بووبێ، ئەوە رۆژی سێهەم بە ساغی ماوەتەوە؛ ئەگەر رۆژی سێهەمیش ئاخری حەیز بێ، رۆژی حەڤدەهەم ئەمێنێتەوە. ئەم ئوسووڵی دووهەمە، بۆ قەزای حەوت رۆژ و کەمتر لە حەوت بەکـار دێت و ئەو تەرتیبەی ئێستا وتمان، شەرت نییە، بەڵکوو ئەوەندە پێویستە بەینی رۆژی

ئەووەڵیش و ڕۆژە زیادەکە چەندێکە، بەینی ڕۆژی پانزەهەمی مانگ و ڕۆژی دواییش ئەوەندە بێ؛ مەسەلا، ئەگەر ڕۆژووە دووهەمەکە لە ڕۆژی سێهەما بوو، ڕۆژووی ئاخر لە حەڤدەدا بێ. ئەگەر لە ڕۆژی چوارەمیشدا بوو، ڕۆژووی دوایی لە ڕۆژی هەژدەهەما بێ و هەروا لەسەر ئەم میزانە.

نۆهەم، «موعتادەی غەیرە مومەییزە» کە تەنیا ژمارەی ماوەی حەیزی لە بیر مابێ ئیتر وەختەکەی بە ڕۆشنی نەزانێ، وەکوو ئەو ژنە وەزع گۆڕاوەی خوێن لە پازدە ڕۆژ لاداوە کە ئەڵێت وائەزانم لەمەوپێش لە هەموو مانگێکا حەیزم شەش ڕۆژ بووە لە دەی ئەووەڵی مانگەوە، ئەمە بۆ ئەوەی کە یەقینە لە حەیز و پاکی، حوکمی مەعلوومە، بۆ ئەوەش کە هەڵئەگرێ حەیز بێ یا «اِسْتِحاضة» بێ، وەکوو پاکوایە لە عیبادەتێکا کە نییەتی ناوێ و بەوێنەی خاوەن حەیزە لە غەیری ئەو عیبادەتانەدا. ئێستا لەم میسالەی خۆماندا ڕۆژی شەشەم حەیزە بەڕاستی و بیست ڕۆژی ئاخری مانگ پاکییە بەڕاستی و لە یەکی مانگەوە تا ئاخری ڕۆژی پێنجەم، هەڵئەگرێ پاك بێ و هەڵیش ئەگرێ حەیزی بەسەرا هاتبێ و لە حەوتی مانگەوە تا ئاخری ڕۆژی دەهەم، هەڵئەگرێ خاوەن حەیز بێ و هەڵیش ئەگری پاك بێ بەهۆی تەواو بوونی حەیزەوە؛ کەواتە، بۆ هەموو فەرزێ پێویستە خۆی بشۆرێ و ڕەفتاری «مُسْتحاضة» ببینێ ئەگەر وەختی دوایی هاتنی حەیزی زەمانی زووی لە بیر نەبێ، ئەگینا، لەو کاتەدا غوسڵی لەسەرە و بەس.

دەهەم، «موعتادەی غەیرە مومەییزە» کە هەر وەختی لە بیرە و ئەندازە نازانێ ـ مەسەلا ـ ئەڵێت: ئەزانم کە مانگی جارێ حەیزم ئەبوو، لە ڕۆژی شەشەمی مانگا حەیزم بووە؛ ئەمە ڕۆژی شەشی مانگ، حەیزە بە یەقین و دەی ئاخری مانگ، ئیستیحازەیە بە یەقین و لە ڕۆژی ئەووەڵەوە تا ڕۆژی شەش، هەڵئەگرێ پاك بێ و هەڵیش ئەگرێ حەیزی بەسەرا هاتبێ و لە حەوتەمەوە تا بیست، هەڵئەگرێ پاك بێ و هەڵیش ئەگرێ حەیزی بووبێ و بڕابێتەوە، کەواتە، پێویستە بۆ هەموو فەرزێ لەم ماوەیەدا خۆی بشۆرێ، ئەگەر وەختی بڕانەوەی حەیزی لەوەوبەری نەزانی، ئەگینا هەر لەو وەختانەدا پێویستە خۆی بشۆرێ. لازمە لێرەدا بزانین لەم دوو ماددەی نۆهەم و

دەهەمەدا، «موتەحەییرەی موقەییەدە» سەرگەردانی بەعزە شتێکە نەك هی هەموو شتێك؛ هەروا پێویستە بزانین ئەم دوو ماددە، وەختێ داخلی «موتەحەییرەی موقەییەدە» ئەبن ئەگەر ژنەکە میقداری دەورو[١] ئەووەڵی دەورەکە بزانێ، وەکوو لەم دو وێنەدا باسمان کرد؛ ئەگەر ئەمانەی نەئەزانی، مەسەلا، ئەوەی کە هەر ژمارەی حەیزی لە بیرە، بڵێت: ئەزانم حەیزم پێنج رۆژ بووە لە ماوەیەکا و غەیری ئەمە هیچ نازانم، یاخود ئەو ژنەکە هەر وەختی لەبیرە، بڵێت: ئەزانم حەیزم شەو و رۆژێ بووە لە ماوەی مانگێکا و غەیری ئەوە هیچ نازانم، ئەمانە، هەر حوکمی «موتەحەییرەی موتڵەقە» سەرگەردانی تەواوییان هەیە، وەکوو زوو بەیانمان کرد.

## زەیسانی

زەیسانی هاتنی خوێنە لە ژنەوە لەپاش منداڵبوون. ماوەی هاتنی ئەم خوێنە، لای خوارووی چاو تترووکاندنێکە و لای ژووررووەکەی، شەست رۆژ و ئەغڵەبەکەشی چل رۆژە. هەرچی بە حەیزەوە حەرام بێ، بە زەیسانییشەوە حەرامە. لادانی ماوەی زەیسانی لە شەست رۆژ، وەکوو لادانی ماوەی حەیزە لە پازدە رۆژ؛ جا ئەو ژنەی کە خوێنەکەی لە شەست رۆژ لائەدا، یا «موبتەدیئەی مومەییزە»یە نۆ جاریەتی و خوێنەکەی بە رەنگامە ئەبینێ هەندێ ئاڵ و هەندێ کاڵ، ئەمە ئەو خوێنەی ئاڵە، زەیسانییە و ئەوەی کاڵە، خوێنی ئیستیحازە (نەخۆشی) یە، ئەگەر ئاڵەکەی لە شەست رۆژ لانەدا[٢]. ئەگەر لایشبدا، ئەوە لەم کاتەدا خوێنی زەیسانییەکەی بە لەحزە (چاو تترووکاندنێ) دائەنرێ، ئیتر مەندەی خوێنەکەی هەموو، ئیستیحازە (نەخۆشی)یەو حوکمی لەمەوبەر رابورد.

---

١. مەبەست لە «دەور» بۆ ئەو ژنەی عادەتی نەگۆڕاوە، ئەو ماوەیەیە کە حەیزێك و پاکییەکی تیایە، بۆ ژنێکیش عادەتی گۆڕابێ، کۆمەڵی ئەو مانگانەیە کە عادەتە جیاجیاکانیان تیایە، لە حاشیەی «علي شبراملسي» وەرگیراوە.
٢. باقی شەرتەکانی تەمیز لێرەدا رێناکەون، چونکە خوێنی قەوی، لە لەحزە کەمتر نابێ تا بڵێین خوێنە قەوییەکە لەوە کەمتر نەبێ، پاکییش لە بەینی زەیسانی و حەیزا ئوسووڵێکی نییە تا بڵێین خوێنە زەعیفەکەی لەو ئەندازە کەمتر نەبێ.

ئەگەر موبتەدیئەی «لاٰمُمیّزە»شە، یانێ ئەو خوێنەی کە لە شـەست ڕۆژ لایـداوە، هەمووی یەك ڕەنگە یاخود ڕەنگامەیە، بەڵام ئاڵەکەی لە شەست ڕۆژ سەرکەوت، ئەمە زەیسانییەکەی یەك لەحزە (چاوترووکاندن)ە و باقی‌مەندەکەی، هەموو «استحاضة»یە.

ئەگەر موعتادەی مومەییزەشە، یانێ بەسەرهاتووی‌واکە فەرق لە بەینی خوێنەکانا بخا، ئەوە ڕەفتار بە فەرقەکەی ئەکرێ، چونکە بەسەرهاتێکی ئێستەیە و عادەتەکەی شتێکی کۆنە؛ بۆ وێنە، ئەم ژنە زووتر خوێنی پاش منالّی دە ڕۆژ بووە، ئەم جارە بیست ڕۆژ خوێنێکی ئاڵی چاو پێ‌کەوت و پەنجا ڕۆژیش خوێنی کـاڵ، لێرەدا ڕەفـتار بـە عادەتە کۆنەکە ناکەین کە دە ڕۆژە، بەڵکوو ڕەفتار بە فەرقەکە ئەکەین و بیست ڕۆژە ئاڵەکەی بۆ دائەنێین بە خوێنی زەیسانی، پەنجا ڕۆژەکەیش بە ئیستیحازە و نەخۆشی.

ئەگەر «موعتادەی غەیرە مومەییزە» بوو، ئەوە مادام عادەتی پـێشـووی لە بـیرە، ئەبرێتەوە سەر عادەتەکەی: بۆ وێنە، زووتر خوێنی پاش منالّی دە ڕۆژ بووە و ئێستە ئەگاتە سێ مانگ بە یەك ڕەنگ، لێرەدا، دە ڕۆژی بە «نیفاس» دائەنرێ و باقی‌مەندەکەی ئیستیحازەیە؛ ئەگەر عادەتی پێشووی لە بیر نییە، مەسەلا، ئەڵێت: لەمەوبەر لەپاش منالّ بوون خوێنی بووە، بەڵام نازانێ ئەندازەی چەند بووە و ئێستەش سێ مانگە خوێنی پاش منالّبوونی هەیە، ئەمە بە «مُتَحيّرة»: سەرگەردان ئەناسرێ؛ کەواتە، لەحزەیەکی، خوێنی زەیسانییە بە یەقین و لەوەلا تا دوو مانگ هەڵئەگرێت خوێنی زەیسانی بێ و هەڵیش‌ئەگرێ ڕزگار بووبێ لە زەیسانی و ئەم خوێنە «ئیستیحازە» و نەخۆشی بـێ، کەواتە، وەکوو پاك وایە لە هەر عیبادەتێکا نییەتی پێویست بێ و وەکوو زەیسـانە لە غەیری ئەوانا و گەرەکە هەموو فەرزەکانی بەجێ‌بێنێ و بۆ پاك کـردنەوە و بـەستنی فەرجی، ڕەفتاری «مُستَحاضة» بکاو بۆ هەموو فەرزێکیش، گەرەکـە خـۆی بشـۆرێ ئەگەر کاتی پاك بوونەوەی ئەوسای لە بیر نەبوو، ئەگینا لەو کاتانەدا غوسڵ پێویستە تا شەست ڕۆژ و لەوەپاش هەر «اِسْتِحاضة»یە و بەس.

**بێدار کردنەوە:** خوێنێ لەکاتی حەملی ژنا بێت بە خوێنی حەیز ئەناسرێ ئەگەر لە ماوەی خۆی کەمتر نەبێ؛ ئەو پاکییانەی لەنێوانی خوێنی حەیزا هەن، هەر بە حـەیز

ئەزانرێن؛ خوێنی زەرد و کاڵیش هەر خوێنی حەیزە. کاتێ ژن کەوتە خوێنەوە، ئەبێ بۆ هەموو رەفتارێ خۆی بە خاوەن حەیز بزانێ، جا ئەگەر بەر لە ماوەی حەیز رزگار بوو، ئەوە دەرئەکەوێ حەیز نەبووە و قەزای نوێژ و تاعەتەکەی ئەکاتەوە؛ هەر کاتێکیش خوێنەکەی نەما، ئەبێ خۆی بە پاك بزانێ و بۆ مێردەکەی دروستە پاش خۆشوردن بڕواتە لای. وە ئەگەر لەوەلا خوێنەکەی هاتەوە، ئەم کابرا بە گوناهبار ناناسرێ، چونکە رەفتارەکەی لەسەر باوەڕی پاك بوونەوەی ژنەکەی بووە.

## باسی نوێژ

ئەو نوێژانەی فەرز کراون لە هەموو شەو و رۆژێکا پێنجن:

یەکەم «ظُهر»، نوێژی نیوەڕۆ؛ ئەووەڵی وەختی ئەم نوێژە، ئەو کاتەیە کە رۆژ بەدیمەن لە ناوەڕاستی ئاسمان لائەدا و ئاخرەکەشی ئەو کاتەیە کە سێبەری هەر شتێ ئەوەندەی خۆی لێ‌بێ بێجگە لە سێبەری وەختی ئیستیوا: ئەو کاتە کە رۆژ وا لە ناوەڕاستی ئاسمانا.

ئەو سێبەری وەختی ئیستیوایە، لە وڵاتی ئێمەدا، بۆ هەر ئینسانێ، لە یەکەم مانگی بەهارا شەش پێیە بە پێی ئەو ئینسانە. لە دووەما چوار، لە سێهەما دوو، لەسێ مانگەی هاوینا بە پێچەوانەی بەهارە، لە یەکەم مانگی پایزا هەشت پێیە، لە دووەما یازدە، لە سێهەما دوازدە و لە سێ مانگەی زستانا، بە پێچەوانەی پایزە.

دووەم «عَصر»، نوێژی عەسر؛ ئەووەڵی وەختی ئەم نوێژە، ئاخری وەختی نیوەڕۆیە و تا قورسی خۆر ئاوا ئەبێ ئەمێنێتەوە [و]باش‌وایە لەو کاتە دوانەکەوێ کە سێبەری شت لە دووقاتی خۆی لائەدا.

سێهەم «مَغرِب»، نوێژی شێوان؛ ئەم نوێژە ئەمێنێتەوە تا سوورایی کەناری ئاسمان لای خۆرنشینەوە لە چاو ون ئەبێ.

چوارەم «عِشاء»، نوێژی خەوتنان؛ ئەووەڵی وەختی ئەم نوێژە، کاتی دوایی هاتنی نوێژی شێوانە و ئەشمێنێتەوە تا تلووعی فەجر، دەرکەوتنی سپیدەی بەیانی، بەڵام باش وایە لە سێ‌یەکی شەو دوا نەکەوێ.

**پێنجەم** «صُبح»، نوێژی سبەینێ؛ ئەم نوێژە دایێ بە (تلووعی فـەجری سـادق،) دەرکەوتنی سپیدەی بەیان کە بریتییە لەکاتی بڵاو بوونەوەی رووناکی بە پانایی قەراغی ئاسمانا لای رۆژهەڵاتەوە و ئەمێنێتەوە تا هەندێ لە قورسی رۆژ دەرئەکەوێ و هەتاو ئەدا لەسەر بەرزان، بەڵام چاك وایە لەو کاتە دوانەخرێ کە عاستی رۆژهـەڵات زەرد ئەبێ و رووناکی ئەوەندە هێرش دێنێ ئینسان هەموو شتێ لە نزیکەوە باش ئەناسێ و جیای ئەکاتەوە. ئەگەر یەکێ دەستی کرد بە نوێژی بەیانی و درێژەی پێدا تا پاش هەتاو کەوتن، ئەوە دروستە، هەروا نوێژی مەغریب و باقی نوێژەکانی تریش.

کەراهەتی هەیە نووستن پێش نوێژی عیشا و قسەکردن لەپاش نوێژی عیشا مەگەر لە شتێکا کە خێر بێ، وەکوو عولوومی شەرع و ئەو عیلمانەکە ئەسبابی زانینی ئەون، یا قسەکردن لە هەر هونەرێ کە زانینی فەرزی عەین بێ، وەکوو عیلمی عەقیدە و باوەڕ، یا فەرزی کیفایە بێ، وەکوو خەیاتی و ئاسنگەری و دارتاشی و باقی ئەو سەنعەتانە کە هۆی مانەوە و بەرزی ئوممەتی ئیسلامن، یا قسەکردنی سوننەت بێ، وەکوو قسە لەگەڵ میوانا بەو شەرتە فاسق نەبێ، یا ئەگەر فاسق بوو قسەکردنەکە لەبەر فیسقەکەی نەبێ[1] بەڵکوو لەبەر ئەوەبێ کە مامۆستای دەرزت بووە، یا هاوڕێی سەفەرتە، یـا شـەریکی بازرگانی و ئاڵوویرتە، یاخود لە تەرك کردن و بەجێ هێشتنیا ترسی شتێ ببێ.

ئەم نوێژانە واجب ئەبن بە هاتنی ئەووەڵی وەختەکەیان بە واجب بوونێکی ماوەدار، دروستیش نییە دوابخرێن مەگەر بەشەرتی ئەوە کە عـەزمت بـبێ لە مـاوەی وەخـتا بیانکەی. سوننەتە هەموو فەرزێ لە ئەووەڵی وەختەوە بەجێبێنی، بەڵام پاش ئەوە کە وەختەکەیان بە یەقین دابێت؛کەوابوو، ئەگەر یەکێ بڵێ: نوێژ بووە و یەکێ بڵێ: نەبووە و لە عەینی وەختا هەستنەوە بۆ نوێژ کردن، ئەگەر ئەو کەسە کە باوەڕی وایە نوێژ نەبووە، نوێژ بکا نوێژەکەی بەتاڵە.

**بزانن!** گەورەیی ئەووەڵی وەخت نافەوتێ بەوە کە ئینسان لەپاش بانگ خەریکی دەسنوێژ بێ یا چاوەڕێی کۆمەڵێ بێ کە عادەتیان وایە حازر ئەبن بۆ جەماعەت، یا

---

١. شیروانی: ب ١ ، ل ٤٣٠.

بەوە کە قسەیەکی کورت بکا لە بابەتێکی خێرا یا نان بخوات بۆ ئەوەی ئارەزووی بشکێ؛ بەڵێ، لە چەندشوێنێکدا پەلە نەکردن سوننەتە، وەکوو کاتێ کە حاجی خەریکی رەجمی شەیتانە، یاخود لەسەفەرا نیازی جەمعی هەبێ و لەکاتێ نوێژی یەکەما بەڕێوەبێ، یا بەرگ نەبێ بیکاتەبەری و بزانێ لە ئاخری وەختا بەرگی دەست ئەکەوێ، یا بە راستی نەزانێ نوێژبووە، یا لەبەر عوزرێ تەرکی نوێژی جومعەی کردبێ و ئومێدی وابێ لەپێش فەوتانی جومعەکەدا، عوزرەکەی نەمێنێ، یا لە وڵاتێکی زۆر گەرما بێ و نوێژەکەی بە جەماعەت بێ لە مزگەوتێکی دوورا، یا لە ئەووەڵی وەختەوە مەشغووڵی رزگارکردنی یەکێ بێ لە ئاوا یا لە ئاگرا یا لە بەڵایەکی تراگیری خواردبێ، بەڵکوو لەم کاتانەدا واجبە نوێژەکەی دوابخا.

هەر کەسێ نوێژەکەی دواکەوت، ئەگەر رکاتێ لە نوێژەکەی کەوتە وختەوە، ئەو نوێژە بە حازر دائەنرێ؛ ئەگەر یەکێ بەڕاستی وەختی نەئەزانی، ئەتوانێ ئیجتیهاد بکا بۆ زانینی وەخت بەهۆی ئیش وکاری خۆیەوە، مەسەلا، یەکێ لەپاش نوێژی بەیانی دە جوزء قورئانی ئەخوێند ئەوجا مەلا بانگی نیوەڕۆی ئەدا، یا خەیاتێ کەوایەکی ئەدووری و بانگی نیوەڕۆ ئەدرا، ئەتوانێ ئەو ئیشە بکا بە ئەندازە بۆ وەختی نیوەڕۆ؛ هەروا دروستە باوەڕ بکا بە کەڵەشێرێ یا بە پەلەوەرێ کە بەراوردی کردبن؛ جا ئەگەر لەپاش نوێژەکە دەرکەوت غەڵەت بووە، ئەوە واجبە لەسەری نوێژەکە بکاتەوە.

هەر کەسێ نوێژی فەوتا، واجبە قەزای بکاتەوە؛ جا ئەگەر بە بێ عوزری شەرعی فەوتابوو، واجبە لەسەری بە پەلە بیگێڕێتەوە و بیخاتە پێش ئەو نوێژە حازرانەیشەوە کە ترسی فەوتانیانی نەبێ، هەروا ئەبێ بیخاتە پێش ئەو نوێژانەیش کە بە عوزری شەرعی فەوتاون؛ ئەگەر بە عوزر فەوتابوو، سوننەتە پەلە بکا بۆ قەزاکردنەوەی و بیخاتە پێش ئەو نوێژە حازرانەیش کە ترسی فەوتانیانی نەبێ؛ ئەگەر هەموو نوێژە فەوتاوەکانی بە بێعوزر فەوتابوون یا هەموویان بە عوزر فەوتابوون، سوننەتە کە ئەیانگێڕێتەوە چاودێری تەرتیب بکا لە نێوانیانا.

حەرامە لەسەر کەسێ قەزای نوێژی لەسەر بێ، مەشغووڵ ببێ بە عیبادەتی سوننەتەوە لەو کاتانەدا کە مەجالی قەزای هەیە و پێویستە هەر کاتێکی ئەمێنێتەوە لە

نووستن و کاسبی لازم بۆ ژیان، سەرفی بکا لە قەزای نوێژەکانا. بەڵام، «شێخی رەمەلی»، ئەفەرموێت: «دروستە نوێژی سونەتی راتبەی هەر فەرزێکی فەوتاو لەگەڵ قەزای ئەو فەرزەدا بکات و راتبە قەبلییەکانیش بخاتە پێش قەزای فەرزەکانەوە»، لەمەوە دەرئەکەوێ کەوا بوونی قەزا لەسەر ئینسان، مانیع نییە لە کردنی «رَواتِب» لەگەڵ نوێژە حازرەکانا.

بزانن! نوێژ لە پێنج وەختا کەراهەتی هەیەو دانامەزرێ.

یەکەم، لەپاش ئەوە کە کابرا نوێژی سبەینێی کرد تا رۆژ ئەوەندەی رمێ بەرز ئەبێتەوە؛

دووەم، لەکاتی دەرچوونی رۆژەوە تا دەردێ و ئەوەندەی رمێ بەرز ئەبێتەوە؛

سێهەم، لە وەختی ئیستیواوە تا زەوال لە غەیری رۆژی جومعەدا؛

چوارەم، پاش ئەوە کە نوێژی عەسری کرد تا رۆژ ئاوا ئەبێ؛

پێنجەم، لەکاتی زەردەی خۆراوابوونەوە تا رۆژ ئاوا ئەبێ؛ بەڵام ئەم کەراهەتە لە حەرەمی مەککەدا نییە و لە نوێژێکیشا نییە سەبەبی پێش کەوتبێ، وەك نوێژی قەزا و سوننەتی دەستنوێژ و دیاریی مزگەوت و جەنازە و رۆژ و مانگ گیران، کەواتە، بۆ سوننەتی موتڵەقە و بۆ خاوەن سەبەبی دواکەوتووە، وەك نوێژی «ئیستیخارە» و نوێژی «ئیحرام»، بەڵام شەرتی دروستبوونی نوێژی خاوەن سەبەبی پێشکەوتوو، ئەوەیە کابرا بەتایبەتی ئەو کاتانەی هەڵنەبژاردبێ بۆ نوێژ لەبەر موخالەفەی شەرع، ئەگینا حەرامن.

## نوێژ لەسەر کێ واجبە و لەسەر کێ واجب نییە؟

نوێژ واجب نییە لەسەر یەکێ نەبێ کە موسوڵمان و باڵغ و عاقڵ و پاك بێ؛ کەواتە، واجب نییە لەسەر کافر، یانێ کافر تا کافر بێ، شەرع داوای نوێژی لێ ناکا، بەڵکوو داوای لێ ئەکا موسوڵمان ببێ ئەوجا نوێژ بکا. هەر کافرێ موسوڵمان ببێ، قەزای نوێژی زەمانی کافرێتی لەسەر نییە، مەگەر «مُرْتَد»، یانێ ئەو کەسە کە لەدوای

موسوڵمانەتی گەڕابێتەوە بۆ سەر کوفر، ئەوە هەر کاتێ موسوڵمان بووەوە، پێویستە هەر نوێژێکی لە وەختی «مورتەد»یدا فەوتاوە، قەزای بکاتەوە.

هەروەها نوێژ واجب نییە لەسەر منداڵ؛ بەڵام واجبە لەسەر باوك و دایکی و بەرەوژوورتر لەوان لە تەمەنی حەوت ساڵیدا ئەمری پێبکەن بە نوێژ کردن‌و کە دە ساڵی پڕکردەوە تا باڵغ ئەبێ بە فامیدەیی، لەسەر نوێژ لێی‌بدەن بە لێدانێکی نەرمی عادەتی، بۆ ئەوەی خوو بە نوێژ کردنەوە بگرێ و لەپاش بلووغ تەرکی نەکا؛ کە لە توانایشیا بوو ڕۆژوو بگرێت، پێویستە ئەمری پێبکەن ڕۆژوو بگرێ.

بەر لە هەمووشتێ، پێویستە لەسەر باوك و دایك، منداڵەکانیان فێر بکەن کە ئەم عالەمە، پەروەردگارێکی هەیە ناوی «اللّٰه»یە کە بە کوردی پێی ئەڵێن «خودا»؛ ئەم زاتە، هەر بووە و هەر ئەبێ و لە هیچ شتێ ناچێ و هەرچی سیفەتی گەورەی لایق هەیە، هەیەتی و هەرچی سیفەتی ناتەواوییە، دوورە لێی. هەروەها، فێری بکەن کە پێغەمبەری ئێمە، ناوی «مُحمّد»ە ﷺ و باوکی ناوی عەبدوڵڵایە و باپیری ناوی عەبدولموتەلیبە و دایکی ناوی ئامینەیە، لە شاری «مەککە» لە دایك بووە و هەر لە مەککەدا لەتەمەنی چل ساڵیدا خودا کردوویە بە پێغەمبەر بۆ هەموو جینن و ئینسان و لەپاش سێزدە ساڵ لە پێغەمبەری، بە فەرمانی خودا، ڕۆیشتووە بۆ شاری «مەدینە» و لەپاش دە ساڵ لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا لە مەدینە وەفاتی کردووە و مەرقەدی لەوێیە و تا دنیا بمێنێ دینەکەی حوکمی هەیە و لەپاش ئەو پێغەمبەر نابێ. هەروا، پێویستە هەر باوەڕ و عەقیدەیێ کە لە ئوسووڵی دینی ئیسلامە، فێریان بکەن و ئەمریان پێبکەن بە بەجێ هێنانی واجبات و بە تەرکی هەرشتێ کە حەرام بێ.

هەروا، نوێژ واجب نییە لەسەر ژنێ کە لە حەیزا یا لە زەیسانیدا بێ، واجبیش نییە لەسەر شێت و بێهۆش و سەرخۆشێ کە دەستی خۆیانی تیا نەبێ، بەڵام ئەگەر بە وەزعێکی ناشەرعی دەستی خۆیانی تیابوو، ئەوە لەپاش ڕزگاربوون، قەزای ئەو نوێژانەیان لەسەرە. ئەگەر ئەم مانیعانە لەکاتی یەکێ لە نوێژەکانا لاچوون لەسەریان و ئەوەندە لەو وەختە مابوو لەگەڵ نییەتا «اللهُ أَكْبر» بڵێن، ئەوە ئەو نوێژە واجبە لەسەریان.

هەروا، نوێژی نیوەڕۆ واجب ئەبێ بە واجب بوونی نوێژی عەسر؛ نوێژی مەغریبیش واجب ئەبێ بە واجب بوونی نوێژی عیشا.

ئەگەر منداڵێ نوێژی ئەکردو لەناو نوێژەکەدا بە تەمەن باڵغ بوو، ئەوە پێویستە ئەو نوێژە تەواو بکا و لەباتی فەرزی وەختەکە بۆی حیساب ئەکرێ؛ هەروا ئەگەر لەدوای تەواوکردنی نوێژەکەش باڵغ بوو، کردنەوەی ئەو نوێژەی لەسەر نییە. ئەگەر یەکێ لە ئەووەڵی وەختەوە مانیعێکی بەسەرا هات، ئەم شەخسە ئەگەر بە ساغی ماوەی کردنی نوێژەکەی رابوردبێ، ئەوە ئەو نوێژە فەرز ئەبێ لەسەری و پێویستە لەپاش رزگاربوون لەو مانیعە، ئەو نوێژەبکا، ئەگەر ئەوەندەی بە ساغی لەو وەختە رانەبواردبوو، ئەوە نوێژی ئەو وەختەی لەسەر نییە.

## باسی بانگ و قامەت

بانگدان و قامەتکردن، سوننەتن بۆ نوێژی فەرز و بەس. بۆ ئەو نوێژە سوننەتانەیش کە بە جەماعەت ئەکرێن، وەك نوێژی رۆژ و مانگگیران و نوێژی تەراویح و وەترێ کە بە جەماعەت بکرێ، ئەوە لەباتی بانگ و قامەت، ئەوترێ: «اَلصَّلاةُ جامِعَةٌ، الصَّلاةُ جامِعَةٌ؛ هَلُمُّوا لِلصَّلاةِ الفُلانِيَّةِ [لێرەدا، ناوی نوێژەکە ئەبرێ] يَرْحمْكُمُ اللّٰهُ». بانگدان بۆ ژن رەوا نییە، بەڵام قامەت سوننەتە بۆی. بانگ بۆ یەکێکیش کە بەتەنیا نوێژ بکا سوننەتە، سوننەتیشە ئەوەندەی تاقەت و توانای خۆی دەنگ بەرز بکاتەوە، مەگەر لە مزگەوتێکا نوێژی جەماعەتی تیاکرابێ یا خەڵکەکەی بە یەکەیەکە نوێژیان کردبێ و بڵاوەیان لێ کردبێ. هەروا، بۆ نوێژی فەوتاویش لەکاتی قەزا کردنەوەدا، بانگدان و قامەت کردن سوننەتە، بەڵام ئەگەر لەشوێنێکا چەند نوێژێکی فەوتاو ئەگێڕرایەوە، ئەوە تەنیا بۆ یەکەم نوێژیان بانگ ئەدرێ.

ئەو جوملانەی لە بانگا ئەوترێن، دوو دوون، مەگەر «اللّٰهُ أَكْبر» لە ئەووەڵیەوە کە چوارە و «لا إله إلا اللّٰه» لە ئاخریەوە کە یەکێکە. ئەو جوملانەش کە لە قامەتا ئەوترێن، یەکە یەکەن، مەگەر «اللّٰه أكبر» لە ئەووەڵ و ئاخریەوە و «قَدْ قامَتِ الصَّلاة»، ئەوانە دوو دوون.

سەبر و ئارامی لە بانگدانا سونнەتە، پەلەکردنیش لە قامەتا سوننەتە. هەروا، «تَرْجیع» لە هەموو بانگێکا و «تَثْوِیب» لە بانگی بەیانیدا سوننەتە؛ «تەرجیع»، ئەوەیە کە بانگدەر لەپێش ئەوەداکە هەردوو کەلیمەی شەهادەت بە دەنگی بەرز ئەڵێت، بۆ خۆی، بە پەنامەکی «شَهٰادَتَیْن» وەکوو بانگەکەی بڵێت، مەسەلا، بڵێ: «أَشْهَدُ أَنْ لّا إِلٰهَ إِلّا اللّٰه، أَشْهَدُ أَنْ لّا إِلٰهَ إِلّا اللّٰه، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اللّٰهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اللّٰه» ئەوجار دەنگیان بۆ بەرز بکاتەوە. «تەسویب»یش ئەوەیە لەپاش «حَيَّ عَلَى الْفَلاٰح»، دو جار بڵێ: «اَلصَّلاٰةُ خَيْرٌ مِّنَ النَّوْم».

لەفزەکانی بانگ، ئەمانەن: «اللّٰهُ أكبر، اللّٰه أكبر، اللّٰه أكبر، اللّٰه أكبر. أَشهدُ أن لّا إله إلّا اللّٰه، أشهد أن لا إله إلا اللّٰه. أشهدُ أنَّ محمّداً رسول اللّٰه، أشهد أنَّ محمّداً رسول اللّٰه. حي على الصَّلاٰة، حي على الصّلاٰة. حي على الفلاح، حي على الفلاح. اللّٰهُ أكبر، اللّٰه أكبر. لا إله إلا اللّٰه». لەفزەکانی قامەتیش، ئەمانەن: «اللّٰهُ أكبر، اللّٰه أَكبر. أشهد أنْ لّا إله إلا اللّٰه. أشهد أن محمداً رسول اللّٰه. حي على الصلوة. حي على الفلاح. قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة. اللّٰه أكبر، اللّٰه أكبر. لا إله إلا اللّٰه».

شەرتە ئەو کەسەی بانگ و قامەت ئەخوێنێ، موسوڵمان بێ، بەتایبەتی، بانگدەر ئەبێ نێرینە و باڵغ یا منداڵێکی خاوەن تەمیز بێ؛ بانگ و قامەت، ئەبێ کەلیمەکانیان یەك لەدوای یەك و بەتەرتیب بن. هەرکەسێ دەستی بە بانگ و قامەت کرد، ئەبێ هەر ئەو کەسە تەواویان بکا، کەواتە، بانگێ یا قامەتێ بە دوو کەس بەتاڵە، بۆ هەردووکیشیان شەرتە وەخت داهاتبێ، مەگەر بۆ نوێژی بەیانی، ئەوە لە نیوەشەوەوە بانگدان دروستە تا ڕۆژ ئەبێتەوە؛ جا لەسەر ئەم ئەساسە، سوننەتە بۆ نوێژی بەیانی دوو بانگدەر ببێ، یەکێکیان لەپێش فەجرا بانگبدا، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی پێویستە خۆیان بشۆن یا عوزرێکیان هەیە، خۆیان ئامادە بکەن، بانگدەری دووەمیش لەپاش ڕۆژبوونەوە بانگ بدا؛ ئەم دوو بانگدەرە، ئەگەر هەردووکیان بە ئیزنی فەرمانداری ئیسلام دامەزراون، ئەوە بۆ قامەتکردن، ئەبێ یا لەناو خۆیانا ڕێك بکەون یا قورعە بخەن، ئەگەر

یەکێکیشیان دامەزراوە و ئەویان وا نییە، ئەوە پێویستە دامەزراوەکە قامەت بکا، بەڵام بەفەرمانی ئیمام، چونکە قامەت بەسراوە بە ئیزنی ئیمامەوە، تەنانەت، هەندێ لە عالمان فەرموویانە: هەر قامەتێ کە بە بێ ئیزنی ئیمام بێ، بەتاڵە.

سوننەتە بانگ و قامەت بە راوەستانەوە بن. ئەگەر پێویستیش بوو، بانگەکە لە زۆر شوێنێکی بەرزەوە بێ بۆ ئەوەی خەڵك [ی] ئاگادار ببنەوە. سوننەتە بانگدەر و قامەتکەر روو بە قیبلە بن. هەروا، سوننەتە بانگدەر هەردوو پەنجەی شەهادەتی بخاتە کڕاکەی هەردوو گوێچکەیەوە. سوننەتە بانگدەر لە جاری ئەووەڵی «حي عَلى الصّلاة»دا، بەسەر لابکاتەوە بەلای راستا و لە جاری دووەما بگەڕێتەوە بۆ سەر وەزعی خۆی، لە جاری یەکەمی «حَيَّ على الفلاح»یشدا، بەسەر لابکاتەوە بۆ لای چەپ و لە جاری دووەمدا بگەڕێتەوە بۆ سەر وەزعی خۆی. سوننەتە بانگدەر و قامەت کەر دەسنوێژیان ببێ، چونکە بانگدان بۆ بێدەسنوێژ کەراهەتی هەیە و بۆ لەشپیس کەراهەتەکەی توندترە، بێدەسنوێژی و لەشپیسی بۆ قامەتکەر کەراهەتەکەی گەلێ گرانترە. سوننەتە بانگدەر عادڵو دەنگخۆش و دەنگبەرز بێ؛ ئەگەر چەند مزگەوتێکیش لە نزیکی یەکەوە بوون، هێشتا هەر سوننەتە لە هەموو مزگەوتەکانا بانگ بدرێ، چونکە مەبەست بڵاوکردنەوەی شیعارە نەك تەنیا بیستنی خەڵك. بانگدان بەتەنیا لە ئیمامەت خەیری زۆرترە؛ ئەو کەسە کە بانگ ئەدا ـ ئەگەر بۆی بلوێ ـ سوننەتە هەر خۆی ئیمامەتەکەش بکا.

سوننەتە بۆ ئەو کەسەی گوێی لە بانگ و قامەتەوەیە، ئەوەی ئەوان ئەیڵێن، ئەمیش بیڵێ، بێجگە لە هەردوو کەلیمەی «حي على الصّلاة» و «حي على الفلاح»، ئەوە لەمانا، بڵێت: «لا حولَ و لا قُوَّةَ إلّا باللّه» و بێجگە لە جوابی «الصّلاة خيرٌ من النَّوم»، ئەوە لێرەدا، بڵێت: «صَدَقتَ و بَرِرْتَ و بِالْحَقِّ نَطَقْتَ» و بێجگە لە جوابی «قَدْ قامَتِ الصّلاةُ»، ئەوە لێرەدا، بڵێت: «أَقامَهَا اللّهُ و أدامَها، وَ جَعَلَني مِنْ صالِحي أَهْلِها»؛ سوننەتە بۆ گوێگر، خوێندنی قورئانی پیرۆز ببڕێ، تا جوابی بانگ بداتەوە؛ ئەگەر مەشغووڵی دوعای پاش دەسنوێژیش بوو، لەپاش تەواو کردنی ئەو دوعایە، جوابی بانگەکە لەسەریەك بداتەوە، هەروا، ئەگەر لە ئاخری بانگا پێی‌زانی.

سوننەتە بۆ بانگدەر و قامەتکەر لەپاش بانگ و قامەتەکەوە، سەڵەوات بدەن و دوعا مەشهوورەکە بخوێنن، بڵێن: «اَللَّهُمَّ صَلِّ وَ سَلِّمْ وَ بارِكْ عَلَى النَّبِيِّ الْكَرِيمِ وَ آلِهِ. اَللَّهُمَّ رَبَّ هذِهِ الدَّعْوَةِ التّامَّةِ و الصَّلاةِ الْقائِمَةِ، آتِ سيِّدَنا محمّداً اَلْوَسِيلَةَ و الفَضِيلَةَ و الدَّرَجَةَ الَّرفيعةَ، وَ ابْعَثْهُ مقاماً محموداً الّذي وعَدْتَهُ إنَّكَ لا تُخْلِفُ الميعاد».

هەروا سەڵەواتدان لەپێش قامەتیشا سوننەتە[1]. سوننەتە لەنێوانی بانگ و قامەتا هەموو کەسێ دوعای خێر بۆ دین و دنیای خۆی و موسوڵمانان بکا؛ ئەگەر مابەینی قامەت و نوێژ زۆر فەسڵی کەوت، ئەبێ قامەتەکە دووبارە بکرێتەوە. سوننەتە ئیمام لەپاش تەواوبوونی قامەت راست ببێتەوە، هەروا سوننەتە ئەمر بکا بەوانەی کە لە پشتیەوەن ریزەکەیان رێكبخەن و بلکێن بە یەکەوە، بەڵام بە جۆرێ کە لە نوێژەکەدا زەحمەتیان پێنەگا.

سوننەتە بانگدان بەسەر مناڵاکە لەدایك ئەبێ و لەکاتی سووتانی شوێنێکا و لەکاتی تێکرژانی سوپای ئیسلام لەگەڵ سوپای کافرانا و بەسەر ئینسانی فێرەرقدا لەو کاتەدا کە رقی هەڵئەسێ و بەسەر ئینسانی «فێ» لێهاتوو و بەسەر ئینسانی پەرێشان و خەفەتبارا. سوننەتە بانگ و قامەت بەدوای کەسێکدا کە ئەڕوا بۆ سەفەرێکی پیرۆز، وەك خوێندنی عیلم یا سەفەری حەج، بەڵام جوابدانەوەی ئەم بانگانە سوننەت نییە.

**بێداری!** هەرکاتێ وەخت ئەوەندەی نەمابێ بەشی بانگ و قامەت بکا لەگەڵ نوێژەکەدا، سوننەت نییە بانگدان و قامەتکردن، بەڵکوو پێویستە تەرك بکرێن بۆ ئەوە کە نوێژەکە بە ئەدا جێبەجێ بکرێ.

## باسی شەرتی نوێژ

نوێژ، پێنج شەرتی هەیە:

(یەکەم)، زانینی داهاتنی وەختی نوێژەکەیە؛

---

١. حاشیەی شێخ سولەیمانی جەمەل لەسەر «فتح‌الوهّاب».

(دووهەم)، رووکردنە لە قیبلە؛

(سێهەم)، داپۆشینی عەورەتە؛ عەورەتی پیاو لە نوێژا[1] مابەینی ناوك و ئەژنۆیەتی، کەواتە، نەفسی ناوك و ئەژنۆ عەورەت نین، بەڵام پێویستە کە هەردووکیان داپۆشرێ بۆ ئەوەی کە داپۆشینی عەورەت بەڕاستی بێتەجێ. عەورەتی ژنیش، هەموو لەشیەتی بێجگە لە دەموچاو و هەردوو دەستی تا جمگەی مووچ[2]. شەرتی پۆشاکەکە ئەوەیە مەنعی بینینی رەنگی پێستی عەورەت بکا. ئەگەر بەرگی دەس نەکەوت، پێویستە ئەو مابەینە بە قوڕ یا بە ئاوێکی لێڵ داپۆشێ. ئەگەر ئەمەیش نەبوو واجبە بە رووتی نوێژەکەی بکاو قەزای نوێژەکەیشی لەسەر نییە. ئەگەر با لەکوتووپڕا عەورەتی دەرخست، ئەمیش بە بێقسوور خۆی داپۆشی، ئەوە قەیدی نییە، ئەگینا نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە. پێویستە وەزعی پۆشاکەکە وا بێ کە لەلای ژوورەوە لە تەنیشتەوە عەورەتی نەبینرێ، کەواتە، پێویستە ئینسانی نوێژکەر یا پشتێنێ ببەستێ یاخود بە قۆپچە ناوقەدی ببەستێ بۆ ئەوەی مەنعی بینینی عەورەت بکا؛ بەڵام بینینی عەورەتی نوێژکەر لەلای خوارەوە قەیدی نییە؛ ئەگەر ئەوەندە پۆشاکی دەس ئەکەوت هەر بەشی بەرودوای بکا، ئەوە پێویستە هەر ئەو دوانەی پێداپۆشێ؛

(چوارەم)، پاکییە لە بێدەسنوێژی و لەشپیسی؛

(پێنجەم)، پاکی لەش و پۆشاك و جێگەی نوێژە. جا ئەگەر لەناو نوێژەکەدا بێدەسنوێژی بەسەراهات، پێویستە دەسنوێژ بگرێ و سەرلەنوێ نوێژەکەی بکاتەوە. ئەگەر پۆشاکێ یا جێگەیەکی پاك و پیسی لێگۆڕا، ئەبێ ئیجتیهاد (کۆشش) بکا بۆ دۆزینەوەی پاکەکەیان بە نیشانە و بەڵگە. ئەگەر هەندێ لە لەش یا لە پۆشاکی پیس بوو و نەیئەزانی کوێیەتی، پێویستە هەموو لەشی یا هەموو ئەو پۆشاکەی بشۆرێ.

---

١. هەروا عەورەتی لەگەڵ پیاو و لەگەڵ ژنی مەحرەما؛ بەڵام لەگەڵ ژنی بێگانەدا ئەوە هەموو لەشیەتی بە پێست و مووەوە؛ عەورەتی لە خەڵوەتا تەنیا بەر و دوایەتی، ئەگەر مەبەستێکی شەرعی بێ، ئەوە دروستە تەماشایان بکا.

٢. عەورەتی ژن لەگەڵ پیاوی نامەحرەما، هەموو لەشیەتی و لەگەڵ ژنی موسوڵمان و پیاوی مەحرەما، بەینی ناوك و ئەژنۆیەتی؛ لەگەڵ ژنی کافریشدا، غەیری ئەو جێگەیەی دەرئەکەوێ لە ئیش و کارا، هەمووی عەورەتە.

ئەگەر جلێکی پیسی هەبوو و ئێستە نیوەی شۆرد و لەپاش ماوەیێ نیوەکەی تریشی شۆرد، ئەوە پێویستە قەیتانێ لەو پاکەی کە دراوسێی ئەم نیوە پیسەیە، دووبارە بیشۆرێتەوە، ئەگینا ئەو دراوسێیە هەر بە پیس ئەزانرێ.

ئەگەر ئینسان لەشی یا پۆشاکی بەری گەیشت بە شتێکی پیس، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە با ئەو شتە پیسەش هەڵنەگرێ یاخود پیسێکی وشك بێ، کەواتە، ئەگەر نوێژکەرێ لە نوێژا لکا بە دیوارێکی پیسەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە [و] ئەگەر بوویش بە هەڵگری شتی پیس، نوێژەکەی بەتاڵە، کەواتە، ئەگەر ئینسان شتێکی پاکی هەڵگرت کە سەرێکی لەسەر شتێکی پیس بێ، مەسەلا، گوریسێکی هەڵگرت یا بەستی بەدەستیەوە کە ئەوسەری لەسەر شتێکی پیس بێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، خواه ئەوسەرەی لەسەر پیسییەکەیە بەسرابێ بە پیسییەکەوە یا نە و خواه ئەو شتە پاکە سەرێکی لەسەر پیسییەکەیە بە جووڵانەوەی نوێژەکەرەکە بجووڵێ یا نە، لە عەینی حاڵا ئەگەر ئەو گوریسە ـ مەسەلا ـ کە سەرێکی لەسەر پیسییە بیخاتە ژێری پێی، ئەوە زیانی بۆ نوێژەکەی نییە.

ئەگەرنوێژکەرێ شتێکی پاکی گرت بە دەستەوە کە سەرێکی تری بەسرابوو بە شتێکی پاکەوە و ئەو شتە پاکە بەسرابوو بە شتێکی پیسەوە، ئەگەر ئەم شتە پاکە دووهەمە کە لکاوە بە پیسەکەوە بەسرابێ بەو پیسەوە و ئەو پیسەیش بە جووڵانی نوێژکەرەکە بجووڵێ، ئەوە نوێژەکە بەتاڵ ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر هەر لەسەری دانرابێ و نەبەسرابێ پێیەوە، یاخود بەسرابێ پێیەوە بەڵام بە جووڵانی کابرا نەجووڵێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە؛ قسەی راست لەمبەبابەتەوە، ئەوەیە کە وتمان وەك لە «إعانة» دا نەقڵی ئەکا لە «کوردی»یەوە؛ کەواتە، ئەگەر نوێژکەرێ یا خوتبەخوێنێ تەلی میکرۆفۆنی بەدەستەوە بوو و ئەو تەلە توند کرابوو لە کۆڵەکەیەك و ئەو کۆڵەکە لە ئەرزێکی پیسدا داکوترابوو، ئەوە مادام ئەو شوێنە تەلەکەی پێوە بەسراوە پاك بێ، نوێژەکەی و خوتبەکەی دروستە چونکە ئەو کۆڵەکە بە راکێشانی ئینسان بەکێش ناکرێ.

هەروەها، زیانی نییە دەستێکی شکاو کە بە ئێسکێکی پیس بگیرێتەوە، مادام غەیری ئەو ئێسکە پیسە دەست نەکەوێ بۆ گرتنەوەی ئەو دەستە شکاوە. هەروا، زیانی نییە

پیساییەك بەرابەر بە سنگی ئینسان لەسەر جێگەی نوێژ، مادام پێوە نەلکێ. زیانیشی نییە دانانی پێ لەسەر لەغاوێ یا هەوسارێ کە ئەو سەرەکەی بەسرابێ بە حەیوانێکی پیسەوە.

**بزانن!** عەفو ئەدرێ لە قوڕی ڕێگا لە کاتێکا خۆپاراستن زەحمەت بێ، لە پـرژی ئاوی پلووسك کە لە بانی پیسەوە بێتە خوار یا لە ئەرزی پیس هەڵپرژێتەوە؛ لە جێ پێی سەگ و بەراز لە کەژ و کێوا ئەگەر ئەوەندە زۆر بێ خۆپاراستن لێی زەحمەت بێ، هەروا لە شوێن پێی سەگ لە ئاوەدانیدا و لە کەمێ خوێنی کێچ لە لەش و پۆشاکی ئینسانا و لە خوێنی برین و شوێنی کەڵەشاخ گرتن و لە کەمێ خوێنی بێگانە کە بکەوێتە سەر لەش و بەرگی ئینسان و لە رشانەوەی منداڵی شیرەخۆرە لە باوەشی دایکیدا.

ئەگەر کەسێ پاش ئەوە کە لە نوێژ بووەوە، زانی پـیسییەکـی وای پـێوە بـووە یـا پێوەیەتی کە عەفوی لێ نادرێ، ئەوە پێویستە نوێژەکەی بگێڕێتەوە؛ ئەگەر ژمارەی ئەو نوێژانەی نەئەزانی کە بەو پیسییەوە کردوونی، ئەبێ بچێتـەوە سـەر ئـەو ئـەندازەیـە بەڕاستی ئەیزانی کردوویەتی.

## درێژەی باسی قیبلە

رووکردنە قیبلە شەرتی نوێژە مەگەر لەکاتی شیددەتی ترسدا «مُطْلَقا» و لە نوێژی سوننەتی سەفەردا. دروستە ئینسان نوێژی سوننەت بکا بـە سـواری و بـە پـیادە بـا سەفەرەکەیشی کورت بێ، بەڵام ئینسانی ڕێبوار ئەگەر لەناو کەژاوەدا بێ و بۆی بکرێ رووبکاتە قیبلە و رکووع و سجوود تەواو بکا، ئەوە پێویستە رووبکاتە قیبلە؛ ئەگـەر ئەوەی بۆ رێنەکەوت، بەڵام بۆی ئەکرا بە ئاسانی لە کاتی «اللّٰهُ أكبر»ی نوێژدابەستنا رووبکاتە قیبلە، ئەوە پێویستە لەو کاتەدا رووی تێبکا، ئەگینا لەسەر حاڵی ڕێبواریی خۆی دەوام بکا [و] نوێژە سوننەتەکەی تەواو بکا، بەڵام ئەم ڕێبوارە نابێ لەعـاستی سەفەرەکەی لابدا مەگەر بەرە و قیبلە.

ئینسانی سوار، ئەبێ لە وەختی رکووعا کەمێ دابنەوێتەوە و لەکاتی سوجدەکەیا زیاتر لەو ئەندازە، بەڵام بۆ پیادە پێویستە لەکاتی تەکبیری «تحرُّم» و لە کاتی رکووع و

سجووددا روو لە قیبلە بکاو رکووع و سجوودەکەی تەواو بکا؛ دروست نییە بڕوا بە ڕێگەدا لە وەختی راوەستانا نەبێ بۆ خوێندنی فاتیحە و سوورەت و لەکاتی خوێندنی تەحیاتا؛ ئاشکرایە پێویستە کەوشی کابرا پاك بێ و ئەو خاکەی بەسەریا ئەڕوا پاك بێ، ئەگینا نوێژەکەی دروست نابێ.

دروستە ئینسانی سوار نوێژی فەرز بەسواری بکا بەو شەرتە وڵاغەکەی راوەستاو بێ و رووی لە قیبلە بێ و [خۆی] رکووع و سجوودی تەواو بکا، ئەگەر وانەبێ، نوێژی فەرز بەسەر وڵاغەکەوە دروست نییە. بەڵام نوێژی فەرز لە کەشتیدا و لەناو شەمەندەفەرا لە وەختی رۆیشتنا دروستە، چونکە ئەم نەوعە شوێنانە وەکوو خانووی ئینسان وان.

فێربوونی دەلیلی ناسینی قیبلە بۆ نیشتەجێ و ڕێبوار فەرزی عەینە لە شوێنێکا زانای سەمتی قیبلە کەم بێ و فەرزی کیفایەشە ئەگەر زانا لەو شوێنەدا زۆر بوو؛ لەسەر ئەم ئەساسە، هەرکەسێ بڕوا بۆ سەفەر و دەلیلی قیبلە نەزانێ و هاوڕێی زانایەکیش نەبێ، ئەو سەفەرەی گوناهەو لەو سەفەرا هەرچی بۆ سەفەری رەوایە، وەکوو تەیەمموم و «قَصْر و جَمْع»ی نوێژ و رۆژوو نەگرتن، بۆ ئەو کەسە دروست نییە. ئینسان لەکاتێکا لە خانووی «كَعْبَةُ اللّه» دا بێ و رووبکاتە دیواری کەعبە یا رووبکاتە دەرگاکەی و ئەو دەرگایە داخرابێ یاخود کرابێتەوە، بەڵام داری ناو دەرگاکە ئەوەندەی دووسێ یەکەگەز بەرز بێ، ئەوە نوێژەکەی دروستە، هەروا ئەگەر لەسەر بانی کەعبە نوێژ بکا و رووبکاتە حەساری قەراغی بانەکە و ئەو حەسارەیش دووسێ یەکەگەز بەرز بێ.

هەرکەسێ بۆی بکرێ خۆی بە یەقین قیبلە بزانێ، وەکوو یەکێ لە مەککەدا بێ و چاوی بکەوێ بە کەعبە، ئەوە حەرامە بکەوێتە شوێن قسەی خەڵك و پێویستە خۆی کەعبە دیاردی بکا؛ ئەگەر خۆی بە یەقین کەعبەی نەئەزانی، بەڵام یەکێکی باوەڕ پێ کراویوا هەبوو بە یەقین ئاگای لە کەعبە بوو، ئەوە واجبە بکەوێتە شوێن قسەی ئەو کەسە.

ئەگەر یەکێکی وای دەس نەکەوت، بەڵام خۆی ئەیتوانی ئیجتیهاد بکاو بە نیشانە و بەڵگە قیبلە بدۆزێتەوە، ئەوە واجبە لەسەری ئیجتیهاد بکا و حەرامە تەقلیدی خاوەن

ئیجتیهادێکی‌تر بکا، چونکە دروست نییە خاوەن ئیجتیهاد تابیعی خاوەن ئیجتیهاد بێ؛ دروستە لەم‌کاتی ئیجتیهادەدا باوەڕ بکا بە قیبلەنومای بەراورد کراو و بە میحرابی مزگەوتی قەرەباڵغی موسوڵمانان، بەڵام ڕەوایە لەسەر ئیجتیهاد لابدا بۆ لای ڕاست یا چەپی ئەو میحرابە، مەگەر لە میحرابی «مەدینەی مونەووەرە»دا.

دەلیلی قیبلە زۆرن؛ یەکێ لەو دەلیلانە زانینی درێژی و پانی وڵاتە. ئینسان پاش ئەوە خەتی «نِصْفُ النَّهار»ی وڵاتی زانی، دۆزینەوەی قیبلە ئاسانە ئەگەر دەرەجەی درێژی و پانی مەککەو ئەو شوێنی خۆیە بزانێ؛ مەسەلا، بۆ دۆزینەوەی «نِصْفُ النّهار»ی خۆت، لە ئەرزی ڕێکا، دائیرەیێ بکێشەو لەسەر مەرکەزی ئەو دائیرەیە دارێ، کە ئەوەندەی چواریەکی ماوەی ناو دائیرەکە درێژ بێ، داچەقێنە و شوێنی دەرچوونی سێبەری ئەو دارە لە دائیرەکە لەکاتی بەیانی و ئێوارەدا دیاری بکەو ئەو قەوسە کەوا لەبەینی ئەو دوو نیشانگادا، بیکە بە دووبەشەوە، لەم وەختەدا ئەو خەتە کە لەمەرکەزی دائیرەکەوە دەرئەچێ و ئەگاتە ئەو مابەینە، ئەوە خەتی «نصفُ النّهار»ی ئەو وڵاتەیە؛ جا کاتێ کە سێبەری دارەکە ئەکەوێتە عاستی ئەو خەتە، ئەوە کاتی «نصفُ النّهار»ی وڵاتەکەتە. جا لەبەر ئەوە کە «شارەزوور» لەپانیدا چواردە دەرەجە و بیست دەقیقەو لە درێژیدا چواردە دەرەجە و بیست دەقیقە لە پانی و درێژیی «مەککەی موکەڕڕەمە» زیاترە، ئێمە ئەگەر سەمتی جەنووبی غەربی خەتی «نصفُ النّهار»ی وڵاتی خۆمان بگرین و رووی تێبکەین، ئەوە ڕوومان لە قیبلەیە[1].

یەکێکی‌تر لەو دەلیلانە، ئەستێرەی قوتبی شیمالییە کە دوا ئەستێرەی حەوتەوانانی بچووکە. ئینسانێ لەم وڵاتی عێراقەدا هەروەختێ بەرەو جنووب بە نەوعێکی وا ڕاوەستا ئەگەر لەکاتێکا بەلای ڕاستا لای کردەوە ئەو ئەستێرەیەی بینی، ئەوە ئەو کەسە ڕووی لە قیبلەیە، بەڵام تا ئینسان زۆرتر بکەوێتە خۆرنشینی عێراقەوە، لاکردنەوەیەکی

١. درێژیی شاری مەککە لەسەر مقیاسی پێشوو، حەفتا و حەوت دەرەجەیە و عەرزی بیست و یەك دەرەجە و چل دەقیقەی ئاسمانییە، درێژیی شارەزووریش هەشتا و یەك دەرەجە و بیست دەقیقەی ئاسمانی و پانیی سی و شەش دەرەجەیە. بۆ هەر دەرەجەیەکی ئاسمانی، چوار دەقیقە بە سەعاتی زەمانی دانراوە، بەم میزانە نیوەڕۆی مەککە، هەژدە دەقیقە ئەکەوێتە دوای نیوەڕۆی شارەزوورەوە و مادام بەشی زەوالییشی بخەینە سەر، ئەبێ بە نزیکەی نیو سەعات.

زۆرتری ئەویٚ، مەسەلا، لە شاری مووسڵدا، لاکردنەوەی زۆرتر ئەویٚ تا لە شـاری کەرکووك و بەم‌جۆرە.

یەکێکی‌تر لەو دەلیلانە، ئەوەیە ئینسان شوێن دەرچوونی رۆژ لە ئەووەڵی زستانا و شوێن ئاوابوونی لە ئەووەڵ رۆژی هاوینا دیاری بکا؛ نوختەی ناوەڕاستی ئـەو دوو شوێنە، لە وڵاتی ئێمەدا، سەمتی قیبلەیە.

یەکێکی‌تر لەو دەلیلانە، دەرزیی قوتب‌نومایە. ئینسان لەم وڵاتی ئێمەدا ئەگەر شانی راستی ئەو دەرزیی قوتب‌نومایە بگریٚ، ئەوە رووی لە قیبلەیەو ئەهلی شەرع رەوایان داوە ئینسان باوەڕی پیٚ‌بکا.

جا ئەو کەسەی کە قابیلیەتی ئیجتیهادی هەیە، ئەگەر مەجالی ئیجتیهادی نـەبوو لەبەر تەنگی وەخت یا لەبەر ئەوە کە بەهۆی هەور و غوبارەوە سەرگەردان بوو، ئەوە دروست نییە تەقلیدی خاوەن ئیجتیهادێکی‌تر بکا، بەڵکوو هەرچۆن بۆی رێکـەوت نوێژ بکاو لەکاتی دەرکەوتنی قیبلەدا ئەو نوێژە بە قەزا بکاتەوە ئەگەر لە نـوێژەکـەیا رووی لە قیبلە نەبووبیٚ. لەسەر ئینسانی خاوەن ئیجتیهاد پێویستە بۆ هەموو فـەرزیٚ ئیجتیهادەکەی تازە بکاتەوە، چونکە ئیجتیهاد قابیلی ئەوەیە بگۆڕیٚ. ئەگەر یـەکـیٚ ئەهلی ئیجتیهاد نەبوو بەڵام ئەیتوانی فێری دەلیلی قیبلە ببیٚ، پێویستە فێری ببیٚ، ئەگەر نەشی‌توانی فێری ببیٚ، واجبە تەقلیدی کەسێکی‌وا بکا کە زانا بیٚ بـە دەلیـلی قـیبلە. هەرکەسیٚ ئیجتیهادی کرد بۆ دۆزینەوەی قیبلە و پاشان بەیەقین بۆی دەرکەوت کەوا بەغەڵەتا چووە لەو ئیجتیهادەدا، ئەگەر ئەمە لەپێش کردنی نوێژەکـەدایـە، پـێویسـتە رووبکاتە ئەو تەرەفە کە بەیەقین قیبلەیەو، ئەگەر لەناو نوێژا بوو، پێویسـتە بـیبڕیٚ و سەرلەنویٚ نوێژەکەی دابمەزرێنێتەوە بەرەو تەرەفە راستەکە، هەروا ئـەگـەر لەپـاش نوێژکردن بوو و وەختی ئەو نوێژەیش مابوو؛ ئەگەر وەختیشی نەمابوو، قەزای بکاتەوە. هەر کەسیٚ ئیجتیهادی گۆڕا بەڵام باوەڕیشی لەلا یەقین نەبوو، ئەمە ئـەگـەر لەپـێش نوێژکردنایە یا لەناو نوێژەکەدایە، پێویستە رەفتار بەم ئیجتیهادە دواییە بکا، تەنانەت دروستە بەهۆی چوار ئیجتیهادی جیاوازەوە چوار رکاتەی نیوەڕۆ بە چوار تەرەفا بکاو

قەزای ئەو نوێژەیشی لەسەر نییە مادام بە یەقین نەزانێ بە هەڵەدا چووە. ئەگەر لەپاش کردنی نوێژەکە ئیجتیهادی گۆڕا، ئەوە هیچ ئیعتیبار و قیمەتی نییە و نابێ رەفتار بەم ئیجتیهادە دواییە بکا مادام بەیەقین نەزانێ ئەم ئیجتیهادە دواییە راستە.

لەم بەیاناتەوە دەرکەوت کەوا رووکردنە قیبلە، بە پێنج جۆرە:

(یەکەم)، عیلمی یەقین بە قیبلە؛

(دووهەم)، تابیع بوون بە یەکێ کە عیلمی یەقینی ببێ؛

(سێهەم)، ئیجتیهادی ئینسان خۆی؛

(چوارەم)، تەقلیدی موجتەهید؛

(پێنجەم)، حیرەت و سەرگەردانی.

بزانن! دەرکەوتنی میحرابی مزگەوتی حەزرەتﷺ لە «مەدینەی مونەوەرە» دا، نەشوێنی خەبەردانی کەسێکدایە کە «عِلمُ الیَقین»ی ببێ؛ چاو کەوتنیش بە میحرابی مزگەوتی شارانی تری ئیسلام و بە قوتبنوما، لەپایەی ئیجتیهاددایە. بەڵام ئینسان خاترخۆیە لە رەفتارکردنا بە ئیجتیهادی خۆی یا بەپێی قوتبنوما و میحرابی شارانی ئیسلام.

## باسی چۆنیەتی نوێژ

ئەرکانی نوێژ، واتە ئەو شتانە کە نوێژ بەوانە پێکدێ، سیانزەن:

یەکەم، «نییەت»، یانێ قەسدو مەبەستی دڵ. جا ئەگەر نوێژی فەرزی کرد، پێویستە قەسدی کردنی نوێژەکەو دیاری کردنی ناو و مولاحەزەی فەرزیەتی ببێ؛ ئەگەر نوێژێکی سونەتی وایشی کرد کە وەختی تایبەتی ببێ، وەکوو نوێژی چێشتەنگا، یا سەبەبێکی تایبەتی هەبوو، وەکوو نوێژی رۆژگیران، ئەوە پێویستە هەر نییەتی کردن و دیاری کردنی ببێ، ئیتر باسی سونەت پێویست نییە؛ ئەگەر نوێژێکی سونەتی بێوەخت و سەبەبیش بوو، ئەوە تەنیا قەسدی کردنی نوێژ پێویستە و پێویست نییە لە دڵا بە تایبەتی خەیاڵی ئەوە بکا کە ئەم نوێژە بۆ زاتی خودایە، چونکە لەواقیعا نوێژ هەر بۆ خودا ئەکرێ، بەڵام ئەم خەیاڵە سونەتە. هەروا فەرز نییە دیاری کردنی بەجێهێنانی

نوێژی حازر یا گێڕانەوەی رابوردوو، بەڵکوو ئەم نییەتە سوننەتە. دروستە ئینسان نوێژێکی حازر بکا و نییەتی قەزا بێنێ یا نوێژێکی رابوردوو بکاو نییەتی ئەدای حازر بهێنێ، ئەگەر عوزرێکی ببێ، وەکوو هەور و تۆز و نەزانێ وەخت ماوە یا نەماوە یا مەبەستی لەم ئەداو قەزا هەر کردن و بەجێ‌هێنان بێ.

نییەت لە دڵایە، وتنی بە زمان فەرز نییە، بەڵام سوننەتە بۆ ئەوەکە دڵ و زمان بکەونە یەك، بەر لە وتنی «اللّٰهُ أكبَر»، ئەوانەی لە دڵا قەسدی کردوون بە زمان بیانڵێت.

دووهەم، وتنی «اللّٰهُ أكْبَر»ە لەگەڵ ئەو نییەتەدا کە لە دڵیا بووە. فەرزە لەسەر کەسێ توانای وتنی ئەم لەفزەی ببێ یا بتوانێ فێری ببێ، ئەم لەفزە بە تایبەتی بڵێت، ئەگینا تەرجومەکەی بڵێ، وەکوو: «خودا لە هەمووکەسێ گەورەترە» و عەیبی نییە زیادەیەکی واکە مەنعی ناوی «تَكبير» نەکا، وەکوو «اللّٰهُ الأَكبر» بە ئەلف لام، یا «اللّٰهُ الْجَلِيلُ أكْبر» بە زیادەی «الجَليل»، بەڵام بەرودواکردن بەو لەفزە، وەکوو «أكبر اللّه»، ئەوە دروست نییە.

سوننەتە لەگەڵ ئەووەڵی «اللّه أكبر»ا هەردوو دەستی بە رووتی و کراوەیی لەگەڵ کەمێ بڵاویی پەنجەکانیا بەرزکاتەوە تا سەری پەنجەکان رێکی لای ژووررووی گوێ و پەنجە گەورەکانی رێکی نەرمەی گوێی بن و، بەری دەستی رووی لە قیبلە بێ و کەمێ سەرپەنجەکانی بەرەو قیبلە لار ببنەوەو ئاخری بەرز کردنەوەی دەستی لەگەڵ ئاخرهاتنی لەفزی «اللّٰهُ أكبر»دا یەك بکەون، جا پاش ئەوە دەستەکانی بێنێتە خوارەوە بۆ خواری سنگ و ژووری ناوکی بە مەیلی لای چەپ، بە دەستی راستی مووچی دەستی چەپی بگرێ.

پێویستە ئەو نییەتەی باسمان کرد، لەگەڵ هەموو حەرفێکی «اللّٰهُ أكبر»دا بکەوێتە یەك، بەڵام لەبەر ئەوەکە ئەم وەزعە گرانە و بۆ هەمووکەس دەس نادا، کۆمەڵێ لە پێشەوا بەرزەکانی مەزهەبی شافیعی، وەکوو «امامُ الحَرمَينْ» و «امام غزالی»، ئیختیاری ئەوەیان کردووە کە کەوتنە یەکێکی عورفی لەبەینی نییەتی دڵ و وتنی «اللّٰهُ أكبر»دا کافییە، یانێ بە جۆرێکیوا کابرا بە ئینسانێ بزانرێ کە خۆی حازر کردبێ بۆ نوێژ دابەستن و خۆی ئەوەندە ئاگادار بێ کە ئەو نوێژە دیارییە دائەبەستێ؛ جا با لەم مەسەلەیەدا ئینسان بکەوێتە شوێنی ئەم ئیمامانە و بە قسەکەیان رازی بێ.

**سێهەم**، راوەستانە بۆ خوێندنی فاتیحە لە نوێژی فەرزا بۆ یەکێ توانای بێ؛ شەرتی راوەستان ئەوەیە زنجیرەی پشتی رێك بوەستێ؛ کەواتە، ئەگەر یەکێوا راوەستا بچەمێتەوە بە بەرا یا بە دوادا، بەلای راستا یا بەلای چەپا، بە ئەندازەیێ کە لە عورفا پێی نەڵێن راوەستاو، ئەوە نوێژەکەی دروست نییە. ئەگەر نوێژکەر نەیتوانی راوەستێ مەگەر وەکوو ئینسانێ کە لە رکووعا بێ، ئەوە دروستە وا راوەستێ بۆ خوێندنی فاتیحە، بەڵام بۆ رکووعەکەی زیاتر بچەمێتەوە؛ ئەگەر ئەیتوانی راوەستێ بۆ فاتیحە بەڵام نەیئەتوانی رکووع و سجوودەکەی تەواو بکا، ئەوە با راوەستێ بۆ فاتیحە و بۆ رکووع و سجوودەکەی هەرچەند ئەتوانێ بەجێی بێنێ و هەرچیشی نەتوانی، قەیدناکا.

ئەگەر هەر تاقەتی راوەستانی نەبوو، ئەوە هەرچۆن مەیلی هەیە دابنیشێ، بەڵام «اِفْتِراش»،[1] واتە بەچۆکاهاتن و پێ خستنە ژێر، باشترە لە «تَرَبُّع» واتە دانیشتنی چوار مەشقی؛ کەراهەتی هەیە «اِقْعاء»، واتە بەقنگەوە دانیشتن و ئەژنۆ هەڵنان. جا کاتێ کە فاتیحەکەی بەدانیشتنەوە خوێند، ئەوسا بۆ رکووعەکەی ئەوەندە دابنەوێتەوە تەوێڵی رێکی بەر ئەژنۆی بێ، بەڵام ئەگەر ئەوەندە دابنەوێتەوە کە تەوێڵی رێکی سوجدەگاکەی بێ، ئەوە باشترە. ئەگەر کابرا نەیئەتوانی دانیشێ، بەلای راستا بکەوێ؛ ئەگەر نەیتوانی بەلای راستا بکەوێ، دروستە لەسەر لای چەپ بکەوێ؛ ئەگەر ئەمەشی نەتوانی، لەسەر پشت راکشێ، بەڵام واجبە شتێ بخاتە ژێر سەری بۆ ئەوەی رووی لە قیبلە بێ، سوننەتە پاژنەکانی رووبکەنە قیبلە، جا بۆ رکووع و سجوود زۆر و کەم ئیشارە بکا.

ئەم باسەی کردمان، بۆ نوێژی فەرز بوو، چونکە لە نوێژی سوننەتدا، کابرا هەرچەند توانای راوەستانیشی بێ، ئەتوانێ بە دانیشتنەوە نوێژەکەی بکا.

**چوارەم**، خوێندنی فاتیحەیە لە هەموو رکاتێکا بە راوەستانەوە بۆ یەکێ کە توانای بێ، مەگەر لە رکاتی نوێژکەرێکدا کە «مَسْبُوق» بێ، یانێ ئیمامی لێ پێشکەوتبێ، ئەوە، لەپاش «اللّٰهُ اکبَر»ی تەحەرڕوم، هەرچەند بۆی رێکەوت فاتیحە بخوێنێ، ئەگەر

---

[1] اِفتراش، ئەوەیە بێ بەچۆکا و پاژنەی چەپی بنێتە ژێری و پەنجەی پێی راستی هەڵنێ.

مەیدانیشی نەبوو بیخوێنێ، قەیدناکا و رکاتەکەیشی بۆ حیساب ئەکرێ بەو شەرتە بگا بە ئیمام لە رکووعا.

«بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيم»یش ئایەتێکە لە ئایەتەکانی فاتیحە، ئەگەر نوێژکەری «غَير مَسْبوق» تەرکی بکا، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە. هەروا، هەموو «شَدَّە»گیراوەکان کە چواردەن، داخڵی فاتیحەن، ئەگەر یەکێ بە بێ‌عوزر یەکێ لەو گیراوانەی بەردا، ئەوە خوێندنی ئەو لەفزە بەتاڵە. پێویستە هەموو حەرفێ لەو حەرفانەی وان لە فاتیحەدا هەریەکێ لە شوێنی تایبەتی خۆیەوە دەربکا؛ کەواتە، دروست نییە «صاد» بکا بە «سین» و «ضاد» بکا بە «ظێ» و «ذال» بکا بە «زێ»، هەروا هەموو حەرفەکانی تریش. تەرتیبی ئایەتەکان پێویستە و ئەبێ لەسەر ریزی دیاری خۆیان بخوێنرێنەوە؛ ئەگەر لە نیوەی دواییەوە دەستی پێ کرد و لەپاش نیوەی دوایی، نیوەی ئەووەڵی خوێند، ئەوە لێرەدا هیچ ئیعتیبار نییە بەو نیوە دواییەکە زوو دەستی پێ کردووە؛ جا ئەگەر ئەمەی بە سەهو کردووەو کاتێکی زۆری بەسەرا نەرۆییوە، ئیعتیبار بەم نیوەی ئەووەڵی فاتیحەیە ئەکرێ کە ئەم لەدوادا خۆیندوویەتی و پێویستە فاتیحەکەی لەسەر ئەمەوە تەواو بکا؛ ئەگەر بە قەسدیش بووە یا زۆری پێ چووە، لازمە لە ئەووەڵی فاتیحەوە دەس پێ‌بکاتەوە و جارێکی تر بە رێکی بیخوێنێتەوە.

ئەگەر نوێژکەر تەرکی حەرفێکی کرد لە کەلیمەیەك ـ بەقەسد ـ ئەوە ئەگەر مەعنای نەئەگۆڕی، پێویستە گورج ئەو حەرفە بە ساغی بخوێنێتەوە و هەرچی کە لەدوای ئەویشەوە خوێندوویەتی دووبارەی بکاتەوە، ئەگەر مەعنایشی ئەگۆڕی، وەکوو تەخفیفی گیراوی «إِيَّاكَ»، ئەوە ئەبێ سەرلەنوێ نوێژەکەی دابەستێتەوە و بیکاتەوە، چونکە تەرکی حەرفی‌وا بە عەمدی کە بەهۆی ئەو تەرکەوە مەعنا بگۆڕێ، موبالات نەکردنە بە نوێژەکە، کەواتە، نوێژی پێ بەتاڵ ئەبێتەوە؛ ئەگەر بە سەهویش تەرکی کرد، ئەبێ هەرکە پێی‌زانی بیخوێنێتەوە لەگەڵ ئەوەی لەدواوە خوێندوویەتی؛ کەواتە، ئەگەر زۆری پێ‌نەچووبێ، ئەوە خوێندنەوەی تەنیا ئەو حەرفە لەگەڵ دواییەکەیدا لازمە و خوێندنەوەی حەرفی پێش ئەو حەرفە پێویست نییە.

واجبە هەموو کەلیمەکان بە ساغی یەك لە شوێنی یەك بخوێنێ و زیاد لە راوەستان بۆ هەناسەدان یا حەسانەوەی ماندوویەتی، بەینیان نەخا؛ ئەگەر زیکرێکی خستە مابەینیانەوە، ئەوە ئەگەر زیکرەکە عەلاقەی بە نوێژەکەوە نەبوو، واجبە لە ئەووەڵەوە نوێژەکەی بکاتەوە، ئەگەر عەلاقەشی پێیەوە هەبوو، وەکوو وتنی «سُبْحَانَ اللّـه» بۆ خەبەردار کردنی ئیمام لە سەهو یا وەکوو خوێندنەوەی ئایەتێ کە ئیمام لێی تێك چووبێ، ئەوە قەید ناکا.

بزانن! ئایاتەکانی سوورەتی فاتیحە، هەروا کەلیماتی تەحیاتی دوایی و سەڵاوات لەسەر حەزرەتﷺ لە ئاخریاو سەلام دانەوەی یەکەم، واجبن و ئەبێ نوێژکەر وایان بخوێنێتەوە کە خۆی گوێی لێ بێ و بزانێ چی ئەڵێ.

واجبە غەڵەتێکی وا نەکا کە مەعنا بگۆڕێ بەهۆی بەردانی حەرفی گیراو، یا بەهۆی گۆڕینی حەرفێکەوە بە حەرفێکی تر، ئەگینا، مادام بەعەمدی بێ، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە و ئەبێ سەرلەنوێ دایبەستێتەوە، بەڵام ئەگەر بە سەهو بێ، ئەوە، کە زانی، گورج ئەبێ ئەو غەڵەتە راستبکاتەوە و ئەو گۆڕینە بباتەوە سەر ئەساس؛ بەڵام غەڵەتێ کە مەعنا نەگۆڕێ، وەکوو سەردان بە نوونی «دین» و دالی «نَعْبد»، ئەوە ئەگەر عەمدی بێ، حەرامە، هەرچەند نوێژەکەی پێ بەتاڵ نابێتەوە، ئەگەر سەهویش بێ نە حەرامە و نە نوێژەکەشی پێ بەتاڵ ئەبێتەوە. هەروا قەیدی نییە پەیدابوونی حەرفی «مَدْ» ـ کە ئەلف و واو و یێ‌یە ـ بەهۆی درێژ کردنەوەی سەر و بۆرو ژێری ئاخری کەلیمەکانەوە بە درێژکردنەوەیەکی عادەتی.

ئەگەر یەکێ نەیئەتوانی فێری فاتیحە ببێ، واجبە حەوت ئایەتی تر بخوێنێتەوە، خواهبەیەکەوە بن یا لە یەك جیا بن؛ ئەگەر ئەمەیش فێر نەبوو، ئەبێ زیکر بخوێنێ. بەڵام پێویستە ئەوەی لەباتی فاتیحە ئەخوێنرێ، لە فاتیحە کەمتر نەبێ. ئەگەر زیکریش فێر نەئەبوو، ئەوەندەی خوێندنی فاتیحە بە بێ‌دەنگی راوەستێ.

سوننەتە بۆ هەموو نوێژکەرێ لەپاش تەکبیری تەحەڕڕوم «دوعای ئیفتیتاح» بخوێنێ کە بریتییە لەمە: «وَجَّهتُ وجْهيَ لِلَّذي فَطَرَ السَّمواتِ وَ الْأَرضَ حَنيفاً

**مُسْلِماً وَ ما أَنَا مِنَ المُشْرِكينَ، إِنَّ صَلاٰتي وَ نُسُكي وَ مَحْيايَ وَ مَماتي لِلّٰهِ رَبِّ العالَمينَ، لا شَريكَ لَهُ وَ بِذلكَ أُمِرْتُ وَ أَنا مِنَ المُسْلِمينَ»**، سوننەتیشە لەپاش ئیفتیتاح، بڵێ: «**أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الشَّيْطٰانِ الرَّجيم**»، بەڵام ئەمە لە دوو رکاتی ئەووەڵ و دووەمدا سوننەتێکی گەورەترە.

سوننەتە هەرکەسێ فاتیحەی تەواو کرد، بڵێت: «آمین»، هەروا سوننەتە مەئموم لەگەڵ ئامینی ئیماما بە دەنگی بەرز ئامین بکا، سوننەتیشە وەستانێکی کەم لە بەینی ئاخری فاتیحە و «تَلَفُّظ» بە ئامین‌دا بێ، هەروا سوننەتە لەپاش لەفزی ئامین، «ربَّ الْعالمین» زیاد بکا و لەپێش ئامین کردنا، بڵێت: «**رَبِّ اغْفِرْ لي وَ لِوالِدَيَّ**».

سوننەتە بۆ نوێژکەری تەنیا و بۆ ئیمام، خوێندنی سوورەتێ لە قورئان لەپاش خوێندنی فاتیحە، بۆ مەئموومیش سوننەتە خۆی بێ‌دەنگ بێ‌و گوێ بگرێ لە ئیمام، مەگەر مەئموومێ کە دەنگی ئیمام نەبیسێ لەبەر دووری یا لەبەر ئەوە کە بە پەنامەکی بیخوێنێ، ئەوە لەم کاتەدا سوننەتە بۆ مەئموومیش خۆی سوورەت بخوێنێ. ئەم سوورەتە کە ئیمام ئەیخوێنێ، ئەبێ لەپاش ماوەیێ بێ تا لەو ماوەیەدا مەئموومەکان فاتیحە تەواو بکەن، لەو ماوەیەدا ئیمام بۆخۆی دوعا ئەخوێنێ[1]. ئەگەر یەکێ هات لە رکاتی سێهەما تابیعی ئیمام بوو، ئەوە ئەگەر مەیدانی بوو، لە رکاتی سێهەم و چوارەمی ئیماما سوورەت بخوێنێ، ئەگەر مەجالیشی نەبوو، پاش ئەوە کە لەم جیا بووەوە، بۆ خۆی لە رکاتی سێهەم و چوارەمی خۆیا لەباتی رکاتی یەکەم و دووهەم سوورەت بخوێنێ.

سوننەتە ئەو سوورەتانەی لە نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا ئەخوێنرێن، لە سوورەتە درێژەکان بن، ئەوانەیان کە ئایەتەکانیان کورتن کە بریتین لە سوورەتی «حُجُرات»ەوە تا سوورەتی «عَمَّ»؛ لە نوێژی عەسرو عیشایشدا، لە سوورەتە میانەکان بن، لەو سوورەتە ئایەت کورتانە کە لە سوورەتی «عَمَّ»وەن تا سوورەتی «ضُحىٰ»؛ لە نوێژی مەغریبیشدا،

---

١. دوعاکە، ئەمەیە: «اَللّٰهُمَّ باعِدْ بَيْني وَ بَيْنَ خَطٰايايَ كَما باعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَ الْمَغْرِبِ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطٰايا كَما يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ».

لە سوورەتە کورتەکان بن، لەو سوورەتە ئایەت کورتانەکە لە سوورەتی «ضُحیٰ»وەن تا ئاخری سوورەتەوردەکان؛ بۆ بەیانی جومعەیش، سوورەتی «سجْدة» و «هَلْ أَتیٰ» بن؛ بەڵام ئەم تەرتیبە لە کاتێکا سوننەتە نوێژکەرەکە پیاوێکی تەنیا بێ و کرێکاری کەس نەبێ و ژنی خاوەن شوو نەبێ، یاخود ئیمامی کۆمەڵێکی تایبەتی ژمارە دیاری بێ و لە مزگەوتێکی وادا بن کەسیان بەسەرا نەیێ و ئەو کۆمەڵەیش ژنی خاوەن مێرد و پیاوی کرێکاریان تیا نەبێ، ئەگینا سوننەتە هەر لە سوورەتە کورتەکان بخوێنن، مەگەر مێردی ژنەکە یا خاوەنکارەکە، ئیزنیان لەسەر درێژەدان بە نوێژەکە بیێ.

پێنجەم، لە ئەرکانی نوێژ «رکووع»ە. لای کەمی رکووع ئەوەیە ئەوەندە دابنەوێتەوە هەردوو بەری دەستی بگەن بە هەردوو ئەژنۆکانی بەشەرتی ئەوەکە لەشی ئەوەندە لە جووڵە بکەوێ بەرزەوەبوونی جیا بکرێتەوە لە دانەوینی و مەبەستیشی لەو دانەوینە شتی‌تر نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر یەکێ بە قەسدی سوجدەی تیلاوەت دانەوی و لەپاشا سوجدەکەی نەبرد و ئەم دانەوینەی کرد بە رکووع، ئەوە دروست نییە. لای زۆریشی ئەوەیە پشت و ملی لە دانەوینا رێك بین و هەردوو ساقی پێکانی رێك راوەستێنێ و هەردوو ئەژنۆی بە دەستەکانی بگرێت و پەنجەکانی بەرەو قیبلە بڵاو بکاتەوە و لە ئەووەڵی دانەوینەکەیەوە، «اللّٰهُ أکبر» بکاو هەردوو دەستیشی بەرز بکاتەوە، وەکوو لەکاتی «اللّه أکبر»ی نوێژ دابەستندا، جا سێ جار بڵێت: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ وَ بِحَمْدِهِ»؛ ئیمام لەم ئەندازەیە زیاد نەروا، بەڵام ئینسانی تەنیا، ئەمەیش بڵێت: «اَللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَ بِكَ آمَنْتُ، وَ لَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَ بَصَرِي وَ مُخِّي وَ عَظْمِي وَ عَصَبِي وَ مَا اسْتَقَلَّتْ بِهِ قَدَمِي».

شەشەم، راست بوونەوە (اِعْتِدال) و راوەستانە بەنەوعێ کە لەشی لە جووڵە بکەوێ و مەبەستی لەم بەرز بوونەوە شتی‌تر نەبێ؛ ئەگەر سەری لە ترسی شتێ بەرز کردەوە، ئەوە کافی نییە.

سوننەتە لەگەڵ سەر بەرزکردنەوەیا هەردوودەستی بەرزکاتەوە و بڵێت: «سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَه» کە راوەستا، بڵێت: «رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمٰواتِ وَ مِلءَ الْأَرْضِ وَ

مِلْءَ مٰا شِئْتَ مِنْ شَيْيءٍ بَعْدُ»؛ ئینسانی تەنیا، ئەمەیش بڵێت: «أَهْلَ الثَّنَاءِ وَ الْمَجْدِ، أَحَقُّ مٰا قٰالَ الْعَبْدُ وَ كُلُّنٰا لَكَ عَبْدٌ، لاٰمٰانِعَ لِمٰا أَعْطَيْتَ، وَ لاٰ مُعْطِيَ لِمٰا مَنَعْتَ، وَ لاٰ رٰادَّ لِمٰا قَضَيْتَ، وَ لاٰ يَنْفَعُ ذَاالْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ».

سوننەتە «قُنوت» لە ئیعتیدالی رکاتی دووهەمی بەیانیدا کە بـریتییە لەمـە: «اَللّٰهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَ عٰافِنِي فِيمَنْ عٰافَيْتَ، وَ تَوَلَّنِي فِيْمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَ بٰارِكْ لِي فِيْمٰا أَعْطَيْتَ، وَ قِنِي شَرَّ مٰا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَ لاٰ يُقْضَى عَلَيْكَ، وَ إِنَّهُ لاٰ يَذِلُّ مَنْ واٰلَيْتَ، وَ لاٰ يَعِزُّ مَنْ عٰادَيْتَ، تَبٰارَكْتَ رَبَّنٰا وَ تَعٰالَيْتَ، فَلَكَ الْحَمْدُ عَلىٰ مٰا قَضَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَ أَتُوبُ إِلَيْكَ». بۆ ئیمام سوننەتە قونووتەکەی بە لەفزی جەمع بخوێنێ، یانێ ئەوکەلیمانە کە بۆ تەنیا کەسێ ئەبن وایان لێبکا بۆ کۆمەڵێ دەس بدەن[1] هەروا سوننەتە ئیمام ئەم قونووتە بە دەنگی بەرز بخوێنێتەوە و سوننەتە مەئمووم ئامین بکا لە جوابی هەموو ئەو جوملانەوە کە دوعان، واتە تا «فَإِنَّكَ تَقْضِي» و باقییەکەی لەگەڵ ئیماما بخوێنێ و هەردووکیان دەست بەرز بکەنەوە تا ئاخری قونووت. سوننەتە سەڵاوات لە ئاخری قونووتەوە و مەئمووم بۆ ئەم سەڵاواتەیش هەر ئامین بکا.

ئەم قونووتە، لە ئیعتیدالی ئاخری هەموو فەرزێکا لەکاتی هێرشی بەڵا و مـەینەتا سوننەتە، خواه مەینەتی گشتی بێ، وەکوو شەڕ و شۆڕی جیهانی، یـا ئـەقلیمی، یـا تاعوون، یا بێبارانی وگرانی، یا تایبەتی بێ، وەکووگیرۆدە بوونی پیاوێکیوا قازانجی بۆ موسوڵمانان زۆر بێ؛ سوننەتە پـاش تـەواو کـردنی قـونووتی مـەشهوور، داوای لاچوونی ئەو بەڵا بکا.

**بزانن!** لە هەر قونووتێکا کە مەبەست لێی دەفـعی بـەڵاو مـەینەت بـێ، سـوننەتە نوێژکەر هەر لە ئەووەڵەوە تا ئاخری پشتی دەسـتەکـانی بکـاتە ئـاسمان[2]؛ ئـەگـەر مەبەستیشی داواکردنی خێرێ بێ، ئەوە بەری دەستەکـان بکـاتە ئـاسمان؛ بـەعزێ عولەما، فەرموویانە: ئەگەر مەبەستی دەفعی بەڵا بێ، ئەوە کە گـەیشتە «وَقِنِي شَرَّ مٰا

١. بڵێ: «اِهْدِنٰا، عٰافِنٰا، تَوَلَّنٰا، بٰارِكْ لَنٰا، قِنٰا، رَبَّنٰا، نَسْتَغْفِرُكَ وَ نَتُوبُ».
٢. ئەم حوکمە، لە لاپەڕە ٤٧ی «بُغية»دا هەیە.

**قَضَیْتَ»**، پشتی دەستەکانی بکاتە ئاسمان[1].

**حەوتەم**، سوجدەی یەکەمە کە لای کەمەکەی ئەوەیە بەعزێ لە تەوێڵی بە رووتی لەسەر جێگە نوێژەکەی دانێ. ئەگەر هات و سوجدەی لەسەر پۆشاکێ بردکە لکابوو بە خۆیەوە، ئەبێ ئەو پۆشاکە وابێ بە جووڵانەوەی ئەوکەسە نەجووڵێتەوە، وەکوو سەری پشتێنێکی درێژ، ئەگینا سوجدەکەی بەتاڵە. واجبە هەردوو بەری دەستی و ئەژنۆی و هەردوو پێی، یانێ جوزئێ لە سکی بەعزێ لە پەنجەکانیان بنێتە زەوی. پێویستە لەم سوجدەدا ئارام بێتەوە بەنەوعێ لەشی لە جووڵە بکەوێ و قورسی سەری بگا بە سوجدەگاکەی و پشت قنگی بەسەر سەر و ملیا بەرز بێتەوە [و] دانەوینەکەیشی هەر بۆ سوجدە بردن بێ، کەوابوو. ئەگەر لە ئیعتیدالا گێژ بوو و بەڕوودا کەوت، گەرەکە بگەڕێتەوە بۆ ئیعتیدال جا دانەوێتەوە سوجدە ببا. لای زۆرەکەی سوجدە، ئەوەیە «اللّه أکبر» بکا بۆ دانەوینەکەی بە بێ دەست بەرزەوە کردن و لەپێشا هەردوو ئەژنۆی بنێتە زەوی. جا هەردوو دەستی و تەوێلی و لووتی دانێ و بڵێت: **«سُبْحانَ رَبِّيَ الْأَعْلیٰ وَ بِحَمْدِهِ»** تا سێ جار و ئەگەر تەنیا خۆی بوو یا ئیمام بوو لەگەڵ شەرتە پێشووەکانا، ئەمەیش زیاد بکا: **«اَللّٰهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَ بِكَ آمَنْتُ، وَ لَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذي خَلَقَهُ وَ صَوَّرَهُ وَ شَقَّ سَمْعَهُ وَ بَصَرَهُ، تَبارَكَ اللّٰهُ أَحْسَنُ الْخالِقِين»**. سوننەتە هەردوو دەستی بەرابەری شانی بن و پەنجەکانی دەستی بەڕووتی و بە کراوەیی و بە یەکەوە لکاوی، بەرەو قیبلە، لەسەر جێی نوێژەکەی دانێ و ئەژنۆکانی لەیەك جیا بکاتەوە و سکی لە هەردوو رانی جیا بکاتەوە، هەروا هەردوو ئەنیشکیشی لە تەنیشتی دوور بخاتەوە؛ ئەم وەزعە لە رکووعیشا سوننەتە، بەڵێ ژن ئەبێ ئەم شوێنانە بلکێنێ بەیەکەوە.

**هەشتەم**، دانیشتنە لەپاش سوجدەی یەکەم بەنەوعێ لەشی لە جموجووڵ بکەوێ. واجبە مەقسەدی بە بەرزبوونەوەکەی هەر دانیشتنی بەینی سوجدەکان بێ و پێویستە درێژە بەم دانیشتنە نەدا و هەروا بە ئیعتیدالیش. لای زۆری ئەم دانیشتنە، ئەوەیە «اللّٰهُ

---

[1]. ئەم حوکمە، لە لاپەڕە ٧٦ی بەرگی ٢ی «شیروانی»دا هەیە.

أكبر» بکا بۆ بەرزەوەبوون لە سوجدە و بە وەزعی «افتِراش» یانێ لەسەر پێی چەپی دانیشێ و پێی راستی بە پەنجەکانەوە لەژێری خۆیا هەڵنێ و هەردوو دەستی بە کراوەیی لەسەر رانی لە نزیکی ئەژنۆکانیەوە دابنێ و بڵێت: «رَبِّ اغْفِرلِي وَ ارْحَمْنِي وَ اجْبُرْنِي وَ ارْفَعْنِي وَ اهْدِنِي وَ عٰافِنِي».

نۆهەم، سوجدەی دووهەمە وەکوو سوجدەی یەکەم. سوننەتە دانیشتنێکی سووك پاش سوجدەی دووهەم لە هەر رکاتێکا کە لێی هەڵبسێتەوە بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی، ئەگینا تەحیاتی یەکەم بخوێنێ.

دەهەم، خوێندنی تەحیاتە.

یازدەهەم، دانیشتنە لەکاتی خوێندنی تەحیاتەکەدا.

دوانزەهەم، سەڵاوات‌دانە لەسەر حەزرەتﷺ.

ئەمانە لەکاتێکا فەرزن کە سەلام دانەوەیان لەپاشەوە بێ، ئەگینا سوننەتن. نوێژکەر لەم تەحیات و سەڵاواتا هەرچۆن دابنیشێ باشە، بەڵام بۆ تەحیاتی یەکەم «افْتراش» وەکوو وتمان و بۆ تەحیاتی دوایی، «تَوَرُّك» سوننەتە، «تَوَرّك»یش هەر وەکوو «اِفتِراش»ە، بەڵام لێرەدا پێی چەپی لەژێریەوە دەرئەکا بۆ لای راستی و نەرمەی لاقنگی ئەلکێنێ بە زەوییەکەوە و دەستی چەپی لەسەر ئەژنۆی چەپی دائەنێ و پەنجەکانی دەستی راستی ئەنووقێنێ، تەنها پەنجەی شەهادەتی نەبێ کە بەری ئەداتەوە و کاتێ گەیشتە «اِلاَّ اللّٰه»، بەرزی ئەکاتەوە ئیتر نایجووڵێنێ و پەنجەی گەورەی ئەلکێنێ بە پەنجەی شەهادەتەوە. سەڵاوات لەسەر ئالی حەزرەت سوننەتە لە تەحیاتی دواییدا، بەڵام لە تەحیاتی یەکەمدا سوننەت نییە. لای کەمی تەحیات، ئەمەیە «اَلتَّحِيٰاتُ لِلّٰهِ سَلاٰمٌ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتَهُ، سَلاٰمٌ عَلَيْنٰا وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ الصّٰالِحينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاٰ إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهَ، وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّٰه»، لای کەمی سەڵاواتیش لەسەر حەزرەتﷺ، ئەمەیە «اَللّٰهُمَّ صَلِّ عَلىٰ مُحَمَّد» و لای زۆری تەحیات و سەڵاوات، ئەوەیە بڵێت: «اَلتَّحِيٰاتُ الْمُبٰارَكٰاتُ الصَّلوٰاتُ الطَّيِّبٰاتُ لِلّٰهِ، اَلسَّلاٰمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ، السَّلاٰمُ عَلَيْنٰا وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللّٰهِ

الصّالِحينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ اللّه وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّه، اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلىٰ مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَ رَسُولِكَ النَّبِيِّ الأُمِيِّ، وَ عَلىٰ آلِ مُحَمَّدٍ وَ أَزْواٰجِهِ وَ ذُرِّيَّتِهِ كَمٰا صَلَّيْتَ عَلىٰ إِبْراٰهِيمَ وَ عَلىٰ آلِ إِبْراٰهِيمَ فِي الْعٰالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدَ، وَ بٰارِكْ عَلىٰ مُحَمَّدٍ وَ آلِ مُحَمَّدٍ وَ أَزْواٰجِهِ وَ ذُرِّيَّتِهِ كَمٰا بٰارَكْتَ عَلىٰ إِبْراٰهِيمَ وَ عَلىٰ آلِ إِبْراٰهِيمَ فِي الْعٰالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».

خوێندنی دوعا لەپاش سەڵاواتەکە سونەتە، بەڵام ئەو دوعایانە کە بیسراون لە حەزرەتەوەﷺ گەورەترن و خێریان زۆرترە، وەکوو «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مٰاقَدَّمْتُ وَ مٰا أَخَّرْتُ وَ مٰا أَسْرَرْتُ وَ مٰا أَعْلَنْتُ وَ مٰا أَسْرَفْتُ وَ مٰا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَ أَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ أَنْت» یا وەکوو «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذاٰبِ الْقَبْرِ، وَ مِنْ عَذاٰبِ النّٰارِ، وَ مِنْ فِتْنَةِ الْمُحْيا وَ الْمَمَاتِ، وَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجّٰالِ» یا وەکوو «رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً كَبِيراً، وَ لاٰ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ».

سونەتە بۆ ئیمام لەم دوعادا زیاد نەڕوا لە ئەندازەی تەحیات و سەڵاوات لەسەر حەزرەتﷺ، مەگەر ئیمامێ کە شەرتە پێشووەکانی تیا بێتەجێ، بەڵام ئینسانێ کە بەتەنیا نوێژ بکا، ئەتوانێ هەرچەند ئارەزووی هەیە دوعا بخوێنێ مادام ترسی ئەوەی نەبێ بکەوێتە سەهووەوە؛ هەروا مەئمومیش، پاش سەلام دانەوەی ئیمامەکەی، ئەتوانێ دوعای زیاد بخوێنێ. کەسێ نەتوانێ تەحیات وسەڵاوات بخوێنێ، تەرجومەیان بخوێنێتەوە، هەروا ئەتوانێ تەرجومەی دوعاو زیکری سونەت بکا بەشەرتێ نەتوانێ بەعەرەبی بەجێیان بێنێ.

سیازدەهەم، سەلامدانەوەیە کە لایکەمی ئەوەیە یەكجار بڵێت: «اَلسَّلاٰمُ عَلَيْكُم» و لای زۆری ئەوەیە دوو جار بڵێت: «السَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّه» جارێ بەلای راستا و جارێ بەلای چەپا، ئەوندەش لابکاتەوە تا کوڵمی راست و چەپی ئەبینرێ و مەبەستی سەلام کردن بێلەوانەی کە لە لای راست و چەپیەوەن لە مەلائیکە و ئینس و جین؛ ئیمامیش نییەتی سەلامکردن بێنێ لە مەئمومەکان، ئەمانیش نییەتی جوابی

سەلامی ئەو بێنن. واجبە هەرکەسێ لە ئیمام و مەئموم و ئەوەی بەتەنها نوێژ ئەکا، ئەو سەلامە وا بخوێنێتەوە کە خۆی بیبیسێ و بەشوێنی «سلام»دا، گورج «عَلیکُم» بڵێ و بەینیان نەخا. سوننەتە بۆ ئیمام ئەوەندە دەنگ بەرز بکاتەوە ئەو کەسانەی نزیکن لەپشتیەوە بیبیسن. سوننەتە مەئموم پاش هەردوو سەلامەکەی ئیمام سەلام بداتەوە. ئەگەر سەلامی لەگەڵ سەلامی ئیمامدا یەك بگرێتەوە، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، ئەوەندە هەیە ئەم وەزعە مەکرووهە؛ بەڵام پێشکەوتن لە سەلامی ئیمام، نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە.

**چواردەهەم**، تەرتیبە، یانێ ریزدانی ئەم ئەرکانانە وەکوو باسمان کردن. جا ئەگەر هات و بە عەمدی تەرکی کرد، مەسەلا، بەر لە رکووع سوجدەی برد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، ئەگەر بە سەهویش بوو، ئەوە هەرچی بکا لەپاش تەرك کراوەکە، هەموو بێسوودە. جا ئەگەر ئەو تەرككراوەی کەوتەوە یاد، بەر لەوەی بگا بە وێنەی لە رکاتێکی ترا، ئەوە بیکا و لەسەر ریز بڕوا؛ ئەگەر بیریشی نەکەوتەوە تا گەیشت بە هاووێنەی، مەسەلا، تەرکی رکووعی رکاتی ئەووەڵی کرد و نەکەوتەوە بیری تا گەیشت بە رکووعی رکاتی دووهەم، ئەم رکووعە بکا بە رکووعی رکاتی ئەووەڵ و نوێژەکە تەواو بکا؛ کەواتە، ئەگەر لە ئاخری نوێژەکەیەوە کەوتەوە بیری کەوا تەرکی سوجدەیەکی کردووە لە رکاتی ئاخری نوێژەکەیا، ئەوە ئەو سوجدەیە ببا و تەحیاتەکەی بخوێنێتەوە و نوێژەکەی تەواو بکا، یا ئەگەر کەوتەوە بیری کە ئەو سوجدەیە لە رکاتێکی ترا بووە یا شکی بوو کە لە رکاتی ئاخرایە یا نە، پێویستە رکاتێ نوێژ بەتەواوی بکات، چونکە ئەو رکاتەکە سوجدەیەکی ناتەواو بووە، بە سوجدەیێ لە رکاتی دوایی تەواو ئەبێ و باقی ماندەکەی بێسوود ئەمێنێتەوە و بەساغی رکاتێکی ئەکەوێتەسەر.

ئەگەر لە راوەستانی رکاتی دووهەمدا بەوەی زانی کەوا لە رکاتی یەکەمدا سوجدەیەك تەرك کراوە، ئەبێ بیربکاتەوە بزانێ ئەگەر لەپاش ئەو سوجدەیە کە بردوویەتی، دانیشتووە، ئێستە گورج دانەوێ سوجدەیێ ببا بۆ ئەوە کە رکاتی یەکەمی

پێ تەواو بکا، جا دەس بکا بە رکاتی دووهەم، ئەگەر دایش نەنیشتبوو، ئێستە دابنیشێ، جا پاش دانیشتنەکە سوجدەیێ ببا بۆ تەواوکردنی رکاتی یەکەم، جا دەس بکا بە رکاتی دووهەم.

ئەگەر لە ئاخری نوێژێکی چوار رکاتیدا بەوەی زانی کە تەرکی دوو سوجدە یا سێ سوجدەی کردووە، بەڵام نەیئەزانی لە چ رکاتێکا بوون، واجبە ئێستە[1] دوو رکات نوێژ بە تەواوی بکا.

ئەگەر بەوەی زانی کە چوار سوجدەی تەرك کردووە، بەڵام نەیزانی جێگەکەیان لەکوێیە، ئەوە واجبە سوجدەیێ ببا و دوو رکات نوێژ بکا، چونکە هەڵئەگرێ سوجدەیەکی لە رکاتی یەکەمدا و دوو سوجدەی لە رکاتی سێهەمدا و یەك سوجدەی لە رکاتی چوارەمدا تەرك کردبێ؛ جا لەم وەزعەدا، رکاتی یەکەم بە سوجدەیێ لە رکاتی دووهەم تەواو ئەبێ، ئەمجار دیارییە کە سوجدەیەکی رکاتی چوارەمی لەگەڵ رکاتی دووهەم و رکاتی سێهەم لەسەر ماوە کە بە بەجێ‌هێنانیان نوێژەکەی تەواو ئەبێ.

ئەگەر بەوەی زانی کە پێنج یا شەش سوجدەی تەرك کردووە و شوێنەکەیانی نەزانی، ئەوە واجبە سێ رکات نوێژ بکا؛ چونکە هەڵئەگرێ سوجدەیەکی لە رکاتی یەکەمدا و دوو سوجدەی رکاتی دووهەم و دوو سوجدەی رکاتی سێهەمی تەرك کردبێ، ئەو سوجدەی شەشەمەش لە رکاتی چوارەمدا تەرك کرابێ؛ کەواتە، رکاتی یەکەم تەواو ئەبێ بە سوجدەیەکی رکاتی چوارەم و سێ رکاتی ساغی لەسەر ئەمێنێ بەو جۆرە کە وتمان جێ‌بەجێ ئەبێ.

ئەگەر بەوەی زانی کەوا لە نوێژەکەیدا حەوت سوجدەی تەرك کردووە، واجبە سوجدە ببا بۆ تەواوکردنی رکاتی یەکەم و پاش ئەوە سێ رکات نوێژ بکا. ئەگەر بە تەرکی هەشت سوجدەی زانی، ئەوە پێویستە دوو سوجدە ببا و پاش ئەوە سێ رکات

---

١. چونکە سوورەتی یەکەم حەمل ئەکرێ لەسەر تەرکی سوجدەیەك لە رکاتی یەکەم و سوجدەیەك لە رکاتی سێهەم. جا رکاتی ئەووەڵ تەواو ئەکرێ بە سوجدەیەکی رکاتی دووهەم و رکاتی سێهەمیش بە سوجدەیەکی رکاتی چوارەم و باقییەکەیان بەتاڵ ئەبێتەوە. سوورەتی دووهەمیش هەر ئەوەیە لەگەڵ تەرکی سوجدەیەکیش لە رکاتی دووهەمدا.

نوێژ بکا. سوورەتی تەرکی ئەم سوجدانە وەهایە کە کابرا لە سوجدەکانا لەشی لە جموجووڵ نەکەوتبێ، یاخود پێی باش دانەنابێ یا سوجدەکەی لەسەر پۆشاکێکی خۆی بووبێ کە بە جووڵەی ئەو جوڵابێتەوە.

**بزانن!** لە هەموو ئەو سوورەتانەدا سوننەتە کابرا سوجدەی سەهو ببا ئەوجار سەلام بداتەوە. سوننەتە نوێژکەر لە هەموو نوێژەکەیدا هەر بۆ سوجدەگای خۆی بڕوانێ، بەڵام لە تەحیاتی ئاخرا لەپاش بەرزکردنەوەی پەنجەی شەهادەتی لەگەڵ «إلاَّ اللّٰه»دا، سوننەتە هەر بۆ ئەو پەنجەیە بڕوانێ تا سەلام ئەداتەوە.

کەراهەتی نییە چاویشی بنێ بەیەکا ئەگەر ترسی بەسەرهاتی زیانێکی نەبێ؛ ئەگەر ترسی روانینێکی حەرامی بوو، ئەوە واجبە چاو بنێ بەیەکا. سوننەتە نوێژکەر لە نوێژەکەیدا «خُشوع» کزی دڵی ببێ، بەم تەرزە کە هەر بیری نوێژەکەی لە دڵا بێ و تێبکۆشێ بۆ ئەوە خەیاڵی بێگانە بە دڵیا نەیەت؛ ئەوەیش کە ئەبێ بەهۆی خشووع، ئەوەیە خەیاڵی ئەوە بکا کە لە حوزووری زاتی خودادا راوەستاوە و خودا بە هەموو خەیاڵێکی ئەزانێ و وا بزانێ خودای گەورە ئەبینێ، ئەگەر ئەم، خودا نابینێ خودا ئەم ئەبینێ.

سوننەتە بیر بکاتەوە لە مەعنای ئەو ئایەت و زیکرەی ئەیخوێنێ؛ ئەگەر نەخوێندەوار بوو، ئەوەندە بزانێ کەوا ئەم ئایەت و زیکرە، بۆ پاڕانەوە و سکاڵای خۆیەتی لە حوزووری زاتی خودادا.

سوننەتە قورئان بە «تَرتيل»: ئارام و سەبر و مۆڵەت بخوێنێتەوە، چونکە نیوە سوورەتێ بە سەبر، خێری لە سوورەتێ بە پەلە زۆرترە، مەگەر خوێندنی هەموو سوورەتەکە سوننەت بێ، وەکوو «ألم سجدة»، ئەوە بۆ تەواوکردنی ئەگەر کەمێ پەلە بکا قەیدی نییە.

سوننەتە سوورەتی تەواو بخوێنێ. سوورەتی تەواو ـ باکەمیش بێ ـ خێری لە چەند ئایەتێ لە سوورەتێ زۆرترە. سوننەتە هەموو نەوعە سوورەتێ لە سوورەتی رەحمەت و سوورەتی عەزاب بخوێنێتەوە؛ سوننەتە کاتێ گەیشت بە ئایەتی رەحمەت، داوای

ڕەحمەت بکا لە خودا و کاتێ گەیشت بە ئایەتی عەزاب، «اِسْتِعَاذَة» بکا بە خودا لە عەزاب و کاتێ گەیشت بە ئایەتی «تَسبیح»، «سُبْحان اللّه» بکا و کاتێ گەیشت بە ئایەتی «ضَربُ الْمثل» باش لەو مەسەلە تێفکرێ و کاتێ گەیشت بە ئایەتی ﴿أَلَيْسَ اللّهُ بِأَحْكَمِ الْحاكِمِينَ﴾ بڵێت: «بَلىٰ وَ أَنَا عَلى ذٰلِكَ مِنَ الشّاهِدِينَ» و کاتێ گەیشت بە ئایەتی ﴿فَبِأَيِّ حَديثٍ بَعْدَهُ يؤْمِنُونَ﴾ بڵێت: «آمنتُ بِاللّه» و کاتێ گەیشت بە ئایەتی ﴿فَمَنْ يأْتيكُمْ بِماءٍ مَعِينٍ﴾، بڵێت: «اللّهُ رَبُّ العالمينَ».

سوننەتە ئینسان بە جل‌وبەرگێکی پاك و جوانەوە و بە حاڵەتی خۆشی و نیشاتەوە نوێژ بکا و کە سوجدە ئەبا، لە سوجدەکەیدا دوعا بخوێنێ، وەکوو «اَللّٰهُمَّ اغْفِرْلي ذَنْبي كُلَّه، دُقَّهُ و جُلَّه، أَوَّلَهُ و آخِرَهُ، سِرَّهُ و عَلانيَتَهُ» و کە لە سوجدە یا لە تەحیات ڕاست ئەبێتەوە، هێز بداتە سەر بەری هەردوو دەستی بۆ ئەوەی سووك هەڵبسێتەوە و سینەی لە قیبلە هەڵنەسوورێ. سوننەتە سوورەتی ڕکاتی یەکەم لە سوورەتی ڕکاتی دووهەم درێژتر بێ. سوننەتە تەماشای ڕیزی سوورەتەکان بکا، مەسەلا سوورەتی «فَلَق» بەر لە سوورەتی «ناس» بخوێنێ.

سوننەتە بۆ ئینسانێ کە بە تەنها نوێژ بکا، یا بۆ مەئموم لەپاش جیابوونەوە لە ئیمام و بۆ نەفسی ئیمامیش پاش تەواو کردنی نوێژەکە، خەریك بین بە خوێندنی ئەو زیکرانەوە کە حەزرەت ﷺ خوێندوونی، مەسەلا، سێ جار بڵێن: «أَستَغفُر اللّهَ العظيم» و بڵێن: «اَللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ، و مِنكَ السَّلامُ، تبارَكتَ يا ذَا الجلالِ و الإِكرامِ»، جا «آيَة الْكرسي» بخوێنن و سی‌وسێ جار «سبحانَ اللّه» و سی‌وسێ جار «الحمدُللّه» و سی‌وسێ جار «اللّهُ أكبر» و پاش ئەمانە، «لا اله الا اللّه» بخوێنن. هەروا لە خودا بپاڕێنەوە بۆ چاکەی دنیا و قیامەت و دەفعی خراپەی دنیا و قیامەت؛ لە ئەووەڵ و ئاخری ئەم پاڕانەوەدا سەڵاوات بدەن لە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ. سوننەتە نوێژکەر پاش نوێژی بەیانی و نوێژی مەغریب، دە جار بڵێت: «لاٰ إِلٰهَ إلا اللّهُ وَحدَهُ لاشريكَ لهُ، لهُ المُلكُ و لهُ الحَمْدُ، يُحيِي و يُميتُ، بِيَدِهِ الخَيرُ، و هُو عَلى كُلِّ شيىءٍ قدير» و پاش هەموو نوێژێ، دە جار بڵێت: «لا اِلٰه الاّ اللّه». سوننەتە ئەم زیکرانە بە پەنامەکی

بخوێنرێن مەگەر بۆ ئیمامێ بیەوێ نوێژکەرەکانی پشتەوەی فێر بکا ئەوە تا فێر ئەبن، ئەبێ بە ئاشکرا بیخوێنێ، کاتێکیش کە فێربوون، بە پەنامەکی بیخوێنن، بەڵام ئیمامی «أذرعي»، وای پێباشە ئەگەر نوێژکەرەکان کۆمەڵ بوون، بۆ خوێندنی زیکـر دەنگ بەرزکەنەوە؛

**بزانن!** ئەم فەرموودەیە خاریجە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعی و لەسەر تـەقدیری رەفتار پێکردنیشی، ئەبێ نەگاتە ئەندازەیەك سەر لەو کەسانە تێك بدا کە لەو کاتەدا خەریکی نوێژن.

سوننەتە بۆ ئیمام لەکاتی خوێندنی زیکری پاش نوێژدا، شانی راستی بکاتە لای مەئموومەکانەوە و شانی چەپی بکاتە لای میحرابەوە، بـەڵام «جَـمالي رَمَـلي» وای بەباش زانیوە لە مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ، شانی چەپی بکاتە لای مەئموومەکانەوە و شانی راستی بکاتە لای میحرابەوە، بۆ ئەوەی پشت نەکاتە مەرقەدی پێغەمبەرﷺ.

سوننەتە لە هەر زیکرێکا کە دوعا و پاڕانەوەی تیابێ، هەردوو دەستی بەرز بکاتەوە بەو شەرتەی لە عاستی شانەکانی تێنەپەڕن، لەپاش دوعـاکـەیش دەست بـێنـێ بـە دەموچاویا؛ سوننەتیشە ئەو دوعایانە بخوێنێ کە لە پێغەمبەرەوە بیسراون و لە ئەووەڵ و ئاخری دوعاکانا، سەڵەوات بدا لە پێغەمبەرﷺ.

سوننەتە مەئمووم لە شوێنی خۆیا بمێنێتەوە تا ئیمام شوێنی خۆی بەجێ ئەهێڵێ ئەگەر عوزرێکی نەبوو لە زوو دەرچـوونا، کـە رۆیشـتیشە دەرەوە، روو بکـاتە ئـەو شوێنەی ئیشی تیا هەیە، ئەگەر ئیشی نەبوو، بەلای راستا بڕوا.

سوننەتە نوێژکەر بەین بخا لە بەینی نوێژی فەرز و سوننەتا، یا بە قسەیەك، یا بـە گوێزانەوەی جێگە. ئەگەر لەپاش نوێژی سبەینێ دانیشت بۆ زیکر خوێندن، سوننەتە تا خۆر ئەکەوێ شوێنەکەی بەجێنەهێڵێ، چونکە مانەوەکەی لەو شوێنەدا، خێری حەج و عەمرەیەکی سوننەتی هەیە.

بۆ هەر سوننەتێ جەماعەتی تیا نەبێ، وەکوو سوننەتی پێش و پاش نوێژ، سوننەتە لە ماڵی خۆیا بیکا لەبەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، بەڵام شێخی «ابنُ حَجر» لە توحفەدا ئەفەرموێت، ئەمە بۆ کاتێکە کە کابرا «مُعْتَكِف» نەبێ لە مزگەوتا، یاخود ترسی ئەوەی

نەبێ کە ئەگەر نوێژەکەی دواخست بۆ ماڵەوە، بفەوتێ یا وەختەکەی بەسەر بچێ؛ لەسەر ئەم فەرموودەیە بۆ ئەوانەی ماڵیان لە مزگەوتەوە دوورە، یا ئیش و کاری پێویستی بازاڕیان هەیە، یا لەماڵەوە شوێنی تایبەتییان نییە بۆ نوێژ، چاکتر ئەوەیە ئەم سوننەتانە لە مزگەوتا بکەن.

## ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ ئەکەنەوە

نوێژ بەتاڵ ئەبێتەوە بەوە کە نوێژکەر قسەیەکیوا بەدەمیا بێ بەشێك نەبێ لە نوێژەکەی، لە دوو حەرفەوە تا زیاتر، هەروا بە وتنی تاقە حەرفێك کە مەعنای هەبێ و کەسێکی پێ تێبگەیەنێ، هەروا بە تاقە حەرفێك کە مەددەیەکی بەدوادا بێت، وەکوو «ها.. هو..»؛ بەڵام چاوپۆشی ئەکرێ لە قسەی کەم، ئەگەر زمانی هەڵکەوت یا لە بیری نەبووکە خەریکی نوێژە، یا نەیزانی قسەکردن حەرامە، بەو شەرتە نەوموسوڵمان بێ یا لە زانایانی دین دوور بێ.

هەروەها کۆکە و پێکەنینو گریانو ناڵەناڵو فووکردن ـ مادام حەرفیان لێ پەیدا بێ ـ نوێژ بەتاڵ ئەکەنەوە، بەڵام ئەگەرکۆکە و پژمە لەخۆیانەوە زۆریان هێنا بۆ ئینسان، ئەوە با دوو حەرفیشیان لێ پەیدا ببێ زیانیان نییە، یان ئەگەر نوێژکەر نەیتوانی بە بێ کۆکە نوێژ و دوعاکانی نوێژ بخوێنێ، ئەوە قەید ناکا بکۆکێ؛ بەڵێ، ئیمامی «ئەسنەوی»، فەرموویەتی: ئەگەر ئیمام نەیتوانی بە بێ کۆکە زیکرەکانی گواستنەوەی بەینی روکنەکانی نوێژ بە دەنگی بەرز بخوێنێ، ئەتوانێ بکۆکێ بۆ ئەوەی نوێژکەرەکان گوێیان لە دەنگی بێ. ئەگەر ئینسان زۆری لێ بکرێ کەوا لە نوێژا قسە بکا، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، چونکە شتیوا کەم روو ئەدا. ئەگەر نوێژکەر قورئانی لە نوێژەکەیا خوێند، هەر بۆ ئەوە کە یەکێك تێبگەیەنێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر تەنها بە نیازی قورئان خوێندن خوێندی، یا لەگەڵ ئەو مەبەستە مەبەستیشی بوو یەکێك تێبگەیەنێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. هەروەها، نوێژ بەتاڵ نابێتەوە بە زیکری خوا و بە پاڕانەوە لە خوا و بە دوعاکردن بۆ خۆی یا بۆ

کەسێکی تر بە زمانی عەرەبی ئەگەر خیتابی تیا نەبێ، ئەگینا بەتاڵ ئەبێتەوە، وەك ئەوەکە لە بەرابەری یەکێکدا کە بپژمێ، بڵێ: «یَرْحَمُكَ اللّٰه». سوننەتە بۆ کەسێ لە نوێژا شتێکی لێ رووبدا، وەکوو ئەوە ئیمامەکەی سەهو بکا، یا کوێرێکی چاو پێ‌بکەوێ لە گوێ بیرێکا یا لە نزیکی ئاگرا، بڵێت: «سُبحان اللّٰه»، ئەگەر نێرینە بوو؛ ئەگەر مێینەش بوو، بە بەری دەستی راستی لەسەر پشتی دەستی چەپی چەپڵە لێ‌بدا.

ئەگەر کەسێك لە نوێژا کردەوەیەکی وای کرد کە داخڵی نوێژەکە نەبوو، ئەمە ئەگەر ئەو ئیشە لە جینسی ئادابی نوێژ بێ، وەك رکووع و سوجدەی زیادە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە مەگەر بە سەهو بیکا یا لە بیری نەبێ؛ ئەگەر لە جینسی ئادابی نوێژیش نەبوو، ئەوە ئەگەر زۆر بوو، وەك سێ هەنگاو لەسەریەك، نوێژی پێ بەتاڵ ئەبێتەوە، ئەگەر کەمیش بوو، وەك جارێك یا دووجار پێ گواستنەوەی لەسەر یەك یان سێ جاری جیاجیا، ئەوە نوێژی پێ بەتاڵ نابێتەوە.

نوێژ بەتاڵ نابێتەوە بە وردە جووڵاندنەوەی دەست وەك خوراندنی لەش ئەگەر هەر پەنجەکانی بجووڵێنێتەوە و بەری دەستی لە شوێنێکا جێ گیر بێ. کردەوەی سەهویش وەك عەمدی وایە، ئەگەر زۆر بێ، نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە، ئەگەر کەمیش بێ، زیانی نییە. هەروەها نوێژ بەتاڵ ئەبێتەوە بە خواردن و خواردنەوەی زۆر و کەم، بەڵام ئەگەر لەبیری نەبوو کە لە نوێژایە، یا نەوموسوڵمان بوو، یا دوور بوو لە زانایانی دین، ئەوە بە خواردن‌و خواردنەوەی کەم نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. کەوابوو، ئەگەر شەکرێکی تواوەی لە دەمدا بوو و پاش نییەت هێنانی بۆ نوێژەکە، ئەو تواوەی قوت دا، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە.

سوننەتە بۆ نوێژکەر روو بکاتە شتێ کە مەسافەی بەینی ئەو و ئەو شتە سێ گەز یا کەمتر بێ، وەك دیوارێ یا کۆڵەکەیێ یا عەسایەکی داچەقاو یا بەرماڵێکی داخراو؛ ئەگەر ئەمانە نەبوون، خەتێك لە عاستی جێ سوجدەکەیا بکێشێ؛ ئەمانە هەموو بۆ ئەوەیە کەس بە بەردەمیا رانەبوورێ، لەم کاتەدا هاتوچۆ بە بێ عوزری شەرعی بە بەردەمیا حەرامە و سوننەتە بۆ نوێژکەرەکە دەفعی ئەو کەسە بکا کە بەبەردەمیا رائەبوورێ.

کەراهەتی هەیە لاکردنەوە لە نوێژا بەلای راست یا چەپدا، هەروەها کەراهەتی هەیە چاو هەڵبڕین بۆ ئاسمان و گرد کردنەوەی مووی سەری و بەرگی بەری، مەگەر عوزرێکی هەبێ، وەکوو سەرماو ناساغی، هەروا کەراهەتی هەیە دانانی دەستی لەسەر دەمی و راوەستان لەسەر یەك پێ و نوێژکردن لە کاتێکا پێویستی بە چوونە سەر ئاو بێ، هەروا لە کاتی حازر بوونی خواردەمەنییەکدا کە حەزی لێ بێ و [هەروا] دانانی دەستی لەسەر کەلەکەی و موبالەغە کردن لە دانەواندنی سەردا لە کاتی رکووعدا. هەروەها کەراهەتی هەیە نوێژکردن لە حەمام و لەناو رێگە و لە شوێنی زبڵ و خەوش و خاك و لەناو کلیسای گاور و جولەکە و لە شوێنی مۆڵەڕان و لەسەر قەبران و لە هەر شوێنێکا کە تاقە قەبرێکی تیابێ چ لەسەر قەبرەکە و چ لەهەر لایەکیەوە، بەو شەرتە بەپێی عورف نزیکی بێ؛ خۆ ئەگەر مەبەستی لە نوێژکردنەکەی لەو شوێنەدا تەعزیمی خاوەن قەبرەکە بێ، ئەوە حەرامە و بە قەتعی مەمنووعە.

## سوجدەی سەهو

سوجدەی سەهو، دوو سوجدەیە وەك سوجدەی نوێژ لە واجبات و مەندووباتا، کاتی ئەم دوو سوجدەیەش تەواو بوونی تەحیاتی دوایی و پێش سەلامدانەوەی نوێژە، کەواتە ئەگەر بە قەسدی، تەرکی سوجدەکانی کرد و سەلامی دایەوە، ئیتر ئەفەوتێ، بەڵام ئەگەر بە سەهو تەرکیان بکاو سەلام بداتەوە، ئەوە ئەگەر زۆری بەسەرا تێنەپەڕیبوو ئەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ سوجدەکان، ئەوجا سەلام بداتەوە.

سوجدەی سەهو سوننەتە لەبەر لەبیرچوونی شتێکیواکە ئەمری پێ کرابێ، یا لەبەر کردنی شتێکیواکە نەهیی لێ کرابێ. شتی ئەمر پێ کراو لە کاتێکا سوجدە بۆ نەکردنی ئەبرێ کە روکن بێ لەنوێژا، وەکوو خوێندنی «فاتحة» و رکووع و سوجدە، یا لە سوننەتە موهیممەکان بێ کە پێیان ئەوترێ «أَبْعاض»، وەکوو قونووتی نوێژی بەیانی و تەحیاتی یەکەم و سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەرﷺ لەپاش ئەو تەحیاتەوە. جا ئەگەر ئەمر پێ کراوەکە روکن بوو، پێویستە لەسەر ئەوەی کە تەرکی کردووە بگەڕێتەوە بۆی،

ئەگەر بەهۆی گەڕانەوەکەیەوەکردەوەی زیادە لە نوێژەکەیدا پەیدا نەبوو، ئەوە هەر ئەو واجبە بەجێ دێنێ و ئیتر سوجدە پێویست ناکا، وەك ئەوەکە لە ئەووەڵی نوێژەوە نییەت هێنانی لەبیر چووبێ، ئەوە هەر کە بەخۆی زانی کە نییەتی لەبیر چووە، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەووەڵی نوێژەکەی، یەعنی نییەتەکە دێنێ و خەریکی نوێژەکەی ئەبێ، یان وەك ئەوەکە لە ئاخری نوێژا بێ سەلامدانەوە، بیەوێ هەستێ بڕوا، جا بکەوێتەوە بیری کە سەلامی نەداوەتەوە، ئەوە گورج سەلام بداتەوە و هەستێ بڕوا. ئەگەر بەهۆی گەڕانەوەیەوە بۆ سەر ئەو روکنە، زیادەیێ لە نوێژەکەیدا رووی ئەدا، ئەوە سوجدەی سەهوی ئەوێ؛ مەسەلا، یەکێك لەکاتی رکووعا کەوتە بیری کە خوێندنی فاتیحەی تەرك کردووە، ئەوە واجبە بگەڕێتەوە بۆ فاتیحەکەی و پاش ئەوە رکووع بباو لەسەر نوێژەکەی بڕوا تا تەواوی ئەکاو لەپاش تەحیاتی ئاخر و پێش سەلامدانەوە، سوجدەی سەهو ببا؛ هەروەها ئەگەر لە سوجدەدا کەوتەوە بیری کە رکووعی تەرك کردووە، ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ رکووعەکەی و رکووع ببا و لەسەر نوێژەکەی بڕوا و تەواوی بکا و لەپێش سەلام دانەوەدا، سوجدەی سەهو ببا. هەروەها ئەگەر لەپاش تەحیاتی یەکەم یا دووهەم، کەوتەوە بیری کە سوجدەی یەکەم یا دووهەمی تەرك کردووە، پێویستە بگەڕێتەوە بۆ سوجدەکەی و لەوێوە نوێژەکەی تەواو بکاو لە ئاخرا سوجدەی سەهو ببا. بەڵێ ئەگەر فاتیحەی لە رکاتی یەکەما تەرك کرد و نەکەوتەوە بیری تا هەستایەوە بۆ رکاتی دووهەم، ئەوە پێویستە رکاتی دووهەم دابنێ بە رکاتی یەکەم و ئەوەی لەوەپێش کردوویەتی، بە بێسوودی دابنێ و لەم رکاتەوە نوێژەکەی تەواو بکا و لە ئاخرا سوجدەی سەهو ببا. هەروەها ئەگەر رکووعی رکاتی یەکەمی تەرك کرد و نەکەوتەوە بیری تا گەیشتە رکووعی رکاتی دووهەم، ئەوە ئەو رکووعی رکاتی دووهەمە دابنێ بە رکووعی رکاتی یەکەم و لەسەر ئەم رکووعەوە نوێژەکەی تەواو بکا؛ هەروەها ئەگەر یەکێ لە سوجدەکانی رکاتی یەکەمی تەرك کرد و نەکەوتەوە بیری تاگەیشتە سوجدەی رکاتی دووهەم، ئەوە ئەو سوجدەیە دابنێ بە سوجدەی رکاتی یەکەم و لەسەر ئەو سوجدەوە نوێژەکەی تەواو بکا.

ئەگەر کەوتە شکەوە کە سێ رکات نوێژی کردووە یا چوار رکات، ئەوە پێویستە رکاتێ نوێژ بکا و لە ئاخرا سوجدەی سەهو ببا، هەرچەند لەپێش سەلام دانەوەشدا ئەو شکەی لە دڵا نەمێنێ. هەروەها ئەگەر روکنێ لە روکنەکانی نوێژی بە شکەوە ئەکرد، یەعنی باش بۆی روون نەبوو کە ئەو روکنە ئەیکا پێویستە یاخود بە زیادە ئەیکا، واجبە ئەو روکنە بەجێبێنێ و لە ئاخریشا سوجدەی سەهو ببا؛ بەڵێ ئەگەر لە رکاتی سێهەما کەوتە شکەوە کەوا ئاخۆ ئەو رکاتە، چوارەمە یا سێهەمەو خەریکی بەجێهێنانی ئەو رکاتە بوو و پێش تەواوکردنی رکاتەکە،کەوتەوە بیری کە ئەو رکاتە رکاتی سێهەمە، ئەوە لە ئاخرا سوجدەی سەهوی ناوێ، چونکە ئەو رکاتە کە کردوویەتی، بە هەموو جۆرێ پێویست بووە، یەعنی چ رکاتی سێهەم بێ و چ چوارەم بێ، هەر لە ئەرکانی نوێژەکەیەتی و ئەمە، وەکوو ئەوە نییە کە لە رکاتی چوارەمی نیوەڕۆدا -مەسەلا- بکەوێتە شکەوە کە سێهەمە یا چوارەمە و رکاتێ بکاو لەپێش تەواو بوونیا بکەوێتەوە بیری کە رکاتی چوارەمە؛ بۆ ئەمە پێویستە لە ئاخرا سوجدەی سەهو ببا، چونکە لەو کاتاکە بە شکەوە مەشغووڵی رکاتەکە بووە، ئیحتیمالی ئەوە بووە کە ئەو رکاتە زیاد بێ و داخڵی نوێژەکەی نەبێ.

ئەگەر ئەمر پێ کراوە کە سوننەت و لە ئەبعازی نوێژ بوو، ئەویش تەرکی کرد، ئەوە سوجدەی سەهوی ئەوێ، بەم پێیە کە بەیانی ئەکەین: مەسەلا، ئەگەر تەرکی قونووتی نوێژی سبەینێی کرد و لەپێش سوجدەدا کەوتەوە بیری، ئەوە سوننەتە بگەڕێتەوە بۆ ئیعتیدال و قونووتەکەی بخوێنێ و دانەوێ بۆ سوجدە و لە ئاخریشا سوجدە ببا ئەگەر گەڕانەوەکەی لە حەددی رکووعدا بووبێ؛ بەڵام ئەگەر لەپاش ئەوە کە ئەعزای سوجدەی لەسەر ئەرز دانا کەوتەوە بیری، ئەوە نابێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو قونووتە. هەروەهایشە حوکمی قونووتی نوێژی «وەتر» لە نیوەی دوایی مانگی رەمەزانی پیرۆزدا. بەڵام قونووتی «نازِلة» وەکوو ئەم قونووتانە نییە و سوجدەی سەهوی لەسەر سوننەت نییە، چونکە لە ئەبعازی نوێژ حیساب ناکرێ.

ئەگەر تەحیاتی یەکەمی تەرك کردو لەپێش ئەوەدا بگاتە راوەستان، کەوتەوە بیری، سوننەتە بگەڕێتەوە و تەحیاتەکەی بخوێنێ، جا ئەگەر ئەم گەڕانەوەیە لە حاڵێکا بووبێ

کە لە راوەستانەوە نزیکتر بووبێ، سوجدەی سەهوی ئەوێ، ئەگەر لە حاڵێکیشا بووبێ کە لە دانیشتنەوە نزیکتر بووبێ، سوجدەی سەهوی ناوێ؛ بەڵێ ئەگەر بەعەمدی تەرکی تەحیاتی یەکەمی کردو گەڕایەوە سەری، ئەوە ئەگەر لە راوەستانەوە نزیکتر بوو، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە؛ هەروەها ئەگەر بە سەهو تەرکی ئەو تەحیاتەی کردبێ و لەپاش راوەستان بگەڕێتەوە و بزانێ ئەم گەڕانەوەیە حەرامە، نوێژەکەی هەر بەتاڵ ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بە نەزانینەوە گەڕایەوە، یاخود زانا بوو بەڵام بە سەهو گەڕایەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، ئەوەندە هەیە لە ئاخرا سوجدەی سەهو ئەبا. ئەگەر مەئمومێ بە سەهو راست بووەوە لە تەحیاتی یەکەم و ئیمامەکەی دانیشت بۆ تەحیات، ئەوە واجبە لەسەر مەئموم یا نییەتی جیایی لە ئیمام بێنێ، یاخود بگەڕێتەوە بۆ لای ئیمام و دانیشێت بۆ تەحیات، ئەگینا نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە.

سوجدەی سەهو لەبەرکردنی کردەوەی نەهی لێ کراو، بەپێی ئەم بەیانەیە: ئەگەر ئەو نەهی لێ کراوە لەوانە نەبوو کردنی بەعەمدی نوێژ بەتاڵ بکاتەوە، وەکوو لاکردنەوە بە رووله نوێژدا، یا وەکوو دانانی هەنگاوێ یا دوو هەنگاو، ئەوە سوجدەی سەهوی ناوێ، ئەگەر لەوانەش بێ بە عەمد و سەهو نوێژ بەتاڵ بکاتەوە، وەکوو قسەکردنی زۆرو سێ چوار هەنگاو بەیەکەوە، ئەوەیش دیسان نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە و بە سوجدەی سەهو چار ناکرێت؛ ئەگەر تەنیا بە عەمدی نوێژ بەتاڵ ئەبووەوە نەك بە سەهوی، وەکوو درێژەدان بە روکنی کورت، ئەوە سوجدەی سەهوی بۆ ئەبرێ؛ روکنی کورت، وەکوو ئیعتیدال و دانیشتنی ناوبەینی سوجدەکان، بەڵام درێژ کردنەوەی ئیعتیدال بە زیکر، وەکوو قونووت و گەلێ دوعای مەئسوور زیانی نییە و نابێ بەهۆی پێویستی سوجدەی سەهو، ئەوە ئەبێ بەهۆی پێویستی سوجدەی سەهو کە ئیعتیدالە کە درێژ بکاتەوە بە خوێندنی شتێکی وا کە جێی خۆی نەبێ، وەکوو فاتیحە یا تەحیات کە لەو شوێنەدا مەشرووع نین. ئەم ماددەیە جیا کراوەتەوە لەو قاعیدەیە کە وتراوە هەرچی عەمدی نوێژ بەتاڵ نەکاتەوە، سوجدەی سەهو بۆ سەهوی نییە، ئەمانە هەرچەند عەمدیان نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، سوجدەی سەهو بۆ سەهویان ئەبرێ.

ئەگەر کەسێ لە تەرکی قونووت یا تەحیاتی یەکەم یا وێنەی ئـەمانە لە سـوننەتە موهیممەکانی نوێژداکەوتە شکەوە، ئەوە ئەبێ سوجدەی سەهوی بۆ ببا؛ بەڵام ئەگەر لە کردنی ئیشێکی نەهی لێ کراودا کەوتە شکەوە، لەوانـەی کـە بـاسمان کـردن، ئـەوە سوجدەی سەهوی ناوێ. ئەگەر سەهوێکی کرد و لەپێش سەلامدانەوەداکەوتە شکەوە ئایا سوجدەی سەهوی بۆ بردووە یا نە، ئەوە سوجدەی سەهو ببا. هەر سەهوێ ئینسان لەکاتی ئیقتیدادا بە ئیمام بیکا، ئیمامەکەی هەڵی ئەگـرێ و سـوجدەی مـەئموومی پێویست نییە؛ کەواتە، ئەگەر لە تەحیاتا کەوتەوە بیری کەوا تەرکی روکنێکی کردووە غەیری نییەتی نوێژ و «اللّه أكبر» کردن، ئەوە لەپاش سەلام دانەوەی ئیمام، هەستێ بۆ کردنەوەی ئەو رکاتەی کە بەهۆی فەوتانی ئەو روکنەوە فەوتاوە کە بـە بـیری خـۆی ئەزانێ فەوتاوە، بەڵام ئیتر سوجدەی سەهوی نـاوێ، چـونکە تـەرکەکـەی لەکـاتی ئیقتیدادا بووە بە ئیمام؛ بەڵام بۆ بیرکردنەوەی فەوتانی نییەتی نوێژ یـا «اللّـه أكـبر»، پێویستە ئەو نوێژە بەتەواوی بکاتەوە، چونکە بۆی دەرکەوتووە کەوا لەو کاتەدا کە لە پشتی ئیمامەوە بووە، یاخۆی بەتەنیا خەریکی نوێژ بووە، لە نوێژا نەبووە.

هەر سەهوێ ئیمام بیکا، چ لەکاتی ئیقتیدای مەئموومدا و چ لەپێش ئەوەدا، ئیعتیبار ئەکرێ بە سەهو بۆ مەئموومیش؛ جا ئەگەر ئیمام سوجدەی سەهوی برد، پێویـستە ئەویش لەگەڵیا سوجدە ببا، ئەگەر مەسبووقیش بوو، یەعنی لە رکاتی یەکەمەوە لەگەڵ ئیمامدا نەبووبوو، ئەوە ئەبێ لە ئاخری نوێژەکەی خۆیشیا دیسانەوە سوجدەی سەهو ببا. ئەگەر ئیمام سوجدەی سەهوی نەبرد، پێویستە مەئمووم لەپاش جـیابوونەوە لە ئیمام، لە ئاخری نوێژەکەیدا، سوجدەی سەهو ببا.

ئەگەر ئیمام بە سەهو هەستایەوە بۆ رکاتی زیادە، ئەوە دروستمەئمووم بکەوێتە شوێنی، بەڵکوو ئەبێ بە «سبحان اللّه» ئیمامەکەی ئاگادار بکاتەوە؛ ئەگەر ئیمام هەر هەستایەوە، پێویستە مەئمووم نییەتی جیایی لە ئیمام بێنێ و بۆ خۆی نوێژەکەی تەواو بکا. ئەگەر لەپاش سەلام دانەوەی نوێژ کەوتە شکەوە لە تەرکی فەرزێ لە نوێژەکەیدا، ئەوە تەئسیری نییە و موبالات بەو شکە نەکا. ئەگەر ئەو کەسە کە سەهوی کردووە، بە

عەمدی تەرکی سوجدەی سەهوی کرد و سەلامی دایەوە، ئەوە ئیتر سوجدەی سەهوی ئەفەوتێ، بەڵام ئەگەر بە سەهو تەرکی سوجدەی سەهوی کرد، ئەوە مادام زۆری پێنەچووبوو، بگەڕێتەوە بۆ سوجدەی سەهوەکەی و لەپاش سوجدەکان، سەلام بداتەوە، ئەگەر زۆریشی پێچووبوو، ئەوە سوجدەکەی ئەفەوتێ.

ئەگەر ئیمامی جومعە سەهوی کرد و لەئاخری نوێژەکەدا سوجدەی برد، جا دەرکەوت کەوا کاتی نیوەڕۆ نەماوە، واجبە لەسەر ئەوەوە کە کردوویانە نوێژی نیوەڕۆ تەواو بکەن و لە ئاخریشا سوجدەی سەهو ببەنەوە.

## سوجدەی تیلاوەت

سوجدەبردن سوننەتە لەسەر خوێندنەوەی ئایەتی سوجدە لە قورئانی پیرۆزدا یا لەسەر بیستنی. ئایەتی سوجدە لە چواردە شوێندا هەیە، دوانیان لە سوورەتی «الحَج»دا و ئەو دوازدەکەیان لەم سوورەتانەدا: «الأعراف، الرّعد، النّحل، الإسراء، مَريم، الفُرقان، النَّمل، الم السّجدة، حمالسّجدة، النّجم، الانشقاق، العلق». سوجدەکەی سوورەتی «ص»، سوجدەی تیلاوەت نییە، بەڵکوو سوجدەی شوکرە، لەغەیری نوێژدا سوجدە لەسەر بردنی سوننەتە و لە نوێژدا حەرامە. وە ئەگەر بە عەمدی بێ، نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە، ئەگەر بە سەهو بێ، بەتاڵی ناکاتەوە، بەڵام سوجدەی سەهوی پێویستە.

سوجدەی تیلاوەت، وەکوو بۆ قورئانخوێنەکە سوننەتە، بۆ ئەوکەسەیش سوننەتە کە گوێی لێڕائەگرێ، یا گوێی لێ ئەبێ. سوننەتیەتی ئەم سوجدەیە زۆر زیاترە بۆ کەسێك کە گوێی لێبێ یا گوێی لێڕاگرتبێ ئەگەر قورئان خوێنەکە خۆی سوجدە ببا؛ بەڵام ئەگەر ئیمام لەسەر خوێندنی ئایەتی سوجدە سوجدەی برد و مەئموم سوجدەی نەبرد، یاخود مەئموم بۆ خوێندنی کەسێکیتر سوجدەی برد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە. هەروەها ئەگەر لەبەر خوێندنی ئیمامەکەی سوجدە ببا لەکاتێکا ئیمام خۆی سوجدە نەبا، لەم حاڵەشدا نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە.

جا ئەگەر ئەو کەسەی سوجدەی تیلاوەت ئەبا، لە نوێژدا نەبوو، ئەوە پێویستە نییەتی سوجدەی تیلاوەت بێنێ و «اللّه أكبر» بکا لەگەڵ بەرز کردنەوەی هەردوو

دەستیا، وەکوو لە نوێژدا، هەروەها جارێکی تریش بۆ دانەوینەوە، «اللّه أكبر» بکا بە بێ‌دەست بەرز کردنەوە و سوجدەیێ بیا وەکوو سوجدەی نوێژ و سەر بەرز بکاتەوە لەگەڵ وتنی «اللّهُ أكبر»دا و سەلام بداتەوە. ئەگەر لە نوێژیشدا بوو، ئەوە تەنها «اللّه أكبر» بکا بۆ دانەوین بۆ سوجدە و بۆ بەرز بوونەوە، ئیتر لەم‌سوورەتەدا نییەتی ناوێ، چونکە ئەم سوجدەیە بە تابیعی نوێژەکە دائەنرێ، هەروەها دەست بەرز کردنەوە و سەلام دانەوەشی ناوێ.

بۆ دامەزرانی سوجدەی تیلاوەت، ئەوەی لە سوجدەی نوێژدا فەرزە، لەمیشدا فەرزە. سونەتە لەم سوجدەیەدا، چ لە نوێژدا بێ و چ لە غەیری نوێژدا، بڵێت: «**سَجَدَ وَجْهي لِلَّذي خَلَقَهُ وَ صوَّرَهُ وَ شَقَّ سَمْعَهُ و بَصَرَهُ بِحَولِهِ و قوَّتِهِ، فَتَبارَكَ اللّهُ أَحْسَنُ الخالِقينَ**»؛ ئەگەر هیچیش نەخوێنێ یا دوعایەکی تری غەیری ئەم زیکرە بخوێنێ، هەر دروستە.

ئەگەر کەسێ ئایەتی سوجدەی تیلاوەتی لە مەجلیسێکا دووجار خوێندەوە، ئەوە ئەگەر بەینیان کەم بوو، یەك‌جار سوجدە ئەبا، ئەگەر بەینیشیان زۆر بوو، دووجار سوجدە ئەبا، وەك چۆن یەك ئایەت لە دوو مەجلیسدا بخوێنێتەوە. ئەگەر ئەوکەسەی کە پێویستە سوجدە بیا سوجدەی نەبرد، بێ عوزر یا لەبەر عوزر، ئەوە پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر، وەختی سوجدە بردنەکەی بەسەر ئەچێ.

## سوجدەی شوکر

سوجدەی شوکر لە نوێژدا نابرێت، بەڵکوو لە دەرەوەی نوێژدا، بەهۆی ئەوەوە کە نیعمەتێکی خوا بە سەر کەسێکا بڕژێت، یا خوا بەڵایەك لەسەر کەسێك لابەرێ، یاخود ئەگەر ئینسان چاوی بە یەکێك کەوت گیرۆدەی دەردێکی خراپ بوو، یا خەریکی ئیش و کاری بێ‌دینی بوو؛ مەبەست لە سوجدەی شوکر لەم حاڵەتەی دوایەدا سوپاس کردنی خوایە کە ئەمی نەخستووەتە سەر ئەو ڕێگا چەوتە کە کابرای بێ‌دین گرتوویەتییەبەر.

## باسی نوێژی جەماعەت

راسترین قسە ئەوەیە جەماعەت فەرزی کیفایەیە لە نوێژە فەرزەکاندا، بێجگە لە نوێژی جومعە، چونکە لە نوێژی جومعەدا فەرزی عەینە لەسەر ئەوانەی کە جومعەیان لەسەر فەرزە. پێویستە نوێژی جەماعەت بە جۆرێك بکرێ کە شیعاری دینی پێدەرکەوێ و بە پەنامەکی و لە ناو ماڵا نەبێ، بە جۆرێك کە کەس پێی نەزانێ. جەماعەت بۆ ژنان فەرز نییە بەڵکوو سوننەتە، بەو شەرتە کە نەبێ بەهۆی فیتنەی دینی و تاوانباری، ئەگینا دروست نییە بڕۆن بۆ جەماعەت بۆ دەرەوەی ماڵی خۆیان.

نوێژی جەماعەت لە مزگەوتدا خێری زۆرترە تا لە دەرەوەی مزگەوت؛ تا قەرە باڵغیشی زۆرتر بێ، خێری زیادترە، مەگەر لەحاڵێکا کە ئیمامی جەماعەتی قەرەباڵغتر فاسق بێ یا لە ئەهلی بیدعەت بێ، یا ڕۆیشتنی نوێژکەرەکە بۆ مزگەوتە قەرەباڵغەکە، پەکی نوێژی مزگەوتی جەماعەتکەم بخا؛ لەم جۆرە حاڵەتانەدا، نوێژکردنی جەماعەتەکە لە مزگەوتە بێ قەرەباڵغەکەدا باشترە.

پیرۆزترین نوێژی جەماعەت، ئەوەیە نوێژکەرەکە بگا بە «اللّٰه أکبر»ی نوێژ دابەستن (تەکبیری تەحەڕڕوم)دا لەگەڵ ئیمام. ئەم خێرە دەسگیر ئەبێ بە خۆ ئامادەکردنی نوێژکەرەکە بۆ «اللّٰه أکبر» کردنەکە، هەرچەند کەمێکیش دوابکەوێ. قسەی راستتر ئەوەیە نوێژکەر خێری نوێژی جەماعەتی دەسگیر ئەبێ مادام بەرلەوەی ئیمام سەلام بداتەوە پیا بگات، بەڵام خێری زۆرتر لەوەدایە زووتر پیا بگات.

سوننەتە ئیمام لە کورتی نوێژ ببڕێتەوە، واتە ئەوەندەی درێژە نەداتێ نوێژکەرەکان هەراسان بکا، چونکە نەخۆش و خاوەن ئیش و پیرو لێکەوتوویان تیایە، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشا ئەبێ سوننەتە موهیممەکانی نوێژ تەواو بکا. ئەبێ لە شوێنێکا کە بتوانێ بە خوێندنی سوورەتی کورت بیبڕێتەوە، سوورەتی درێژ نەخوێنێ و تەسبیحاتەکان زیاد نەکا و هەندێ دوعای زیادە هەن نەیانخوێنێ، مەگەر نوێژکەرەکانی چەند کەسێکی تایبەتی بن رازی بن بەو درێژە پێدانە.

ئەگەر ئیمام لەکاتی رکووع یا تەحیاتی ئاخردا زانی کەوا یەکێك ئەیەوێ بێتە نوێژەکەیەوە، سوننەتە چاوەڕوانی بکا بەو شەرتە زۆری پێ نەچێ، ئەبێ لەم چاوەڕوانییەشدا جیاوازی نەخا لە نێوانی خەڵکا.

سوننەتە بۆ کەسێك بەتەنیا یا بە جەماعەت نوێژی فەرزی کردبێ، تاقەجارێك، ئەو نوێژە لەگەڵ یەکێك یا جەماعەتێکی تردا بکاتەوە، هەرچەند وەختی ئەم نوێژکردنەوەیەی رێکەوتی ئەو وەختانە بکا کە نوێژیان تیا مەکرووهە، یان پایەی ئیمامی جەماعەتی دوایی لە ئیمامی جەماعەتی پێشوو کەمتر بێ. بەڵام نوێژکردنەوە بەتەنیا سوننەت نییە مەگەر بۆ کەسێك کە عوزرێکی هەبێ، وەکوو ئەوە یەکێك داخڵی نوێژی فەرز ببێ و لە نوێژەکەیدا بکەوێتەوە بیری کەوا قەرزاری فەرزێکە، ئەوە ئەم نوێژەی دەستی پێ کردووە تەواوی بکا، جا نوێژە قەرزەکەی بگێڕێتەوە و پاش ئەوە، سوننەتە نوێژە حازرەکەی بکاتەوە، چونکە بە بەعزێ مەزهەب، نوێژە پێشووەکەی بەتاڵە لەبەر ئەوە کە قەرزاری نوێژ بووە؛ تەنها نوێژی جومعە لەم حوکمە بەدەرە، چونکە ئەو وەکوو نوێژی سوننەت وایە، پێویستی بە دووبارە کردنەوە نییە. ئەبێ نوێژکەر لەو نوێژەدا کە ئەیکاتەوە، نییەتی فەرز بێنێ، هەرچەند فەرزەکەی نوێژە پێشووەکەی بووە.

بزانن! تەرکی جەماعەت دروست نییە مەگەر لەبەر عوزرێکی تێکڕایی، وەك باران و رەشەبای شەو و قوڕی زۆر، یا لەبەر عوزرێکی تایبەتی، وەك نەخۆشی و برسیەتییەکی زیاد لە ئەندازە و وەك ئەوە کە پێویستی بە چوونەسەر ئاو بێ، یا لە ستەمکارێك بترسێ بۆ خۆی یا بۆ ماڵی، یا ترسی ئەوەی هەبێ خاوەن قەرز بکەوێتە دوای و ئەمیش نەیبێ بیداتەوە، یا رووت بێ یا خۆی ئامادە بکا بۆ سەفەر و ترسی ببێ لە هاوڕێکانی دوابکەوێ، یا شتێکی بۆن ناخۆشی خواردبێ، یا کەسێکی نەخۆش بێ و لەم زیاتر کەسی بەلاوە نەبێ یا زیاتر ئولفەتی بەمەوە گرتبێ.

## باسی سیفەتەکانی ئیمام (پێش نوێژ)

نوێژکردن دروست نییە لەپشت ئیمامێکی واوە بە باوەڕی نوێژکەرەکە نوێژەکەی بەتاڵ بێ، وەك ئیقتیدای شافیعی مەزهەب بە حەنەفی مەزهەبێکی وا دەستی دابێ لە عەورەتی خۆی، یا «بسم اللّٰه» نەخوێنێ لە نوێژا. هەروەها دروست نییە ئیقتیدای حەنەفی مەزهەب بە شافیعییەکی وا خوێنی لووتی بەربووبێ و بە بێدەسنوێژ گرتنەوەی دووبارە، ئیمامەت بکات. فەرقی نییە ئاخۆ باوەڕی نوێژکەرەکە بە دانەمەزرانی نوێژی ئیمامەکە یەقینی بێ یا هەر گومان بێ، وەك ئەوە کە دووکەس ئیختیلافیان ببێ لە قیبلەدا و هەرکەس بە بیری خۆی، لایەك بکا بە قیبلە؛ بەڵام ئەگەر ئیختیلافیان بوو لە چەند گۆزە ئاوێکا و هەرکامیان یەکێکیانی بە پاك زانی، ئەوە ئیقتیدای هەرکامیان بەویان دروستە مادام تەنها گۆزەی ئیمام نەمێنێتەوە بۆ ئەوە کە بە پیس دابنرێ؛ کەوابوو؛ ئەگەر پێنج کەس سەریان لێ تێکچوو لە پێنج گۆزە ئاودا کە کامیان پیسە و هەرکامیان دەسنوێژی بەگۆزەیەکیان گرت و هەریەك لەوان بوو بە ئیمام بۆ باقییەکان لە نوێژێ لە پێنج فەرزەدا، ئەوە هەموویان پێویستە نوێژی عیشا بە قەزا بگێڕنەوە، مەگەر ئیمامی عیشا، ئەوە ئەو پێویستە قەزای نوێژی مەغریب بکاتەوە.

دروست نییە ئیقتیدا بە کەسێك کە خۆی لە حاڵی ئیقتیدادا بێ بە ئیمامێك، بەڵام پاش جیابوونەوەی لە ئیمامەکەی دروستە ئیقتیدای پێبکرێت. هەروەها دروست نییە ئیقتیدا بە کەسێك کە پێویست بێ نوێژەکەی بکاتەوە، وەك ئەوە کە تەیەمومی کردبێ لەبەر نەبوونی ئاو لە شوێنێکا کە بە عادەت ئاوی تیا دەس بکەوێ، یا بە کەسێ کە نە دەسنوێژی گرتبێ و نە تەیەمومی کردبێ و تەنیا لەبەر حورمەتی وەخت نوێژ بکا، یا بە کەسێ کە گیانی یا پۆشاکی پیسییەکیوای پێوەبێ کە عەفوی لێ نەدرابێ.

هەروەها دروست نییە ئیقتیدای خوێندەوار بە نەخوێندەوار. مەبەست لە «خوێندەوار»، ئەوەیە واجباتی نوێژەکەی بەجۆرێك بخوێنێتەوە زیان بە حەرفێ لە حەرفەکان یا بە هەیئەتیان نەگەیەنێ، نەخوێندەواریش کەسێکە زیان بگەیەنێ بە

حەرفەکان یا بە سیفەتیان وەك «شَدّة»؛ کەواتە، ئەوەی لەشوێنێکا کە پێویست نـەبێ «إدغام» بکا، واتە حەرف بگرێ، یا حەرفێ بگۆڕێ بە حەرفێکی تر لە غەیری شوێنی گۆڕیندا، بە نەخوێندەوار دائەنرێ؛ بۆیە ئەوەی «ث» و «ص»بکا بە «س» و «ط» بکا بە «ت»، بە نەخوێندەوار دائەنرێ. بەڵێ دروستە ئیقتیدای نەخوێندەوار، بە نەخوێندەوار ئەگەر لەو حەرفانەدا کە بەباشی بۆیان ناوترێ، وەك یەك وابن.

کەراهەتی هەیە ئیقتیدا بەوکەسەی حـەرفی «ت» یـا «ف» دووبـارە بکـاتەوە، یـا بەوکەسەی لەفز بگۆڕێ بەجۆرێ کە مەعنا تێكنەدا وەك ئەوەکە بۆر بدا بە هێی «اللّه» لە «بسم اللّه» و «الحمد للّه»دا؛ بەڵام ئەگەر مەعنای ئـەگـۆڕی، وەك بـۆر دان بـە تـێی «أنعمت»، ئەوە نوێژی ئیمامەکە بەتاڵە ئەگەر ئەیتوانی فێر ببێ بەڕاست بیخوێنێتەوە، هەروا نوێژی مەئمومەکەشی بەتاڵە، ئەگینا هەر نوێژی ئیمامەکە بەتاڵە، بەو شەرتە ئەم گۆڕینە لە لەفزێکا بێ خوێندنەوەی واجب بێ.

دروست نییە پیاو ئیقتیدا بکا بە ژن و بە نێرەمووك (مُخَنَّث)؛ هەروا دروست نییە ئیقتیدای نێرەمووك بە نێرەمووك، چونکە ڕێی تێ‌ئەچێ ئیمامەکە ژن و مەئمومەکە پیاو بێ؛ بەڵام ئیقتیدای نێرەمووکێك کە مەعلووم بێ ژنە، بە نێرەمووکێك کە مەعلووم بێ پیاوە، ئەوە دروستە. دروستە ئیقتیدای ژن بە پیاو و بە ژن و بە نێرەمووك. دروستە ئیقتیدای باڵغ بە نابالغ، بەو شەرتە خاوەن تەمیز بێ، ئەگەر ئیقتیداکەرەکە باڵغی نێرینە بوو، ئەبێ ئیمامەکەش نێرینە بێ.

دروستە ئیقتیدای خاوەن دەس‌نوێژ بەوەی تەیەمومی کردبێ و گێڕانەوەی نوێژی لەسەر نەبێ، یا بەکەسێ کە مەسحی خوفی کردبێ. ئیقتیدای ڕاوەستاویش دروستە بەوەی بە دانیشتنەوە نوێژ بکا. هەروا، دروستە ئیقتیدای چاو ساغ بە کوێر و ئیقتیدای ئافرەتی پاك لە خوێن بەوەی کە گیرۆدەی خوێنی عیللەت بێ، بەو شەرتە لەمـاوەی پاکیدا بێ یەعنی سەرگەردان (متحیّرە) نەبێ. ئەگەر یەکێ ئیقتیدای کرد بە کەسێك و لەپاشا دەرکەوت ژنە یا کافرە، واجبە نوێژەکەی بگێڕێتەوە، نەك ئەگەر دەرکەوێ لەشی پیسە یا پیسییەکی پەنامەکی پێوەیە یا بێ‌دەس‌نوێژە، ئەوە نوێژی مەئمومەکە بەتاڵ

نابێتەوە. قسەی راستتر ئەوەیە کەسێ لە ئەحکامی نوێژ شارەزا بێ، باشترە بۆ ئیمامەت لە کەسێ قورئان باشتر بخوێنێ، یا وەرع و پارێزی زیاتر بێ؛ یەکێکیش کە ئەحکامی نوێژ بزانێ یا خوێندنی باش بێ، چاکترە بۆ ئیمامەت لەوەی عومری زۆرتر بێ، یا بە ئوسووڵی کەفائەت نەسەبی بەرزتر بێ؛ کەوابوو، مەلا بۆ ئیمامەت چاکترە لە سەیید و شێخزادەیێ کە شارەزای ئەحکامی شەرع نەبن، کەسێکیش عومری زۆرتر بێ، چاکترە لەوەی نەسەبی بەرزتر بێ. ئەگەر دووکەس لەم سیفەتانەی ئیمامەتدا وەك یەك بوون، ئەوە هەرکامیان گیان و پۆشاکی پاکتر یا دەنگی خۆشتر، یا سەنعەت و پیشەی خاوێنتر بێ، ئەوە پێش ئەکەوێ. ئەوەی موستەحەقی قازانجی شوێن نوێژەکە بێ بەهۆی موڵکییەت یا وەقف یا ئیجارەوە، ئەو کەسە چاکترە بۆ ئیمامەت لەو شوێنەدا لە کەسێکی تر، مادام ئوسووڵی ئیمامەت بزانێ. جا ئەگەر خاوەن موڵك بوو، ئەتوانێ کەسێکی تر پێش بخا. قسەی راستتر ئەوەیە ئەو کەسەی شوێنێکی بە کرێ گرتبێ لە خاوەنی ئەو شوێنە پێش ئەکەوێ و ئەوەی بە خواستەمەنی ئەو شوێنەی دابێ بە یەکێك، پێش ئەکەوێ لەوەی کە خواستوویەتی، چونکە خاوەن موڵك خاوەنی قازانجی شوێنەکەیە. هەروەها، راستتر ئەوەیە کەوا حوکمداری وڵاتێك، چاکترە بۆ ئیمامەت لەو وڵاتەدا لە کەسێك کە ئاگادارتر بێ لە ئەحکامی شەرع، هەروا لە خاوەنی شوێن نوێژەکە.

## شەرتەکانی ئیقتیدا

ئیقتیدا بە ئیمام، گەلێك شەرتی هەیە:

یەکەم، ئەوەیە مەئمووم پێش نەکەوێ لە ئیمام لە جێگە نوێژدا؛ کەواتە، ئەگەر لەکاتی «اللّٰه أکبر»ی تەحەڕڕوم دا لێی پێش کەوت، نوێژەکەی دانامەزرێ، ئەگەر لەناو نوێژەکەدا بە عەمدی لێی پێش کەوت، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بەخۆی نەزانی [و] پێشکەوت، ئەوە واجبە لەسەری هەرکە بە خۆیزانی، بگەڕێتە دواوە. بۆ زانینی ئەوە کە کێ لەپێشەوەیە و کێ لەدواوەیە، تەماشای پاژنەی پێ ئەکرێ بۆ

راوەستاو و تەماشای بێخی ران ئەکرێ بۆ دانیشتوو ئەگەر ئیمام و مەئمووم لە شانی یەکدا وەستابوون، ئەوە زیانی نییە، بەڵام سوننەتە مەئمووم پاش بکەوێ لە ئیمام.

ئەگەر نوێژکەرەکان لە «مسجِدُ الْحَرام»دا بوون، ئەتوانن دەور بدەن بە دەوری «كَعبةُ اللّٰه»دا؛ لەم‌سوورەتەدا، ئەگەر مەئمووم لە غەیری لای ئیمامەوە نزیکتر کەوتەوە لە کەعبە، ئەوە زیانی نییە، بەڵام لەلای ئیمامەوە دروست نییە لە ئیمام پێش بکەوێ و نزیکتر بکەوێتەوە لە کەعبە.

ئەگەر یەك پیاو حازر بوو لەگەڵ ئیمامدا، لەلای راستیەوە راوەستێ، جا ئەگەر پیاوێکی تریش هات، ئەویش لەلای چەپیەوە راوەستێ، پاش ئەمە، یا ئیمام کەمێ بڕواتە پێشەوە، یا مەئموومەکان کەمێ بێنە دواوە تا ببن بە ریز [و] هەروەها، ئەگەر منالێکی نێرینەی خاوەن تەمیز لەپاش ئیقتیدای تاقە پیاوەکە پەیدا بوو. ئەگەر پیاوێك و منداڵێکی خاوەن تەمیز بەیەکەوە هاتن، ئەوە لە پشتی ئیمامەوە ریز ببەستن. ئەگەر پیاوێك و ژنێك حازر بوون، پیاوەکە لەلای راستی ئیمامەوە راوەستێ و ژنەکە لە پشتی پیاوەکەوە راوەستێ. ئەگەر چەند پیاو و چەند ژن و چەند منداڵی نێرینە حازر بوون، ئەوە پیاوەکە لەپشتی ئیمامەوە لە ریزی یەکەمدا و منداڵە نێرینەکان لە ریزی دووهەمدا و ژنەکان لە ریزی سێهەمدا راوەستن؛ بەڵام ئەگەر منداڵە نێرینەکان زوو لە پشتی ئیمامەوە ریزیان بەست، ئەوە پیاوەکان لەپاشەوە ریز ببەستن و منداڵەکان نەگوێزنەوە. ئەگەر پیاوان و منداڵان بەیەکەوە حازر بوون و ریزەکە هەموویانی ئەگرت، ئەوە ریزی پیاوەکان بە منداڵەکان تەواو ئەکرێ؛ «دٰارَمی» فەرموویە: ئەگەر پیاوەکان فاسق بوون، ئەوە منداڵەکان لەپێشەوە ریز ئەبەستن.

ئەگەر ژنان ئیقتیدایان کرد بە ژنێك، ئەوە ئیمامەکەیان لە ناوەڕاستیانا بووەستێ و کەمێك لێیان پێش‌بکەوێ، وەکوو لە حاشیەی «سُليمان الكُردي»دا بەیان کراوە.

کەراهەتی هەیە مەئمووم بەتەنها راوەستی، بەڵکوو ئەگەر لە ریزا شوێنی دەس‌کەوت، بڕواتە ریزەوە، ئەگینا لەپاشەوە نییەتی ئیقتیدا بێنێ و یەکێ لە مەئموومەکان راکێشێ بۆلای خۆی، سوننەتە ئەوکەسەش یارمەتی بدا و بێتە پاشەوە و پێکەوە ریزێك دروست‌کەن.

سوننەتە بۆ مەئموومەکان تا بتوانن لە ریزی یەکەمدا راوەستن و ئەو ریزە تـەواو بکەن، ئەوجا دەس‌بکەن بە دانانی ریزێکی‌تر؛ سوننەتیشە ریزەکـەیان رێك بـێ و لە ئەندازەی عادەت زیاتر، کەسەکان بەینیان نەبێ، ئەگینا فەزڵ و پایەی جەماعەتەکەیان ئەفەوتێ. زانایانی شەرع، لەم شوێنەدا دوو قسەیان هەیە: یەکەم، ئەوەیە بەتەنها یـەك کەراهەت فەزیلەتی جەماعەتەکە هەموو ئەڕوا؛ دووهەم، ئەوەیە تەنها ئەو فەزیلەتەی جەماعەتەکە ئەڕواکە بەهۆی نەکردنی ئەو مەکرووهەوە پەیدا ئەبوو، ئەگینا فەزیلەتی باقی ئادابەکان ئەمێنێتەوە؛ ئەم قسەیان، موناسبی رەحمەتی فراوانی زاتـی خـوایـە، چونکە لە لوتفی خوداوە دوورە بە تاقەکەراهەتێك نوێژ بیست و حەوت پـایە بـێتـە خوارەوە، ﴿وَ اللّٰهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.

دووهەم، لە شەرتەکانی ئیقتیدا، ئەوەیە مەئموم ئاگای لە هەڵسان و دانـیشتنی ئیمام بێ، واتە یا چاوی لە ئیمام خۆی بێ یا لە هەندێ لە نوێژکەرەکان کە ریـزیان بەستووە، یا گوێی لە دەنگی ئیمامەوە بێ یا لە دەنگی راگەیێنەوە (مُبَلِّغ)، خـوا ئـەو راگەیێنە لەگەڵ ئیمامەکەدا بێ یا نە، هەر بەو شەرتە کە باوەڕ پێ‌کراو بێ.

سێهەم، لە شەرتەکانی ئیقتیدا، ئەوەیە ئیمام و مەئموم بەپێی عورف پێکەوەبن، لەسەر ئەم تەرتیبە: بەمیسال، ئەگەر ئیمام و مەئموم هەردووکیان لە مزگەوتا بن، ئەوە ئیقتیدا دائەمەزرێ، هەرچەند مەسافەی بەینیان زۆر بـێ و هـەرچـەند هـۆدە و بـینا کەوتبێتە بەینیان، بەو شەرتە دەرگایان تیابێ بۆ ناو یەکتر و قابیل بێ هاتوچۆی عادەتی لە هەرکامیانەوە بۆ ناو باقی هـۆدەکـان و بـۆ حـەرەمی مـزگەوت، هـەرچـەند ئـەو هاتوچۆیەش بە نەوعێك بێ کە ئینسان پشت یا شان بکاتە قیبلە، یا هۆدەیەکیان لەسەر بانی حەرەمی مزگەوت بێ و دەرگای تیابێ بۆ خوارەوە، با دەرگاکانیش پێوەدرابن یا داخرابن، بەو شەرتە بە بزمار قایم نەکرابن؛ هەروەهایە حوکمی چەند مـزگەوتێ کـە نزیکی یەك بن، ئەمانەیش، وەکوو یەك مزگەوت دائەنرێن بەو شەرتە جـۆگـایەك یـا رێگەیەکی کۆن لە نێوانیانا نەبێ، ئەگینا بە مزگەوتی جیاجیا و دوور لە یەك دائەنرێن.

لە حوکمی مزگەوت خۆیدایەتی «رَحْبە»ی مزگەوت، وەك بەرهەیوان و سەکـۆی حەوشی مزگەوت کە هاوینان نوێژی لەسەر ئـەکـەن، بـا دووریش بـن لە حـەرەمی

مزگەوت، کەواتە، ئەگەر ئیمام لەسەر ئەو سەکۆیە بوو و لەپێشەوە بوو، یا مەئموم لەسەری بوو و لەدوایەوە بوو، ئەوە حوکمی لەگەڵ نەفسی مزگەوتا یەکێکە؛ بەڵام «حَریم»ی مزگەوت ـکە شوێنی خەوش‌وخاڵ و پێویستییەکانی مزگەوتە ـ ئەوە بە دەرەوەی مزگەوت دائەنرێ و حوکمی جیایە، وەك لەمەولا بەیانی ئەکەین، خوا یار بێ.

ئەگەر ئیمام و مەئموم هەردووکیان لە دەشتا بوون، ئەوە شەرتی ئیقتیدا ئەوەیە مەسافەی بەینیان زیاتر نەبێ لە سێسەد زیراع بە زیراعی ئادەمی کە بریتییە لە دوو بست؛ لەم‌سوورەتەدا، مانیعی ئیقتیدار نییە ڕێگایەك لە بەینیانا بێ، یا چەمێك بە مەلە لێی بپەڕنەوە؛ هەروایە حوکمی هەموو دوو ریزێ لەپشتی ئیمامەوە. ئەگەر لە دوو بینایشدا بوون، ئەوە زانایانی شافیعی مەزهەب دوو قسەیان هەیە، ڕاستریان، ئەوەیە کە هەر نزیکی، شەرتە ـوەك باسمان کرد ـبەو شەرتەکە حائیل (ڕێ‌گر) لەبەینا نەبێ، یا هەبێ و مەنعی هاتوچۆ نەکا؛ ئەگینا بەقەتعی، ئیقتیدا دروست نییە، هەرچەند ئەو حائیلە مەنعی دیتنی ئیمام نەکا، وەکوو پەنجەرەیەك کە لەبەینا بێ؛ هەروەها ئەگەر یەکێکیان لە خانوو و یەکێکیان لە دەشتابێ.

**بزانن!** کەراهەتی هەیە ئیمام لە شوێنی بەرز و مەئموم لە شوێنی نەویدا بێ، یا بەپێچەوانەی ئەمە، مەگەر مەبەستێ وەکوو وەزعی شوێنەکە، یاخود فێرکردنی ئادابی نوێژ بە مەئمومەکان، یا وەك پێویستی بە مەئمومێ کە دەنگی ئیمام بگەیەنێ بە مەئمومەکانی تر.

سوننەتە ئیمام و مەئموم هەڵنەسنەوە بۆ نوێژ تا قامەت خوێن لە قامەت ئەبێتەوە، ئەوسا ئیمام هەڵسێتەوەو مەئمومەکانیش بەدوایا. سوننەتە ئەو کەسەی ئەیەوێ نوێژی فەرز بکا، دەست نەکا بە نوێژی سوننەت پاش ئەوەی کە قامەت خوێن دەستی کرد بە قامەت، یەعنی ئەم کردەوەیە کەراهەتی هەیە؛ ئەگەر کابرا لەناو نوێژی سوننەتا بوو و قامەت خوێن دەستی کرد بە قامەت، ئەوە ئەگەر ترسی فەوتانی نوێژی جەماعەتەکەی نەبوو، سوننەتەکەی تەواو بکا. ئەگەر ترسیشی هەبوو، ئەوە ئەگەر جەماعەتەکە بۆ نوێژی جومعە بوو، واجبە کابرا نوێژەکەی خۆی بەتاڵ بکاتەوە؛ ئەگەر

غەیری نوێژی جومعەش بوو، ئەوە سوننەتە نوێژەکەی خۆی ببڕێ و بڕواتە ناو جەماعەتەکەوە.

ئەگەر کەسێ لە نوێژی فەرزا بوو و قامەت کرا بۆ نوێژی جەماعەت، ئەوە ئەگەر نوێژی کابرا نوێژی سبەینێ بوو، نوێژەکەی تەواو بکا و پاش ئەوە بڕواتە ناو جەماعەتەکەوە، هەروەها ئەگەر نوێژی سێ رکاتی یا چوار رکاتی بوو و راست بووبووەوە بۆ رکاتی سێهەم؛ بەڵام ئەگەر لە رکاتی یەکەما یا دووهەما بوو، ئەوە دوو رکات تەواو بکات و سەلام بداتەوە، بە نیازی ئەوە کە ئەو نوێژە بکا بە سونەت و پاشان هەستێ بڕواتە ناو جەماعەتەکەوە؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو نوێژە فەرزە کە پێیەوە مەشغووڵە، قەزای فەرز بێ، ئەوە نەیبڕێ و نەیکا بە سوننەت، بەڵکوو تەواوی بکا، جا ئەگەر مەجال هەبوو، داخڵی ئەو جەماعەتەیش ببێ، ئەگینا با ئەو جەماعەتەی بفەوتێ.

## شەرتەکانی ئیقتیدا بە ئیمام

ئیقتیدای مەئمووم بە ئیمام، چەند شەرتێکی هەیە؛ یەکەم: ئەوەیە مەئمووم لەگەڵ تەکبیری تەحەڕڕومدا نییەتی ئیقتیدای ببێ؛ مەسەلا، بڵێت: نییەتم هەیە فەرزی ئەم وەختە ئەکەم بە جەماعەت، «اللّٰه أكبر». لەکاتی تەکبیرەکەشیدا ئەو قەسدەی ببێ؛ نوێژی جومعەیش وەکوو غەیری جومعە وایە؛کەوابوو، ئەگەر قەسدی ئیقتیدای نەبوو و لە رکووع و سجووددا تابیعی ئیمام بوو، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە.

واجب نییە نوێژکەر لە ئیقتیدادا ئیمام دیاری بکا، ئەگەر دیاری کرد و کەچی ئیمامەکە کەسێکی تر بوو، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە. نییەتی ئیمامەتکردن واجب نییە لەسەر ئیمام، بەڵکوو سوننەتە بۆ ئەوەکە خێری لە ئیمامەتەکەی دەسکەوێ؛کەوابوو، ئەگەر ئیمام مەئموومی دیاری کرد و بەهەڵەدا چوو، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

دروستە ئیقتیدای کەسێ کە نوێژی حازر بکا بە کەسێ کە نوێژ بگێڕێتەوە و ئیقتیدای یەکێ کە نوێژی فەرز بکا بەکەسێ کە نوێژی سوننەت بکاو لە نوێژە فەرزەکانا شەرت نییە ئیمام و مەئمووم یەك نوێژ بکەن؛ کەواتە، دروستە بۆ ئەوەی کە فەرزی

سبەینێی لەسەرە، ئیقتیدا بکا بە کەسێك کە نوێژی نیوەڕۆ ئەکا، هەروەها دروستە بۆ کەسێ کە نوێژی عیشای لەسەرە، ئیقتیدا بکا بە ئیمامێ کە نوێژی سبەینێ ئەکا [و] زیانی نییە قونووتەکەشی لەگەڵدا بخوێنێ، یا لە دانیشتنی دوایی نوێژی مەغریبا لەگەڵیا بێ، هەرچەند شوێنی دانیشتنی مەئموومەکەیش نییە، چونکە لەبەر شوێن کەوتنی ئیمام دانیشتووە.

ئەگەر یەکێك نوێژی بەیانی ئەکرد و ئیقتیدای کرد بە ئیمامی نوێژی نیوەڕۆ، ئەوە پاش خوێندنی تەحیاتی یەکەم و هەستانەوەی ئیمام بۆ رکاتی سێهەم، یا نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بێنێ و سەلام بداتەوە، یا هەر بە دانیشتوویی بمێنێتەوە تا ئیمام دوو رکاتەکەی تەواو ئەکاو پێی ئەگاتەوە، ئەنجا لەپاش سەلامدانەوەی ئیمام سەلام بداتەوە و ئەم بارەیان خێری زۆرترە.

ئەگەر لە گێڕانەوەی نوێژی سبەینێدا ئیقتیدای کرد بە ئیمامی نوێژی نیوەڕۆ، ئەوە ئەگەر پیاگەیشت لە رکاتی دووهەما قونووت بخوێنێ و بگاتەوە بە ئیمامدا، ئەوە باشە؛ ئەگینا، واز لە قونووتەکەی بهێنێ یاخود نییەتی جیابوونەوە لە ئیمام بهێنێ و بۆ خۆی قونووت بخوێنێ و نوێژەکەی تەواوبکا.

دروست نییە ئیقتیدا بە ئیمامێ کە هەیئەت و ئادابی نوێژەکەی لەگەڵ نوێژەکەی ئەودا یەكنەکەوێ، وەك لە نوێژی مانگ و رۆژگیران یا نوێژی جەنازەدا.

## هەندێ لە واجباتی مەئمووم لە ئیقتیدادا

واجبە لەسەر مەئمووم تابیعی ئیمام بێ لە فیعلەکانی نوێژدا، بەم رەنگە کە سەرەتای فیعلی مەئمووم، بکەوێتە پاش سەرەتای فیعلی ئیمامەوە و لەپێش تەواو کردنی ئیمامیشا دەس پێ بکا؛ ئەگەر هاوکات بوو لەگەڵ کردەوەی ئیماما، زیانی نییە، تەنها لە تەکبیری تەحەڕڕومدا نەبێ، ئەوە لەویادا واجبە تەکبیری مەئمووم بکەوێتە پاش تەکبیری ئیمامەوە.

ئەگەر مەئمووم، بە عەمد و عیلمەوە و بە بێ عوزر، بە روکنێ لە روکنە فیعلییەکان، وەك رکووع، کەوتە پاش ئیمامەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، چونکە ئەمە بە

موخالەفەیەکی کەم دائەنرێ؛ ئەگەر بە دوو روکن لە ئیمام پاشکەوت، وەکوو ئەوە کە ئیمام لە دانەوینەوەدا بێ بۆ سوجدە و مەئمووم هێشتا لە راوەستانی پێش رکووعا بێ، ئەوە ئەگەر عوزرێکی رەوای نەبێ ـ مەسەلا ـ لەبەر خوێندنی سوورەت پاش کەوتبێ، لەمسوورەتەدا، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، خواه ئەو دوو روکنە کورتو درێژ بن، وەکوو وتمان، یا دوو روکنی درێژ بن، وەکوو ئەوەکە ئیمام بگات بە ئیعتیدالی رکاتی دووهەم و هێشتا مەئمووم لە سوجدەی دووهەمی رکاتی یەکەمدا بێت؛ ئەگەر عوزریشی ببێ، وەکوو ئەوەکە ئیمام زۆر بە پەلە بخوێنێ یاخود مەئموومەکە بە تەبیعەت لە خوێندنەوەدا سست بێ، ئەوە راست ئەوەیە مەئمووم هەر لەسەر ریزی خۆی بڕوا بەشوێنی ئیمامدا، مادام ئیمام بە زیاتر لە سێ روکنی درێژ پێش نەکەوێ و چاوپۆشی ئەکرێ لەو پاش کەوتنەی؛ ئەگەر بە زیاتریش لە سێ روکن پاشکەوت، وەکوو ئەوە مەئمووم لە خوێندنی فاتیحە نەبووبێتەوە تا ئیمام لە سوجدەی دووهەم هەستایەوە، لەمسوورەتەدا، واجبە مەئمووم ببێ بە هاوڕێی ئیمام لەوەدا کەوا پێیەوە مەشغوولە، تا ئەو سەلام ئەداتەوە، جا پاش ئەوە، مەئموومەکە ئەوەی کە فەوتاندوویەتی جێبەجێی بکاتەوە، ئەوجا سەلام بداتەوە. لە جوملەی عوزری پاش کەوتنە بۆ مەئمووم، ئەوەکە مەشغووڵ بووبێ بە خوێندنی دوعای ئیفتیتاحەوە.

تا ئێستا، قسەمان لەوەبوو کە مەئمووم لەگەڵ ئیمامدا رێك بووبێ، بەم نەوعە ئەوەندە لەگەڵی بووبێ کە مەجالی خوێندنی فاتیحەی هەبێ. بەڵام مەئموومێکی واکە ئیمام لێی پێش کەوتبێ و ئیمامەکەی رکووع بباکەچی ئەو هێشتا لە وەستانی خوێندنی فاتیحەدا بێ، ئەوە راستتر ئەوەیە ئەگەر خەریك نەبووبێ بە خوێندنی دوعای ئیفتیتاح و «أعوذُ باللّه»یەوە، گورج واز لە فاتیحە خوێندنەکەی بهێنێ و لەگەڵ ئیماما رکووع بەرێ و لەم حاڵەدا وا دائەنرێ کە بە رکاتەکەدا گەیشتووە؛ ئەگەر خەریکیش بووبێ بە خوێندنی دوعای ئیفتیتاح یا «أعوذُ باللّه»یەوە، واجبە لەسەری بە ئەندازەی ئەوە کە خوێندوویەتی لەو سونەتە، لە ئایاتی فاتیحە بخوێنێ و بکەوێتە شوێن ئیمام، جا ئەگەر ئیمام پێشنەکەوت بە زیاتر لە سێ روکنی درێژ، ئەوە لەسەر ریزی خۆی

نوێژەکەی تەواو بکا؛ ئەگەر ئیمام بە زیاتر لە سێ روکن پێش‌کەوت، ئـەوە بـبێ بـە هاوڕێی ئیمام لەوەدا کە پێیەوە مەشغوولە و لەپاش سەلام دانەوەی ئیمامیش، ئەوەی کە فەوتاندوویەتی بە جێی بێنێ؛ کەواتە، بۆ مەئموومی لێ پێش کـەوتوو، سـوننەتە لەپاش نییەت هێنان و «اللّه أكبر» کردن، خەریکی خوێندنی فـاتیحە بـێ و دوعـای ئیفتیتاح نەخوێنێ، مەگەر بە ئاشکرا بزانێ کە پیا ئەگاو لە رکووعیشا لەگـەڵ ئـیمام ئەبێت.

ئەگەر مەئموم لەکاتی رکووعا ئاگادار بوو لەوە کەوا فاتیحەی نەخوێندووە، یـا شکی لەوەدا پەیداکرد، ئەوە نابێ بگەڕێتەوە بۆی، بەڵکوو راست لەسەر نوێژەکەی بڕوا و لەپاش سەلام دانەوەی ئیمام، ئەو سەلام نەداتەوە، بەڵکوو هەڵسـێ رکـاتێك نـوێژ بکات، ئەوجا تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە؛ ئەگەر لەپاش رکووعی ئیمام و پێش رکووعی خۆی، ئاگادار بوو یا شکی پەیدا کرد لە خوێندنی فاتیحەدا، ئەوە پێویستە فاتیحەکەی لەسەرەوە بخوێنێ و پاش ئیمام بکەوێ، لەم حاڵەتـەشدا بـە مـەعزوور دائەنرێ. ئەگەر مەئموم لە «تەکبیری تەحەڕڕوم»دا پێش ئیمام کەوت، ئەوە نوێژەکەی دانامەزرێت. ئەگەر لە خوێندنی فاتیحە یا تەحیاتا لێی پێش کەوت، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام پێشکەوتنەکەی خیلافی شەرعە. ئەگەر مەئموم لە فیعلا پێش ئیمام کەوت، وەك لە رکووع یا لە سوجدەدا، ئەوە ئەگەر بە دوو روکن بێ، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە. وە ئەگەر بە کەمتریش بێ، بەتاڵ نابێتەوە.

## باسی بڕینی ئیقتیدا بە ئیمام

کە ئیمام سەلامی دایەوە لە نوێژ، ئیتر ئیقتیدای مەئموومیش بەو ئیمامە دوایی دێ؛ لەمکاتەدا، ئەگەر سەهوێکی کرد، سوجدەی سەهوی ئەکەوێتە سەر، ئەگەر ویستیشی ئیقتیدا بکا بە ئیمامێکی‌تر، ئەتوانێ، ئەگەر کەسێکـیش ویسـتی ئـیقتیدای پـێ‌بکـا، دروستە. ئەگەر ئیمام لەنوێژا مابووەوە و مەئموم نییەتی جیابوونەوەی هێنابوو لە دڵا، ئەتوانێ. ئیتر ئەتوانێ سەربەخۆ چۆن ئارەزووی هەیە، نوێژەکەی خۆی تەواو بکـا؛

بەڵام هەندێ لە زانایانی شەرع، فەرموویانە: بە بێ عوزرێکی وا کە ببێ بە سەبەب بۆ تەرکی جەماعەت، دروست نییە مەئمووم لە ئیمامەکەی جیا ببێتەوە؛ لەو عوزرانەیە، درێژەدانی ئیمام بە نوێژەکەی بەنیسبەت مەئموومی نەخۆش و لاواز و خاوەنی ئیش و کاری پەلەو ناچارییەوە، هەروەها لەو عوزرانەیە ئەمە کە ئیمام تەرکی هەندێ سوننەتی مەقسوودە بکا، وەکوو تەحیاتی یەکەم و قونووتی نوێژی سبەینێ، لەمحاڵەدا مەئمووم ئەتوانێ جیا ببێتەوە لە ئیمام بۆ ئەوەی خۆی ئەو سوننەتانە بکا.

ئەگەر یەکێ نوێژی دابەست بەتەنیا، جا یەکێکی تر هات و دەستی کرد بە نوێژ، ئەوە ئەم شەخسە ئەتوانێ نییەتی ئیقتیدا بهێنێ بەم تازە هاتووە، هەروەها، ئینسان ئەتوانێ ئیقتید بکا بە ئینسانێ کە لەپێش ئەودا مەشغووڵی نوێژ بووبێ و لەمکاتەوە، لە کردار و ئادابی نوێژدا شوێنی ئەو ئەکەوێ و وەك مەسبووق ئەبێ، واتە ئەبێ لەپاش تەواو بوونی نوێژی ئیمامەکەی، هەڵسێتەوە نوێژەکەی خۆی تەواو بکا؛ ئەگەر مەئمووم زووتر نوێژەکەی تەواو ئەکرد، ئەتوانێ لە تەحیاتا نییەتی جیابوونەوە بێنێ لە ئیمامەکەی و بۆ خۆی سەلام بداتەوە، ئەیشتوانێ هەر لە تەحیاتا بمێنێتەوە و مەشغووڵی خوێندنی دوعا بێ تا ئیمامەکەی سەلام ئەداتەوە، جا ئەمیش سەلام بداتەوە.

ئەگەر «مەسبووق» لە رکووعا گەیشت بە ئیمام، ئەوە ئەو رکاتەی بۆ حسێب ئەکرێ، بەو شەرتە لەپێش ئەوەدا کە ئیمام بەرز ببێتەوە بۆ ئیعتیدال، ئەم شەخسە لە رکووعا لەشی دامەزرێت؛ ئەگەر کەوتە شکەوە لەمەدا، ئەو رکاتەی بۆ ناژمێررێ. ئەوەی کە نییەتی ئیقتیدا بهێنێ لە کاتێکا کە ئیمام لە رکووعا بێ، واجبە «اللّە أكبر»ی دابەستنی نوێژەکەی بکا، جا سوننەتە «اللّە أكبر» بۆ رکووعەکەشی بکا، ئەگەر ماوەی هەبێ؛ ئەگەر بە «اللّە أكبری» یەکەم نیازی هەردووکیانی هەبێ، نوێژەکەی دانامەزرێ. ئەگەر لە ئیعتیدال یا لەبەینی ئیعتیدال و سوجدەی یەکەما، گەیشت بە ئیمام، ئەوە پاش «اللّە أكبر»ی نوێژدابەستن، دووبارە «اللّە أكبر» بکا و دوای ئیمام بکەوێ و لە سوجدە و تەحیات و تەسبیحاتا لەگەڵ ئیمام بێ؛ بەڵام ئەگەر لە سوجدەی یەکەم یا دواتردا گەیشت بە ئیمام، ئەوە بەس «اللّە أكبر» بکا بۆ دابەستنی نوێژ، ئیتر «اللّە أكبر» نەکا بۆ داپەڕین بۆ لای ئیمام.

کە ئیمامی نوێژکەری مەسبووق سەلامی دایەوە و مەئمووم ویستی هەستێ بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی خۆی، تەماشا بکا ئەگەر ئەو شوێنە شوێنی دانیشتنی خۆی بوو بۆ تەحیات، «اللّه أکبر» بکا، ئەگینا بێدەنگ بەرز بێتەوە بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی.

## باسی کورتکردنەوەی نوێژ

کورتکردنەوەی نوێژی فەرز، روخسەتێکە لەلایەن خودای گەورەوە بۆ موسوڵمانان، چونکە سەفەر کردن گرانەو ئینسان ناتوانێ بە ئاسانی وەکوو لەماڵەوە بێ، عیبادەتی تیا بکا.

ئەو نوێژەی کە کورت ئەکرێتەوە، نوێژی فەرزی چوار رکاتییە کە بە حازر بکرێ لە سەفەری درێژی دوو مەنزڵیدا؛ کەواتە، نوێژی حازر هەڵناگیرێ بۆ سەفەر بۆ ئەوەی کورت بکرێتەوە تیایا، هەروەها نوێژی فەوتاو بە کورتکراوەیی قەزا ناکرێتەوە لە سەفەردا، بەڵام نوێژی فەوتاوی سەفەر لە سەفەردا بە کورتی قەزا ئەکرێتەوە، وەکوو باسی ئەکەین.

سەرەتای سەفەر لە لادانی رێبوارەوە دەست پێئەکا لە ئاوەدانی ئەو شوێنەی کە سەفەری لێوە ئەکا؛ کەواتە، لادان لە کاول و وێرانەی دەوری شار یا دێیە کە، پێویست نییە، هەروەها لادان لە باخات و جێگە کشت و کاڵی ئەو شوێنە پێویست نییە، چونکە ئەمانە بە نەفسی ئاوەدانییەکە ناژمێررێن. ئەگەر خەڵکی وڵاتی رێبوارەکە دەوارنشین بوون، پێویستە لابدا لە خێوەتەکان و لە شوێن دانیشتنیان کە تیا دائەنیشن بۆ کۆبوونەوە و رابواردن؛ کە لە سەفەرەکەی گەڕایەوە، سەفەرەکەی ئەبڕێتەوە بە گەیشتنی بەو شوێنەی کە لەکاتی رۆیشتنیا بە سەرەتای سەفەری دانرابوو.

کە رێبوار بە نییەتی سەفەر لە ئاوەدانییەکان دەرچوو، ئەوە بە سەفەری ئەناسرێ و کورتکردنەوەی نوێژی بۆ دروستە، هەرچەند لە سەرەتای سەفەرەکەوە نییەتی ئەوەی نەبێ نوێژ کورت بکاتەوە، چونکە سەبەبی کورتکردنەوەی نوێژ، بوونی سەفەرەکەیە و نوێژکەر ئەتوانێ لە سەفەرەکەیا هەندێ نوێژ کورت بکاتەوە و هەندێکیشیان وەك خۆیان بەجێبێنێ.

ئەگەر کەسێك لە شوێنێکەوە کە نشینگەی خۆی نەبوو چوو بۆ سەفەر و لەو سەرەوە گەڕایەوە ئەو شوێنە، بەڵام نیازی نەبوو لەوێ دابنیشێ و ئەیویست لەوێوە بڕواتەوە بۆ وڵاتی ئەسڵی خۆی، ئەوە سەفەرەکەی نابڕێتەوە تا ئەگاتە ئەو وڵاتە.

ئەگەر یەکێك لە ماوەی سەفەریا گەیشتە شارێك و نییەتی مانەوەی چوار رۆژ یا زیاتری هێنا لەو شوێنەدا، ئەوە سەفەرەکەی ئەبڕێتەوە بە گەیشتنی بەو شوێنە، بەڵام رۆژی گەیشتن و گەڕانەوەی هەر بە رۆژی سەفەر بۆ دائەنرێت؛ ئەگەر نیازی مانەوەی ماوەیەکی تایبەتیشی نەبوو و ئەیویست هەرکاتێك ئیشەکەی جێبەجێ بوو بڕوا، ئەوە بێجگە لە رۆژی گەیشتن و گەڕانەوەی، تا هەژدە رۆژ حەقی کورتکردنەوەی نوێژی هەیە.

ئەگەر ئەیزانی ماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوە لەو شوێنەدا کە بۆی ئەچێ، وەك «طَالِبُ الْعِلم» و بازرگانی بەندەرگر، ئەوە کە گەیشتە ئەو شوێنە، حەقی کورتکردنەوەی نوێژی نامێنێ.

## شەرتەکانی کورتکردنەوەی نوێژ

شەرتەکانی کورتکردنەوەی نوێژ هەشتن:

[شەرتی] یەکەم، ئەوەیە سەفەرەکەی درێژ بێ؛ سەفەری درێژ لای ئیمامی شافیعی ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ بریتییە لە چل و هەشت میل بە «میلی هاشمی» کە وەختی خۆی ئەندازە بووە و بە حسێبی کاروانی، بریتییە لەدوو قۆناغی تەواو.

ئەگەر ئینسان لە دەریادا بە کەشتی و لە وشکانیدا بە ئۆتۆمۆبیل و ئەم جۆرە شتانە، ماوەی قۆناغێك یا زیاتری لە وەختێکی کەما بڕی، حەقی نوێژ کورتکردنەوەی لەو سەفەرەدا نافەوتێ، چونکە شەرع لەسەر ئاسانکاری ئەڕوا بەرامبەر بە موسوڵمان.

ئەگەر یەکێ نیازی سەفەرێکی درێژی کرد و لە رێگەدا نوێژی کورت کردەوە و لەپاش بڕینی ماوەی قۆناغێك پەشیمان بووەوە، ئەوە ئەو نوێژانەی لەوەوپێش کردوونی بەکورتی دروست بوون و قەزایان ناوێ، بەڵام لەوەپاش حەقی کورتکردنەوەی نییە.

**شەرتی دووهەم**، ئەوەیە سەفەرەکەی حەڵاڵ بێ؛ کەواتە دز وجەردە و ئەوانەی بۆ ئیشی حەرام ئەچن بۆ سەفەر، حەقی کورتکردنەوەی نوێژیان نییە، بەڵکوو ئەگەر یەکێ بە نیازی حەڵاڵ سەفەری کرد و پاشان نیازی گۆڕا بە حەرام، ئەوە لەکاتی نیازگۆڕانەکەیەوە بۆی نییە نوێژ کورتبکاتەوە.

**شەرتی سێهەم**، ئەوەیە بۆ شوێنێ بچێ بزانێ لە دوو قۆناغ کەمتر دوور نییە، با بەتایبەتی شوێنەکەیش نەزانێ؛ کەواتە، نوێژ کورتکردنەوە نییە بۆ ئەوانەی سەری خۆیان هەڵئەگرن و بە بێ‌نیازی شوێنێکی دیاری ئەسووڕێنەوە بەم‌لا و بەولادا؛ بەڵێ، ئەگەر بۆ ئەوە بگەڕێ بەڵکوو تووشی زانایەکی‌وا ببێ دەرسی عیلم و خوو و رەوشتی لێ وەربگرێ، ئەوە کورتکردنەوەی بۆ دروستە هەرچەند شوێنێکی تایبەتیشی مەبەست نەبێ. هەروا کورتکردنەوە نییە بۆ کەسێك بەدوای قەرزارێکا یا کەسێکیا بگەڕێ کە نەزانێ لە کوێیەو لە هەرلایەك بیدۆزێتەوە بگەڕێتەوە.

ئەگەر ژن لەگەڵ مێردەکەیا، یا کرێکار لەگەڵ خاوەن ئیشا، یا دیل لەگەڵ زۆردارا، یا سوپایی لەگەڵ سەرلەشکرا چوون بۆ سەفەر، ئەوە ئەگەر هەر لە سەرەتاوە ئەیانزانی ئەو سەفەرە دوو قۆناغ ئەبێ، یا چاویان بە گەورەکەیان کەوت نوێژی بە کورتکراوەیی ئەکرد، ئەوە ئەوانیش نوێژ کورتکردنەوەیان بۆ دروستە، ئەگینا حەقی ئەوەیان نییە تا دوو قۆناغ ئەبڕن، کە دوو قۆناغیان بڕی، ئەمجار حەقی کورتکردنەوەیان ئەبێ بۆ ئەو نوێژانەی لەوەولا ئەیکەن، هەروەها بۆ بەقەزا گێڕانەوەی ئەو نوێژانەیان کە لەماوەی دوو قۆناغە پێشووەکەدا فەوتاون؛ بەڵێ ئەو سوپاییانەی بە ئارەزووی خۆیان ئەڕۆن بۆ غەزا، تابیعی سەرۆك نین. وە ئەگەر بزانن دوو قۆناغ یا زیاتر ئەبڕن، حەقی کورتکردنەوەیان هەیە.

**شەرتی چوارەم**، ئەوەیە ئەگەر ویستی نوێژ بە جەماعەت بکا، ئیقتیدا بە ئیمامێ بکاکە نوێژ کورت بکاتەوە؛ کەواتە، ئەگەر بۆ یەك هەناسە ئیقتیدای بە ئیمامی نیشتەجێ کرد، ئەبێ نوێژەکەی تەواو بکا لەگەڵیا؛ هەروا ئەگەر ئیمامەکە مانیعێکی لێ‌پەیدا ببێ و نەتوانێ نوێژەکەی تەواو بکا، وەك ئەوەکە خوێنی لووتی بەربێ و یەکێکی نیشتەجێ

لەجیاتی ئەو بچێتە پێشەوە، لەم حاڵەشدا ئەبێ مەئموومی نوێژ کورتکەرەوەیش نوێژەکەی بەتەوای بکا، هەرچەند پاشان ئیمامی پێشوو بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی؛ بەڵێ، ئەگەر لەو کاتەدا کە ئیمامی تازە هاتە پێشەوە، ئەم زانی کەوا ئەم ئیمامە نوێژی تەواو ئەکاو نییەتی جوێبوونەوەی هێنا، ئەتوانێ نوێژەکەی بە کورتکراوەیی بکا.

تێکڕا، لە هەر شوێنێکا کە تەواوکردنی نوێژ واجب بێ لەسەر نوێژکەر، وەك ئەوە کە نییەتی نوێژی تەواوی هێنابێ و لەپاشا مانیعی لێ پەیدا بووبێ و پێی تەواو نەکرابێ، مەسەلا، بێدەس‌نوێژیی بەسەرا هاتبێ، یا دەرکەوتبێ کە ئیمام لەشی پیسە، یا پیسییەکی پەنامەکی پێوەیە و لەبەر ئەوە نوێژەکەی بڕی و ئەمجار ویستی بیکاتەوە، ئەوە ئەبێ بەتەواوی بیکاتەوەو بە قەتعی، مەجالی کورتکردنەوەی نییە، چونکە وەختی خۆی بەحاڵەتی تەواوکردنەوە فەرز بووە لەسەری؛ بەڵێ، ئەگەر دەرکەوت نوێژەکە لە ئەساسا دانەمەزراوە و بەتاڵ بووە، ئەوە ئێستە بە کورتکراوەیی بیکا دروستە.

ئەگەر یەکێ ئیقتیدای کرد بە ئیمامێ کە بە موسافیری ئەزانی، کەچی دەرکەوت نیشتەجێیە، یا بە ئیمامێ کە نەیئەزانی سەفەرییە، ئەوە پێویستە نوێژەکەی بەتەواوی بکا.

بەڵام ئەگەر ئەیزانی ئیمامەکە سەفەرییە و دڵنیا نەبوو لەوە کە نییەتی کورتکردنەوەی هێناوە، ئەوە ئەتوانێ نوێژەکەی کورت بکاتەوە، هەروەها ئەگەرلە نییتەکەیا وتبووی: ئەگەر ئیمام کورتی کردەوە، منیش کورتی ئەکەمەوە ئەگینا، بەتەواو ئەیکەم، ئەوە لەم حاڵەشدا ئەتوانێ لەگەڵ کورتکردنەوەی ئیماما ئەمیش کورتی کاتەوە.

**شەرتی پێنجەم**، ئەوەیە ئەو کەسەی نوێژ کورت ئەکاتەوە، لە «تەکبیری تەحەڕڕوم»دا نییەتی کورتکردنەوە بهێنێ.

**شەرتی شەشەم**، ئەوەیە لە هەموو پارچەیەکی نوێژەکەیا خۆی بپارێزێ لە هەرشتێ لەگەڵ نییەتی کورتکردنەوەدا ڕێك‌نەکەوێ؛ کەواتە، نابێ لە نوێژەکەیا دوو دڵ بێ بۆ تەواوکردنی، چ جای ئەوەکە عەزمی لەسەر تەواو کردنی هەبێ. ئەگەر نییەتی کورتکردنەوەی هێنا و لەپاشا دوو دڵ بوو لەوەدا کەوا بە کورتی بیکا یا بەتەواوی، یا کەوتە شکەوە لە خۆیا ئاخۆ نییەتی کورتکردنەوەی بووە یا نە، یا ئیمامەکەی

هەستایەوە بۆ رکاتی سێهەم و ئەمیش کەوتە شکەوە ئاخۆ ئیمام نوێژەکەی بەتەواوی ئەکا یا بەکورتی، یا ئەم هەستانەوەیە بە عەمدە یا بە سەهوە، پێویستە لە هەموو ئـەم سوورەتانەدا نوێژەکەی بەتەواوی بکا.

ئەگەر ئینسانێکی نوێژ کورتکەرەوە، بەعەمدی هەستایەوە بۆ رکاتی سێهـەم بـە بێ‌ئەوەکە شتێ ببێ بەهۆی تەواو کردنی نوێژەکەی، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بە سەهو هەستایەوە، ئەوە ئەبێ دانیشێتەوە و سەلام بداتەوە.

ئەگەر پاش هەستانەوە، ویستی نوێژەکەی تەواو بکا، ئەوە ئەبێ دانیشێتەوە، ئـەو جار هەڵسێتەوە و نوێژەکەی تەواو بکا.

**شەرتی حەوتەم**، ئەوەیە لە هەموو ئەجزای نوێژەکەیا سەفەری بـێ؛ کـەوابـوو، ئەگەر لەناو نوێژەکەیا نییەتی ئیقامەتی هێنا، یا شکی پەیدا کرد لە نییەتی ئیقامەتا، یا گەیشتەوە شوێنی خۆی، یا گومانی پەیدا کرد کەوا گەیشتووەتەوە، ئەبێ نوێژەکـەی تەواو بکا.

**شەرتی هەشتەم**، ئەوەیە کابرا ئاگادار بێ لە چۆنیەتی کـورتکردنەوەی نـوێژ؛ کەوابوو، ئینسانی نەزان ئەگەر لەخۆیەوە نییەتی کورتکردنەوەی نوێژی هێنا، ئەوە نوێژەکەی دانامەزرێ.

**بزانن!** ئەگەر سەفەر گەیشتە سێ قۆناغ یا زیـاتر، ئـەوە کـورتکردنەوەی نـوێژ خێرترە لە کورت نەکردنەوەی، ئەگینا تەواوکردن خێرترە؛ بەڵێ، بۆ کـەسێك لە دڵی خۆیا شکی ببێ لە کورتکردنەوەدا، یا ئارەزووی لێ نەبێ، یا لەو پیاوانە بێ کە خەڵك چاوی لێ بکەن، ئەو کورتکردنەوە خێری زۆرترە، بەڵکوو تـەواوکـردنی نـوێژ لەم حاڵەتانەدا کەراهەتی هەیە.

## باسی کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەکاتی یەکێکیانا

دروستە کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ و عەسرو، مەغریب و عیشا، بـەمجۆرە کـە هەردوو نوێژەکە لەکاتی یەکەمیانا، یا لەکاتی دووهەمیانا بکا، بەو شەرتە ئەو کەسە لە

سەفەرێکی درێژا بێ، «مَعَ الْعِلم»، ئەگەر هەر نوێژێکیان لەکاتی خۆیا بکا، ئەوە خێری زۆرترە بۆ کەسێك نەبێ کە گومانی هەبێ لەوەدا کە کۆکردنەوەی دوو نوێژ دروستە، هەروا بۆ کەسێك کە خەڵك چاوی لێ بکەن، یا ئەگەر پێکەوە بیانکا نوێژەکانی بێعەیبتر بن، یا لەکاتی بەجێهێنانی ئادابی حەجدا لە خاکی «عَرَفة» و «مُزْدَلِفة»دا، لەم سوورەتانەدا،کۆکردنەوەی دوو نوێژ بە پێش خستنیان یا پاش خستنیان، خێری زۆرترە و سوننەتە لە دینا.

ئەگەر رێبوار لەکاتی نوێژی یەکەما بە رێگەدا ئەڕۆیشت، ئەوە پاش خستنی نوێژەکان باشترە بۆی، ئەگینا پێش خستنیان چاکترە.

ئەگەر ئەو دوو نوێژەی پێش خست، ئەوە سێ شت پێویستە:

یەکەم: لەپێشا دەس بە نوێژی یەکەمیان بکا؛ کەواتە، ئەگەر هەردوو نوێژەکەی کردو لەپاشا دەرکەوت کە نوێژی یەکەمیان بەتاڵ بووە، ئەوە دووهەمیشیان بەتاڵ ئەبێتەوە، چونکە نوێژی دووهەم تابیعی نوێژی یەکەمە؛

دووهەم: ئەبێ نییەتی کۆکردنەوەی هەردوو نوێژەکەی بێ لە سەرەتای نوێژی یەکەمەوە یا لەپێش تەواو بوونیا؛

سێهەم: ئەو دوو نوێژە یەك لەدوای یەك بکا و بەینیان زۆر نەخا، هەتاوەکوو تەرکی سوننەتی «رَواتِب» بکا لەبەینیانا؛ کەوابوو، تەرتیب ئەوەیە لەپێش نوێژی نیوەڕۆدا سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ بکا، جا نوێژی نیوەڕۆ بکا، پاش ئەوە نوێژی عەسر بکا، جا سوننەتی پاش نیوەڕۆ بکا و لەدوای ئەوە سوننەتی عەسر بکا، هەروەها بۆ مەغریب و عیشایش. ئەگەر هات [و] بەینیان زۆر بوو، با عوزریشی بێ، ئەوە واجبە نوێژە دواییەکەی هەڵبگرێ بۆ وەختی خۆی. بەڵام ئەگەر بە عورف بەینیان کەم بوو، ئەوە قەیدی نییە؛ بەینی کەمیان داناوە بە ماوەی دوو رکات نوێژی سووك؛ کەوابوو، قەیدی نییە بەینیان بخرێ بە تازەکردنەوەی دەسنوێژ و بە بانگدان، هەر چەند لەو بەینەدا سوننەت نییە، هەروا بە قامەت کردن؛ بەڵکوو ئەگەر ئەمانە هەموویشیان بە شێوەیەکی درێژە پێنەدراو جێبەجێ بکرێن، قەیدی نییە.

کۆکردنەوەی نوێژ دروستە بۆ ئەوانەیش کە تەیەمموم ئەکەن. قەیدی نییە ئەگەر کابرا لەبەینی نوێژەکانا بگەڕێ بۆ ئاو، بەڵام گەڕانەکەی کەم بێ. جا ئەگەر دوو نوێژی کۆکردووەوە، پاشان زانی روکنێکی لە نوێژی یەکەما تەرك کردووە، ئەوە هەردوو نوێژەکەی بەتاڵ ئەبنەوەو ئەتوانێ هەردووکیان بەیەکەوە بکاتەوە، هەروەها ئەگەر هەر دووهەمیان بەتاڵ بوو و جیاییان لە یەك درێژەی نەکێشا، ئەگینا پێویستە هەڵی بگرێ بۆ وەختی خۆی؛ ئەگەر نەشیزانی ئەو روکنە لەکامیان تەرك کراوە، ئەوە هەردوو نوێژەکە بکاتەوە، هەر کام لە وەختی خۆیا.

ئەگەر «جَمعُ التّأخیر»ی کرد، یەعنی نوێژەکانی دواخست بۆ کاتی نوێژی دووهەمیان، ئەوە نە تەرتیب لەبەینی نوێژەکانا واجبەو نە نییەتی کۆکردنەوەو نە یەك لە شوێنی یەك، بەڵام واجبە لە وەختی نوێژی یەکەما نیازی دواخستنی هەبێ، ئەگینا گوناهبار ئەبێ و نوێژی یەکەمیان ئەبێ بە قەزا. ئەگەر کابرا «جَمعُ التّقدیم»ی کرد و لەبەینی نوێژەکانا بوو بە نیشتەجێ، ئەوە دروست نییە نوێژی دووهەم کۆبکاتەوە لەگەڵ یەکەمدا، بەڵام ئەگەر لەکاتی کردنی نوێژی دووهەما بوو بە نیشتەجێ، ئەوە زیانی نییە ئەگەر دواشی خستن و لەپاش هەردوو نوێژەکە ئیقامەتی کرد، ئەوە قەیدناکا، ئەگەر لەپێش تەواوکردنی هەردووکیشیان بوو بە نیشتەجێ، نوێژی یەکەم ئەکا بە قەزا.

بزانن! هەروەکوو کورتکردنەوەی نوێژ بەتەنها دروستە بە بێ کۆکردنەوەو کۆکردنەوە بەتەنها دروستە بە بێ کورتکردنەوە، کورتکردنەوە و کۆکردنەوەش پێکەوە دروستن، بەڵکوو لە هەندێ کاتا واجبن؛ بەمیسال، ئەگەر ئەو کەسە نییەتی کۆکردنەوەو دواخستنی هێناو وا رێکەوت تا ئەگەیشتە جێ وەختی بۆ نەئەما بەتەواوی بیانکا، ئەوە پێویستە دەسبەجێ نوێژی یەکەم و دوابەدوای ئەو نوێژی دووهەم، بە کورتکراوەیی، بکا تا هەردوو نوێژەکە لە وەختی شەرعی خۆیانا کرابن.

## کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەبەر بارشت و لەبەر نەخۆشی

دروستە بۆ کەسێك کە نوێژی جەماعەت بکا لە مزگەوتێکی دوورا، نوێژی نیوەڕۆ و عەسرو، نوێژی مەغریب و عیشا پێکەوە بکا لەکاتی نوێژی یەکەمیانا کە پێی ئەڵێن

«جمعُ التّقديم»؛ ئەمەش بەهۆی هێرشی بارانەوە، بەو شەرتە لە سەرەتای هەردوو نوێژەکە و لە کاتی سەلام دانەوەی یەکەمیشدا باران بباریێ هەروەها، ئەم کۆکردنەوەیە دروستە ئەگەر بەفر یا تەرزە ئەباری و بووبوو بە ئاو، بەو شەرتە کە ئەو نوێژانە بە جەماعەت بکاو ئەگەر دووجار بۆیان بڕوا بۆ مزگەوت تووشی ئازار و سەرما ببێ؛ لەحاڵیوادا، دروست نییە نوێژەکان دوابخا بۆ کاتی نوێژی دووهەمیان کە پێی ئەڵێن «جَمعُ التّأخير».

**بزانن!** گەلێك لە زانایانی مەزهەبی شافیعی، فەرموویانە: دروستە بۆ ئینسانی نەخۆش دوو نوێژ یەك بخا و لەکاتی هەرکامیانا ئارەزوویەتی بیانکا، گێڕراویشەتەوە کە ئەمە فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعییە -خوای لێ رازی بێ- نوێژکەر ئەتوانێ تەقلیدی ئەم فەرموودەیە بکا؛ «بِناءً عَليه»، تەماشای مەسڵەحەتی نەخۆشەکە ئەکرێ: ئەگەر لەسەر عادەتی خۆی وای هەست ئەکرد لەکاتی نوێژی یەکەمدا ئازار زۆری پێ ئەهێنێ، دوایان بخا وە ئەگەر بەپێچەوانەوەش بوو، پێشیان بخا؛ ئەگەر لە کاتی نوێژی یەکەمیان کردنی، ئەبێ نوێژی پێشوویان پێش‌بخا و دوابەدوای یەك بیانکا و لە نوێژی یەکەما نیازی ئەوەی لەدڵا بێ کە دووهەمی لەگەڵ کۆبکاتەوە؛ هەروەها، ئەبێ لەکاتی دابەستنی هەردوو نوێژەکە و سەلام دانەوەی نوێژی یەکەمیانا، نەخۆشییەکەی هەبێ؛ ئەگەر دوایشی خستن، هەر ئەوەندە پێویستە کە نەخۆشییەکەی تا ئاخری هەردوو نوێژەکە دەوام بکا، ئەگینا نوێژی یەکەم ئەبێ بە قەزا.

لە فەرموودەی توحفەی «ابنُ حَجر»ەوە وا دەرئەکەوێ کە نەخۆشی بەو شەرتە ئەبێ بەهۆی دروست بوونی کۆکردنەوەی دوو نوێژ [کە] نوێژەکەرەکە بۆی زەحمەت بێ هەرکامیان لە کاتی خۆیا بکا و پێویستیش ناکا ئەوەندە نارەحەت بێ ناچار بێ بە دانیشتنەوە نوێژ بکا.

**بێداری!** زانایانی شافیعی بە ئاشکرا نەیانفەرمووە شەرتی کۆکردنەوەی نوێژ بۆ نەخۆش، ئەوەیە بە جەماعەت بکرێ؛ وادیارە ئەمە شەرت نەبێ، چونکە زۆر زەحمەتە وا هەڵکەوێ لەگەڵ نەخۆشێکا کۆمەڵە نەخۆشێکی تریش هەبن، یا ئیمامێکی نەخۆشی

لەگەڵ بێ، تا پێکەوە نوێژ بە جەماعەت بکەن؛ ئەم مەسئەلەیە، تەنها بـۆ بـارسووکی نەخۆشەکەیە، ئیتر جەماعەت ببێ یا نەبێ.

## باسی نوێژی جومعە

نوێژی جومعە، دوو رکاتە؛ ئەم دوو رکاتە، لەگەڵ دوو خوتبە کە لەپێش نوێژەکەدا ئەخوێنرێنەوە جێنشینی نوێژی نیوەڕۆیە. نوێژی جومعە، فەرزی عەینە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی نێرینەی باڵغی عاقڵی نیشتەجێ بۆ هەموو کاتێ یا بە نیازی چوار رۆژ، غەیری رۆژی رۆیشتن و دەرچوون، لەشوێنێکا چل پیاوی موسوڵمانی عاقڵی خەڵکی ئەو شوێنەی تیابێ، یا ئەوەندەی تیا نەبێ، بەڵام نـزیکی شـارێ یـا دێیـەکـیوا بـن جومعەیان تیا بکرێ و دەنگی بانگی جومعەیان لەکاتی ئارامی دنیادا پێبگا. ئەوەندە هەیە ئەم کەسانە ئەگەرچی واجبە لەسەریان بڕۆن بۆ ئەو شوێنە کە جومعەکەی تـیا ئەکرێ و جومعەکەیان دروستە، بەڵام لەو شوێنەدا جومعەیان پێ تەواو نابێ.

جومعە فەرزە لەسەر پـیاوی پـیر و شـلەپەتکە، بـەو شـەرتە وڵاغـی سـواریـیان دەسبکەوێ؛ هەروەها لەسەر کوێرێ کە کەسێکی هەبێ دەسی رابکێشێ، بەڵام واجب نییە لەسەر رێبوار و ژن و نێرەمووك و دیل و زیندانی. ئەوەی جومعەی لەسەر نەبێ، ئەگەر گەیشتە مزگەوتیش، ئەتوانێ بێتە دەرەوە و جومعە نەکا، مەگەر نەخۆش وکوێرێ کەکەسێکی لەگەڵ بێ دەسی راکێشێ؛ ئەمانە ئەگەرگەیشتنە مزگەوت، نابێ بێنە دەرەوە تا جومعەکەیان ئەکەن، مەگەر نەخۆشەکە بە مانەوەی لە مزگەوتا ئازاری زۆرتر ببێ، ئەوە ئەتوانێ بچێتە دەرەوە.

بە شێوەیەکی گشتی، هەر کەس لەوانەی کە دروستە تەرکی نوێژی جومعە بکەن، ئەگەر بۆیان رێکەوت نوێژی جومعە بکەن، ئەوە جومعەکەیان دروستە و لەباتی نوێژی نیوەڕۆ بۆیان ئەژمێررێ. ئەوانەی کە جومعەیان لەسەرە، دروستە بەر لە بەیانی رۆژی جومعە لە شوێنی جومعەکە دەرچن بۆ ئیش وکار، یا بۆ سەفەر، با لە رێگایشا تووشی جومعە نەبن، چونکە لەو کاتەدا کە ئەوان چوونەتە دەرەوە، شەرع مەنعی دەرچوونی

لێنەکردوون؛ بەڵێ، ئەگەر ڕۆیشتن بۆ شوێنێ کە لەو شـوێنـەوە گـوێیـان لە بـانگی جومعەی خۆیانەوە بوو، فەرزە لەوێوە بێنەوە بۆ نوێژی جومعە، بەڵام ئەگەر دەنگی بانگی وڵاتێکی تریان ئەبیست، پێویست نییە بڕۆن بۆ نوێژی جومعە بۆ ئەو شوێنە.

دروست نییە ئینسان پاش سبەینێی ڕۆژی جومعە لە وڵاتی خۆی دەرچێ، چ پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان (زَوْال) و چ پاش لادانی، مەگەر بەو شەرتە کە لە ڕێگادا نوێژی جومعەی بۆ بکرێ؛ بەڵێ، ئەگەر بەهانەیەکی شەرعی هەبوو، وەکـوو ناچاریی پەیدا کردنی گوزەرانی ڕۆژانەی خۆی و منداڵی، یـا تـرسی دواکـەوتن لە کاروان، یا لە هاوڕێیەکی سەفەرکە زۆر پێویستی پێی بێ، یا وەك خەریك بوون بـە کاروباری کشتو کاڵەوە، ئەوە لەو حاڵەدا بۆی دروستە لە دێ دەرچێ و بڕوا بۆسەر ئەو ئیشانە، هەر چەند بیشبێ بەهۆی کەم بوونەوەی ئەو ژمارەیە کە پێویستە بۆ نوێژی جومعە؛ بەڵام ئەگەر دەنگی دێکەی ئەبیست، ئەوە فەرزە لەسەری بێتـەوە بـۆ دێ و جومعەکە بکا، مەگەر ناچارییەکیوا بێتە پێشەوە کە مەجالی نەمێنێ، وەك هـێرشـی ئافەت بۆ سەرکشت وکاڵ، بەجۆرێ کە لەوانەبێ کشتوکاڵەکەی بفەوتێ، ئەوە لەوکاتا دروستە، بەڵکوو فەرزە، نەیەتەوە، چونکە فەرزی نوێژ بە قەزا ئەکرێتەوە، بەڵام ئـەو زیانانە تۆڵەیان زۆر زەحمەتە.

ئەو کەسانەی لە ئەساسا نوێژی جومعەیان لەسەر نییە، وەکوو ژن، سوننەتە هەر لە ئەووەڵی وەختەوە نوێژی نیوەڕۆ بە جەماعەت بکەن؛ ئەگـەرلە ئـەساسا جـومعەیان لەسەربوو، بەڵام ئێستە عوزری شەرعییان هەبوو، ئەوانە ئەگەر ئـومێدی لاچـوونی عوزرەکەیان هەبوو، ئەوە سوننەتە نوێژی نیوەڕۆکەیان دوابخەن تا لە جومعەکە بـێ ئومێد ئەبن، ئەوسا نوێژی نیوەڕۆ بکەن، ئەگەر ئومێدی لاچوونی عوزرەکەیان نەبوو، هەر لە ئەووەڵی وەختەوە نوێژەکەیان بە جەماعەت بکەن، بەڵام ئەگەر بەهانەکـەیان نهێنی بوو، نوێژەکە بە پەنامەکی بکەن، ئەگەر ئاشکراش بوو، نوێژی جەماعەتەکەشیان بە ئاشکرا بکەن.

بێجگە لەو شەرتانەی بۆ نوێژەکانیتر پێویستن، نوێژی جومعە چەند شەرتێکـی تایبەتیتریشی هەیە:

یەکەم، ئەوەیە لە وەختی نوێژی نیوەڕۆدا بکرێت. ئەگەر لەو وەختەدا نەکرا، بە سیفەتی جومعەیی قەزا ناکرێتەوە، بەڵکوو بە نوێژی نیوەڕۆ ئەگێڕرێتەوە. ئەگەر ئەوەندەش وەخت نەمابوو بەشی دوو خوتبە و دوو رکات نوێژی سووك بکا، ئەوە پێویستە نییەتی نوێژی نیوەڕۆ بێنن، چونکە نوێژی نیوەڕۆ بەوە دائەمەزرێ کە هیچ نەبێ تاقە رکاتێکی لە وەختی خوێدا بکرێ، بەڵام نوێژی جومعە پێویستە هەمووی لە کاتی خۆیدا بکرێ؛ ئەگەر کۆمەڵێك لە نوێژی جومعەدا بوون و لەپێش سەلامی یەکەمی نوێژەکەدا وەختی نیوەڕۆ نەما، ئەوە پێویستە لەسەر ئەو دوو رکاتەوە کە کردوویانە، دوو رکاتی تر بکەن و ئەو نوێژە بکەن بە نوێژی نیوەڕۆ. ئەگەر مەئموومێکی لێ پێشکەوتوو لەگەڵ ئیمامی جومعەدا رکاتێك نوێژی کرد و پاش سەلامی ئیمامەکە تێ گەیشت کەوا وەخت بەشی رکاتێکی تری نەماوە، ئەوە واجبە لەسەری نوێژەکەی بکا بە نوێژی نیوەڕۆ.

دووهەم، ئەوەیە ئەو نوێژی جومعەیە لە «خِطّة»ی خانوو و مەسکەنی ئەهلی جومعەکەدا بکرێت. مەبەست لە «خِطّة»، شوێنێکە لەناو شوورەی دەوری شارا بێ، یا لەمدیوی ئەو شوێنەوە بێ کە بە سەرەتای مەسافەی نوێژ کورتکردنەوە دائەنرێ بۆ رێبوار، خوا ئەو شوێنە دەشت بێ یا سابات یا مزگەوت یا هەر خانوویەکی تر.

شەرتی سێهەم، ئەوەیە جومعەیەکی تر لەپێش یا لەگەڵ ئەم جومعەدا نەکرابێ، چونکە مەزهەبی ئیمامی شافیعی - خوای لێ رازی بێ - ئەوەیە نابێ لە یەك شوێنا لە یەك جومعە زیاتر بکرێ، مەگەر ئەو شوێنە شارێکی گەورەی وا بێ ئەو کەسانەی ئەغلەب حازری جومعە ئەبن، مومکین نەبێ لە یەك شوێنا تیا گردببنەوە؛ لەم وەختەدا دروستە لە یەك جومعە زیاتر بکرێ لەو شوێنەدا، بەڵام بۆ ئەم جومعە زیادەیە، پێویستە ئیمام، یەعنی سەرۆك و فەرمانداری ئوممەتی ئیسلام رێگای دابێ.

جا ئەگەر بە بێ ناچاری لە جومعەیەك زیاتر کرا لە شوێنێکا، ئەوە تەنها جومعە پێش کەوتووەکەیان دائەمەزرێ؛ بۆ زانینی ئەوەش کە کامیان لە پێشەوە بووە، سەرنجی ئەوە ئەدرێ کە «اللّٰهُ أكبر»ی دەس پێ کردنی کامیان لەپێشەوە بووە؛ ئەگەر جومعە

پێشووەکەیان لەبیر چووبووەوە، واجبە لەسەریان و فەرزی عەینە نوێژی نیوەڕۆ بکەن، فەرزی کیفایەشە کە بە جەماعەت بیکەن، ئیتر لەم وەختەدا قابیل نییە نوێژی جومعە دووبارە بکرێتەوە، لەبەر ئەوە کە جومعەیەکی راست کراوە، ئەوەندە هەیە ئێستە لەبیرمان نەماوە کام جومعەیانە. ئەگەر هەردوو جومعەکە بەیەکەوە بوون، یا گومانمان هەبوو کەوا بەیەکەوە بوون، یا بەرودوا بوون، ئەوە هەردووکیان بەتاڵن و پێویستە سەرلەنوێ جومعەیێکی تر بکرێت؛ ئەگەر کردنەوەی نوێژی جومعە رێك نەئەکەوت، ئەوە فەرزی عەینە نوێژەکەی نیوەڕۆ بکەنەوە و فەرزی کیفایەیە بە جەماعەتیش بیکەن؛ لەم‌سوورەتەدا سونەتی پێش جومعە ئەکرێت لەبەر ئەوەکە لەئەساساکردنی جومعەکە دروست بووە، بەڵام سونەتی پاش جومعە ناکرێت، چونکە شەرتی ئەو سونەتە ئەوەیە لەپاش جومعەیەکی بێ‌عەیب بکرێ.

ئەگەر کەسێ بڵێت: چۆن قابیلە، لەکاتێکا، دوو فەرز بکرێت؟! ئەڵێین: مەعلووم نییە جومعەکان هیچیان دروست بووبێ، کەواتە، لەسوورەتی ئەوەدایە جومعە هەر نەکرابێ و تەنیا نوێژی نیوەڕۆ کرابێ.

ئەگەر کەسێ بڵێ: لەشارێکا کە جومعەی زیاد لە پێویستی تیا بکرێ، ئینسان شکی هەیە لەوەدا کە ئاخۆ جومعەکەی خۆی لەپێشەوە بووە یا ئەویان، کەواتە، لەگەڵ ئەم شکەدا چۆن نییەتی جومعەمان بۆ دێت! لە وەڵاما، ئەڵێین: ئەم شکە کە ئێمە هەمانە لەپێش‌کەوتنی جومعەکانا، مانیعی نییەت نییە، لەبەر ئەوە کە ئیحتیمالی هەیە جومعەکەی ئێمە پێش‌کەوتوو بووبێ و لەبەر ئەم ئیحتیماله، دروستە ئیقدام بکەین لەسەر نوێژی جومعە و نییەت بهێنین[1].

ئەگەر هەردوو جومعەکە لەبەر ناچاری کرابوون، ئەوە هەردووکیان دروستن، بەڵام سونەتە لەپاش جومعە نوێژی نیوەڕۆ بکرێتەوە بۆ ئەوەی لە خیلافی ئەو ئیمامانە رزگار ببین کە بە هیچ‌جۆرێ رازی نابن بە زۆریی جومعە؛ سونەتیشە ئەم نیوەڕۆیە بە جەماعەت بکرێ.

---

١. ئەم باسە، لە «تُحفە»دا وتراوە.

بزانن! تێکڕا، لە هەر لایەکا کردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ واجب بێ، جەماعەتەکەیشی فەرزی کیفایەیە، لە هەرلایەکیشا کردنەوەی سوننەت بێ، وەکوو ئەمە کە ئێستا لەبەر ناچاری لە یەك ئاوەدانیدا لەگەڵی لادا نوێژی جومعە ئەکرێ، یاخود وەکوو ئەوە کە ژمارەی خەڵکەکە لە چل کەس کەمتر بێ و بە تەقلید نـوێژی جـومعە بکـەن، ئـەوە جەماعەتەکەیشی سوننەتە.

**شەرتی چوارەم**، ئەوەیە بە جەماعەت بکرێ و ئیمام و مەئمووم، هەردووکیان، نییەتی جەماعەت بێنن. شەرتی ئەم جەماعەتە، ئەوەیە بە چل کەس بێ، هەر چـەند ئیمامەکەش یەکێك بێ لەم چل کەسە، یاخود یەکێکیان نەخۆشێك بێ لە ماڵی خۆیا نوێژی نیوەڕۆی کردبێ و بە نیازی جومعە خۆی گەیاندبێتە مزگەوت، یاخود پیاوێك بێ لە دێیەکی ترا نوێژی جومعەی کردبێ و گورج هاتبێتەوە بۆ دێکەی خۆی و لەوێیش نوێژی جومعە بکا. پێویستە ئەو چل کەسە خەڵکی ئەو شوێنە بن و لەبەر ناچاری نەبێ، نە بە زستان و نە بە هاوین، کۆچ نەکەن؛ ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك هەمیشە کۆچەری بن، ئەوە بە هیچ جۆرێ نوێژی جومعەیان لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر بۆیان بلوێ بیکەن، ئەوە دروستە و لەباتی نوێژی نیوەڕۆ دائەنیشێ؛ ئەگەر لە دەوار و خێوەتیشا بن و نەجووڵێن، بەڵام ئامادە بن بۆ جووڵان، ئەمانەیش جومعەیان لەسەر نییە، مەگەر کاتێ دەوارەکانیان لە ناوبەینی خانووی خانوونشینا بێ و خانوونشینەکـانیش جـومعە بکـەن، یـاخود دەنگی بانگی جومعە ببیسن لە شوێنێکی نزیکەوە، وەکوو باسمان کرد.

ئەگەر کەسێك لە دوو شوێنا خانووی هەبوو [و] جارێ لەمیان و جـارێ لەویـانا دائەنیشت، ئەوە ئەوەیانی بۆ دائەنرێ بە شوێنی راستەقینە کە زیـاتر تـیا دائـەنیشێ؛ ئەگەر لە هەردووکیانا وەك یەك دائەنیشت، ئەوە ئیعتیبار بەویانەیە کە ژن و منداڵەکەیی تیایە؛ ئەگەر لە هەردووکیانا ژن و منداڵی هەبوو، ئەوە لە هەردووکیانا بـە هـاووڵات دائەنرێ و لە هەرکامیانا نوێژی جومعە کرا، جومعەی تیا واجب ئەبێ لەسەری؛ ئەمە، حوکمی کەسێکە کە نیشتەجێ بێ و لە شوێنی خۆی نەجووڵێ.

ئەگەر کۆمەڵێك هەبوون لە پایز و زستان و ماوەیەکی بەهارا لە شوێنـی خـۆیـانا نیشتەجێ بوون و لەو بەشەکەی بەهار و لە هاوینا ئەچوون بۆ هەوارگەی کوێستان، ئەوە

ئەگەر هەوارگەیەکی تایبەتییان هەبێ بۆ هەموو ساڵێك، لەوێیشدا بە هاووڵات دائەنرێن، جا ئەگەر شەرتەکانی جومعەیان تیا هاتەدی، جومعەیان لەسەر واجب ئەبێ تیایا؛ ئەگەر هەوارگەی تایبەتیشیان نەبوو و هەر ساڵێ لە شوێنێك ئەبوون، یا لە تاقە ساڵێکا ئەیان گواستەوە بۆ چەند شوێن، ئەوە لەو هەوارانەدا جومعەیان لەسەر نییە تا ئەگەڕێنەوە بۆ شوێنی زستانیان.

ئەگەر خەڵکی دێیەك بە بەهار و هاوین ئەچوون بۆ ناوباخ و بێستان، وەك خەڵکی «خۆشناوەتی و هەورامان» و چەند مانگێك لەوێ رایان ئەبوارد، ئەوە ئەو باخ و بێستانەش هەر بە ناودێ دائەنرێ بۆیان؛ جا ئەگەر لە ناو باخەوە دەنگی بانگی ناودێیان ئەبیست، ئەوە فەرزە لەسەریان هەموو جومعەیێ بێنەوە بۆ ناودێ و نوێژی جومعە بکەن؛ ئەگەر ئەوەندەش دوور بوون دەنگی بانگیان نەئەبیست، ئەوە واجب نییە بگەڕێنەوە بۆ نوێژی جومعە بۆ ناودێ، جا لەم کاتەدا، ئەگەر ئەهلی باخەکان ئەوەندە زۆربوون جومعەیان پێ تەواو ئەبوو، ئەوە واجبە لەوێ جومعە بکەن، ئەگینا جومعەیان لەسەر نییە.

**شەرتی پێنجەم**، ئەوەیە دوو خوتبە لەپێش نوێژەکەوە بخوێنرێتەوە. ئەرکانی ئەم دوو خوتبەیە، پێنجن؛ سیانیان موشتەرەکە لەبەینی هەردوو خوتبەکەدا، وەك حەمد و سەنای خوا و سەڵەوات دان لەسەر حەزرەتی پێغەمبەرﷺ بە ناوی خۆیو پەند و ئامۆژگاری خەڵکەکە کە لە خوا بترسن. ئەبێ خوتبەخوێن لەفزی «حمد» و «صَلاة» بەکاربێنێ. روکنی چوارەمی دوو خوتبەکە، ئەوەیە ئایەتێکی قورئان لە یەکێکیانا بخوێنێ و دوعاکە لە خوتبەی دووهەمدا بکا. قسەی راستتر ئەوەیە تەرتیب لە نێوانی ئەم ئەرکانانەدا شەرت نییە؛ کەواتە، ئەگەر لە ئاخرەوە سەڵاوات بدا لە دیداری پێغەمبەر، قەیدناکا. شەرتە لەم دوو خوتبەیەدا ئەرکانەکانیان بە عەرەبی بێ و بەینیان زۆر نەبێ، نە بە قسەی بێگانە و نە بە بێدەنگی؛ ئەبێ خوتبەکانیش یەك لەدوای یەك بن و دانیشتنێکی کەم لەبەینیانا بێ، ئەوەندەی ئەوەکە جێگەی خوێندنی سوورەتی «قُلْ هُوَ اللّٰه»ی تیا ببێتەوە؛ خوێندنی ئەم سوورەتە خۆی لەبەینی دوو خوتبەکەدا سوننەتە؛

هەروەها، شەرتە ماوەی بەینی دوو خوتبەکە و نوێژەکە لە ئەندازەی دوو رکات نوێژی سوننەتی سووك زیاتر نەبێ؛ هەروا شەرتە خوتبەکان لەپێش نوێژەکەدا بن و لەوەختی نیوەڕۆدا و لەناو «خِطّة»ی ئەو شوێنەدا کە جومعەکەی تیا ئەکرێ؛ ئەبێ ئەوەندەش ئاشکرا بن قابیل بێ ئەو چل کەسەی کە حازرن، بیانبیسن؛ هەروەها، شەرتە ئەو چل کەسە ئەرکانی خوتبەکە ببیسن وە ئەگەر هەندێکیان لە کاتی خوێندنی ئەرکانی خوتبەکانا دیار نەبوون، پێویستە پاش هاتنیان خوتبەکان دووبارە بخوێنرێنەوە، مەگەر دیار نەبوونەکەیان بۆ ماوەیەکی ئێجگار کەم بێ، لەو حاڵەدا پێویست نییە دیسان خوتبەکە بخوێنرێتەوە [و] قەیدیشی نییە خەتیب لەسەر خوتبە خوێندنەوەی خۆی بڕوا.

شەرتی خەتیب، ئەوەیە پاك بێ لە بێدەس‌نوێژی و لەش پیسی و لە هەر پیسییەك عەفوی لێ نەدرابێ؛ ئەشبێ نێرینە بێ و عەورەتی داپۆشیبێ، هەروا ئەبێ دروست بێ ئیقتیدای پێ‌بکرێ. ئەگەر توانای راوەستانی هەبێ، نابێ دابنیشێ بۆ خوتبە خوێندنەوە، ئەگینا قەید ناکا؛ ئەگەر دایشنیشت، ئەبێ لە بەینی خوتبەکانا کەمێك بێ‌دەنگ ببێت، بەڵام ئەوانەی کە گوێیان لە خوتبەکان گرتووە، شەرت نییە لەو کاتەدا دەس‌نوێژیان هەبێ و عەورەتیان داپۆشیبێ؛ هەروەها شەرت نییە ئەوەی خوتبە ئەخوێنێتەوە هەر خۆیشی ببێ بە ئیمامی نوێژەکە؛ کەواتە، ئەگەر یەکێك خوتبەی خوێندەوە و یەکێکی تر ئیمامەتی نوێژەکەی کرد، زەرەری نییە.

دروستە جومعە لەپشتی منداڵی خاوەن تەمیز و لەپشتی ئیمامی سەفەرییەوە، ئەگەر ئەمانە زیاد بن لە ژمارەی چل کەسەکە؛ لەم‌کاتەدا کە ئیمام لە چل کەسەکە زیادە، ئەگەر دەرکەوت پیسایییەکی پەنامەکی پێوە بووە، نوێژی مەئموومەکان بەتاڵ نابێتەوە.

سوننەتە «خَطیب»، لەپاش کۆبوونەوەی خەڵك و داهاتنی وەختی نوێژ بێت بۆ ناو جامیعە و پاش سوننەتی نوێژی جومعە، بچێتە سەر مینبەر؛ ئەگەر مینبەر نەبوو، بڕواتە سەر شوێنێکی بەرز، جا روو بکاتە خەڵکەکە و سەلام بکا لەوانەی لە نزیکی میحرابەکەوەن و پاش ئەوە دابنیشێ، ئەنجا بانگ‌دەر هەڵسێتەوە بانگ بدات؛ لەپاش تەواوبوونی بانگەکەش، خەتیب هەڵسێتە سەر پێ، دوو خوتبەی کورتی پڕ مەعنای

موناسب بۆ وەزعی موسوڵمانان بخوێنێتەوە، لەکاتی خوێندنەوەی خوتبەکانا بەدەستی چەپی هێز بداتە سەر شیرێك یا عاسایەك و دەستی راستی لەلای مینبەرەکە توند بکا. سوننەتە خەڵکەکە هەموو گوێ بگرن و بێدەنگ ببن؛ لەپاش خوتبەی دواییش، ئیمام گورج بێتە خوارەوە بۆ میحراب و تا ئەو ئەگاتە میحراب «مُؤَذِّن» قامەت تەواو بکا، جا ئیمام نوێژ دابەستێ و دوو رکات نوێژ بکا [و] لە رکاتی یەکەما، سوورەتی «الْجُمُعة» یا «الأعْلٰى» و لە رکاتی دووهەما، سوورەتی «المُنٰافِقون» یا «الغٰاشِية» بخوێنێ.

## باسی هەندێ سوننەتی جومعە لەگەڵ ئەو غوسڵانەکە سوننەتن

سوننەتە بۆ کەسێك بیەوێ بڕوا بۆ نوێژی جومعە، خۆی بشوا؛ وەختی ئەم سوننەتە دەس پێ ئەکا لە بەرەبەیانی رۆژی جومعەوە، بەڵام ئەگەر نزیکی بخاتەوە لە رۆیشتنی بۆ نوێژەکە، خێری زۆرترە. ئەگەر ئاو نەبوو بۆ خۆشۆردن، یاخود نەیتوانی بە کاری بێنێ، سوننەتە تەیەمموم بکا. هەروەها، سوننەتە غوسڵ لەپێش نوێژی جەژنەکان و نوێژی رۆژگیران و مانگگیران و نوێژە بارانە؛ بۆ ئەو کەسەیش کە مردووی شۆردبێ و بۆ شێت و لەهۆشی خۆچوو، هەرکاتێ کە رزگار بوون لە نەخۆشییەکەیان، بۆکافریش، پاش موسوڵمان بوونی. هەروەها غوسڵەکانی ناو ئادابی حەج سوننەتن؛ سوننەتە غوسڵ بۆ ئەو کەسەی بیەوێ «اِعْتِكاف» بکا لە مزگەوتا و بۆ داخڵبوونی ئەرزی حەرەمی شاری «مەدینەی مونەووەرە» و «مەککەی موکەڕڕەمە»، با لە ئیحرامیشا نەبێ؛ سوننەتیشە لە هەموو شەوێکی رەمەزانا و بۆ ئەو کەسەی بەساڵ باڵغ ببێ و پاش کەڵەشاخ و خوێن گرتن و پاش تاشینی مووی بەر و بنباڵ و بۆ چوونە ناو هەر قەرەباڵغێکەوە کە بۆ چاکە کۆبووبنەوە. گەورەترینی ئەم غوسڵانە، غوسڵی جومعەیە، ئەمجار غوسڵی کەسێ کە مردووی شۆردبێ.

سوننەتە بۆ ئەو کەسەی ئەڕوا بۆ نوێژی جومعە، زوو بڕوا؛ وەختی ئەم رۆیشتنە دایەت لە بەرەبەیانەوە؛ سوننەتیشە بە پیادە و بە ئارام و ئەدەب بڕوا بەرێدا؛ هەروا،

سوننەتە لەو کاتەوەکە ئەڕوا بۆ نوێژ تا خەتیب ئەچێتە سەر مینبەر، خەریکی خوێندنی قورئان و زیکر کردن بێ، گەورەترین زیکر لەم‌شوێنەدا سەڵاوات‌دانە لەسەر پێغەمبەرﷺ. سوننەتە لەکاتی جێگا دۆزینەوەدا بۆ خۆی، هەنگاو بەسەر کەسدا نەنێ، مەگەر لەکاتێکا لە ریزی پێشەوە جێگایەکی خاڵی هەبێ و بیەوێ بچێتە ئەو جێگایە، بۆ ئیمامیش ئەگەر درەنگ هاتبێتە مزگەوتەوە، قەیدی نییە هەنگاو بەسەر خەڵکەکەدا بنێ و بڕواتە جێگەکەی خۆی. سوننەتە بۆ نوێژی جومعەکام جل و بەرگی جوان و پاکی هەیە، ئەوە بکاتە بەری و نینۆکی بکاو بۆنی ناخۆش لە خۆی دوور بخاتەوە و بۆنی خۆش بدا لەخۆی. سوننەتە لە شەو و رۆژی جومعەدا سوورەتی «الْكَهف» بخوێنێ و دوعای خێر زۆر بکا بۆ موسوڵمانان، بەڵکوو رێکەوتی ئەو کاتە بکا کە دوعای تیا گیرایە؛ زانایانی دین، ئەڵێن: هیوامان ئەوەیە ئەو کاتە لەبەینی دانیشتنی خەتیب لەسەر مینبەر و تەواو بوونی نوێژی جومعەدا بێ. سوننەتە لە شەو و رۆژی جومعەدا سەڵاوات زۆر بدا لە پێغەمبەرﷺ.

کەراهەتی هەیە ئینسان پاش زەوالی رۆژی جومعە و پێش بانگ، خەریکی مامەڵە و کڕین و فرۆشتن بێ [و] پاش ئەوەش کە بانگ‌دەر بانگی بەردەمی خەتیبی دا تا نوێژ تەواو ئەبێ، حەرامە، بەڵام هەر مامەڵەیەك لەم ماوەیەدا بکرێ دائەمەزرێ.

## باسی گەیشتن بە نوێژی جومعەدا

هەرکەس بە رکووعی رکاتی دووهەماگەیشت، ئەوە بە نوێژی جومعەدا گەیشتووە و پاش سەلام‌دانەوەی ئیمام، رکاتێکی‌تر نوێژ ئەکاو سەلام ئەداتەوە؛ ئەگەر پاش رکووعی رکاتی دووهەم گەیشت بە ئیمام، ئەوە جومعەکەی لەدەس دەرچووە و پێویستە پاش سەلامی ئیمام، چوار رکات نوێژی نیوەڕۆ تەواو بکا؛ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەگەر پاش رکووعی دووهەمیش گەیشت بە ئیمام، ئەبێ هەر نییەتی نوێژی جومعە بێنێ؛ ئەمەیە ئەوە کە «مەتەڵە» ئەهێننەوە ئەڵێن: نییەتم هێنا و نوێژم نەکرد، نوێژم کرد و نییەتم نەهێنا!

هەرکاتێ کە ئیمام بەهۆی پەیدابوونی بێدەسنوێژی یا هەر هۆیەکی ترەوە نوێژی جومعەکەی بەجێهێشت، دروستە یەکێك بنێتە جێی خۆی بۆ ئەوەی نوێژەکە بە مەئموومەکان تەواو بکا، پێویستە ئەم جێنشینە یەکێك بێ لە مەئموومەکانی خۆی، بەڵام لە غەیری نوێژی جومعەدا دروستە مەئموومی خۆیشی نەبێ؛ جا ئەگەر ئەم جێنشینە بە رکاتی یەکەمدا گەیشتبوو، ئەوە نوێژەکەیان بەیەکەوە تەواو ئەبێ، ئەگینا، جومعەی مەئموومەکان بەر لە هی ئەو تەواو ئەبێ و پێویستە ئەم جێنشینە لەسەر ئوسووڵی نوێژی ئیمامەکەی پێش خۆی بڕوا و کاتێ کە گەیشتە نزیکی سەلامدانەوە، ئیشارەت بۆ خەڵکەکە بکا کە یا لێی جیا ببنەوە، یاخود چاوەڕوانی بکەن تا ئەم هەڵئەسێتەوە نوێژەکەی خۆی تەواو ئەکاو ئەگاتەوە بەواندا و سەلام ئەداتەوە تا ئەوانیش پاش ئەو سەلام بدەنەوە.

ئەگەر مەئموومێکی نوێژی جومعە، لەبەر زۆری قەرەباڵغ، مەجالی نەبوو لە رکاتی یەکەما لە شوێنی خۆیا سوجدە ببا، ئەوە ئەگەر رێکەوت، لەسەر لەشی یەکێك سوجدە ببا، باشە؛ ئەگینا، چاوەڕوانی فرسەت بێ، جا ئەگەر پێش رکووع بردنی ئیمام لە رکاتی دووهەما بۆی رێکەوت سوجدە ببا، ئەوە ببیا و پاش ئەوە کە سەری بەرز کردەوە، بکەوێتەوە شوێنی ئیمام، چ بەپێوە بێ و چ لە رکووعی دووهەما بێ و بە وێنەی مەسبووق رکاتی دووهەمیشی بۆ ئەژمێررێ و لەگەڵ ئیماما سەلام بداتەوە. ئەگەر لەپاش ئەوەکە سەری لە سوجدە بەرزکردەوە، ئیمام لە رکووعی دووهەم دەرچووبوو، بەڵام هێشتا سەلامی نەدابووەوە، ئەوە پێویستە لە هەر شوێنێکی نوێژەکەیدا بێ، شوێنی ئیمام بکەوێ [و] پاش ئەوەکە ئیمام سەلامی دایەوە، هەستێ رکاتێك نوێژ بکا و سەلام بداتەوەو لەمسوورەتەیشا جومعەی بۆ کراوە. ئەگەر تا ئەم سەری لە دوو سوجدەکەی هەڵبڕی، ئیمام سەلامی دابووەوە، ئەوە جومعەکەی فەوتاوە و ئەبێ نوێژەکەی بە سوورەتی نوێژی نیوەڕۆ بۆ خۆی تەواو بکا. ئەگەر هەر بۆی رێنەکەوت سوجدە ببا تا ئیمام گەیشتە رکووعی رکاتی دووهەم، ئەوە پێویستە چاوەڕوانی فرسەتی سوجدە نەبێ، بەڵکوو شوێنی ئیمام بکەوێ لەم رکووعەدا و نوێژەکەی لەگەڵ بکا؛ بەمجۆرە، رکاتێکی بۆ ئەژمێررێ کە تێکەڵە لە رکووعی رکاتی یەکەم و سوجدەی رکاتی

دووهەم‌و، رکووعی رکاتی دووهەم بەزیادە دەرئەچیٚ‌و ئەبیٚ لەپاش سەلام دانەوەی ئیمام، هەستیٚ رکاتێکی‌تر بکا و تەحیات بخوێنیٚ و سەلام بداتەوە؛ ئەگەر لەم‌حاڵەدا شوێن ئیمام نەکەوت و لەسەر تەرتیبی خۆی رۆیی تا سوجدەی بردو ئەوجا کەوتەوە شوێن ئیمام و ئەیشی‌زانی کە ئەبیٚ شوێنی ئیمام بکەویٚ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە؛ بەڵام ئەگەر نەیئەزانی، واجبە شوێنی ئیمام بکەویٚ، یاخود لەبیری چووبووەوە، ئەوە سوجدەی رکاتی یەکەمی بۆ حیساب ناکریٚ؛ جا ئەگەر بەرلە سەلام دانەوەی ئیمام بە سوجدەی رکاتی دووهەما گەیشت، ئەوە لەم سوورەتەشدا رکاتێکی لە رکووعی رکاتی یەکەم و سوجدەی رکاتی دووهەم بۆ ئەژمێریٚ و پاش سەلام‌دانەوەی ئیمام، هەستیٚ رکاتێکی‌تر بکاو تەحیات بخوێنیٚ و سەلام بداتەوە. ئەگەر ئاگای لە خۆی نەبوو رکووعی رکاتی یەکەمی نەبرد تا ئیمام گەیشتە رکووعی رکاتی دووهەم، ئەوە پێویستە لەگەڵ ئیماما رکووع بباو لەگەڵیا بیٚ تا سەلام ئەداتەوە؛ بەم‌جۆرە، رکاتێکی دەس ئەکەویٚ؛ جا پاش سەلام دانەوەی ئیمام هەڵسێتەوە رکاتەکەی‌تری بکا.

**بزانن!** موسوڵمانان، بە نیسبەت نوێژی جومعەوە، شەش بەشن:

**یەکەم:** نە جومعەیان لەسەرەو نە پێیان تەواو ئەبیٚ و نە بۆیان دروستە؛ ئەمانە بریتین لە شێت و لە هۆشی‌خۆ چوو و سەرخۆش؛

**دووهەم:** جومعەیان لەسەرەو پێیان تەواو ئەبیٚ‌و بۆیشیان دروستە؛ ئەمانە بریتین لە پیاوانی عاقڵی باڵغی خەڵکی شوێنەکە لەوانەکە عوزرێکی شەرعییان نییە بۆ نەکردنی نوێژی جومعە؛

**سێهەم:** جومعەیان لەسەر نییە، بەڵام پێیان تەواو ئەبیٚ و، بۆیان دروستە؛ ئەمانە ئەوانەن کە عوزرێکیان هەیە بۆ نەکردنی نوێژی جومعە، غەیری سەفەر، وەك ئینسانی نەخۆش؛

**چوارەم:** جومعەیان لەسەرە و بۆیان دروستە، بەڵام پێیان تەواو نابیٚ؛ ئەمانە بریتین لەوکەسانەکە خەڵکی شوێنەکە نین، بەڵام نیشتەجێی وڵاتەکەن و بۆ چوار رۆژ یا زیاتر

هاتوونو ئەگەڕێنەوە و ئەوانەن کە لە دەرەوەی شوێنی نوێژی جومعەکـەدان، بـەڵام گوێیان لە بانگی جومعەوەیە؛

پێنجەم: جومعەیان لەسەر نییە و پێیان تەواو نابێ، بەڵام ئەگەر کـردیان بـۆیـان دائەمەزرێ؛ ئەمانە بریتین لە رێبوار و لەو کەسانە کە لەدەرەوەی جێگای جومعەکەدان و دەنگی بانگی جومعەش نابیسن، بەڵام هاتوون بۆ جومعە؛

شەشەم: جومعەیان لەسـەرە، بـەڵام بـۆیـان دروست نـییە؛ ئـەمانە ئـەو کـۆنـە موسوڵمانانەن کە لە دین وەرگەڕاونـەتەوە؛ ئـەمانە تـا مـوسوڵمـان نـەبنەوە نـوێژی جومعەیان بۆ دروست نییە، بەڵام لەسەر نەکردنی گوناهبار ئەبن.

## بێداری!

هەرچەند فەرموودەی بەهێزی ئیمامی شافیعی ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ ئـەوەیە کـە نوێژی جومعە چل کەسی پێویستە، بەڵام چەند فەرموودەیەکی تریش هەیەکەوا جومعە بە کەمتر لەو ژمارەیەش دائەمەزرێ؛ فەرموودەیەکیان ئەوەیە بە دوو کەس، ئیمامێك و مەئمومێك، وەکوو باقی نوێژە جەماعەتەکانی تر[١]؛ فەرمودەیەکی تریان ئـەوەیە بـە چوار کەس، ئیمام و سێ کەس[٢]؛ سێهەم، ئەوەیە بە دوازدەکەس بێجگـە لە ئـیمام[٣]. دروستە بۆ ئێمە تەقلیدی هەرکام لەم فەرموودانە بکەین و رەفتاری پێبکەینو نوێژی جومعەی پێبکەین؛ بەڵام چونکە ئەم فەرموودانە ئیختیلافن و ئەسڵی مەزهەب نین، سوننەتە بۆ دەرچوون لە خیلاف، لەپاش نوێژی جومعەکە، نوێژی نیوەڕۆ بەجەماعەت بکـەینەوە، لەبـەر ئـەوە لە هـەرلایەکـا گـێڕانـەوەی نـوێژی نـیوەڕۆ واجب بـێ، جەماعەتەکەیشی فەرزی کیفایەیە و هەرکاتێك کردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ سوننەت بێ، وەکوو لەم شوێنەدا، جەماعەتەکەیشی سوننەتە، بەڵام لەشوێنێکا کە ژمارەی جومعە تەواو بێ و نوێژەکەیان بە هەموو فەرموودەیەك دروست بێ و خیلافی تیا نەبێ، ئەوە بە

---

١. ئەمە، لە حاشیەی «جَمَل»دا لەسەر شەرحی مەنهەج نووسراوە.
٢. ئەمە، فەرموودەی ئیمامی «مُزَنی»یە کە قوتابی ئیمامی شافیعی بووە.
٣. ئەم فەرموودەیەش، لە هامیشی ئیعانەدا نەقڵ کراوە.

هیچ جۆرێ کردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ سوننەت نییە، نە بەتەنها و نە بە جەماعەت؛ هەروەها، ئەوەش تەئسیری نییە کە یەکێك بە خەیاڵی خۆی بڵێ نوێژ کەرەکان نوێژیان ڕەوان نییە و لەبەر ئەوە جومعەکەیان دانامەزرێ؛ بەڵام ئەگەر کەسێك دڵنیا بوو کەوا نوێژکەرەکان نوێژیان نارەوانە و نارەوانییەکەشیان لەبەر کەمتەرخەمی خۆیانە نەك لەبەر نەگونجانی زمانیان، ئەوە لەو حاڵەدا جومعەکەیان لە ئەساسا دانامەزرێ.

تا لە توانادا هەبێ، زۆرتر مەتڵەبە نوێژی جومعە لە یەك شوێنا بکرێ، چونکە لە زەمانی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ و لە زەمانی هەر چوار خەلیفەکەیدا و تا زەمانی خەلیفە «مەهدیی عەبباسیش»، لە شارانی ئیسلاما، هەر یەك جومعە کراوە. مەبەست لە خوتبە و نوێژی جومعە، دەرسێکی حەفتەییە بۆ هەموو موسوڵمانان کە بە ئەهمیەتتر بێ لە نوێژە جەماعەتەکانی تر کە ڕۆژی پێنج جار لە چەندلادا ئەکرێن.

## باسی نوێژی ترس

نوێژی کاتی ترس، بە شازدە جۆر لە حەدیس و ئایەت وەرئەگیرێ، بەڵام ئیمامی شافیعی -خوای لێ ڕازی بێ- چوار جۆریانی هەڵبژاردووە؛

**[جۆری] یەکەم**، ئەوەیە کە دوژمن لەلای قیبلەوە بێ؛ لەمسوورەتەدا، ئیمام خەڵکەکە بکا بە دوو ڕیز و نوێژ دابەستێ لەگەڵ هەموویان، کاتێ کە گەیشتن بە سوجدەی ڕکاتی یەکەم، ڕیزێکیان لەگەڵ ئیمام سوجدە بەرن و ڕیزەکەی تریان پاسی ئەمان بکەن، کە ئیمام و ڕیزەکەی لەگەڵیان سوجدەیان برد و ڕاست بوونەوە بۆ ڕکاتی دووهەم، ڕیزی پاسەوان سوجدە ببەن و ڕاست ببنەوە و بگەنەوە بە ئیمام و ڕکاتی دووهەم بخوێنن، کاتێ گەیشتن بە سوجدەی ڕکاتی دووهەم، ڕیزی پاسەوانی پێشوو لەگەڵ ئیماما سوجدە ببەن و ڕیزەکەی تر پاسەوانی بکەن تا ئەمان لە سوجدە سەر بەرز ئەکەنەوە، جا ئەوانیش سوجدە ببەن و لەگەڵ ئیمام و ڕیزەکەیا تەحیات بخوێنن و ئیمام سەلامی نوێژیان پێبداتەوە؛ ئەمە، وێنەی نوێژی حەزرەتی پێغەمبەرەﷺ لە غەزای «عَسْفان»دا؛ ئەگەر لەم نەوعە نوێژەدا تاقە ڕیزێکیان یا تاقمێك لە ڕیزێك پاسەوانی بکەن، ئەوەش دروستە.

جۆری دووهەم، ئەوەیە کە دوژمن لە غەیری تەرەفی قیبلەوە بێ و ئیمام خەڵکەکە بکا بە دوو بەشەوە و لەگەڵ هەر بەشێکیانا جارێك نوێژەکە بکا و لەو کاتەدا کە لەگەڵ بەشێکیانا نوێژ ئەکا، بەشەکەی‌تر پاسەوانی ئـەوان بکـا؛ ئـەمەیش، وێنـەی نـوێژی حەزرەتی پێغەمبەرەﷺ لە غەزای «بَطنُ النَّخلة»دا.

جۆری سێهەم، ئەوەیە کە دوژمن هەر لە غەیری تەرەفی قیبلەوە بێ، بەڵام ئیمام خەڵکەکە بکا بە دوو بەشەوە، لەگەڵ بەشێکیانا نوێژ دابەستێ و رکاتێك نوێژ بکا، جا ئەم بەشە نییەتی جیایی لە ئیمام بێنن‌و بۆ خۆیان نوێژەکەیان تەواو بکەن‌و بڕۆن بـۆ پاسی ئیمام و باقی خەڵکەکە، جا بەشی دووهەم بێن لەپشتی ئیمامەوە نوێژ دابەستن و ئیمام رکاتی دووهەم لەگەڵ ئەمانە بخوێنێ، کاتێ کە ئیمام دانـیشت بـۆ تـەحیات، ئەمانیش راست ببنەوە نوێژەکەیان تەواو بکـەن و ئـیمام هـەر لە نـوێژا بـمێنـێتـەوە چاوەڕوانی ئەمانە بکا تا پێی ئەگەنەوە و سەلامی نوێژەکەیان لەگەڵا ئەداتەوە؛ ئەمەیش، وێنەی نوێژی حەزرەتی پێغەمبەرەﷺ لە غەزای «ذاتُ الرِّقاع»دا. فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەم‌جۆرە نوێژە سەوابی زۆرترە لە جۆرەکەی پێشوو. ئەگەر نوێژەکە نـوێژی مەغریب بوو، ئەوە لەگەڵ بەشێکیانا دوو رکات نوێژ و لەگەڵ ئەو بەشەکەیانا رکاتێك بکا، یاخود بە پێچەوانەوە، بەڵام یەکەمیان خێری زۆرترە؛ ئەگەر نوێژی چوار رکاتییان کرد، لەگەڵ هەر بەشێکیانا دوو رکات بکات، یا بیان‌کا بە چوار بەشەوە و لەگەڵ هەر بەشێکیانا رکاتێك بکات، ئەوسا هەر بەشێك لە عاستی خۆیا هەڵسێتەوە نییەتی جیایی بهێنێ و نوێژەکەی خۆی بەتەنها تەواو بکات تا بەشی دوایی، ئەوان کە هەستانەوە بۆ تەواوکردنی نوێژەکەیان، ئیمام لە تەحیاتی ئاخرا چاوەڕوانیان بێ تا پێی ئەگەنەوە، ئەوجا سەلامیان لەگەڵا بداتەوە.

لەکاتێکا کە ئیمام خەڵکەکە بکا بە دوو بەشەوە، هەر سەهوێ لە رکاتی یەکەمی هەر بەشێکیانا پەیدا ببێ، ئیمام بۆیان هەڵ ئەگرێ؛ هەروەها، سەهوی رکاتی دووهـەمی بەشی دووهەمیش، لەبەر ئەوە کە لەئاخرا لەگەڵ ئیمام سەلام ئەدەنەوە؛ بەڵام سەهوی رکاتی دووهەمی بەشی یەکەم، ئیمام هەڵی ناگرێ چونکە لێی جیا بوونەتەوە. ئیمامیش هەر سەهوێکی بەسەرا بێت لە رکاتی یەکەمدا، کار ئەکاتە سەر هەردوو بەشەکە، چونکە

لەو کاتەدا یا وانلەگەڵیا، یاخود لە رکاتی دووهەما ئەکەونە تەکی؛ بەڵام سەهوێ کە لە رکاتی دووهەما بەسەریا بێ، ئەوە هەر بەسەر بەشی دووهەما دێت و ناگەڕێتەوە بۆ بەشی یەکەم. لە هەموو ئەم سێ جۆرەدا، چەك هەڵگرتن بۆ نوێژەکەرەکان سوننەتە و بە فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعی واجبە.

**جۆری چوارەم،** ئەوەیە شەڕ گەرم بێ و ترس زۆر بێ و دۆست و دوژمن بڕژێنە ناو یەکەوە؛ لەم حاڵەدا، بە هەر جۆرێك بۆیان رێكبکەوێ، نوێژ بکەن دروستە؛ بە سواری بێ یا بە پیادە، با روویشیان لە قیبلە نەبێ، چونکە عوزریان هەیە؛ هەروەها، بۆشیان دروستە بێن و بچن و رابکەن و باز بەرن لەناو نوێژدا، بەڵام نابێ لەخۆڕایی دەس بکەن بە هاوار کردنو نابێ قسەی زیادە بکەن؛ کە چەکی دەستیشیان خوێناوی بوو، ئەبێ فڕێی بدەن و چەکێکی خاوێن هەڵبگرن. ئەو نوێژەی بەو جۆرە ئەیکەن، قەزا کردنەوەی ناوێ.

ئەگەر نەیانتوانی روکووع و سوجدە ببەن، ئەوە بۆ روکووع کەمێك لار ببنەوە و بۆ سوجدە کەمێك زیاتر؛ ئەم جۆرە نوێژە، دروستە لەکاتی هەموو شۆڕش و هەرا و هەڵاتن و لێقەومانێکا کە بەهۆی کردەوەی گوناهەوە پەیدا نەبووبێ؛ هەروەها لەکاتی راکردنا لەبەر ئاگر و لافاو و دڕندە و زۆرداری ستەمکار و خاوەن قەرز ئەگەر قەرزارە کە لات بێ و بترسێ ئەگەر بیگرن بیخەنە بەندیخانەوە. ئەگەر لەدوورەوە تاپۆیەك دەرکەوت و وایان زانی دوژمنە و نوێژی ترسیان کرد، کەچی بۆیان دەرکەوت دوژمن نەبووە، واجبە قەزای ئەو نوێژە بکەنەوە.

## باسی نوێژ نەکەر

ئەگەر کەسێك نوێژی نەئەکرد چونکە باوەڕی بەوە نەبوو کە نوێژ واجبە، ئەوە بە کافر ئەناسرێ و بەم بێباوەڕییەی، حوکمی «مُرْتَد» لە دین هەڵگەڕاوی هەیە. پێویستە ئیمام داوای تۆبە و پەشیمانی لەم شەخسە بکا؛ جا ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەسەر دەرخستنی بێباوەڕییەکەی، حوکمی کوشتنی ئەدا؛ ئەگەر لەبەر تەمەڵیش تەرکی

نوێژی ئەکرد، ئەوە لێی رائەوەستین تا لە وەختی ناچاری لائەدا کە وەختی نوێژی عەسرە بە نیسبەت نوێژی نیوەڕۆوە و وەختی نوێژی عیشایە بە نیسبەت نوێژی مەغریبەوە؛ ئەگەر هەر نەیکرد، ئەوکاتە ئیمام داوای پەشیمان بوونەوەی لێ ئەکا؛ جا ئەگەر گوێی نەدایە، واجبە ئیمام بدا لە گەردنی، بەڵام ئەم کوشتنەی، بە «حَدّ»ی شەرعی دائەنرێ نەك لەبەر کافر بوونی، چونکە مادام باوەڕی وا بووە کە نوێژ واجبە، بە نەکردنەکەی کافر نابێ [و] لەبەر ئەوە، پاش کوشتنەکەی، ئەشۆررێ و نوێژی لەسەر ئەکرێ و لە گۆڕستانی موسوڵمانانا ئەنێژرێ و نیشانەی قەبرەکەشی کوێر ناکرێتەوە.

## باسی نوێژی سوننەت

زانایانی ئایین، فەرموویانە: گەورەترین شتێ لە دڵا بێ، ئیمان و باوەڕە بە خوا و پێغەمبەران و مەلائیکە و ئەو کتێبانەی کە خوا بەهۆی جیبرەئیلەوە بۆ پێغەمبەرانی ناردوون و بە رۆژی قیامەت و بە قەزا و قەدەر، گەورەترین کردەوەیەکیش کە بە لەش بکرێ «شَهادَتێن»ە، ئەنجا نوێژە، نوێژی فەرزی عەین لە هەموو فەرزێکی تر گەورەترە؛ نوێژی سوننەتیش لە هەموو سوننەتێکی تر گەورەترە؛ ئەمجار رۆژوو، جا حەج و زەکات. مەبەست لەمباسە، ئەمەیە کە ئینسان زۆر خەریك بێ بە یەکێ لەمانەوە و باقی ئادابەکانی ئیسلامیش بەجێبێنێ؛ ئەگینا، گومان لەوەدا نییە کە رۆژووی رۆژێك گەورەترە لە دوو رکات نوێژ. لەناو فەرزی کیفایەشدا، گەورەترین شت خوێندنە؛ فەرزی، لە باقی فەرزەکان و سوننەتی لە باقی سوننەتەکان گەورەترە[1]؛ بەڵام لەسەر فەرموودەی «ئیمامی غەزالی» و گەلێ لە زانایان، لەپاش ئیمان هێنان و وتنی «شَهادَتێن»، هەرچەند هەموو فەرزێکی عەین یا کیفایە واجبە بکرێ، بەڵام فەزڵ و گەورەیی کردەوە، بە گوێرەی مەسڵەحەتێکە لەو کردەوەوە پەیدا ببێ؛ بەمیسال، ئینسانێکی رژد درەمێ بدا بە داماوێ ئەوە خێری زۆرترە لەوە کە رۆژێك بە رۆژوو بێ و شەوێك نوێژ بکا.

١. توحفە، بەرگی دووهەم، لاپەڕەی ٢٢٠.

نوێژی سوننەت، دوو جۆرە؛ جۆرێکیان، جەماعەت سوننەت نییە تیایا و جۆرێکیان جەماعەتی تیا سوننەتە. لە جۆری یەکەمە، «رَواتِب»، واتە سوننەتە دامەزراوەکانی بەرودوای نوێژەکان؛ ئەوەی کە «مُؤَكَّدة»یە و خێری زۆرترە لەناو «رواتب»ە کانا، دوو رکاتە لەپێش نوێژی بەیانی و دوو رکات لەپێش نیوەڕۆ و دوو رکات لەپاش نیوەڕۆ و دوو رکات لەپاش مەغریب و دوو رکات لەپاش عیشا؛ ئەوەشی کە «غیَره مؤکّدة»یە، دوو رکاتیترە لەپێش نیوەڕۆدا و دوو رکات لەپاشیەوە و چوار رکات لەپێش عەسردا و دوو رکات لەپێش مەغریبدا و دوو رکات لەپێش عیشادا؛ نوێژی جومعەیش وەك نیوەڕۆ وایە لەم رووەوە.

سوننەتە ئینسان لەپاش سوننەتی پێش بەیانی، لەسەر شانی راست راکشێ روو بە قیبلە [و] دەستی راستی بخاتە ژێر سەری بۆ بەین خستنی ئەو نوێژە و نوێژی بەیانییەکەی و بۆ بیرکردنەوە لە وەزعی قەبر و مردن. سوننەتە سوننەتی پێش بەیانی و مەغریب و عیشا کورت بن. لە رکاتی یەکەمی سوننەتی پێش بەیانیدا، سوورەتی «الکٰافِرون» و لە رکاتی دووهەمیا، سوورەتی «الإخلاص» بخوێنێ، هەروەها ئەم دوو سوورەتە سوننەتن لە هەر نوێژێکی سوننەتا کە خوێندنی سوورەتی تایبەتی بۆ دانەنرابێ؛ هەر وەها، سوننەتە خوێندنی سوورەتی «الأنشراح» لە رکاتی یەکەم و سوورەتی «الفیل» لە رکاتی دووهەمی سوننەتی بەیانیدا.

وەختی سوننەتە «قَبلیّة»: پێشینەکان، دەس پێ ئەکات بە هاتنی وەختی نوێژە فەرزەکان، وەختی «بَعدیَّة»: پاشینەکانیش، دادێت بە لێبوونەوە لە نوێژە فەرزەکە؛ ئەمانە ئەگەر فەوتان، بەقەزا گێڕانەوەیان سوننەتە؛ هەروا هەر سوننەتێ کە خاوەن وەخت بێ ئەگەر فەوتا، سوننەتە قەزا بکرێتەوە. فەوتانی ئەم «رَواتب»انە، بە نەمانی وەختی فەرزەکانە.

لای کەمی نوێژی سوننەتی «وَتر»، رکاتێك و لای ژوورووی یازدە رکاتە، لای خواری کەماڵیشی، سێ رکاتە. سوننەتە بۆ هەرکەسێ کە لە رکاتێ زیاتر بکا، لە ئاخری هەموو دوو رکاتێکا، تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە، لە تاقە رکاتە دواییەکەشیا،

تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە؛ ئەم وەزعە، پێی ئەڵێن «فەسڵ» و خێری زۆرترە لە «وەسڵ» کە لە دوو رکاتەکانا سەلام نەداتەوە هەتا رکاتی ئاخریشیان لەگەڵا ئەخوێنێ، ئەوجار سەلام بداتەوە؛ دروستە لەم کاتی وەسڵەدا، لە ئاخری دوو رکـاتی دوایـیدا، یەکی تەحیاتێك بخوێنێ و یا هەر لە ئاخری یەك رکاتەکەدا، تەحیات بخوێنی و سەلام بداتەوە بۆ ئەوە کە شێوەی نەچێتە سەر شێوەی نوێژی مەغریب. سوننەتە لە سێ رکاتی ئاخری وەترا، لە یەکەمیانا، سوورەتی «الأَعلى» و لە دووهەمیانا، سوورەتی «الکافِرون» و لە سێهەمیانا، سوورەتی «الاخلاص» و «الفَـلَق» و «النّـاس» بـخوێنـێ [و] لەپـاش نوێژەکەش، سێ جار بڵێ: «سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوس»، ئەمجار بڵێت: «اَللَّهُمَّ إِنّي أعُوذُ بِرِضاكَ مِن سَخَطِكَ، وَ بِمُعافاتِكَ مِن عُقُوبَتِكَ، و بِكَ منكَ، لاٰ أُحصي ثَناءً عليكَ أنتَ كَما أَثْنَيْتَ عَلى نفسِكَ، فَلَكَ الْحَمْدُ حَتَّى تَرْضىٰ، وَ لَكَ الشُّكْرُ إذا رَضِيتَ».

وەختی سوننەتی وەتر، وا لەبەینی نوێژی عیشا و تلووعی فەجرا. سوننەتە بۆ یەکێ لای وابێ شەو خەبەری ئەبێتەوە و بیەوێ شەونوێژ بکا، ئەو نوێژی وەترە بخاتە پاش شەونوێژەوە؛ ئەگەر هات و نوێژی وەتری لە پێشاکرد، جا شەونوێژی کرد، نابێ نوێژی وەتر دووبارە بکاتەوە چونکە دوو وەتر لە تـاقەشەوێکـا دروست نـییە. جـەماعەت سوننەتە لە وەتری رەمەزانا، خواه بکەوێتە پـاش جـەماعەتی تـەراویـحەوە یـا نـە. خوێندنی قونووت سوننەتە لە ئیعتیدالی رکاتی ئاخری وەترا لە نیوەی دوایی مانگی رەمەزانا و لەدوای قونووتەکەیش سوننەتە دوعای «اللَّهُمَّ إنَّا نَسْتَعِينُكَ» تا ئاخری بخوێنێ، خوا بە تەنیا بێ یا لەگەڵ جەماعەتا بێ.

لەبەشی یەکەمە، دو رکات سوننەتی «إِشْراق»: هەتاو کەوتن، کە وەختەکەی، لەپاش بەرزەوەبوونی رۆژە ئەوەندەی رمێ؛ راستتر ئـەوەیە ئـەم نـوێژە غـەیری سـوننەتی چێشتەنگایە. هەروا، سوننەتی «ضُحىٰ»: چێشتەنگا؛ وەختی ئەم نوێژە، پاش ئیشراقە تا «اِسْتِواء»، واتە گەیشتنی خۆر بە ناوەراستی ئاسمان و باش وایە لە چواریەکـی رۆژا بکرێ؛ لای کەمی، دوو رکاتە و لای ژووری هەشت رکاتە؛ لە رکاتی یەکەما، سوورەتی «الشَّمس» و لە دووهەما، سوورەتی «الضُّحى» بخوێنێ؛ ئەگەر لە دوو رکات زیـادی

کرد، لە هەموو دوو رکاتێکا، سوورەتی «الکٰافِرون» و «الاخلاص» بخوێنێ. هەروەها، لەم‌بەشەیە، سوننەتی «بعد الزَّوال» کە بریتییە لە چوار رکات و دوو دوو ئەکرێن بەر لە «رَواتب»ی نیوەڕۆ. هەر لەم بەشەیە، سوننەتی «أوّابین» لە بەینی نوێژی مەغریب و عیشادا؛ لای خوارووی ئەم سوننەتە، دوو رکات‌و لای کەمی کەماڵی، چوار رکات [و] میانەی، شەش رکات و لای ژووررووەکەی، بیست رکاتە. هەروا، سوننەتی «صلاةُ التّسبیح» کە بریتییە لە چوار رکات و وەختی تایبەتی نییە و لە شەو و لە رۆژا ئەکرێ، جا یا لە شەو و رۆژێکا جارێ، یا حەفتەی جارێ، یا مانگی جارێ، یا لە ساڵێکا جارێ، یا لە عومرا جارێ؛ ئەگەر لەشەوا بکرێ، دوو رکات دوو رکات سەلام ئەدرێتەوە وە ئەگەر لە رۆژا بکرێ، بەسەر یەکەوە ئەکرێ وەکوو نوێژی نیوەڕۆ؛ لە هەموو رکاتێکا حەفتا و پێنج جار ئەوترێ: «سُبْحٰانَ اللّهِ وَ الْحَمْدُ للّهِ وَ لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ اللّهُ وَ اللّهُ أَكْبَر»؛ بۆ خوێندنی ئەمانە، دوو شێوە هەیە؛ یەکەم، ئەوەیە لەپاش خوێندنی فاتیحە پازدە جار و لە رکووعا دە جارو لە ئیعتیدالا دە جار و لە هەر سوجدەیەکا دە جار و لە دانیشتنی بەینیانا دە جار و لە دانیشتنی ئیستیراحەتی پاش سوجدەکانا ـ ئەگەر کاتی هەستانەوە بێ ـ یا لەپێش تەحیاتا ـ ئەگەر کاتی تەحیات بێ ـ دە جار؛ شێوەی دووهەمیش، ئەوەیە ئەو پازدە جاری پاش فاتیحەیە لەپێش فاتیحەدا بخوێنرێ و دە جارەکەی دانیشتنی پاش سوجدەکانیش، لەپاش فاتیحەو باقییەکانیش، لە شوێنی خۆیانا بخوێنرێن؛ ئەگەر کەسێك لەم نوێژەدا، هەموو تەسبیحاتەکەی تەرك کرد، نوێژەکەی ئەبێ بە سوننەتی رووت و لەم نوێژە دەرئەچێ، بەڵام ئەگەر هەندێکیانی تەرك کرد، ئەوە هەر «صلاةُ التّسبیح»ە، ئەوەندە هەیە خێری کەمترە لەوەکە هەمووی بخوێنێ؛ لە رکاتی یەکەمی ئەم نوێژەدا، سوننەتە سوورەتی «الْكٰافِرون» و لە رکاتی دووهەمیا، سوورەتی «الإخلاص» بخوێنێ.

هەر لەبەشی یەکەمە، نوێژی «تَهَجُّد»: شەونوێژ لەپاش نووستن و بێدار بوونەوە. لای کەمی ئەم نوێژە، دوو رکاتە و لای ژووررووی ئەندازەیەکی دیاری نییە، بەڵام کەراهەتی هەیە «قیام»ی هەموو شەو و بە تایبەتی، قیامی شەوی جومعە؛ هەروەکوو

کەراهەتی هەیە تەرکی تەهەججود بۆ کەسێك کە عادەتی پێوە گرتبێ. سوننەتە بۆ ئەو کەسەی شەو نوێژ ئەکات، بە رۆژا چاشتەخەو بکات و لە ئەووەڵی شەویشەوە ماوەیەك بنوێ تا بتوانێ بە ئیستیراحەت هەڵسێتەوە و نوێژەکەی بکا. ئەگەر کەسێك رێبوار بوو و نەیئەتوانی شەو هەڵسێتەوە بۆ نوێژی تەهەججود، ئەتوانێ پاش نوێژی عیشا و «راتِبة» و وەتر، دوو رکاتی تر بکا لەجیاتی شەونوێژ. سوننەتە کە بە شەو خەبەری بووەوە، دەست بە رووبا بێنێ و رووبکاتە ئاسمان و ئایەتی ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمواٰتِ وَ الْأَرْضِ وَ اخْتِلاٰفِ اللَّيْلِ وَ النَّهارِ لَآياتٍ لِأُولِي الْأَلْبابِ﴾ بخوێنێ و شەونوێژەکەی بە دوو رکات نوێژ دەس پێ بکا و دوعا و ئیستیغفار بکا و لە خوا بپاڕێتەوە.

هەروا لە بەشی یەکەمە «تَحِيَّةُ الْمسجد»، واتە نوێژی دیاریی مزگەوت، یەعنی هەر کاتێ کە ئینسان رۆیشتە مزگەوتەوە، دانەنیشێ تا دوو رکات نوێژ ئەکا؛ ئەم نوێژە، تەکرار ئەبێتەوە بە تەکرار بوونەوەی چوونە مزگەوت و بە هەر نوێژێکی تریش پێك دێ، فەرز بێ یا سوننەت، حازر بێ یا قەزا؛ بەم مەعنا، «تحيّة المسجد»، دێتەجێ، بەڵام بە بێ نییەتی تایبەتی، ئەو خێرەی نییە. ئەم نوێژە ئەفەوتێ بە دانیشتن لە مزگەوتا، بەو شەرتە کە بزانێ و نیازی نەکردنی ئەو نوێژەی هەبێ، هەروا بە نەزانین و لەبیرچوونەوە، ئەگەر زۆری پێ بچێ، بەڵام نافەوتێ بە راوەستان لە مزگەوتا، هەرچەند ماوەکەیشی زۆر بێ. سوننەتە بۆ یەکێ کە ئەم نوێژە نەکا، کە رۆیشتە مزگەوتەوە، بڵێ: «سُبحانَ اللّٰهِ وَ الْحَمْدُ لِلّٰهِ وَ لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَ اللّٰهُ أَكْبَرُ، وَ لاٰ حَوْلَ وَ لاٰ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ».

هەروا، لە بەشی یەکەمە سوننەتی دەس نوێژ؛ بەم مەعنا هەر کاتێ کەسێك دەسنوێژی گرت، بەدوای ئەو دەسنوێژەدا دوو رکات نوێژ بکات. هەر لەم بەشەیە، سوننەتی ئیحرام، بەم جۆرە لەپێش ئەوەدا کە نییەتی ئیحرام و چوونە ناو حەج یا عەمرە بهێنێ، دوو رکات نوێژ بکا. هەروا سوننەتی تەواف، یەعنی بەر لە دەس کردن بە گەڕان بەدەوری ماڵی کەعبەی پیرۆزدا، دوو رکات نوێژی سوننەت بکاو [لەوانەیە:] سوننەتی «صَلاٰةُ الْحٰاجة»، واتە هەرکاتێ کە ئینسان پێویستییەکی بوو، دوو رکات نوێژ بکات و لەخوا بپاڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئەو ئیشەی بۆ جێ بەجێ ببێ. «صلاٰةُ

الإِستِخارة»یش کە واتە هەرکاتێ ئیشێکی لەپێشا بوو و نەیئەزانی چاکە یا خراپە، دوو رکات نوێژی ئیستیخارە بکاو لە ئاخری نوێژەکەدا، لە خوا بپارێتەوە بۆ ئەوەی لەبابەت ئەو ئیشەوە دڵی رۆشن ببێتەوە. جا ئەگەر بەجارێ هیچی دەس‌نەکەوت، دووبارەی بکاتەوە تا شتێکی بۆ رۆشن ئەبێتەوە.

هەروەها لەم‌بەشەیە «صلاةُ السَّفر»، یەعنی کاتێك کە ویستی بچێ بۆ سەفەر، دوو رکات نوێژ سوننەتە بۆی، لە رکاتی یەکەما، سوورەتی «الکٰافِرون» و لە رکاتی دووهەما سوورەتی «الاخلاص» بخوێنێ. هەروا «صَلاةُ القُـدوم»، واتـە سـوننەتی هـاتنەوە لە سەفەر، بەم رەنگە کە لە سەفەر گەڕایەوە، لەپێش ئەوەدا کە بڕواتە مـاڵەوە، بـچێ بـۆ مزگەوت دوو رکات نوێژی سوننەتی هاتنەوە بکات. هەروا، سوننەتی بانگ، یەعنی کە بانگدەر بانگی‌دا، پاش جواب‌دانەوەی بانگەکەی، دوو رکات نوێژ بکا بەر لە کردنی «رَواتب». سوننەتی «زَفاف»یش، یەعنی لەپاش عەقدی نیکاح و بەرلەوەی بچێتە لای بووك دوو رکات نوێژ بکا. «صَلاةُ المُسافِر»یش، بەم رەنگە ئینسان کە گـەیشتە هـەر مەنزڵێك، دوو رکات نوێژ بکات. سوننەتی «تَوبة»یش، یەعنی هەر کاتێ کە ویسـتی تەوبە بکا لە گوناهێ، لەپێش تەوبەکەدا، دوو رکات نوێژ بکا. سوننەتی دەرچوون لە حەمامیش، بەم رەنگە کە لە حەمام هاتە دەرەوە، ئەگەر شوێنەکە بۆ ئەوە دەس‌بدا نوێژی تیا بکرێ، دوو رکات نوێژ بکا.

هەرلە بەشی یەکەمە، سوننەتی «مُطْلَق» یەعنی نوێژێ کە نەبەسرابێ بە وەختێك و سەبەبێکی تایبەتییەوە؛ نوێژی‌وا، ژمارە و ئەندازەی نییە؛ حەزرەتﷺ، فەرموویەتی: «نوێژ، خێرێکە دانراوە بۆ موسوڵمان، زۆری لێ‌بکا یا کەم»؛ کەوابوو، نوێژی سوننەتی موتڵەق، هەمیشە دروستە هەرچەند نییەتی ژمارەیەکی لێ‌نەهێنێ، یاخود تەنها رکاتێك بکا و تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە، ئەمە کەراهەتی نییە. ئەگەر نییەتی هێنا بـۆ زیاتر لە رکاتێ، ئەوە سوننەتە لە هەموو دوو رکاتێکا تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە. ئەگەر نییەتی هێنا بۆ ژمارەیەکی تایبەتی، ئەتوانێ هەر لە نوێژەکەدا لەو ژمارەیە زیاد بکا، بەو شەرتە پێش ئەوە کە بگا بە وەختی زیادەکە، نیازی کردنی ئەو زیادەیە بکا.

هەروەها ئەتوانێ لەو ژمارەیشە کەم بکاتەوە، بەو شەرتە لەپێش ئەوەداکە بگاتە ئەوەی ئەیەوێ لای ببا، نیازی لابردنی بکا. ئەگەر نییەتی دوو رکاتی هێنا کەچی لەپاش ئەو دوو رکاتە هەستایەوە بۆ رکاتێکی‌تر، ئەمە ئەگەر بەزانست و دەستی قەسد بوو، نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە وە ئەگەر نەیئەزانی یا بە سەهو هەڵسایەوە، پێویستە دەس بەجێ بگەڕێتەوە بۆ دانیشتنە پێشووەکەی، جا ئەگەر مەیلی لە زیادە بوو، نییەتی زیادە بهێنێ و هەستێ بیکا، ئەگینا سەلام بداتەوە.

سوننەتی «مُطْلَق»، بەشەوا خێری زۆرترە لە رۆژ؛ بۆ سوننەتی شەویش ئەگەر شەوی کرد بە سێ بەشەوە، بەشی ناوەڕاستیان خێری زۆرترە وە ئەگەر کردی بە دوو بەشەوە، ئاخریان خێری زۆرترە لە بەشی یەکەم.

**بێداربن!** ئەو بەشە سوننەتەکە جەماعەتی تیا سوننەت نییە، ئەگەر بە جەماعەتیش بکرێ کەراهەتی نییە، چونکە کەراهەت پێویستی بە مەنع و رێ‌لێ‌گرتنی تایبەتییە و ئەمەش نییە؛ هەرچەند ئەگەر بەتەنها بکرێ، خێری زۆرترە، بەڵام «شێخ سولەیمانی کوردی»، لە «فَتاوێ» کەیا، نەقڵ ئەکا لە «ئیمامی نەوەوییەوە» کەوا: ئەگەر ترسمان هەبوو لەوە کە خەڵك ئەو جەماعەتە بکەن بە عادەت و بە شتێکی مەشرووعی بزانن، ئەوە دروستە بەڵکوو پێویستە کاربەدەستی وەخت، مەنعی ئەو جەماعەتەیان لێ‌بکا، چونکە فەسادی دینی لێوە پەیدا ئەبێ و پێویستە موسوڵمانان لەسەر شاڕێگەی سوننەتی پێغەمبەرﷺ بڕۆن بە رێدا.

ئەو بەشە نوێژی سوننەتانە کە سوننەتە بە جەماعەت بکرێن، بریتین لە نوێژی تەراویح و هەردوو جەژن و نوێژی مانگ و رۆژگیران و نوێژە بارانە و نوێژی وەتری پاش تەراویحی مانگی رەمەزان.

## نوێژی تەراویح

ئەم نوێژە، لە مانگی رەمەزانی، ساڵی دووی هیجرەتدا دامەزراوە؛ حەزرەتﷺ، لە شەوی بیست‌و سێ و بیست‌و پێنج و بیست و حەوتی ئەم مانگەدا، هەشت رکات

تەراویحی بە دوو رکات دوو رکات لەگەڵ ئەسحابەکانا کردووە. هەرچەند حەزرەت ئەم چەند رکاتەی بە شێوەی ئیمامەت نەئەکرد، بەڵام ئەسحابەکان ئیقتیدایان پێ ئەکرد و ئەویش رێی لێ نەئەگرتن، لەمەوە جەماعەت لە تەراویحا بووە بە سوننەت. حەزرەت بێجگە لەم سێ شەوە تەشریفی نەئەهات بۆ مزگەوت بۆ ئەم نوێژە. کە پرسیاریان لێ کرد لە سەبەبی نەهاتنی، فەرمووی: «ترسام فەرز بکرێ لەسەرتان»؛ «مَعَ الْعِلم»، لە ریوایەتێکا هەیە کە حەزرەت لە ماڵی خۆیا بیست رکات نوێژی تەراویحی تەواو کردووە، ئیتر لەسەر ئەم وەزعە، حەزرەتﷺ و ئەسحابەکانی لە زەمانی خۆیا و ئەسحابەکان لە زەمانی «حەزرەتی ئەبووبەکر» و تاساڵێکیش لە خەلافەتی «حەزرەتی عومەر»، هەشت رکات تەراویحی ئەو سێ شەوەیان لە مزگەوت و باقییەکەیان لە ماڵەوە ئەکرد، ئەنجا حەزرەتی عومەر، لە ساڵی دووهەمی خەلافەتی خۆیا، فەرمووی: تازە ئێمە ترسی واجب بوونی نوێژی تەراویحمان نییە، کەواتە، با هەمووی بە جەماعەت بکەین لە مزگەوتا، وەك ئەو چەند شەوەی زەمانی حەزرەت، ئەوە باشترە چونکە موسوڵمانان بەمجۆرە ئەم عیبادەتەیان جوانتر بۆ ئەکرێ و ئارەزووی زیندوو کردنەوەی شەوانی رەمەزانیان زیادتر ئەبێ؛ لەبەر ئەوە، فەرمانیدا بە «ئوبەیی» کوڕی کەعب ـکە قورئان خوێنێکی باش بوو ـ ببێ بە پێشنوێژ بۆ پیاوان و فەرمانیدا «سولەیمان» کوڕی «حثمة» ببێ بە پێشنوێژ بۆ ژنان، بەمجۆرە نوێژی تەراویح هەمووی کرا بە جەماعەت لە «مەدینەی مونەووەرە»دا و لە شارانی تری ئیسلامیشا دەنگی دایەوە و هەموو ئەسحابەکان قایل بوون بەوەکە تەراویح بە جەماعەت بکرێ و بوو بە ئیجماع، هەتاوەکوو «حەزرەتی عوسمان»، دوعای خێری کرد بۆ «حەزرەتی عومەر» و فەرمووی: خوا دڵی نوورانی بکا وەك مزگەوتەکانمانی بەم نوێژە نوورانی کرد؛ کەواتە، ئەسڵی نوێژی تەراویح و جەماعەت کردن لە هەشت رکاتیا، سوننەتی پێغەمبەرە و لەو دوازدە رکاتەکەیا، ئیجماعی بێدەنگی ئەسحابە و باقی موسوڵمانانی لەسەر دامەزراوە[1].

---

١. ئەمە، لە «فتحُ الباري» شەرحی «بُخاري» و لە «توحفة» و «شیروانی» و «حاشیەی جەمەل»دا نووسراوە.

وەختی نوێژی تەراویح، دەس پێ ئەکا لەپاش کردنی نوێژی عیشاوە تا بەرەبەیان. واجبە لەسەر ئەو کەسەی ئەم نوێژە ئەکا، نییەتی دوو رکات سونەتی تەراویح یا «قیام»ی رەمەزان بهێنێ و ئەبێ پاش هەر دوو رکاتێك، تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە؛ ئەگەر چوار رکاتی خستەیەك و سەلامی دایەوە، نوێژەکەی دانامەزرێ؛ ئەگەر کەسێکیش تەنها هەشت رکات یا چوار رکات یا دوو رکات تەراویح بکا، ئەوە لەسەر زاهیری «ابنُ حجر» و فەرموودەی زانا گەورەکانی پاش ئەو، ئەسڵی سونەتی تەراویحی بۆ دێتەدی، بەڵام ئاشکرایە خێری بیست رکاتەکەی دەس ناکەوێ.

## باسی نوێژی جەژنەکان

ئەم نوێژانە، سونەتن و جەماعەتیشیان تیا سونەتە؛ هەروەها، سونەتن بۆ تەنیا و بۆ رێبوار و ژن. وەختی ئەم نوێژانە، لەبەینی خۆر کەوتن و لادانیایەتی لە ناوەڕاستی ئاسمان، بەڵام سونەتە نەکرێن تا خۆر ئەوەندەی رمێك بەرز ئەبێتەوە؛ نوێژی جەژن، دوو رکاتە؛ نوێژکەر ئەبێ نییەتی سونەتی جەژنی رەمەزان یا قوربان بێنێ و «اللّٰه أکبر» بکا، جا دوعای ئیفتیتاح بخوێنێ و لەپاش ئیفتیتاح، لە رکاتی یەکەما، حەوت «اللّٰه أکبر» بکا[1] و لەبەینی تەکبیرەکانا، ئەوەندەی ماوەی خوێندنی ئایەتێکی مامناوەندی «مُعتدِل» راوەستێ «تَهلیل» و «تمجید» و «تکبیر» بکا، جوان وایە بڵێ: «سُبحانَ اللّٰهِ وَ الْحَمْدُ لِلّٰهِ وَ لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَ اللّٰهُ أَکْبَر» ئەنجا «أَعُوذُ بِاللّٰه» تا دوایی بخوێنێ و فاتیحە بخوێنێ؛ لە رکاتی دووهەمیشا، پاش «اللّٰه أکبر»ی هەڵسانەوە، پێنج جار «اللّٰه أکبر» بکا و ویردە پێشووەکە بخوێنێ و لە هەموو ئەم «تکبیر»انەدا، دەس بکاتەوە و زیکری پێشوو بەپانەمەکی بخوێنێ. ئەم «تکبیر»انە، فەرز نین، هەروا لە «أَبعاض»یش نین. ئەگەر یەکێك تەرکی کردن و دەستی کرد بە خوێندنی سوورەتی فاتیحە، نابێ بگەڕێتەوە سەریان و سوجدەی سەهویشی ناوێ. لەپاش فاتیحە، لە رکاتی یەکەما، سوورەتی «ق» یا «سَبِّح اسمَ» و لە رکاتی دووهەما، «اِقْتَرَبت» یا «هَلْ أَتٰاكَ» بە ئاشکرا بخوێنێ. سونەتە

---

١. هەر مەئمومێك قەزای لەسەر بێ، قەزای دوو رکات نوێژی بەیانی بکاتەوە و نە «اللّٰه أکبر»ەکان و نە زیکرەکان بخوێنێ و نە دەستیش بەرز بکاتەوە.

لەپاش نوێژەکە، دوو خوتبە بخوێنرێتەوە وەك خوتبەی جـومعە، بـەڵام خـەتیب، لە جەژنی رەمەزانا ئادابی زەکاتی فیتر و لە جەژنی قـوربانا ئـادابـی قـوربانی کـردنو گەورەیی قوربانیدان باس بکا بۆ گوێگرتووەکان؛ سوننەتە لە سـەرەتای خـوتبەی یەکەمدا نۆ جار و لە سەرەتای خوتبەی دووهەما حەوت جار «اللّٰه أکبر» بکا، یـەك لەدوای یەك.

سوننەتە خۆشۆردن بۆ ئەم جەژنانە، وەختەکـەشی لە نـیوەشەوەوەیە؛ هـەروەها، سوننەتە خۆ بۆن خۆش کردن و خۆ جوانکردن لەم جەژنانەدا وەك بۆ نوێژی جومعە. سوننەتیشە ئەم نوێژانە لە مزگەوتا بکرێن. سوننەتە ئیحیاکردنەوەی شەوەکـانیان بـە عیبادەت و تاعەت. لە جەژنی رەمەزانا، سوننەتە بنیادەم بەر لە نوێژ شتێ بخوا، بەڵام لە جەژنی قوربانا هیچ نەخوا تا لە نوێژ ئەبێتەوە. سوننەتە هەموو کەسێ بەیانی زوو بڕوا بۆ مزگەوت، ئیمام نەبێ، ئەو ئەبێ لەکاتی نوێژا بڕواتە مزگەوت. سوننەتە نوێژکـەر بـە ئەدەب و ئارام بڕوا بەڕێدا. بۆ ئیمام نەبێ نوێژی سوننەت کەراهەتی نییە لەپێش نوێژی جەژندا.

## باسی هەندێ لە ئادابی جەژن

سوننەتە «اللّٰه أکبر» کردن لە خۆرئاوابوونی رۆژی پێش هەردوو جەژنەوە، لە مەنزڵ و رێگەوبان و مـزگەوت و نـاوبازارا، بـە دەنگـی بـەرز؛ لە جـەژنی رەمـەزانـا، ئـەم سوننەتیەتی «اللّٰه أکبر» کردنە، دوایی دێ بەوە کە ئیمام نوێژی جەژن دابەستێ، «اللّٰه أکبر»ی شەوی جەژنی رەمەزان، «مُطْلَق»ە، چونکە نەبەسراوە بە تەنها وەختی پـاش نوێژەوە. فەرموودەی راستتر، ئەوەیە لەپاش نوێژی مەغریب و عیشای شەوی جەژن و بەیانی رۆژی جەژندا، «اللّٰه أکبر» سوننەت نییە، بەڵام ئیمامی نەوەوی لە «الاذکار»دا ئەوەی بەڕاستتر زانیوە کە لەپاش ئەم نوێژانەش سوننەتە.

«اللّٰه أکبر»کردن لە جەژنی قوربانا سوننەتە، لە بەیانی رۆژی عەرەفەوە، لەپـاش هەموو نوێژێکی فەرز و سوننەتدا، حازر بێ یا قەرز، تا عەسری دوارۆژی «أیّامُ التّشریق»

کە رۆژی سێهەمی پاش جەژنی قوربانە. ئەم «اللّه أکبر»انە، ناو ئەبرێن بە تەکبیری «مقیَّد»، لەبەر ئەوە کە بەسراون بە دوای نوێژەکانەوە؛ راستتر ئەوەیە ئەم تەکبیرە موقەییەدانە لە تەکبیری موتڵەق گەورەترن، بەڵام تەکبیری موتڵەقی شەوی جەژنی رەمەزان لە تەکبیری موتڵەقی شەوی جەژنی قوربان گەورەترە.

ئەم‌وەزعەی کە وتمان، بۆ غەیری حاجییەکانە، چونکە حاجی نابێ لە شەوی جەژنی قوربانا «اللّه أکبر» بکا، بەڵکوو ئەبێ خەریك بێ بە وتنی «لبّیك، لبّیك»ەوە؛ سوننەت نییە بۆ حاجی لە بەیانی عەرەفەوە دەس‌بکا بە «اللّه أکبر» کردن، بەڵکوو لە نیوەڕۆی رۆژی جەژنی قوربانەوە دەس پێ‌بکا تا بەیانی ئاخر رۆژی «أیّام التّشریق».
ئەو سیغەیە کە جوانە بۆ تەکبیر لە جەژنەکانا، ئەمەیە: «اللّه أکبر، اللّه أکبر، اللّه أکبر، لا إله إلا اللّه و اللّه أکبر، اللّه أکبر و لِلّهِ الحمد». سوننەتە «کبیرا، وَ الحمدُ لِلّه کثیراً، و سُبحان اللّهِ بُکْرَةً وَ أَصیلا»یش زیاد بکا لەسەر ئەم زیکرە.

ئەگەر لە رۆژی سێهەمی مانگی رەمەزانا، لەپێش زەوالا، شەهادەتیان‌دا بە چاو پێ‌کەوتنی مانگ لە شەوی پێشوودا، ئەوە واجبە رۆژوو بشکێنن و نوێژی جەژنیش بکەن؛ ئەگەر لەپاش زەوالیش تا غورووب ئەو شەهادەتەیان دا، رۆژووەکە ئەشکێنن و نوێژەکەیان فەوتاوە و هەروەختێ قەزا بکرێتەوە، باشە؛ ئەگەر لەپاش مەغریبی رۆژی سێهەمیش شەهادەتیان‌دا بەوە کە دوێنێ‌شەو مانگیان بینیوە، ئەوە ئەو شەهادەتە قەبووڵ ناکرێ و سبەینێ بەجەژن دائەنرێ.

**بزانن!** موسافەحە و جەژنە پیرۆزە لە هەردوو جەژنەکانا سوننەتە؛ سوننەتە دوعای خێر بۆ یەکتر بکەن؛ هەروەها، سوننەتە پیرۆزبایی بەبۆنەی داهاتنی ساڵی تازە و مانگی تازەوە.

## باسی نوێژی رۆژ و مانگ‌گیران

ئەم نوێژە، سوننەتە؛ سوننەتیشە بە جەماعەت بکرێ. بۆکردنی ئەم نوێژە، سێ شێوە هەیە؛

یەکەم، ئەوەیە نییەتی نوێژی سوننەتی ڕۆژگیران یا مانگگیران بهێنێ، وەك سوننەتی بەیانی کە بریتییە لە دوو ڕکات و لە هەردوو ڕکاتەکەدا لەپاش خوێندنی فاتیحە، سوورەت بخوێنێ و یەك ڕکووع و دوو سوجدە ببا و هەردوو ڕکاتەکە بەوجۆرە بکا، جا تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە؛

دووهەم ئەوەیە لە هەموو ڕکاتێکا فاتیحە بخوێنێ، جا سوورەتێ بخوێنێ لە سوورەتە وردەکان و ڕکووعێکی عادەتی بباوکاتێ کە سەری بەرزکردەوە بۆ ئیعتیدال، دووبارە فاتیحە بخوێنێ و سوورەتێك لەو سوورەتانە بخوێنێ و ڕکووع بباتەوە و لە ڕکووع بەرز بێتەوە بۆ ئیعتیدال، جا دانەوێ هەردوو سوجدە و دانیشتنی مابەینیان، وەك لە باقی نوێژەکانا، بەجێ بێنێ؛ ئەمە ڕکاتێك، هەروەها ڕکاتی دووهەمیش تەواو بکا، جا تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە؛

شێوەی سێهەمیش ـ کە شێوەیەکی زۆر کاملە ـ ئەوەیە لە هەموو ڕکاتێکا دووجار فاتیحە بخوێنێ و دووجار ڕکووع بەرێ، وەك وتمان، بەڵام لەپاش جاری یەکەمی فاتیحەکەی، یا سوورەتی «البَقرة» یا بەئەندازەی ئەو سوورەتە لە ئایەتی تر بخوێنێ و لە پاش جاری دووهەمی فاتیحەکەی، بە ئەندازەی دووسەد ئایەت لە «البَقرة» و لەپاش فاتیحەی جاری سێهەم، بە ئەندازەی سەد و پەنجا ئایەت و لەپاش جاری چوارەم، ئەوەندەی سەد ئایەت لە «البقرة» بخوێنێ؛ لە ڕکووعی یەکەمیشا، ئەوەندی سەد ئایەتی ئەو سوورەتە، «سُبحانَ رَبِّي العَظيمِ و بِحَمده» بخوێنێ و لە ڕکووعی دووهەما، ئەوەندەی هەشتا ئایەت و لە سێهەما ئەوەندەی حەفتا ئایەت و لە چوارەما، ئەوەندەی پەنجا ئایەت لەو تەسبیحە بخوێنێ؛ لە هەر سوجدەیەکیشدا لە سوجدەکان، ئەوەندەی ڕکووعەکەی پێشەوەی، «سُبحان رَبِّي الأعلىٰ و بِحمدِهِ» بخوێنێ، پاش ئەمانە، تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە.

نوێژی مانگگیران، بە ئاشکرا [(جەهری)] و نوێژی ڕۆژگیران بە نهێنی ئەخوێنرێ.

ئەم شێوەیە زۆر تەواوە و ڕکووعی تری لێ زیاد ناکرێ بۆ چاوەڕێیی کردنی بەربوونی ڕۆژ یا مانگ؛ هەروەها، ئەگەر لەکاتی نوێژەکەشا بەربوون ڕکووعیان لێ کەم ناکرێتەوە.

نوێژی ڕۆژگیران، ئەفەوتێ بە ڕووناك بوونەوەی ڕۆژو بە ئاوابوونی بە تـاریکی؛ نوێژی مانگگیرانیش، ئەفەوتێ بە ڕووناك بوونەوەی و بە هـەتاو کـەوتن، بـەڵام بـە ڕۆژبوونەوە و بە ئاوابوونی بە تاریکی، تەواو نابێ.

سونئەتە ئیمام لەپاش نوێژەکە دوو خوتبە بخوێنێ، وەك خوتبەکـانی جـومعە و تەرغیبی خەڵك بکا لەسەر تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوە لە گوناه و لەسەر دانەوەی حەقی هەرکەس کە لەسەریان بێ و لەسەر خێر و حەسەنات کردن بۆ داماوان و هەژاران،... .

هەرکەسێکی لێ پێش‌کەوتوو (مسَبوق)، گەیشت بە ڕکووعی ڕکاتی یەکەما، ئەوە نوێژەکەی بەتەواوی بە جەماعەت بۆ ئەژمێررێ، بەڵام ئەگەر لە ڕاوەستانی دووهەم یا لە ڕکووعەکەیا گەیشت بە ئیمام، ئەوە هەر ڕکاتی دوایی بۆ ئەژمێررێ و پێویستە لەپاش سەلامی ئیمام هەستێتەوە و ڕکاتێکی‌تر بە شێوەی ڕکاتی یەکەم بکا، ئـەوجا سـەلام بداتەوە، هەروەها ئەگەر لە ڕاوەستانی یەکەم یا لە ڕکووعی ڕکاتی دووهەما گەیشت بە ئیمام، بەڵام ئەگەر لە ڕاوەستانی دووهەم یا لە ڕکووعی دووهەمی ڕکـاتی دووهـەما پیاگەیشت، ئەوە ڕکاتی بۆ حیساب ناکرێ، بەڵکوو ئەگا بە جەماعەتدا و پـێویسـتە لەپاش سەلامی ئیمام هەڵسێتەوە دوو ڕکات نوێژ بەشێوەی پـێشـوو بـخوێنـێ، جـا تەحیات بخوێنێ و سەلام بداتەوە.

ئەگەر نوێژی ڕۆژگیران ڕێکەوتی وەختی نوێژی جومعەی کرد، ئەمە ئەگەر ترسی فەوتانی جومعەکەیان نەبوو، لەپێشا نوێژی ڕۆژگیران، ئەوجار نوێژی جومعە بکەن و خەتیب لە خوتبەی جومعەکەدا باسی ڕۆژگیرانەکـە و داوای تـەوبە و پـەشیمانی لە خەڵکەکە بکا؛ ئەگەر ترسی فەوتانی جـومعەکـەیان هـەبوو، پـێویسـتە جـومعەکـە پێش‌بخەن. ئەگەر نوێژەکە ڕێکەوتی حازربوونی جەنازەیەکـی کـرد، ئـەوە نـوێژی جەنازەکە ئەخرێتە پێشەوە، نەوەك لاشەی مردووەکە بەهۆی مـانەوەیەوە بـۆن بکـا، هەروەها ئەگەر نوێژی جەژنیش ڕێکەوتی حازربوونی جەنازەیەکی‌کرد؛ بەڵام ئەگەر ترسی گۆڕانی لاشەکەیان نەبوو و ئومێدی ئەوەش ئەکرا پاش نوێژی جەژن یا جومعە یا هەر فەرزێکی‌تر، قەرەباڵغێکی زۆرترە کۆببێتەوە بۆ نوێژی جەماعەت لەسەر ئـەو

جەنازەیە، لەو حاڵەدا نوێژی جەنازەکە دوابخرێ باشترە تا خەڵکێکی زۆر کۆببنەوە بۆ نوێژکردن لەسەر مردووەکە.

## باسی نوێژی داواکردنی باران بارین (نوێژە بارانە)

ئەم نوێژە بۆ هەموو کەس سوننەتە لەکاتی پێویستی بارانا، چەندجاریش دووبارە ئەکرێتەوە تا باران ئەبارێ. داواکردنی باران سێ جۆرە؛

یەکەم، دوعا و داواکردنی بارانە بەتەنها یا لەگەڵ کۆمەڵدا؛

دووهەم، دوعاکردنە لەپاش نوێژەکان بەتەنها یا لەگەڵ کۆمەڵدا و پارانەوە لە خوتبەی جومعەدا؛

سێهەم، ئەوەیە کە ئیمام و فەرمانداری موسوڵمانان، ئەمریان پێ بکا لەپێشا سێ رۆژ بە رۆژوو بن و تەوبە بکەن و لە گوناه پەشیمان ببنەوە و حەقی هەرکەسیان لەسەرە یا بیدەنەوە یا بڕیار بدەن کە بیدەنەوە، یاخود گەردنی خۆیانی پێ ئازاد بکەن؛ جا لە رۆژی چوارەما، هەموو بە زمانی بەڕۆژووەوە و بە جل و بەرگێکی سووکەوە لە ئاوایی دەرچن و زۆر بە ئەدەب وکزییەوە بڕۆن و مناڵ و پیریشیان لەگەڵ خۆیان بەرن و ران و ئاژەڵ وگاگەل و حەیواناتی تریان بدەنە پێش خۆیان؛ بەڵکوو ئەگەر ئەو شوێنە کافری «ئەهلی زیممە»شی تیابوو، رێیان لێ ناگیرێ بچنە دەرەوە بەو شەرتە تێکەڵی موسوڵمانان نەبن، جا بە جەماعەت نوێژی داوای باران بارین بکەن. ئەم نوێژە، دوو رکاتە وەك نوێژی جەژن، یەعنی لە رکاتی یەکەمیا، لەپاش دوعای ئیفتیتاح، حەوت جار «اللّٰهُ أکبر» و لە رکاتی دووهەمیا، لەپێش خوێندنی فاتیحە، پێنج جار «اللّٰه أکبر» ئەکەن؛ ئەوەندە هەیە لە رکاتی دووهەمی ئەما، سوورەتی «نُوح» ئەخوێنرێ و وەختی نوێژەکە هەرکاتێك بێ قەیدی نییە. لەپاش نوێژەکە، ئیمام دوو خوتبە بخوێنێتەوە وەك خوتبەی جەژن، بەڵام لەجیاتی تەکبیر، ئیستیغفار بکا، یەعنی لە ئەووەڵی خوتبەی ئەووەڵەوە، نۆ جار و لە ئەووەڵی خوتبەی دووهەمەوە، حەوت جار «استغفرُ اللّٰه» بکا، لە خوتبەی یەکەمیشدا، ئەم دوعا بخوێنێ: «**اَللَّهُمَّ اسْقِنا غَيْثاً مُغيثاً مَرِيئاً غَدَقاً مُجَلِّلاً سَحّاً طَبَقاً دائماً، اَللَّهُمَّ اسقِنا الغيثَ و لا تجْعلْنا من القانِطينَ، اللَّهُمَّ إِنَّا نستغْفِرُكَ إِنَّكَ كُنْتَ**

غفّاراً، فَارْسِلِ السّماءَ عَلینا مِدْراراً»؛ خەتیب لەپاش ئەووەڵی خوتبەی دووهەمەوە، رووبکاتە قیبلە و زۆر موبالەغە بکا لە پارانەوە و دوعا خوێندندا بە ئاشکرا و بەپەنامەکی؛ لەو کاتەدا کە رووئەکاتە قیبلە، ئەو جلە کە راست و چەپ کردوویەتە ناوشانی، هەڵیبسوورێنێ، لای راستی بخاتە لای چەپ و لای چەپی بخاتە لای راست و لای خوارووی بکاتە سەرەوە و لای سەرووی بکاتە خوارەوە؛ مەئموومەکانیش هەروەها بکەن لە بەرماڵی سەرشانی خۆیان و بەمجۆرە بیهێڵنەوە بەشانیانەوە تا ئەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە و لای ئەبەن. ئەگەر ئیمام تەرکی ئەم نوێژە بارانەیەی کرد، یا شوێنەکە هەر ئیمامی نەبوو، خەڵکی وڵاتەکە خۆیان بیکەن؛ ئەگەر خوتبەکان لەپێش نوێژەکەوە خوێنرانەوە، یا هەر یەك خوتبە خوێنرایەوە، ئەوەش دروستە.

سوننەتە ئینسان خۆی دەربخا بۆ بارانی سەرپەڵە و بێجگە لە عەورەتی، هەمووگیانی رووت بکاتەوە بۆ ئەوەی باران لێیبدا؛ هەروەها، سوننەتە خۆی بشوا یا دەسنوێژ بگرێ بە لافاوێك کە لەو بارانە هەڵسابێ. سوننەتە لەکاتی هەورەگرمە و هەورەبرووسکەدا، بڵێت: ﴿سُبحانَ مَن يُسبِّحُ الرَّعدُ بحَمدِهِ وَالْمَلائِكَةُ مِنْ خيفَتِهِ﴾ و بە دوای هەروە برووسکەدا نەڕوانێ و لەکاتی باران بارینا، بڵێت: «اللّٰهُمَّ صيِّباً نافعاً» و هەر دوعایەکی حەڵاڵی ئارەزوو لێ بێ بیکات و لەپاش بارانەکە، بڵێت: «مُطِرْنا بفضلِ اللّهِ و رحمتِهِ» واتە، لەسایەی خواوە بارانمان بۆ باری، کەراهەتی هەیە بڵێت: «مُطِرْنا بنَوءِ كذا» واتە: لە فڵانە برجا بارانمان بۆ باری. کەراهەتی هەیە جنێو بدا بە «با». ئەگەر بەهۆی زۆری بارانەوە زیانیان پێ گەیشت، سوننەتە لەخوا بپارێنەوەکە خۆش بکاتەوە و بڵێن: «اَللّٰهُمَّ حَوالَيْنا و لاٰ عَلَيْنا» واتە: «خوایە! بە دەور و پشتمانا بباری نەك بەسەرمانا»، بەڵام نوێژکردن بەم مەبەستە سوننەت نییە. ئەگەر هەورەگرمە و بوومەلەرزە و بای توند پەیدا بوو، سوننەتە هەرکەس بۆ خۆی بەتەنها نوێژ بکا و لەخوا بپارێتەوەکە لایان بدا؛ نوێژی ئەم مەبەستە دوو رکاتە.

**بزانن!** ئەو نوێژە سوننەتانە سوننەتە بە جەماعەت بکرێن، گەورەترن لەو سوننەتانەی جەماعەتیان تیا سوننەت نییە، بەڵام راستتر ئەوەیە کە «رٰاتِبە»ی بەرودوای نوێژەکان، لە تەراویح گەورەترن. تەرتیبی گەورەیی لەبەینی ئەم سوننەتانەدا، بەم جۆرەیە: نوێژی

جەژنەکان لە نوێژەکانی تر گەورەترن؛ نوێژی جەژنی قوربان لە نوێژی جەژنی رەمەزان گەورەترە، ئەمجار نوێژی رۆژگیران، جا مانگگیران، جا نوێژی داوای بارانبارین، جا دوو رکاتی سوننەتی پێش نوێژی سبەینان، جا راتبە موئەککەدەکانی تر؛ راتبە موئەککەدەکانیش لەناو خۆیانا وەك یەکن؛ ئەمجا نوێژی تەراویح، جا نوێژی چێشتەنگا، جا دوو رکات سوننەتی تەواف بەدەوری کەعبەدا، جا «تحَّية المسجد»، جا سوننەتی ئیحرام، جا سوننەتی دەسنوێژ، جا ئەو سوننەتەی کە سەبەبەکەی لە نوێژکەرەکەوە نەبێ، وەك سوننەتی زەوال، پاش ئەمانە سوننەتی موتڵەق، لەناو سوننەتی موتڵەقیشدا، سوننەتی موتڵەقی شەو گەورەترە لە سوننەتی موتڵەقی رۆژ.

## باسی وەزعی نەخۆش و شۆردنی مردوو

سوننەتە ئینسان هەمیشە ئەوەندەی پێیبکرێ بیر لە مردنی خۆی و وەزعی پاشەڕۆژی بکاتەوە، بۆ ئەوە کە خۆی لە ئیشی ناڕەوا و خوو و ڕەوشتی ناپەسەند بپارێزێ؛ سوننەتە خۆی ئامادە بکا بۆ سەرفەرازی ئەو رۆژەی، بەهۆی تەوبەکردن و پەشیمان بوونەوەوە لە گوناه و دانەوەی حەقی خەڵك کە لەسەریەتی؛ ئەم وەزعانە، بۆ ئینسانی نەخۆش پێویسترن؛ پێویستە بۆ نەخۆش وەسیەت بکا بۆ ئەو کەسانەی کە لە نزیکیەوەن و باوەڕیان پێ ئەکرێ، لەبارەی قەرزێکەوە کە لەسەری بێ یا ئەمانەتێك کە لای بێ، یا خێر و حەسەناتێ کە بیەوێ بۆی بکرێ؛ پێویستە داوای گەردن ئازادی بکا لەو کەسانە کە عەلاقە و تێکەڵییان لەگەڵیا بووە. سوننەتە ئینسان لەکاتی نەخۆشیدا خۆی رابگرێ و کەم شکات لە دەردی خۆی بکا، مەگەر لای دوکتۆرێکی ئەمین و باوەڕ پێ کراو، هەروا سوننەتە خۆی خەریك بکا بە زیکر و تەسبیحات و خوێندنی ئەو ئایەتانەوە کە لەبەرینی بە تایبەتی سوورەتی «الإخلاص»؛ سوننەتە هیوای زۆر بێ بە لوتفی خوای تەعالا و بە تەمای عەفو و لێ خۆش بوونی خوا بێ.

هەروەها سوننەتە بۆ ئینسان سەر لە نەخۆش بدا هەتاوەکوو لە یەکەم رۆژی نەخۆشییەکەشیا، هەرچەند نەخۆشییەکەی دەردێکی وەك چاوئێشەیش بێ، بیناسێ یا

نە، دۆستی بێ یا دوژمنی بێ، موسوڵمان بێ یا کافری ئەهلی زیممە بێ، بەو شەرتە دراوسێی بێ یا عەلاقەیەکی شەرعی لەگەڵا هەبێ؛ بەڵێ، ئەم سەرلێدانە بۆ خزم و برای موسوڵمان و ئەوانەی کە دۆست و برادەرن زۆر بەئەهمیەترە، بەڵام سوننەتە کەم دانیشێ و نەبێ بە مایەی ئازاری دڵی نەخۆشەکە، مەگەر ئەو خۆی داوای لێبکا زۆر دابنیشێ. سوننەتە بۆ نەخۆش تەداوی بکا و لە هەندێ کاتیشدا، واجبە. سوننەتە لەو کاتەدا کە نەخۆش ئەکەوێتە گیاندان، بەجێی نەهێڵن و بەسەر لای راستا روو بە قیبلە رایکێشن، ئەگەر بەلای راستا نەیتوانی، بەسەر لای چەپا رایکێشن، ئەگەر ئەمەش رێنەکەوت، لەسەر پشت رایکێشن، بەڵام رووی بکەنە قیبلە، هەروەها هەردوو پاژنەی پێیشی؛ سوننەتە لەو کاتەدا هەرکەس بەلای نەخۆشەکەوە بوو، «لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ اللّٰه» بکا بۆ ئەوە ئەویش بیڵێ و دوایی ژیانی بەو وشەیە بێت؛ هەروەها سوننەتە «سوورەتی یاسینی» بەلاوە بخوێنرێ؛ کە گیانیشی دەرچوو، زوو بەزوو، تا لەشی گەرمە، چاوەکانی بنرێن بەیەکا و جمگەکانی لەشی نەرم بکرێن بەو جۆرەکە باسکی ببرێتەوە بۆ لای قۆڵی و ساقی ببرێتەوە بۆلای رانی، جا راست رابکێشرێ و بە دەسەسرێك ژێر چەناکەی ببەسرێ بەسەریەوە و هەموو جلەکانی لەبەر دابکەنرێ و لەسەر کورسییەك یا شوێنێکی بەرز، روو بە قیبلە رابکێشرێ و شتێکی قورس لەسەر سکی دابنرێ؛ ئەو کەسەی ئەم ئیشانە ئەکا، ئەبێ مەحرەمێك بێ لە هەموو مەحرەمەکانی میهرەبانتر بێ. واجبە پاش ئەوە کە دڵنیا بوون لە مردنی، زوو دەست بکرێ بە شۆردنی، مەگەر شەهیدی شەڕی کافران کە دروست نییە بشۆررێ.

لای کەمی شۆردنی مردوو، ئەوەیە لەپاش لابردنی هەر پیسییەك کە بەلەشیەوە بێ، هەموو گیانی بە ئاوێکی پاك و پاکەوەکەر بشۆرن و ئەو ئاوە بگا بە هەموو شوێنێکی کە شۆردنی پێویست بێ بۆ لابردنی لەش پیسی، تەنانەت ژێری پێستی سەری زەکەری نێرینەیەك کە خەتەنە نەکرابێ. ئەگەر مردووەکە قابیلی شۆردن نەبوو، پێویستە تەیەممومی بۆ بکرێ؛ هەروەها ئەگەر شوێنێکی قابیلی شۆردن نەبێ، واجب نییە لەسەر ئەو کەسە کە مردوو ئەشۆرێ نییەتی غوسڵی مردوو بهێنێ، بەڵام سوننەتە بڵێ:

نییەتمە غوسڵی ئەم مردووە بەجێ‌ئەهێنم، هەروا بۆ تەیەممومەکەشی واجب نییە بەڵکوو سوننەتە، ئەوەندە هەیە واجبە تەیەممومی مردوو لەپاش لابردنی هەر پیسییەك کە بەلەشیەوە بێ؛ جا ئەگەر لەپاش شۆردن یا پاش تەیەممومم، شتێکی پیس لەگیانیەوە هاتەدەرەوە، تەنها واجبە ئەو پیسییە لابیرێ و دووبارەکردنەوەی شۆردن و تەیەممومی ناوێ. حەرامە لەسەر مردووشۆر تەماشای عەورەتی مردووەکە بکا [و]کەراهەتی هەیە تەماشای غەیری عەورەتی بکا مەگەر ئەوەندە کە پێویست بێ بۆ شۆردنەکەی. لای ژوورووی شۆردنی مردوو، ئەوەیە لەشوێنێکی خەڵوەت و سەرداپۆشراوا بێ و مردووشۆرەکە لەسەر تەختەیەك داینێ و لەناو کراسێکا کە لەشی داپۆشێ، بە ئاوێکی سارد بیشۆرێ و وەزعی شۆردنەکە، وابێ: مردووەکە لەسەر تەختەیەك دابنیشێنرێ بە نەوعێ کە مەیل بکا بۆلای پشتەوە و مردووشۆرەکە، دەستی راستی لەسەرشانی راستی مردووەکە دابنێ و پەنجەی گەورەی دەستی لە قووڵایی پشتی ملی توند بکا و پشتی بدا بە ئەژنۆی راستی خۆیەوە، جادەستی چەپی بەهێز بهێنێ بەسەر سکیا بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکی تیابێ، دەربچێ، ئەمجار بەسەرپشتا رای‌بکێشێ و بەدەستی چەپی، بە لەفافەیەکەوە عەورەتی، بەرودوا بشۆرێ؛ پاش ئەمە، لەفافەیەکی‌تر بکاتە دەستی، پەنجە بکا بەدەمیا و بیهێنێ بەسەر دانەکانیا و هەرچی لە کونەلووتەکانیا هەبوو پاکی بکاتەوە، جا وەك دەس‌نوێژی زیندوو دەس نوێژێکی باشی بۆ بگرێ؛ واجبە لەسەر مردووشۆرەکە نییەت بۆ ئەم دەس‌نوێژە بهێنێ بەڵام نییەتی دەس‌نوێژی سوننەت بهێنێ؛ پاش ئەمە، سەر و ریشی بشۆرێ بە ئاوێکی‌وا کە بە شتێکی وەك مۆرد بۆن‌خۆش کرابێ و بە شانەیەکی دان‌شاش بە نەرمی و ئارامی بۆی دابهێنێ، ئەگەر موویەکیان لێ کەوتە خوارەوە، بیخاتەوە ناومووەکانی؛ پاش ئەمە، لای‌راستی بشۆرێ، جا لای چەپی، ئەوجا هەڵی‌سوورێنێ بۆ لای‌چەپ بۆ ئەوەکە لای راستی لەپشتەوە تا پێ بشۆرێ، جا هەڵی‌بسوورێنێتەوە بۆ لای راستی بۆ ئەوەکە لای چەپی باش بشۆرێ لەسەر و پشتیەوە تا پێی، لەهەموو ئەم شۆرینەشدا، شتێکی بۆن‌خۆش وەك مۆرد تێکەڵی ئاوەکە بکا؛ ئەمە هەمووی کە وتمان، بە تاقە غوسڵێك دائەنرێ؛ سوننەتە بۆ

جاری دووهەمیش وەك جاری یەكەم بیشواتەوە، بەڵام بۆ جاری سێهەم بە ئاوێكی رووت هەمووڵەشی وەك جارەكانی تر بشوا؛ ئەمە سێ جار؛ لەم سێ جارا، هەر جاری سێهەمی بەكاردێت، چونكە جارە پێشووەكان بەهۆی ئەو شتە بۆنخۆشانەوەكە تیایانا بووە، ئاوەكەی پاكەوەكەر نەبووە، بەڵام ئاوی جاری سێهەم ئاوێكی سافە. رادەی زۆر تەواوی شۆردنی مردوو، ئەوەیە هەركام لەم سێ شۆردنە دوو جاریتریش تەكرار بكرێتەوە كە هەمووی، ئەكاتە نۆ غوسڵ. باشتر ئەوەیە پیاو، پیاو بشۆرێ و ژن، ژن؛ بەڵام دروستیشە پیاو، ژنی خۆی و ژن، مێردی خۆی بشۆرێ، ئەوەندە هەیە لەموەختەدا سونەتە مردووشۆرەكە دەسپێچێكی بەدەستەوە بێ بۆ ئەوەی دەستی نەكەوێ لە پێستی مردووەكە. تەرتیب لە شۆردنی [پیاوی] مردوودا، بەمجۆرەیە:

یەكەم، ئەو پیاوانەكە موستەحەقن بۆ نوێژ لەسەركردنی، وەك باوك و باپیرە وكوڕ وكوڕەزا، جا برای باوك و دایكی، جا برای باوكی؛

دووهەم، پیاوێ كە مەحرەمی بێ، وەك خاڵ و باوە پیارە؛

سێهەم، پیاوێ كە خزمایەتی لەگەڵیا هەبێ، وەك خاڵۆزا؛

چوارەم، پیاوی بێگانە؛

پێنجەم، ژنی خۆی؛

لە شۆردنی ژنیشا، تەرتیب بەمجۆرەیە:

یەكەم، ژنێ كە مەحرەمی بێ، بەڵام پووری خوشكی باوك لەپێش پووری خوشكی دایكەوەیە؛

دووهەم، ژنێ كە خزمی بێ، وەك پوورزا و ئامۆزا و خاڵۆزا؛

سێهەم، مەحرەمی شیر، وەك خوشك و خوشكەزای شیری؛

چوارەم، مەحرەمی ژنو ژن خوازی، وەك خەسوو و بووك و كچی مێرد؛

پێنجەم، ژنی بێگانە؛

شەشەم، مێردی ئەو ژنە مردووە. ئەگەر مردووەكە ژنی زەیسان یا خاوەن حەیز بوو، تەنیا ئەم شۆردنەی بەسە.

ئەگەر بۆ شۆردنی ژن، هەر پیاوێکی نامەحرەم هەبوو و بۆ شۆردنی پیاو، هەر ژنێکی نامەحرەم هەبوو، ئەوە دروست نییە ئەو مردووەکە بشۆرێ، بەڵکوو ئەبێ تەیەممومی بۆ بکات؛ بەڵام ئەگەر وا هەڵکەوت ئەو پیاوە نامەحرەمە یا ئەو ژنە نامەحرەمە، مردووەکەی شۆرد، ئەوەکافییە و فەرزەکەمان لەسەر لائەچێ. دروستە ژنی مردووشۆر لە حەیزا بێ؛ منداڵێکیش کە نەگەیشتبێتە قۆناغی ئارەزووکردن، کوڕ بێ یا کچ، دروستە بۆ پیاو و بۆ ژن بیشۆرن، بەڵام ئەگەر گەیشتبووە ئەو قۆناغە، حوکمی پیاو و ژن پەیدا ئەکا.

منداڵی لەبارچوو، ئەگەر سەرو سوورەتی ئادەمیزادی تیا دەرنەکەوتبوو، شۆردن و نوێژی ناوێ، بەڵام سوننەتە جلێکی پێوە بپێچرێ و دفن بکرێ؛ ئەگەر سەر و سوورەتی ئادەمیزادی تیابوو، بەڵام نیشانەی ژیانی نەبوو، وەکوو جووڵە و دەنگ، ئەوە پێویستە بشوررێ و دفن‌بکرێ، هەرچەند نوێژی لەسەر ناکرێ؛ ئەگەر سەرو سوورەتی هەبوو و نیشانەی ژیانیشی پێوە دیاری دابوو، کە دەنگ و ئاوازە و جووڵەجووڵە، ئەوە وەکوو ئینسانی گەورە وایە، شۆردن و کفن و نوێژ لەسەر کردن و دفن‌کردنی واجبە.

ئەگەر پارچەی ئینسانێك لەشوێنێکا کەوتبوو، ئەوەیش حوکمی وەك مردوویەکی تەواو وایە، شۆردن و کفن و نوێژ لەسەرکردن و دفن کردنی پێویستە.

کەراهەتی هەیە بڕینی نینۆکی مردوو و تاشین و قرتاندنی مووی سەر و ریش و شوێنی تری، هەتاوەکوو ئەگەر رشك و چنگنە بەسەر و ریشی پیاو و قژیژنەوە مەنعی تەڕبوونی مووەکان بکەن، ئەوە عەفویان لێ‌ئەدرێ وناتاشرێن و پێویستیش نییە بە تەیەمموم؛ بەڵێ، ئەگەر مووی سەر و ریش لەخۆیەوە لوولی خواردبوو، یا بەهۆی دەرمانێکی وەك جەوییەوە، نووسابوو بەیەکەوە و ئاوی پێ‌نەئەگەیشت، ئەوە لەم‌کاتەدا واجبە ئەو موانە بتاشرێن؛ بەڵام «شیروانی»، ئەڵێ: بەهیچ جۆرێك مووی مردوو ناتاشرێ و عەفو ئەدرێ لە تەڕ نەبوونی. کەسێك بە جل‌وبەرگی ئیحرامەوە لە حەج و عەمرەدا بمرێ، واجبە هیچ وەزعێکی نەگۆڕرێ، بەم مەعنایە نابێ لە وەختی شۆردنا ئاوی غوسڵەکەی بۆن خوش بکرێ، هەروا کفنەکەشی دەرمانی بۆن‌خۆشی پێوە ناکرێ، تا شێوەی ئیحرامەکەی بمێنێتەوە. پێویستە مردووشۆر کەسێکی ئەمین بێ،

ئەگەر نیشانەیەکی چاکەی بە مردووەکەوە دی، باسی بکا وە ئەگەر نیشانەی خراپەی پێوەدی، بێدەنگ بێ مەگەر لەبەر مەسڵەحەت.

## باسی کفن‌کردنی مردوو

مردووکفن ئەکرێ بە هەر پۆشاکێك لەژیانیا دروست بووبێ لەبەری بکا. کفنی زۆر باش، ئەوەیە ڕەنگی سپی بێ. لای کەمی کفن، جلێکە هەموو لەشی داپۆشێ، بێجگە لە سەری پیاوێك و ڕووی ژنێك کە لە ئیحراما بن؛ ئەم ئەندازەیە، حەقی خوایە، هەرچۆن بووە ئەبێ جێبەجێ بکرێ؛ ئەوەی کە حەقی مردوو خۆیەتی، سێ کفنی سەر تا پێیە، کەس ناتوانێ مەنعی ئەم سێ کفنە بکا لە مردوو مەگەر خاوەن قەرزێکی وا قەرزەکەی هەموو ماڵی مردووەکە بگرێتەوە؛ میراتگر ناتوانن مەنعی کفنی دووهەم و سێهەم بکەن لە مردوو هەرچەند منداڵی نابالغیشیان تیابێ، چونکە ئەم سێ کفنە حەقی مردووەکە خۆیەتی، بەڵام ئەگەر خۆی وەسیەتی کردبوو بۆی نەکەن، ئەوە بۆی ناکەن؛ ئەوەش کە حەقی میراتگر خۆیەتی، کفنی چوارەم و پێنجەمە؛ کەواتە، ئەگەر لەناو میراتگرەکانا منداڵی نابالغ هەبوو، بە قەتعی، ئەم دوو کفنە زیادە دروست نییە؛ هەروەها ئەگەر میراتگری باڵغ ئارەزووی نەبوو ئەو دوو کفنە بکا، ئەتوانێ نەیەڵێ بۆی بکرێ.

جا ئەگەر هیچ مانیعێك نەبوو لە زیادکردنی ئەم دوو کفنەیش، ئەوە بۆ ژن واباشە پێنج کفنەکەی دوانیان باڵاپێچ (لەفافە) بن و سیانەکەی تریان جلێك بن بۆ بەینی ناوك و ئەژنۆ کە پێی ئەڵێن: «إِزار» و کراسێکی قۆڵدار کە لە ناوشانیەوە تا قولاپەی پێی بگرێتەوە کە پێی ئەڵێن: «قَمیص» و سەرپۆشێك کە بەدەوری سەریا بپێچرێ کە پێی ئەڵێن «خِمار»، بەڵام بۆ پیاو ـ هەرچەند مانیعیش نەبێ لە زیادکردنی کفن ـ هەر سێ کفن باشترە، چونکە داپۆشینی ژن لە داپۆشینی پیاو مەتڵەبترە، بەڵام دروستە دوانە زیادەکەشی بۆ بکرێ. زیادەڕەوی لە کفن کردنا کەراهەتی هەیە هەرچەند مانیعیش نەبێ. کفنی شۆراویش لە نەشۆراو چاکترە. منداڵیش وەکوو باڵغ وایە لە ئادابی کفن‌و لە فەرقی نێوانی ژن و پیاوا. ئەگەرکەس‌وکاری پیاوی مردوو، هەر ئارەزوویان هەبوو پێنج کفنی

بۆ بکەن، ئەوە واباشە سیانیان باڵاپێچ و دوانیان کراس و مێزەرە بن؛ ئەگەر هەر سێ کفن کرا بۆ مردوو، ئەوە واجبە سێ باڵاپێچی وا بن هەموو لەشی مردووەکە داپۆشن، باشتریش ئەوەیە هەر سیانیان وەك یەك وابن، واتە هیچیان پان و درێژتر نەبێ، هەرچەند ئەگەر یەکێکیان هەموو گیانی داپۆشی، دروستە ئەو دوانەکەیان پانتر یا درێژتر بن؛ جا ئەگەر سێ کفنەکە بالاپێچ بوون و گەورەو بچووکیان تیابوو، کامیان گەورەترە، ئەوەیان لەپێشا، راخەن، ئەمجا دووهەمەکەیان و پاشان سێهەمەکەیان راخەن و دەرمانی بۆنخۆش بە هەرسێکیانەوە بکەن. ئەگەر زیاتریش بوون، هەر بەم پێیە رایان خەن، جا مردووەکە وشك کەنەوە و بەئارامی رایکێشن بەسەر کفنەکانا و لۆکەی پاکی شیکراوە لەسەر هەموو کونەکانی گیانی دانێن و هەردوو رانی بە شتێك ببەستن بەیەکەوە، جا یەکەیەکە کفنەکانی پێوە بپێچن و بە شتێك قایمیان بکەن، کە خستیشیانە قەبرەوە، ئەو شتانەی لێ بکەنەوە.

**بزانن!** کفنی مردوو لە ماڵی خۆی ئەکرێ؛ ئەگەر خۆی هیچی نەبوو، لەسەر ئەو کەسەیە کە نەفەقەی لەسەریەتی، وەك باب و باپیرو کوڕ و کوڕەزاو مێرد... تاد؛ ئەگەر ئەمانە نەبوون، لەسەرماڵێکە وەقف کرابێ بۆ کفنکردنی مردوو؛ ئەگەر ماڵی وەقفی وایش نەبوو، لەسەر خەزێنەی موسوڵمانانە؛ ئەگەر ئەوەش نەبوو، لەسەر هەر موسوڵمانێکی دەسەڵاتدارە کە لەو شوێنەدا بێ. کەراهەتی هەیە هەڵگرتنی کفن، مەگەر کفنێك کە زۆر دوور لە شوبهە بێ، بەڵام هەڵکەندنی قەبر پێش وەخت دروستە، بە تایبەتی لەجێگەیەکدا کە سەخت بێ و قەبری بە نارەحەت تیا هەڵبکەنرێ.

## نوێژی مردوو

ئەرکانی نوێژی مردوو:

[روکنی] یەکەم، نییەتی فەرزی نوێژی مردووە لەگەڵ «تەکبیری تەحەڕڕوم»دا؛ پێویست نییە نوێژکەر لە نوێژەکەیا ئیشارەت بۆ ئەوە بکاکە نوێژەکەی فەرزی کیفایەیە، هەروەها پێویست نییە مردووەکە بناسێ، ئەگەر زۆریش بوون، پێویست نییە ناو و

ژمارەیان بزانێ، یاخود بزانێ مردووەکە ژنە یا پیاوە، بەڵکوو ئەگەر نییەتی نوێژی مردوو بهێنێ بۆ هەموو ئەو موسوڵمانانەی لەو ڕۆژەدا مردوون، دروستە؛ ئەگەر چەند مردوویەك حازر بوون، ئەتوانێ نییەتی نوێژی هەموویان بێنێ و بەتەنیا یەك نوێژ لەسەر هەموویان بکا، بەو شەرتە خاوەنەکانیان ڕازی بن؛ بۆ مەئمومیش دروستە نییەتی نوێژی مردوو بهێنێ لەسەر ئەو کەسانە کە ئیمام نوێژیان لەسەر ئەکا؛ بەڵێ، ئەگەر هات و مردووەکەی دیاری کرد و دەرکەوت ئەو کەسە نییە، نوێژەکەی بەتاڵە.

**روکنی دووهەم**، چوار «اللّه أکبر»ە بەوەی نوێژ دابەستنیشەوە؛ ئەگەر پێنج «اللّه أکبر»ی کرد و لای وابوو دروستە، زیانی نییە، بەڵام ئەگەر باوەڕی وابوو بەتاڵە و لەگەڵ ئەوەشدا کردی، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەکاتەوە؛ ئەگەر ئیمام پێنج «اللّه أکبر»ی کرد، مەئموم شوێنی نەکەوێ، بەڵکوو نییەتی جیابوونەوە بهێنێ و سەلام بداتەوە، یا چاوەڕوانی بکا تا ئیمامەکەی سەلام ئەداتەوە، ئەوجا سەلام بداتەوە.

**روکنی سێهەم**، خوێندنی فاتیحەیە لەپاش «اللّه أکبر»ی یەکەم؛ سوننەتە لەپێش فاتیحەکەدا «تَعویذ»یش بخوێنێ، بەڵام دوعای «إفتتاح» و خوێندنی سوورەت لەپاش فاتیحە، سوننەت نین.

**روکنی چوارەم**، سەڵاوات دانە لەسەر پێغەمبەرﷺ لەپاش «اللّه أکبر»ی دووهەم؛ سەڵاواتدان لەسەر ئال لێرەدا واجب نییە، بەڵکوو سوننەتە؛ لای کەمی سەڵاواتەکە، «**اَللّٰهُمَّ صَلِّ علی مُحمَّد**»ە و سیغەی سەڵەواتی تەحیات لەمشوێنەدا لە سیغەکانی تر گەورەترە.

**روکنی پێنجەم**، دوعایە بۆ مردووەکە لەپاش «اللّه أکبر»ی سێهەم؛ لای کەمی ئەم دوعایە، ئەوەیە بڵێت: «**اَللّٰهُمَّ ارْحَمْه**» یا: «**اللّٰهُمَّ اغفِرْ له**»؛ دوعای مەشهووریش، ئەمەیە: «**اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِحَیِّنا و میِّتِنا و شاهِدِنا و غائِبِنا و ذَکَرِنا و أُنْثانا، اَللّٰهمَّ مَنْ أَحْیَیْتَهُ منّا فَأَحْیِهِ عَلَی الإِسْلام، و من توفَّیْتَه مِنّا فتَوَفَّهُ علی الإِیمانِ**»، بۆ نوێژ لەسەر منداڵی مردوو، ئەمەش بڵێ: «**اَللّٰهمَّ اجْعَله فَرَطاً لِأَبَوَیْه، و سَلَفاً وَ ذُخْرا و عِظَةً وَ اعتِباراً و شفیعاً، و ثَقِّلْ بِهِ موازِینَهُما و أَفْرِغِ الصَّبْرَ علی قُلوبِهِما**». لەپاش

تەکبیری چوارەم و پێش سەلام دانەوە، سوننەتە بڵێت: «اَللّٰهُمَّ لا تَحرِمْنا أَجْرَهُ و لا تَفْتِنّا بَعْدَهُ». لە هەموو دوعاکانی ناونوێژی مـردوودا، ئـەبێ «ضَـمیر»ەکـان بـەپێی مردووەکە بگۆڕێن، یەعنی ئەگەر مردوو نێر بێ یا مێ، یەکێك بێ یا زیاتر، زەمیرەکە بەوپێیە بگۆڕێ.

ئەگەر کەسێك ئیقتیدای کرد بە ئیمام و بەبێ عوزر راوەستا تـا ئـیمام فـاتیحەی خوێند و «اللّه أکبر»ی دووهەمی کرد، ئەوە نـوێژەکـەی بـەتاڵ ئـەبێتـەوە. ئـینسانی مەسبووقیش حەقی وایە کە چووە نوێژەکەوە و «اللّه أکبر»ی کرد، دەس بکا بە خوێندنی فاتیحە، با ئیمام لە شوێنێکی تریشا بێ، جا ئەگەر ئیمام «اللّه أکبر»ێکی تری کرد لە پێش ئەوەدا کە ئەم دەس بکا بە فاتیحە، ئەوە لەگەڵ ئیماما «اللّه أکبر» بکاو فاتیحەی لەسەر لائەچێ؛ ئەگەر لەو کاتەدا کە ئیمام «اللّه أکبر»ی دوایی کرد مەسبووقەکە لەفاتیحەدا بوو، تەرکی فاتیحە بکاو شوێنی ئیمام بکەوێ و لەپاش سەلامی ئیمام، هەرچی لەسەر ماوە لە خوێندنی فاتیحەی پاش «اللّه أکبر»ی یەکەم و تەکبیرەکانی تر بە خۆیـان و زیکرەکانیانەوە، هەموویان بخوێنێ، بەڵام فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعی هەیە کـە تەنها ئەو تەکبیرانەی لەسەری ماون یەك لەسەر یەك بیانڵێ و زیکر نەخوێنێ و سەلام بداتەوە.

**بزانن!** هەرچی شەرتی نوێژەکانی ترە، بۆ نوێژی مردوویش شەرتە، زیاد لەوانـە، بەشەرتیش گیراوە ئەو کەسەی نوێژی مردوو ئەکا پیاو بێ، کەواتە، ئەم نوێژە بـە ژن پێك‌نایەت مادام لەو شوێنەدا پیاو یا منداڵی نێرینەی خاوەن تەمیز ببێ، ئەگەر پیاو یا منداڵی نێرینەی خاوەن تەمیز نەبوو، پێویستە ژن نوێژەکە بکا و فەرزەکە بەوە دێتەدی و سوننەتە بە جەماعەتیش نوێژەکە بکەن، ئەگەر پاش ئەوان پیاو پەیدا بوو، پێویست ناکا نوێژەکە دووبارە بکەنەوە؛ ئەگەر لەپاش نوێژی پیاوان لەسەر مردوو، خەڵکی تر هاتن، سوننەتە ئەوانیش نوێژی لەسەر بکەن. شەرتە نـوێژی مـردوو لەپـاش تـەواوبـوونی شۆردنی مردووەکە بێ[1]، هەروەها، شەرتە هیچ پیسایییەك بە لەش و کفنی مردووەکەوە

١. بەڵام کەراهەتی هەیە نوێژکردن لەسەر مردوو بەرلەوەی کفنی بکەن.

نەبێ، هەتاوەکوو ئەو تابووتەی مردووەکەی پێوە بەسراوە، ئەبێ پاك بێ و ئەو بەرگەش کە پێچراوە بە مردووەکەوە، هەر ئەبێ پاك بێ؛ بەڵێ، خوێنی ئینسانی کوژراو کەبەردەوام لە لەشیەوە بێت، عەفوە و مانیعی نوێژ لەسەرکردنی نییە؛ هەروەها ئەو تابووتەکە مردووەکەی تیایە، ئەگەر پێیەوە نەبەسرابێ وکفنەکەی پیس نەکا، مانیع نییە لە دامەزرانی نوێژکردن لەسەر مردووەکە. شەرتە لەکاتێکا کە نوێژکەر نوێژی مردووی حازر بکا، جەنازەکە لەپێشیەوە بێ، ئیتر شەرت نییە مردووەکە لەعاستی سوجدەگای نوێژکەرەکەدا بێ، هەروەها، پێویست نییە مردووەکە رووەو قیبلە دانرابێ؛ ئەگەر لەسەر قەبرەکەی نوێژی لەسەر کرا، شەرتە قەبرەکەی لەپێشەوە بێ.

دروستە نوێژ لەسەر مردووی «غائِب» (نادیار)، هەرچەند شوێنی مردووەکە نەکەوێتە لای قیبلەوە، یا نوێژکەرەکە لێی پێش‌کەوتبێ؛ مەبەست لە مردووی نادیار، ئەوەیە لەشوێنێکا بێ نیسبەت نەدرێ لە شوێنی نوێژکەرەکە؛ کەواتە، هەر مردوویەك لەناو شوورای شاری نوێژکەرەکەدا بێ، بە حازر ئەناسرێ و لەو شارەدا نوێژی نادیاری بۆ ناکرێ‌و پێویستە نوێژکەرەکە بڕواتە سەر جەنازەکەی؛ هەروەها، چەند دێهاتی‌واکە تێکەڵی یەك بن بە یەك جێگە ئەناسرێن و نوێژی نادیار بۆ ئەهلی یەکێ لەو دێیانە لەسەر مردووی دێکەی‌تر ناکرێ.

فەرزی نوێژی جەنازە، بە تاقە پیاوێك پێك دێت و جەماعەت شەرتە بۆی، بەڵکوو سوننەتە. سوننەتە نوێژکەرەکان بە سێ ریز بووەستن و هەموویان دوعای خێر بۆ مردووەکە بکەن. واجبە ئەم نوێژە پێش دفن کردن بێ؛ ئەگەر وا رێکەوت بەر لە نوێژلەسەرکردن دفن‌کرا، دروستە پاش دفنیش نوێژەکەی بکرێ، بەو شەرتە ئەو کەسە کە نوێژەکە ئەکا لەکاتی مردنی مردووەکەدا ئەهلی فەرزی ئەو نوێژە بووبێ، یەعنی باڵغ و عاقڵ و پاك بووبێ.

**بزانن!** «شەهید» ناشۆررێ و نوێژیشی لەسەر ناکرێ؛ شەهید، بە کەسێك ئەڵێن لە شەڕی کافرانا بەهۆی شەڕەوە کوژرابێ؛ ئەگەر بە دەردێکی تایبەتی مرد، یا لە شەڕەکەدا موسوڵمانێك کوشتی، یاخود کافرەکان لە شەڕەکەدا برینداریان کرد و لەپاش شەڕەکە

وەفاتی کرد، ئەوە بە شەهید ناناسرێ و پێویستە بشۆررێ و نوێژیشی لەسەر بکرێ؛ هەروەها، کەسێ لە شەڕی ئەوانەدا بکوژرێ کە لە گەورەی موسوڵمانان یاخی بوون.

ئەگەر ئینسانێکی لەش پیس شەهید کرا، ئەوە فەرموودەی راست ئەوەیە ناشۆررێ؛ بەڵام هەر پیسییەکی غەیری خوێن و زامی کاتی شەڕ بە لەشی شەهیدەوە بێ، پاك ئەکرێتەوە. شەهید ئەبێ بە بەرگە خوێناوییەکەی خۆیەوە دفن بکرێ، جا ئەگەر هەموو لەشی دانەئەپۆشی، ئەبێ ئەو شوێنەی کە بەدەرەوەیە بە پارچەیەکی تر داپۆشرێ.

**بێداری!** کەسێك کە خۆی کوشتبێ، ئەشۆررێ و نوێژیشی لەسەر ئەکرێ، وەکوو هەر موسوڵمانێکی تر. بۆ ئیمامەتی نوێژی مردوو، خزم و کەس و کاری مردوو باشترن لە فەرمانداری شەرعی، لەناو ئەوانیشا ئەم تەرتیبە راگیر ئەکرێ: باوك، باپیر، باپیرە گەورە، کوڕ، کوڕەزا، برای باوکی و دایکی، برای باوکی، برازای کوڕی برای باوکی و دایکی تا ئەڕوا، لەسەر شێوەی میراتگرتن، ئەمجار خزمانی غەیری نەسەب. ئەگەر دوو کەس لە پایەیەکا بوون، ئەوە کامیان پیرتر یا لەخواترستر بوو، ئەوەیان ئەبێ بە ئیمام.

سوننەتە ئەو کەسەی نوێژی مردووئەکا، لەعاستی سەری پیاو و سێبەندەی ژنا راوەستێ. سوننەتە هەڵگرتنی جەنازە بە سێ کەس بێ، یەکێك لەپێشەوە و دووکەس لەپاشەوە، ئەو کەسە کە وا لەپێشەوە، هەردووداری تابووتەکە بخاتە سەر هەردووشانی و ئەو دووکەسەیش کە لە دواوەن، یەکی دارێ لەو دارانە بخەنە سەرشانیان، ئەم شێوەیە سەوابی زۆرترە لەوە کە دووکەس لەپێشەوە و دووکەس لە دواوەبن.

سوننەتە سەری مردووەکە لە تابووتا لەپێشەوە بێ و کە گەیشتنە سەر قەبران، تابووتەکە وادابنرێت سەری مردووەکە بکەوێتە لای پێی قەبرەکەوە، بۆ ئەوەی لەو کاتەدا کە ئەخرێتە قەبرەوە، لەلای سەریەوە بەئارامی رای بکێشن بۆ ناو قەبرەکەی.

سوننەتە «تَشییع» (بەڕێکردنی جەنازە)؛ رۆیشتن بە پیادە لەپێشی جەنازەوە باشترە لە رۆیشتن بەسواری، یا بە پیادە لەپاشیەوە. سوننەتە مردوو بە پەلە ببرێ ئەگەر ترسی گۆڕانی مردووەکە نەبێ بەهۆی پەلەکردنەوە. سوننەتە ئەو کەسانە کە جەنازەکە

هەڵئەگرن، هەموو پیاو بن، هەرچەند جەنازەکە جەنازەی ژن بێ. حەرامە جەنازە بە شێوەیەکیوا هەڵبگیرێ کە عەیب و شوورەیی بێ، یا ترسی داکەوتنی لێبکرێ؛ سوننەتە شتێکیوا بدرێ بەسەر جەنازەی ژنا کە دایپۆشێ، یا جەنازەکە بخرێتە ناوشتێکەوە نەهێڵێ بەدەرەوە بێ، وەك تابووت. کەراهەتی هەیە دەنگ بەرزەوەکردن و راکردن لەگەڵ جەنازەدا لەو کاتەدا کە ئەبرێ بۆ سەرقەبران، هەرچەند ئەو دەنگ بەرزکردنەوەیشە بە خوێندنی قورئان و زیکر و سەڵاوات دان بێ؛ هەروەها دەنگ بەرزکردنەوە کەراهەتی هەیە لەکاتی شۆردن و کفنکردن و خستنەناو تابووت و دانانی مردوو لەلای قەبرا تا دائەپۆشرێ؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش شۆردن و نوێژ لەسەرکردنی، لە شوێنێکی پاکا دانرا تا قەبرەکەی تەواو ئەبێ، یا تا رۆژ ئەبێتەوە و ئەبرێ بۆ سەرقەبران، ئەوە خێرە قورئانی بەدەورا بخوێنرێ بەو شەرتە کە ئەو قورئان خوێندنە نەبێ بەهۆی سەرلێشێوانی ئەهلی مزگەوت لە نوێژ و ئادابی نوێژیانا، بە تایبەتی ئەگەر ببێ بەمایەی مەنعی خەڵك لە قسەی دنیایی بەدەوری جەنازەکەدا، وەکوو لە «فَتاویٰ ابن زیاد الْیَماني» وەرئەگیرێ.

کەراهەتی هەیە ئاگر هەڵگرتن بەشوێنی جەنازەدا، مەگەر وا رێکەوێ بە شەو دفن بکرێ و ئاگر و چرا پێویست بێ بۆ دەفعی سەرما، یا بۆ ئەوەی خەڵکەکە بتوانن مردووەکە باش دفن کەن، چونکە دفنکردنی مردوو بەشەو دروستە و کەراهەتی نییە.

حەرامە گواستنەوەی مردوو لەشوێنی مردنەکەیەوە بۆ قەبرستانی جێگەیەکی تر، مەگەر بەو شەرتە کە ترسی گۆڕانی مردووەکەمان نەبێ و ئەو شوێنەش کە بۆی ئەبرێ، «مَكّة» یا «مَدینة» یا «بیتُ الْمَقْدِس» یا گۆڕستانێکیوا بێ سالحان و پیاوچاکانی تیا دفن کرابێ، لەو حاڵەدا قەید ناکا.

## باسی قەبرو ئادابی دفن

لای کەمی قەبر، چاڵێکی وایە نەهێڵێ بۆنی مردووەکە بێتەدەرو مەنعی درِندەبکا لەوە کە مردووەکە دەرکێشنە دەرەوە. سوننەتە قەبر ئەوەندە گوشاد بێ بەئاسانی

جێگەی مردووەکەی تیا ببێتەوە و ئەوەندە قووڵ بێ ئینسانێکی نەکورت و نەدرێژ لەناویا راوەستێ و هەردوو دەستی هەڵبڕێ ئەوجا بگاتە لێوارەکەی. ئەگەر ئەو زەوییەی قەبرەکەی تیا هەڵئەکەنرێ، زەوییەکی رەق بوو، وا چاکە قەبرەکە بە «ئەڵحەد»، واتە: «لادر» هەڵکەنن، ئەگینا، هەر لەناو چاڵەکەدا گۆڕیچەی بۆ دروست کەن، ئەوجا مردووەکە کە لەپێینی قەبرەکەوە دانراوە، بە نەرمی لای سەریەوە ئەهێنرێ بۆ ناو قەبرەکە. سوننەتیشە ئەو کەسانەی کە باشتر وایە ئەوان نوێژی لەسەر بکەن، هەر ئەوانە دای بهێڵنە خوراەوە بۆ ناو قەبرەکە، هەروا سوننەتیشە ئەو کەسانە تاق بن و لەو کاتەدا جلێك بدەن بەسەر قەبرەکەدا تا باش مردووەکەی تیا دائەمەزرێنن؛ بەڵێ بۆ ژنێ کە شووی هەبێ، مێردەکەی لە هەموو کەس چاکترە بۆ داهێشتنی بۆ ناوقەبر. جا ئەگەر قەبرەکە لادر بوو، لەسەر لای راست رای بکێشن و پاڵی بدەن بەوپەڕی ئەڵحەدەکەوە و پشتەکەی بە خشت یا بە بەرد قایم بکەن، ئەوجار چاڵەکەی لاپشتی پڕبکەنەوە، ئەگەر گۆڕیچەش بوو سەری جەنازەکە بە تەختە بەرد یا بە خشت یا بە دار بگرن، جا قەبرەکە بەسەر ئەوەدا پڕبکەنەوە، سوننەتیشە خشتێ بخەنە ژێر سەری و لەعاستی سەریا کفنەکەی لادەن؛ سوننەتە بۆ ئەو کەسەی لە قەراغی قەبرەکەدا بێ، سێ مشت خۆڵ لە خۆڵی قەبرەکە هەڵبگرێ و بەسەر یەکێکیانا، (مِنها خَلَقْناكُمْ) و بەسەر دووهەمیانا (وَ فيها نُعيدُكم) و بەسەر سێهەمیانا، (و منها نُخْرِجُكُمْ تارةً أُخرى) بخوێنێ و پاشان ئەو مشتە خۆڵانە بکاتە خوارەوە بۆلای سەری مردووەکە؛ هەروەها سوننەتە یەکێك مشتێ خاك هەڵبگرێ و حەوت جار (إِنّا أَنْزَلناهُ في ليلةِ القدرِ)ی تا ئاخر بەسەرا بخوێنێ و بیکا بەسەر کفنەکەیا، جا پاش ئەمە خۆڵ بکرێتە قەبرەکەوە تا پڕئەبێتەوە؛ سوننەتە قەبر ئەوەندەی بستێك بەرز بکرێتەوە، بەڵام بەرزییەکە تەخت بێ باشترە لەوە لەبنەوە پان و لەسەرەوە باریك بێ.

سوننەتە یەکێك لەوانە کە مردووەکە ئەخەنە ناو قەبرەوە، بڵێت: «بِسم اللّهِ و من اللّهِ و عَلى مِلَّةِ رسولِ اللّه». هەروەها، سوننەتە هیچ لەژێر مردوودا رانەخەن. کەراهەتی هەیە مردوو لە سندووقا بخەنە قەبرەوە، مەگەر خاکەکە نمدار و رووخەك بێ.

سوننەتە سەری قەبرەکە ئاوڕشێن بکرێ و دابکوترێتەوە و حەوت بەردی بچووك بەڕیز لەسەر قەبرەکە دابنرێ و لای سەریەوەکێلێکی بۆ داکوتن؛ ئەگەر بەردێکیش لای پێیەوە و بەردێکیش لە ناوەڕاستی قەبری پیاودا هەبێ، بۆ لێك جویَ کردنەوەی قەبری پیاو و ژن، ئەوە قەیدی نییە، هەندێ لە ئەهلی شەرع، ئەڵێن ئەمەیش بە قیاس لەسەر دانانی بەرد لای سەریەوە، سوننەتە.

سوننەتە لەپاش تەواوبوونی قەبرەکە، تەڵقینی مردوو بکرێ و تەڵقین خوێنەکە لای سەری قەبرەکەوە دانیشێ و پشت بکاتە قیبلە و رووبکاتە مردووەکە و بڵێت: «یا عبدَاللّهِ ابنِ أمةِ اللّهِ! أُذْكُرِ العهدَ الذي خَرجتَ عليه مِنَ الدنيا، شهادةَ أَن لا إلهَ إلا اللّهُ وحدهُ لا شريك له، و أَنَّ محمّداً رَّسولُ اللّهِ، و أَنَّ الجَّنةَ حقٌ و أَنَّ النّارَ حقٌ، و أنَّ البعثَ حقٌ، و أنّ السّاعةَ آتيةٌ لاريبَ فيها، و أنَّ اللّهَ يبعثُ مَن في القُبور، و إنَّكَ رضيتَ باللّهِ ربّاً و بالإسلامِ ديناً و بمحمّدٍﷺ نبيّاً و بالقرآنِ إماماً و بالكعبةِ قبلةً و بالمؤمنينَ إخواناً؛ ربِّيَ اللّهُ لا إلهَ إلاّ هوَ عليه توَكَّلْتُ و هو ربُّ العرشِ العظيمِ»، سوننەتیشە ئەمە تا سێجار تەکرار بکرێتەوە؛ سوننەتە لەکاتی تەڵقینا خەڵکەکە راوەستن و تەڵقینخوێنەکە دانیشێ [و] جا پاش ئەمە، سوننەتە هەموویان دوعای خۆڕاگرتن (تَثبیت)ی بۆ بکەن و بڵێن «اَللّهُمّ ثَبِّتْ لِسانَهُ على جوابِ المَلَكَيْنِ». سوننەتیشە ئەم کۆمەڵە کە دوعاکە ئەخوێنن چەند دەقیقەیەك بەسەر قەبرەکەوە راوەستن و پاشان بەجێیبێڵن.

## هەندێ لە ئادابی قەبر

سوننەتە قەبرستانی هەر خێزانێك پێکەوە بێ. دروست نییە قەبر هەڵدرێتەوە مەگەر لەبەر ئەوە کەشتێکی زۆر بەقیمەتی تێکەوتبێ. هەروا دروست نییە هەڵیبدەنەوە و مردووەکە بگوێزنەوە مەگەر لەبەر ناچاری وەك ئەوەکە ئەو ئەرزەی تیا نێژراوە ئەرزی یەکێکی تر بێ و رازی نەبێ ئەو مردووەی تیا بنێژرێ. یا مردووەکە وەختی خۆی نەشۆرابێ و هێشتا نەگۆڕابێ، یا روو بە قیبلە نەنێژرابێ. دروست نییە مردوو بخرێتە ناو

قەبری کۆنەوە مەگەر مردووە پێشووەکە بەتەواوی رزیبێ و نیشانەی نەمابێ و ناودارێکی گەورەی ئیسلام نەبووبێ. دروست نییە دوو کەس لە یەك قەبرا بنێژرێن، مەگەر لەبەر ناچاری، ئەوسا کامیان گەورەترە، ئەوەیان ئەخرێتە پێشەوە. ناشتنی مردوو لە قەبرستانی عومومیدا باشترە تا لە خانوودا، مەگەر لەبەر مەسڵەحەتێکی شەرعی. دروست نییە بینای قەبر چ لەناویەوە و چ بەسەریەوە، مادام لە قەبرستانی عومومیدا بێ، چونکە ئەوە ئەبێ بەهۆی داگرتنی خاکی وەقف کراو، بەڵام بینای قەبر لە موڵکی خاوەنەکەیا، چ لەناو قەبرەکەوە و چ بەسەریەوە، دروستە لەبەر ناچاری، وەك نەرمیی خاکی قەبرەکە و لە ترسی هەڵدانەوەی لەلایەن درندە و دوژمنەوە، یا لەترسی لافاو، لەم حاڵانەدا نەك هەر دروستە، بەڵکوو واجبیشە، ئەگەر سەبەبێکیوا نەبوو، مەکرووهە؛ بەڵێ، هەندێ لە زانایان، و توویانە: دروستە بیناکردنی ناوی قەبر لە خاکی وەقفکراوا و هەڵبەستن و قایم کردنی چوار دەورەکەی ئەوەندەی پێویست بێ لەترسی لافاو و درندە، بۆ ئەوەکە خەڵك دەست لە قەبرەکە نەدەن و هەڵی نەدەنەوە، بەو شەرتە ئەوەندەی ناچارییەکە بێ.

حەرامە دانیشتن لەسەر قەبر و هەنگاودانان لەسەری؛ هەروەها، حەرامە مەجال بدرێ گاگەل و ئاژەڵ بەسەریا بڕۆن، بەڵام ئەگەر ناچار بوون هاتوچۆی بەسەرا بکەن بۆ هەڵکەندنی قەبر بۆ مردوویەك، یا بۆ زیارەتی قەبری کەس‌وکار، ئەوە دروستە.

دروستە بۆ کەس‌وکاری مردوو و بۆ دۆست و برادەری، رووی ماچ بکەن. دروستە ئاگاردار کردن لە مردنی کەسێك بۆ ئەوەی خەڵك بێن بۆسەر جەنازەکەی، بەڵام بانگەواز و هەڵدان و لاواندنەوەی بە شێوەی زەمانی جاهیلیەت و باس‌کردنی گەورەیی و شان و شکۆی مردووەکە، حەرامە. گریان بەسەر مردوودا دروستە، چ بەر لەوەی گیانی دەرچێ و چ پاش گیان دەرچوونی، بەو شەرتە لەگەڵ هاوارکردنو لەسنگدانو باس‌کردنی رەوشتە بەرزەکانی نەبێ؛ یەخەدادڕین و مووبڕین و بەرگی رەش لەبەرکردن و گۆڕینی جل‌وبرگی عادەتییش، حەرامە [و] هەروەها[یشە] درێژەدان بە ماتەم لە سێ رۆژ زیاتر و تازەکردنەوەی ماتەم لە نۆجەژنی پاش مردنی مردووەکەدا و قوڕدان بەسەر یا بەشانا؛ پێویستە لەسەر موسوڵمان هەوڵبدا بۆ لابردنی ئەم گوناهانە.

## باسی تەعزییە

سوننەتە بۆ دراوسێی ئەو ماڵە کە مردوویان لێ مردووە، خواردنیان بۆ دروست بکەن لەو شەو و ڕۆژەداو هەوڵیان لەگەڵ بدەن بۆ خواردن؛ بەڵام حەرامە دروست کردنی خواردەمەنی بۆ ئەو ژنانە کە هاتوون بۆ گریان و هەڵدانی چاکەی مردووەکە.
سوننەتە تەعزییە لە موسوڵمان لە مسیبەتی مردنی خزمیا، موسوڵمان بێ یا کافر؛ هەروەها دروستە تەعزییە لە ئینسانی کافر، لە مردنی خزمی موسوڵمانی یا خزمی کافری «ئەهلی زیممە»یدا. سوننەتە ڕۆیشتن لەگەڵ جەنازەی گاور و جوولەکەدا، بەو شەرتە خاوەن جەنازەکە موسوڵمان بێ یا کافرێکی دراوسێ بێ، یا دۆستایەتی و مامەڵەی لەگەڵیا هەبێ.

حەرامە ئەهلی مردووەکە خواردن دروست بکەن بۆ خەڵك، مەگەر کابرای مردوو وەسیەتی کردبێ کە خواردن ئامادە بکەن بۆ ئەوانەی دێن بۆ تەعزییە، بەو شەرتە نەیوتبێ بۆ ئەو کەسانە کە ئەگرین و بە سەریا هەڵئەخوێنن. ڕێگایەکی تر هەیە بۆ دروستی خواردن دروست کردن بۆ خەڵك، ئەوەش ئەوەتە کەسێکی باڵغی عاقڵ لە میراتگرەکانی مردووەکە، لە ماڵی خۆی خواردنیان بۆ بکا، بەو شەرتەکە شەرم و حەیا ناچاری نەکردبێ بۆ ئەو مەسرەف کردنەو نەشبێ بەهۆی زیان گەیشتن بە میراتگری نابالغ لە ڕێگای بەکار هێنانی خانوو و قاپ و قاچاخ و فەرش و نوێنی بەشی ئەو میراتگرە نابالغەوە.

ڕێگایەکی تریش هەیە ئەوەیە ئەهلی ئەو شوێنە کە مردووەکەی تیا مردووە، بە دەسەوام لەبەینی خۆیانا بڕیار بدەن لە هەر ماڵێکا یەکێ مرد، ئەوانی تریان مەسرەفی میوانی ئەو ماڵە بدەن؛ ئیتر ئەمە وەك قەرزی لێ دێ و واجب ئەبێ؛ ئەم ڕێگەیەش هەر خەتەرە، لەبەر ئەوە کە لەوانەیە هەندێك لە خەڵکی ئەو شوێنە تازە هاتبن بۆ ئەوێ، یاخود پاش ماوەیەك کۆچ بکەن، یا لەبەر عەیب نەبێ ئەو مەسرەفە نەگرنە ئەستۆی خۆیان؛ کەواتە، مەسڵەحەتی شەرعی، ئەوەیە یا بە جارێ نانخواردنی کاتی تەعزییە

هەڵگیرێ لە ناوا، یاخود هەرکەس یا هەر کۆمەڵێ کە ئەڕۆن بۆ تەعزییە بۆ شوێنێك، پێش ڕۆیشتنی خۆیان، ئەوەندە رزق بنێرن بۆ ئەو شوێنە بەشی خواردنـی خـۆیـان بەتەواوی بکا، ئەم شێوەیە لە هەر شێوەیەکی تر ئـاسانتر و بـەجێتـرە. «مَـعَ العـلـم»، دانیشتنی کەس‌وکاری مردووەکە بۆ تەعزییە سوننەت نییە، بەڵام ئێستە بەجۆرێك‌بووە بە عادەت‌کە ئەگەر دانەنیشن، تووشی هەزار عەیب و شوورەیی ئەبن؛ کەواتە، چارە ئەوەیە کە بەیانمان کرد.

## زیارەتی قەبر

لەسەرەتای ئیسلامەتیدا، حەزرەتﷺ مەنعی زیارەتی قەبری کـرد، بـەڵام پـاش ماوەیەك ڕێگای داو فەرمووی: «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيٰارَةِ القُبورِ، أَلاٰ! فزوُروها فإنّها تُذَكِّرُ الآخِرَةَ»، یەعنی: «لەمەوپێش من مەنعی ئێوەم کردبوو لە زیارەتی قەبر، بـەڵام ئێستە قەیدی نییە، زیارەتی بکەن چونکە ڕۆژی قیامەتتان ئەخاتەوە بیر».

زیارەتی قەبر، چەند نەوعی هەیە:

یەکەم، بۆ بیرکردنەوەیە لە پاشەڕۆژ؛ ئەمە، تێکڕاییە بۆ هەموو مـوسوڵمـانان لە ناسراو و نەناسراو؛

دووهەم، بۆ سیلەی رەحمە؛ ئەمە تایبەتییە بۆ خزم و کەس‌وکار، بە تایبەتی، بـۆ باوك و دایك؛ لە حەدیسا هەیە «هەرکەس هەموو جومعەیەك زیارەتی قەبری باوك و دایکی یا یەکێکیان بکا، ئەوە وەك حەجێکی کردبێ وایە»؛

سێهەم، بۆ بەجێ‌هێنانی حەقی دۆستایەتی خزمەت و برایەتییە؛ ئەمەیش، بریتییە لە زیارەتی قەبری مامۆستاو برادەران و ئەو کەسانە کە حوقووقیان لەبـەینا هـەیە؛ لە حەدیسا هەیەکەوا: «ئەگەر دۆستێك زیارەتی قەبری دۆستێکی بکات، ئەو زیارەتە لای ئەو دۆستە مردووە خۆشەویسترە لە دنیاو هەرچی لەدنیادا هەیە»؛

چوارەم، بۆ بەرەکەت و پیرۆزییە؛ ئەمە بریتییە لە زیارەتی قەبری پێغەمبەران، بە تایبەتی حەزرەتی فەخری عالەمﷺ کە فەرموویەتی: «هەرکەسێ زیارەتم بکا، ئـەوە موستەحەقی شەفاعەتم ئەبێ».

سوننەت وایە زیارەت بە دەس‌نوێژەوە بێ و کە زیارەتکەرەکە گەیشتە ئەو شوێنە، سەلام بکا و بڵێت: «السّلامُ عَلیکُم دارَ قومٍ مُؤمنینِ! و إنّا إن‌شاءَاللّهُ بِکُم لاحِقون» و روو بەقیبلە راوەستێ دوعای خێرو داوای پایەی بەرز بکا بۆیان و لەخوایش بپاڕێتەوە بۆ دین و دنیای خۆی، چونکە مەقامی زاتی گەورە جێگای خرۆشی رەحمەتی خوایە و دوعا لەو شوێنانەدا نزیکە بە قەبووڵ. هەروا، زیارەتی ئەولیا و عالم و باقی ساڵحان، بەم تەرتیبە سوننەتە. سوننەتە زیارەتکەر چەندی بۆ رێبکەوێ، بە نیازی خێری مردووەکان، قورئان بخوێنێ و لەپاش تەواوکردنی خوێندنەکە، دوعایان بۆ بکا و سەوابی قورئانەکەیان بۆ بنێرێ، بڵێ: خوایە! میسلی سەوابی ئەم قورئانە کە خوێندم، بێگەیەنە بە رۆحی فلانی کوری فلان، بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانە کە گومانی ئەوە ببرێ لە وەختی خۆیا گوناهیان بووبێ؛ لە حەدیسی شەریفا هەیە: «مردوو زۆر چاوەروانی ئەوەن لەلایەن خزم و دۆست و باقی موسوڵمانانەوە خێریان بۆ بڕوا»؛ لە ئایەتیشدا، مەدحی ئەوانە کراوە کە دوعای لێبۆردن ئەکەن بۆ برایانی مردووی خۆیان و بۆ باوك و دایکیان و بۆ باقی موسوڵمانان. سوننەتە قورئان خوێندنی سەر مردوو، بەدانیشتنەوە و روو لە قیبلە بێ.

شەرتی زیارەت کردن، ئەوەیە بەشێوەی حەرام و خیلاف شەرع نەبێ؛ بە تایبەتی بۆ ژن زۆر پێویستە زیارەتەکەی یا لەگەڵ مەحرەما بێ، یا لەگەڵ چەند ژنێکی شەرم لێکراوا، بەجۆرێ کە نە خۆی تووشی روانینی حەرام ببێ و نە کەسیش بۆی‌بڕوانێ، ئەگینا، ئەو زیارەتە حەرامە. زیارەتی مردوو بۆ ژن پێویستە بە ئیزنی مێردەکەی بێ.

## باسی زەکات

زەکات، یەکێکە لە پێنج روکنەی ئیسلام و لە ساڵی دووهەمی هیجرەتدا فەرزکراوە لەپاش فەرزکردنی زەکاتی فیتر. زەکات، واجبە لەهەشت جۆر ماڵدا: نەختینە (ئاڵتوون و زیو)، وشتر، رەشەوڵاخ، مەڕ، بزن، خورما،ترێ، هەموو جۆرە قـووتێك؛ زەکـات ئەدرێ بە هەشت تاقم لە موسوڵمانان وەك بەیان ئەکرێن.

## زەکاتی نەقد (ئاڵتوون و زیو)

ئەو ئەندازە کە دانراوە بۆ واجببوونی زەکات لەم دوو نەقدەدا، لە زیوا دوو سەد درهەمە کە ئەکاتە سەدو چل مسقاڵ، لە ئاڵتوونیشا بیست مسقاڵە؛ کە ئاڵتوون و زیو گەیشتن بەم ئەندازە، «رُبعُ العَشر»، چل یەکیان لێ ئەکەوێ. هەر نەقدێکی ئاڵتوون یا زیو کە مەغشووش بێ، یەعنی مەعدەنێکی تری تێکەڵ بێ، ئەگەر نەقدە سافەکەی گەیشتە ئەندازەی پێشوو، ئەوە زەکاتی ئەکەوێ، ئەگینا زەکاتی ناکەوێ. ئەگەر شووشێك یا قاپێك دارژابوو لەم دوو نەقدە، ئەوە ئەگەر ئەمانزانی کەم‌و زۆرییان چۆنە، ئەوە دیارە، ئەگەر نەمانئەزانی، ئەوە لە هەردوو لایانا ئیعتیباری لای زۆر ئەکەین‌و بەو حـیسابە زەکاتی ئەدەین، یاخود ئەی توێنینەوە بۆ ئەوە کە لەیەك جیا بکرێنەوە و ئەندازەیان دەربکەوێ. هەر خشڵێکی ئاڵتوون و زیو کە حەڵاڵ بێ بۆ خاوەنەکەی بەکاری بهێنێ، زەکاتی نییە، وەکوو هەموو خشڵی ژنانە بۆ ژن؛ ئەگەر حەرامیش بوو بەکاری بهێنێ، زەکاتی لەسەرە، وەك قاپ و قاچاخی ئاڵتوون و زیو بۆ بەکارهێنانی پیاو بێ یا ژن، یا وەکوو بازن و پشتێن و پاوانە بۆ پیاو، یا وەك رەختی ئەسپ و دانلەغاوی وڵاخ بـۆ هەرکەس بێ. راستتر ئەوەیە زیادەڕەوی کردن لە خشڵا بۆ ژن حەرامە، وەکوو بازنێك کە سەنگەکەی دوو سەد مسقاڵ بێ؛ ئەگەرگەیشتە ئەو رادەیە زەکات لەهەموویا واجب ئەبێ.

شەرتی واجببوونی زەکات لە ئاڵتوون و زیوی بـەڕادەی زەکـات گـەیشتوودا، ئەوەیە لە موڵکی خاوەنەکەیا ساڵی بەسەرا بێتەوە؛ کەواتە، ئەگەر ئەو ئەندازە ئاڵتوون و

زیوە تا شەش مانگ هەڵگیرا و پاشان درا بە قەرز، ئەوە لەپاش تەواوبوونی شەش مانگی‌تر، واجبە خاوەنەکەی زەکاتی لێبدا بەو شەرتە قەرزەکەی دەس بکەوێتەوە، یاخود خاوەن پارەکە خۆی دەوڵەمەند بێ، ئەگینا پێویستە ئەو قەرزەی دەسگیر ببێتەوە، ئەوسا زەکاتی لێدەرئەکرێ.

**بزانن!** جەواهیراتی وەك دوڕ و یاقوت و ئەڵماس و پیرۆزە و شتیوا، زەکاتی لێ ناکەوێ.

## زەکاتی کان (مَعْدن)

هەرکەس لە موڵکی تایبەتی خۆیا، یا لە وێرانەیەکا، کانێکی ئاڵتوون یا زیوی دۆزییەوە و ئاڵتوون و زێوی لێ دەرکرد، واجبە لەسەری چل‌یەکی بدا لە زەکاتا؛ لە فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعیدا، ئەڵێت: ئەبێ پێنج‌یەکی بدا؛ لە فەرموودەیەکی‌تریشیا، ئەڵێت: ئەگەر بەزەحمەت بۆی دەرکرا، چل‌یەکی ئەدا، ئەگەر بەئاسانیش بۆی دەرکرا پێنج‌یەکی ئەدا.

شەرتی واجب بوونی زەکات لەو ئاڵتوون و زیوەدا کە لە کان دەرئەکرێ، ئەوەیە بگاتە رادەی زەکات وەك بەیانمان کرد، ئیتر واجب نییە ساڵی بەسەرا بێتەوە؛ ئەو ئاڵتوون و زیوەی لە کان دەرئەکرێ، هەمووی ئەخرێتە پاڵ‌یەك و زەکاتی هەمووی دەرئەکرێ، مادام ئیش‌کردن لەو کانەدا بەیەکەوە و یەك لەشوێنی یەك بێ هەرچەند ئەو نەقدەی لەو کانە دەر ئەهێنرێ، پوختەکەی یەکسەر دەس نەکەوێ، وەك ئەوە کە سەد تەن خاکی لەسەر یەك دەرکردبێ، بەڵام ئێستە دە تەن و ماوەیەکی‌تر دە تەنی‌تر و پاشان دە تەنی‌تر پاك بکاتەوە و هەر بەم تەرتیبە ئەمە هەمووی وەك ئەوەیە نەقدە پوختەکەی بە جارێ وەرگرتبێ؛ هەروەهایە حوکمی ئەوەش کە ئیشەکەی پچڕپچڕ بووبێ لەبەر عوزرێك، وەك ناساغی یا نەبوونی کەرەستەی ئیش یادەس نەکەوتنی کرێکار، بەڵام ئەگەر بە بێ‌عوزر ئیشەکەی ببڕێ، ئەوە بەشی یەکەمی نادرێتە دەم بەشی دووهەمی لە پێویست‌بوونی زەکات لێ‌دانا، بەڵام بەشی دووهەم ئەدرێتە دەم یەکەم؛ بە میسال،

ئەگەر لە مانگی شەشەڵان (شَوّال)دا پێنج مسقاڵ ئاڵتوونی دەرکرد، ئەوجا ئیشی وەستاند و لە مانگی قوربانا کەوتەوە ئیش و پازدە مسقاڵی تری دەرکرد، ئەوە پێنج مسقاڵەکەی مانگی شەشەڵان زەکاتی لێ دەرناکرێ، بەڵام پازدە مسقاڵەکەی مانگی قوربان ئەخرێتە سەر پێنج مسقاڵەکەی مانگی شەشەڵان بۆ گەیشتنە رادەی زەکات واجب بوون و زەکات لەبەشی تەنها ئەو پازدە مسقاڵە دەرئەکرێت.

## زەکاتی ئاڵتوون و زیوی شاراوەی کۆن

هەرگەنجینەیەکی کۆن دۆزرایەوە، ئەگەر ئەوگەنجینەیە ئیسلامی بوو، یەعنی ناوی پادشایەکی ئیسلامی لەسەر بوو، ئەوە ئەگەر ئەزانرا خاوەنەکەی کێیە، ئەیدرێتەوە، ئەگەر نەشئەزانرا کێیە، حوکمی «لُقطَة» (ماڵی دۆزراوە)ی هەیە و لەبارەی بانگەواز و ناوونیشان هەڵدان و شتیواوە، حوکمی ئەوی بەسەرا ئەدرێ؛ هەروایە حوکمی گەنجینەیەکیش کە نەزانرێ هی زەمانی ئیسلامە یا هی پێش ئیسلامە، ئەگەرگەنجینەکە هی سەردەمی پێش ئیسلام بوو، ئەوە ئەبێ بە هی ئەوکەسەکە دۆزیویەتەوە، ئەگەر لە وێرانەی بێ‌خاوەن یا لە موڵکێکی وەهادا دۆزیبێتیەوە کە خۆی ئاوەدانی کردبێتەوە؛ ئەگەر لە خاکی مزگەوت یا لەشەقامی گشتیدا دۆزییەوە، ئەوە بەماڵی دۆزراوە دائەنرێ؛ ئەگەر لە موڵکی کەسێکیشا دۆزییەوە، ئەوە هی ئەوکەسەیە، مادام داوای بکاو بڵێ هی منە؛ ئەگەر داواشی نەکرد، ئەوەهی ئەوکەسەیەکە موڵکەکەی لێ وەرگیراوە، هەروەها تا ئەگاتە سەر ئەوکەسەی ئەو شوێنەی لە ئەساسا ئاوەدان کردووەتەوە. ئەگەر خانووکڕ و خانووفرۆش، یاخانوو بەکرێدەر و خانوو بەکرێگر لەسەر ئەو گەنجینەیە بوو بە هەرایان، ئەوە باوەڕ بەو کەسە ئەکرێ کە خانووەکەی بەدەستەوەیە. ئەم گەنجینە دۆزراوەیە، بۆ هەرکەس ساغ بووەوە، پێنج یەکی جیا ئەکرێتەوە و ئەدرێ بەزەکاتا، بەو شەرتەکە بگاتە رادەی زەکات واجب بوون و نەقدیش بێ؛ ئیتر ساڵبەسەرا هاتنەوەی پێویست نییە.

## زەکاتی ماڵی بازرگانی

شەرتی زەکات لە ماڵی بازرگانیدا، چەندشتە؛

**یەکەم**، ئەوەیە ئەو ماڵە بە «مُعاوضَه» (ئاڵوویڵ) یا لە تۆڵەی شتێکا وەرگیرابێ[1]، نەك بەشێوەی بەخشین یا بە میرات یا وەسیەت دەستی کەسێك کەوتبێ؛ کەواتە، ئەو ماڵی بازرگانییەی کە بە میرات هاتووەتەوە بۆ کەسێك، ساڵەکەی ئەپچڕێ‌و لەو کاتەوە ساڵی تازەی دەس پێ‌ئەکاکە میراتگرەکە بە نیازی بازرگانی پێوەکردن دەستی تێ ئەخا؛

**دووهەم**، راگرتنی ئەو ماڵەیە بەنیازی بازرگانی؛ کەواتە، زەکات نییە لە ماڵێکا ئینسان بۆ پێویستی خۆی و خێزان و ماڵی رایگرتبێ؛

**سێهەم**، ئەوەیە دوانزە مانگی لەسەر یەکی بەسەرا تێپەڕ بووبێ لەوکاتەوەکە نیازی بازرگانی پێوەکردنی کراوە؛ بەڵێ، ئەگەر هەموو ئەو ماڵی بازرگانییە لە ناوقەدی ساڵا گۆڕراوە بە ماڵی‌تری بازرگانی، یاخود هەندێکی گۆڕراوە بە نەخت، ئەوە ساڵی بازرگانییەکەی دەوام ئەکا، هەروەها ئەگەر هەمووی گۆڕراوە بە نەخت و ئەو نەختەش گەیشتە رادەی زەکات‌لێ واجب بوون، ئەوە هەر لەسەر ساڵی ماڵی بازرگانییەکەوە ساڵی بۆ ئەژمێررێ، بەڵام ئەگەر هەمووی گۆڕراوە بە نەخت‌و نەختەکەیش نەئەگەیشتە رادەی زەکات لێ واجب بوون، ئەوە ساڵی ماڵی بازرگانییەکە ئەبڕێتەوە، جا ئەگەر نەختی‌تری هەبوو کە بگاتە رادەی زەکات، ئەوە ئەم نەختەیشی لەگەڵدا ئەژمێرری و ساڵەکەی ئەوی بۆ دائەنرێ؛ ئەگەر بەم نەختە کە لەرادەی زەکات کەمترە، ماڵی بازرگانی تازەی کڕی، ئەوە لەوکاتی موعامەلەوە ساڵی بۆ دائەنرێ؛

**چوارەم**، ئەوەیە کە لە ئاخری ساڵا ئەو ماڵە بگاتە رادەی زەکات بەحیسابی ئەو پارەیەی کە پێی کڕراوە، ئەگەر قیمەتەکەی کەمتر بوو، ئەو ساڵەی بەتاڵ ئەبێتەوە و سەرلەنوێ ساڵی تازە دائەنرێ بۆ بازرگانییەکەی؛ بەڵێ، ئەگەر پارەی نەختی‌تری هەبوو گەیشتبووە رادەی زەکات، ئەوە قیمەتی ماڵی بازرگانییەکەی ئەدرێتە پاڵ ئەو پارەیە و زەکاتی هەمووی دەرئەکرێ.

---

۱. وەك پارەی مارەیی ژن و حەقی خولع و پارەی لەجیاتی خوێن وەرگیراو.

**بزانن!** ساڵی ماڵیی بازرگانی، بەو شەرتە لە کاتی کڕینی ئەو ماڵەوە حیساب ئەکرێ کە ئەو پارەیەی پێی کڕراوە کەمتر بێ لەڕادەی زەکات، یاخود بە پارەی نەخت نەکڕرابێ؛ ئەگەر بەپارەیەکی نەختی واکڕیبێتی کەگەیشتبێتە رادەی زەکات، ئەوە ساڵی لەو کاتەوە بۆ ئەژمێررێ کە بووە بە خاوەنی ئەو پارە نەختە.

هەر قازانجێ لە ماڵی بازرگانی پەیدا ببێ، بە هەر هۆیەکەوە بێ، لەگەڵ ماڵی بازرگانییەکەدا زەکاتی ئەدرێ، بەڵام ئەگەر قازانجەکەی نەخت بوو لەو نەختەی کە ماڵی بازرگانییەکەی پێ کڕیوە و بەو نەختە ماڵی بازرگانی کڕی، یاخود هەر بە نەختی هەڵیگرت، ئەوە ساڵی تازەیان بۆ دائەنرێ.

فەرموودەی راستتر، ئەوەیە کە بەچکەی حەیوانی ماڵی بازرگانی و بەری باخێك کە بۆ بازرگانی کڕرابێ، هەر بە ماڵی بازرگانی دائەنرێ و ساڵەکەیشی ساڵی ئەسڵەکەیەتی.
هەرکەس بازرگانی بە خانووەوە بکات، ئەو خانوانەی بە ماڵی بازرگانی دائەنرێن، بەڵام ئەگەر خانوو بۆ ئەوە بکڕێ کە بیدا بەکرێ، ئەوە پارەی کرێ خانووەکان زەکاتی ئەکەوێ بەپێی شەرتەکانی زەکاتی پارە.

واجبی زەکاتی ماڵی بازرگانی، چل یەکە؛ جا ئەگەر ئەو ماڵە بە نەخت کڕرابێ، ئەوە لە ئاخری ساڵیا قیمەتی دائەنرێ بەونەختە کە پێی کڕراوە و بەوحیسابە زەکاتی لێ ئەدرێ، ئەگەر بە جینسیش کڕرابوو، ئەوە قیمەتی دائەنرێ بەونەختە کە لەو وڵاتەدا زۆر بەکاردێت، ئەگەر لەو وڵاتەدا دوو نەخت وەك یەك خەرج ئەکران، ورد ئەبینەوە ئەگەر ئەم ماڵی بازرگانییە لە هەردوو نەختەکە ئەگەیشتە رادەی زەکات، ئەوە بەویانە قیمەتی دائەنرێ کە قازانجی زۆرتر بێ بۆ فەقیرو هەژار و بەوپێیە زەکاتی لێ ئەدرێ، ئەگەر هەر بە یەکێکیان ئەگەیشتە رادەی زەکات، ئەوە تەنها بە حیسابی ئەویانە قیمەتی دائەنرێ. ئەگەر نیوەی ماڵی بازرگانییە کە بە نەخت و نیوەکەی تری بە کەل و پەل کڕرابو، نیوەی یەکەمی بە عەینی ئەو نەختە و نیوەی دووهەمی بە نەختی غاڵبی ئەو وڵاتە قیمەتی دائەنرێ.

ئەگەر ماڵی بازرگانی حەیوانی زەکات بوو، لەمسوورەتەدا، ئەگەر بەپێی ژمارەی حەیوان ئەگەیشتە رادەی زەکات، بەڵام بە قیمەت نەئەگەیشت، یا بە پێچەوانەوە، ئەوە

بەوبارەیانا زەکاتی لێ ئەدرێ کە پێی ئەگاتە رادەی زەکات، ئەگەر بە هەردوو بارەکەیانا ئەگەیشتە رادەی زەکات، مەسەلا، بە ژمارە، حەیوانەکان چل سەر یا زیاتر بن و قیمەتیشیان دوو سەد درهەم بوو، ئەوە بەپێی سەری حەیوانەکان زەکاتی لێ دەرئەکرێ؛ بینا لەسەر ئەمە، ئەگەر ساڵی بازرگانی پێش کەوت، مەسەلا، شەش مانگ ماڵی بازرگانی بەدەستەوە بوو، ئەوسا گۆڕییەوە بە چل سەر مەڕ، ئەوە لەمسوورەتەدا، بۆ یەکەمساڵ ساڵی بازرگانی تەماشا ئەکرێ و لەپاش شەش مانگیتر، زەکاتیان بە پێی ماڵی بازرگانی لێ دەرئەکرێ، پاش ئەوە، ساڵی تازە دائەمەزرێ بۆ حەیوانەکان و بەوجۆرە ئەڕوا.

لە ماڵی قازانج بەشەراکەتا، لەبەر ئەوە کە راستتر ئەوەیە کابرای کاسب هەر بە دەرکەوتنی قازانجی پارەکە ئەبێ بە خاوەنی بەشە قازانجی خۆی، واجبە لەسەر خاوەن پارەکە زەکاتی سەرمایە و بەشە قازانجی خۆی بدا و کابرای کاسبیش زەکاتی بەشە قازانجی خۆی دەرکا.

## ئەمە، چەند مەسئەلەیەکە:

(یەکەم)، ئەو کەسانە کە پیشەیان سەڕڕافییە، یەعنی ئاڵوگۆڕی پارە ئەکەن بە پارەیتر، زەکاتیان لەسەر نییە بەرامبەر بەو ئەندازە پارە کە ئاڵوگۆڕی پێ ئەکەن، چونکە ئەگەر تەماشای عەین بکەین، ئەو عەینەیان لانامێنێ تا ساڵی بەسەرا بێتەوە، ئەگەر تەماشای وەزعی بازرگانییش بکەین، بازرگانی لە نەختی ئاڵتوون و زیوا نایابە وەك لە «تُحفة»دا بەیان کراوە؛ بەڵێ، ئەو ئەندازە پارەیە کە لە ماڵەوە دایناوە و زیادە لە ئەندازەی پارەی ئاڵوگۆڕ، ئەوە زەکاتی لێ ئەدرێ.

(دووهەم)، سەنگی مسقاڵ، حەفتا و دوو دەنکە جۆیە کە لە هەر دوو سەرەوە ئەوەی باریك و درێژە، قرتابێ، بەڵام توێکڵی لێ نەکرابێتەوە؛ سەنگی مسقاڵ، نە پێش ئیسلام و نەپاش ئیسلام، نەگۆڕاوە، بەڵام سەنگی درهەم گەلێ جار گۆڕاوە و ئێستا، بڕیار لەسەر ئەوەیە کە سەنگەکەی پەنجاودوو دەنکە جۆ و دوو پێنج یەکی دەنکێکە؛ کەواتە، دە درهەم، ئەکاتە حەوت مسقاڵ.

(سێهەم)، هەرچەند قسەی باوەڕ پێکراوتر ئەوەیە ئەبێ لە زەکاتی ئاڵتوونا، ئاڵتوون و لە زەکاتی زیوا، زیو بدرێ، بەڵام گەلێ زانای گەورە فتوایان داوە دروستە زیو لە زەکاتی ئاڵتوونا و ئاڵتوون لە زەکاتی زیوا بدرێ، بەڵکوو ئیمامی «بُلقيني» فەرموویەتی: دروستە فلسی سوور لە زەکاتی ئاڵتوون و زیوا بدرێ؛ لەسەر ئەم ئەساسە، دروستە دیناری کاغەز لە زەکاتی ئاڵتوون و زیوا بدرێ؛ زانایانی ئیسلام، ئەمڕۆ، بڕیاریان لەسەر ئەوەیە کە زەکات واجبە لە کاغەزی دینار و تمەناکە بە ڕەواجی ئاڵتوون و زیو خەرج ئەکرێن، جا هەندێ لەم زانایانە دایاننناوە ئەم کاغەزە ماڵی بازرگانییە، هەندێکی تریشیان دایانناوە لەبریتی ئەو پارە نەختینەیە کە لە سندووقی حوکوومەتا دانراوە، کۆمەڵێکی تریشیان ئەفەرموون: مادام پارەی کاغەزیش وەك ئاڵتوون و زیو دەفعی ئیحتیاجی ئادەمیزاد ئەکا و کاری پێ ئاسان ئەبێ، لە حوکمی ئەواندایە و وەك ئەوان زەکاتی تێدا فەرزە؛ ئەمە، قسەیەکی موافیقی ئوسووڵی شەریعەت و ڕۆحی ئایینی ئیسلامە؛ کەسێ بڵێت: ئەم عالمانە کە ئەم فتوایەیان داوە، موجتەهید نین و حەقی فتوای وایان نییە، ئێمە لە وەڵامیانا، ئەڵێین: هەرچەند ئەوان لە هەموو مەسئەلەیەکدا موجتەهید نەبن، بەڵام لەم مەسئەلەیەدا پایەی ئیجتیهادیان هەیە، چونکە شتەکە ئەوەندە ڕۆشنە پێویستی بە لێکوڵینەوە نییە و وەك ئەوە وایە ئەمڕۆ جۆرە شەرابێکی سەرخۆشکەری تازە دروست بکرێ کە لەمەوپێش ناوی نەبووبێ و ئێمە، بڵێین: حەرامە چونکە ئینسان سەرخۆش ئەکا.

زەکات واجبە لە ماڵی منداڵ و شێتدا و واجبە لەسەر چاودێریکەریان زەکاتەکەی لێ دەرکا. هەروەها واجبە لەماڵێکا کە ون بووبێ، یا بە زۆر داگیرکرابێ، بەڵام واجب نییە لەسەر خاوەنەکەی زەکاتەکەی لێ دەربکا تا ماڵەکەی دەس ئەکەوێتەوە، جاکە دەستی کەوتەوە، زەکاتی هەموو ساڵەکانی لێ دەرئەکا، تا ئەگاتە ڕادەیەك کە کەمتر ببێتەوە لەوە کە زەکاتی تیا واجب بێ.

ئەگەر کەسێك قەرزی لەسەر یەکێك بوو، ئەوە ئەگەر ئەو قەرزە حەیوانێك بوو زەکاتی لێ بکەوێ، ئەوە زەکاتی لێنادرێ، چونکە شەرتی زەکاتی حەیوان ئەوەیە لە

ئیدارەی خاوەنەکەیا بلەوەڕێ؛ ئەگەر ماڵی بازرگانییش بێ، یا پارەی نەخت بێ، ئەوە ئەگەر قەرزەکەی وادەی هاتبێ و مومکین بێ وەری‌بگرێتەوە، بەڵام بەئارەزوو وەری نەگرێتەوە، ئەوە واجبە لە هەموو ساڵێکا زەکاتی دەس‌بەجێ زەکاتی دەربکا، ئەگەر مومکینیش نەئەبوو لە قەرزارەکەی وەربگرێتەوە، لەبەر ئەوە کە لات بوو یا وادەی قەرزەکە نەهاتبوو، ئەوە ئەو قەرزە وەك ماڵی داگیرکراو وایە، هەروەختێ دەستی کەوتەوە زەکاتی دەرئەکا بۆ هەموو ساڵەکان، مادام بە دەرکردنی زەکاتی ساڵێ یا زیاتر، لە ئەندازەی زەکات نەیەتە خوارەوە، ئەگینا تەنها زەکاتی ئەو ساڵە یا ئەو ساڵانەی لێ‌دەرئەکاکە لە رادەی زەکات کەمی نەکردووە؛ «بۆ وێنە»، ئەگەر ژنێك بیست مسقاڵ ئاڵتوونی مارەیی لەسەر مێردەکەی بوو و تا دە ساڵ نەیدایەوە، هەرکاتێك کە پێی دایەوە، تەنها نیو مسقاڵی ئەدا بە زەکاتی ساڵێکا، ئیتر زەکاتی ساڵەکانی‌تری لەسەر نابێ، چونکە بەو نیو مسقاڵە کە بۆ یەکەم ساڵ داویە بەزەکاتا، لە رادەی زەکات لێ‌کەوتن کەمتر بووەتەوە؛ ئەمە، بەو شەرتەکە ژنەکە پارەی دانراوی‌تری نەبێ، ئەگینا لەگەڵ ئەو پارەیەدا بۆی حیساب ئەکرێ و تا تێکڕای ماڵەکەی لە رادەی زەکات کەم ئەبێتەوە، هەر زەکاتی لێ دەرئەکرێ.

ئەگەر کەسێك ئەوەندە پارەی نەخت یا ماڵی بازرگانی هەبوو ئەگەیشتە رادەی زەکات، بەڵام لە هەمان‌کاتا قەرزاریش بوو، ئەگەر کابرا ماڵی‌تری هەبوو قەرزەکەی لێ بداتەوە، ئەوە واجبە لە هەموو ساڵێکا زەکاتی ئەم پارەنەختە یا ئەم ماڵی بازرگانییە بدا کە وابەدەستیەوە، ئەگەر لە غەیری ئەوەکە وابەدەستیەوە ماڵی‌تری نەبوو، ئەمجار ئەگەر قەرزەکەی نیوەی ماڵەکەی ئەگرتەوە، ئەوە واجبە زەکاتی ئەو ماڵەی دەربکاکە قەرز لە بەرامبەریەوە نییە، بەڵام بۆ ئەو نیوەکەی کە قەرز ئەیگرێتەوە، یا بۆ ئەو سوورەتە کە قەرز هەموو ماڵەکەی بگرێتەوە، بەوڕەنگە کە ئەم ماڵی بازرگانییەی کەوابەدەستیەوە، هەمووی لەسەر باوەڕ و متمانە پێی درابێ تاکاسبی پێوە بکا و خۆی پێ‌بژێنێ و وردە وردە پارەی خاوەن پارەکەش بداتەوە، ئەوە ئیمامی شافیعی سێ فەرموودەی بۆ ئەم حاڵەتانە هەیە: یەکەم، ـکە فەرموودەی زۆر بەهێزیەتی ـ ئەڵێ: واجبە لەسەری

زەکاتەکەی لێ دەربکا، چونکە پارەیەکی بەدەستەوەیە و قازانجی لێ دەسگیر ئەبێ؛ دووهەم، ئەوەیە زەکاتی لەسەر نییە چونکە پارەی خۆی نییە و هەر کـاتێك خـاوەن قەرزەکە بیەوێ لێی ئەسێنێتەوە؛ سێهەم، ئەوەیە ئەگەر ئەو ماڵەی بەدەستیەوەیە و قەرز ئەیگرێتەوە، ماڵێکی دیاری بێ، وەك حەیوان، ئەوە ئەبێ زەکاتی لێ بدا تـا رسـوای بەرچاوی عالەم نەبێ و نەڵێن زەکات نادا، ئەگەر ماڵێکی نادیاریش بوو، وەك کەلوپەلی بازرگانی، ئەوە واجب نییە زەکاتی لێ بدا، چونکە قەرز بە راسەریەوەیە و ماڵەکەیش لای خۆیەتی هەمووکەس پێی‌نازانێ؛ کـەواتـە، ئـەوەی بـیەوێ دوور بـێ لە هـەموو گومانێك، با بە فەرموودەی یەکەم زەکاتی هەموو ماڵەکەی دەربکـا، ئـەگـەر لەبـەر بێدەسەڵاتی یا لەبەر هۆیەکی‌تر پێی‌نەکرا زەکاتی بدا، ئەوە با تەقلیدی فەرموودەی دووهەم بکا تا کردەوەکەی شەرعی بێ.

## باسی زەکاتی حەیوان

زەکات لە حەیوانا نییە لە وشتر وگا و مەڕ و بزنا نەبێ. لای کەمی ژمارەی وشتر کە زەکاتی تیا واجب بێ، پێنج سەرە، کە گەیشتە پێنج سەر، کاوڕێك ئەدرێ لە زەکاتیانا، کە گەیشتیشە دەسەر، دوو کاوڕ ئەدرێ، لە پانزە سەریشا، سێ کاوڕ و لە بیست سەرا، چوار کاوڕ و لە بیست و پێنج سەرا، وشترێکی مێی یەك ساڵە ئەدرێ، لە سی‌وشەش سەرا، وشترێکی مێی دوو ساڵە و لە چل‌و شەش سەرا، وشترێکـی مـێی سـێ سـاڵە ئەدرێ، کە گەیشتیشە شەستو یەك سەر، وشترێکی مێی چـوار سـاڵەو کـە گـەیشتە حەفتاو شەش سەر، دوو وشتری مێی یەك ساڵە ئـەدرێ، لە نـەوەدویەك سـەرا، دوو وشتری مێی سێ ساڵە و لە سەدو بیست و یەك سەرا، سێ وشتری مـێی یـەك سـاڵە ئەدرێ، کە لەم‌ئەندازەیە تێپەڕی، یا چل چل حیساب ئەکرێ و لە هەر چل سەرێکا، وشترێکی مێی یەك ساڵە ئەدرێ، یا پەنجا پەنجا حیساب ئەکـرێ و لە هـەر پـەنجا سەرێکا، وشترێکی مێی سێ ساڵە ئەدرێ.

**بزانن!** ئەم کاوڕە کە باسمان کرد، ئەبێ ساڵێکـی تـەواو کـردبێ؛ خـاوەن‌ماڵ بـە ئارەزووی خۆیەتی یا ئەو کاوڕە یەك ساڵانە بدا، یا چتیر بزنێکی دوو ساڵانەی نێر یا

مێ بدا، دروستیشه لەباتی ئەم کاوڕ یا چتیره، وشترێکی یەكساڵانه یا گەورەتر بدا؛ ئەگەر خاوەن وشترەکە وشتری مێی یەك ساڵانەی نەبوو بیدا لە زەکاتی بیستو پێنج سەرەکەدا، ئەتوانێ لە جیاتی ئەوە وشترێکی نێری دوو ساڵانە بدا و داوای یەك ساڵەی مێچکەی زۆر باشی لێناکرێ؛ بەڵام ئەگەر یەك ساڵەیەکی نایابی هەبوو، نابێ لەوەلادا و لەباتی ئەوە وشترێکی نێری دو و ساڵانە بدا؛ دروستە نێری سێ ساڵانە بدرێ لە باتی وشتری مێچکەی یەك ساڵانە، بەڵام لەباتی مێچکەی دوو ساڵانە نادرێ. ئەگەر لە وشتری خاوەن ماڵێکا دوو فەرز رێکەوت، مەسەلا، کابرا دووسەد وشتری هەبوو کە ئەتوانێ یا پێنج وشتری مێچکەی یەك ساڵانە بدا بە زەکاتیانا، یا چوار وشتری مێچکەی سێساڵانە، ئەوە ئەگەر هەردووکیان لای خاوەن ماڵەکە دەس ئەکەوتن، پێویستە کامیان قازانجی زۆرترە بۆ موستەحەقی زەکات، ئەوەیان بدات، ئەگەر هەر یەکێکیانی هەبوو، بیدا بە خاوەن حەق، ئەگەر هیچکامیانی نەبوو، ئەوە ئارەزووی خۆیەتی هەرکامیان پەیدا بکاو بیدا بە زەکاتا؛ لەو سوورەتەدا کە واجب بێ چی باشتر بێ بۆ خاوەن حەق، ئەوە بدا، ئەگەر هاتو شتێکی دا لە زەکاتا کە باشتر نەبوو، ورد ئەبێتەوە ئەگەر ئەمە بە بێ کەمتەرخەمی «ساعی» و بە بێ فڕوفێڵی خاوەنماڵ بوو، ئەوە زەکات دانەکەی دائەمەزرێ. ئەگینا دانامەزرێ و پێویستە چی باشترە ئەوە بدا؛ لە سوورەتێکیشا کە خاوەنماڵ ناباشەکەی دا بە زەکاتاو بڕیارمان دا زەکات دانەکەی دامەزراوە، ئەوە پێویستە ئەندازەی فەرقی بەینی باشەکە و ناباشەکە بکا بە پارە و بیدا بە کابرای موستەحەق کە زەکاتەکەی وەرگرتووە.

ئەگەر یەکێك واجبی ئەوەبوو وشترێکی مێچکەی یەك ساڵانە بدا و نەیبوو، بەڵام وشتری مێچکەی دوو ساڵانەی هەبوو، ئەوە ئەو دوو ساڵانەیە بداو دوو کاوڕ یا بیست درهەم لە کابرای زەکات وەرگر وەرگرێ بۆ خۆی؛ ئەگەر واجبیشی ئەوەبوو وشترێکی مێچکەی دوو ساڵانە بدا، بەڵام نەیبوو، ئەوە وشترێکی مێچکەی یەك ساڵانە بدا لەگەڵ دوو کاوڕ یا بیست درهەما، یاخود وشترێکی مێچکەی سێ ساڵان بدا و دوو کاوڕ یا بیست درهەم وەربگرێ؛ مەسەلەی دانی دوو کاوڕەکە یا بیست درەمەکە، بە ئارەزووی

ئەو کەسە خۆیەتی کە ئەیدا، بەڵام مەسەلەی سەرکەوتن بە سەر دەرەجەی ئەوەدا کە واجبە بدرێ، یا داپەڕین لێیەوە بۆ دەرجەیەکی نزمتر، بەدەست خاوەن ماڵەکەوەیە، ئەوەندە هەیە ئەگەر وشترەکانی عەیبدار بن، مەسەلەکە ئەکەوێتە دەستی ئەو کەسەکە زەکاتەکە وەرئەگرێ؛ ئەگەر بە یەك دەرەجە، سەرکەوتن یا داپەڕین مومکین نەئەبوو، دروستە خاوەنماڵ دوو دەرەجە سەرکەوێ و دوو تۆڵە وەربگرێ، یا دوو دەرەجە داپەڕێ و دوو تۆڵە بدا بە موستەحەقی زەکات؛ دروست نییە بۆ سەرکەوتنی یەك دەرەجە کاوڕێك و دە درهەم وەربگرێ، یا لە داپەڕینی یەك دەرەجەدا کاوڕێك و دە درهەم بدا، بەڵام ئەگەر دوو دەرەجە سەرکەوت یا داپەڕی، ئەوە دروستە دوو کاوڕ و بیست درهەم بدا یا وەربگرێ، چونکە لێرەدا قابیلە دوو کاوڕەکە دابنێین بۆ تۆڵەی دەرەجەیەك و بیست درهەمەکەش بۆ تۆڵەی دەرەجەیەکی تر.

## زەکاتی ڕەشەوڵاخ

زەکات لە ڕەشەوڵاخدا نییە تا ئەگاتە سی سەر، کە گەیشتە سی سەر، ئەبێ گوێرەکە نێرێکی یەك ساڵە بدا بە زەکاتا؛ کە لەم ڕادەیەش تێپەڕی، بۆ هەر سی سەرێك، گوێرەکە نێرێکی یەك ساڵە، یا بۆ هەر چل سەرێك، نێون مانگایەکی دوو ساڵە بدا.

## زەکاتی مەڕو بزن

مەڕو بزن زەکاتیان تیا نییە تا ئەگەنە چل سەر، ئەوسا کاوڕێکی یەك ساڵە یا چتیر بزنێکی دوو ساڵە بدا؛ کە گەیشتیشە سەدو بیستو یەك سەر، دوو سەر بدا؛ کە گەیشتیشە دووسەد و یەك سەر، سێ سەر واجبە؛ کە گەیشتیشە چوارسەد سەر، چوار سەر واجبە؛ کە لەمئەندازەیەش سەرکەوت، لە هەر سەد سەرێکا، سەرێك واجبە. جا ئەگەر ئەو حەیوانانە یەك نەوع بوون، ئەوە زەکاتیان لە خۆیان وەرئەگیرێ؛ ئەگەر دوو نەوعیش بوون، ئەوە ئەگەر زۆر و کەم بوون، زەکات لە زۆرەکەیان وەرئەگیرێ؛ ئەگەر ئەوەندەی یەکیش بوون، ئەوە زەکات لەویانە وەرئەگیرێ کە قازانجی زۆرترە بۆ

هەژاران، بەڵام فەرموودەی دیاریتر، ئەوەیە دروستە هەرکام لەم دوو نەوعە بدرێ، هەر بەو شەرتە ریعایەتی قیمەت کرابێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك دە بزن و سی مەڕی بوو، ئەوە دروستە بزنێك بدا لە زەکاتا کە قیمەتی بکاتە چارەکە بزنێك و سێ چارەکە مەڕ. هەروەها، دروستە لەجیاتی زەکاتی مەڕ، بزن بدا، بەو شەرتە کە ئەو بزنە قیمەتی مەڕێکی هەبێ.

دروست نییە حەیوانی نەخۆش و عەیبدار وەربگیرێ لە زەکاتا، مەگەر لەزەکاتی حەیوانی نەخۆش و عەیبدارا؛ دروستیش نییە حەیوانی نێر وەربگیرێ مەگەر ئەو حەیوانانە کە زەکاتیان ئەدرێ نێرینە بن، وەك گوێرەکە نێر لە زەکاتی گادا، یا لەبەر ناچاری، وەك وشترێکی نێری دوو ساڵە لەجیاتی وشترێکی مێچکەی یەك ساڵە کە لە موڵکی خاوەنماڵەکەدا نەبێ؛ دروستە لەجیاتی زەکاتی حەیوانی بچکۆلە، حەیوانێکی بچکۆلە وەربگیرێ، وەك باسی ئەکەین لە باسی زەکاتی بەچکەدا کە تابیعی رادەی زەکاتی دایکی بێ.

دروست نییە ئەوەی زەکات ئەچنێتەوە بۆ خەزێنەی موسوڵمانان، داوای حەیوانی ئاوس یا تازەزاو یا دابەستە بکا، مەگەر بە ئارەزووی خاوەن حەیوانەکە؛ هەروەها، دروست نییە داوای حەیوانی زۆر بە قیمەت و نایاب بکا، مەگەر ئارەزووی خاوەنەکەی وابێ.

شەرتی واجب بوونی زەکات لە حەیوانا، ئەوەیە لە موڵکی خاوەنەکەیا ساڵێکی بەسەرا رابوردبێ و بە دەمی خۆی بلەوەڕێ بەبێ ئەوەی خاوەنەکەی ئالفی بداتێ، بەڵام شوانیان ببێ. ئەو بەچکانە کە لە حەیوانێ پەیدا ئەبن، کە گەیشتبن بە رادەی زەکات، لەسەر حیسابی ساڵی دایکیان، زەکاتیان ئەدرێ؛ مەسەلا، کابرایەك چل سەر مەڕی بوو، لەپاش چەند مانگێ زان و لە هەمان ساڵا بیست مەڕیان لێ مرد، ئەوە بەچکەکان لەجێگەیانا دائەنرێن و زەکاتیان لێ ئەدرێ؛ یاخود کەسێك چل سەر مەڕی هەبوو و پاش ئەوە کە زان، هەموویان مردن و بەرخەکانیان مانەوە، ئەوە لەجیاتی دایکەکانیان دائەنرێن و زەکاتیان لێ ئەدرێ؛ یاخود کەسێك شەست و یەك سەر مەڕی هەبوو و

لەپاش شەش مانگ زان، ئەوە چونکە بەهەموویانەوە بوون بە سەدوبیستویەك سەر، لە ئاخری ساڵی دایکیانا زەکاتیان لێ‌ئەدرێ و دوو سەریان ئەدرێ بە زەکاتا لەگەڵ ریعایەتی قیمەتدا، هەرچەندکە بەچکەکان ساڵیان تەواو نەکردووە. ئەگەر بەچکەکان لە بەشی زۆری ساڵا ئاڵفیان پێ‌ئەدرا، یاخود لە ماوەیەکی وادا ئاڵفیان پێ‌ئەدراکە بێ‌ئاڵف نەژین لەو ماوەیەدا، ئەوە زەکاتیان لێ نادرێ، بەڵام ئەگەر ماوەی ئاڵف پێدانەکە کەم بوو، وەك شەو و رۆژێك، ئەوە رێگا لە واجب بوونی زەکات تیایانا ناگرێ؛ ئەگەر ئەو حەیوانانە بۆ خۆیان بە بێ‌شوان ئەلەوەڕان، زەکاتیان لێ‌نادرێ؛ هەروەها، هەر حەیوانێکی بە دەمی خۆی لەوەڕیو کە ببێ بە ئاڵفخۆر و حەیوانێ کە ئیشی پێ‌بکرێ، وەك گای جووت و گێرەکردن و هەڵگۆزتن، ئەوانەیش زەکاتیان لێ‌نادرێ.

هەر حەیوانێ کە بە کڕین یا بەخشین و شتیوا دەستی خاوەن حەیوان بکەوێ، ساڵی تایبەتی بۆ دائەنرێ و لەگەڵ حەیوانەکانی تری ناژمێررێ لە ساڵا؛ هەروەها، هەر کار و بەرخ و گوێرەکەیەك کە لەپاش تەواوبوونی ساڵی دایکەکانیان پەیدا بووبن، ساڵی تازەیان بۆ دائەنرێ؛ کەواتە، ئەگەر خاوەن حەیوان، وتی: ئەم بەچکانە زەکاتیان تیا نییە، چونکە لەپاش تەواوبوونی ساڵی دایکەکانیان پەیدا بوون، باوەڕی پێ‌ئەکرێ ئەگەر بە درۆزن مەشهوور نەبوو؛ ئەگینا سوێند ئەدرێ؛ ئەگەر لەنێوان مانگانی ساڵا هەندێك لەم حەیوانانەی فرۆشت و پاشان کڕینیەوە، ئەوە سەر لەنوێ ساڵیان بۆ دائەنرێ.

**بێداری!** خاوەنماڵ لەبارەی ژمارەی سەری حەیوانەکانیەوە باوەڕی پێ‌ئەکرێ، ئەگەر پیاوێکی چاك بوو، ئەگینا حەیوانەکانی لە تەنگەبەرییەکا خڕ ئەکرێنەوە و ئەژمێررێن.

## زەکاتی دەغڵ و دان و میوە

دەغڵ و دان و میوە، زەکاتیان نییە، مەگەر ئەوانەیان کە رۆزی (قووت) بن و ئادەمیزاد بتوانێ بە ئارەزوو پێیان بژی؛ ئەمەش لە دەغڵ‌ودانا، بریتییە لە برنج و گەنم و

جۆو پەڕشە و نیسك و نۆك و ماش و فاسۆلیا و پاقلە و گەنمە شامی و زەڕاتە عەرەبیلە و هەرزەن و رەمەدانە و دێمیلە و هەر دەغڵ و دانێكی تر كە ئینسان بە بێ‌ناچاری پێی‌بژی؛ لە میوەشدا، بریتییە لە خورماو مێوژ. رادەی زەكاتی دەغڵودان و میوە، پێنج «وِسْق»ە كە بە پێوانە، ئەكاتە سێسەد «صاع» و بە پێوانەی كوردەواریی، ئەكاتە نزیكەی چل‌و پێنج تەنەكە، بە كێشانەش ئەكاتە هەزار و شەش‌سەد «رِطْل»ی بەغدایی و بە كێشانەی كوردەواری، ئەكاتە دوو سەد و بیست و پێنج تەورێزی.

**بزانن!** بۆ هەر روتابێ بە خورمایی بخورێ و بۆ هەر ترێیەك بكرێ بە مێوژ، حیسابی پێنج ویسقەكە بە خورمایی و مێوژی ئەكرێ، ئەگینا بە تەڕی حیساب ئەكرێن و لێك‌ئەدرێتەوە چەند خورمای تەڕ و چەندترێ پێنج ویسق خورمای وشك و مێوژی تیا ئەبێ و بەوجۆرە لەسەر خاوەنەكەی تەخمین و حیساب ئەكرێ تا زەكاتەكەیان بێتە ئەستۆی و بتوانێ تەسەڕوف بكا لە میوەكەیا؛ ئەگەر تەخمین نەكرا لەسەری و لە خۆیەوە تەسەڕوفی تیا كرد، زەكاتەكە قەرز ئەبێ لەسەری و قیمەتەكەی ئەدا بەوانەی موستەحەقن.

هەرقووتێ لە توێكڵا هەڵنەگیرێ، وەك گەنم، ئەوە ئەبێ بە پاك كراوی بگاتە رادەی زەكات؛ هەرچییش بە توێكڵەوە هەڵگیرێ، وەك برنج و پەڕشە، دروستە پاك بكرێتەوە و رادەی زەكاتی بە پێنج ویسق دابنرێ، یا پاك نەكرێتەوە و رادەی زەكاتی بە دە ویسق دابنرێ.

بۆ گەیشتنە رادەی زەكات، جینسێك ناخرێتە پاڵ جینسێكی‌تر، بەڵام جۆرێكی جینسێك ئەخرێتە پاڵ جۆرێكی‌تری ئەو جینسە؛ كەواتە، گەنم ناخرێتە پاڵ جۆ، بەڵام گەنمە قەندەهاری ئەخرێتە پاڵ گەنمە زەردكەو جۆ رەشە ئەخرێتە پاڵ جۆ سپی؛ میوەی ئەمساڵ، ناخرێتە پاڵ میوەی ساڵێكی‌تر، بەڵام دوو میوەی ساڵێك ئەخرێنە پاڵ یەك، هەرچەند لەیەك كاتیشا پێ‌نەگەن. بۆ هاوساڵی میوە و دەغڵودان، تەماشای ئەوە ناكرێ ناشتن و چاندینان لە یەك ساڵا بووبێ، بەڵكوو تەماشای ئەوە ئەكرێ لە یەك ساڵا بچنرێنەوە یا درەو بكرێن؛ لە وڵاتی ئێمەدا، ساڵی پێگەیشتنی كشتوكاڵ، لەپاش

ناوەڕاستی بەهارەوە دەس پێ ئەکات تا نزیکی ئاخری پایز و کشت‌وکاڵی هاوینەمان لەم‌ماوەدا ئەکرێ و پێش ئەگا.

ئەو ئەندازەی واجبە بدرێ لە زەکاتی میوەو دەغڵ‌ودانا، دەیەکە بۆ ئەوەی دەیم بێ و بە باران پێ‌بگا، یا بە ئاوی کارێز یا بەهۆی نزیکی ریشەکەی لە ئاوەوە، یا بە ئاوی چەم یا جۆگای هەڵگیراو ئاو بدرێ، هەرچەند هەڵکەندنی ئەو جۆگایە و ئاو لێ‌هەڵگرتنی مەسرەفی ببێ؛ بۆ ئەوەش کە بە ئاوهەڵگۆستن یا بە دۆڵاب یا بە کڕینی ئاو ئاو بدرێ، بیست‌یەکە؛ بۆ ئەوەش کە بەم دووجۆرە هەردووکیان وەکوو یەك ئاو بدرێ، سێ چارەکە دەیەکە، یەعنی دەیەکێکی ئەکرێ بە چوار بەشەوە، سێ‌بەشی ئەدرێ بە زەکاتاو بەشێکی ئەدرێتەوە بە خاوەن‌ماڵ؛ ئەگەر بەجۆرێکیان زیاتر ئاو درا لەو جۆرەکەیان، ئەوە ئەندازەی زەکاتەکەی بەش ئەکرێ بەسەر باری پێگەیشتنەکەیا.

زەکات واجب ئەبێ لە خورما و ترێدا لەو کاتەوە کە سەرەتای پێگەیشتنیان دیاری ئەدا، جا هەر لەم کاتەوە دەس بۆ بردنیان حەرامە، چونکە حەقی فەقیریان پێوەیە، مەگەر کابرای خاوەن ماڵ پیاوێکی عادڵ بهێنێ و لەسەر بنچینەی تەماشاکردنی هەموو باخ و رەزەکان تەخمینی بکا، ئەوجا حەقی زەکات ئەکەوێتە ئەستۆی و دروست ئەبێ هەموو جۆرە تەسەڕوفێکیان تیا بکا، بەڵام ئەبێ رازی بێ بەوەی کە تەخمین‌کەرەکە دایئەنێ؛ «ابنُ حَجَر»، فەرموویەتی: بۆ دەرچوون لەم گێژداوە، عەیبی خاوەن ماڵ تەقلیدی مەزهەبی ئیمام ئەحمەد بکا کە لای‌وایە دروستە ئینسان بەر لە تەخمین، خۆی و خێزانی بە پێی عادەت لەو خورماو ترێیە بخۆن و دیاری لێ‌بنێرین بۆ دۆستانیان و لەسەریشیان حیساب ناکرێ.

زەکاتی دەغڵ‌ودانیش لەو کاتەوە واجب ئەبێ کە دەنکەکەی رەق ببێ و خۆی بگرێ، جا چونکە لە دەغڵ‌ودانا مەجالی تەخمین نییە لەبەر ئەوە دەنکەکانی دیار نین، دروست نییە خاوەن ماڵ تەسەڕوفی تیابکا تا زەکاتی لێ‌دەرئەکا، مەگەر لەبەر ناعیلاجی، چونکە حەقی زەکات بە هەموو بەشێکی ئەو ماڵەوەیە.

لای هەندێ لە عالمانی شافیعی مەزهەب وایە زەکاتی ماڵ لە ئەستۆی خاوەن‌ماڵەکەدایە، ئیمامی شافیعی خۆیشی فەرموودەیەکی وای هەیە؛ کەواتە، عەیبی نییە خاوەنی میوە و

دەغڵودان تەقلیدی ئەم قەولە بکاو ئەوجا، بۆی دروست ئەبێ گەنم بکا بە گوڵە پڕووزە بۆ چێشتو بەرکوت بکا بۆ نانو چەڵتووك کرە بکاو گوناهی پێ ناگا، ئەوەندە هەیە ئەبێ حیسابی ئەو ئەندازەیە رابگرێ! کە ئەیخوا تا لەپاشا لەگەڵ میوە و دەغڵودانەکەی تریا زەکاتی دەرکا.

**بزانن!** هەرچی مەسرەفێکی کشتوکاڵ و باخە لەسەر خاوەنماڵەکەیە، وەك درەو و گێرە و کێشە و شەنکردنی خەرمان و چنین و وشك کردنەوەی میوە، بەڵام هەندێ کەس دێن ئەم مەسرەفانە حیساب ئەکەن، ئەوجا زەکاتی باقیەکەی ئەدەن، ئەمە ناشەرعییە، ئەبێ زەکات بۆ تێکڕای میوە و کشتوکاڵ بدرێو هەموو مەسرەفێك لە گیرفانی خاوەن ماڵ خۆی دەربچێ.

ئەمێنێتەوە باسی «موڵکانە» کە خاوەن زەوی ئەندازەیەکی واریدات لەسەر خەرمان هەڵئەگرێ بۆ خۆی لەجیاتی کرێی زەوییەکەی؛ ئەم سوورەتە، لە شەرعا بە ئیجارەی بەتاڵ دائەنرێ، چونکە لە وەختی بە ئیجارەدانی زەوییەکەدا دیار نییە ئەو ئەندازەیە ئەکاتە چەند و بەپێی شەرع، خاوەن زەوی کرێی زەوییەکەی ئەکەوێ نەك ئەو ئەندازەی واریداتە کە بڕیاریان داوە؛ جا ئەگەر خاوەن زەوی بێ رەزای خاوەن توو، ئەو ئەندازە واریداتەی برد، ئەوە بەشە زەکاتی ئەو ئەندازە براوە وەك زەکاتی ماڵی زەوتکراو وایە، تا دەستی خاوەنەکەی نەکەوێتەوە، لەسەری نییە؛ ئەگەر خاوەن تووەکە بە ئارەزووی خۆی ئەو ئەندازەی واریداتەی دا بە خاوەن زەوی، ئەوە واجبە لەسەری زەکاتی هەموو واریداتەکەی بدا، چونکە موڵکانە لە بەشی فەقیر و هەژار بار ناکرێ.

## زەکاتی ماڵی موشتەرەك

شەریکی، تەئسیری هەیە بۆ واجب بوونی زەکات لە هەموو جۆرە ماڵێکا، چ حەیوان و چ میوە و چ ماڵی بازرگانی و چ پارەی نەخت؛ ئەم شەریکییە، دوو جۆرە؛

یەکەم، ئەوەیە کە بەشەکان دیاری نەبن، وەك ئەوەکە دووکەس چل سەر حەیوانیان بە میرات بۆ هاتبێتەوە، یا باخێك، یا دوو سەد درهەم، یا بایی دوو سەد درهەم ماڵی بازرگانی؛

دووهەم، ئەوەیە كە بەشەكان دیاری بن، وەك ئەوە یەكێك بیست سەر حەیوانی بێ‌و تێكەڵی چل سەر حەیوانی یەكێكی‌تری بكا. جۆری یەكەم، پێی ئەڵێن: «شەراكەتی عەین» و دووهەم، پێی ئەڵێن: «شەراكەتی جیوار»؛ شەریكی، بە هەركام لەم دوو جۆرە بێ، ئەو دوو كەسە واجبە وەك یەك كەس زەكاتی ئەو ماڵە دەربكەن، بەو شەرتە لەو كاتەدا كە بەشی هەردووكیان دیارییە، وەزعێكی‌وا نەیەتە پێشەوە كە ببێ بەهۆی جیایی؛ مەسەلا، لە حەیوانا جێگەی ئاوخواردن و مۆڵەڕان و جێگەی شەو و جێگەی دۆشین و شوان و فەحلیان جیا نەبێ؛ بەڵام شەرت نییە دۆشەریان یەك كەس بێ، چونكە هەر خاوەن ماڵێك شیری حەیوانی خۆی ئەدۆشێ و لە ماڵی خۆیا ئەیژەنێ. پێویستە لە ماڵی بازرگانیدا دووكان و پاسەوان و مەنپێو و ترازوكێش یەكێك بێ؛ لە كشت‌وكاڵیشدا پێویستە ئاودێر و دروێنەكەر و خەرمان یەكێك بێ؛ لە میوەشدا ئەبێ دیوار یا پەرژینی باخ‌و جێگەی وشك‌كردنەوەی میوە یەكێك بێ؛ لە نەختیشدا كیسەو سندووقی پارە و شوێنی هەڵگرتنی یەكێك بێ. ئەبێ لە هەردوو جۆرەكەدا ماڵەكان لە ڕادەی زەكات واجب بوون كەمتر نەبن، ئەگەر كەمتربوون، ئەبێ یەكێ لە شەریكەكان ئەوەندە ماڵی ببێ كە بەتەنیا یا لەگەڵ بەشەكەی خۆی لە ماڵی شەریكەكەیا، بگاتە ڕادەی زەكات واجب‌بوون.

هەروەها، شەرتە هەردوو شەریكەكە ئەهلی زەكات بن؛ كەواتە، ئەگەر یەكێكیان كافرێكی «ئەهلی زیممە» یاخود منداڵێك بوو لە سكی دایكیا ئەوە قیمەتی نییە و تەنیا تەماشای بەشی ئەویانە ئەكرێ كە ئەهلی زەكاتە؛ لە هەر ماڵێكا كە پێویست بێ ساڵی بەسەرا بێتەوە، ئەبێ شەریكییەكەیان لە ساڵ كەمتر نەبێ؛ بۆ كشت‌وكاڵیش پێویستە لە سەرەتای ساڵی كشت‌وكاڵەوە تا دوایی شەریك بن؛ بۆ میوەش ئەبێ لەسەرەتای پێگەیشتنی میوەكەدا شەریك بن؛ بۆ حەیوانیش پێویستە لە یەك جۆر بن، یا لە دوو جۆری وابن بدرێنە دەم یەك وەك مەڕ و بزن.

**بێداری!** مەبەست لە یەكیەتیی فەحل ئەوەیە ئەگەر حەیوانەكان یەك‌جۆر بوون، هەركام لە شەریكەكان فەحلی تایبەتی نەبێ بۆ حەیوانەكانی، ئەگینا لە كاتێكا بەشی

یەکێکیان مەڕ و بەشی ئەویان بزن بێ، قەیدی نییە هەر یەکێکیان فەحلێکی تایبەتی بۆ حەیوانەکانی ڕاگرتبێ.

**بزانن!** شەراکەت، جاروبار ئەبێ بە مایەی بارگرانی بۆ هەردوو شەریکەکە، وەکوو ئەوەکە بەهەردوولایان چل مەڕیان بێ؛ جاروباریش ئەبێ بە مایەی بارسووکی بۆیان، وەك ئەوە کە هەردووکیان هەشتا مەڕیان بە نیوەیی بێ؛ جاری وایش هەیە ئەبێ بە مایەی بارسووکیی یەکێکیان و بارقورسی ئەولایان، وەك ئەوەکە شەست مەڕیان هەبێ، چلی هی یەکێکیان و بیستی هی ئەو یەکەکەیان.

## باسی هەندێك لە ئادابی زەکات

شەرتی واجب بوونی زەکات، ئەوەیە خاوەن ماڵەکە موسوڵمان بێ و ئەبێ مەعلووم بێ کە خاوەنی ئەو ماڵەیە زەکاتەکەی لێ ئەدرێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك خانوویەکی دا بە کرێ بۆ ماوەی چوار ساڵ بە هەشتا دینار، ئەوە لەپاش تەواوبوونی ساڵی یەکەم، واجبە زەکاتی تەنها بیست دیناری بدا، چونکە تەنیا کرێی ساڵێك دامەزراوە؛ لەپاش ساڵی دووهەمیش، واجبە زەکاتی بیست دینارەکەی پێشوو بدا بۆ ساڵێك و زەکاتی بیست دیناریتریش بدا بۆ دوو ساڵ، چونکە دەرکەوتووە دوو ساڵە خاوەنی ئەم بیست دینارەشە؛ لەپاش ساڵی سێهەمیش، زەکاتی چل دیناری کرێی ساڵی یەکەم و دووهەم بدا بۆ ساڵێك و چل دیناری کرێی ساڵی یەکەم و دووهەم بدا بۆ ساڵێك و زەکاتی بیست دیناری کرێی ساڵی سێهەم بدا بۆ سێ ساڵ؛ لە ساڵی چوارەمیشا، زەکاتی شەست دیناری کرێی سالی یەکەم و دووهەم و سێهەم بدا بۆ ساڵێك و زەکاتی بیست دیناری کرێی ساڵی چوارەم بدا بۆ چوار ساڵ؛ ئەم سوورەتە ئەکرێ بە نموونە بۆ هەموو سوورەتێکی لەم چەشنە.

زەکات نییە لە ماڵێکا وەقف کرابێ لەسەر جیهەتێکی چاکە، وەك مزگەوت و ئیمامەت و دەرس وتنەوە و خوێندەواری و خەستەخانە و پرد و شتیوا، خوا ئەو ماڵە نەخت بێ یا نەخت نەبێ؛ هەروا، زەکات نییە لەماڵێکا کە وەقف کرابێ لەسەر مناڵێك

كە لە سكی دایكیا؛ بێ. بەڵێ، ئەگەر ماڵێك وەقف كرا لەسەر كەسێك یا لەسەر چەند كەسێك و بەشی هەموویان بەسەر یەكەوە ئەگەیشتە رادەی زەكات، ئەوە واجبە زەكاتی لێ دەربكرێ، یاخود ئەگەر كەسێك موستەحەقی نەقدێكی وەقف بوو بەرامبەر بە ئیشێك [و] ساڵی بەسەرا رابوورد، ئەوە زەكاتەكەی واجبە.

ئەگەر ژنێك چل سەر حەیوانی دیاری كراوی پێدرا لە مارەییا، ئەوە لەپاش بەسەراهاتنەوەی ساڵێك لەكاتی پێدانەكەیەوە، واجبە لەسەری زەكاتی بدا، بەڵام ئەگەر حەیوانەكان لە ئەستۆ (ذِمّة)ی مێردەكەیدا بوون، ئەوە زەكاتیان واجب نییە لەسەر ژنەكە، چونكە هێشتا لە ئەستۆی مێردەكەیدان و دیاری نەكراون بۆی كامەن.

بۆ زەكاتدان لە ماڵی منداڵ و شێت و كەسێكا بە سەفیهی باڵغ بووبێ، «وَليّ أَمر» (سەرپەرشتی كەرەكەیان) مەسئوولە ئەو زەكاتە بدا بە خاوەن حەق.

فەرموودەی راستتر لەناو فەرموودەكانی ئیمامی شافیعیدا، ئەوەیە پەیوەندی زەكات بەو ماڵەوەكە زەكاتی تیایە، وەك پەیوەندی كۆمەڵە هاوبەشێك وایە بەوماڵەوەكە هاوبەشن تیایدا؛ كەواتە هەموو دەنكە گەنمێكی ئەو خەرمانەی كە زەكاتی تیایە، دەیەكێكی خاوەن حەقی پێوەیە؛ ئەم فەرموودەیە هەرچەند وائەگەیەنێ كە ئەبێ زەكات لە عەینی ماڵەكەی دەربكرێ، بەڵام شەرع لەبەر ئاسانكاری رێگای داوە كەوا خاوەنماڵ زەكاتی ماڵەكەی لە غەیری خودی ئەو ماڵەش دەربكا؛ فەرموودەی دووهەمی شافیعی، ئەوەیە پەیوەندی زەكات بە ماڵەوە، وەك پەیوەندی خاوەن قەرزە بە ماڵی رەهن كراوەوە؛ كەواتە، تا بەشێك لەو زەكاتە مابێ بیدا، دروست نییە تەسەروف لەو ماڵەدا بكا، بەڵام ئەگەر زەكاتەكە لە غەیری ئەو ماڵە دەربكا، قەیدی نییە و دروستە؛ لە فەرموودەی سێهەمیا، شافیعی فەرموویەتی: زەكات لە ئەستۆی خاوەن ماڵدایە و پەیوەندی بە ماڵەكەوە نییە؛ لەسەر تەقلیدی ئەم فەرموودەیە، بەر لە دەركردنی زەكات، دروستە خاوەن ماڵ تەسەروف لە ماڵەكەدا بكا، وەك لەپێشەوە بەیانمان كرد.

**بزانن!** بینا لەسەر پەیوەندی زەكات بە ماڵەوە، ئەو حەقی زەكاتە ناگاتە شیری حەیوانی زەكات و ئەو بەچكەی لەپاش واجببوونی زەكات لەدایك بووبێ و ئەو

خورییەی لەپاش واجب‌بوونی زەکات دەرچووبێ؛ ئەمانە، هی خاوەن ماڵەکە خۆینی و مەگەر بە ئارەزووی خۆی بیانبەخشێ بە کابرای زەکات وەرگر.

واجبە ئەوکەسەی زەکات وەرئەگرێ، باڵغ و عاقڵ بێ؛کەواتە، ئەگەر یەکێك ویستی زەکات بدا بە هەتیو و شێت، ئەبێ بیدا بە «وَلي أمر»یان بە نیازی ئەوان؛ لەسەر فەرموودەی کۆنی ئیمامی شافیعی، ئەگەر منداڵ و شێت باوك و باپیریان نەبوو، دایکیان ئەتوانێ زەکاتیان بۆ وەربگرێ؛ لەسەر ئەم فەرموودەیە، ئەتوانرێ زەکات بدرێتە دەستی دایکیان، ئەگەر دایکیشیان نەبوو «قازی» سەرپەرشتی کەرێکیان بۆ دابنێ، ئەگەر ئەویش نەبوو، شارەزایانی ئەو شوێنە یەکێك بکەن بە سەرپەرشتی‌کەریان و ئەو سەرپەرشتی‌کەرە زەکاتیان بۆ وەربگرێ.

واجبە لەسەر خاوەن‌ماڵ هەرکە وادەی زەکات‌دانەکەی هات، دەس‌بەجێ زەکاتی ماڵەکەی دەربکا، بەو شەرتەکە ماڵەکەی لە بەردەستا بێ و خاوەن حەقەکانیش حازر بن. دروستە بۆ خاوەن ماڵ بە دەستی خۆی زەکاتی ماڵی بدا بە خاوەن حەق، دروستیشە وەکیل‌بگرێ، بەڵام لەوە باشتر ئەوەیە بیداتە دەستی فەرمانڕەوای موسوڵمانان لەو شوێنەدا، بۆ ئەوە ئەو دابەشی بکا، بەو شەرتە ئەو فەرمانڕەوایە پیاوێکی دادپەروەر (عادِل) بێ؛ خاوەن‌حەقیش ئەتوانێ خۆی زەکاتەکە وەربگرێ‌و دروستیشە وەکیل‌بگرێ بۆ وەرگرتنی، بەڵام لەم‌سوورەتەدا، پێویستە خاوەن‌ماڵ بە نیازی خاوەن حەقەکە زەکاتەکە بداتە دەستی وەکیلەکەی و وەکیلەکەش بەنیازی ئەو وەری‌بگرێ.

واجبە لەسەر خاوەن‌ماڵ نییەتی زەکات‌دان بهێنێ؛ مەسەلا، بە زمان یا بە دڵ، بڵێ: ئەمە فەرزی زەکاتی ماڵی خۆمە، یا ئەمە فەرزی سەدەقەی ماڵی خۆمە ئەیدەم؛ ئیتر دیاری‌کردنی ماڵەکە پێویست نییە؛ ئەگەر هات و دیاری کرد، ئەوە ئەو زەکاتە هەر لەباتی ئەو ماڵە ئەبێ و ناتوانێ بیکا بە زەکاتی ماڵێکی‌تر. لەکاتی جیاکردنەوەی ئەندازەی زەکاتی ماڵەکەشیەوە تا کاتی بڵاوکردنەوەی بەسەر خاوەن حەقدا، ئەتوانێ ئەم نییەتە بهێنێ؛ هەروەها، دروستە لەوکاتەشا نییەت بهێنێ کە ئەیداتە دەستی وەکیل؛

ئەگەر وەکیل زەکاتەکەی ئەدا بە خاوەن حەق و لەو کاتەدا خاوەن ماڵ نییەتی ئەهێنا، ئەوە باشترە. هەروەها، واجبە «ولي أمر»ی منداڵ و شێت لەکاتی دەرکردنی زەکاتی ماڵیانا نییەت بهێنن. ئەگەر خاوەنماڵ زەکاتەکەی دایە دەستی فەرمانڕەوای موسوڵمانان و لەو کاتەدا نییەتی هێنا، ئەوە دروستە، ئەگینا دانامەزرێ، هەرچەند فەرمانڕەوایش نییەت بهێنێ؛ بەڵێ، ئەگەر بە زۆر زەکاتەکەیان لێ وەرگرت، ئەوە ئەبێ فەرمانڕەوا نییەت بهێنێ و نییەتەکەی ئەو لەجیاتی خاوەن ماڵەکەیە. جا لەبەرئەوە کە نییەت پێویستە لە زەکاتا، دروست نییە خاوەن حەق کە هەلی بۆ هەڵکەوت، ماڵی دەوڵەمەند لەجیاتی زەکات داگیر بکا، بەڵکوو ئەبێ فەرمانڕەوای موسوڵمانان وەریبگرێ و بیبەخشێتەوە بەسەر موستەحەقەکاندا.

## باسی زەکاتی فیتر (سەرفیترە)

سەرفیترە واجب ئەبێ بە ئاوابوونی خۆری دوارۆژی رەمەزان؛ کەواتە، سەرفیترە واجبە بدرێ بۆ کەسێك کە لەپاش مەغریبی شەوی جەژن بمرێ و واجب نییە بۆ کەسێك لەو کاتە بەدواوە لەدایك بووبێ. سوننەتە سەرفیترە لە بەیانیی رۆژی جەژنا پێش نوێژی جەژن بدرێ و حەرامە دوابخرێ لە رۆژی جەژن، چونکە پاش ئەو رۆژە وەختەکەی بەسەرئەچێ و ئەبێ بە قەزا؛ دیاریشە حەرامە ـ بە بێعوزر ـ ئینسان فەرزێك لەوەختی خۆیدا جێبەجێ نەکا.

شەرتی واجببوونی سەرفیترە، ئەوەیە کابرا زیادی هەبێ لە مەسرەف و نەفەقەی پێویستی شەو و رۆژی جەژنی خۆی و هەرکەس کە گوزەرانی لەسەریەتی، وەك ژن و باوك و دایك وکوڕوکچی فەقیری و خرمەتکاری خۆی وکارەکەری، ژنەکەی ئەگەر بە نانەسکی خزمەتیان بکەن، هەروەها ژنی تەڵاق دراو بە تەڵاقی «ریجعی» یا بە تەڵاقی «بائین»، بەو شەرتە ئەو ژنە «بائینە»یە دووگیان بێ؛ هەروەها، شەرتە زیادی هەبێ لە ئەندازەی دەستەجلێکی موناسب بۆ خۆی و ژنەکەی و هەرکەسێکی تر کە مەسرەفی لەسەریەتی و لەکرێی خزمەتکارێ کە پێویستی پێبێ و لەکرێی خانوویەکی موناسب،

ئەگەر خۆی خانووی نەبوو، پێویستیشە زیادی هەبێ لە قەرزێ کە وادەی دانەوەی هاتبێ. ئەگەر پیاوێك خۆی لات و ژنەکەی دەوڵەمەند بوو، ئەوە واجب نییە لەسەر ژنەکە سەرفیترەی خۆی بدا، چونکە مەسرەفی ژن لەسەر مێردەکەیەتی و مێردەکەش لەمسوورەتەدا لاتە، بەڵام دروستە ئەو ژنە سەرفیترەی خۆی بدا؛ لەمسوورەتەدا، واجبە لەسەر ئەو ژنە سەرفیترەی کارەکەرەکەشی بدا ئەگەر بە نانەسکی ئیشی بۆ ئەکرد، چونکە مێردەکەی لەبەرئەوە کە لاتە پێویست نییە لەسەری کارەکەری بۆ بگرێ تا مەسرەفی کارەکەرەکەی لەسەر ئەو بێ؛ هەروەها، ئەگەر ئەو ژنە منداڵی فەقیریشی هەبوو، ئەبێ سەرفیترەی ئەوانیش بدا. هەرکەس کە خۆی دەوڵەمەند بوو و منداڵی دەوڵەمەندیشی هەبوو، واجب نییە لەسەری سەرفیترەی ئەو منداڵە دەوڵەمەندەی بدا، بەڵکوو سەرفیترەی ئەو منداڵە لە ماڵەکەی خۆی دەرئەکرێ؛ بەڵێ، ئەگەر باوکی لە ماڵی خۆی دای، دائەمەزرێ، بەڵام سەرفیترەی کوڕ و کچی باڵغ و دەوڵەمەند لەسەر خۆیانە و دروست نییە بێ ئیجازەی ئەوان باوکیان یا دایکیان سەرفیترەیان دەربکا، هەروەك چۆن دروست نییە کەس بە بێ‌ئیجازە سەرفیترەی یەکێکی بێگانە بدا.

واجب نییە لەسەر باوك سەرفیترەی ژنی کوڕی فەقیری بدا؛ هەروا، واجب نییە لەسەر کوڕێ کە دەوڵەمەند بێ، سەرفیترەی ژنی باوکی فەقیری بدا، ئەگەر ئەمانە سەرفیترەی ئەوانەیان دا، ئەبێ ئیجازەیان لێ وەرگرن. واجب نییە لەسەر برا سەرفیترەی خوشکی فەقیری خۆی بدا وە ئەگەر ویستی بیدا، ئەبێ ئیجازەی لێ وەربگرێ، حوکمی سەرفیترە دانی خوشکیش لەجیاتی برا، هەر وایە. ئەگەر هات و فەقیرێك قەرزی کرد و سەرفیترەی دا، ئەوە سەرفیترەکەی دائەمەزرێ، هەرچەند پێویست نییە لەسەری ئەو قەرزە بکا. ئەگەر کەسێك کوڕێکی فەقیری بوو سەری خۆی هەڵگرتبوو و ڕۆیشتبوو بێ سەرو شوێن مابوو، ئەوە واجبە سەرفیترەی بۆ بدا، چونکە زاهیر وایە هێشتا هەر فەقیر بێ و مابێتیش.

ئەندازەی واجبی سەرفیترە بۆ هەر ئینسانێك، یەك «صاع»ە لە قووتی غاڵبی ئەو شوێنەکە سەرفیترەکەی تیا واجب بووە؛ سەنگی «صاع» ئەکاتە شەش‌سەد و هەشتاو نۆ

درەم و پێنج حەوت یەکە درەم و بە مسقاڵ، چوارسەد و هەشتا و چوار مسـقاڵە، بـە حیسابی تەنەکەی نەوتیش، تەنەکەیەك و شەش مشت بۆ سەرفیترەی شەش کەس بەش ئەکات.

**بزانن!** ئەو فەرموودەیەی لە ساعدا جێی ئیعتیبارە، ئەوەیە بە حیسابی پێوانە بێ، چونکە سەنگ بەپێی قورسی و سووکیی دەغڵەکە ئەگۆڕێت؛ جا ئەگەر عایەرەی ساعی حەزرەتﷺ دەس کەوت، ئەوە باشە، ئەگینا ئەتوانین بە کێشانەیش دەریکەین.

ئەگەر کەسێك دەسەڵاتی نەبوو سەرفیترەی هەموو ئەوانـە بـدا کـە سـەرفیترەیان لەسەریەتی، با لەپێشا سەرفیترەی خۆی، ئەوجا هی ژنەکـەی، ئـەوجا هـی مـنداڵی بچووکی، ئەوجا هی باوکی، ئەوجا هی دایکی، ئەوجا هی منداڵی گەورەی دەربکـا. دروستە کەسێك سەرفیترەی خۆی لە جۆرە قووتێك و سەرفیترەی ژنەکەی لە جۆرە قووتێکی تر بدا ئەگەر وڵاتەکە چەند جۆرە قووتێکی تیابوو هەموو وەك یەك ئەخوران. ئەگەر خۆی لە شوێنێك و ژن و منداڵەکانی لە شوێنێکی تر بوون، بۆ هەرکام لە قووتی غالبی ئەو شوێنە بدا کە تیایەتی.

## باسی زەکاتدان بەر لە واجببونی

دروست نییە بەرلەوەی ماڵبگاتە رادەی زەکات، زەکـاتی لێ دەربکـرێ؛ پـاش گەیشتنیشی بەو رادەیە، دروست نییە پێشەکی، زەکاتی دوو ساڵی لێ بدرێ، بـەڵام دروستە زەکاتی ساڵێك بدرێ بەرلەوەی ساڵەکە تەواو ببێ؛ هەروەها، دروستە هـەر لەسەرەتای مانگی رەمەزانەوە سەرفیترە بدرێ بە موستەحەق. دروست نییە زەکاتی میوە بدرێ بەرلەوەی پێ بگا، یا زەکاتی دەغڵودان بدرێ بەرلەوەی دەنکەکەی رەق ببێ.

شەرتی جێ گرتنی ئەو زەکاتەی لەپێشا بدرێ، ئەوەیە خاوەنماڵ لە ئاخری ساڵدا زەکاتی لەسەر واجب بێ و خاوەن حەقیش زەکاتی پێ بشێ؛ ئەگەر یەکێك لەم شەرتانە نەهاتەدی، خاوەنماڵ ئەتوانێ ئەو زەکاتە وەربگرێتەوە لە موستەحەق، ئەگەر وەختی خۆی پێی وتبێ ئەم زەکاتە زەکاتی واجبی ئاخری ساڵە، یا پێی وتبێ: ئەگەر لە ئاخری

ساڵا مانیعێك پەیدا بوو لە واجببوونی زەکات لەسەرم، لێت ئەسێنمەوە؛ ئەگینا ناتوانێ لێی وەربگرێتەوە؛ ئەگەر خاوەنماڵ و موستەحەقی زەکات قسەیان یەکی نەگرت لەوەدا کە ئەبێ بەهۆی وەرگرتنەوەی زەکاتەکە، ئەوە موستەحەقی زەکاتەکە سوێند ئەدرێ. لە هەر سوورەتێکا کە وەرگرتنەوەی زەکات دروست بێ، ئەبێ عەینی زەکاتەکەی لێوەربگرێتەوە ئەگەر مابێ، ئەگینا، پێی ئەبژێرێ، ئەگەر وێنەی هەبوو، وێنەی، ئەگینا، قیمەتەکەی وەرئەگرێتەوە.

ئەگەر ئەو ماڵە کە زەکاتی تیا ئەکەوێ، بەرلەوەی خاوەن ماڵ بتوانێ زەکاتەکەی دەرکا، فەوتا، ئەوە خاوەنماڵ قەرزار نابێ؛ ئەگەر پاش ئەوەش فەوتا کە ئەیتوانی بیدا، واجبە بیبژێرێ؛ ئەگەر هەندێکی فەوتا، پێویستە بەشی ئەو هەندەی بژێرێ؛ ئەگەر خۆی لەپاش تەواوبوونی ساڵ، ماڵەکەی فەوتاند، ئەوە دیارە واجبە زەکاتەکەی بژێرێ، هەرچەند پێش ئەوەش بێ کە مەجالی تەسلیمکردنی ببێ بە خاوەنحەق.

## باسی ئەوانەی موستەحەقی زەکاتن

زەکات ئەدرێ بە لات وگەدا و زەکاتکۆکەرەوەی حوکوومەتی ئیسلام و قەرزار و بەندەی کاغەز پێدراو و ئەوانەی لەبەر نۆموسوڵمانی دڵیان رائەگیرێ و ئەوانەی لە رێگەی خوادا غەزا ئەکەن؛ مەبەست لە لات، ئەوەیە هیچی نەبێ وگەدا، ئەوەیە شتێکی هەبێ و بەشی نەکا، لات وگەدا لە لاتی وگەدایی ناکەون بەوەکە خانوویەکیان هەبێ تیا دانیشن ئەگەر خانووەکە لەپایەی شانی خۆیان بێ، هەرچەند عادەتیشیان گرتبێ بەوەوە کە لە خانووی کرێدا دانیشن، یا ئەگەر دەستێك یا چەند دەست جلوبەرگیان هەبێ، بەو شەرتەکە ئەو جلانەیان بۆ کەسێکی وەك خۆیان دەست بدەن، یا ئەگەر کتێبی عیلم و شەرع و شتیوایان هەبێ هەرچەند زۆریش بن، هەر بەو شەرتە لەوانە بن کە لە ساڵا جارێك پێویستیان پێببێ، یا ئەگەر ماڵێکیوایان هەبێ تا دوو مەنزڵ دوور بێ و دەستیان پێنەگا، یا قەرزێکیان هەبێ بەسەر خەڵکەوە و وادەی وەرگرتنەوەی نەهاتبێ، یا کاسبییەکیوا بزانن کە ئێستە نەتوانن بیکەن، یا بتوانن بیکەن بەڵام لایەقی شانیان نەبێ، فەقێیەکیش کە کاسبییەك بزانێ و پێی بکرێ بیکا، بەڵام کردنی ئەو کاسبییە رێگەی

خوێندنی لێ بگرێ، ئەوە زەکاتی ئەدرێتێ و داوای لێ ناکرێ کاسبی بکاو پەکی خوێندنەکەی بخا؛ هەروەها، عالمێکی‌وابە خۆرایی دەرس بڵێتەوە و کاروباری ئایین فێری موسوڵمانان بکاو وڵاتەکەش پێویستی بەو ئیشەی ئەو هەبێ، ئەوە زەکاتی ئەدرێتێ و داوای کاسبی‌کردنی لێ‌ناکرێ، بەڵام ئەگەر کەسێك ئەیتوانی کاسبی بکا و لەبەر خەریك بوون بە نوێژکردن و قورئان‌خوێندنەوە کاسبی پێ‌نەئەکرا، ئەوە زەکاتی نادرێتێ و ناچاری کاسبی کردن ئەکرێ، چونکە ئەوە لە شەرعا بە بەتاڵ ئەناسرێ و بەتاڵیش کە بە ئارەزووی خۆی بەتاڵ بێ، زەکاتی پێ‌ناشێ.

کەسێك کە گوزەرانی لەسەر کەسێکی تر بێ و ئەو نەفەقەیە کە ئەیدرایە بەشی ئەکرد، وەکوو ژن کە مێردەکەی ئەیژێنێ و باوك و دایك کە کوڕیان بیانژێنێ، ئەوە بەو نەفەقەیە لە لاتی و گەدایی دەرئەچێ و زەکاتی پێ‌ناشێ، ئەگەر ئەو نەفەقەیەش بەشی نەئەکرد، یا کەسێك ئەیدایە کە گوزەرانی واجب نەبوو لەسەر ئەو، وەکوو ئەوە کە برا، خوشك و خوشکەزا و براو برازا بژێنێ، ئەوە زەکاتی پێ‌ئەشێ، کەواتە، دروستە برایەك کە خوشکێکی خۆی بژێنێ، زەکاتی ماڵی خۆی بدا بەو خوشکەی، هەرچەند ئەویش خەرجی بکا بۆ شتی زیادەی، وەك خشڵی حەڵاڵ، بەو شەرتە کە زیادەڕەوی تیا نەکا؛ هەروەها، دروستە بۆ باوك زەکاتی ماڵی خۆی بدا بە کوڕی بۆ ئەوەی خەرجی بکا بۆ مەسرەفی ژنەکەی، چونکە مەسرەفی ئەو ژنە واجب نییە لەسەر ئەم و ئەو گوزەرانەش کە باوکی ئەیداتێ بەشی خۆی و ژنەکەی ناکا؛ هەروەها، دروستە باوك، زیاد لە نەفەقەی واجب، زەکاتی ماڵی خۆی بدا بە کوڕێکی کە خەریکی خوێندەواری بێ و موحتاج بێ بە پارە بۆ کڕینی کتێب و شتی‌وا؛ دروستیشە باوك زەکات بدا بە کوڕی خۆی، نەك لەبەر ئەوەکە لات یا گەدایە، بەڵکوو لەبەرئەوە کە قەرزارە یا لەبەر هۆیەکی تر لەو هۆیانە کە زەکات بە ئینسان حەڵاڵ ئەکەن، وەك «ابن حجر» لە «تحفة»دا فەرموویەتی.

مەبەست لە زەکات کۆکەرەوەی حوکوومەتی ئیسلام، ئەو کەسەیە کە فەرمانڕەوای ئیسلام ئەینێرێ زەکات لە خاوەن‌ماڵەکان وەربگرێ بۆ خەزێنە (بیت‌المال)ی موسوڵمانان؛ ئەم‌جۆرە، ئەمڕۆ نەماوە.

قەرزاریش ئەگەر قەرزی بۆ خۆی کردبێ و لە ڕێگای حەراما خەرجی نەکردبێ، یاخود لە ڕێگای حەراما خەرجی کردبێ، بەڵام ئێستا پەشیمان بوو بێتەوە، ئەوە زەکاتی ئەدرێتێ بەو شەرتە خۆی نەیبێ قەرزەکەی بداتەوە و وەعدەشی هاتبێ، یا ئەگەر بۆ قازانجی موسوڵمانان قەرزار بووبێ، وەك ئاشت کردنەوەی دوو کۆمەڵ یا دووکەس کە شەڕ و ئاژاوەیان لەبەینا بێ، یا قەرزی کردبێ بۆ کردنەوەی مزگەوت و قوتابخانە و نەخۆشخانەو پرد لە شوێنی پێویستا، یا بۆ میوانداری و ناندان بەخەڵك، ئەوە دروستە ئەوەندە زەکاتی بدرێتێ کە قەرزەکانی پێبداتەوە با خۆیشی پارەی هەبێ؛ مەبەست لەم جۆرە زەکاتدانە، هاندانی موسوڵمانانە بۆ چاکە کردن.

مەبەست لە ڕێبواریش، ئەو کەسەیە ڕێی بکەوێتە ئەو وڵاتەکە زەکاتەکەی تیا ئەدەن، یا خۆی خەڵکی ئەوێ بێ و بڕوا بۆ سەفەرێکی حەڵاڵ، خوا سەفەرەکەی فەرزی عەین بێ، وەك سەفەر بۆ فێربوونی عەقیدەو ئادابی دینی خۆی، یا فەرزی کیفایە بێ، وەك سەفەر بۆ فێربوونی پیشەیەك کە پێویست بێ بۆ موسوڵمانان، یا سوننەت بێ وەك سەفەر بۆ بەسەر کردنەوەی خزمو کەسوکار، یا مەباح بێ، وەك بۆ دیتنی دۆستان، یا لەبەر بێتاقەتی، بەو شەرتە کە نیازێکی نادروستی لەدڵا نەبێ، خواهئەو سەفەرە کەمتر بێ لە دوو قۆناغ یا زیاتر بێ؛ دروستە ئەوەندە زەکات بدرێ بەم ڕێبوارە کە بەشی سەفەرەکەی بکا، بەڵام ئەگەرکابرای ڕێبوار بە بێمەبەست ئەسووڕایەوە، ئەوە زەکاتی نادرێتێ، چونکە ئەبێ بە یارمەتی دانی گوناح.

مەبەستیش لە بەندەی کاغەز پێدراو، ئەو کەسەیە کە خاوەنەکەی بۆی نووسیبێ ئەگەر ئەوەندە دیناری بەوەندە جار بۆ بهێنێ، ئازاد بێ؛ ئەم جۆرەش، زەکاتی ئەدرێتێ بۆ ئەوەی ڕزگار ببێ لە کۆیلەیی، چونکە ئایینی ئیسلام زۆر ئارەزووی لە ئازادکردنی بەندەیە وگەلێ شتی داناوە بۆ ئەوەی ببێ بەهۆی ئازادکردنی بەندە؛ ئەمجۆرە، ئەمڕۆ لە وڵاتانی ئیسلاما نایابە و بەتایبەتی، لە وڵاتی ئێمەدا نییە.

مەبەستیش لە نۆموسوڵمانی دڵ ڕاگیرکراو، ئەو کەسەیە کە موسوڵمان بووبێ و هێشتا تەواو دڵی لەسەر ئیسلامەتی دانەمەزرابێ، یا موسوڵمان بووبێ و کەسوکاری

خۆی دەس‌بەرداری بووبن وە ئەگەر لەناو موسوڵمانانا یارمەتی نەدرێ، پەکی بکەوێ یا باوەری زەدە بێ؛ هەروا، ئەو کەسەیە کە بەهۆی زەکات پێدانیەوە هیوای ئەوەمان بێ خەڵکی‌تریش موسوڵمان بین؛ ئەوانەشن کە زەکات نەدەر ئەترسێنن، یا سنووری وڵات ئەپارێزن و دوژمن ئەترسێنن، یا بەرپەرچی کەللەرەقانی ناو خۆ ئەدەنەوە و نایەڵن سەرکێشی بکەن؛ بەپێی پەیرەوی ئیمامی شافیعی، ئەمانە هەموویان زەکاتیان ئەدرێتێ.

مەبەست لە غەزاکەری رێگای خودایش، ئەوانەن کە لەبەر رەزامەندیی خوا غەزا ئەکەن، بێ ئەوەی مووچەیەکیان بۆ برابێتەوە لە «بیتُ‌المال»ی موسوڵمانان؛ ئەمانە ئەوەندەیان زەکات ئەدرێتێ کە بەشی گوزەرانی خۆیان و ماڵ و خێزانیان بکا تا ئەرۆن بۆ سەفەری غەزا وە ئەگەرێنەوە.

## لەسەر چ ئەساسێ زەکات ئەدرێ بە خاوەن‌حەق؟

ئەگەر کەسێ داوای زەکاتی کرد و فەرمانرەوای ئیسلام یا خاوەن‌ماڵ ئەیزانی پێی‌ئەشێ، پێویستە بەپێی زانستەکەی خۆی زەکاتی بداتێ. ئەگەر کابرایەك ئیددیعای لاتی یا گەدایی ئەکرد و مەعلووم نەبوو راست ئەکا یا نە، ئەوە داوای شاهیدی لێ ناکرێ. ئەگەر کەسێك ـکە لەناو خەڵکا بە خاوەن‌ماڵ ناسرابوو ـ ئیددیعای فەوتانی ماڵەکەی کرد، ئەبێ بە شاهید ئیسپاتی بکاکە ماڵەکەی فەوتاوە، یا ئەگەر ئیددیعای کرد کە مناڵ و خێزانی زۆرە، ئەمیش ئەبێ ئیسپاتی بکاکە ئیددیعاکەی راستە. لات و گەدا ئەوەندەیان زەکات ئەدرێتێ کە بەشی عومری غاڵبیان بکاکە بریتییە لە ٦٠ ـ ٧٠ ساڵ؛ بەم‌جۆرە ئەگەر توانای کاسبی کردنیان هەبوو، سەرمایەیان ئەدرێتێ کە کاسبی پێوە بکەن، ئەگینا باخێك یا دووکانێك یا چەند سەر حەیوانیان بۆ ئەکرێ تا بە بەرهەمەکەی بژین.

ئەم هەشت تاقمە کە باسمان کرد، ئێستا چواریان هەن: لات و گەدا و رێوار و قەرزار؛ جا ئەگەر فەرمانرەوای موسوڵمانان یا خاوەن‌ماڵ زەکاتیان دابەش کرد، ئەبێ

بەشی هەر چوار تاقمەکە بدەن ئەوەندەی یەك، هەرچەند پێویست ناکا بەشی یەکەیەکەی هەر تاقمێکیان ئەوەندەی یەك بێ؛ بەڵام ئەگەر خاوەنماڵ زەکاتی دابەش ئەکرد و ماڵەکە بەشی هەمووی نەئەکرد، پێویستە لە هەرجۆرێ بەشی سێ کەس بدا، ئەگەر بەشی ئەوەندەشی نەئەکرد، ئەوە ئەبێ بەپێی توانا دابەشی بکا بەسەریانا و تا ئەم تاقمانە لەو وڵاتەدا بین کە زەکاتەکەی تیا ئەدرێ، دروست نییە خاوەنماڵ زەکاتی خۆی بنێرێ بۆ وڵاتێکی تر.

شەرتی زەکات وەرگر، ئەوەیە موسوڵمان بێ و لە ئەولادی «هاشِم» و «مُطَّلِب» نەبێ، چونکە ئەمانە حەقیان لە بیستو پێنج یەکی «فَیْء» و «غَنیمة» دایە، تا ئێرە ئەسڵی مەزهەبی ئیمامی شافیعییە ـ خوای لێ رازی بێ ـ بەڵام بۆ ئەم زەمانە کە «بیت‌المال» وەك جاران نەماوە و ئەم «هاشمی» و «مُطلّبي» یانە «خُمس الخُمس» (پێنج یەکی پێنج یەکیان) نادرێتێ و زەحمەتیشە بۆ خاوەن ماڵ بەپێی ئەسڵی مەزهەبی شافیعی بجووڵێتەوەوە زۆر داماوی بێ دەس هەیە لە شوێنی‌ترا جگە لەو شوێنەی کە زەکاتەکە هی ئەوێیە، چاك وایە ئینسان تەقلیدی ئەو ئیمامانە بکا کە فەرموویانە: دروستە زەکات بدرێ بەتەنیا تاقمێك لەم تاقمانە، بەڵکوو بە تاقەکەسێك لە تاقمێك لەو تاقمانە و دروستە زەکات بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی‌تر و دروستە لەکاتی نەمانی پێنج‌یەکدا زەکات بدرێ بەوانە کە لە ئەولادی «هاشم» و «مطلّب»ن کە «سَیِّد» بەعزێکیانن؛ ئەمە، فەرموودەی ئیمامی «أبو حَنیفة»یە، هەروەها فەرموودەی گەلێکیشە لە زانایانی شافیعی مەزهەب، وەك ئیمامی «إصْطَخري» و «أَذرعي» و «سُبْكي» و «أَسنَوي» و غەیری ئەمانەیش؛ ئەم تەقلیدە یەك‌جار بکرێ، بەسە بۆ هەموو ماوەی ژیان و پێویست نییە ئینسان لە تەقلید کردنا ناوی ئیمامەکان بزانێ، ئەوەندە بەسە باوەڕی بێ کەوا ئەم فەرموودەیە فەرموودەی ئیمامێکە لە ئیمامە باوەڕپێ‌کراوەکانی ئیسلام و رازی بێ بە فەرموودەکەی؛ ئەم باسە، لە حاشیەی «شیرواني» و لە «إعانة» و لە حاشیەی «شَرحْ مَنهج» و «نِهایة» و گەلێ کتێبی‌تری گەورەی شەرعا، نووسراوە.

## باسی سەدەقەی سوننەت

سەدەقەکردن، سوننەتە و حەڵاڵە بدرێ بە فەقیر و بە دەوڵەمەند، هەتاوەکوو بە کافرێکیش کە لە ئەهلی زیممە بێ؛ ئەم جۆرە سەدەقەیە، بە پەنامەکی بدرێ و لە مانگی رەمەزاندا و بۆ خزم و دراوسێ، گەلێ خێری زۆرترە. ئەگەر کەسێك قەرزار بێ، یا نەفەقەی واجبی خۆی و ماڵ و منداڵ و باوك و دایکی لەسەر بێ، سوننەتە لەپێشا واجبەکەی خۆی جێبەجێ بکا، ئەوسا خێر و خێرات بکا؛ بەڵکوو ئەگەر قەرزار بێ یاخود مەسرەفێکی واجبی لەسەر بێ، حەرامە سەدەقە بکا تا ئەمانە جێبەجێ ئەکا مادام ئومێدی ئەوەی نەبێ لەلایەکی ترەوە ماڵی دەس بکەوێ و سەرفی بکا لەو قەرز و نەفەقە واجبەدا.

پاش لێقەوماو، ئەبێ ئینسان سرنجی قازانج بدا؛ مەسەلا، هەر خێرێ ببێ بەهۆی ئاسایش و نەهێشتنی فیتنە، سەوابی زۆرترە. خێرکردن بە پیاوی بە حورمەتی لێقەوماو و بە تایبەت بە پیرو خاوەن خێزان، ئیحسانی گەلێك زۆرە؛ هەروا بۆ ئەو کەسانە کە بوونیان بۆ دین قازانج بێ، وەك خوێندەواری دین و ئەوانە بێچاون و قورئان لەبەر ئەکەن و ئەو کەسانە کە ئامۆژگاریی موسوڵمانان ئەکەن و دەرسی عولوومی دین ئەڵێنەوە، چونکە ئەگەر ئەمانە نەمێنن، ئادابی دین لەناو ئەچێ. سەدەقەی نەبڕاوە، گەلێك سوودی هەیە، وەك دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە، پاش ئەمە نان‌دان بە خەڵك و بە فریاد گەیشتنی کەسێ کە چارەی بڕابێ. پێویستە ئینسانی موسوڵمان لەکاتی سەدەقەکردنا هەمیشە ئەم بەراوردە بکا و خێری بەپەنامەکی بێ؛ بەڵێ، ئەگەر پیاوێکی وا بێ خەڵك چاوی لێبکەن، ئەوە تا بە ئاشکراتر حەسەنات بکا چاکترە.

## باسی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان واجب ئەبێ بە تەواوبوونی سی ڕۆژەی مانگی شەعبان، یا بە چاوپێکەوتنی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان لەلایەن پیاوێکی عادڵەوە، یا «مَستُور العَدالة»یش بێ؛ فەرقی نییە ئەو چاوپێکەوتنە بە چاوی ڕووت بێ یا بەهۆی دووربینەوە، بە پێچەوانەی ئەوەوەکە «شیروانی» ئەیلێت؛ بەڵێ، ئەگەر بەهۆی ئاوێنە یا ئاوەوە ببینێ، ئەوە لای «ابن حُجر» ئیعتیباری نییە، بەڵام گەلێکی تر لە زانایان ئیعتیباری ئەکەن و ئەڵێن: ئەوەی لە ئاوا یا بەهۆی ئاوێنەوە بینراوە، عەکسی مانگەو ئەگەر مانگ بە ئاسمانەوە نەبوایە، بە ئاوێنە یا لەناو ئاوا نەئەبینرا؛ ئەم فەرموودەیە، فەرموودەیەکی جوان و عەقڵ گیرە.

ڕەمەزان سابت نابێ بە چاوپێکەوتنی مانگ لەلایەن پیاوی فاسق و ژنەوە و بە قسە و حیسابی حیسابگەر و ئەستێرە ژمێر، بەڵام لەسەر خۆیان واجب ئەبێ بە ڕۆژوو بن، هەروەها لەسەر هەر کەس کە باوەڕیان پێ بکا. واجبە ئینسان پشت بەو نیشانە و عەلامەتانە ببەستێ کە لەو ناوچەیەدا بووە بە عادەت لە یەکەم شەوی ڕەمەزانا پیشان ئەدرێن، وەك ئاگر کردنەوە لەسەر لوتکەی کێو و چرا داگیرساندن لەسەر منارەو تۆپ تەقاندنی ئێوارەو تەپڵ لێدانی پارشێو، هەروەها، بۆ داهاتنی شەوی جەژنیش، ئەبێ پشت بەم نیشانانە ببەسترێ.

سابتبوونی ڕەمەزان ـ تێکرا ـ بەوە ئەبێ یا ئەو پیاوە عادڵە خۆی بڕوا بۆلای قازی شەهادەت بدا کەوا مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانی ئەو ساڵەی دیوە، یا لای دوو کەسی عادڵ شەهادەت بداو ئەوانیش بچنە لای قازی لەسەر شەهادەتەکەی ئەو شەهادەت بدەن و قازیش لەسەر ئەم شەهادەتە حوکم بدا بە داهاتنی مانگی ڕەمەزان؛ دروست نییە بۆ ئینسان لەسەر شۆرەت و لەسەر بیستن لە ژن و منداڵ و گوناهبار، بڕوا شەهادەت بدا لای قازی؛ پێویستیش نییە شاهید لە شەهادەتەکەیا بەیانی سیفەتی مانگەکە بکا کە ڕووی لە کوێ بووە، یا دووری و نزیکیی لە قەراخی ئاسمانەوە چەند بووە، چونکە ڕاگرتنی ئەمە شتێکی گرانە.

جا هەر کاتێ کە قازی حوکمی‌دا بە سابت‌بوونی مانگی ڕەمەزان، ئەو کاتە ڕۆژوو واجب ئەبێ لەسەر هەموو ئەهلی ئەو شوێنە لەوانە کە ڕۆژوویان لەسەر واجبەو لەسەر خەڵکی هەر وڵاتێکیش کە هاومەتڵەع بێ لەگەڵ ئەو شارەدا کە قازی حوکمی تیا داوە؛ مەعنای‌هاومەتڵەعیش ئەوەیە کاتێك مانگ یا ئەستێرەیەك لە یەکێکیانا بینرا، لەویشیانا ببینرێ، جیاوازی مەتڵەعیش بە پێچەوانەی ئەمەوەیە؛ دوو شار کە لەسەر یەك «خَطُّ الطُّول» بن، مەتڵەعیان جیانابێ؛ بە میسال، شاری بەغدا و سولەیمانی لە بەر ئەوەکە خەتی توولیان لەیەك ئەچێ، لە هەرکامیانا مانگ ببینرێ، لەویشیانا ئەبینرێ؛ هەروەها، هەرکاتێ لە وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتیدا مانگ ببینرێ، لە ڕۆژاوایەکەشدا ئەبینرێ‌و مانگ، لەوێ بەرزتر ئەبێ تا لە وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکە، بەڵام پێویست ناکا ئەگەر مانگ لە ڕۆژئاواییەکەدا بینرا، لە ڕۆژهەڵاتییەکەشدا ببینرێ، بۆیە زۆر وا هەڵ ئەکەوێ لە دیمەشقا مانگ ئەبینرێ، کەچی لە سولەیمانیدا نابینرێ، چونکە مەتڵەعیان جیایە؛ ئەمە، فەرموودەی ئیمامی «سُبْکی»یە؛ «اَبو مَخرَمە»، ئەگێڕێتەوە لە ئیمامی «نەوەوی» کەوا: هەر دوو شارێکی لەیەك جیا لە ڕۆژهەڵاتیەت و ڕۆژئاواییدا کە بەینیان هەشت دەرەجەی فەلەکی یا کەمتر بێ، ئەوە هاومەتڵەعن و مانگ لە هەرکامیانا بینرا، لەویشیانا ئەبینرێ، بەڵام ئەگەر بەینیان لە هەشت دەرەجە زیاتر بوو، ئەوە یا مەتڵەعیان بە ڕاستی جیایە، یاخود گومان ئەکرێ کە مەتڵەعیان جیا بێ.

**بزانن!** ئاسمان کراوە بە سێسەد و شەست دەرەجەوە، هەر دەرەجەیەکی، ڕۆژ بە چوار دەقیقە ئەیبڕێ؛ کەواتە، هەر دوو شارێ مابەینیان هەشت دەرەجە بێ، مەعنای وایە وەختی بانگیان لەیەك جیا ئەبێتەوە بە ئەندازەی سی‌ودوو دەقیقە و تا ئەم ئەندازە بە هاومەتڵەع دائەنرێن، ئەگەر زیادیشی کرد، مەتڵەعیان جیا ئەبێتەوە.

جا هەروەختێ بە بڕیاری قازی ڕۆژوومان گرت و بەو حیسابە سی ڕۆژمان تەواو کرد لەو وڵاتەدا، ئەوە بە قەتعی جەژن ئەکەین، هەرچەند مانگی شەشەڵان (شَوّال)یش نەبینین لە سایەقەی سافا، بەڵام ئەگەر ڕۆژووەکەمان لەسەر بنچینەی باوەڕکردن بوو بە قسەی ژن و مناڵ و پیاوی فاسق و حیسابگەر و ئەستێرە ژمێر، یا لەسەر قسەی

دەمبەدەم بوو، ئەوە ئەبێ ڕۆژوو نەشکێنین تا مانگ ئەبینین، چونکە بیناغەی ڕۆژوو گرتنەکەمان قایم نییە.

ئەگەر لە ئەووەڵی ڕەمەزانا بینینی مانگ سابت نەبوو بە یەکێ لەو نەوعانەکە وتمان، ئەوە دروست نییە ئەو ڕۆژووە بەڕۆژوو بین، چونکە «يَومُ الشَّكّ»ە و حەزرەتی پێغەمبەر، فەرموویەتی: «هەرکەس لە «يَومُ الشَّك» دا بە ڕۆژوو بێ، ئەوە باوڕی بە پێغەمبەر نییە»؛ هەروەها، ئەگەر سەرەتای مانگی قوربانیش سابت نەبوو، ڕۆژی عەرەفە ئەبێ بە «يوم الشّك» و حەرام ئەبێ تیا بە ڕۆژوو بین، چونکە هەڵەگرێ ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژن بێ، وەك لە «شیروانی» دا نووسراوە؛ بەڵێ، شك لە ئاخری ڕەمەزانا زەرەری نییە و دروستە ئینسان بڵێ نییەتم هەیە سبەینێ بەڕۆژوو بم ئەگەر لە مانگی ڕەمەزان بوو، چونکە مادام بیست‌ونۆ ڕۆژ لە ڕەمەزان گیراوە، وادیارە ئەم ڕۆژی سێهەمەش هەر لە ڕەمەزان بێ و مانگەکە تەواو بێ، وەك لە «تُحفه»دا وتراوە.

لەسەر ئەساسی پێشوو، ئەگەر مانگ لەشاری ئێمەدا سابت بوو و بە سەفەر چووین بۆ شارێ‌کە مەتڵەعی لەگەڵ شارەکەی ئێمە جیا بوو و لەپاش ئێمە بەڕۆژوو بووبوون، پێویستە لە ئاخری مانگا لەبەر حورمەتی ڕەمەزان، لەگەڵ خەڵکی ئەو شارە بەڕۆژوو بین؛ ئەگەر چوویشینە شارێ‌کە خەڵکی ئەوێ لەپێش شاری ئێمەدا جەژنیان ئەکرد، جەژنیان لەگەڵ ئەکەین و لەپاشا ڕۆژێ قەزا ئەکەینەوە وە ئەگەر خۆمان جەژنمان کرد و بە فڕۆکە (طَيّارة) چووین بۆ شارێ‌کە لەوێ دوارۆژی ڕەمەزان بوو، پێویستە لەبەر حورمەتی ڕەمەزان لەوێ هیچ نەخۆین.

شەرتی ئەوکەسەکە ڕۆژووی لەسەر واجب ئەبێ، ئەوەیە موسوڵمان و عاقڵ و باڵغ و پاك بێ لە خوێنی حەیز و زەیسانی لە هەموو، سەعاتەکانی ڕۆژا؛ ئەگەر واش ڕێکەوت بەدرێژایی ڕۆژ نووست ڕۆژووەکەی دائەمەزرێ؛ هەروەها، ئەگەر بەدرێژایی ڕۆژ هۆشی لەخۆی نەبوو تەنها یەك دەقیقە نەبێ، ڕۆژووەکەی دائەمەزرێ. شەرتە بۆ دامەزرانی ڕۆژوو، هەموو شەوێ ڕۆژووەوانەکە بە دڵ نییەتی فەرزی ڕۆژووی سبەینێی ڕەمەزانی ئەو ساڵە بهێنێ، ئیتر ئەم نییەتە لە هەرکاتێکی شەوا بێ، لەپاش

مەغریبەوە تا بەرەبەیان، فەرقی نییە؛ ئەگەر لەپاش نییەتەکەی شتی خوارد، یا چووە لای ژنەکەی، نییەتەکەی بەتاڵ نابێتەوە. ئەگەر تا رۆژیش ئەبێتەوە لەشی پیس بێ و لە رۆژا خۆی بشۆرێ، قەیدی نییە، بەڵام سوننەتە هەر لەشەوا خۆی بشوا بۆ ئەوەکە لە رۆژا بەهۆی خۆشۆردنەوە ئاو نەچێتە قورگ و ئەندامەکانی تری لەشی؛ بەڵێ، نییەتی رۆژووی سوننەت واجب نییە لە شەوابێ، ئەگەر لە رۆژا شتی نەخواردبوو تا پێش نیوەڕۆ، دروستە نییەتی رۆژووی سوننەت بهێنێ و بۆی حیساب ئەکرێ بە رۆژوو.

## ئەو شتانەکە رۆژوو بەتاڵ ئەکەنەوە

رۆژوو، بەتاڵ ئەبێتەوە بە «جِماع» لە رۆژی رەمەزانا ئەگەر بە ئارەزووی خۆی بێ و بزانێ رۆژووی پێ ئەشکێ و لەبیریشی بێ، خوا ئاوی بێتەوە یا نە، بەڵام ئەگەر بەزۆری کەسێ بوو، یاخود نەیئەزانی رۆژووی پێ ئەشکێ و لەم نەزانینەشا عوزری هەبوو بەو رەنگەکە تازە موسوڵمان بووبوو یاخود لە وڵاتێکی دوور لە مەلا بوو، یا لە بیری نەبوو کە رۆژوو بە جیماع ئەشکێ، ئەوە رۆژووەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

هەروەها، رۆژوو، بەتاڵ ئەبێتەوە بە «استِمناء» (هێنانەوەی ئاوی خۆی)، چ بە سوورەتێکی حەڵاڵ بێ، وەك بە دەستی ژنەکەی، یا بە سوورەتێکی حەرام بێ، وەك بە دەستی خۆی، بە رووتی دەستی پیا بهێنرێ، یاخود بەسەر جلێکەوە، بەو شەرتەکابرا بزانێ رۆژووی پێ ئەشکێ و لەبیری بێ کە بەڕۆژووە و بە زۆری کەس نەبێ، بەڵام ئەگەر زەکەری خوراند لەبەر نەخۆشییەکی وەك سەودا و ئاوی هاتەوە، رۆژووی ناشکێ، مەگەر هەمیشە عادەتی وابێ هەرکە زەکەری بخورێنێ، ئاوی بێتەوە، لە حاڵیوادا رۆژووەکەی ئەشکێ مەگەر ناچار بێ، وەك ئەوەکە نەتوانێ نەیخورێنێ، ئەوە عەفوی لێ ئەدرێ.

هەروەها، رۆژوو بەتاڵ ئەبێتەوە بە دەرچوونی مەنی بەهۆی دەستدان لە زەکەرێك یا لە فەرجێکەوە، یا لە پێستی ژنێکی نامەحرەمەوە، یا بەهۆی ماچ کردنیەوە، یا بەهۆی راکشان لەگەڵیا، بەجۆرێ کە لەشی بدا لە لەشی ژنەکە بە رووتی. رۆژوو، بەتاڵ نابێتەوە

بە دەرچوونی مەنی بەهۆی راکشان لەگەڵ ژنێکی نامەحرەما بە جلەوە، یا بەهۆی دەستدانەوە لە پێستی ژنێکی مەحرەم، وەك دایك و خوشك و خەسووی، یا بەهۆی دەستدانەوە لە منداڵێکی بێموو یا ماچکردنی یا باوەش پیاکردنی ئەگەر بەنیازی دەرچوونی مەنی ئەوەی نەکردبێ و لە حاڵی خۆیشیا عادەتیوا نەبێ بەمجۆرە وەزعانە ئاوی بێتەوە، ئەگینا رۆژووەکەی ئەشکێ. هەروەها، رۆژوو ناشکێ بە دەرچوونی مەنی بەهۆی بیرکردنەوەوە لە وێنەی ئافرەتێك، یا بەهۆی روانینەوە بۆی، یا بەهۆی دەستدانەوە لە فەرجی حەیوانێك، ئەگەر عادەتی وانەبێ بەمجۆرە ئیشانە ئاوی بێتەوە؛ ئەگینا رۆژووەکەی ئەشکێ، چونکە شتەکە ئەبێ بە عەمدی.

دروستە بۆ رۆژووەوان ژنی خۆی ماچ بکا و دەست بکاتە ملی، ئەگەر ترسی ئارەزوو هەڵسانی نەبوو، بەڵام باشتر ئەوەیە شتیوا نەکا؛ ئەگەر ترسی هەبوو کە ئارەزووی هەڵسێ و ئاوی بێتەوە، ئەوە مەکرووهە بەکەراهەتی تەحریمی.

رۆژوو، بەتاڵ ئەبێتەوە بەوەکە رۆژووەوان بە ئارەزوو خۆی بڕشێنێتەوە، هەرچەند هیچ لەو رشانەوەیەی نەڕواتەوە ناو سکی، بەڵام ئەگەر بە ناچاری رشایەوە، ئەوە زیانی نییە، مادام رشانەوەکەی قووت نەدات، بەڵکوو ئەگەر کەمێکیشی بە ناچاری قووت بدا، ئەوە عەفوی لێ ئەدرێ و رۆژووەکەی ناشکێ. رۆژوو، ناشکێ بەوە کە ئینسان لۆکەیەك بخاتە کونی گوێی یا کونی لووتی، یا بیخاتە پاشی لە ترسی خوێنی مایەسیری، یا ئافرەت لەترسی خوێنی ناساغی بیخاتە کونی فەرجی و بە رۆژا دەری کێشێ و فڕێی بدا. ئەگەر رۆژووەوان پارچە بەڵغەمێکی هەڵکەندو فڕێیدا، ئەوە بۆ رۆژووەکەی زیانی نییە؛ ئەگەر لەدەمیشیا هێشتیەوە و لەپاشا قووتیدا، رۆژووەکەی ئەشکێ؛ ئەگەر پارچە بەڵغەمێك لە دەماغیەوە هاتە خوارەوە، یا لە سنگی هاتە دەرەوە، یاخود بەهۆی کۆکەوە گەیشتە سنووری دەرەوە ـکە مەخرەجی «ح»یی بێنوختەیە ـ و فڕێیدا، ئەوە عەیبی نییە؛ ئەگەر قووتی دایەوە، یا موبالاتی نەکرد بە فڕێدانی تا خۆی رۆیشتە خوارەوە، ئەوە بەقەتعی رۆژووەکەی ئەشکێ، بەڵام ئەگەر ئینسانەکە گیرۆدەی دەردی کۆکە بوو و بەڵغەمی زۆر بوو، ئەوە عەفوی لێ ئەدرێ ئەگەر جار جار لەبەر ناچاری بەڵغەمەکەی قووت بداتەوە.

ڕۆژوو، بەتاڵ ئەبێتەوە بە گەیشتنی شتێ کە بەپێی عورف ماددەی هەبێ بۆ هەر شوێنێ کە بەپێی عورف پێی بڵێن بۆشایی، خوا ئەو شوێنە هێزێکی وای ببێ کە خواردەمەنی یا دەرمان بگۆڕێ، یا نە؛ کەواتە ڕۆژوو ئەشکێ بە گەیشتنی بڕنووتی بۆ بڕناخ و نان و ئاو و خواردەمەنی و هەر شتێك بۆ ناو قوڕگ و سنگ و مەعدە و ریخۆڵە؛ هەروا بە شاف هەڵگرتن و دەرمانکردنە ناو میزەڵدان بە ترومپا و شتیوا [و] بە دەرمان تکاندنە ناو گوێیش. هەروەها، ئەگەر کەسێك سەری بشکێ ودەرمانی بکەن و ئەو دەرمانە بچێتە خوارەوە بۆ ناو دەماخی، یا خەنجەرێکی لێبدرێ و دەرمانی بکەن و دەرمانەکە بگاتە ناو سکی، ڕۆژووەکەی ئەشکێ؛ بەڵام ڕۆژوو ناشکێ بەوەکە چاوی بڕێژێ و وردەی ئەو کلەیەکە چاوی پێڕشتووە داپەڕێ بۆ ناو قوڕگی، چونکە ئەوە ڕێگەی عادەتی نییە. هەروەها، ڕۆژوو ناشکێ بەوەکە مەڵهەمێ بدا لە لەشی و لە بنی مووەکانیەوە چەوریی ئەو مەڵهەمە بڕواتە ناولەشیەوە، یاخود شرنقەیەك بدا لە خۆی و دەرمانی شرنقەکە بڕواتە ناو ڕەگەکانیەوەو تێکەڵی خوێنی ببێ، با تەئسیریش لە دڵ و جگەرو ناوسك و ئەندامانیتری لەشی بکا لەناوەوە؛ بەڵێ، ئەگەر دەرزییەکی کرد بە پێستی سکیا و دەرزییەکە گەیشتە ناوسکی، ئەوە ڕۆژووەکەی ئەشکێ.

ڕۆژوو ناشکێ بە بۆنکردنی گوڵ و شتیبۆندار و بە وەرگرتنی بۆنی بخوور، چونکە بۆن لە عورفا بە مادده دانانرێ، بەڵام ئەشکێ بە هەڵمژینی دووکەڵی جگەرە و قلیان و سەبیل، مادام بگاتە دەماغ یا بگاتە قوڕگ، چونکە ئەم دووکەڵە عەینێکی ڕاستییە و عورفیش ئیعتیباری ئەکاو نیشانەی دووکەڵەکەیش لەناو قلیان و سەبیل و دەمنەجگەرەدا دیارەو توێژ ئەبەستێ بەجۆرێ کە پێویستی بە پاك کردنەوەیە؛ «مَعَ العِلم»، ئەوەی کە ئەلکێ بە قلیان و سەبیل و دەمنە جگەرەکەوە، کەمترە لەوەی کە ئەڕواتە دەماخ و قوڕگی جگەرەکێشەکە؛ هەرکەسێ پارچەیەك کەتان بخاتە سەر دەمنە جگەرەیەك و هەناسەی لێوەبکێشێ، ئەزانێ ئەو کەتانە چی بەسەر دێت؛ بەڵێ، ئینسانێ کە لەسەر تەنوور نان و چێشت بکا، هەرچەند دووکەڵی زۆر بڕوا بە قوڕگیا، ئەوە عەفوی لێ ئەدرێ، چونکە ناچارییە.

**بزانن!** شەرتی رۆژوو بەتاڵەوە بوون بەمانە، ئەوەیە بە ئارەزوو بێ و کابرا بزانێ رۆژووی پێ ئەشکێ و لەبیری بێ؛ کەواتە، ئەگەر بەزۆر خواردەمەنی دەرخوارد درا، یا ئاو و شتیوای کرا بە قوڕگا، یا کابرا دوور بوو لە عالمانی دین و نەیئەزانی ئەم خواردەمەنییانە رۆژوو ئەشکێنن، یاخود لەسەر خەیاڵ نەبوو کە بەرۆژووە تا نان و ئاوەکەی خوارد، ئەوە رۆژووەکەی ناشکێ. هەروەها، رۆژوو ناشکێ بەوە کە مێشێ بچێ بە قوڕگی رۆژووەوانا، یا تۆزی ئارد لەکاتی ئارد بێژانا بچێتە قوڕگی، یا پاشماوەی خواردەمەنی لە بەینی دانەکانیا مابێتەوە و لەگەڵ تفاقووتی دابێ، بەو شەرتە نەتوانێ بەتەواوی دانەکانی پاك بکاتەوە؛ هەروەها، ئەگەر تفی دەمی خۆی کۆکاتەوە و قووتی بدا، رۆژووەکەی ناشکێ.

ئەگەر دەزوویەکی بە تف تەڕ کردو دەزووەکەی هێنایە دەرەوە، ئەمجار خستیەوە ناودەمی و هەڵیمژی و تەڕایی لەو دەزووە جیابووەوە و قووتیدا، ئەوە رۆژووەکەی ئەشکێ؛ هەروەها، ئەگەر خوێنی بنی دانەکانی تێکەڵی تف بوو و قووتیدا،رۆژووەکەی ئەشکێ، مەگەر گیرۆدەی خوێن رۆیشتنی پووکی بووبێ، ئەوە عەفوی لێ ئەدرێ. هەروەها، رۆژوو ئەشکێ بە بنێشت جوین ئەگەر هیچی لێ جیا ببێتەوە و قووت بچێ. ئەگەر رۆژووەوان موبالەغەی کرد لە ئاوڕادانا لە دەم و لووتیو ئاو پەڕییە قوڕگی، ئەوە رۆژووەکەی ئەشکێ، ئەگەر بەڕێکەوت ئاو پەڕییە قوڕگی قەیدی نییە؛ ئەگەر کەسێك خۆی کرد بە ئاوێکا و ئاو رۆیشتە ناو لووتی یا ناو گوێچکەیەوە، ئەمە ئەگەر ماوەی بووبوو بە بێ خۆ کردن بە ئاوا خۆی بشۆرێ و ئەیشیزانی ئاو ئەڕواتە لووت و گوێیەوە، ئەوە رۆژووەکەی ئەشکێ، ئەگینا ناشکێ. هەر وەکوو ناشکێ بە خوێنگرتن و کەڵەشاخگرتن.

سوننەتە بۆ رۆژووەوان لە هەموو دەسنوێژێکیا، چ پێش نیوەڕۆ و چ پاش نیوەڕۆ، بێ موبالەغە ئاو لە دەم و لووتی رابدا؛ هەروەها سیواك کردنیش سوننەتە بۆی تا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لائەدا، لەوەلا کەراهەتی هەیە.

لە شەوا دروستە ئینسان شت بخوا، مادام باوەڕی وابێ هێشتا شەوە [و] ئەگەر لە ئاخری شەوا شتی خوارد بە خەیاڵی ئەوەکە شەو ماوە، کەچی دەرکەوت رۆژ بووەتەوە،

ئەوە رۆژووەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە؛ هەروەها، ئەگەر لە ئاخری رۆژا شتی خوارد بە خەیاڵی ئەوەکە رۆژ ئاوا بووە، کەچی دەرکەوت بەهەڵەدا چووە وە هێشتا رۆژە، ئەوە رۆژووەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە؛ ئەگەر تیکەیەك لەدەمیا بوو و تولووعی دا ئەویش گورج تیکەکەی فڕێدا، ئەوە رۆژووەکەی دامەزراوە. ئەگەر خەریکی جیماع بوو و هەر کە تولووعیدا گورج هاتە لاوە، ئەوە رۆژووەکەی دروستە، ئەگینا دانامەزرێ.

ئەگەر ژنێکی خاوەن حەیز نییەتی هێنا سبەینێ بەرۆژوو بێ و هەر لەو شەوەدا خوێنی وەستایەوە، ئەوە دروستە سبەینێ بەرۆژوو بێ، بەو شەرتە ئەو شەوە کە نییەتەکەی تیا هێناوە، شەوی لای ژووررووی ماوەی حەیزی بێ، یاخود لەسەر عادەتی پێشووی وەختی تەواو بوونی حەیزەکە، شەوی مابێ و دووبارە نییەتی هێنابێتەوە.

**بزانن!** رۆژوو دروست نییە لە رۆژی جەژنی رەمەزان و قوربان و سێ رۆژەی پاش جەژنی قورباندا کە مەشهوورن بە «ايّـامُ التّشـريق»، یەعنی سێ رۆژەی حەیوان سەربڕین بۆ قوربانی؛ هەروەها دروست نییە رۆژووی رەمەزان لە «يوْم الشّك»دا، وەك وتمان؛ رۆژووی سوننەتیشی تیا دروست نیە مادام سەبەبێك نەبێ بۆ ئەو رۆژووە وەك قەزاکردنەوەی رۆژوو، یا وەفاکردن بە نەزرێ کە نەزری کردبێ لەسەر خۆی، یا وەك رێکەوتن لەگەڵ عادەتی رۆژووی سوننەتی خۆیا؛ مەسەلا، عادەتی وابووبێ هەموو دووشەممە و پێنجشەممەیەك بەرۆژوو بێ و یەکێك لەم رۆژانە رێکەوتی رۆژی «يومُ الشّك» بکا.

واجبە لە سەر باوك کە منداڵەکەی بوو بە حەوت ساڵان، فەرمانی بداتێ رۆژوو بگرێ ئەگەر لەتوانایا بێ و ئەبێ لە دە ساڵانا لێی بدا ئەگەر رۆژووی نەگرت. دروستە رۆژوو نەگرتن بۆ نەخۆشێ کە بەهۆی رۆژووگرتنەوە تووشی نارەحەتی ببێ بە جۆرێ کە تەیەمموم کردنی بۆ حەڵاڵ بێ، واجبیشە لەسەری تەرکی بکا ئەگەر ترسی لەگیانی بوو بەهۆی رۆژووەوە، یاخود ترسی بوو تووشی ئازارێکیوا ببێ کە پێی هەڵ نەگیرێ؛ ئەمە، عەقیدەی گەلێکە لە عالمانی مەزهەبی شافیعی؛ لە گەڵ ئەمەپیشا، ئەگەر هات‌و بەرۆژوو بوو، رۆژووەکەی دائەمەزرێ؛ جا ئەم نەخۆشە، ئەگەر نەخۆشییەکەی لە

شەوو رۆژا دەوامی بوو، ئەوە دیارە؛ ئەگەر هەندێ وەخت هەبوو و هەندێ وەخت نەبوو، لەم سوورەتەدا، ئەگەر لەپێش بەرەبەیانا ساغ بوو، ئەوە پێویستە نییەت بهێنێ، جا هەر کاتێ کە نەخۆشییەکەی تووش بووەوە، رۆژووەکەی بشکێنێ؛ ئەگەر لەپێش بەرەبەیانا نەخۆش بوو، ئەوە پێویست ناکا نییەت بهێنێ.

هەروەها دروستە بۆ کەسێ کە لە سەفەرێکی درێژیوادا بێ لە دوو قۆناغ کەمتر نەبێ، تەرکی رۆژوو بکا؛ بەڵێ، شەرتی بەرۆژوو نەبوون لە یەکەم رۆژی سەفەرەکەیا، ئەوەیە لە پێش بەرەبەیانا لە قەراغی ئەو شارە یا ئەو دێیە دەربچێ کە تیایەتی، ئەگینا پێویستە ئەو رۆژە بە رۆژوو بێ، رێبوار ئەگەر بەهۆی رۆژووەوە زەرەری پێ بگا، باشتر ئەوەیە بەرۆژوو نەبێ، ئەگینا بەرۆژوو بێ باشترە.

ئەگەر رێبوار و نەخۆش نییەتیان هێنا و بە رۆژووەوە رۆژیان کردەوە، بەڵام لەپاشا ویستیان بیشکێنن، ئەوە بۆیان دروستە. ئەگەر ئینسانێکی ساغ نییەتی هێنا و بە رۆژوو بوو و لەپاشا نەخۆش کەوت و بەهۆی رۆژووەکەیەوە ئازاری زیاتر ئەبوو، دروستە بیشکێنێ و ئەبێ لەم رۆژوو شکاندنەیا ئەوەی لە دڵا بێ کە روخسەتێکی شەرعی جێبەجێ ئەکا. ئەگەر یەکێکی نیشتەجێ بەرۆژوو بوو و چوو بۆ سەفەر، ئەوە نابێ رۆژووەکەی بشکێنێ تا [کاتێك کە] بەهۆی رۆژووەکەیەوە نارەحەت ئەبێ، چونکە لە ئەووەڵی رۆژەوە لە سەفەرا نەبووە. هەروەها، هەرکەسێ کە بەهۆی رۆژووەوە، ترسی گیانی، یا ئەندامێکی لەشی ببێ، یا بترسێ تووشی ئازارێکی نابار ببێ، ئەوە دروستە ـ بەڵکوو واجبە ـ ئەو رۆژە رۆژووەکەی بشکێنێ. ئەگەر رێبوارێ ـ کە نییەتی رۆژووی هێنابوو ـ بوو بە نیشتەجێ، ئەوە ئەبێ درێژە بە رۆژووەکەی بدا؛ هەروەها، نەخۆشێ کە نییەتی هێنابێ و پاشان چاك بووبێتەوە، ئەوە ئەویش ئەبێ دەوام بدا بە رۆژوەکەی.

ئافرەتی دووگیان کە ترسی لەبار چوونی منداڵەکەی ببێ بەهۆی رۆژووەوە، دروستە ـ بەڵکوو واجبە ـ بەرۆژوو نەبێ؛ هەروەها ئافرەتی منداڵ بە بەرکە ترسی ئەوەی هەبێ بە هۆی رۆژوو گرتنەوە مەمکی وشك ببێتەوە یا شیری ئەوەندە تیا نەمێنێ کە بەشی منداڵەکەی بکا، ئەویش واجبە رۆژوو نەگرێ لە بەر خاتری منداڵەکەی. شێخی

«ابنُ‌حجر»، لە «تُحفة»دا، فەرموویە: دروستە بۆ ئەو کەسانە کە ئیشەکەیان گرانە، وەك درەوی دەغڵ و گێرە و کێشە و ئاسنگەری و بەنایی، رۆژوو نەگرن بە سێ شەرت: یەکەم، ئەوەیە ئەو ئیشە نەتوانرێ بە شەو بکرێ، یا بکرێ بەڵام باش دەرنەچێ؛ دووهەم، ئەوەیە ئەگەر لەوەختا ئەو ئیشە نەکا، تووشی زیانی ماڵی ببێ بەجۆرێ کە بەعادەت تەحەممول نەکرێ؛ سێهەم، ـ وەکوو لە قسەی عالمانی ئوسووڵ دەرئەکەوێ ـ ئەوەیە کە ئەو ئیشە دوانزە مانگە نەبێ و قابیل بێ لە وەختێکی ترا رۆژووەکە بەقەزا بگێڕرێتەوە؛ بەڵام ئیمامی «أذْرَعي»، فەرموویەتی: واجبە لەسەر ئەوانەکە درەوی دەغڵ ئەکەن، بە شەو نییەت بێنن و بە رۆژ، بەرۆژوو بن تا نارەحەت ئەبن، کە نارەحەت بوون، ئەوسا رۆژووەکەیان بشکێنن؛ دیارە ئەم قسە زیاتر لە ئیحتیاتەوە نزیکە. ئەگەر هاتو قووتی رۆژانەی نەبوو بە بێ کاسبی کردن، ئەوە رۆژوو شکاندنی باشتر بۆ دروستە، بەڵام ئەوەندەی ناچاری. ئینسانی موسوڵمان بۆی دروستە بەپێی فەرموودەی ئەم ئیمامانە بجووڵێتەوە، بەڵام لەخوا بترسێ و نیازی ئەوەی ببێ کە پاش ئەو ماوەیە رۆژووەکەی بە قەزا بگێڕێتەوە و هەرکاتێ کە بۆی رێکەوت، قەزای بکاتەوە.

هەر کاتێ رێبوار و نەخۆش رۆژوویان نەگرت، پێویست ئەبێ لەسەریان قەزای بکەنەوە؛ هەروەها، ئافرەتی خاوەن حەیز و زەیسان و هەرکەس بەهۆی ئیشێکی گرانەوە تەرکی رۆژووی کردبێ [و] هەرکەس لەبەر عوزرێك رۆژووی شکاندبێ یا نەیگرتبێ، وەك ئافرەتی دووگیان و منداڵبەبەر؛ هەروەها، هەرکەسێك کە بەبێ‌عوزر و بەئارەزوو رۆژووی نەگرتبێ، یا شکاندبێتی؛ ئەوەندە هەیە ئەوانەی لەبەر عوزرێك بەرۆژوو نەبوون، یا رۆژوویان شکاندووە، واجب نییە دەس بەجێ قەزای بکەنەوە، بەڵام ئەوانە کە بە بێ‌عوزر وایان کردووە، ئەبێ دەسبەجێ قەزای بکەنەوە و بە دواخستنی گوناهبار ئەبن. هەروەها، واجبە قەزای رۆژوو لەسەر ئەو کەسەی رۆژووی فەوتابێ بەهۆی بێ‌هۆش بوونەوە یا بەهۆی ئەوەوە کە لە دین وەرگەڕابێ، بەڵام واجب نییە لەسەر منداڵ و شێت و کافری ئەسڵی لەپاش ئەوەی کە موسوڵمان ببێ.

ئەگەر منداڵێکی بەڕۆژوو لەکاتی ڕۆژووەکەیدا باڵغ بوو، ئەوە ڕۆژووەکەی بۆ حیساب ئەکرێ و قەزای لەسەر نییە. خۆگرتن لە خواردن واجب نییە لەسەر ڕێبوار و نەخۆشێك کە پاش ڕۆژوو نەگرتن عوزرەکەیان نەمێنێ، هەروەها، ئەگەر لەپێش شت خواردنا عوزرەکەیان لاچووبێ، بەو شەرتە شەو نییەتی ڕۆژوویان نەهێنابێ؛ بەڵام هەرکەسێ کە بەناحەق ڕۆژووی شکاندبێ، یاخود شەو لەبیری چووبێ نییەت بهێنێ، واجبە لەسەری بە ڕۆژا خۆی بگرێ لە خواردن و خواردنەوە و هەرچی کە حەرام بێ لەسەر ڕۆژووەوان؛ هەروەها، کەسێکیش لە ڕۆژی «یوم الشّك»دا شتی خواردبێ و لەپاش شتخواردنەکە سابت بووبێ کە ڕەمەزانە، واجبە لەسەری لە پاشماوەی ئەو ڕۆژەدا خۆی بگرێ لە هەرچی کە ڕۆژووی پێ بشکێ.

**بزانن!** هەر کەسێ لەبەر پیری نەتوانێ بەڕۆژوو بێ، یا ئەگەر بەڕۆژوو بێ ئازارێکی وای پێ بگا کە پێی تەحەممول نەکرێ، واجبە لەجیاتی ڕۆژووی هەر ڕۆژێ، «مُدّ»ێك، یەعنی مشتێك قووت بدا بە فەقیرێك؛ هەروەها، نەخۆشێکیش کە ئومێدی چاکبوونەوەی لێ نەکرێ.

## ئەوەی سوننەتە لە ڕۆژووی ڕەمەزانا و ئادابی شەوەکانی

ئیمامی غەزالی، فەرموویەتی: ڕۆژوو لەسەر سێ بەشە: ڕۆژووی گشتی و ڕۆژووی تایبەتی و ڕۆژووی تایبەتی لە تایبەتی؛ یەکەم، ئەوەیە کە واجباتەکەی جێبەجێ بکرێ و بپارێزرێ لەو شتانە کە ڕۆژوو بەتاڵ ئەکەنەوە و باقی ئادابە سوننەتەکانی بەجێ بهێنرێن؛ دووهەم، ئەوەیە کە ئینسانی بەڕۆژوو مەنعی هەموو حەواس و ئەندامانی لەشی خۆی بکا لە هەموو گوناهێك؛ مەسەلا، بەچاو تەماشای حەرام نەکا و نەڕوانێ بۆ شتێ کە غافڵی بکا لە یادی خوای تەعالا و بە گوێچکە، گوێ نەگرێ بۆ هیچ گوناهێ و زمانی بپارێزێ لە هەموو قسەیەکی ناشەرعی، وەك غەیبەت و فیتنەیی لەناو خەڵکاو وەك درۆ و بوختان و جنێو و شەڕەدەم و قسەی هیچوپووچ، هەتاوەکوو ئەگەر کەسێك جنێوی دایە ئەم، لە بەرابەریا بڵێ: «من، بەڕۆژووم»؛ بەشەویش ئەوەندە نەخوا کە

ئیسراحەتی لێ ببڕێ بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئاسانی خەریکی عیبادەت و قورئان خوێندن و زیکری خوا بێ؛ هەروا، ئەبێ لەپاش هەموو ڕۆژوویەك دڵی لەنێوانی ترس و ئومێدا بێ، چونکە نازانێ ئاخۆ خوای گەورە بە میهرەبانی ئەو ڕۆژووەی لێ وەرئەگرێ، یاخود لەبەر لەکەداریی ئەیداتەوە بەسەریا، هەروەك لە هەموو عیبادەتێکا ئەبێ موسوڵمان دڵی وەها بێ، بەڵام لای ئومێدی زۆرتر بێ؛ سێهەم، ئەوەیە لەماوەی ڕۆژووی ڕۆژ و عیبادەتی شەوا هەمیشە بە دڵ یادی خوا بکا و خوا بە حازر بزانێ وبیربکاتەوە لە سیفاتی بێباکی و میهرەبانیی ئەو و مەنعی نەفسی خۆی بکا لە فکر و بیری پەست و ڕوو بکاتە خەیاڵی بەرزی پیاوانە بەهۆی بەگەورە زانینی خوا و لادانەوە لە غەیری خوا.

ئەمە بەکورتی ئادابی ئەهلی ڕۆژوو بوو؛ ئەو سوننەتانەش کە ئەهلی شەرع فەرموویانە زۆرن؛ لەو سوننەتانەیە خەریك بوون بە قورئان خوێندن و زیکری خوداوە بەپێی توانا، بەتایبەتی لە دە شەوی ئاخریا کە «لَيلَةُ القَدر»یان تێئەکەوێ، بەڵکوو پایەی پیرۆزی ئەو شەوەی بەنسیب ببێ؛ هەروا، لەو سوننەتانەیە نوێژی تەراویح هەموو شەوێك پاش نوێژی عیشا و نوێژی وەتر بە جەماعەت لەپاش نوێژی تەراویح، وەك باسمان کرد.

سوننەتە ئەگەر ئینسان لەشپیسی بەسەرا هات، هەر شەو خۆی بشوا بۆ ئەوەکە بگا بە جەماعەتی بەیانیدا و پارێزگاری خۆی بکا لەوەکە لە خۆشۆردنی ڕۆژا ئاو بچێتە کونەلووت وکونەگوێیەوە و [ڕۆژووگر ئەبێ] بە ڕۆژ خۆی بپارێزێ لە بۆنکردنی گوڵ و تامکردنی چێشت و خواردەمەنیی تر، مەگەر ناچار بێ لەبەر چێشت لێنان؛ هەروا بنێشت نەجوێ، هەرچەند دڵنیاش بێ لەوەکە هیچی لێ جیا نابێتەوە. ئەبێ خوێنی خۆی بەرنەدا و کەڵەشاخ نەگرێ، نەوەك ئەوەندە بێهێز ببێ ڕۆژووەکەی پێنەگیرێ. ئەبێ خۆی بپارێزێ لە ماچکردنیژنی خۆی و لە هەرچی کە ئارەزووی نەفسی هەڵسێنێ. کە بەڕاستییش بۆی دەرکەوت شەو داهاتووە، بەپەلە ڕۆژووەکەی بشکێنێ، جا ئەگەر خورما هەبوو، بە خورما، ئەگینا بە ئاو بەربانگ بکاتەوە و لەو کاتەدا بڵێت:

**«اَللّهُمَّ لَكَ صُمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَ عَلى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ»**. سونن‌ەتە هەموو شەوێ پارشێو بکا و پارشێوەکەی بخاتە نزیکی بەیانییەوە بەو شەرتەکە دڵنیا بێ شەوی ماوە. سونن‌ەتە بەپێی توانای خۆی، خواردەمەنی بدا بە موسوڵمانان، بەتایبەتی بە هەژاران، بۆ ئەوەی ڕۆژووی پێبشکێنن و پارشێوی پێبکەن. خێر کردن لە مانگی ڕەمەزانا و بەتایبەتی لە دە ڕۆژی ئاخریا، سونن‌ەتێکی گەورەیە. هەروەها، سونن‌ەتە لەم مانگەدا زۆر بمێنێتەوە لە مزگەوتا، بۆ ئەوەی خۆی لە کردەوەی بێسوود و قسەی پڕوپووچ بپارێزێ.

## باسی فیدیە و کەفارەتی ڕۆژوو

هەرکەس ڕۆژووی ڕۆژێك یا زیاتری لە مانگی ڕەمەزان لەبەر عوزر فەوتاند و بەرلەوەی بۆی ڕێکەوێ قەزای بکاتەوە، مرد، ئەوە نە گوناهبار ئەبێ و نە فیدیە[1] و قەزای لەسەرە؛ بەڵام ئەگەر بە بێعوزر فەوتاندنی، یاخود مەجالی بوو قەزای بکاتەوە و بەئارەزوو قەزای نەکردەوە، ئەوە گوناهبار ئەبێ؛ لەسەر ڕۆشنترین فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعی، دروستە خزم و کەسی ئەو مردووە، لەجیاتی ئەو، ڕۆژووەکەی بۆ بەقەزا بگێڕنەوە، یاخود لەبریتی هەر ڕۆژ ڕۆژوویەك، مشتێ دەغڵ بدەن بە لاتێك لە کەفارەتدا، یا یەکێکی بۆ بەکرێ بگرن ڕۆژووەکەی بۆ بگێڕێتەوە؛ جا ئەگەر کابرای مردوو ماڵێکی لەپاش بەجێمابوو، واجبە یەکێ لەم دوو شتەی بۆ بکەن کە وتمان؛ ئەگەر میراتیشی نەبوو، ئەوە، بەسراوە بە ئارەزووی خۆیانەوە، یا ڕۆژووەکەی بۆ بگێڕنەوە، یا لە ماڵی خۆیان کەفارەتی بۆ بدەن، یا هیچیان نەکەن و گوێی نەدەنێ؛ ئەگەر کەسێکی بێگانە بە ئیزنی مردووەکە خۆی، یا لە سەر وەسیەتی ئەو، یا بە ئیزنی کەس‌وکارەکەی ڕۆژووەکەی بۆ بگێڕێتەوە، ئەوەش دروستە، ئەگینا دروست نییە، بەڵام

---

[1]. فیدیە: بەرامبەر بەو ڕۆژووەیە کە بە عوزر فەوتابێ و کابرا مەجالی نەبووبێ قەزای بکاتەوە؛ بەڵام کەفارەت بەرامبەر بەو ڕۆژووەیە کە بە بێعوزر فەوتابێ، ئیتر مەجالی بووبێ قەزای بکاتەوە و دوای خستبێ، یا هەر مەجالی نەبووبێ، یا بە عوزر فەوتابێ و مەجالی بووبێ قەزای بکاتەوە، بەڵام دوای خستبێ.

بێگانە ئەتوانێ بە بێ ئیزن وەرگرتن لە کەس‌وکاری مردووەکە، لە ماڵی خۆی کەفارەتی ڕۆژووەکەی بۆ بدا، چونکە ماڵ سەرف کردن عیبادەتی بەدەنی نییە و دروستە بێگانە جێبەجێی بکا؛ لە سوورەتێکیشا کە کابرای مردوو میراتی لێ بەجێبمێنێ و میراتگرەکان نە ڕۆژووەکەی بۆ بگرنەوە و نە کەفارەتی بۆ بدەن، واجب ئەبێ لەسەر حاکمی شەرع بەزۆر یەکێك لەم دووشتەیان پێبکا.

ئەگەر کەسێك مرد و نوێژی قەزای لەسەر بوو، ئەوە لەسەر ئەسڵی مەزهەبی شافیعی، نە دروستە کەس قەزای نوێژەکەی بۆ بکاتەوە و نە کەفارەتی بۆ ئەدرێ؛ هەروەها ئیعتیکافێکیش کە نەزری کردبێ لە سەرخۆیو فەوتابێ. بەڵام گەلێك لە عالمانی مەزهەبی شافیعی، فتوایان داوە کەوا دروستە خزم و کەسی مردووەکە نوێژە فەوتاوەکانی بۆ بگێڕنەوە؛ «ئیمامی سوبکی»، خۆی نوێژی لەجیاتی هەندێ خزم و کەسی مردووی قەزا کردووەتەوە. گەلێکیش لە زانایانی شافیعی مەزهەب، لەسەر ئەو باوەڕەن کەوا دروستە خزم و کەسی مردوو کەفارەتی نوێژە فەوتاوەکانی بۆ بدەن و لەجیاتی هەر نوێژێك مشتێ دەغڵ بدەن بە لاتێك، هەروەها، دروستە بێگانەیش بە بێ ئیزنی کەس کەفارەتی نوێژی فەوتاوی ئەو مردووە دەرکا.

جا لەسەر ئەم ئەساسە، لە مەزهەبی شافیعیدا، کەفارەت[1] دان بۆ ڕۆژوو و لەسەر فەرموودەی هەندێ لە عالمانی شافیعی، بۆ نوێژیش دروستە؛ هەروەك لەسەر فەرموودەی هەڵبژاردەی زانایانی مەزهەبی حەنەفییش دروستە؛ بەڵام بۆیە ئێستە لەسەر مەزهەبی حەنەفی ئەکرێ، چونکە لەم مەزهەبەدا دروستە کەفارەتەکە لەجیاتی دەغڵ بە پارە بێ، کەچی لای شافیعییەکان وایە ئەبێ هەر دەغڵ بێ [و] دیارە دانی پارەکە ئاسانترە لە دانی دەغڵ.

ئافرەتی دووگیان و مناڵ بەبەر، ئەگەر لەترسی گیانی خۆیان یا لەترسی نەخۆش کەوتنیان، ڕۆژوویان نەگرت، واجبە قەزای ڕۆژووەکە بکەنەوە و فیدیەیان لەسەر نییە؛ ئەگەر لە ترسی منداڵەکەیان ڕۆژوویان نەگرت، قەزای ڕۆژووەکە و فیدیەیشیان

---

١. ئەم کەفارەتە، ئێستا لە ولاتی ئێمەدا بە ئیسقات (إسقاط) مەشهوورە.

لەسەرە. هەروەها کەسێکیش کە بۆ رزگاربوونی یەکێك لە ئاو رۆژووەکەی بشکێنێ، قەزای رۆژووەکە و فیدیەیشی لەسەرە. بەڵام یەکێك هەر بە دەستی قەسد رۆژوو نەگرێ، هەر قەزای لەسەرە، چونکە تۆڵەی تاوانیوا، لای خوایە و بە کەفارەت چار ناکرێ. هەرکەس قەزای رۆژووی رەمەزانی بەئارەزوو دواخست تا رەمەزانێکیتر داهات، واجبە لەسەری لەگەڵ قەزای رۆژووەکەدا، بۆ هەر رۆژێ مشتێ قووت بدا لە کەفارەتا؛ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەم مشتە قووتە دووبارە ئەبێتەوە بەپێی دووبارە بوونەوەیساڵ تا ئەیگرێ و لە کۆڵی ئەکەوێ؛ ئەگەر لەپاش ساڵی یەکەم کابرا مرد، ئەوە بەرامبەر بە هەر رۆژێ دوو مشتی لەسەرە، مشتێ لەبەر فەوتاندنی رۆژووەکە و مشتێ لەبەر دواخستنی قەزاکەی.

**بزانن!** فیدیە و کەفارەت، هەر بە لات وگەدا ئەدرێن؛ دروستیشە چەند مشت بدرێ بە تاقە لاتێك؛ جینسی فیدیە و کەفارەتیش، هەر جینسی سەرفیترەیە، یەعنی لەو قووتەیە کە لە هەر قووتێکیتر زیاتر ئەخورێ لەو وڵاتەدا.

## باسی کەفارەتی جیماع لە رەمەزانا

هەر کەسێ بەڕۆژوو بێ لە مانگی رەمەزانا، بە رۆژووی رەمەزان و رۆژووەکەی بشکێنێ بە جیماع، بەجۆرێ کە گوناهی پێبگا بەهۆی شکاندنی رۆژووەکەوە، ئەوە واجبە لەسەری لەگەڵ قەزای رۆژوەکەدا، کەفارەتی ئەو جیماعە بدا، خواه جیماعەکەی لەگەڵ ئادەمیزادا بێ، یا لەگەڵ حەیوانا، لەپێشەوە بێ یا لەپاشەوە؛ کەواتە، کەفارەت نییە لەسەر کەسێ کە بەڕۆژوو نەبێ و جیماع بکا، یاخود بەڕۆژوو بێ، بەڵام رۆژووەکەی رۆژووی رەمەزان نەبێ؛ مەسەلا ئەو رۆژە بە رەمەزان نەزانێ و رۆژووی سوننەتی تیا بگرێ، یا قەزای رۆژوویەکی فەوتاوی تیا بکاتەوە.

کەفارەت نییە لەسەر رێبوارێك یا نەخۆشێك کە رۆژووی لەسەر واجب نەبێ و رۆژووەکەی بە جیماع بشکێنێ، یا لەسەر یەکێ کە لە پێشا رۆژووەکەی بشکێنێ ئەوسا جیماع بکا، یا کەسێ کە وەخت بە شەو بزانێ و جیماع بکا، ئەوسا دەربکەوێ ئەوکاتە

کە جیماعەکەی تیا کردووە رۆژ بووە؛ هەروەها، کەفارەت واجب نییە لەسەر کەسێ نەوموسوڵمان بێ یا لە وڵاتێکی وادا بێ دوور بێ لە زانایانی دین، یا بەزۆر ناچاری جیماع کردنی بکەن، یاخود بزانێ کە حەرامە و بە ئارەزووی نەفس بیکا، بەڵام لەیادی نەبێ کە بەرۆژووە؛ دیسان کەفارەت واجب نییە لەسەر کەسێك رۆژووی سوننەت یا رۆژووی فەرزی غەیری رەمەزان ـ وەك رۆژووی نەزر ـ بشکێنێ بە جیماع، یاخود رۆژووی رەمەزان بشکێنێ، بەڵام لە وەختی قەزا کردنەوەیدا بێ؛ واجبیش نییە لەسەر کەسێ رۆژووی رەمەزان بە غەیری جیماع بشکێنێ.

فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەم کەفارەتە تەنها لەسەر کابرا واجبە و بەس، خوا ژنەکەی نووستوو یا بەخەبەر بووبێ، رازی بووبێ یا نە.

ئەگەر کەسێك رۆژووی بە جیماع شکاند و لەپاش ئەوە لە هەمان رۆژا نەخۆش کەوت، یا چوو بۆ سەفەر، ئەوە هەر واجبە لەسەری کەفارەتەکە بدا، چونکە رۆژی رۆژووەکەی بە ناشەرعی شکاندووە. ئەگەر کەسێك لە [یەك] رەمەزانا چەند جار جیماع بکا، هەر یەك کەفارەتی لەسەرە؛ ئەگەر چەند رۆژیش جیماعی کرد، ئەبێ بەپێی رۆژەکان کەفارەت بدا، چونکە رۆژووی هەر رۆژێك عیبادەتێکی سەربەخۆیە.

کەفارەتی رۆژوو، یەکێکە لەم سێ شتە بەتەرتیب:

یەکەم: ئازاد کردنی بەندەیەکی ساغی بێعەیب؛

دووهەم: ئەگەر بەندە دەس نەکەوت ـ وەکوو لەم چەرخەی ئێمەدا ـ بەرۆژووبوونی دوومانگ یەك لەسەریەك؛

سێهەم: ئەگەر بە قسەی دوکتۆرێکی باوەڕ پێکراو، قابیلی ئەوە نەبوو دوو مانگ یەك لەسەریەك بەرۆژوو بێ، نانی شەست هەژار بدا، هەریەکە مشتێك قووتی ئەغڵەبی ئەو وڵاتەیان بداتێ؛ ئەگەر ئەمەشی پێنەکرا، کەفارەتەکە قەرز ئەبێ [و] بەسەریەوە ئەمێنێتەوە تا هەرکاتێ کە دەستی ئەڕوا، ئەوکاتە جێبەجێی ئەکا؛ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەگەر کابرا زۆر خاوەن شەهوەت بوو و نەیئەتوانی دوو مانگ یەكلەسەریەك بەرۆژوو بێ و بە رۆژا خۆی بگرێ جیماع نەکا، ئەوە ئەتوانێ شەست مشتە دەغڵەکە بدا بە هەژاران. دروست نییە کابرا ئەم کەفارەتە بدا بە خێزان و مناڵی خۆی.

## باسی ڕۆژووی سوننەت

ڕۆژووی سوننەت، خێری گەلێك زۆرە. حەزرەتﷺ فـەرموویەتی: «هـەرکەسێ لەبەر ڕەزامەندیی خوای تەعالا ڕۆژێ بەڕۆژوو بێ، خوا ڕێگای حەفتا پایز لە دۆزەخ دووری ئەخاتەوە».

ڕۆژووی سوننەت سێ جۆرە:

[جۆری] یەکەم: دووبارە ئەبێتەوە بە داهاتنی ساڵ؛ ئەمە، بریتییە لە ڕۆژووی نۆ ڕۆژی یەکەمی مانگی قوربان و بەتایبەتی ڕۆژی نۆهەمی کە «ڕۆژی عەرەفەیە»، بەو شەرتە کابرا لە سەفەرا نەبێ و خەریکی ئادابی حەج نەبێ و نەخۆش نـەبێ؛ هـەروا، ڕۆژووی نۆهەم و دەهەم و یازدەهەمی مانگی موحەڕڕەم و ڕۆژووی شەش ڕۆژەی شەشەلان لەپاش ڕۆژی جەژنەوە؛ سوننەتە ئەم شەش ڕۆژە بەیەکەوە بگیرێن و لەپاش ڕۆژی جەژن دوانەخرێن، هەرچەند بە یەکەیەکە و لە ناوەڕاست و ئاخری مانگیشا هەر دروستە؛ هەروا ڕۆژی پازدەهەمی شەعبانیش.

جۆری دووهەم: دووبارە ئەبێتەوە بە دووبارە بوونەوەی مانگ؛ ئەمەش، بریتییە لە «أيّامُ البيض»، واتە ئەو ڕۆژانەی بەشەو مانگیان تیا ئاوا نابێ کە سیازدە و چواردە و پازدەهەمی مانگن و «أيّامُ السُّود»، واتە ئەو ڕۆژانـەی شـەویان هـەمووی تـاریکە و مانگیان تیا دیار نییە کە بیستو هەشتو بیست نۆ و سێهەمی مانگن؛ ئەگەر مـانگ کەمیەك بوو، ڕۆژی یەکەمی مانگی تازەشیان بخاتەسەر؛ ئەگەر ئەمانەی بۆ نەئەگیرا، لە هەر مانگێکا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

سـوننەتە ڕۆژووی مـانگی «ذي‌القَـعدة» و «ذي‌الحـجّة» و «مـحرم» و «رجب» و «شعبان» جگە لە ڕۆژی جەژن و سێ ڕۆژەی «أيّام التّشريق». ئەگەر ئەمانەی هەموو بۆ نەگیرا، لە هەر مانگێکا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ. کەراهەتی هەیە بـەتایبەتی ڕۆژەکـانی جومعە بەڕۆژوو بێ، هەروەها کەراهەتی هەیە بەتایبەتی ڕۆژەکانی شەممە و یەکشەممە بەڕۆژوو بێ.

[جۆری سێهەم، دووبارە ئەبێتەوە بە دووبارە بوونەوەی هەفتە؛ ئەمەیش بریتییە لە ڕۆژووی دووشەممە و پێنجشەممەی هەموو هەفتەیەك][١].

کەراهەتی هەیە بەڕۆژوو بوونی تەواوی ساڵ بۆ کەسێ کە ترسی فەوتانی حەقێکی شەرعی لەسەر خۆی بێ؛ ئەگەر ئەو حەقە شەرعییە فەوتا ئەوە ڕۆژووەکەی حەرامە؛ ئەگەر ترسیشی نەبوو بفەوتێ، سوننەتە. باشترین شێوەی بەڕۆژووبوون، ئەوەیە ڕۆژێ بە ڕۆژووبێ و ڕۆژێ بەڕۆژوو نەبێ، بۆ ئەوە لەلایەکەوە لە عیبادەت دوور نەکەوێتەوە و لەلایەکی ترەوە حەقی گیانی خۆی و ماڵ و خێزانیشی بە جێ هێنابێ.

هەرکەس بەڕۆژوو بێ بەڕۆژووی سوننەت، دروستە بۆی بیشکێنێ، بەڵام کەراهەتی هەیە، مەگەر لەبەر میوان یا لەبەر ئەوەکە کەسێك دەعوەتی کردبێ و نەتوانێ خۆی بگرێ هیچ نەخوا، ئەو وەختە کەراهەتی نییە، بەڵکوو سوننەتە بیشکێنێ؛ هەروەهایە حوکمی نوێژی سوننەتیش، دروستە ببڕێ و کەراهەتیشی هەیە، قەزای ئەم ڕۆژوو و نوێژی سوننەتەیش پێویست نییە، بەڵکوو سوننەتە. هەرکەسێ خەریکی قەزا کردنەوەی ڕۆژوو یا نوێژی فەرز بێ، حەرامە یەکیانبخا، خواه وەختی خۆی بە بێعوزر ئەو نوێژ و ڕۆژووەی فەوتاندبێ یا بە عوزر. حەرامە لەسەر ژنی مێرددار لە غەیری عەرەفە و عاشوورادا ڕۆژووی سوننەت بگرێ، مەگەر مێردەکەی ڕێگای بدا، یاخود بزانێ کەوا ڕازییەتی.

گەورەترین ڕۆژوو بەپێی مانگ، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانە، جا هی مانگی موحەڕڕەم، جا هی مانگی ڕەجەب، جا هی «ذوالحجّة»، جا هی «ذوالقعدة»، جا هی شەعبان؛ گەورەترین ڕۆژوویش بەپێی ڕۆژ، ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە، جا هی عاشوورا، جا هی تاسووعایە.

---

[١. ئەم جۆری سێهەمە لە نوسخەکدا نەبوو، بەڵام چونکە بە هەڵەی چاپیمان زانی ئەم بەندەمان لە ڕووی کتێبە شەرعییەکانەوە نووسییەوە و بۆ زیادکرد. (بڵاوکردنەوەی کوردستان)].

## باسی ئیعتیکاف

«اِعتِکاف» لای ئەهلی شەرع، واتە مانەوە لە مـزگەوتا بـەنیازی خـواپـەرستی. ئیعتیکاف سوننەتێکی گەورەیە و شەرتەکانی شەشن: نییەت و ئیسلامەتی و عەقڵ و پاکی لە لەش‌پیسی و مانەوە بەئارامی، ئەوەندەی ئینسان لە رکووعدا ئـەمێنـێتـەوە؛ شەرتە ئەم مانەوەیش لە مزگەوتا بێ، خواه ناو حەرەمی مزگەوت، یا سەربانی، یا بەر هەیوانی، یا هۆدەی بانگدەر و مجێوری مزگەوت، یا حوجرەی فەقێ؛ هەروا پاکییش لە حەیز و لە زەیسانی بەنیسبەت ژنەوە، شەرتە.

ئیعتیکاف لە هەموو وەختێکا سوننەتە، بە تایبەتی لە دەی ئاخری مانگی رەمەزانا، بەهیوای دەسگیر بوونی فەزڵی «لیلةُ القَدر» کە بەپێی عەقیدەی ئیمامی شافیعی، بریتییە لە شەوی بیست‌ویەك یا بیست‌وسێی رەمەزان. ئەگەر شوێنی ئیعتیکافەکە مزگەوتێك بێ جومعەی تیا بکرێ، ئەوە باشترە. فەرموودەی راستتر، ئـەوەیە دروست نـییە ژن ئیعتیکاف لە هۆدەیەکدا بکا کە جیای کردبێتەوە لە ماڵی خۆی بۆ نوێژ تیاکردن. ئەگەر کەسێك بەتایبەتی نەزری کرد لەسەر خۆی کە ئیعتیکاف لە مەککەی موکەڕڕەمەدا بکا، ئەوە واجب ئەبێ لەسەری؛ هەروا، مزگەوتی حەزرەتیشﷺ لە مەدینەی مونەووەرە و مزگەوتی «المسجِدُ الأقصیٰ» لە «قودس»؛ ئەگەر کەسێك نەزری کرد لەسەر خۆی کە ئیعتیکاف بکا لە مزگەوتی مەدینە یا قودسدا، ئەتوانێ لە مزگەوتی مەککەدا دانـیشێ لەجیاتی ئەوان، بەڵام بەپێچەوانەوە دروست نییە؛ ئەگەر نەزریشی کرد لەسەر خۆی کە ئیعتیکاف بکا لە مزگەوتی قودسدا، ئەوە ئەتوانێ لە مزگەوتی مەدینەدائیعتیکاف بکا لەجیاتی ئەو و بەپێچەوانەوە دروست نییە.

نییەت هێنان شەرتە بۆ ئیعتیکاف، بەڵام شەرت نییە لەگەڵ رۆژوودا، بێ؛ ئەگەر ئەو کەسە نییەتی ئیعتیکافی شەوی هێنا دروستە؛ ئەگەر نەزریشی کرد بەرۆژوو بـێ بـە ئیعتیکافەوە، یا ئیعتیکاف بکا بەرۆژووەوە، ئەوە هەردووکیان واجب ئەبن لەسەری و لەم سوورەتەدا واجبە نییەتی فەرزی ئیعتیکاف بێنێ. ئەگەر موددەی قەرار نـەدا بـۆ

ئیعتیکافەکەی، نییەتی ئیعتیکاف بێنێ و هەرچەند بمێنێتەوە لە مزگەوتەکەدا دروستە؛ بەڵام هەرکاتێ چووە دەرەوە و لەپاش ئەوە هاتەوە ژوورەوە، پێویستە نییەتی ئیعتیکاف بهێنێتەوە. ئەگەر نییەتی ئیعتیکافی موددەتێکی هێنا و لەو موددەتەدا رۆیشتە دەرەوە و هاتەوە، ئەوە ئەگەر بۆ پێویستییەکی وەك دەس نوێژ گرتن دەرچووبوو، نییەت هێنانەوەی ناوێ، ئەگینا ئەبێ دووبارە نییەت بهێنێتەوە.

ئەگەر نەزری کرد لەسەر خۆی موددەتێك لەسەریەك ئیعتیکاف بکا و پاش ئەوە رۆیشتە دەرەوە لەبەر عوزرێك، ئەوە ئەگەر عوزرەکەی لەوانە نەبوو کە دوو ماوەکەی ئیعتیکافەکەی لەیەك ببڕێ، تازەکردنەوەی نییەتی ناوێ؛ ئەگەر بە بێ‌عوزر چووە دەرەوە، یا بە عوزر چووە دەرەوە، بەڵام عوزرەکەی لەوانە بوو ماوەی پێش درچوون و پاش دەرچوونەکەی لەیەك جیا ئەکردەوە، وەکوو سەفەر، ئەوە ئەبێ دووبارە نییەت بهێنێ‌و ماوەی پێشوویشی بۆ ناژمێررێ. ئەگەر نەزری کرد لەسەر خۆی رۆژێك ئیعتیکاف بکا، ئەوە دروست نییە سەعاتەکانی ئەو رۆژە پارچە پارچە بکا بەسەر چەند رۆژێکا. ئەگەر ماوەیەکی دیاری کرد و بڕیاری‌دا کە ئەو ماوەیە هەمووی پێکەوە بێ، ئەوە پێویست ئەبێ پارچە پارچەی نەکا، ئەگەر پارچە پارچەی کرد، ئەبێ قەزای بکاتەوە. ئەگەر نەزری کرد لەسەر خۆی لە فڵان رۆژەوە تا فڵان رۆژ ئیعتیکاف بکا و لە نەزرەکەیدا، وتی: ئەگەر مانیعێك رووی‌دا، ئەرۆمە دەرەوە، ئەوە شەرتەکەی دائەمەزرێ و هەروەختێ هۆیەك پەیدابوو بۆ چوونە دەرەوەی، ئەتوانێ بڕواتە دەرەوە و قەزای ئەو موددەتەی لەسەر نییە؛ بەڵام ئەگەر ماوەکەی دیاری نەکردبوو؛ مەسەلا، وتبووی: مانگێك، ئەوە پێویستە قەزای ماوەی دەرچوونەکەی بکاتەوە و بەینی ئەو ماوەی قەزاکردنەوەیەش نەخا.

لە هەرکاتێکا کە نەزری کردبوو لەسەر خۆی رۆژەکانی ئیعتیکافەکەی پێکەوە بن، نابێ بە بێ‌عوزر بڕواتە دەرەوە، ئەگەر دەرچوو، ئیعتیکافەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە و ئەبێ دووبارە بیکاتەوە، بەڵام زەرەری نییە ئەگەر سەری یا دەستی یاقاچێکی لە دەرگا یا پەنجەرەی مزگەوت بکاتە دەرەوە، بەو شەرتە هەر هێز نەداتە سەر ئەو تەنیا قاچە.

چوونە دەرەوە بۆ دەس بە ئاو گەیاندن و شتیوا، زەرەری نییە و پێویست نییە لەسەری ئەم دەس بە ئاو گەیاندنەی لە ئاودەسخانەی مزگەوتا بێ، بەڵکوو ئەتوانێ بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی، مەگەر ماڵەکەی زۆر دوور بێ؛ ئەگەر بەسەر ڕێگەی چوون بۆ قەزای حاجەتەوە سەری لە نەخۆشێك دا، ئەوە قەیدی نییە، مەگەر زۆری پێبچێ، واتە زیاتری پێبچێ لەوەندە کە نوێژێکی جەنازەی تیا بکرێ، ئەگینا ئیعتیکافەکەی پچڕ پچڕ ئەبێ.

ئیعتیکاف ناپچڕێ بە دەرچوون لە مزگەوت لەبەر نەخۆشییەکیوا ناچاری بکا بۆ دەرچوون، یا لەبەر حەیز بەسەراهاتن بە نیسبەت ژنەوە، ئەگەر ماوەی ئیعتیکافەکەی لە پازدە ڕۆژ زیاتر بێ، بەڵام ئەگەر کەمتر بوو، ئەوە زنجیرەی ئیعتیکافەکەی ئەپچڕێ. هەروەها، ئیعتیکاف ناپچڕێ بەوە کە لەبیری نەبێ و بچێتە دەرەوە لە مزگەوت، یا دەرچێ بۆ بانگدان ئەگەر بانگدان ئیشی ئەو بێ. پێویستە لەسەر ئەوەی کە لە ئیعتیکافایە ئەو ماوەیە بەقەزا بگێڕێتەوە کە تیایا ئەچێتە دەرەوە بە عوزر، مەگەر بۆ دەس بە ئاو گەیاندن و شتیوا دەرچێ؛ بەڵام ئەگەر وەختی خۆی بڕیاری دابێ کەوا بە عوزر ئەچێتە دەرەوە، ئەوە قەزای لەسەر نییە، وەك پێشان وتمان.

## ئیعتیکاف بە چی بەتاڵ ئەبێتەوە؟

ئیعتیکاف، بەتاڵ ئەبێتەوە بە جیماع ئەگەر لەبیری بێ کە لە ئیعتیکافایە و بە عەمدی بێ و بە ئارەزووی خۆی؛ هەروا، بە تێکەڵبوون لەگەڵ ئافرەتا بە رووتی، ئەگەر ئاوی هاتەوە، بەوجۆرە کە لەڕۆژوودا باسمان کرد؛ هەروا بە شێتبوون و لەهۆشی خۆچوونیش ئەگەر بەهۆی ناشەرعییەکەوە لە هۆشی خۆی چوو؛ بە دەرچوونیش لە مزگەوت بە عەمدی بە بێ پێویستییەکی شەرعی، مەگەر بۆ دەس بە ئاو گەیاندن و شتیوا؛ ئەگەر ـ پەنا بە خوا! ـ کابرا کوفری بەسەرا هات، یا بەهۆی ناشەرعییەوە سەرخۆش بوو، ئەوە دیارە ئیعتیکافەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە و ماوە پێشووەکەشی لەدەس دەرئەچێ، ئەگەر نییەتی ئیعتیکافی یەك پارچەی هێنابوو؛ بەڵام ئەگەر شێت بوو،

یاخود به بێ خەتای خۆی له هۆشی خۆی چوو، ئیعتیکافەکەی بەتاڵ نابێتەوە، مادام نەچووبێتە دەرەوە لە مزگەوتەکە؛ ماوەی بێهۆشییەکەیشی بۆ حیساب ئەکرێ، بەڵام ماوەی شێتی بۆ حیساب ناکرێ.

ئەگەر ئافرەتی ئیعتیکاف کردوو کەوتە حەیزەوە، پێویستە دەس‌بەجێ بڕواتە دەرەوە لە مزگەوتەکە ، [و] هەروەها، ئەگەر پیاو یا ژن لەشی پیس بوو و نەیتوانی لەناو مزگەوتەکەدا خۆی بشوا و [لەم سوورەتەدا]ماوەی حەیز و لەش پیسییەکەشیان بۆ حیساب ناکرێ.

## باسی حەج و عەمرە

حەج، روکنێکە لە روکنەکانی دینی ئیسلام و فەرزە لەسەر موسوڵمان بەو شەرتانەی کە باسیان ئەکەین، هەروەها عەمرەیش. هەرچی پێویست بێ بۆ حەج، بۆ عەمرەیش پێویستە، راوەستانی عەرەفات و وەختی تایبەتی نەبێ، چونکە عەمرە لە هەمووکاتێکا دروستە، بەڵام حەج هەر لە چەند رۆژێکی مانگی قوربانا ئەکرێ.

شەرتی دامەزرانی حەج، تەنها ئیسلامیەتە؛ کەواتە، دروستە بۆ باوکی منداڵ لەجیاتی منداڵەکەی ئیحرام دابەستێ، یاخود نییەتی ئیحرامی منداڵەکەی بهێنێ و بەرگی ئیحرامی پێوە بپێچێ و لەگەڵ خۆی بیبا حەجی پێ بکا و هەرکام لە ئەرکانەکەی حەجی پێ‌بکرێ، پێی بکا.

شەرتی دامەزرانی خەریك بوونی[1] حەج، ئەوەیە ئەو کەسە وەك موسوڵمانە، تەمیز و شوعووریشی هەبێ؛ بەڵێ، ئیحرامی منداڵی خاوەن تەمیز بەوە دائەمەزرێ باوکەکەی رێگای بدا نییەتی ئیحرام بێنێ و ئیحرامی بۆ دابەستێ. هەر خوێنێ کە واجب بێ لەسەر منالەکە بیرێژێ، ئەبێ باوکی بۆی برێژێ لە پارەی خۆی، چونکە ئەو رێگای منداڵەکەی داوە بچێ بۆ حەج و ئەم مەسرەفەی بەهۆی ئەوەوە هاتووەتە ئەستۆ.

شەرتی ئەوەش کە ئەو حەجەی ئینسان ئەیکا جێگەی حەجی واجب «حَجَّةُ الاسلام» بگرێتەوە، ئەوەیە ئەو کەسە حەجەکە ئەکا، باڵغ و عاقڵ و ئازاد بێ؛ کەواتە؛ ئەگەر فەقیرێك رێی‌کەوتە مەککە و حەجی کرد، ئەوە کافییە لەباتیی حەجی واجب، بەڵام بۆ منداڵ و بەندە کافی نییە و ئەبێ ئەگەر توانییان، پاش باڵغ‌بوون یا ئازادبوون، حەجێکی تر بکەن.

شەرتی واجب‌بوونی حەج ئیسلامییەتە و باڵغ بوون و عەقڵ و ئازادی و توانین.

توانین، دوو بەشە:

**یەکەم:** ئەوەیە بتوانێ بە نەفسی خۆی حەج بکا؛ ئەمەش چەند شەرتێکی هەیە:

---

١. مەبەست لە خەریك بوون، ئەوەیە ئەو کەسە خۆی خەریکی ئادابی حەجەکە بێ.

**شەرتی یەکەم:** ئەوەیە مەسرەفی چوون و گەڕانەوەی ببێ؛ کەواتە، ئەگەر کابرا کاسبێکی‌وا بوو هەر ڕۆژێ مەسرەفی چەند ڕۆژێکی پەیدا ئەکرد، ئەوە ئەگەر سەفەرەکەی کەمتر بوو لە دوو قۆناغ، واجبە بڕوا، ئەگەر دوو قۆناغ یا زیاتریش بوو، واجب نییە، چونکە قابیلە لە ڕێگەدا نەخۆش بکەوێ و کاسبی پێ‌نەکرێ و پەکی بکەوێ، یاخود مەجالی ئەو کاسبییەی نەمێنێ.

**شەرتی دووهەم:** ئەوەیە بۆ کەسێ کە مەسافەی بەینی ماڵی ئەو و مەککە دوو مەنزڵ زیاتر بێ، هۆی سواری دەس بکەوێ؛ ئەگەر مەسافەکە لە دوو مەنزڵ کەمتر بوو، بەڵام کابرا بێ‌هێز بوو و نەیئەتوانی بە تەنها بڕوا و پێویستی بە هاوڕێیەك بوو، ئەبێ ئەو هاوڕێیەشی لەگەڵ بێ.

ئەبێ ئەم مەسرەفی ڕێگەیە زیاد بێ لە قەرزێ کە لەسەریەتی، هەرچەند وادەی قەرزەکەیش نەهاتبێ، یاخاوەن قەرزەکە پەلەی لێ نەکا، یا قەرزەکە قەرزی خوای تەعالا بێ، وەکوو ئەوەکە شتێکی نەزرکردبێ لەسەر خۆی، چونکە لەوانەیە لە ڕێگەدا بمرێ و حەقەکە لە ئەستۆیا بمێنێتەوە؛ هەروەها، ئەبێ ئەو مەسرەفە زیاد بێ لە دەستە جلێکی لایق بۆ خۆی و لە مەسرەفی ئەوانە کە مەسرەفیان لەسەر شانیەتی لە ماوەی چوون وگەڕانەوەیا، نابێ بیشکەوێتە ڕێ تا یەکێك نەکا بە وەکیل بۆ مەسرەف‌کردن بۆ ئەوانە؛ هەروا، پێویستە مەسرەفی ڕێگەکەی زیاد بێ لە خانوویەکی لایق بۆ دانیشتنی خۆی و خێزانی، هەرچەند ئەو کەسە عادەتیشی وابێ لە خانووی کرێدا دابنیشێ، مەگەر خانوویەکی لەسەر وەقف کرابێ یا وەسیەتی بۆ کرابێ تیا دانیشێ؛ پێویستە زیادیش بێ لە کرێی خزمەتکارێ کە پێویست بێ بۆ خزمەت کردنی؛ فەرموودەی ڕاستتر، ئەوەیە واجبە لەسەر ئینسان ئەو دەسمایەی بازرگانییەی بەدەستیەوەیە، خەرجی بکا بۆ توێشووی خۆی و کرێی هۆی سواربوونی لەم سەفەرەدا؛ هەروەها، ئەبێ باخ و زەوییەکی کە بەرهەمیان بەشی مەسرەفی ساڵێکی بکا، بیان فرۆشێ بۆ سەفەری حەج، چونکە حەج واجبی ئێستەیە و مەسرەفی ساڵ پێویستی پاشەڕۆژە.

**شەرتی سێهەم:** ئەوەیە ڕێگا ئەمین بێ؛ کەواتە، ئەگەر ترسی بوو لەوەکە زیانێك تووشی گیانی خۆی یا تووشی ئەندامێکی ببێ لە لایەن دوژمنەوە، یا جەردە و ڕێگر یا

دروندە لە ڕێگەدا هەبوو، لەم سوورەتانەدا حەج واجب نییە، بەڵام ئەگەر حوکوومەت باجێکی وەرئەگرت بەرامبەر بە پاراستنی گیان و ماڵی حاجییەکان لە ڕێگەدا و ئەو پارەیە زیاتر نەبوو لەئەندازەی پێویستی پارێزگاری، واجبە بدرێ و حەجەکە واجب ئەبێ، چونکە حەقی پارێزگاریش وەك توێشووی ڕێگا وایە. واجبە ئینسان سواری پاپۆڕ و تەیارە و شتیوا ببێ، ئەگەر سواربوونیان زیاتر وابوو سەلامەت بێ و ڕۆژەکەی ڕۆژێکی مەترسیدار نەبێ.

بەشەرت گیراوە ئاو و نان و هەموو پێویستییەکیتر لە ڕێگەدا دەست بکەوێ لەو شوێنانەدا کە هەڵگرتنی نان و ئاو لەوێوە کراوە بە عادەت، ئەبێ قیمەتەکەشیان لە قیمەتی موناسبی ئەو کات و شوێنە زیاتر نەبێ. شەرتە ئەگەر بە سواری وڵاخ چوو، ئاڵفی دەس بکەوێ بۆ وڵاخەکەی. ئەگەر حەجکەرەکە ئافرەت بوو، ئەبێ یا مەحرەمێکی وەك مێرد و برا و برازای لەگەڵا بێ، یاخود کۆمەڵە ژنێکی باوەڕ پێکراو بن، هەرچەند مەحرەمیشیان لەگەڵ نەبێ؛ ئەگەر ئەو مەحرەمە بە بێ کرێ نەئەچوو لەگەڵی، ئەبێ کرێی ئەویشی هەبێ.

**شەرتی چوارەم**: ئەوەیە حەجکەرەکە خۆی بگرێ بەسەر وڵاخەوە یا لەناو ئۆتۆمۆبیل و تەیارەدا بە بێ نارەحەت بوونێکی نابار. حەج واجبە لەسەر کوێر ئەگەر کەسێکی هەبێ دەستی ڕابکێشێ بەرامبەر بە کرێیەکی عادەتی و دەسیشی بڕوا ئەو کرێیە بدا. حەج واجبە لەسەر سەفیهێ کە مەنعی مەسرەف کردنی لێ کرابێ، بەڵام مەسرەفی حەجەکەی نادرێتە دەستی خۆی، بەڵکوو ئەبێ یا باوکی لەگەڵی بڕوا یاکەسێکی لەگەڵدا بنێرن کە لە ڕێگەدا مەسرەفی بۆ بکا؛ ئەگەر ئەمکەسە کرێی ئەویست، ئەبێ کرێی بدرێتێ.

**بەشی دووهەمی توانین**، ئەوەیە یەکێکیتر حەج بکا بۆ ئینسان. کەواتە، ئەگەر کەسێك مرد و حەجی لە ئەستۆدا بوو، واجبە لەو میراتەی بەجێی هێشتووە حەجی بۆ بکرێ، ئەگەر میراتەکەی زیاد بوو لەو حەقانەی بەسراون بە خۆیەوە، وەك زەکات و حەقی مەسکەنی ژنەکەی بۆ ماوەی «عِدّة» بەسەر چوون و زیاد بوو لە حەقی شۆردن و کفن و دفنکردنی، و ئەو کەسەش حەجەکەی بۆ ئەکا زیاتر لە کرێی عادەتی داوا نەکا؛

ئەگەر میراتی لێ‌بەجێ نەمابوو، واجب نییە لەسەر میراتگرەکانی حەجی بۆ بکەن یا یەکێك بنێرن حەجی بۆ بکا، بەڵام سوننەتە بۆ میراتگر و بۆ بێگانەیش، هەرچەند میراتگریش ئیزنی نەدابێ و مردووەکە خۆیشی وەسیەتی نەکردبێ، چونکە ئەم حەجە فەرز بووە لەسەر مردووەکە. هەروەها، دروستە بۆ هەموو موسوڵمانێ حەج بکا لەجیاتی هەر موسوڵمانێ کە حەجی لەسەر بووبێ و بۆی نەکرابێ بیکا، بەڵام بۆ حەجی سوننەت نابێ کەس لەجیاتی کەس حەج بکا، مەگەر کابرا خۆی وەسیەتی کردبێ حەجی بۆ بکەن.

## باسی حەجی زیندووی پەك‌كەوتوو

هەرکەس پەکی کەوتبێ و توانای نەمابێ بڕوا بۆ حەج، چ لەبەر پیری بێ و چ لەبەر نەخۆشی و دوکتۆرێکی باوەڕ پێ‌کراو بڕیاری دابێ پەکی کەوتووە، واجبە لەسەری یەکێك بنێرێ لەجیاتی ئەو حەجی بۆ بکا، ئەگەر پارەی زیاد لەو پێویستییانەی هەبوو کە باسمان کردن، بەڵام پێویست نییە ئەوەندەی هەبێ بۆ مەسرەفی ماڵ و منداڵ تاکابرا دێتەوە؛ ئەگەر کابرای پەك‌کەوتوو ماڵی نەبوو بیدا بەکرێ‌دا و کوڕی خۆی یا بێگانەیەك بۆی ئەدا، واجب نییە لەسەری وەری بگرێ، بەڵام ئەگەر کوڕەکەی یا بێگانەکە خۆیان چوون حەجیان لەجیاتی ئەو کرد، واجبە قەبووڵی بکا.

شەرتە ئەو کەسە کە حەجی فەرز ئەکا لەجیاتی مردوو یا ئینسانی پەك‌کەوتوو، موسوڵمان و باڵغ و عاقڵ و ئازاد و باوەڕ پێ‌کراو بێ، بەو رەنگە یا ئینسانێکی عادڵ یا «مَستورُ العدالة» بێ، یەعنی بەدیمەن بە عادڵ ناسرابێ؛ بەڵێ، بەعزێ لە عالمەکان فتوایان داوە ئەگەر ئینسانی پەك‌کەوتوو متمانەی بە فاسقێك هەبوو و کرێی دایە و ناردی حەجی لەجیاتی بکا، یاخود بەرلە مردنی وەسیەتی کرد کە فڵانکەس حەجی لە جیاتی بکاو ئەو کەسەیش فاسق بوو، ئەوە دروستە ئەو کەسە بڕوا حەجی لەجیاتی بکا، چونکە جێگای بڕوای بووە؛ ئەم فتوایە بۆ ئەم چەرخی ئێمە زۆر لەبارە، چونکە ئینسانی عادڵ نایابە.

هەروەها، شەرتە ئەو کەسەی لەجیاتی یەکێکی تر ئەچێ بۆ حەج، خۆی حەجی کردبێ و حەجی نەزریشی لەسەر نەبێ. ئەم کابرا ئەگەر بەرلەوەی بچێتە ئیحرامەوە مرد، کرێکەی ناکەوێ؛ ئەگەر لەپاش ئیحرامیش مرد، ئەوە ئەگەر حەجەکەی تەواو کردبوو، هەمووکرێکەی ئەکەوێ، ئەگینا بەشی ئەوەی ئەکەوێ کە جێبەجێی کردووە؛ ئەگەر هەموویشی وەرگرتبوو، ئەبێ میراتگرەکانی زیادەکەی بدەنەوە بە کابرا کە بەکرێی گرتووە حەجی لەجیاتی بکا.

## ئەرکانی حەج و عەمرە

ئەرکانی حەج، پێنجە: ئیحرام و، وەستان لە عەرەفات و، سووڕانەوە بەدەوری کەعبەدا و، راکردن لە بەینی سەفا و مەروەدا و، تاشین یاکورت کردنەوەی مووی سەر؛ ئەم پێنج روکنە، هەموویان روکنی عەمرەیشن، بێجگە لە وەستان لە عەرەفاتدا.

کاتی ئیحرام دابەستن بۆ حەج، مانگی شەشەڵان و ناوجەژنان و دە شەوی یەکەمی مانگی قوربانە؛ کەواتە، ئەگەر لە غەیری ئەم دوو مانگ و دە شەوەدا ئیحرامی بۆ حەج دابەست، بە ئیحرامی عەمرە دائەمەزرێ بۆی؛ بەدرێژایی ساڵ ئیحرام بۆ عەمرە دائەبەسرێ؛ ئەمە؛ لەبارەی وەختی ئیحرامەوە، لەبارەی «میقات» (شوێنی ئیحرام)یشەوە، بۆ ئەو کەسەی لە مەدینەی مونەوەرەوە هاتبێ «ذُو الحَلیفة»یە، بۆ ئەو کەسەش لە شام و میسر و مەغریبەوە هاتبێ «جَحفة»یە، بۆ ئەو کەسەش لە «تهامة»ی یەمەنەوە هاتبێ «یەلەملەم»ە، بۆ ئەو کەسەش لە نەجدی یەمەن و نەجدی حیجازەوە هاتبێ، «قَرن»ە و بۆ ئەوەی لە خۆرهەڵاتەوە هاتبێ «ذات عرقة»یە.

ئیحرام دابەستن لە ئەووەڵی شوێنی ئیحرام دابەستنەوە چاترە تا لە ئاخریەوە و لە ماڵی حاجییە کە خۆیەوە، ئەگەر ماڵەکەی دوورتر بێ لە سەرەتای شوێنی ئیحرام دابەستن. ئەگەر کەسێك لە رێگەیەکەوە بڕوا نەگاتە یەکێك لەو شوێنانەی باسمان کردن، ئەوە لەو شوێنەوە ئیحرام دابەستێ کە ئەکەوێتە شانی شوێنی ئیحرام دابەستنی ئەو وڵاتەوە؛ ئەگەر کەوتە نێوان دوو شوێنەوە، ئەوە لەبەرابەری دوورەکەیانەوە ئیحرام

دابەستێ؛ ئەگەر لە بەرابەری هیچ شوێنێکی ئیحرام دابەستنەوە نەبوو، ئەوە لە ماوەی دوو قۆناغەوە بۆ مەککە ئیحرام دابەستێ؛ ئەگەر کەسێك ماڵی بکەوێتە نێوان مەککە و شوێنی ئیحرامدابەستنەوە، لە ماڵی خۆیەوە ئیحرام دابـبەستێ. هـەر کـەسێ گـەیشتە شوێنی ئیحرامدابەستن و ئارەزووی لە حەج نەبوو تـا لایـدا لەو شـوێنـە، ئـەوە لەو شوێنەدا ئیحرام دابەستێ کە ئارەزووی حەجکردنی تێدا پەیدا کـردووە؛ ئـەگـەر بـە ئارەزووی حەج کردنەوە گەیشتە ئەو شوێنە، دروست نییە بێ‌ئەوەی ئیحرام دابەستێ لابدا، ئەگەر لای‌دا، ئەبێ بگەڕێتەوە دواوە بۆ ئیحرام دابەستن، ئەگەر بۆی ڕێ‌نەکەوت بگەڕێتەوە لەبەرئەوە کە ئەترسا یا سواری ئۆتۆمۆبیل و تەیارە و شـتی‌وا بـوو، ئـەوە دروستە لە دەرەوەی ئەو شوێنەوە ئیحرام دابەستێ، بەڵام ئەبێ بەرامبەر بەو لادانەی، حەیوانێك سەربڕێ بۆ کەفارەت؛ ئەگەر لەپاش لادان لە شوێنـی ئـیحرام دابـەستن، گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنە، ئەبێ حەیوانێك بۆ کەفارەت سەربڕێ، ئەگەر گەڕانەوەکەی پاش دەس کردن بوو بە ئادابی حەج، ئەگینا پێویست نییە. ئیحرام دابەستن دروستە پێش گەیشتن بەو شوێنە کە بۆی دیاری کراوە، بەڵام پێش داهاتنی مانگی شـەشەڵان دروست نییە. شوێنی ئیحرام دابەستن بۆ عـەمرەیش بـۆ ئـەو کـەسانەی لەدەرەوەی مەککەوە دێن، هەر شوێنەکەی ئـیحرام دابـەستنی حـەجە و بـۆ ئـەو کـەسانەش لە مەککەدان، نزیکترین شوێنێکە لە دەرەوەی حـەرەمی مـەککـەوە، هـەرچـەند یـەك هەنگاویش لە حەرەم دەرچـێ؛ ئـەگـەر نـەڕۆیشـتە دەرەوە و ئـیحرامـی دابـەست، ئیحرامەکەی دائەمەزرێ، بەڵام ئەبێ حەیوانێك سەربڕێ. باشترین شوێن بۆ ئیحرامی عەمرە لە دەرەوەی حەرەمەوە «جَعْرانە»یە، ئەوجا «تَنْعیم» و پاشان، «حُدیبیّە»یە.

## چونیەتی نییەت هێنان بۆ ئیحرام

ئیحرام، دائەمەزرێ لەگەڵ دیاری کردنی ئەوەدا کە بـۆ حـەجە یـا بـۆ عـەمرەیە، بەم‌ڕەنگە نییەتی حەج یا عەمرە یا هەردووکیان بێنێ؛ ئیحرام، بە بێ دیاری کردنیش دائەمەزرێ، بەوجۆرە کە هەر بڵێ: نییەتمە ئیحرام دائەبەستم، بەڵام لەگەڵ دیاری کردنا

خێری زۆرترە؛ جا ئەگەر ئیحرامی بێ دیاری کردن لە مانگی ئیحرامی حەجدا بوو، ئەوە بەئارەزووی ئەو کەسە خۆیەتی بەسەر حەجیا ئەبڕێ یا بەسەر عەمرەدا یا بەسەر هەردووکیانا و دەس بکا بە جێبەجێ کردنی ئادابەکەی؛ ئەگەر لە مانگی ئیحرامی حەجیشدا نەبوو، بە عەمرە دائەمەزرێ.

بۆ ئینسان دروستە بڵێ: نییەتم هەیە ئیحرام دائەبەستم وەك ئیحرامی فڵانەکەس؛ جا ئەگەر ئەو فڵانە کەسە لەو کاتەدا ئیحرامی دانەبەستبوو، ئیحرامەکەی ئەم حوکمی ئیحرامی دیاری نەکراو وەرئەگرێ و بەئارەزووی خۆیەتی بەسەر چییدا ئەبڕێ بیبڕێ؛ ئەگەر ئیحرامیشی دابەستبوو، وەك ئیحرامەکەی ئەو ئەبێ؛ ئەگەر کابرایش مردبوو و نەئەزانرا ئیحرامی بۆ چی دابەستووە، ئەوە وا دائەنرێ کە ئیحرامی بۆ حەج و عەمرە پێکەوە دابەستووە و ئادابی حەج و عەمرە پێکەوە بەجێ ئەهێنێ.

واجبە لەسەر ئەو کەسەی ئەیەوێ ئیحرام دابەستێ، بە دڵ نییەتی ئیحرام بهێنێ، یەعنی بە دڵ، بڵێ: نییەتم هەیە دەس ئەکەم بە بەجێهێنانی ئادابی حەج یا عەمرە یا هەردووکیان و لە گەڵ نییەتەکەیدا «لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ»یش بکا. ئەگەر بە بێ نییەت «لبيّك»ەی کرد، ئەوە ئیحرامەکەی دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر نییەتی هێنا و «لبّيك»ەی نەکرد، ئەوە ئیحرامەکەی دائەمەزرێ. سوننەتە لەپێش ئیحرام دابەستندا، بەنیازی سوننەتی ئیحرام خۆی بشۆرێ و دوو رکات نوێژ بکا بە نیازی سوننەتی پێش ئیحرام، لە رکاتی یەکەمدا سوورەتی «الكـافِرون» و لە دووهەمدا «اَلْإِخـلاص» بخوێنێ. سوننەتە ئیحرام بەستنەکەی لەو کاتەدا بێ کە کاروانی حاجییەکان لە میقاتەوە بار ئەکا و ئەڕوا. ئەبێ لەپێش ئیحرام دابەستندا خۆی رووت بکاتەوە لە هەموو جل و بەرگێکی دووراو و لە هەرشتێ کە دەوری ئەندامی لەشی بدا، وەك پێڵاو و گۆرەوی و دەسکێش و کراس و کەوا و ئەم جۆرە شتانە. ئەوجا بۆنی خۆش بکا بەگیانیەوە و دوو پارچەبەرگی تایبەتی «إِزار» و «رِداء» بپێچێ بەخۆیەوە، بە یەکێکیان نێوانی ناوك و ئەژنۆی و بەویان ناوشان و سنگی داپۆشێ و ئەم دوو پارچەیەش بۆنخۆش بکا؛ مانەوەی بۆنخۆشی بە لەشیەوە و بە جلەکانیەوە زیانی نییە، بەڵام ئەگەر ئەو جلە بۆنخۆشەی داکەند و جارێکی تر لەبەری کردەوە، ئەبێ فیدیە بدا.

سونەتە لەپاش نییەتی ئیحرام، زۆر خەریکی «لبێك» کردن بێ، بەتایبەتی لەکاتی گۆڕانی وەزعدا، وەك سواربوون و دابەزین و سەرکەوتن بۆ شوێنی بەرز و داپەڕین لە شوێنی بەرزەوە و تێکەڵ بوون لەگەڵ کۆمەڵدا، سونەتە دەنگیشی بەرز بکاتەوە؛ ئەمەش، سیغەی دوعاکەیە: «لَبَّيكَ اللّهُمَّ لبَّيكَ، لبَّيكَ لاشَريكَ لكَ لبَّيكَ، إنَّ الحمدَ والنِّعمةَ لكَ والملكَ، لاشريك لكَ»؛ سونەتیشە لەهەر کاتێکا شتێکی سەیری دی بڵێ: «لبَّيكَ إنَّ العَيْشَ عَيشُ الآخِرَة»، کە «لبیك»ەی تەواوکرد، سەڵەوات بدا لەسەر پێغەمبەرﷺ و لەسەر ئاڵ و ئەسحابی و داوای بەهەشت و ڕەزامەندیی خودا بکا و پەنا بگرێ بەخودا لە ئاگری دۆزەخ.

## ئەو شتانەی حەرامن بۆ ئەوکەسەی لە ئیحرامدا بێ

ئەو شتانەی حەرامن لەسەر ئینسان لە ئیحراما، نۆ شتن:

یەکەم: ئەوەیە پیاو هەمووی سەری یا هەندێکی داپۆشێ بە شتێ کە لە عورفا بە داپۆشەر دابنرێ، هەرچەند ئەو شتە قوڕ یا خەنە و شتیوا بێ و هەرچەند ئەو داپۆشەرە ئەوەندە ناسك بێ مەنعی دیتنی ڕەنگی سەر نەکا؛ کەواتە، حەرامە داپۆشینی سەر بە کڵاو مێزەر و دەستەسڕ و هەرچییەکی تر، مەگەر لەبەر ناچاری، وەك گەرما و سەرمای توند، ئەوە لەو کاتەدا دروستە دایپۆشێ، بەڵام ئەبێ فیدیەی بۆ بدا. هەروەها حەرامە پیاو هەموو گیانی یا هەندێکی داپۆشێ بە پۆشاکێکی دووراوی وا دەوری هەموو گیانی یا هەندێکی بدا، وەك عابا و کەواو سەڵتە و سوخمە و کراس و دەرپێ و کەوش و گۆرەوی؛ جلی هۆنراوەش لە حوکمی جلی دووراودایە، وەك کراسی زرێ و بەرگی زەنگیانە؛ هەروەها، جلی گرێدراو و پارچەجلێکیش کە لەگەڵ جلێکی تراگرێ درابێ و بیکاتە بەری، پارچەیەکیش کە بەهۆی ساوینەوەوە هەندێکی نووسابێ بە هەندێکیەوە وەك لباد و فەرەنجی، پۆشینی حەرامە. ئەبێ ئیحرام دابەستوو قەناعەت بکا بە تەنها ئەو دوو خاولییە گەورەیە کە یەکێکیان نێوانی ناوك و خواری ئەژنۆی و ئەویان هەموو ناوشان و سنگ و باڵی دائەپۆشێ؛ زەرەری نییە بەندەخوێنێك دروست

بکا بۆ ئەو خاولییەیان کە نێوانی ناوك و ئەژنۆی پێدائەپۆشێ تا خاولییەکەی پێببەستێ بە قەدیەوە، یاخود پشتێنێکی بەسەرا ببەستێ، یا سەرێکی ئەو خاولییە ببەستێ بە خاولییەکەی ناوشانیەوە؛ بەڵام دروست نییە چمکێکی خاولییەکەی ناوشانی ببەستێ بە چمکێکی تریەوە و گرێی بدا، یا بیاندوورێ بەیەکا [و] ئەگەر وای کرد، ئەبێ فیدیە بدا؛ بەڵام دروستە داوێنەی خاولییەکەی ناوشانی بخاتە ژێر خاولییەکەی بەینی ناوك و ئەژنۆیەوە و ئەمی بەسەرا توند بکا بە بەندەخوێنەکەی، وەك لە «تُحفة»دا باسکراوە. هەروەها، دروستە ئەنگوستیلە بکاتە پەنجەی و قورئان بخاتە حەمایلێکەوە و بیکاتە ملی و، شمشێر بکاتە ملی و کەمەربەندی پارەکەی ببەستێتە پشتی؛ دروستیشە پشتێن ببەستێ، بە گرێدان یا بە جۆرێکی تر.

واجبە لە جیاتی کەوش، نەعل یا قاپقاپ بکاتە پێی؛ ئەگەر ئەمانەی دەس نەکەوت، ئەبێ شتێکی وا لە پێ بکا هەموو پەنجەکانی پێی نەشارێتەوە؛ دروستە لەمکاتەدا «خُفْ» لە پێ بکا، بەو شەرتە کە پاژنەکەی بشکێنی یا بیدڕێنێ، بەجۆرێك کە پاژنەی پێی دەرکەوێ.

بزانن! دروستە بۆ کەسێك کە لە ئیحراما بێ، کە نوست، وەك لێفە و کەوا و کراس و جلوبەرگی تر بدا بەسەر خۆیا، بەڵام ئەبێ لای خوارووویان بخاتە سەرەوە، بەجۆرێ کە هەستایەوە سەرپێ، ئەو جلوبەرگانە داکەون؛ هەروەها، دروستە بەتانیە و لێفەش بدا بەخۆیا، بەجۆرێ کە راستەوە بوو، داخزێنە خوارەوە.

دووهەم: ئەوەیە ئافرەت دەسکێش بکاتە دەستی و رووی خۆی داپۆشێ بە هەرچی کە حەرام بێ پیاو سەری پێ داپۆشێ، بەڵام دروستە ئەندامەکانی تری لەشی بە هەموو جۆرە پۆشاکێك داپۆشێ لە دووراو و تەنراو و گرێدراو و غەیری ئەمانە. دروستە دەستەسڕێ ببەستێ بە دەستیەوە و گرێیشی بدا و دروستە کەوش و گۆرەوی لە پێ بکا.

سێهەم: بەکارهێنانی بۆنخۆشییە لە جل و بەرگ و هەموو ئەندامانی لەشدا بۆ پیاو و بۆ ژن، لە هەرجۆرە بۆنخۆشێك کە بۆ بۆن خۆش کردن بەکار بهێنرێ، نەك ئەو بۆن

خۆشانەی بۆ دەرمان یا بۆ خواردن بەکار ئەهێنرێن، وەك نارنج و پرتەقاڵ و سێو و شتی‌وا؛ هەروەها، زیانی نییە دەس‌دان لە بۆن‌خۆشی وشك و بۆن‌کردنی گوڵ و عەتر و رێحان و شتی‌وا، بەو شەرتە نەلکێن بە لووتیەوە؛ هەروەها، زیانی نییە هەڵمژینی بۆنی بخووری سووتاو و سەرشۆردن بە سابوونی بۆن‌خۆش و لە پەڕۆ پێچان و هەلگرتنی میسك.

**چوارەم:** چەور کردنی مووی ریش و سەرە بۆ پیاو و ژن، هەرچەند رۆنەکـەیش بۆن‌خۆش نەبێ؛ هەروەها، چەور کردنی مووی سمێڵ و زوڵف و برۆ و لاجانگ.

**پێنجەم:** بڕینی نینۆك و تاشینی مووی سەر و ریش و سمێڵ و ئەندامانی‌تری لەشە بۆ پیاو و ژن، بەڵام لابردنی نینۆکی شکاو و بڕینی موویەك کە لە پێڵووی چاودا روابێ، زیانی نییە. ئەگەر کابرا زۆر نارەحەت ئەبوو بە موو، ئەتوانێ بیتاشێ و فیدیە بدا.

**شەشەم:** جیماعە لە بەر و لە دواوە لەگەڵ ئینسان یا لەگەڵ حەیوانا. حەرامە لەسەر ئافرەتێك کە لە ئیحراما نەبێ مەجالی مێردەکەی بدا کە لە ئیحراما بێ، بۆ کردنی ئەم ئیشە؛ هەروەها، حەرامە لەسەر پیاوێك کە لە ئیحراما نەبێ بەزۆر بچێتە لای ژنەکەی کە ئەو لە ئیحراما بێ. حەج و عەمرە بە جیماع بەتاڵ ئەبنەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا واجبە کابرا ئەو حەج و عەمرە بەتاڵ بووەوەیە تەواو بکا و کەفارەتیش بدا، ئەگەر بە علیم و عەمد و ئیختیار بووبێ؛ هەروەها، واجبە لەساڵی دواییدا بە بێ‌تەفرە قەزای ئەم حەجە یا ئەم عەمرە فەوتاوە بکاتەوە، هەرچەند سوننەتیش بن. هەروەها، حەرامـە هـەرچـی لەوانەبێ بکێشێتەوە بۆ جیماع، وەك ماچ و دەس لێدان بە رووتی و روانین بۆ ئافرەت لەگەڵ ئارەزوودا.

**حەوتەم:** ئەوەیە لە ماوەی ئیحراما راوی حەیوانێکی دەرەکی‌وا بکا کە گۆشـتی بخورێ، یاخود لە حەیوانێکی گۆشت خوراو و یەکێکی گۆشت نەخوراو پەیدا بووبێ، خوا ئەو حەیوانە لە خاکی حەرەمی مەککەدا بووبێ یا لە دەرەوەی حەرامدا؛ هەروەها، حەرامە نێچیر گرتن لە خاکی حەرەمی مەککەدا لەسەر کەسێکیش کە لە ئیحراما نەبێ؛ ئەگەر حەیوانەکەی کوشت، واجبە تۆڵەی بـدا؛ مـەسەلا، لەجـیاتی وشـترمورغێك،

وشترێك و لەجیاتی گاکێوییەك یاکەرەکێوییەك،گایەك و لەجیاتی ئاسکێك، بزنێك و لە جیاتی کەروێشکێك، گیسکێك و لەجیاتی رزقێك، کارژەلەیەك بدا. ئەگەر حەیوانێکی کوشت کە وێنەی دیاری نەکرابێ لەشەرعا، ئەوە لەسەر بڕیاری دووکەسی دادپەروەر وێنەی بۆ دائەنرێ وە ئەگەر وێنەی نەبوو، قیمەتی بۆ دائەنرێ و بە قیمەتەکەی، خواردن ئەکرێ و دابەشی ئەکا بەسەر هەژارانی دەور و پشتیا. فەرموودەی راستتر، ئەوەیە نێچیر گرتن لە خاکی مەدینەی مونەووەرەشدا حەرامە، بەڵام تۆڵەی واجب نییە.

هەشتەم: بڕینی دار و گیای حەرەمی مەککەیە، چ لەخۆیەوە سەوز بووبێ و چ بەدەس نێژرابێ؛ ئەگەر درەختێکی بڕی یاگیایەکی هەڵکەند، ئەبێ تۆڵەی بدا؛ لەجیاتی دارێکی گەورە، گایەك و لەجیاتی دارێکی بچووك، مەڕێك ئەبێ سەربڕێ. بەڵێ، حەڵاڵە بڕینی گیای «اِذْخِر» کەگیایەکی بۆنخۆشە و گیای دڕکاویی وەکوو «عِوْسَج» و گیا بۆ ئالفی حەیوان و بۆ دەرمان.

نۆهەم: ژن بەشوودان و ژن مارەبڕینە، چ بە ئەساڵەت و چ بە وەکالەت.

بزانن! ئینسان لە تۆڵەدانی نەچیرکردنا، بە ئارەزووی خۆیەتی، یا وێنەکەی سەر ببڕێ و بیدا بە داماوانی حەرەمی مەککە، یا بە پارەی قیمەتەکەی قووتێکیوا بکڕێ کە بۆ سەرفیترە بشێ وبیدا بە داماوانی حەرەم، یا بزانێ پارەکە چەند مشت قووت ئەکا و بەرامبەر بە هەر مشتێك، رۆژێ بەرۆژوو بێ؛ ئەگەر وێنەی نەبوو، یا پارەی قیمەتەکەی بدا بە قووت و دابەشی بکا بەسەر داماوانا، یا بەرامبەر بە هەر مشتێ لەو قووتە، رۆژێ بەرۆژوو بێ ئەگەر لە ئیحراما جلی کردەبەری، یا خۆی بۆنخۆش کرد، یا سەری چەور کرد، یا بەئارەزووەوە نزیکی ژنەکەی بووەوە و ئاوی هاتەوە، یا سێ تەڵ مووی بڕی، یا سێ نینۆکی کرد، واجب ئەبێ لەسەری یا حەیوانێکیوا سەربڕێ کە بۆ قوربانی بشێ یا سێ ساع قووت بدا بە شەش گەدا، یەکی نیو ساع، یا سێ رۆژ بەرۆژوو بێ. ئەگەر بە عیلم و عەمد و ئیختیارەوە جیماعی کرد، واجبە لەسەری وشترێك سەربڕێ بۆ گەدایانی حەرەمی مەککە ئەگەر ئەوەی نەتوانی، گایەك سەربڕێ؛ ئەگەر دەستی نەکەوت حەوت، سەر مەڕ سەربڕێ؛ ئەگەر ئەوەشی بۆ نەکرا، قیمەتی وشترەکە

بدا بە قووت و دابەشی‌کا بەسەر داماونی حەرەمی مەککەدا. ئەگەر ئەوەشی پێ‌نەکرا لەجیاتی هەر مشتێك قووت کە ئەبوو بە پارەی قیمەتی وشترەکە بیکڕێ، ڕۆژێ بەڕۆژوو بێ؛ بۆ نیومشتیش هەر ڕۆژێ بەڕۆژوو بێ. ئەگەر لە شوێنی دابەستنی ئیحراما ئیحرامی دانەبەست، ئەبێ حەیوانێکی‌وا سەرببڕێ کە بۆ قوربانی بشێ. ئەگەر بۆی‌نەکرا، قیمەتەکەی‌بدا بە قووت و دابەشی بکا بەسەر داماوانا، ئەگەر ئەوەشی بۆ نەکرا، لەجیاتی هەر مشتێ لەو قووتە، ڕۆژێ بەڕۆژوو بێ؛ ئەمە، لەسوورەتێکا کە بەتەنها حەج بکا کە پێی ئەڵێن «اِفْراد»، لە سوورەتێکیشا کە لەپێشا عەمرە بکا و ئەوجا حەج بکا -کە پێی ئەڵێن «تَمَتُّع» - یا هەردووکیان پێکەوە بکا -کە پێی ئەڵێن: «قران» -، ئەوە کەفارەتەکەی بە جۆرێکی‌ترە.

ئەوە حەیوانەی سەربڕینی واجب بێ بەهۆی کردنی شتێکی حەرامەوە، یا بەهۆی نەکردنی شتێکی واجبەوە، هەروەها ئەو حەیوانەیش کە سەربڕینی واجبە لەسەر ئەو حاجییەی «تمتُّع» یا «قِران» ئەکا، ئەوکەسە ئەتوانێ هەرکاتێك خۆی ئارەزووی لێ بێ سەری ببڕێ، هەر بەو شەرتە کە لە حەرەمی مەککەدا سەری‌ببڕێ و ئەبێ گۆشتەکەشی دابەش بکرێ بەسەر هەژارانی مەککەدا؛ کەواتە، ئەتوانێ خۆی بگەڕێتەوە و وەکیلێك لە مەککە بگرێ حەیوانەکەی بۆ سەرببڕێ. باشترین شوێن بۆ سەربڕینی ئەو حەیوانە بۆ ئەوکەسەی حەج ئەکا، خاکی «مِنىٰ»یە و بۆ ئەوکەسەی عەمرە ئەکا، خاکی «مَروة»یە، هەروەها بەنیسبەت ئەو حەیوانەشەوە کە حاجی یا ئەهلی عەمرە هاوردبێتیان بۆ سەربڕین بە دیاری کە پێی ئەڵێن: «هَدي»، بەڵام وەختی سەربڕینی، وەختی سەربڕینی قوربانییە کە بریتییە لە ڕۆژی جەژن و سێ ڕۆژەی پاش جەژن.

## واجباتی حەج

لەپێشەوە، وتمان: ئەرکانی حەج پێنجن؛ ئەگەر یەکێکیان فەوتا؛ تۆڵەی ناکرێتەوە و حەجەکە بەتاڵ ئەبێتەوە؛ واجباتی حەجیش، پێنجن؛

یەکەم، ئیحرام دابەستنە لە میقاتەوە؛

دووهەم، رەجم کردنی شەیتانە لە رۆژی جەژن و سێ رۆژەی پاش جەژندا؛

سێهەم، مانەوەی شەوە لە «مُزْدَلفە»دا؛

چوارەم، مانەوەی شەوەکانی پاش جەژنە لە «مِنیٰ»دا؛

پێنجەم، خۆپاراستنە لەو شتانە کە بەهۆی ئیحرامەوە حەرام ئەبن لەسەر حاجی؛ ئەگەر یەکێ لەمانە فەوتا؛ تۆڵەی ئەکرێتەوە بەکەفارەتدان. ئەم واجباتە، ناویش ئەبرێن بە «أَبعاض». غەیری ئەرکان و واجبات، هەرچیتر لە حەجدا بکرێ، هەمووی سوننەتە، ئەگەر فەوتایشن، تۆڵەیان ناوێ و ناو ئەنرێن بە هەیئات.

## حەج و عەمرە بە چەند جۆر ئەکرێن؟

حەج و عەمرە بە سێ جۆر بەجێئەهێنرێن:

[جۆری] یەکەم، «إفـراد»، یەعنی کردنیان بەجیاجیا. شێوەی زۆر گەورەی ئەمجۆرە، ئەوەیە حاجی ئیحرام بۆ حەج دابەستێ و ئادابی حەج تەواو بکا و لەپاش ئەوە ئیحرام بۆ عەمرەیش دابەستێ، وەکوو خەڵکی مەککەی موکەڕڕەمە و ئادابی عەمرەکە بەجێبهێنێ؛ «إفراد»، بەوجۆرەیش ئەبێ کە لەساڵێکا تەنها حەج و لەساڵێکیترا تەنها عەمرە بکا، یاخود هەر لە یەك ساڵا پێش داهاتنی مانگی شەشەڵان، عەمرە بکا و کە کاتی ئیحرام دابەستنی حەجیش هات، ئیحرامی بۆ دابەستێ لە میقاتەوە و جێبەجێی بکا.

جۆری دووهەم «قِران»ە، یەعنی کردنی حەج و عەمرە بەیەکەوە، بەوجۆرە کە لەمیقاتەوە ئیحرام دابەستێ بۆ هەردووکیان و تەنها ئادابی حەج بەجێ بهێنێ، بەم سوورەتەیش هەردوویکان بەجێدێن. ئەگەر لە مانگەکانی حەجدا ئیحرامی بەنیازی عەمرە دابەست و لەپێش تەوافدا نیازی تێکەڵ کردنی حەجیشی لێ هێنا، ئەوە ئەم سوورەتەیش هەر بە «قِران» دائەنرێ؛ بەڵام دروست نییە لە ئیحرامدا نییەتی حەج بهێنێ و لەپاشا عەمرەیشی تێبخا.

جۆری سێهەم «تَـمَتُّع»ە، یەعنی وەرگرتنی رەحەتی و حەسانەوە؛ ئەمەش، بەوجۆرە ئەبێ کە لەمیقاتی وڵاتی خۆیەوە ئیحرامی عەمرە دابەستێ و عەمرەکە تەواو

بکا، پاش ئەوە هەر لە شاری مەککەوە حەج دابمەزرێنێ و ئیحرامی بۆ دابەستێ، یاخود بڕوا بۆ میقاتی ئیحرامی عەمرەکەی و لەوێوە ئیحرام ببەستێ، یاخود لە مەسافەیەکی ئەوەندەی مەسافەی میقاتەکەوە، یا لە شوێنێکی نزیکتر لە میقاتی ئیحرامی عەمرەکەوە، ئیحرام دابەستێ بۆ حەج.

گەورەترینی ئەم سێ جۆرە «إفراد»ە، ئەمجار «تمتّع»، لەبەرئەوەکە ئادابی حەجیش و عەمرەشی جێبەجێ کردووە و هەر ئەوەندەیە یەکێك لە میقاتەکانی بۆ گەڕاوەتەوە. واجبە لەسەر ئەوەی بەشێوەی «تمتّع» حەج و عەمرە بکا، حەیوانێك سەرببڕێ بۆ قوربانی بشێ، بە دوو شەرت؛ یەکەم، لە ئەهلی «المسجِدُ الحرام» نەبێ کە بریتین لەو کەسانەی ماڵیان لە مەککەدایە یا دوو قوناغ کەمتر لە مەککەوە دوورە؛ دووهەم، عەمرەکەی لە مانگی حەجدا بێ لەو ساڵەدا کە حەجەکەی تیا ئەکا. هەروەها، پێویستە لەسەر ئەوەی بەشێوەی «قِران» حەج و عەمرە ئەکا، حەیوانێك سەرببڕێ ئەگەر لە ئەهلی «المسجدُ الحرام» نەبێ؛ وەختی واجب بوونی سەربڕینی ئەو حەیوانە، وەختی ئیحرام دابەستنە بۆ حەجەکە بەتەنها، وەکوو لە «تمتّع»دا، یا لەگەڵ عەمرەدا، وەکوو لە «قِران»دا و گەورەتر، ئەوەیە لە ڕۆژی جەژنی قوربانا سەری ببڕێ؛ ئەگەر لەوێ ئەمەی بۆ ڕێنەئەکەوت، دە ڕۆژ بەڕۆژوو بێ سێ ڕۆژیان بەر لە تەواوبوونی حەجەکەی کە سوننەتیشە بکەونە پێش ڕۆژی عەرەفەوە و حەوت ڕۆژیان پاش گەڕانەوەی بۆ ناو ماڵ و منالی خۆی؛ سوننەتە ئەو سێ ڕۆژە و ئەم حەوت ڕۆژە لەناو خۆیانا بەینیان نەکەوێ؛ ئەگەر ئەو سێ ڕۆژەی لەماوەی حەجەکەدا بۆ نەگیرا، پێویستە کە لە ماڵدا ئەیانگرێت، لەگەڵ حەوت ڕۆژەکەدا بەینیان بخات.

## باسی چوونە ناو شاری مەککەی موکەڕڕەمە

باشتر ئەوەیە حاجی لەپێش ڕاوەستانی عەرەفە بڕواتە شاری مەککەوە. جا ئەو کەسەی لە ڕێگەی مەدینەوە دێت، سوننەتە کە گەیشتە «ذِي طُوى»، خۆی بشوا و بڕواتە ناو شار لە دانەی «كِدا»وە؛ هەرکەسێکیش لە غەیری ڕێگەی مەدینەوە بێت، ئەگەر

ویستی لە دانەی ژووررووەوە بڕواتە ناو شار، ئەویش هەر لە «ذی طوی»دا خۆی بشوا، ئەگینا لەئەندازەی مەسافەی ئەوێدا خۆی بشوا و بڕواتە ناو شارەوە.

سوننەتە کە چاوی بە «بیتُ اللّه» کەوت، بڵێت: «اَللّٰهُمَّ زِدْ هٰذا البَیتَ تَشریفاً وَ تَعظیماً و تَكْریماً و مَهابَةً، وَ زِدْ مَنْ شَرَّفَهُ وَ عَظَّمَهُ مِمَّنْ حَجَّهُ أَوِ اعْتَمَرَهُ تشریفاً وَ تَعظیماً وَ تَكْریماً وَ بَرّاً، اَللّٰهُمَّ أَنتَ السَّلامُ وَ مِنكَ السَّلامُ، فَحَیِّنا رَبَّنا بِالسلامِ»، جا لە دەرگای «بني شَیْبة»وە ـکە ئێستا مەشهوورە بە «بـابُ السّـلام» - بـڕواتـە نـاو مزگەوتەوە و دەست بكا بە «طوافُ القُدوم»، یەعنی سووڕانەوە بەدەوری کەعبەدا لە خۆشی گەیشتنیا بەو شوێنە پیرۆزە و حەوت جار هەڵسووڕێ بەدەوریا؛ کە ڕۆیشتیشە ناو حەوشی مزگەوتەوە، گورج خەریکی تەواف ببێ، مەگەر ترسی فەوتانی نوێژێکی فەرز، یا جەماعەتی ببێ، یا بترسێ لە فەوتانی سوننەتی راتیبەی نوێژەکەی، ئەوە لەو کاتەدا لەپێشا ئەمانە جێبەجێ بکا، ئەوسا تەواف بکا. «طوافُ القُدوم»، سوننەتە، بەڵام سوننەتێکی ئەوەندە گەورەیە گەلێ کەس بە واجبیان داناوە؛ ئەم تەوافە بۆ ئەو کـەسە سوننەتە کە لەپێش راوەستانی عەرەفاتا بڕواتە مزگەوتەوە؛ ئەگەر لەپـاش راوەسـتان چووە مزگەوتەوە، واجبە دەسبەجێ تەوافی فەرزبکا، چونکە کاتی تـەوافـی روکـن هاتووە؛ بەڵام ئەگەر پاش راوەستانی عەرەفە و پێش نیوەشەو گەیشتە بەیت، ئەوە لەم وەختەیشدا «طواف القدوم» هەر سوننەتە؛ سوننەتە لەپاش تەواف دوو رکات سوننەتی تەواف بکا لە پشتی مەقامی حەزرەتی ئیبراهیمەوە؛ جا پاش ئەوە کە گەیشتە بەیت و «طواف القدوم»ی کرد، لەوێدا ئەمێنێتەوە خەریکی عیبادەت ئەبێ تـا کـاتی بـەجێ هێنانی ئادابی حەج و بەقەدەر توانا، سوننەتە بڕواتە ناوماڵی کەعبەوە و دوو رکـات نوێژی تیا بکات.

## باسی دەرچوون لە مەککە بۆ خاکی عەرەفات

سوننەتە بۆ فەرمانڕەوای موسوڵمانان یا خۆی یا وەکیلەکەی بەسەر حاجییانەوە، لە رۆژی حەوتەمی مانگی قوربانا، لەپاش نوێژی نیوەڕۆ خوتبەیەك لەناو حاجییەکاندا

بدا، لەو خوتبەیەدا فەرمانیان بداتێ کە سبەینێ لە مەککە دەرچن بۆ خاکی «مِنی» و ئەو ئادابانەی لەپێشیانە پیشانیان بدا [و] بۆ سبەینێیش ـکە هەشتی مانگە ـ لەگەڵیان دەرچێ بۆ خاکی «منی» و شەوی نۆی مانگ لەوێ بمێننەوە و رۆژی دوایی، کە رۆژ هەڵات، بڕۆن بۆ عەرەفات، بەڵام نەڕۆنە خاکی عەرەفاتەوە، بەڵکوو تـا نـیوەڕۆ لە «نـمرَة»دا بمێننەوە کە نزیکی عەرەفاتە، جا خۆیان بشۆن بۆ وەستانی عەرەفات [و] فەرمانڕەوای موسوڵمانانیش یا جێنشینەکەی، دوو خوتبەی کورتیان بۆ بخوێنێتەوە، لە خوتبەی یەکەمیانا ئەو ئادابەیان پیشان بدا کە لەپێشیانە، وەك راوەستانی عەرەفات و زیکر و «لبێك» کردن و دوعا خوێندن و دەرچوون لە عەرەفات [و] لەپاش خوتبەی یەکـەم، ئەوەندەی خوێندنێکی سوورەتی «الإخلاص» دانیشێ، جا راست بێتەوە بۆ خوتبەی دووهەم، لەمکاتەدا بانگدەر دەست بکا بە بانگدان بەجۆرێ تا ئەم بانگەکەی تەواو ئەکات، خەتیبیش لە خوتبەی دووهەم ببێتەوە، جا قامەت بکا و ئیمام نوێژی نیوەڕۆ و عەسریان بە «جمعُ التّقدیم» پێبکا، بەڵام حاڵییان بکا لەوە کەوا تـەنها ئـەو کـەسانە حەقی کورت کردنەوەی نوێژی چوار رکاتی و کۆکردنەوەی دوو نوێژیان هەیە کەوا لە چوار رۆژ پێش ئەو رۆژەوە لە مەککە نـەبووبن و ئـێستـەش نـیازیان نـەبێ لەپـاش تەواوکردنی ئادابی حەج لە مەککە بمێننەوە، هەروەها ئەوانەیش کە بەنیازی مانەوە، چوار رۆژ لە مەککە دانیشتبن، بەڵام نیازیان وابێ پاش حەج لە مەککە دەرچن، نەك ئەو کەسانە کە بە نیازی مانەوە، چوار رۆژ لە مەککە دانیشتبن و ئێستەش بیانەوێ پاش ئادابی حەج، چوار رۆژ یا زیاتر بمێننەوە لە مەککەدا، ئەوانە حەقی کورت کردنەوە و کۆکردنەوەی نوێژیان نییە [و] ئەبێ لەپاش سەلامدانەوەی ئیمامیش لە دوو رکاتەکەی نوێژی نیوەڕۆ، راست ببنەوە دوو رکاتەکەیتری نوێژەکەیان بکەن و بۆیشـیان نـییە نوێژی عەسر لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆیاندا پێکەوە بکەن.

بزانن! ئەم خوتبە خوێندنەوە و نوێژی نیوەڕۆ و عەسرە، لە «مزگەوتی حەزرەتی ئیبراهیمدا» جێبەجێ ئەکرێت ـعلی نبیِّنا و علیه السّلام ـ؛ سنووری سەرێکی ئـەم مزگەوتە، «عرنة»یە کە هەزار گەز لە حەرەمەوە دوورە، سنووری ئەوپەڕیشی، ئاخری خاکی «عَرفات»ە لەو شوێنەدا کە چەند بەردێکی گەورە فەرش کراوە.

پاش ئەمە، هەموو برۆن بۆ عەرەفات و لەوێ بمێننەوە تا مەغریب زیکری خوا بکەن و «لا اله الاّ اللّه» بکەن و دوعا بۆ خۆیان و بۆ هەموو موسوڵمانان بکەن لە مردوو و زیندوو. ئەو زیکر و دوعایانەی کە لە پێغەمبەرەوەﷺ بیسراون، خێریان زۆرترە لە دوعای‌تر؛ لەم دوعایانەیە «اَللُّهَّمَ اغْفِرْ لِلحَاجِّ وَ لِمَن اسْتَغْفَرَ لَهُ الحاجُّ». ریوایەت کراوە هەرکەس لە رۆژی عەرەفەدا هەزار جار سوورەتی «قُل هو اللّه احد» بخوێنێ، دوعای قەبووڵ ئەکرێ. سوننەتە سوورەتی «الحشر» بخوێنێ و «لا إله إلا اللّهُ وحدَه لاشريكَ لَهُ، لَهُ الْمُلكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ، يُحيِي وَ يُميتُ، بِيدِهِ الخيرُ، و هُوَ عَلى كُلِّ شيءٍ قديرٌ» بخوێنێ، هەروەها ئایەتی ﴿رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنيا حَسَنةً، وَ في الآخرةِ حَسَنِةً، وَقِنا عَذابَ النارِ﴾ بخوێنێ؛ «لبّيك لبّيكَ» کردن و سەڵاوات دانیش لەسەر حەزرەتﷺ، سوننەتە.

**بزانن!** واجبی راوەستانی عەرەفات، ئەوەندەیە ئینسان لە لایەکی خاکی عەرەفاتا حازر بێ، هەرچەند بۆ رابواردنیش هاتبێ یا بەدوای برادەرێکیا بگەڕێ، بەو شەرتە ئەهلی عیبادەت بێ و لە ئیحراما بێ و شێت و بێ‌هۆش و سەرخۆش نەبێ.

وەختی راوەستان لە عەرەفاتدا، دەس‌پێ ئەکا لە نیوەڕۆی رۆژی نۆهەمی «ذي الحجّة»وە تا بەرەبەیانی رۆژی جەژن و هەرچەند لەویادا بمێنێتەوە، واجبەکەی پێ جێ‌بەجێ ئەبێ؛ بەڵام ئەگەر لە رۆژی نۆهەمدا رۆیشتە ئەوێ، سوننەتە بمێنێتەوە تا رۆژ ئاوا ئەبێ و زەردەی کەناری ئاسمان ون ئەبێ؛ ئەمەش، بۆ دەرچوون لە خیلافی ئەو ئیمامانە کە فەرموویانە واجبە لەسەر حاجی شەو و رۆژ یەك بخا لە عەرەفاتا؛ کەواتە، ئەگەر پێش رۆژئاوابوون عەرەفاتی بەجێ‌هێشت و شەو نەگەڕایەوە، یاخود هەر شەو هاتە عەرەفاتەوە، سوننەتە حەیوانێك سەرببڕێ. ئەگەر لە رۆژی دەهەمدا ـ کە رۆژی جەژنە ـ بە هەڵە لە عەرەفاتدا راوەستان، ئەوە کافییە و بەکاردێت، چونکە بەهیچ دەرکردنی حەجی هەزاران کەس، شتێکی زەحمەتە؛ کەواتە، رۆژی جەژن و سێ رۆژەی «أيّام التّشريق»یان ئەکەوێتە دواوە؛ بەڵام ئەگەر ژمارەی حاجییەکان زۆر کەمتر بوو لە عادەتی ساڵانە، ئەو راوەستانەنادروستەیان بۆ دانامەزرێ و ئەبێ لە ساڵی

دواییدا قەزای حەجەکەیان بکەنەوە. ئەگەر بە غەڵەت لە رۆژی هەشتەمدا راوەستان لە عەرەفاتدا، ئەمە ئەگەر بۆ سبەینێ بەم غەڵەتەیان زانی، جارێکی تریش بچنەوە بۆ عەرەفات؛ ئەگەر تا رۆژی جەژن پێیان نەزانی، ئەوە ئەبێ حەجەکەیان قەزا بکەنەوە. کە مەغریب داهات، ئەبێ ئەوانەی لە عەرەفاتدان و حەقی «جمعُ التّأخیر»یان هەیە، نوێژی مەغریب نەکەن و نوێژەکەیان دواخەن لەگەڵ نوێژی عیشا لە «مزدلفة»دا پێکەوە بیانکەن، ئەوانەشیان کە حەقی «جمع التّاخیر»یان نییە، هەر لە عەرەفاتدا نوێژی مەغریب بکەن و ئەوجا بڕۆن بۆ «مزدلفة».

**بزانن!** سوننەتە بۆ ئەوانەی لە عەرەفاتا دوعای خێر ئەکەن، روو لە قیبلە بن و لەشیان پیس نەبێ و بێ‌دەس‌نوێژ نەبن و لەپاڵ «جبلُ الرّحمة»دا بووەستن.

## باسی دەرچوون لە «عَرفات»ەوە بۆ «مزدَلِفة»

لەپاش رۆژ ئاوا بوون، لە عەرەفاتەوە داپەڕن بۆ موزدەلیفە کە مەسافەکەی، بەدرێژی حەوت هەزار و هەشتا گەزە؛ کە گەیشتنە ئەوێ، ئەگەر نوێژی عیشا بووبوو، ئەوانەیان کە نوێژی مەغریبیان نەکردووە، بە «جمع التّأخیر» لەگەڵ نوێژی عیشادا پێکەوە بیانکەن، ئەوانەشیان کە نوێژی مەغریبیان لە عەرەفاتدا کردووە، نوێژی عیشاکەیان بکەن. مانەوەی شەو لە موزدەلیفەدا واجبە؛ ئەگەر کەسێك شەو لە موزدەلیفەدا نەمایەوە، واجبە حەیوانێك سەرببڕێ، بەڵام ئەگەر لە پێش نیوەشەوا لەوێ دەرچوو و لەپێش بەرەبەیانا هاتەوە، حەیوانی لەسەر نییە.

جا سوننەتە پێش ئەوە کە رۆژ ببێتەوە، ئەوەی پیر و لاوازە و هەموو ژنان، بڕۆن بۆ خاکی «مِنی» بۆ ئەوە زوو لەوێ نوێژی بەیانی بکەن و بەر لە کۆبوونەوەی قەرەباڵغ، رەجمی شەیتان بکەن، ئەگەر ئەیانویست زوو رەجمی بکەن، ئەگینا بیخەنە دوای هەتاو کەوتن؛ پیاوە بەهێزەکانیش لە موزدەلیفەدا بمێننەوە تا رۆژ ئەبێتەوە، لە تاریکی بەرەبەیانا نوێژی بەیانی بکەن، جا ئەوانیش دەرچن بۆ مینا و هەر لە خاکی موزدەلیفەوە وردە بەرد هەڵگرن بۆ رەجمی شەیتان و بڕۆن تا ئەگەنە «المَشْعَر الحرام»

ـکە بینایەکە ئێستاش ماوە و لە سنووری موزدەلیفەدایە ـکە گەیشتنە ئەوێ، راوەستن و دوعا بکەن تا بەری رۆژ زەرد ئەبێتەوە، جا بڕۆن بۆ مینا؛ لەپاش هەتاو کەوتن ئەگەنە مینا، لەوێ هەر یەکی حەوت بەرد فڕێ بدەن بۆ کۆگا بەردی «جَـمْرَةُ العَـقَبة»؛ ئـەم بەردانە، وەکوو بەردی پەلەپیتکە وان و یەکە یەکە فڕێ ئەدرێن، لەگەڵ هەر بەردێکیشا «اللّه أکبر» بکەن.

جا ئەوەی حەیوانی «هدي»ی پێیەکە ئەوەتە هێنرابێ بۆ هەژارانی مەککە، چ نەزری کردبێ لەسەر خۆی و چ بە ئارەزوو هێنابێتی، لەویا حەیوانەکەی سەرببڕێ؛ هەروەها هەرکەس ئارەزووی قوربانی کردنی هەیە، ئەویش لەویادا حەیوانەکـەی سـەرببڕێ؛ پاش ئەمە، یا سەری بتاشێ یا کورتی بکاتەوە، بەڵام سەرتاشینەکە خێرتره بۆ پیاو، بۆ ژنیش کورتکردنەوە خێری زۆرترە؛ لای کەمی کورت کردنەوە، هـەڵ پـاچینیسێ مووە؛ ئەو کەسەش کە سەری مووی پێوە نەبێ، هەر سونەتە چەقۆ بهێنێ بەسەریا؛ ئەم سەرتاشین یا کورت کردنەوەیە، روکنێکە لە ئەرکانی حەج، ئەگەر نەکرێ، حەجەکە دانامەزرێ.

حاجی، پاش لێبوونەوە لە سەرتاشین یا کورت کردنەوەی موو، ئەڕواتە ناو شاری مەککەوە و تەوافی روکن بەجێ دێنێ؛ پاش تەوافیش، سەعی ئەکا لەنـێوان سـەفا و مەروەدا، جا ئەگەڕێتەوە بۆ مینا بۆ رەجمی شەیتان، وەکوو بەدرێژی باسی ئەکەین. سونەتە ئەم رەجمی شەیتان و سەربڕینی حەیوان و لابردنی موو و تەوافی روکنە، بەو تەرتیبە جێبەجێ بکرێن کە باسمان کردن؛ وەختی ئـەمانە، لە نـیوەشەوی شـەوی جەژنەوە دەس پێئەکا. وەختی رەجمی «جَمرة العَقبة»یش تا ئاخری رۆژی جەژن ئەمێنێ. وەختی سەربڕینی حەیوانیش[١]، وەختی قوربانی کـردنە و ئـەم وەخـتە، بـە تەواوبوونی «ایّام التّشریق» ئەفەوتێ؛ بەڵام سەرتاشین و تەوافـی روکـن و راکـردنی بەینی سەفا و مەروە، وەختیان نابڕێتەوە، ئەوەندە هەیە کەراهەتی هەیە دوایان بخا لە رۆژی جەژن و کەراهەتی زۆرترە دوایان بخا لە «ایّام التّشریق». مادام بڵێین: سەرتاشین

١. مەبەست، حەیوانی «هَدي»ە، واتە دیاری، نەك حەیوانی تر.

یەکێکە لە ئادابی حەج، ئەوە ئەگەر دوو شتی لەم سێ شتە (ڕەجم و سەرتاشین و تەواف) کرد، نەجات بوونی یەکەمی بۆ دێتەدی لە ئیحرام و بۆی حەڵاڵ ئەبێ جل لەبەربکا و موو بە خۆیەوە لابەرێ و نینۆکی بکا و ڕاو بکا؛ کە سێهەمەکەشیانی کرد، عەقدی نیکاح و ئەو شتەکانی تری بۆ حەڵاڵ ئەبێ کە بەهۆی ئیحرامەوە لێی حەرام بووبوون.

## تەوافی فەرز

واجباتی تەواف، حەوتن:

یەکەم: داپۆشینی هەر شوێنێکە کە لە نوێژا بە عەورەت دابنرێ؛

دووهەم: پاکییە لە پیسی لەش و بەرگ و لە بێدەس‌نوێژی و لەش پیسی؛ جا ئەگەر لەناو تەوافا دەس‌نوێژەکەی شکا، پێویستە گورج دەس‌نوێژ بگرێ و لەسەر ژمارەی پێشوو تەوافەکانی تەواو بکا؛

سێهەم: سووڕانەوەیە حەوت جار بەدەوری کەعبەدا بەو شەرتە کە تەوافەکانی لە بەرابەری «حَجرُ الأَسوَد»ەوە دەس پێبکا؛ ئەگەر لەولاوە دەسی پێ کرد، بۆی حیساب ناکرێ تا ئەگاتە بەرابەری «حَجر الاسوَد» و لەوێوە بۆی ئەژمێررێ؛

چوارەم: ئەوەیە لەم تەوافانەدا کەعبە بخاتە لای چەپیەوە؛

پێنجەم: ئەوەیە لە هەموو تەوافێکدا، لای چەپی هەموو لەشی بخاتە بەرامبەری «حجَر الاسوَد»ەوە؛

شەشەم: ئەوەیە لە ئەووەڵی تەوافەکانەوە نییەتی تەوافی ڕوکنی ببێ و نییەتەکەی نەگۆڕێ.

ئەگەر کەسێ بەسەر ئەو زیادە دیوارەدا ڕابورد کە لە زەمانی «عبداللّٰه ابن الزُّبَیر»دا لە دیواری کەعبە دزراوەتەوە، ئەوە تەوافەکەی دانامەزرێ، چونکە ئەو زیادە دیوارەیش بەشێکە لە کەعبە و ئەوەی بەسەریا بڕوا، بەدەوری هەموو کەعبەدا نەگەڕاوە؛ هەروەها، ئەگەر دەستی درێژکرد و دای لەو دیوارەی بەیت کە وا لەعاستی ئەو زیادە دیوارەوە،

لەم سوورەتەیشدا دیسان تەوافەکەی بەتاڵە، لەبەر ئەوە کە ئەو ئەندازەیەی دەستی کە درێژی کردووە و داویە لە دیوارەکە، نەکەوتووەتە پشتی هەموو دیواری بەیتەوە. ئەگەر کەسێکیش بە یەکێ لە کونەکانی «حِجر اسماعیل»دا رۆیی و لەو کوونەکەوە دەرچوو، هەر تەوافەکەی بەتاڵە، چونکە لەم حاڵەدا، ئەڵێن: تەوافی لە بەیتا کردووە، نەك بەدەوری بەیتا، چونکە ئەو شوێنە ناو بەیتە.

حەوتەم: ئەوەیە تەوافەکانی لەناو حەوشی مزگەوتەوە بێ؛ کەواتە، ئەگەر یەکێك لە دەرەوەی ئەو حەوشەوە بسوورێتەوە بەدەوری بەیتدا، ئەوە ئەو سوورانەوەیەی بۆ حیساب ناکرێ، چونکە لە عورفدا بە تەواف دانانرێ.

سونەتەکانی تەوافیش، نۆ سونەتن؛

یەکەم: ئەوەیە بە پیادە تەواف بکا؛

دووهەم: ئەوەیە لە ئەووەڵی هەر تەوافێکەوە دەست بە «حجرُ الاسود»دا بێنێ و ماچی بکا و تەوێڵی بنێتە سەر؛ ئەگەر بۆی نەکرا، هەر دەستی پیا بهێنێ؛ ئەگەر ئەوەشی بۆ نەکرا، ئیشارەتی بۆ بکا؛ بەڵام روکنە شامییەکان دەستیان پیا نەهێنێ و ماچیان نەکا؛ روکنی یەمانییش دەستی پیا بهێنێ بەڵام ماچی نەکا؛

سێهەم: لە ئەووەڵی هەر تەوافێکەوە، بڵێت: «بِسم اللّهِ وَ اللّه أكبر، اَللّهُم إيماناً بِكَ، و تصديقاً بكتابِكَ، وَ وَفاءً بِعَهْدِكَ، وَ اتِّباعاً لِسُنَّةِ نبيِّكَ مُحمّدٍ صلّى اللّه عليه و سلّم»؛

چوارەم: ئەوەیە بەرەورووی دەرگای بەیت، بڵێت: «اَللّهمَّ إنّ هذا البيتَ بيتُكَ، والحرَمَ، حرمُكَ، وَ الأَمْنَ أَمنُكَ، و هٰذا مَقامُ العائذِ بِكَ مِنَ النّارِ»؛

پێنجەم: ئەوەیە لەبەینی هەردوو روکنی یەمانیدا، بڵێت: ﴿اللّٰهمَّ آتِنا في الدُّنيا حسَنَةً و في الآخِرَةِ حسَنَةً، و قِنا عذابَ النّارِ﴾، جا هەر دوعایەك کە ئارەزووی لێیە بیکا، بەڵام دوعایەك کە لە پێغەمبەرەوەﷺ نەقڵ کرابێ، چاکترە بۆ ئەو شوێنە لە خوێندنی قورئان و قورئان باشترە لە دوعایەك کە لە پێغەمبەرەوە نەقڵ نەکرابێ؛

شەشەم: ئەوەیە لە سێ تەوافەکەی ئەووەڵدا، پەلە بکا لە رۆیشتندا و هەنگاوەکانی لەیەکەوە نزیك بن کە ئەوەیش پێی ئەوترێ «رَمَل» و لە چوار تەوافەکەی تردا، بە عادەتی

بڕوا بەڕێدا؛ ئەم سوننەتە، لە تەوافێکایە کە راکردنی بەینی سەفا و مەروەی لەپاشەوە بێ؛ سوننەتە لەکاتی ئەم بەپەلە رۆیشتنەدا، بڵێت «اَللّهمَّ اجْعَلْهُ حَجّاً مَبْرُوراً و ذَنْباً مَغفوراً وَ سَعْياً مَشكوراً»؛ سوننەتیشە لە هەر تەوافێکا کە ئەم رۆیشتنی بەپەلەیەی تێدا سوننەت بێ «اِضْطِباع» بکا، یەعنی وا راوەستێ خاولی ناوشانی بخاتە ژێر باڵی راستی و هەردوو چمکەکەی بخاتە سەر باڵی چەپی؛ هەروەها، لەکاتی راکردنی بەینی سەفا و مەروەدا، ئەمە بکا؛ ئەم بەپەلە رۆیشتن و شێوەی دانانی خاولی سەرشانە، سوننەت نییە بۆ ژن؛

**حەوتەم:** ئەوەیە لەکاتی تەواف کردندا نزیك ببێتەوە لە بەیت؛ ئەگەر لەنزیکەوە نەیئەتوانی پەلە بکا لە رۆیشتندا، دوور بکەوێتەوە و بەپەلە بڕوا چاکترە، مەگەر ترسی ئەوەی ببێ کە ئازاری ژن و نەخۆش و لاواز بدا، لەم حاڵەدا، لە نزیکەوە تەوافەکەی بکا و بە ئارام بڕوا بەڕێوە چاکترە؛ **هەشتەم:** ئەوەیە بەینی تەوافەکان نەخا؛

**نۆهەم:** ئەوەیە لەپاش تەوافەکان، لەپشتی مەقامی حەزرەتی ئیبراهیمەوە ـ علی نَبیِّنا و علیه الصّلاة و السّلامُ ـ دوو رکات نوێژ بکا، لە رکاتی یەکەمیانا، سوورەتی «الکافِرون» و لە دووهەمیانا «والاخلاص» بخوێنێ؛ ئەگەر ئەم نوێژەی بە شەو کرد، ئەو سوورەتانە و فاتیحە بە ئاشکرا بخوێنێ؛ ئەم دوو رکاتە، پێیان ئەوترێ: «سوننەتی تەواف». ئەگەر ئینسانێکی بێ‌ئیحرام، یەکێکی ئیحرام داری هەڵگرت و تەوافی پێ کرد، ئەوە حیساب ئەکرێ بۆ هەڵگیراوەکە، هەروەها، ئەگەر ئیحرامدارێکیش هەڵی‌بگرێ کە تەوافی خۆی کردبێ، ئەگینا ئەگەر نیازی هەڵگیراوەکەی هەبوو بەتەنها، ئەوە بۆ ئەو حیساب ئەکرێ؛ ئەگەر نیازی خۆی یا نیازی هەردووکیشیانی هەبوو، تەنها بۆ خۆی حیساب ئەکرێ.

## باسی «سَعي» لە بەینی سەفا و مەروەدا

کە لە حەوت تەوافەکە و دوو رکاتە نوێژەکە بووەوە، بڕوا دەست بێنێ بە «حجر الاسود»دا و لە دەرگای «بابُ الصّفا»وە دەرچێ بۆ سەعی، یەعنی راکردن لەبەینی سەفا و مەروەدا؛ شەرتی ئەم راکردنە، دوو شتە:

یەکەم: ئەوەیە لە سەفاوە دەست پێبکا و حەوت جار لەبەینی سەفا و مەروەدا هاتوچۆ بکا، رۆیشتنەکەی جارێك و گەڕانەوەکەی جارێك؛

دووهەم: ئەوەیە ئەو راکردنە لەپاش تەوافی فەرز بێ، یا لەپاش تەوافی هاتن (طواف القُدوم) بێ بۆ ئەوە کە راوەستانی عەرەفات نەکەوێتە بەینی تەواف و راکردنەکەوە؛ ئەگەر کەسێك پاش «طواف القدوم» راکردنەکەی کرد، لەپاش تەوافی فەرز دووبارەی نەکاتەوە.

سوننەتە ئەوەندەی باڵا پیاوێك بەسەر سەفا و مەروەدا سەرکەوێ، کە سەریش کەوت، بڵێت: «اللّه أكبرُ، اللّه أكبرُ، اللّه أكبرُ، وللّهِ الحمدُ، اللّه أكبرُ على ما هَدانا والحمدُ للّهِ على ما أَوْلينا، لا إله إلا اللّه وحده لاشريكَ له، لهُ الملكُ و لَه الحمدُ، يُحيِي و يُميتُ بيدِهِ الخيرُ و هو على كلِّ شيىءٍ قديرٌ»؛ پاش ئەمە، هەر دوعایەکی دینی یا دنیایی ئەکا، مەیلی خۆیەتی؛ سوننەتە ئەم زیکر و دوعایە تا سێ جار دووبارە بکاتەوە. لە ئەووەڵ و ئاخری راکردنەکەشەوە بە رۆیشتنی عادەتی بڕوا بە رێدا و لە ناوەڕاستا راکات؛ شوێنی ئەمانەش دیارییە.

## رۆیشتن بۆ «مِنیٰ»

هەروەختێ حاجی لە مەککەوە رۆیشتەوە بۆ مینا، یا ئەگەر هەر لەپێش تەوافا لە مینا مایەوە، واجبە لەسەری شەوی یەکەم و دووهەمی «أيّام التّشريق» لە مینا بمێنێتەوە و هەر سێ رۆژەکەی بەرد فڕێ بداتە سەر هەر سێ کۆمەڵە بەردەکە «الجَمرَة الكُبرى و الجَمرةُ الوسطى و جَمرةُ الخيف»، بۆ سەر هەر یەکێکیان حەوت بەرد. جا ئەگەر لە رۆژی دووهەما رەجمی شەیتانیان کرد و ویستیان لەپێش خۆر ئاوا بوونا لە خاکی مینا دەرچن، ئەوە دروستە و مانەوەی شەوی سێهەمیان لە کۆڵ ئەکەوێ، هەروەها رەجمی رۆژەکەیشی؛ ئەگەر مایشنەوە تا خۆر ئاوا بوو، ئەوە واجبە شەوی سێهەمیش لەوێ بمێننەوە و لە رۆژەکەیشیا رەجمی شەیتان بکەن، ئەوجا بڕۆنە دەرەوە.

هەرکەس عوزرێکی ببێ و نەتوانێ لە شەوی یەکەم و دووهەمدا لە میناد بمێنێتەوە، وەك ئەو کەسانە کە ئیش و کاری حاجییەکانی تریان پێسپێرراوە، ئەتوانێ بەر لە رۆژ

ئاوا بوون و داهاتنی شەوی یەکەم، لە مینا دەرچێ و سبەینێ بێتەوە و رەجمی شەیتان بکا، هەروەها ئەتوانێ بەر لە داهاتنی شەوی دووهەمیش، دەرچێ و سبەینێ بێتەوە بۆ رەجم کردنەکە.

وەختی رەجمی شەیتان، لە لادانی خۆرەوەیە لە ناوەڕاستی ئاسمان تا خۆرئاوابوونی هەر سێ رۆژەکەی پاش جەژن. شەرتە ئەو حەوت بەردە کە فڕێ ئەدرێتە سەر کۆگا بەردەکان، یەکە یەکە فڕێ بدرێن و نابێ لەجیاتی بەرد شتێکی‌تر فڕێ بدرێ، ئەبێ وەزعی هاویشتنەکەیش بەجۆرێك بێ پێی بوترێ فڕێ‌دان؛ شەرتیشە بەردەکان بەتەرتیب فڕێ بدا، یەعنی لەپێشا بۆ ئەو کۆمەڵەی وا لەلای مزگەوتی «خـیف»ەوە، ئەوجا بۆ ئەو کۆمەڵەکەی ناوەڕاستیان، پاشان بۆ کۆمەڵەکەی «جَمْرَةُ العَقَبة»؛ سوننەتە بەردەکان ئەوەندەی بەردی پەلەپیتکە بن. شەرت نییە کابرای بەرد هاوێژ لە دەرەوەی کۆگا بەردەکانا بێ، هەروەها شەرت نییە بەردەکان لەناو کۆمەڵەکانا بمێننەوە. هەرکەس خۆی نەیتوانی رەجمی شەیتان بکا، ئەبێ وەکیل بگرێ. ئەگەر یەکێك رۆژێك بەردی نەهاویشت، ئەبێ سبەینێ لەپێش هاویشتنی بەردی ئەو رۆژەدا، بیهاوێژێ، لەم سوورەتەدا پێویست نابێ لەسەری حەیوان سەرببڕێ؛ ئەگەر نەشی‌هاویشت، ئەبێ حەیوانێك سەرببڕێ؛ ئەم حەیوان سەربڕینە کاتێك واجب ئەبێ کە سێ بەرد یا زیاتر لە حەوت بەردەکە فڕێ نەدا؛ کەواتە، فڕێ نەدانی بەردێك یا دوو بەرد، هیچ زیانی نییە.

کاتێك کە حاجی ویستی مەککە بەجێ بهێڵێ «طَواف الوِداع» (زیارەتی ماڵ‌ئاوایی) بکا بە دەوری کەعبەدا کە بریتییە لە حەوت جار سوورانەوە بەدەوریا بە دەس‌نوێژەوە و ئەبێ عەورەتیشی داپۆشیبێ؛ هەروا ئەبێ لەم تەوافەدا هەموو ئادابەکانی تەوافی فەرز بەجێ‌بێنێ جگە لە بەپەلە رۆیشتن و شێوەی دانانی خاولییەکەی سەرشانی؛ پاش ئەوە، دوعای خێر بکا بۆخۆی و بۆ هەموو موسوڵمانان و کە لێ‌بووەوە لە حەوشی بەیت دەرچێ. ئەم تەوافی ماڵ‌ئاواییە، واجبە؛ ئەگەر کەسێك نەیکرد؛ ئەبێ حەیوانێك سەرببڕێ؛ هەندێکیش لە زانایانی دین فەرموویانە: سوننەتە و تۆڵەی نییە، جا لەسەر ئەو فەرموودەیە کە ئەڵێ: واجبە، ئەگەر کەسێك تەرکی کرد و مەککەی بەجێ هێشت،

بەڵام پێش ئەوەی مەسافەی نوێژ کورت کردنەوە ببڕێ، گەڕایەوە و تەوافەکەی کرد، هیچی لەسەر نامێنێ؛ ئەگەر پاش لادان لەو مەسافەیە گەڕایەوە، تۆڵەکەی لەسەر لاناچێ؛ بەڵێ، ژنی خاوەن حەیز و زەیسان، ئەبێ بە بێ‌تەواف کردن مەککە بەجێ بهێڵن.

بزانن! دوعاکردن لەمەککەدا، لە پازدە شوێنا نزیکە لە قەبووڵەوە؛ لەکاتی تەوافدا، لە «مُلْتَزم»دا، لەژێر «میزابُ الرَّحمة»دا، لەناو کەعبەدا، بەسەر سەفا و بەسەر مەروەوە، لەکاتی راکردنی بەینی سەفا و مەروەدا، لەپشتی مەقامی ئیبراهیمەوە، لە عەرەفاتا، لە موزدەلیفەدا، لەکاتی هەر سێ جارەکەی رەجم کردنی شەیتانا؛ فەرقیشی نییە ئەوکەسە دوعاکە ئەکا خەریکی ئادابی حەج و عەمرە بێ، یا نە.

## زیارەتی ناوخانووی کەعبەی شەریفە

سوننەتە بۆ حاجی بڕواتە ناوخانووی کەعبەوە و بەئەدەب راوەستێ و دوو رکات نوێژی تیا بکا لە شوێنێ نوێژی حەزرەتداﷺ، بەمجۆرە کە لە دەرگا رۆیشتە ژوورەوە، هەروا روو بە دیواری بەرانبەری بڕوا تا نزیکی سێ گەزی ئەمێنێ بۆ دیوارەکە، جا لەویادا راوەستێ نوێژەکەی بکا بە نیازی سوننەتی حەزرەت کە لەویادا نوێژی کردووە، تا زۆرتریش بڕواتە کەعبەوە باشترە؛ ئەگەر رێ‌نەکەوت بڕواتە ماڵی کەعبەوە، بڕواتە «حِجْر إسماعیل»ەوە، چونکە ئەویش بەشێکە لە بەیت.

سوننەتە لە «ئاوی زەمزەم» بخواتەوە بۆ بەرەکەت و بە نیازی شیفای لە ئازار، بەتایبەتی لە نەخۆشی ئەخلاقی ناشیرین؛ هەروا، سوننەتە لە ئاوەکەی بهێنێتەوە بۆ ماڵی خۆی.

## زیارەتی مەرقەدی حەزرەتﷺ

سوننەتە پاش دەرچوون لە مەککە، بڕوا بۆ مەدینەی مونەووەرە بۆ زیارەتی مەرقەدی حەزرەتی فەخری عالەمﷺ. سوننەتە ئەوکەسەی بەنیازی زیارەت ئەڕوا بۆ

مەدینە، لە ڕێگەدا سەڵاوات زۆر بدا لەدیداری پێغەمبەرﷺ؛ لە پێش ئەوەشدا کە بگاتە مەدینە، خۆی بشوا و بەرگی پاك لەبەركا؛ کە گەیشتە مزگەوتی حەزرەت، ڕووبکاتە «رَوْضة» ـکە بەینی مەرقەدی موبارەك و مینبەرە ـ و دوو ركات نوێژی «تحيّةُ المسجد» بکا لە تەنیشتی مینبەرەوە، جا بێت بۆ نزیکی مەرقەدی موبارەك‌و ڕوو بکاتە سەری موبارەکی پێغەمبەر و پشت بکاتە قیبلە و ماوەی چوار گەز دوور ڕاوەستێ و بە ئەدەب، سەلام بکا و بڵێ: «السّلامُ عليك يا رسولَ اللّه» و بە ئارەزووی خۆی، لەویادا سەڵاوات بداو لە خوا بپاڕێتەوە بۆ خۆی و بۆ باقی موسوڵمانان، جا بگەڕێتە دواوە بۆ لای ڕاستی ئەوەندەی گەزێك و لەویادا سەلام بکا لە «حەزرەتی ئەبووبەکری سیددیق» ـخوای‌لێ‌ڕازی بێ ـ جا ئەوەندەی گەزێکی‌تر بێتە دواوە و سەلام بکا لە «حەزرەتی عومەر» ـخوای لێ ڕازی بێ ـ جا بگەڕێتەوە بۆ شوێنی یەکەمجاری و لە بەرەوڕووی حەزرەتدا ڕاوەستێ و لەویادا لەخوا بپاڕێتەوە، بڵێ: «خوایە! بۆ خاتری بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ و بۆ خاتری خۆشەویستی ئەو بە لای تۆوە، ڕەحمم پێ بفەرموو»؛ پاش ئەوە، ڕووبکاتە قیبلە و دوعای خێر بکا بۆخۆی و بۆ موسوڵمانانی‌تر.

زۆر مەقسەدە ئینسان ئاگای لەوەبێ کە مەسافەی ئەسڵی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ کامەیە، بۆ نوێژ تیا کردن. چونکە نوێژێك لەویا ئەوەندەی هەزار نوێژی ئەوبەشەی کە زیاد کراوە لەسەر مزگەوتە ئەسڵییەکە، خێری هەیە. پێویستە زیارەتکەر زۆر بەئەدەب بێ و پشت و سکی نەلکێنێ بە پەنجەرەی مەرقەدی پیرۆزەوە و لە دوورەوە ڕاوەستێ و لەو ماوەیەدا کە وا لە مەدینەی مونەووەرەدا، خێر زۆر بکا بە غەریبان و داماوانی ئەوێ و دڵیان عاجز نەکا و کە ویستی لە مەدینە دەرچێ، بڕوا خوا حافیزی بکا لە مزگەوت بە دوو ركات نوێژ، ئەوجا بێت بۆ لای مەرقەد و سەلامی تەقدیم بکا وەك ئەووەڵ جار و لە خوا بپاڕێتەوە بۆ ئەوە کە چەند جاری‌تریش بۆی ڕێ بکەوێ زیارەتی مەککە و مەدینە بکاتەوە.

سونئەتە لەو ماوەدا کە لە مەدینەیە، بڕوا زیارەتی قەبرستانی «جَنّةُ البَقيع»و زیارەتی قەبری ئەو ئەسحابە گەورانە بکا کە لەوێ دفن کراون و لای مەرقەدەکانیان لە خوا

بپارێتەوە بۆ خۆی و بۆ موسوڵمانان، لەبەرئەوە کە ئەو قەبرستانە شوێنی ئەهلی تاعەت و خوا پەرستییە و شوێنیوایش لە رەحمەتی خواوە نزیکە و لەوانەیە خـوا دوعـای ئینسانی تێدا قەبووڵ بکا.

سوننەتە ئینسان زیارەتی مزگەوتی «قُبا» بکا و بڕواتە سەر ئـەو بـیرە ئـاوانـە کـە حەزرەتﷺ چووەتە سەریان ـ بەتایبەتی بیری «أَریس» ـ و دەس‌نوێژیان لێ بگرێ و ئاویان لێ بخواتەوە. خوا بە لوتفی خۆی ئەم زیارەتانە بکا بە نسیبمان و ئەنجاممان خێر بکا و تەوفیقمان بدا و ئاخرمان بە چاکە بهێنێ.

## باسی مەنع کردنی حاجی و عەمرەکەر لە حەج و عەمرە و باسی فەوتانی حەج و عەمرە

هەرکەس مەنع کرا لە تەواو کردنی حەج یا عەمرە، بۆی دروستە ئـیحرامـەکـەی هەڵوەشێنێتەوە، خواه حاجی بێ یا عەمرەکەر بێ یا هەردووکیان پێکەوە بکا، چونکە کاتێك کە کافرەکانی مەککە مەنعی پێغەمبەرﷺ و ئەسحابەکانیان کرد لەوەکە بچنە ناو شاری مەککەوە و عەمرە بکەن، خوا، ئەم ئایەتەی نارد: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ، فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾، یەعنی: «ئەگەر مەنع کران لە تەواو کردنی عیبادەتەکـەتان، ئـەوە ئـەو حەیوانانە سەر ببڕن کە بەدیاری هێناوتانن لەگەڵ خۆتان»؛ بەڵێ، ئەگەر لە سوورەتی حەجا ئەیانزانی دوژمن دەرئەچێ و مەجالی حـەج کـردنیان ئـەبێ و لە سـوورەتی عەمرەدا ئەیانزانی دوژمن پێش سـێ رۆژ دوور ئـەکـەوێتـەوە، ئـەوە دروست نـییە ئیحرامەکەیان بشکێنن، چونکە قەزا کردنەوەی حەج و عەمرە ئـەرکی زۆرە و لەبـەر ناچاری نەبێ، دروست نییە.

هەڵوەشاندنەوەی ئیحرام دروست نییە بەهۆی نەخۆشییەوە مەگەر کابرا لە وەختی ئیحرام دابەستنەکەیدا بەشەرتی گرتبێ و وتبێتی: نییەتم هەیە ئیحرام دائـەبەستم بـۆ حەج یا بۆ عەمرە وە ئەگەر نەخۆش کەوتم، هەڵیئەوەشێنمەوە؛ لەم حاڵەدا، دروستە ئەگەر نەخۆش کەوت، ئیحرامەکەی تێك‌بدا. جا هەرکەس «تَحلُّل»ی کـرد، یـەعنی

ئیحرامەکەی تێكدا، واجبە لەسەری حەیوانێك سەرببڕێ لەو شوێنەدا کە مەنعی تیا کراوە لە تەواوکردنی حەج یا نەخۆش کەوتووە تیایا، خوا ئەو شوێنە ئەرزی حەرەم بێ یا نە؛ بەڵێ، ئەگەر ئەیتوانی بە ئاسانی حەیوانەکە رەوانە بکا بۆ مەککە، ئەوە سوننەتە رەوانەی بکا بۆ ئەوێ. ئەم ئیحرام تێکدانە، دێتەدی بە سەربڕینی حەیوانەکە لەگەڵ نییەتی کردنەوەی ئیحرامەکەیدا، هەروا دێتەدی بە سەرتاشین و موو کورت کردنەوە لەگەڵ نییەتی باس کراودا؛ ئەگەر بۆیشی رێنەکەوت حەیوان بکڕێ، بە قیمەتی ئەو حەیوانە قووت بکڕێ و بیدا بە هەژاران. ئەگەر دەستی بەسەر ئەمەیشا نەڕۆیشت لەجیاتی هەر مشتێك لەو قووتە رۆژێ بەڕۆژوو بێ، لە هەر وڵاتێکدا کە خۆی ئارەزووی لێیە؛ لەم سوورەتەدا، بۆی هەیە تەنها بە نییەت هێنان ئیحرامەکەی تێك‌بدا و لەپاش مانگێ بەڕۆژوو بێ.

دروستە بۆ مێردی ژن ئیحرامی ژنەکەی بکاتەوە لە حەجی یا عەمرەی سوننەت، ئەگەر لەکاتی ئیحرام‌دابەستنەکەدا ئیجازەی نەدابێ، هەروەها لە حەج و عەمرەی فەرزیشدا، ئەگەر ئیزنی نەدابێ، چونکە حەقی رابواردن و لەزەت وەرگرتنی پیاو فەورییە و حەج و عەمرەی فەرز لەسەر مۆڵەتە؛ بەڵێ، ئەگەر دوکتۆرێکی ئەمینی شارەزا وتی: ئەو ژنە ناتوانێ ساڵێکی‌تر حەج یا عەمرە بکا، ئەوە مێردەکەی حەقی ئەوەی نییە ئیحرامەکەی پێ‌هەڵوەشێنێتەوە؛ هەروەها مێرد حەقی ئیحرام تێکدانی بە ژنەکەی نییە ئەگەر خۆی ئیزنی ئیحرام دابەستنەکەی دابێ، یا ژنەکە بچووك بێ و بۆ ئەوە دەس‌نەدا مێردەکەی بچێتە لای، یا خۆی نەدابێ بەدەستەوە بۆ ئەوە مارەیی حازر وەربگرێ، یا کابرا خۆی لەگەڵ ژنەکەیدا ئیحرامی دابەستبێ...، هەروا لەگەڵێ سوورەتی‌تریشدا.

ئەو حەج و عەمرەیە کە بە زۆر مەنعی جێ‌بەجێ کردنیان بکرێ، قەزاکردنەوەیان واجب نییە، مەگەر لەسەر کەسێك کە پێشان لەئەستۆیدا بووبن یا کەسێ کە زووتر دەسەڵاتی بووبێ بیانکا و دوای خستبن، یا نەزری کردبن لەسەر خۆی؛ جا ئەگەر فەرزەکە فەرزی کۆن بوو، ئەوە لە ئەستۆیا ئەمێنێ و ئەبێ بیگێڕێتەوە. ئەگەر هەر ئەو ساڵە واجب بووبوو لەسەری، ئەبێ جارێکی‌تر توانای ببێ.

ئەگەر کەسێك راوەستانی عەرەفەی لە دەس دەرچوو، واجبە گورج ئیحرامەکەی بکاتەوە، چونکە راوەستانی عەرەفە گەورەترین پایەیەکی حەجە، کە لە دەستی دەرچوو و ئیحرامەکەی تێكنەدا، ئەبێ بە ئیحرام لە غەیری وەختی حەجدا؛ ئەم هەڵوەشاندنەوەی ئیحرامە، بە سێ شت ئەبێ؛

یەکەم، تەوافی ماڵی کەعبە؛

دووهەم، راکردنی بەینی سەفا و مەروە؛

سێهەم، سەرتاشین یا موو قرتاندن.

واجبە لەسەر ئەو کەسەی کە راوەستانی عەرەفەی لە دەس دەرچووە، حەیوانێك سەرببڕێ و حەجەکەش قەزا بکاتەوە، جا ئەگەر حەجە فەوتاوەکە سونەت بوو، ئەبێ دەس بەجێ قەزای بکاتەوە؛ ئەگەر فەرز بوو، ئەوە بەپێی وەزعی پێش حەجەکەیە، ئاخۆ بێمۆڵەتە یا مۆڵەتی هەیە؛ وەك وتمان، قەزای ئەم حەجە فەوتاوە، بەو شەرتە پێویستە کە بەزۆر مەنعی نەکرابێ لە وەستانی عەرەفە، لەم حاڵەدا قەزای لەسەر نییە، چونکە بە ئارەزووی خۆی تەرکی نەکردووە و حەجە ناتەواوەکە جێگای حەجێکی تەواوی بۆ ئەگرێتەوە.

بزانن! ئەم خوێنە کە لە مەسئەلەی فەوتانی وەستانی عەرەفەدایە، خوێنی تەرتیبە، وەك خوێنی «تمتّع» و «قِران»و تەرکی ئیحرام دابەستن لە میقاتدا و تەرکی رەجم کردنی شەیتان و تەرکی شەومانەوە لە موزدەلیفە و مینادا و تەرکی تەوافی ماڵاوایی لەسەر ئەوە کە بە واجبی دابنێین؛ یەعنی ئەگەر کابرا دەستی بڕوا، ئەبێ مەڕێك سەرببڕێ، ئەگەر دەستیشی نەڕوا، ئەبێ دە رۆژ بە رۆژوو بێ، سێ رۆژی لە خاکی مەککەدا، ئەگەر ئەو وەختە قابیلی رۆژوو تیا گرتن بێ، بەوڕەنگە کە کابرا لەپاش «أيّام التّشريق» لە مەککەدا بمێنێتەوە و حەوت رۆژیشی لەپاش گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی؛ ئەگەر لەوێ بۆی رێنەکەوت، هەموو دە رۆژەکە لە وڵاتی خۆیدا بەڕۆژوو بێ.

## باسی قوربانی

قوربانی کردن، سوننەتە بۆ هەموو موسوڵمانێکی باڵغ و عاقڵ و خاوەن روشد و ماڵدار کە ئەو حەیوانی قوربانییە زیاد بێ لە مەسرەفی خۆی و ئەوانەی کە مەسرەفیان لەسەریەتی بۆ شەو و رۆژی جەژن و سێ رۆژەکەی پاش جەژن و زیاد بێ لە پۆشاکی ئەو وەرزەی کە قوربانییەکەی تیا ئەکرێ.

قوربانیکەر، ئەگەر تەنها بوو، ئەوە قوربانییەکەی سوننەتی عەینە؛ ئەگەر خاوەن خێزانیش بوو، ئەوە سوننەتی کیفایەیە؛ کەواتە، ئەگەر کەسێکی خاوەن خێزان قوربانی کرد، ئیتر داوای قوربانی لەوان ناکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە خێرەکەی هەر بۆ خۆیەتی، مەگەر نیازی ببێ ئەوانیش بکا بە شەریك لەخێرەکەیدا؛ هەرکامیش لە ئەندامانی ئەو خێزانە قوربانی بۆ خۆی بکا، دروستە.

قوربانی، لە مەزهەبی ئێمەدا سوننەتە و واجب نابێ، مەگەر بەوە کە کابرا بە دەم پێویستی بکا لەسەر خۆی، وەك ئەوە کە بڵێت: «لەسەرم بێ ئەم حەیوانەبکەم بە قوربانی» یا: «لەسەرم بێ حەیوانێك بکەم بەقوربانی»، یا: «ئەم حەیوانە قوربانییە» و مەبەستی واجب کردنی بێت. نەك هەر خەبەر بدا لە نیازی دڵی و بڵێ: ئەمەوێ ئەم حەیوانە بکەم بە قوربانی، قوربانی بەوجۆرە واجب نابێ لەسەر ئینسان، هەروا بەوەش واجب نابێ کە بە دڵ فەرزی بکا لەسەر خۆی.

هەر حەیوانێ کە واجب کرابێ بکرێ بە قوربانی، تەسەڕوف تیاکردنی دروست نییە بە فرۆشتن و بەخشین و گۆڕینەوە. سوننەتە بۆ ئەو کەسەی ئەیەوێ قوربانی بکا، لە دە رۆژەی مانگی قوربانا تا قوربانییەکە ئەکا، مووی سەر و سمێڵ وریش و ئەندامانی تری لەشی لانەبا و نینۆك نەکا؛ مەبەست لەمە ئەوەیە رەحمەتی خوا بگا بە هەموو لەشیا.

کاتی سەربڕینی قوربانی، دەست پێ ئەکا بە هەتاوکەوتنی رۆژی جەژن و تێپەڕبوونی ماوەی دوو رکات نوێژ و دوو خوتبە [و] ئەشمێنێتەوە تا رۆژ ئاوابوونی رۆژی سێهەمی «أيّام التّشريق»، کە تێکڕا ئەکاتە چوار رۆژ: رۆژی جەژن و سێ رۆژی

پاش جەژن. سوننەتیشە ئەگەر بزانێ و بتوانێ، خۆی حەیوانەکە سەرببڕێ، ئەگینا بیداتە دەستی وەکیل و خۆی حازر بێ لەسەری؛ جا ئەگەر قوربانییەکەی سوننەت بوو و خۆی سەری‌بڕی، واجبە لەکاتی سەر بڕینەکەیا نییەتی قوربانی لێ بهێنێ؛ ئەگەر وەکیل سەری بڕی، ئەبێ خاوەن ماڵەکە لەوکاتەداکە ئەیدا بە وەکیلەکە، یا لەوکاتەداکە وەکیلەکەی سەری ئەبڕێ، نییەت بهێنێ؛ هەروەها، بۆیشی دروستە نییەتەکە بداتە دەستی وەکیلەکە و ئەو نییەت بهێنێ، ئەگەر منداڵی بێ تەمیز و شێت و سەرخۆش نەبێ. ئەگەر قوربانییەکە واجب بوو، یەعنی وەختی خۆی حەیوانێکی دیاری نەزر کردبوو سەری‌ببڕێ بۆ قوربانی، یاخود حەیوانێکی نامەعلوومی نەزر کردبوو، بەڵام لەپاشا مەعلوومی کردبوو، یا بە دەست جیای کردبووەوە، ئەوە لەوەختی سەربڕیندا، نییەتی قوربانی سوننەتە و واجب نییە، لەبەر قەناعەت بەوەکە زوو نەزری کردووە و جیای کردووەتەوە یا دیاری کردووە؛ بە هەر حاڵ، سوننەتە لەکاتی سەربڕینی حەیوانەکەدا، «بسم اللّه» بکا و بیربکاتەوە لەگەورەیی خواکە ئەم عیبادەتەی داناوە.

ئەو حەیوانەی بۆ قوربانی دەس ئەدا، وشترە وگایە و بزنە و مەڕە؛ وشتری قوربانی، ئەبێ پێنج ساڵی تەواو کردبێ و کەوتبێتە ساڵی شەشەمەوە؛ گا و بزنیش ئەبێ دوو ساڵیان تەواو کردبێ و کەوتبنە ساڵی سێهەمەوە؛ مەڕیش ئەبێ ساڵێکی تەواو کردبێ و کەوتبێتە ساڵی دووهەمەوە، یاخود بەر لە تەواوبوونی ساڵی، دانی کەوتبێ؛ فەرقی نییە لە حەیوانی قوربانیدا نێر بێ یا مێ، خەسراو بێ یا نە.

وشتر وگا بۆ حەوت کەس بەکار دێن، خواه هەموو بەشەکان قوربانی بن، یاخود بەعزێکیان قوربانی و ئەو بەعزەکەیان کەفارەت و فیدیەی حەج بێ یا دیاریی مەککە (هَدي) بێ یا حەوتم بێ؛کەواتە، ئەگەر بە حەوت کەس گایەکیان کڕی و بەشێکیان دانا بۆ قوربانی و بەشێکی بۆ دیاریی مەککەو بەشێکی بۆ فیدیەی «تـمتّع» لە حەجدا و بەشێکی بۆ فیدیەی تەرکی ئیحرام دابەستن لە میقاتدا و بەشێکی بۆ فیدیەی سەرتاشین و بەشێکی بۆ حەوتم و وەکیلێك لەجیاتی هەموویان بەم نییەتانە سەری‌بڕی، ئەوە دروستە.

مەڕ و بزن بۆ یەك كەس بەكاردێن. حەیوانی بەحەسەناتتر بۆ سەربڕین، وشترە، جا گا، جا مەڕ، جا بزن؛ بەڵێ، حەوت مەڕ، خێری زۆرترە لە وشترێك و مەڕێك، خێری زۆرترە لە بەشێكی گایەك یا وشترێك. شەرتی ئەم حەیوانانە، ئەوەیە عەیبی وایان پێوەنەبێ كە گۆشتیان كەم بكاتەوە؛ كەواتە، دروست نییە سەربڕینی حەیوانی كوێر: یا یەك چاو، یا شەلێكی دیاری، یا لەڕ و لاواز، یا نەخۆش، یا گەڕۆڵ، یا شێت، یا حەیوانێك كە پارچەیەكی گوێچكەی، یا دووگی، یا رانی بڕابێ، یا حەیوانێك كە برین بە لەشیەوە بێ، یا بالووكەیەیك زۆری دەركردبێ؛ ئەم حەیوانانە، بۆ قوربانی دەس نادەن.

دروستە سەربڕینی حەیوانی كۆڵ و شاخ شكاو، ئەگەر زەرەری لە گۆشتی نەدابێ، یا حەیوانێ كە دانی شكابێ یا دانی كەوتبێ، مەگەر دانی ئەوەندە كەوتبێ كە لەوەڕو ژیانی زەرەری پێ گەیشتبێ؛ هەروەها، زەرەری نییە قڵەشانی گوێچكە و كون بوونی، ئەگەر گۆشتی لانەبردبێ و بڕینی كەمێك لە ئەترافی دووگی، وەكوو عادەتە بۆ ئەوە كە دووگەكەی زل ببێ، یا كەمێك لە رانی بەو شەرتە زۆر كەم بێ؛ هەروەها، عەیبی نییە ئەگەر حەیوانەكە بە بێ گوان یا بە بێ كلك لەدایك بووبێ، یا مەڕێ كە هەر لە ئەساسا دووگی نەبووبێ. حەیوانی ئاوس بۆ قوربانی ناشێ، بەڵام لای «ابو مَخرمة» و «سَمْهودي» و هەندێكی تر، دروستە بەو شەرتە بەو ئاوس بوونە لاواز نەبووبێ؛ تەقلیدی ئەمانەش دروستە. ئەگەر حەیوانێكی نەزر كردبوو بۆ قوربانی، واجبە لەسەری لە وەختی قوربانی كردنا سەری ببڕێ؛ ئەگەر لەپێش داهاتنی ئەو وەختەدا حەیوانەكە فەوتا، هیچ واجب نابێ لەسەری، بەڵام ئەگەر خۆی فەوتاندی، یاخود لە پاش داهاتنی وەخت و توانای سەربڕین فەوتا، ئەوە واجبە بە قیمەتەكەی حەیوانێك بكڕێ وەك ئەو حەیوانە و لە وەختا سەری ببڕێ. ئەگەر واجبە كە واجبی «ذِمّة» بوو و لەپاشا دیاریی كرد و لە پێش وەختا فەوتا، ئەوە ئەسڵی واجبەكەی لەسەر ئەمێنێ و فەرزە لەسەری حەیوانێكی وەك ئەو حەیوانە بكڕێ كە نەزری كردووە و لەوەختا سەری ببڕێ. ئەگەر كەسێك حەیوانێكی عەیبداری فەرز كردبوو بۆ سەربڕین بۆ

قوربانی، ئەوە واجبە لە وەختی قوربانیدا سەری ببڕێ و گۆشتەکەی بدا بە خەڵك، کە لەگەڵ ئەوەش [دا] لەجیاتی قوربانی دانانیشێ، چونکە قوربانی ئەبێ بێعەیب بێ؛ ئەگەر ئەم حەیوانە عەیبدارە بەر لە داهاتنی وەخت فەوتا، ئەوە هیچی لەسەر نییە؛ ئەگەر لەپاش هاتنی وەختەکەی و توانای سەربڕینی، فەوتا، واجبە قیمەتەکەی بدا بە حەیوانێك و سەری ببڕێ؛ جا ئەگەر بێعەیب بوو، ئەوە بۆ قوربانیش باشە، ئەگینا هەر واجبە گۆشتەکەی بدا بە فەقیران.

هەر قوربانییەك کە سوننەت بێ، دروستە خاوەنەکەی تا دووبەشی -بەڵکوو زیاتریشی- لێ بخوا، بەڵام باشتر ئەوەیە هەمووی بکا بە خێر، چەند پارووییەکی نەبێ بۆ بەرەکەت بیخوات، هەروا پێستەکەشی بەخێر بدا بە فەقیر، دروستە خۆیشی بیکا بە شتێك سوودی لێ وەربگرێ؛ دروستە لە گۆشتی قوربانی سوننەت بدا بە پیاوی دەوڵەمەندیش بەڵام دروست نییە لێی بفرۆشێ؛ هەروەها، دروست نییە پێستی قوربانییەکە بدا بەکرێی سەربڕینیا یا بیفرۆشێ بە یەکێك. هەر قوربانییەك کە واجب بێ، دروست نییە نەخۆی و نەیەکێ کە نەفەقەی لەسەریەتی، لێیبخۆن، دروست نییە بەشی دەوڵەمەندیشی لێ بدا، بەڵکوو ئەبێ بیدا بەو فەقیر و مسکێنانە کە زەکاتیان پێئەشێ؛ بەڵێ، بەچکەی قوربانی واجب، دروستە خۆی هەموو گۆشتەکەی بخوا، هەروەها دروستە شیر و ڕۆنی دایکەکەشی بخوا تا ئەو ساتە کە سەری ئەبڕێ.

دروست نییە یەکێ لە ماڵی خۆی قوربانی بکا بۆ کەسێکی زیندوو، با بە ئیجازەی ئەو کەسەش بێ، بەڵام دروستە بە وەکالەت قوربانی بۆ بکا بە ئیجازەی ئەو کەسە و لە ماڵی ئەو کەسە؛ هەروەها، دروستە کەسێك لە ماڵیخۆی قوربانی بکا بۆ خۆی و خەڵکیش بکا بە شەریکی خێرەکەی، وەك دروستە باوك قوربانی بکا و منداڵەکانی یا ژنەکەی بکا بە شەریکی خێری. دروست نییە قوربانی کردن بۆ مردوو بێئەوەی کە خۆی وەسیەتی کردبێ؛ بەڵێ، ئەگەر وەسیەتی کردبوو بۆ قوربانی و ماڵی هەبوو، واجبە لە ماڵی ئەو مردووە قوربانی بۆ بکرێ؛ ئەگەر ماڵی نەبوو، یا ماڵی بوو، بەڵام کەسێك ویستی لە ماڵی خۆی قوربانی بۆ بکا، ئەوە دروستە چونکە وەسیەتی کردووە؛ لەم

سوورەتەداکە ئەوکەسە لە ماڵی خۆی قوربانی کرد بۆ مردووەکە، دروست نییە خۆی لە گۆشتی قوربانییەکە بخوا، یا بیدا بە دەوڵەمەند و بەو کەسانە کە نەفەقەیان لەسەر ئەم قوربانی کەرەیە. هەندێ لە عالمانی دین، لایانوایە قوربانی کردن بۆ مردوو دروستە، با خۆیشی وەسیەتی نەکردبێ؛ دروستە ئینسان بەپێی ئەم فەرموودەیە بجووڵێتەوە. هیچ شوبهە نییە لەوەدا کە دروستە ئینسان قوربانی بکا بۆ خۆی و هەموو موسوڵمانانی زیندوو و مردوو لە خێرەکەیدا بکا بە شەریك. هەر لەسەر ئەساسی قوربانی کردن بۆ مردوو بووە ئیمام «موحەممەدی کوڕی ئیسحاق»، مامۆستای «شێخی بوخاری» ـ خوایان لێ رازیٚ بێ ـ قوربانییەکی زۆری کردووە بۆ پێغەمبەرﷺ و خەتمی قورئانیشی بۆ کردووە؛ هەروەها؛ عالمانی پێشوو گەلێ قوربانی و خەتمی قورئان و حەسەناتیان کردووە بۆ مردووی خۆیان و بۆ ئال و ئەسحابەی پێغەمبەر و موسوڵمانی مردوو؛ هیوا وایە ئەمانە هەموو قەبووڵ بن، چونکە خوا لە پێغەمبەران ئەگێڕێتەوە کە داوای لێبوردنی گوناهی خۆیان و باوك و دایکیان و باقی موسوڵمانانیان کردووە لە خوای تەعالا؛ هەروەها خوا تەعریفی ئەو موسوڵمانانە ئەکا کە دوعای عەفوی گوناه ئەکەن بۆ برا مردووەکانیان؛ ئەمە، هەموو لەبابەتی رەحم و فەزڵی خودایە و ئایەتی: ﴿وَ أَنْ لَيْسَ لِلإِنْسانِ إلاَّ ما سَعى﴾، باسی ئیستیحقاقی شەرعی ئینسان ئەکا لەسەر ئوسووڵی عەداڵەت. خوای گەورە بە عەداڵەت لە گەڵمان نەجووڵێتەوە، بەڵکوو بە چاوی فەزڵ و رەحمەتی خۆی تەماشامان بکا.

## باسی ئەو حەیوان و باڵدارانەی گۆشتیان ئەخورێ

هەر حەیوانێ لەئاوا بژی، وەکوو ماسی، گۆشتی حەڵاڵە و سەربڕینی ناوێ، خوا لەسەر سوورەتی ماسی بێ یا نە و زیندوو بێ یا مردوو، هەر بەو شەرتە کە بۆ گەنی نەکردبێ. هەر حەیوانێکیش کە هەر لە وشکیدا بژی، یا لە وشکی و لە ئاویشا بژی، ئەوە یەکێکە لەم شەش جۆرە:

یەکەم: ئەوەی فەرمان دراوە بە کوشتنی، وەك دووپشك و مار و قەلەباچکە و کۆلارە، بە هەموو سینفێکیانەوە؛ ئەمانە، حەرامن و گۆشتیان ناخورێ.

دووهەم: هەر گیانلەبەرێ کە بە قسەی دوکتۆری باوەڕپێ کراو زەهری بێ، ئەوانەش حەرامن و گۆشتیان ناخورێ.

سێهەم: هەرچی وردە جانەوەری زەوییە، وەك قۆلانچە و پەپوولە و مێروولە و گڵخۆرکە و کرم و تەتەڵەمیران و زەردەواڵە و هەنگ‌مێش؛ ئەمانەش، هەموو سینفێکیان حەرامن.

چوارەم: هەرچی دان قولاپ (کەڵبە)ی بێ و هێزی شکاندنی نەچیری بێ، وەك شێر و بەور و پڵەنگ و بەراز و گورگ و سەگ و چەقەڵ و پشیلە؛ ئەمانەش، هەموویان بە هەر رەنگێ بن، حەرامن و گۆشتیان ناخورێ؛ هەروەها ورچ و مەیموون و کەرگەدەنگ و وێنەی ئەمانە.

پێنجەم: هەر باڵدارێ کە چنگی تیژ و نینۆکی قولاپی و دەنووکی لاری بێ و راوی پەلەوەر بکا، وەك باز و شاهێن و هەڵۆ؛ ئەمانەش، حەرامن.

شەشەم: هەر حەیوانێ کە بەعادەت بۆ سواری بەکاری بهێنن، وەك هێستر و کەر و فیل و دووڕەگی ئەمانە؛ ئەمانەش، هەموو حەرامن و تەنها وشتر و ئەسپ و ماینیان لێ جوێ کراوەتەوە.

حەیوان و باڵداری حەڵاڵ، ئەوانەن کە لە قورئان و حەدیسا وترابێ، گۆشتیان حەڵاڵە، یا عالمانی دین بە قیاس لەسەر حەیوان و باڵداری حەڵاڵ وتبێتیان حەڵاڵە و

گۆشتی ئەخورێ، وەك وشتر و گا و بزن و مەڕ چ ماڵی و چ کێوی، هەروەها، کەمتیار و کەرەکێوی و ئاسك و کەروێشك و ڕێوی و دەڵەك و چالەکە و سمۆرە و ژیژك و کەڵەشێر و مریشك و عەلیشیش و قاز و قوڵەنگ و سۆنە و مراوی‌و پۆڕ و کەو و مێشەسی و ماسی گرە و هەرچی چینە بکا، وەك کۆتر و قومری و بیبی‌سوو، بە هەموو جۆرەکانیانەوە و چۆلەکە بە هەموو تەرحێکیەوە و سووچەڕ و قەلەڕەشەی ناو کشت‌و کاڵ و ڕیشۆڵە و عەینەمەل؛ ئەمانە، هەموو حەڵاڵن.

هەر حەیوانێك و هەر باڵدارێك کە لە ئایەت و حەدیسا ناوی نەهاتبێ و زانایانی دینیش باسیان نەکردبێ، حوکمی وەك ئەو حەیوان و باڵداره وایەکە لە وێنەی خۆی بێ و ناوی هاتبێ یا باسی کرابێ؛ ئەگەر وێنەشی نەبوو، ئەوە ئەگەر کەسانی تەبیعەت بەرز و دەس ڕۆیشتوو بە باشیان ئەزانی، حەڵاڵە، ئەگینا حەرامە. هەر حەیوانێك و هەر باڵدارێك کە پەیدا ببێ لە دووجۆر، یەکێکیان گۆشتی بخورێ و ئەویان گۆشتی نەخورێ، ئەویش هەر حەرامە. مردارەوەبوو حەرامە، کوللە و ماسی نەبێ؛ هەروەها هەر پارچەیەك کە لە حەیوانێکی زیندووی حەڵاڵ جیا کرابێتەوە، حەرامە. هەموو خوێنێکیش حەرامە، مەگەر لەبەر ناچاری وەك دەرمان، یا ترسی گیان دەرچوون.

## شەرتی حەیوان سەربڕ و چۆنیەتی حەیوان سەربڕین

شەرتی حەیوان سەربڕ ئەوەیە موسوڵمان بێ، یا لەو کیتابییانە بێ کە ژن لێ‌خواستنیان حەڵاڵە، وەك جوولەکە و گاور، بەو شەرتانە کە بەیان کراون؛ عالمە گەورەکان، فەرموویانە: جوولەکە و گاوری ئەم زەمانە، ئەو شەرتانەیان تیا نییە و خواردنی گۆشتی سەربڕاوی دەستی ئەوان، حەڵاڵ نییە؛ کەواتە، حەرامە خواردنی گۆشتی حەیوانێ کە بت‌پەرست و حەیوان پەرست و ئاگرپەرست و کەسێکی لە دین هەڵگەڕاو سەریان بڕیبێ.

لە موسوڵمانانا، دروستە منداڵ و شێت و سەرخۆش و ژن حەیوان سەرببڕن، بەڵام کەراهەتی هەیە کوێر سەری ببڕێ.

حەیوانی حەڵاڵ، دوو بەشە؛ یەکەم: ئەوەیە لە بەردەستا بێ؛ دووهەم: ئەوەیە لە بەردەستا نەبێ، وەك حەیوانێ کە کەوتبێتە بیرەوە، یا رای کردبێتە جێگەیەك کە دەستی ئینسانی پێ نەگا؛ سەربڕینی بەشی یەکەم، بەوە ئەبێ بە شتێکی تیژ، غەیری نینۆك و ددان، خواه چەقۆ بێ یا پارچە شووشەیەك یابەردێکی تیژ یا قامیش و شتیوا، هەموو قورقوراچکەی کە هەناسەی پیا دێت و ئەچێ و هەموو سووریچکەی کە ئاو و خواردەمەنی پیا دێت و ئەچێ، ببڕرێن؛ ئەگەر یەکێك لەم دوو شوێنە بەتەواوی نەبڕرا، ئەوە حەیوانەکە مردار بووەتەوە؛ بەڵێ، هەندێ لە عالمانی دین فەرموویانە: ئەو گرێ خڕەش کە لە نزیکی بنیزمانەوەیە، بەشێکە لە قورقوراچکە وە ئەگەر حەیوان لەویایشا سەرببڕرێ هەر دروستە، وەك لە «تُحفة»دا بەیان کراوە. شەرتی ئەو حەیوانە کە سەر ئەبڕرێ، ئەوەیە لەکاتی سەربڕینا گیانی تیابێ؛ جا ئەگەر حەیوانەکە نەخۆش بوو، هەر ئەوەندە پێویستە کە گیانی تیابێ، ئەگەر ساغیش بوو، ئەبێ گیانێکی جێ گرتووی تیابێ کە نیشانەکەی ئەوەیە جموجووڵ و پەلەپەلێکی بەهێزی ببێ، یا خوێنی بازرەقە ببەستێ، یا لە کاتی سەربڕینیا دەنگ لە قورگیەوە بێت و خوێنەکەی بەعادەتی بێت و بڕوات؛ کەواتە، دروستە سەربڕینی حەیوانێك کە گورگ سکی دڕیبێ، هەرچەند ریخۆڵەشی دەرهاتبێ و لەوانەبێ لەپاش چەند دەقیقەیەکی تر بمرێ. دروستە لەکاتی سەربڕینا چەقۆ لەسەر ملی حەیوانەکە لابەیت و گورج بیخەیتەوە سەری، بەڵام ئەگەر دەستی لە سەربڕین هەڵگرت تا حەیوانەکە سارد بووەوە، ئەوجا چەقۆکەی نایەوە لە ملی و قورگی بڕی، ئەوە حەرامە.

سوننەتە لەکاتی سەربڕینا، گاو مەڕ و بزن راکێشرێن رووەو قیبلە بەسەر لای چەپدا و پێی راستیان بەرەڵڵا بکرێ؛ هەروەها، سوننەتە ئەو کەسە کە حەیوانەکە سەرئەبڕێ، چەقۆکەی تیژ بکا و پیشانی حەیوانەکەی نەدا و لەکاتی سەربڕینا، «بسم اللّٰه الرّحمن الرّحیم» بکا. ئەگەر وشتری سەربڕی لە خوار قورقوراچکەیەوە چەقۆی لێ بنێ؛ بۆ گاو مەڕ و بزنیش، لەسەر قورقوراچکەیان دایبنێ؛ بەڵێ، باش وایە کەمێك بەلای لاشەکەیانەوە بێ، بۆ ئەوە کە باش سەر ببڕرێن؛ هەروەها، بۆ مریشك و پەلەوەر،

سوننەتە زمانیان دەرکێشێ و بیخاتە بەر دەنووکیان، بۆ ئەوەی زمانیان نەگەڕێتەوە دواوە و قورقوڕاچکەیان دانەپەڕێ، کە ئەوەش ئەبێ بەهۆی مرداربوونەوەیان؛ کەواتە، هەر حەیوانێك بە شەڕەقۆچ یا بە هەڵدێران یا بە کەوتنە ناوچاڵ مرد، یا بەردێکی زلی پیا درا و مرد، ئەوە مردار بووەتەوە و خواردنی حەرامە؛ هەروەها، هەر پەلەوەرێك کە ملی هەڵبکێشرێ.

بەشی دووهەم ـکە ئەوەیە لەبەردەستا نەبێ ـ ئەوە، لەجیاتی سەربڕینی، ئەوەندە بەسە بریندار بکرێ بە شتێکی تیژیواکە ئەندامی ببڕێ، خوا لەعاستی قوڕگیا بێ یا لە شوێنێکی تریا؛ کە لەپاش ئەم بریندارکردنە مرد، وەك حەیوانی سەربڕاو وایە وگۆشتی حەڵاڵە، لەبەرئەوە کە لەوە زیاتر مەیدان و مەجال نییە. هەر لە حوکمی سەربڕین دایە ئەمەکە: کەسێك بازێك یا سەگێکی تەعلیم دراوی ببێ و بینێرێتە سەر نەچیرێکی وەك بزنەکێوی وکەروێشك وکۆتر و شتیوا و بیگرێ، بەو شەرتەکە ئەوەندە مەشقی کردبێ بە قسەی خاوەنەکەی بڕوا و بگەڕێتەوە و بوەستێ و ئینسان لەو باوەڕەدا بێ کە هەرگیز لە فەرمانی خاوەنەکەی دەرناچی، کە نەچیرەکەشی گرت، هیچی لێ نەخوا تا ئەیگەیەنێتە بەردەستی کابرای ڕاوچی یا ئەو پێی ئەگات؛ جا ئەگەر ڕاوچییەکە بەزیندوویی پیاگەیشت، ئەبێ سەری ببڕێ، ئەگیناگرتنەکەی لە جێی سەربڕینەکەیەتی و خواردنی حەڵاڵە؛ ئەوەندە هەیە ئەگەر بە سەگ گیرابوو، ئەبێ جێگەدەمی سەگەکە گڵاو بکرێ.

حەرامە؛ ڕاوکردن بە تفەنگ و گوللە، چونکە حەیوانەکە ئەسووتێنێ و زیاتر وایە تا کابرای ڕاوچی پێی ئەگا، گیانی دەرئەچێ؛ هەروەها، عەزابدانی گیانلەبەر بە ئاگر دروست نییە؛ هەر نەچیرێك بە زەبری گوللە مردبێ، خواردنی حەرامە، هەرچەند نووکی گوللەکەیش تیژ بێ، چونکە تەنها بە تیژیی گوللەکە نەمردووە، بەڵکوو هێزی ئاگرەکەشی لەگەڵە، بە دەلیلی ئەوەکە ئەگەر زمەیەکی تیژ بکەی بە سەردڵی حەیوانێکا یا بە سەریا، ئەوەندە زوو نامرێ کە بە گوللە ئەمرێ؛ بەڵام ئەگەر ئەو نەچیرەی کە بە گوللە ڕاوکراوە، نەمرد تا ڕاوچییەکە گەیشتە سەری و سەری بڕی، ئەوە خواردنی حەڵاڵە.

**بزانن!** هەرچی بە تاقی کردنەوە یا بە قسەی دوو دوکتۆری باوەڕ پێ کراو زیانی بێ بۆ لەشی ئینسان، ئەوە خواردنی حەرامە، وەك گڵ و خۆڵەمێش و دار و بەرد و گژوگیای زیانبەخش؛ هەروەها، حەرامە خواردنی هەرچی کە ئینسان گێژ و سەرخۆش بکا، وەك بەنگ و تریاك و هەموو جۆرە عەرەقێك،...، ئەوانەیان کە تەڕ بن، پیسیشن. هەرچی کە زیانی بۆ دین و گیان و ناموس وعەقڵ و ماڵ بێ، حەرامە.

## هەندێ بابەتی جیاجیا لەبارەی منداڵەوە

منداڵ کە لەدایك بوو، سوننەتە پاش ئەوەی کە پێچرایەوە، بانگ بدرێ بە گوێی راستیا و قامەت بخوێنرێ بە گوێی چەپیا و سوورەتی «قل هُو اللّه» و ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ و ئایەتی ﴿إِنّي أُعيذُها بِكَ و ذُرِّيَّتَها مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيم﴾ بەسەریا بخوێنرێتەوە، خواه نێر بێ یا مێ، بەخورمایش یا بەشیرینییەکی تر مەلاشووی شیرین بکرێ؛ لە رۆژی حەوتەمی لەدایك بوونیشیا، مووی سەری بتاشرێ و بکێشرێ بە ئاڵتوون یا بە زیودا و ئەو ئاڵتوونە یا ئەو زیوە بدرێ بە فەقیر و هەژار و لەپاشا ناوێکی باشی لێ بنرێ؛ گەورەترین ناو، ئەوەیە باسی بەندەیی خوای تیابێ، وەکوو «عبداللّه، عبدالرّحمن، عبدالقادر»، یا حەمد و سەنای تیا بێ، وەك «محمد، احمد، محمود»؛ هەر لەم رۆژی حەوتەمەیدا، «عَقیقة» (حەوتمی) بۆ بکرێ؛ حەوتم، بریتییە لە دوو مەڕ یا مەڕێك یا بزنێك کە لە ئاداب و شەرتا وەك حەیوانی قوربانی وابێ؛ هەروەها، دروستە بە حەوت یەکی وشترێك یا گایەك حەوتمی بۆبکرێ؛ سوننەتە ئەم حەیوانی حەوتمە بە کوڵاوی بدرێ بە خەڵك و لەکاتی کوڵاندنەکەیا شیرینی تێکەڵ بکەن و ئێسقانەکانی نەشکێنن؛ رانێکیش لەو حەیوانی حەوتمە بدرێ بەو ژنە یا ئەو ژنانە کە مامانیی منداڵەکەیان کردووە؛ وەختی دروست بوونی ئەم حەوتمە؛ لە رۆژی لەدایك بوونیەوەیەتی تا کاتی باڵغ بوونی؛ تا ئەو وەختە حەوتم لەسەر باوکە، ئەگەر ئەو دەستی نەڕۆیشت، لەسەر دایکە، بەو شەرتە کە دەستی بڕوا.

ئەگەر منداڵێك حەوتمی بۆ نەکرا و مرد، سوننەتە کە نافەوتێ و لەپاش مردنیش هەر سوننەتە بۆی بکەن، چونکە بەیانی سەبر شوکری خوای تیایە کە لەپاش مردنیش ئەو

خێرە نافەوتێنن؛ لە حەدیسی پیرۆزا هەیە: «هەر منالێ حەوتمی بۆ بکرێ، لە رۆژی قیامەتا تکا ئەکا بۆ باوك و دایکی و ئاویان بۆ ئەهێنێ»؛ دروستە خاوەن ماڵ و منال و میوان، لەم گۆشتی حەوتمە بخۆن، وەك لە قوربانی سونەت ئەخۆن.

ئەگەر منالەکە لەتوانایا بوو، سوننەتە لە رۆژی حەوتەمی پاش لەدایك بوونیا خەتەنەی بکەن؛ ئەگەر لاواز و بێ تاقەتیش بوو، ئەبێ دوای بخەن تا خۆی ئەگرێ. خەتەنەکردنی نێرینە واجبە و ئەبێ ئەو چەرمەی کە وەك بەرگ وایە بەسەر زەکەریەوە، ببڕن؛ هەروەها، خەتەنەکردنی مێیینەش واجبە و ئەبێ ئەو گۆشتە زیادەیەی کە بەم‌بەر و ئەوبەری فەرجیەوە بەرزەبووەتەوە ببڕن؛ هەندێ لە زانایانی ئایینی، فەرموویانە: خەتەنەکردنی ئافرەت سوننەتە. خەتەنەکردن، پەیڕەوێکە لە دینی حەزرەتی ئیبراهیمەوە بە جێ‌ماوە و ئیسلامیش لەسەری رۆیشتووە و یەکێکە لەو دە رەوشتەی کە حەزرەتی ئیبراهیم دایناون؛ ئەو رەوشتەکانی تریش، ئەمانەن: لادانی مووی سەر بەم‌لاو بەولادا، قرتاندنی مووی سمێڵ، سیواك کردن، ئاو رادن لە دەم و لووت، نینۆك کردن، لابردنی مووی بەر و بن‌باڵ، خۆ پاك کردنەوە لە پیسی.

## ـ لەبارەی دەعوەت کردنەوە

سوننەتە چێشت لێ‌نان و بانگ کردنی موسوڵمانان لە چەند حاڵەتا:

**یەکەم:** لەدایك بوونی منال؛

**دووهەم:** حەوتە بەسەرچوونی؛

**سێهەم:** خەتەنەکردنی کوڕ، بەڵام بۆ خەتەنەکردنی کچ تەنها دەعوەت کردنی ژنان سوننەتە؛

**چوارەم:** تەواوکردنی خوێندنی قورئانی پیرۆز یا کتێبی دین؛

**پێنجەم:** هاتنەوە لە سەفەری دوور؛

**شەشەم:** ژن مارە کردن و بەشوودان؛

**حەوتەم:** گواستنەوەی ژن؛

**هەشتەم:** تەواو کردنی کردنەوەی خانوو؛

**نۆهەم:** لەبەر دۆستایەتی، یا بۆ ڕەزامەندیی خوای تەعالا.

هەرکەس بانگکرا بۆ نان خواردن لە یەکێ لەم موناسەبەتانەدا، سوننەتە بڕوا، تەنها لە مەسەلەی ژنگواستنەوەدا نەبێ کە واجبە، بە چەند شەرت؛

**یەکەم:** بانگکەر و بانگکراو موسوڵمان بن؛ ئەگەر بانگکەرەکە کافر بێ، یا بانگ کراوەکان کافریان تیا بێ، ئەوە بۆ بانگ کراوی موسوڵمان نە واجبە و نەسوننەتە بڕوا بۆسەر ئەو دەعوەتە، هەرچەند دروستە ـ بەڵکوو سوننەتە ـ موسوڵمان دەعوەتی کافری «ئەهلی زیممە» بکا، ئەگەر ئومێدی ئەوەی ببێ کە موسوڵمان ببێ یاخود دراوسێی بێ، یا خزمایەتی لەگەڵیا هەبێ، مەسڵەحەتێکی شەرعی لە بانگ کردنەکەیا ببێ؛

**دووهەم:** کابرای بانگکەر تەسەڕوفی لەو خۆراکەدا دروست بێ، بەم ڕەنگە خاوەن ماڵ بێ و منداڵ و شێت و سەفیه نەبێ؛

**سێهەم:** ئەوەیە کابرا فاسیقێکیوا نەبێ ئەم دەعوەتەی هەر بۆ شۆرەت و بەرچاوی بێ؛

**چوارەم:** ئەوەیە قەبووڵ کردنی ئەو دەعوەتە نەبێ بەهۆی شتێکی حەرام، وەك خەڵوەت کردن لەگەڵ ژنێکی نامەحرەم؛

**پێنجەم:** ئەوەیە دەعوەتەکەی گشتی بێ، یەعنی تایبەتی نەبێ بۆ دەوڵەمەندان؛

**شەشەم:** ئەوەیە لە دەعوەتەکەدا ئەم بانگ کراوە دیاری کرابێ بە قسە یا بە ناردنی کاغەزێك یا پیاوێك یا منداڵێکی خاوەن تەمیزیواکە درۆی نەکردبێ لای ئەم شەخسە بەجۆرێ کە قەدر و ئیعتیباری فەوتابێ؛

**حەوتەم:** ئەوەیە پێشان کەسێکی تریوا بانگی نەکردبێ کە قەبووڵ کردنی دەعوەتەکەی پێویست بێ؛

**هەشتەم:** ئەوەیە دەعوەتەکەی لەبەر ترس یا لەبەر مەبەستێکی ناشەرعی نەبێ؛

**نۆهەم:** ئەوەیە لەو مەجلیسەدا کەسێکیوا نەبێ کە ئەم شەخسە پێی نارەحەت ببێ، یا هاوڕێیەتی کردنی، شتێکی ناشیرین بێ؛

دەهەم: ئەوەیە لەو مەجلیسەدا ئیشێکی حەرام یا وەزعێکی حەرامیوا نەبێ کە بە ڕۆیشتنی ئەم لانەچێ؛

یازدەهەم: ئەوەیە کە دەعوەتی شایی ژن گواستنەوە، لە ڕۆژی یەکەمدا بێ و دەعوەتی غەیری شایی یا ڕۆژی یەکەم یا ڕۆژی دووهەم بێ؛ ئەگەر یەکێ لەم مانیعانە هەبوو، نە قەبووڵی بۆدەعوەتی ژن گواستنەوە واجبە و نە بۆ ئەم و شێوەکانی تر سوننەتە؛ لە سوورەتێکیشا ئەم شەرتانە هاتنەدی، ئەوە بەهۆی ڕۆژووەوە قەبووڵی دەعوەتەکە پەکی ناکەوێ، بەڵکوو بڕوا و هیچ نەخوا؛ بەڵێ، ئەگەر شت نەخواردن لەسەر دڵی کابرای بانگکەر گران بوو، ئەوە شکاندنی ڕۆژووەکە خێری زۆرترە ئەگەر ڕۆژووی سوننەت بێ.

## له بارەی شایی و میوانییەوە

لە شایی ژن هێنان و خەتەنە سوورانا، دروستە ئینسان شەکر و نوقڵ و پارە و شتیوا هەڵدا بەسەر خەڵکا و چنینەوەیشی حەڵاڵە، بەڵام تەرك كردنی باشترە؛ کەراهەتی هەیە کەسێك بە داوێن ئەو شتە بگرێتەوە کە هەڵئەدرێ بە ئاسمانا، بەڵام هەرکەس گرتیەوە، یا شتێکی ڕاخست و هەڵدراوەکەی کەوتەسەر، ئەبێ بە موڵکی؛ ئەگەر کەوتە کۆشی، بێ ئەوەی خۆی کۆشی بۆ گرتبێتەوە، نابێ بەماڵی، بەڵام بۆ ئەم ڕەواترە لە یەکێکی تر؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك لە باوەشی هەڵگرت دروستە و حەڵاڵە بۆی؛ بەم پێیە ئەگەر ئەم کەسە هەڵسا و شتەکە لە کۆشی داکەوت و کەسێکی تر هەڵی گرت، ئەبێ بە ماڵی ئەو.

دروستە بۆ کەسێك کە میوان بێ و نانی بۆ بهێنن، بە بێ قسەی خاوەن ماڵ ئەو نانە بخوا، مەگەر لەکاتێکا کە خاوەن ماڵەکە چاوەڕوانی یەکێکی تر بێ، ئەوە لەمکاتەدا ئەبێ ئەم میوانە خۆی بگرێ تا ئەو کەسەیش دێت، یا خاوەن ماڵ ئیجازەی نان خواردنی بدا. دروست نییە میوان تەسەڕوف بکا لەو تەعامەدا کە دانراوە لە بەردەمیا بە غەیری خواردنی خۆی؛ کەواتە، دروست نییە بەشی سواڵکەری لێ بدا، یا لێی بکاتە بەردەمی پشیلە، مەگەر لای وابێ خاوەن ماڵەکە ڕازییە؛ بەڵام دروستە بۆ میوان پاروو بگرێ بۆ

هاوڕێکانی، مەگەر نەوعی خواردنەکان جیاجیا بن، ئەوە لەو حاڵەدا بۆی دروست نییە. ئەگەر بیشزانێ خاوەن ماڵ رازییە، هەر پێویستە عەداڵەت و ئینسافی ببێ لەگەڵ برادەرەکانی و ئەوەندە هەڵ بگرێ کە بەشی خۆیەتی، یا برادەرەکانی پێی رازی بن.

سوننەتە هەرکەس لە بەردەمی خۆیەوە بخوا، مەگەر لە میوەدا، ئەوە دروستە بە عادەت دەست بەرێ بۆ بەردەمی یەکێکی تر. حەرامە ئینسان بکەوێتە دوای میوانی خەڵك و بە بێبانگ کردن بچێ بۆسەر دەعوەتی خەڵك، مەگەر دڵنیا بێ لەوەکە خاوەن ماڵەکە رازییە بە چوونەکەی؛ هەروەها، دروست نییە ئینسان شتی کەس بخوا یا تەسەڕوف لە کەمو زۆری ماڵی خەڵکا بکا، مەگەر لەو باوەڕەدا بێ کەوا ئەو کەسە رازییە. حەرامە ئینسان بە بێپرس بچێتە ماڵی خەڵکەوە مادام لای وانەبێ ئەو کەسە رازییە؛ کەواتە ئەگەر ویستی بچێتە ماڵێکەوە، ئەبێ لەپێشا بدا لە دەرگا و داوای ئیجازە بکا، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە کاتی حەسانەوەی خێزانن.

## ـ لەبارەی مەجلیسی مەولوودنامە و میعراجنامە خوێندنەوەوە

مەجلیس گرتن بۆ خوێندنەوەی مەولودنامە و میعراج نامە بە موناسەبەتی یادی لەدایك بوونی حەزرەتﷺ و چوونیەوە بۆ میعراج، لە بیدعەتی حەسەنەیە؛ یەعنی سوننەت نییە و پاش زەمانی حەزرەت دامەزراوە بۆ یادکرنەوەی ئەوزاعی پێغەمبەرﷺ؛ جا ئەگەر ئەم مەجلیسانە بە ئەدەب بوون و بێشەرعییان تیا نەبوو وەك تێکەڵ بوونی ژن و پیاوی نامەحرەم، ئەوە دروستە و خێری زۆرە، بەتایبەتی ئەگەر خواردەمەنی تیابێ بۆ فەقیران؛ ئەم جۆرە مەجلیسانە تا بە ئەدەبتر راگیرێن، هێشتا کەمە؛ باش وایە لەو مەجلیسانەدا، بەپێی رۆژ و وەزعی ئەوانەی کۆبوونەتەوە، قسە بکرێ لە بارەی کردار و گوفتاری پێغەمبەرەوەﷺ؛ ئەگەر چەند خەتیبێك هەڵسنەوە قسە بکەن، ئەوە قازانجی زۆرترە لەوە کە هەموو ساڵێك قسەکانی ساڵانی پێشوو دووبارە بکرێنەوە؛ ئەم جۆرە مەجلیسانە، فرسەتن بۆ ئەوەی قسەی باشیان تیا بکرێ بۆ موسوڵمانان، چ لە بارەی دین و چ لەبارەی مەسڵەحەتی دنیایی موسوڵمانانەوە.

## ـ لەبارەی چۆنیەتیٚ راگرتنی لەش و جلو بەرگەوە

سونەتە ئینسان ئەوەندەی پێویست بیٚ، مووی سەری چەور بکا بۆ ئەوەی سەری بە پاکی رابگریٚ، لەکاتی نووستنیشا چاوی بەکل برێژیٚ و مووی سپیی سەر و ریشی بە رەنگێکی سوور یا زەرد رەنگ بکا بۆ تازەبوونەوەیان، بەڵام حەرامە بە رەنگی رەش رەنگیان بکا، مەگەر لەکاتی شەڕدا لەگەڵ دوژمنان، ئەوە لەو کاتەدا دروستە. کەراهەتی هەیە تاشینی مووی ریش، لەسەر فەرموودەی ئیمامی غەزالی و «شیخ الاسلام قاضي زکریا» و «ابن حجر» لە توحفەدا؛ لەسەر فەرموودەی غەیری ئەمانیش، حەرامە؛ بەڵام سونەتە بەرسمێڵ کردن ئەوەندە کە سوورایی لێوی پیاو بەتەواوی دەربکەویٚ؛ هەروەها، دروستە قرتاندنی مووی سمێڵ، هەتاوەکوو ئەگەر ئەوەندەش کەمی بکاتەوە یەکێك وابزانیٚ تاشراوە. دروستە مووی سەر نەتاشیٚ و بەشی بکا بەملا و بەولای سەریا. دروستیشە بیتاشیٚ؛ حەزرەتﷺ، جار بە جار سەری تاشیوە و جار جاریش هێشتوویەتیەوە؛ کەواتە، تاشین و نەتاشین، هەردووکیان سونەتن؛ بەڵیٚ، ئەگەر بەهۆی نەتاشینەوە رشك و مۆریان بداتە سەری کەسێك و مەنعی تەڕبوونی بنیمووەکان بکات لەکاتی خۆشۆردنا، ئەوە واجبە چارەیەکی بکا، خوا بە دەرمان یا بە تاشین، ئەگینا غوسڵی دانامەزریٚ و هەمیشە ئەو ئینسانە بە لەش پیسییەوە ئەمێنێتەوە و نوێژی دانامەزریٚ. سونەتە ژن هەموو ئەسبابێکی جوانی و پاکی بەکار بهێنیٚ بۆ گیانی و بۆ جلوبەرگی و خەنە و وسمە و دەرمانیتر بەکار بهێنیٚ، مەگەر لەکاتێکا کە مێردی مردبیٚ و هێشتا «عِدّة»ی بەسەر نەچووبیٚ بە منداڵ بوون ـ ئەگەر دووگیان بیٚ ـ یا بە تێپەڕبوونی چوار مانگ و دە شەو ـ ئەگەر سکی خاڵی بیٚ ـ لەم ماوەیەدا، هەموو ئەسبابێکی خۆجوان کردن حەرامە بۆ ژن، مەگەر لەبەر نەخۆشی و ناچاری.

واجبە هەموو ئینسانێکی باڵغ و عاقڵ تەماشای پاکی جل و بەرگ و لەش و نوێن و قاپ و قاچاغ و خواردەمەنی خۆی بکا و لە هەموو وەختێکا سەری ئاو و قاپی خواردەمەنی وا داپۆشیٚ کە پیس نەبن؛ زۆر قیمەتیش دابنیٚ بۆ راگرتنی پاکی خۆی و ئیشێکی وا نەکا کە هاوڕیٚ و هاوکاسەی، دڵیان لێی بیەشێت.

## هەندێك ئادابی كۆمەڵایەتی

سوننەتێكی گەورەیە ئینسان هەمیشە رووخۆش و قسەخۆش بێ بەرامبەر بە خەڵك، بە تایبەتی ئەگەر ئەو ئینسانە گەورەی كۆمەڵێك، یا مامۆستای چەند قوتابییەك بێ، بۆ ئەوە كە سوودی زۆر بێ بۆیان و تەریزی لێ نەكەن؛ هەروەها، سوننەتە ئینسان قەدر و پایەی هەركەس بەقەدەر خۆی رابگرێ و قسە لەگەڵ هەركەس بە گوێرەی عەقڵی ئەوكەسە بكا و هەر وەكوو قسە ئەكا، قسەیش وەربگرێ و دەمەقاڵە و موجادەلە نەكا، هەرچەند حەقیش لای ئەم بێ. سوننەتە سەلام بكا لە گەورە و بچووك، ناسراو و نەناسراو؛ سەلام كردن بۆیەك كەس، سوننەتی عەینە و بۆ كۆمەڵ، سوننەتی كیفایەیە؛ جواب دانەوەكەشی بۆ یەك كەس، فەرزی عەینە و بۆ كۆمەڵێك، فەرزی كیفایەیە، هەرچەند ئەو كەسەش كە سەلامەكە ئەكا كافری ئەهلی «ذِمّة» بێ؛ جوابی سەلام پێویستە كەلیمەی «علیك»ی تیابێ؛ سەلام كردن لە كافر سوننەت نییە، هەروەها لە پیاوی خراپ، مادام ترسی فیتنەی ئەو پیاو خراپەمان نەبێ؛ سەلام كردن سوننەت نییە لە ژنی جوان ئەگەر بەتەنها بوو، هەروا لە كەسێك لە نوێژا بێ، یا خەریكی خواردن یا بانگ‌دان یا قامەت‌كردن یا خوتبە خوێندنەوە بێ، جوابیشیان واجب نییە؛ سوننەتە ئەو كەسەكە جواب ئەداتەوە، جوابەكەی لە سەلامەكە جوانتر بێ، یاخود ئەوەندەی ئەو بێ؛ هەروەها سوننەتە ئینسان كاتێك كە مەجلیسێك بەجێ ئەهێڵێ، سەلام لە دانیشتووەكان بكاتەوە.

سوننەتە لەكاتی بەیەك گەیشتن‌دا بچووك، سەلام بكا لە گەورە و سوار لە پیادە و، رێبوار لە راوەستاو و دانیشتوو و راكشاو وكەم لە زۆر؛ پێچەوانەی ئەمانەش كەراهەتی نییە. ئەگەر یەكێ كەسێكی كرد بە وەكیل بۆگەیاندنی سەلامێك و لەفزی سەلامەكەشی پێوت و ئەویش قەبووڵی كرد، واجبە بیگەیەنێ؛ كابرای سەلام بۆ نێرراویش واجبە جوابی بداتەوە و باشترین جوملەی جواب ئەوەیە كە بڵێ: «عَلینا و عَلیكَ و علیهِ السّلام»؛ هەركاتێك كەسێك چووە شوێنێكی چۆڵەوە، سوننەتە بڵێت:«السَّلامُ عَلینا

و عَلی عبادِ اللّه الصّالحین» و لە پاش هەستان لە مەجلیس، سونەتە بڵێت: «سُبحانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمّا یَصِفُونَ وَ سَلامٌ عَلَی الْمُرسَلینَ، وَ الحمدُ لِلّهِ رَبِّ الْعالَمینَ».

الحمدللّه، لێبوومەوە لە دانانی بەرگی یەکەمی کتێبی «شەریعەتی ئیسلام بە پێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی -خوای لێ رازی بێ-» لە عەسری رۆژی دووشەممە رێکەوتی رۆژی عەرەفە (٩ی ذی الحجّة)ی ساڵی ١٣٧٨ی هیجری، بەرامبەری ١٤ی حوزەیرانی ١٩٥٩ [ی زایینی]لە حوجرەی دەرس‌وتنەوەی خۆمدا لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووك. خوا یارمەتیم بدا بۆ تەواو کردنی بەرگەکانی تریشی، بەنیازی خزمەت کردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و کۆمەڵی موسوڵمانان.

## سەرچاوەکانی ئەم کتێبە

(١) تحفةُ المحتاج، في شرح المنهاج، لابن حجر الهَيتمي؛

(٢) فتح الوهّاب، في شرح منهج الطّلاب، للقاضي زكريا الأنصاري؛

(٣) حاشية الشيخ سليمان الجمل على شرح المنهج؛

(٤) الحواشي المدنيّة، للشيخ سليمان الكُردي المدني؛

(٥) إعانة الطّالبين، للشّيخ أبي بكر شطا البكري؛

(٦) بُغلة الطّالبين، لمفتي الدّيار الحضرمية؛

هەرکەس شوبهە لە بابەتێکی ئەم کتێبە بکا، بگەڕێتەوە سەر ئەم کتێبانەی ناومان نووسیون؛ جا ئەگەر هەڵەیەکی ئێمەی بۆ دەرکەوت، ئاگادارمان بکا و لێمان ببوورێ، چونکە کەس لە سەهو خاڵی نییە.

# شەریعەتی ئیسلام

بە پێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی

ـ خوای لێ رازی بێ ـ

دانراوی:

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

«بەرگی دووهەم»

بڵاوکردنەوەی کوردستان و پەرتەو بەیان

# ناواخن

## باسی کڕین و فرۆشتن

بۆ هاتنه دیی کڕین و فرۆشتن، چوار شت پێویسته:

یەکەم، فرۆشیار؛ دووهەم، کڕیار؛ سێهەم، فرۆشراو؛ چوارەم، قسەیەك لە بەینی فرۆشیار وکڕیارداکه جێبەجێ کردنی ئەوکڕین و فرۆشتنه بگەیەنێت، یەعنی «صیغة».

پێویسته فرۆشیار و کڕیار چەند شەرتێکیان تیا بێتە دی:

(یەکەم)، ئەوەتە «مُکلَّف» بن، یەعنی باڵغ و عاقڵ بن؛ کەواتە، مامەڵەی منداڵ و شێت و بێهۆش دانامەزرێ؛ بەڵام لە کتێبی «بُغیة»دا هەیە کەوا «أبوفَضل» گێڕاویەتەوە کە زانایانی دین هەموو لەو باوەڕەدان دروستە منداڵ بنێررێ بۆ کڕین و فرۆشتنی ئەو شتانە کە زۆر بە قیمەت نەبن، وەك گۆشت و رۆن و برنج و شەکر و چا و وردەشتی ناومالْ؛ کەواتە، دروستە ئینسانی باڵغ و عاقڵ بۆ ئەم جۆرە شتانە مامەڵە لەگەڵ منداڵا بکا و شتی پێ بفرۆشی و لێی بکڕێ؛

(دووهەم)، ئەوەیە خاوەن روشد بن، یەعنی مەسڵەحەتی دین و دنیای خۆیان بفامن وە بەو جۆرە رەفتار بکەن.

بزانن! ئینسانێکی باڵغ کە نەزانین ئاخۆ روشدی هەیە یا نییەتی وە باڵغێکی خاوەن روشد کە لە پاشا دەسی کردبێ بە ئیسراف و دەس بەرەڵڵایی، بەڵام هێشتا قازی مەنعی موعامەلە کردنی لێ نەکردبێ، بە خاوەن روشد دائەنرێن و مامەڵەیان دروستە؛ بەڵام کەسێك کە بە بێڕوشدی باڵغ بووبی، یا خود بە خاوەن روشدی باڵغ بووبی و پاشان کەوتبێتە دەس بەرەڵڵایی و قازی حیجری نابێتە سەر و مەنعی موعامەلەی لێ کردبێ، ئەوە تەسەروفی دروست نییە.

(شەرتی سێهەم)، ئەوەیە «مُختار» بن، یەعنی ئەو موعامەلەیە بە مەیل و ئارەزووی خۆیان بکەن نەك بە زۆری کەس، مەگەر بە زۆری شەرع، وەك ئەوە کەسێك قەرزاری خەڵك بێ و قازی زۆری لێ بکا هەندێك لە ماڵی خۆی بفرۆشێ تا قەرزەکەیی لێ بداتەوە، ئەوە دروستە و دائەمەزرێ.

**بزانن!** لە بەشی موعامەلەی بەزۆر دانانرێ ئەوە کە یەکێك ماڵی زەوت کرابێ و بە پارە نەبێ، ماڵەکەی بۆ رزگار نەکرێ وە بە ناچاری و ناحەزیی دڵی، هەندێ لە ماڵی خۆی بفرۆشی بۆ ئەوە کە پارەکەی بدا بۆ رزگارکردنی ماڵە زەوتکراوەکەی؛ ئەم شەخسە، با حەزیشی لەو موعامەلەیە نەبێ، موعامەلەکەی هەر دائەمەزرێ. کڕیار، ئەگەر قورئان یا شتێکیوای کڕی کە قورئانی لێ نووسرابێ، ئەبێ موسوڵمان بێ وە تەنها دراو «سکّة» لەم حوکمە بەدەرە؛ هەروەها ئەگەر چەك یا شتێکی وای کڕی کە بۆ جەنگ بەکار بهێنرێ لە جەنگی کافرانا لەگەڵ موسوڵمانان، یا سوودی بۆ کافران هەبێ، ئەوە ئەبێ موسوڵمان بێ، چونکە ئەگەر موسوڵمان نەبێ، موعامەلەکە ئەبێ بە یارمەتی دانی کافران بۆ فەوتاندن و زیان پێ گەیاندنی موسوڵمانان.

«صیغة»، بریتییە لە «إیجاب» لە لایەن فرۆشیار و «قَبول» لە لایەن کڕیارەوە، هەتا وەکوو ئەگەر باوکێك ویستی ماڵی خۆی بفرۆشێ بە کوڕێکی بچووکی، ئەبێ بە تەنها خۆی ئەم ئیجاب و قەبوولە تەواو بکا ـ مەسەلا ـ بڵێت: وا ئەم ماڵەم فرۆشت بەو کوڕە منداڵەم بە ئەوەندە وە بۆم قەبووڵ کرد بەوە؛ کەواتە، فرۆشتن بە بێ سیغە وە بە تەنها پارەدان و ماڵ وەرگرتن ـ کە پێی ئەڵێن «مُعاطاة» ـ دانامەزرێ؛ بەڵێ، ئیمامی نەوەوی و گەلێك لە زانایانی شافیعی مەزهەب، ئەو رایەیان لا پەسەندە کە فرۆشتن بە شێوەی «مُعاطاة»، یەعنی بە بێسیغە، دائەمەزرێ لە هەرشتێکا کە وەها کرابێ بە عادەت تیایدا پارەکە بدرێ و ماڵەکە وەربگیرێ و ببڕێتەوە، ئیتر ئەو شتە ئەهمیەتی هەبێ یا نەیبێ؛ ئەمرو پێویستە ئێمە تەقلیدی ئەو زانایانە بکەین و رازی ببین بە فەرموودەکەیان تا ئەو شتەی ئەیکڕین ببێ بە ماڵی شەرعیمان و تووشی گوناه نەبین؛ هەروەها، ئیمامی غەزالی ئەو رایەی پەسەند کردووە کەوا دروستە ئینسان هەر پێویستییەکی هەبێ، وردە وردە وەری بگرێ لە مەعمیل و لە ئاخری مانگا حیسابی لەگەڵ بکا، هەرچەند لە هەموو کاتێکیشا قیمەتی ئەو شتە نەزانێ کە وەری ئەگرێ، چونکە عادەت دامەزراوە لە سەر ئەم جۆرە مامەڵەیە و خەڵك ناچارن بیکەن.

«صیغة»، دوو جۆرە: «صَریح» و «کِنایة»؛ سەریح، ئەوەیە جگە لە فرۆشتن،مەعنایەکی تر هەڵنەگرێ، وەك فرۆشتن، کردن بە موڵك بە پارە، کڕین، وەرگرتن بە پارە؛ هەر لەم

جۆرەیە ئەوەکە کابرای فرۆشیار بڵێ: پێم‌بەخشیت بەوەندە، چونکە مادام ناوی قیمەتی هێناوە، فرۆشتنەو بەخشین نییە؛ بەڵام دروست نییە بڵێ لێم‌نەزر کردی یا بۆم حەڵاڵ کردی بەوەندە، چونکە نەزر کردن و حەڵاڵ کردن، ئەبێ بەرامبەر بە قیمەت نەبن.

فرۆشتن، دائەمەزرێ بە «بەڵێ» کردنی کڕیارەکە لە پاش ئەوە کە فرۆشیار لێی بپرسێ: «لێت کڕیم بەوەندە؟». وە بە «بەڵێ» لە لایەن فرۆشیارەوە لە پاش ئەوە کە کڕیار لێی بپرسێ: «پێت فرۆشتم بەوەندە؟». وە بە «بەڵێ» لە لایەن هەردووکیانەوە لە کاتێکا شەخسێکی ناوبەین لە فرۆشیار بپرسێ: «ئەمماڵەت فرۆشت بە فلانکەس بەوەندە؟» وەگورج لە کڕیاریش بپرسێ: «ئەم ماڵەت لێ کڕی بەوەندە؟» وە لە بەشی دووهەمە ئەوە کە فرۆشیار، بڵێ بە کڕیار: «ئەم ماڵەت موبارەك بێ» یا: «وا بڕیارم دا بۆ تۆ بێ» یا: «خوا پێت بفرۆشی» یا: «خوا موبارەکی بکا لێت»، وەگورج کڕیاریش بڵێ: «وا وەرمگرت»، یا خود هەردووکیان بە نووسین، فرۆشتن و کڕینەکە بنووسن، یا یەکێکیان بینووسێ و ئەویان بە دەم قەبووڵی بکا؛ بەڵام لە هەموو حاڵەتێکی فرۆشتن بە کینایەدا، پێویستە فرۆشیار بە نیازی مەعنای فرۆشتن قسەکە بکا، یا نووسراوەکە بنووسێ وە کڕیاریش، بە نیازی کڕین قسەکە بکا یا نووسراوەکە بنووسێ.

«صیغة»، چەند شەرتێکی هەیە؛

[شەرتی] یەکەم، ئەوەیە ڕووی مامەڵەکە بکرێتە ئەو کەسە کە قسەکەی لە گەڵدا ئەکرێ، خواه ماڵەکە بۆ خۆی بکڕێ یا لە وەکالەتی کەسێکەوە بیکڕێ؛ کەواتە، دروست نییە فرۆشیار بە وەکیلی کڕیار بڵێ: «وا ئەم ماڵەم فرۆشت بەو کەسەی کە تۆی کردووە بە وەکیل» وە ئەویش، بڵێ: «وا قەبووڵم کرد بۆی»؛ بەڵکوو پێویستە بە سوورەتی گفتوگۆ لەگەڵ وەکیلەکەدا، بڵێ: «وا ئەم ماڵەم پێ فرۆشتی» و ئەویش، بڵێ: «وا قەبووڵم کرد»؛ بەڵێ، دروستە فرۆشیار، بڵێ: «وا ئەم ماڵەم فرۆشت بە فلانکەس»، یەعنی ناوی کەسێك بهێنێ کە خۆی لەویادا بێ و ئەویش، بڵێ: «وا قەبووڵم کرد». هەروەها، دروستە باوکی منداڵێك، بڵێ: «وا ئەم ماڵەم فرۆشت بەو منداڵەم» و هەر خۆی بۆی قەبووڵ بکا؛ بەڵام دروست نییە فرۆشتنەکە بدرێتە پاڵ ئەندامێکی لەشی کڕیارەکە، وەك ئەوە کە بڵێ: «ئەم ماڵەم فرۆشت بە دەستی تۆ» یا: «بە سەری تۆ»،... .

**شەرتی دووهەم**، ئەوەیە ئەو سیغەی فرۆشتنە، «مُعلّق» نەبێ، یەعنی نەبەسرابێ بە هیچەوە؛ کەواتە، دروست نییە فرۆشیار، بڵێ: «هەر رۆژێ جەژنی قوربان هات، ئەم ماڵەم فرۆشت بە تۆ»؛ بەڵێ، ئەگەر بە سرابێ بە ئارەزووی کڕیارەوە، ئەوە دروستە، وەك ئەوەکە بڵێ: «وا ئەم ماڵەم فرۆشت بە تۆ بە دە دینار ئەگەر ئارەزووت بێ»، ئەویش بڵێ: «قەبووڵم کرد»، چونکە ئەم جۆرە قسە، وەك بەیانی شتێکی رووداو وایە وە دیارە ئەگەر کڕیارەکە ئارەزووی لێ نەبێ، ماڵەکە ناکڕێ.

**شەرتی سێهەم**، ئەوەیە کە ئەو فرۆشتنە، «مؤقّت» نەبێ، یەعنی بۆ وەختێکی تایبەتی نەبێ؛ کەواتە، دروست نییە فرۆشیار بڵێ: «وا ئەم ماڵەم فرۆشت بە تۆ بۆ ماوەی ئەوەندە ساڵ»؛ بەڵکوو ئەگەر بیشڵێت: «وا پێم فرۆشتی بۆ ماوەی عومرت»، ئەوەیش هەر بەتاڵە، چونکە وا ئەگەیەنێ پاش مردنی کابرای کڕیار پەیوەندی پێوە نەمێنێ و بە میرات نەگەڕێتەوە بۆ میراتگرەکانی؛ دیارە ئەمەش لەگەڵ ئوسووڵی کڕین و فرۆشتندا ناگونجێ.

**شەرتی چوارەم**، ئەوەیە کە لە لایەن ئەوکەسەوەکە پێویستە جواب بداتەوە، قسەیەکی وا نەکەوێتە بەینی سیغەی فرۆشتن و کڕینەوەکە پەیوەندی بە فرۆشتنەکەوە نەبێ.

**شەرتی پێنجەم**، ئەوەیە بە پێی عورف و عادەت درێژی نەکەوێتە بەینی قسەی فرۆشیار و کڕیارەوە؛ ئەم درێژییە، دانراوە بە شەش کەلیمە[1]؛ کەواتە، لەوەندە کەمتر زیانی نییە.

**شەرتی شەشەم**، ئەوەیە ئەوکەسەیانکە لە پێشەوە قسە ئەکا، ناوی قیمەتی ماڵەکە ببا؛ ئەگەر هاتو ئەو ناوی نەبرد [و]کابرای دووهەم ناوی برد، ئەبێ کابرای یەکەم بە دوایا بێتەوە و قیمەتەکە دیاری بکا؛ بەڵێ، ئەگەر سیغەی فرۆشتنەکە کینایە بوو، ئەوە دروستە هەردوولا نرخەکە لە دڵیانا بێ؛ کەواتە، ئەگەر فرۆشیار وتی: «ئەم ماڵە موبارەکی تۆ بێ» وە کڕیاریش، وتی: «وا وەرمگرت» و هەردووکیان نیازی فرۆشتن و کڕینیان هەبێ و نرخێکی تایبەتییان لە دڵدا بێ، ئەوە دروستە.

---

١. «باجووری» ئەم قسەیەی کردووە لە باسی ئەو شتانەداکە نوێژ بەتاڵ ئەکەنەوە.

شەرتی حەوتەم، ئەوەیە فرۆشیار و کڕیار تا لە مامەڵەکە ئەبنەوە، لایقی مامەڵە کردن بن؛ کەواتە، ئەگەر فرۆشیار قسەی خۆی تەواو کرد و لە پێش وەڵام دانەوەی کڕیاردا شێت بوو، ئەوە ئەو فرۆشتنە دانامەزرێ، هەرچەند کڕیار قەبووڵیشی بکا.

شەرتی هەشتەم، ئەوەیە ئەوەیان کە دەستی کردووە بە سیغەی فرۆشتنەکە، هەرچی وتووە نەیگۆڕێ تا ئەوی تریشیان قسەی خۆی تەواو ئەکا، چونکە ئەم جوابی ئەو ئەندازە قسەیە ئەداتەوە کە ئەو لە پێشا کردوویەتی؛ کەواتە، ئەگەر یەکەمیان قسەکەی خۆی بگۆڕێ، جوابی دووهەمیان نابەسرێ بە قسەکەی ئەوەوە و لەفزی هەردوولا لە یەك ئەپچڕێن.

شەرتی نۆهەم، ئەوەیە قسەی هەردوولایان ئەوەندە ئاشکرابێ هەرکەسێکی خاوەن گوێ لە لایانا بێ، گوێی لێ بێ.

شەرتی دەهەم، ئەوەیە ئەو کەسە کە قسەی لەگەڵدا کراوە، خۆی جواب بداتەوە؛ کەواتە، ئەگەر یەکێك قسە لەگەڵ یەکێك بکا وە وەکیلی ئەم یەکە جواب بداتەوە، مامەڵەکە دانامەزرێ.

شەرتی یازدەهەم، ئەوەیە جوابەکە ڕێکی قسەی یەکەمکەس بێ کەواتە، دروست نییە فرۆشیار، بڵێ: «ئەمماڵەم پێ فرۆشتی بە دە دینار» وە کڕیار، بڵێ: «وا قەبووڵم کرد بە بیست دینار» یا خود بڵێ: «وا نیوەم قبووڵ کرد بە پێنج دینار» یا «بە دە دینار»، هەرچەند کە لەم سوورەتەدا قازانجی فرۆشیارەکەشی تیایە، لە بەر ئەوە کە قسەی هەردوولایان وەك یەك نییە.

شەرتی دوازدەهەم، ئەوەیە هەردوولا مەعنای قسەی یەکتر بزانن.

بزانن! ئیشارەت کردنی ئینسانی لاڵ وەك قسەی زماندار وایە؛ جا ئەگەر ئەو ئیشارەتە ئەوەندە دیاری بوو زیرەك و کەودەن لێی حاڵی ئەبوون، ئەوە وەك لەفزی سەریح وایە وە ئەگەر هەر ئینسانی زیرەك تێی ئەگەیشت، ئەوە بە کینایە دائەنرێ؛ وە لەم کاتەدا پێویستە بە ئیشارەتێکی تر تێمان بگەیەنێ کە مەبەستی لە ئیشارەتی یەکەم ماڵ فرۆشتن یا ماڵ کڕین بووە.

**شەرتی سیانزەهەم**، ئەوەیە سیغەی مامەڵەکە تەردید و دڵەراوکێی تیا نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر یەکێك بە یەك سیغە، وتی: «وا ئەم ماڵەم پێ‌فرۆشتی بە دە دیناری نەخت یا بە دوانزە دیناری قەرز»، ئەویش قەبووڵی کرد، ئەوە ئەو مامەڵەیە بەتاڵە، چ کابرای کڕیار لایەکیان دیاری بکا یا ناوی هیچیان نەبا، لەبەر ئەوە کە سیغەی فرۆشیارەکە تەردیدی تیا بووە؛ بەڵام ئەگەر ئەم دووجۆرە موعامەلەیە بە جیاواز بکرێن، وەك ئەوە کە فرۆشیارەکە هۆقەیەك چایی بفرۆشی بە یەکێك بە دینارێکی حازر و هۆقەیەکی‌تری پێ بفرۆشی بە دینارو روبعێك بە وادەی چەند مانگێك، ئەوە دروستە، چونکە بە پێی شەرع، رەوایە ئینسان فەرق بخا لەبەینی موعامەلە بە حازر و بە قەرزدا و ئەم جۆرە موعامەلەیە بە سوود دانانرێ‌و بەر ئەو حەدیسەی پێغەمبەرﷺ ناکەوێ کە فەرموویەتی: «**کُلُّ قَرْضٍ جَرَّ مَنْفَعَةً فَهو رِباً**»، چونکە ئەو فەرموودەیە بۆ قەرزە و قەرز ئەوەیە شتێ بدەی بە کەسێك لەسەر بڕیاری ئەوە کە ئەوکەسە وێنەی ئەو شتەت بداتەوە، بەڵام ئەم باسی ئێمە، باسی ماڵ فرۆشتنە بە پارەی حازر، یا بە وادە و ئەم دوو مەسەلەیە جیان لە یەك.

«فرۆشراو»یش، واتە ئەو ماڵە کە ئەفرۆشرێ، چەند شەرتێکی هەیە:

**شەرتی یەکەم**، ئەوەیە ئەو شتە عەینەکەی پاك بێ؛کەواتە، فرۆشتنی سەگ و بەراز و شەراب و هەر شتێکی ئاوەکی کە پیس بووبێ و قابیل نەبێ پاك ببێتەوە دروست نییە، وەك شیر و ماست و دۆ و رۆن‌و شتی‌واکە پیس بووبێ.

**شەرتی دووهەم**، ئەوەیە ئەو شتە لە زاتی خۆیا قازانجێکی شەرعی تیابێ، هەرچەند لەو شوێنەشدا زۆر بێ، وەك ئاو لە قەراغ چەمدا و گڵ لە دەشتا و بەردو دار لە کێوو دارستاندا؛ کەواتە، فرۆشتنی دڕندەی بێ خێر و مێش و مێروولە و قوڵانچە و شتی‌وا، دروست نییە، بەڵێ، دروستە فرۆشتنی هەنگی ناو پوورە هەنگ‌و کرمی ئاورێشم بە شوێنی تایبەتی خۆیەوەو فیل بۆ سواربوونی لە جەنگداو مەیموون بۆ پاسەوانی و پشیلەی ماڵی‌و تاوس‌و بولبول‌و تووتی بۆ ئولفەت گرتن بە رەنگ‌و دەنگیانەوە؛ هەروەها دروستە فرۆشتنی زالوو بۆ خوێن‌هەڵمژین و یووز و باز بۆ راو

پێ کردن. دروست نییە فرۆشتنی شتی زۆر بێ‌قابیلەت، وەك دوو دەنکە گەنم؛ هەروەها، دروست نییە فرۆشتنی شتێ کە قازانجە کەی شەرعی نەبێ وەك ئەسبابی رابواردنی حەرام، وەك زورناو جووزەلەو تارو تەموورەو کاغەزی یاری پێ کردن، چونکە ئەو کەڵکەی لێیان وەرئەگیرێ، نارەوایە.

دروست نییە فرۆشتنی پارچە زەوییەك کە لە هیچ‌لایەکەوە رێگەی هاتوچۆ بۆ کردنی نەبێ، بەوجۆرە کە هەموولایەکی موڵکی خەڵك بێ؛ هەروەها، یەك هۆدە لەماڵێکا ئەگەر کابرای فرۆشیار لە موعامەلەکەدا حەقی هاتوچۆ کردن لە کڕیارەکە بگرێ، بەوجۆرە کە بڵێ: «وا تەنها ئەو هۆدەیەم پێ‌فرۆشتی بە بێ‌ئەوەی حەقی هاتوچۆ کردنت لە ماڵی منەوە بێ»و کڕیارەکەیش قەبووڵی بکا؛ بەڵێ ئەگەر فرۆشیار لە کاتی فرۆشتنی هۆدەکەدا باسی شتی‌وای نەکرد، ئەوە موعامەلەکە دائەمەزرێ وکڕیار حەقی هاتوچۆ کردنی بە سەر ماڵی فرۆشیاردا ئەبێ، چونکە قابیل نییە بە بێ‌ئەوە، قازانج لە هۆدەکە وەربگرێ وە لەبەر ئەوە، ئەو حەقە تابیع ئەبێ بە فرۆشتنی هۆدەکە.

دروستە کەسێك نیوەیەکی دیاری نەکراوی خانوویەك بفرۆشێ بە نیوەیەکی دیاری نەکراوی خانوویەکی‌تر بەونیازە کە ئەو نیوە خانووەی لە دەس دەرنەچێ، وەك ئەوەکە باوکی ئەو نیوە خانووەی پێ‌بەخشیبێ؛ لێرەدا، لەبەر ئەوە کە باوکی هەمیشە حەقی پەشیمان بوونەوەو سەندنەوەی نیوە خانووەکەی هەیە، ئەم ئەتوانێ بیفرۆشێ بە نیوە خانوویەکی‌تر با دیاریش نەبێ، چونکە لەم حاڵەدا نیوە خانووەکەی کە باوکی پێی‌بەخشی‌بوو، بەدەسیەوە نەماوە، تا هەر کاتێك کە ئارەزووی بوو لێی وەربگرێتەوە.

هەروەها دروستە فرۆشتنی حەقی هاتوچۆ بۆ خانوویەك یا بەسەربانێکا یا بە ناو باخێکا؛ ئەمە، هەرچەند مەنفەعەتە و ئەبێ بە ئیجارە وەربگیرێ، بەڵام فرۆشتنی بۆ هەمیشە دائەمەزرێ و ئەبێ بە موڵکی کڕیارەکە.

ئەگەر کەسێك خانوویەك یا باخچەیەکی خۆی فرۆشت بە کەسێکی‌تر وە دەورو پشتی فرۆشراوەکە هەمووی هی فرۆشیارەکە خۆی بوو وە ناوی حەقی گوزەر کردنیان نەهێنا بۆ ناو خانوو یا باخچە فرۆشراوەکە، یا وتیان کڕیار حەقی هاتوچۆی بە هەموو

لایەکدا هەبێ، ئەوە فرۆشتنە کە دائەمەزرێ و کڕیار حەقی هاتوچۆی بۆ ناو خانووەکە یا باخچەکە هەیە؛ هەروەها دائەمەزرێ ئەگەر فرۆشیار حەقی هاتوچۆ لەلایەکی دیارییەوە دانێ بۆ کڕیار؛ بەڵام ئەگەر هەر وتی حەقی هاتوچۆکردنی لەلایەکەوە بێ‌و لایەکەی دیاری نەکرد، ئەوە ئەو فرۆشتنە دانامەزرێ، چونکە ئەبێ بە مایەی هەراو ئاژاوە لە نێوانی فرۆشیارو کڕیاردا. ئەگەر کەسێك باخێکی فرۆشت‌و ناوی حەقی ئاودانی باخەکەی نەهێنا، ئەوە هەر باخەکە فرۆشراوە وە ئەگەر بە حەقی ئاودانەوە فرۆشتی، ئەوە دروستە و حەقی ئاودانیشی بەرئەکەوێ وە ئەگەر نیوەی باخەکەی فرۆشت بە نیوەی حەقی ئاودانیەوە، ئەوەیش هەر دروستە.

**شەرتی سێهەمی** ماڵی فرۆشراو، ئەوەیە قابیل‌بێ تەسلیم بکرێ بە کڕیارەکەی؛ کەواتە، فرۆشتنی شتی گوم‌بوو، یا حەیوانی راکردوو، یا ماڵی داگیرکراو دروست نییە؛ بەڵێ، دروستە فرۆشتنی ماڵی داگیرکراو بە کەسێك کە بتوانێ بە بێ زەحمەتێکی زۆر بیسێنێتەوە لەو کەسەی کە داگیری کردووە و دروست نییە فرۆشتنی نیوەیەکی دیاری کراو لە قاپ‌و قاچاخێ، یا شیرێ، یاخەنجەرێ، یاهۆدەیەك، بەجۆرێ کە ئەگەر بەش بکرێن‌و بەشی کڕیارەکە جیا بکرێتەوە، قیمەتی ئەو شتە کەم ببێتەوە؛ بەڵێ، دروستە فرۆشتنی نیوەیەکی دیاری نەکراو لەو شتانە، جا ئەوجار بە نۆبە بە کار ئەهێنرێن؛ هەروەها دروستە فرۆشتنی نیوەیەکی دیاری کراویان، ئەگەر ئەوەندە گەورە بن بە بەش‌کردن و جیاکردنەوەی بەشەکانیان قیمەتیان کەم نەبێتەوە وە دروستە فرۆشتنی ئەندازەیەك لە پارچە قوماشێك، بەو شەرتە کە قیمەتی ئەوی‌تری کەم نەبێتەوە.

دروست نییە فرۆشتنی شتێ کە حەقی کەسێکی‌تری پێوە بەسرابێ، جا حەقی خوا بێ، وەك ئاوێك کە غەیری ئەوە دەست نەکەوێ بۆ دەس‌نوێژ پێ گرتن، یا حەقی ئادەمیزاد بێ، وەك پۆشاکێ کە لای بەرگدروو بێ، چونکە بەرگدرووەکە ئەتوانێ نەیداتەوە تاکرێ دەسەکەی خۆی وەرئەگرێ وە وەك زەوییەك کە خاوەنەکەی دابێتی بە کەسێك کێڵابێتی‌و تەختی کردبێ بۆ توو تیا داچاندن، ئەوە تا حەقی ئەوکەسە نەدرێ‌و رازی نەکرێ، دروست نییە خاوەنەکەی بیفرۆشێ، یا وەك ماڵێکی رەهن کراو لای

خاوەنقەرزێك، ئەوە لەپێش دەرهێنانی ماڵەکە لە دەستی ئەو خاوەن قەرزە، یا بە بێ ئیزنی ئەو، دروست نییە بفرۆشرێ.

**شەرتی چوارەم**، ئەوەیە ئەو ماڵە کە ئەیفرۆشێ، موڵکی تەواوی فرۆشیارەکە بێ؛ کەواتە، ماڵی کڕاو، لە پێش وەرگرتنیا نافرۆشرێ؛ هەروەها، ماڵی کەسێکی تر نافرۆشرێ بە بێ ئیزنی ئەو کەسە؛ بەڵێ ئەگەر ماڵی باوکی خۆی فرۆشت و لای وابوو زیندووە وە لە پاشا، دەرکەوت باوکی لە کاتی ئەو موعامەلەیەدا لە حەیاتا نەبووە، ئەوە ئەو فرۆشتنە بە دامەزراو دائەنرێ؛ جا ئەگەر هەموو ماڵەکە بە میرات ئەهاتەوە بۆخۆی، ئەوە هەرچی فرۆشتووە دروست بووە وە ئەگەر میراتگری تری لە گەڵ بوو، تەنها فرۆشتنی بەشە میراتەکەی خۆی دائەمەزرێ و ئەوی تری بەتاڵە.

**شەرتی پێنجەم**، ئەوەیە ئەو ماڵە کە ئەفرۆشرێ، مەعلووم بێ بە چاو، لە فرۆشتنی شتی لە بەردەستدا. وە بە سیفەت، لە فرۆشتنی بە شێوەی سەلەمدا؛ کەواتە، فرۆشتنی «یەکێك لە دووشت»، دانامەزرێ ئەگەر فرۆشراوەکە دیاری نەکرێ، وەك ئەوە کە فرۆشیارەکە بڵێ: «وا یەکێك لەو دوو وڵاخەم پێ فرۆشتی»؛ هەروەها، شەرتە ئەو شتەی ماڵەکەی پێ ئەفرۆشرێ، مەعلووم بێ یا بە چاو، یا بە ئەندازەو سیفەت؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك شتێکی فرۆشت بە سەنگی فڵانە بەرد لە ئاڵتوون، یا بە پڕی فڵانە هۆدە لە گەنم، ئەوە ئەو فرۆشتنە دانامەزرێ؛ بەڵێ، ئەگەر فرۆشتی بە پڕی گونیەیەك لە گەنم و مەعلووم بوو ئەوگونیەیە چەند ئەگرێ، ئەوە ئەو فرۆشتنە دائەمەزرێ؛ هەروەها، ئەگەر ئەندازەی قورسی بەردە کە مەعلووم بوو، وەك هۆقەو نیو هۆقە، ئەوەیش هەر دروستە.

وە دروست نییە فرۆشتنی شتێك بە دە دینارو درەم، ئەگەر دیاری نەکرێ دینارەکان چەندو درەمەکان چەندن؛ هەروەها، دروست نییە، بڵێ: «ئەو ماڵەم پێ فرۆشتی بەو نرخە کە فڵانکەس ئەسپەکەی خۆی پێ فرۆشتووە»، مادام نەزانرێ نرخی ئەسپەکەی ئەو کابرا چەند بووە. دروستە فرۆشتنی قزناخێك لە خەرمانێك، خواه بزانرێ خەرمانەکە چەند قزناخە یا نە؛ هەروەها، دروستە فرۆشتنی خەرمانێك لەسەر حیسابی قزناخێ بەوەندە، هەر چەندی لێ دەربچێ.

ئەگەر کەسێك بەشێکی هەبوو لەماڵێکا و ویستی بیفرۆشێ، ئەگەر ئەو بەشە لای خۆیو ماڵ‌کڕەکە مەعلووم بوو، ئەوە فرۆشتنی دروستە، ئەگینا دروست نییە تا دەرئەکەوێ چەندە؛ بەڵێ، کابرا ئەتوانێ ئەو بەشە نادیارییەی خۆی نەزر بکا لە کەسێك‌و ئەویش ئەندازەیەك پارە نەزر بکا لەو؛ ئەم جۆرە نەزر کردنە، رێگایە بۆ تەسلیم کردنی هەرچی کە فرۆشتنی دروست نەبێ، وەك ماڵی لە بەر چاو نەبوو یا زەوت‌کراو، یا ماڵێ کە عەینەکەی پیس بێ، یا بە کارهێنانی حەرام بێ، وەك لە پێشەوە باس کران؛ هەروەها، رێگەیەکی تریش هەیە بۆ فرۆشتنی بەشی دیاری نەکراو، ئەوەش، بریتییە لەوە کە کابرا هەموو ماڵە موشتەرەکەکە بفرۆشێ، بە بەشی خۆیو بەشەکەی ترەوە؛ ئەوە ئەو فرۆشتنە لە بەشەکەی خۆیدا دائەمەزرێو لە بەشەکەی تردا بەتاڵە، وەك گێڕراوەتەوە لە «قَفّال»ەوەو گەلێك لە زانایانی مەزهەبی شافیعی رایان لەسەرداوە.

ئەگەر کەسێك بیرێك یا کارێزێك یا جۆگەیەکی فرۆشت بە کەسێك، ئەوە ئەو فرۆشتنە دروستە و ئاوەکەشی داخڵ ئەبێ لە فرۆشتنەکەدا وە ئەگەر فرۆشیار ناوی ئاوەکەشی برد، ئەبێ ناوی ئەو ئاوەش ببا کە لە کاتی فرۆشتنەکەدا لەویا هەیە، ئەگینا موعامەلەکە دانامەزرێ، چونکە ئەو ئاوەی لەو کاتەدا لەویا هەیە هی فرۆشیارەکەیە و تێکەڵی ئاوی تازە هاتوویش ئەبێ کە ئەبێ بە موڵکی کڕیارەکە و بەهۆی ئەمەوە، موڵکی کڕیارو فرۆشیار تێکەڵ بە یەك ئەبنو لە یەك جیا ناکرێنەوە.

ئەگەر کەسێك ماڵێکی فرۆشت بە درەم یا قران یا دینار، وە لەو وڵاتەدا یەك جۆر لەو نەختانە هەبوو، ئەوە فرۆشتنەکە دائەمەزرێ وە ئەگەر دوو جۆری هەبوو، وەك گەورەو بچووك، ساغو مەخشووش، لەم سوورەتەدا ئەگەر یەك لەو دووجۆرە زۆرتر باو بوو، ئەوە حەمڵ ئەکرێتە سەر ئەویانە کە باوترە وە ئەگەر هەردوو جۆرە کە وەك یەك مامەڵەیان پێ ئەکراو قیمەتیشیان وەك یەك وابوو، ئەوە فرۆشتنە کە دائەمەزرێو بە ئارەزووی کابرای فرۆشیارە کام نەختیان وەرئەگرێ؛ بەڵام ئەگەر لە قیمەتا فەرقیان هەبوو، پێوستە فرۆشیار جۆرێکیان دیاری بکاو ناوی ببا، ئەگینا فرۆشتنەکە بەتاڵە.

**بزانن!** ئەو چاو پێ کەوتنەی کە پێویستە بۆ ئەوماڵەی ئەفرۆشرێ، بی‌پێی ماڵە کە ئەگۆڕێ؛ ـ مەسەلا ـ لە فرۆشتنی کاغەزدا هەردوو رووی کاغەزەکە تەماشا ئەکرێ، وە لە فرۆشتنی خانوودا دیوارو سەرمیچو حەوش‌و هەیوان‌و داڵان سەیر ئەکرێ، وە لە فرۆشتنی سەعاتدا، تەماشای ئەو شوێنانەی ئەکرێ کە بە بێ‌لێك کردنەوە دەرئەکەوێ؛ ئیتر تەماشای بناغەی خانوو یا وردە مەکینەی سەعات پێویست نییە؛ جا ئەگەر ئەو شتە کە ئەفرۆشرێ بینرابوو لە پێش فرۆشتنەکەیدا بە ماوەیەکی‌وا کە بە عادەت ئەو شتەی تیا نەگۆڕێ، ئەوە ئەو دیتنە بەسە؛ ئەگینا، پێویستە سەرلەنوێ تەماشای بکرێتەوە. تەماشای بەشێکی کەمی ماڵە فرۆشراوە کە بەسە، ئەگەر ببێ بە نموونە بۆ ئەوی کەی، وەك مشتێك لە فەردە گەنمێك؛ هەروەها، بەسە چاو پێ کەوتنی پێستێك کە هۆی پاراستنی ناوەکەی بێ، وەك توێکڵی هەنارو هێکڵەو توێکڵی بنەوەی گوێز و بادام و شتی‌وا.

## باسی سوود (ربا)

سوود لە عورفی شەرعدا، بریتییە لەوە کەسێك ماڵێکی زیادە وەربگرێ لە موعامەلەیەکدا، بەبێ ئەوەی لەبەرابەریا هیچ‌بدا. سوود لە قەرزدا ئەبێ‌و لە کڕین‌و فرۆشتندا؛ سوود لە قەرزدا دووجۆرە؛ یەکەم، ئەوەیە ـ مەسەلا ـ دینارێك بدەی بە قەرز بە کەسێك بە دینارێك‌و درەمێك بەوادەی مانگێك؛ دووهەم، ئەوەیە دینارێکی بدەیتێ بە دینارێك‌و درەمێك بە وادەی ساڵێك وە ئەگەر لە ئاخری ساڵەکەدا نەیبوو قەرزەکە بداتەوە، مۆڵەتی ساڵێکی تری بدەیت‌و سوودەکەشی لە سەر زیاد بکەی؛ لەم جۆرەیە ئەوەی کە لە پێش پەیدا بوونی ئایینی ئیسلامدا باو بووە، یەکێك قوماشێك یا خواردەمەنییەکی فرۆشتووە بە یەکێکی‌تر بە دینارێك بۆ وادەی ساڵێك وە لە ئاخری ساڵا ئەگەر پارەکەی نەبووبێ، خاوەن قەرزە کە وادەکەی بۆ درێژ کردووەتەوەو سوودێکی لە سەر قەرزەکە داناوە و هەموو ساڵێ بەم جۆرەی کردووە تا کابرا قەرزەکەی داوەتەوەو بەرامبەر بە شتێکی کەم، زیانێکی قورسی لێ کەوتووە؛ هەروەها،

ڕێ‌کەوتووە پارەیەکیان داوە بە یەکێك بە قەرز بە وادەیەك و لە ئاخری وادەکەدا ئەگەر نەیبووبێ قەرزەکە بداتەوە، سوودەکەیان لەسەر زیاد کردووەو وادەکەیشان بۆ زۆر کردووە؛ ئەو سەردەمە، بەم جۆرە موعامەلەیە، وتراوە: «رِبا النّسیئة».

سوود لە کڕین‌و فرۆشتندا لە دوو شتا هەیە؛ لە ماڵی نەختدا، وەك ئاڵتوون‌و زیو و لە خواردەمەنیدا، وەك گەنم‌و برنج‌و ڕۆن‌و میوەو گۆشت‌و خوێ‌و شتی‌وا؛ ئەم سوودە، سێ جۆرە:

یەکەم، موعامەلە بە زیادە، وەك ئەوە ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتوون کە سەنگەکەی مسقاڵێك بێ، بیدەی بە مسقاڵ‌و نیوێك ئاڵتوون بە حازری، یا دوو کیلۆ گەنمی قەندەهاری بدەی بە سێ کیلۆ گەنمە زەرد کە بە حازری؛

دووهەم، ئەوەیە زیادە لەناوا نەبێ، بەڵام لە موعامەلەکەدا وادە دانرێ بۆ وەرگرتنی نرخی فرۆشراوەکە، وەك ئەوە کە دە درەمی حازر بفرۆشرێ بە دە درەمی تا سەری مانگ؛

سێهەم، ئەوەیە نە زیادە لە مامەڵەکەدا هەبێ‌و نە وادەیش دانێن بۆ وەرگرتن، بەڵام لە مەجلیسی مامەڵەکەدا هەر کەس حەقی خۆی وەرنەگرێ، وەك ئەوە یەکێك دینارێك بفرۆشێ بە دینارێکی حازر، بەڵام مەجلیسەکە بەجێ‌بێڵن بە بێ ئەوە کە هەر کەس حەقی خۆی وەربگرێ؛ جۆری یەکەم، مەشهوورە بە «رِبا الْفَضل» لەبەر زیادەکە؛ جۆری دووهەم، مەشهوورە بە «رِبا النَّسا» لەبەر دواکەوتنی وادەی وەرگرتنی نرخەکە؛ جۆری سێهەم، مەشهوورە بە «رِبا الیَد» لەبەر ئەوە کە حەقەکان دەس بە دەس وەرنەگیراون؛ ئەم جۆرانە، هەموویان حەرامن و مایەی تاوانبارین.

وەك وتمان، هۆی پەیدابوونی سوود ئەوەیە ئەو دووشتەی ئەدرێن بە یەکتر، هەردووکیان خواردەمەنی بن، وەك گەنم‌و جۆو برنج‌و شتی‌وا، یا هەردووکیان نەخت بن، وەك ئاڵتوون و زیو؛ جا ئەو دووشتە، ئەگەر هاوجینس بوون، وەك گەنم بە گەنم‌و جۆ بە جۆو ئاڵتوون بە ئاڵتوون‌و زیو بە زیو، ئەوە بۆ دامەزرانی ئەو موعامەلەیە، سێ شەرت پێویستە:

یەکەم، ئەوەیە ئەو دوو شتەی ئەدرێن بە یەکتر، ئەوەندەی یەك بن؛

دووهەم، ئەوەیە هەردووکیان حازر بن؛

سێهەم، ئەوەیە هەردوو کەسەکە حەقی خۆیان لەو مەجلیسەدا وەربگرن؛ ئەگەر دوو شتەکە هاوجینس نەبوون بەڵام هەردووکیان خواردەمەنی بوون، وەك گەنمو جۆ، یا نەخت بوون، وەك ئاڵتوونو زیو، ئەوە تەنها دوو شەرتە دواییەکە پێویستەو بەس و شەرت نییە ئەوەندەی یەك بن؛ کەواتە، دروستە مەنێك گەنم بدرێ بە دوو مەن جۆ وە مسقاڵێك ئاڵتوون بدرێ بە چەند مسقاڵ زیو، بەو شەرتەکە هەردووکیان حازر بن و مامەڵەچییەکان پاش وەرگرتنی حەقی خۆیان لە یەك جیاببنەوە وە ئەگەر هاوجینس نەبوون و هۆی سوود (عِلّة الرّبا)یشیان یەك نەبوو، ئەوە بۆ بەیەك دانیان هیچکام لە سێ شەرتەکە پێویست نییە.

بزانن! هەموو جۆرێکی گەنم بە یەك جینس دائەنرێ ئەگەرچی جۆرێکیان لە جۆرێکیتریان خۆشترو باشترو ئارەزوو لێکراوتر بێ؛ هەروەها، هەموو جۆرێکی جۆو گەنمە شامیو برنجو شتیوا؛ وە گەنمە شامیو زەڕاتە عەرەبیلە، دوو جینسی جیان لەیەك.

کە وتمان خواردەمەنی، هەموو ئەو شتانە ئەگرێتەوە کە قووت بن، وەك گەنمو برنجو جۆ، یا میوە بن، وەك هەنجیرو ترێ و هەنارو سێو، یا خواردنو خواردنەوەیان پێ ئامادە بکرێ، وەك خوێو زەردەچەوەو زەنجەفیلو ئەم جۆرەشتانە. ئاردیش بە گوێرەی ئەسڵەکەی تەماشای ئەکرێ؛ کەواتە، ئاردی گەنمو ئاردی جۆ، دوو جینسی جیاوازن؛ هەروەها، هەرچی کە لە شتێکیتر هێنرابێتە بەرهەم، تەماشای ئەسڵەکەی ئەکرێ؛ کەواتە، سرکەی مێوژو خورما و گۆشتی مانگاو بزنو شیری بزنو مانگا، بە جیاواز دائەنرێن چونکە ئەسڵەکەیان لە دوو جینسی جیاوازن، وە لە کاتی فرۆشتنا ئەگەر یەکێکیان زیاتر بێ لەویان، زیان نابەخشێ؛ بەڵێ گۆشتی مەڕوبەرانو کاوڕو بەرخ، لە یەك جینسن [و] هەروەها، گۆشتی گاو مانگاو گوێرەکە؛ گۆشتی بزنو سابرێن و گێسكو کارژەلەیش، لە یەك جینسن، وە زیادو کەم لەبەینیانا دروست نییە، بەڵام گۆشتی دوو جینسی جیاجیا، زیادو کەمیان تیا دروستە.

هەر شتێك کە بپێورێ، ئەبێ بە پێوانـە ئـەوەندەی ئـەوی‌تر بـێ و هـەرشتێك کـە بکێشرێ، ئەبێ بە کێشانە ئەوەندەی ئەوی‌تر بێ و لەمەدا، ئەگەڕێینەوە سەر ڕەوشتی خەڵکی حیجاز لە زەمانی پێغەمبەرداﷺ وە ئەگەر نەمانزانی ئەوان لەو زەمـانەدا بـە پێوانە یا بە کێشانە موعامەلەیان پێ کردووە، سەیری عادەتی ئەو شوێنە ئەکەین کـە موعامەلەکەی تیا ئەکرێ.

فرۆشتنی نەخت بە نەختیش، وەك فرۆشتنی خواردەمەنییە بە خواردەمەنی؛ ئەگەر کەسێك خۆراکێکی فرۆشت بە خۆراکێکی لە جینسی خۆی، بە گۆتـرە، ئـەوە ئـەو فرۆشتنە دانامەزرێ، هەرچەند لە ڕاستی‌دا ئەوەندەی یەکیش بن.

هەرچی تەڕ بێ، ئەبێ وشك ببێتەوە بە بێ هێزی ئاگر، ئەوسا ئەتوانین بیپێوین یا بیکێشین‌و لەگەڵ هاوجینسی خۆیا بەوەندەی یەکیان دانێین؛ کەواتە، ئەبێ ڕوتاب ببێ بە خورماو ترێ بکرێ بە مێوژو ئەوجا هەرکامیان بدرێ بە هاوجینسی خۆی؛ بەڵام ئەو سەوزییانەی کە وشك ناکرێنەوە، وەك خەیار و ترۆزی‌و شتی‌وا، ئەوە هەر بە تەڕی ئەگۆڕرێنەوە بە یەکتر؛ هەندێ لە زانایان فتوایان داوە گۆشتیش هەر بە تەڕی ئەفرۆشرێ بە گۆشتی‌تر و ئەم فتوایە لە «شیروانی»دا بە فتوایەکی بەجێ دانراوە.

**ئاگاداری!** دروستە تا پێنج ویسق کە بە سەنگ‌و ترازووی لای خۆمـان ئـەکـاتە دووسەدو بیست‌و پێنج تەورێزی، ڕوتاب بدرێ بە خورما و ترێ بدرێ بە مێوژ بـۆ ئەوەی ئەوانەی کە خۆیان باخیان نییە، ڕوتاب‌و ترێیان دەس بکەوێ بۆ ماڵ‌و مناڵیان؛ لەم حاڵەدا، ڕوتاب‌و ترێکە بە دارەوە ئەمێننەوە تا وردە وردە ئەکرێنەوەو ئەخورێن و ئەبێ هاوئەندازەیی ڕوتاب‌و خورماو ترێ‌و مێوژەکە بە تەخمین بێ.

هاو ئەندازەیی دانەوێڵە، وەك گەنم‌و جۆو شتی‌وا، لەو کاتەدا تەماشا ئەکـرێ کـە دەنکەکەی ڕەق بووبێ و بۆ هەر دانەیەك کە ڕۆنی لێ بگیرێ وەك کونجی، هەم بەوەش ئەبێ کە دانەکەی ڕەق بووبی، هەم بەوەش ئەبێ کە ڕۆنەکەی بگیرێ و بۆ ترێ، هەم بە مێوژیش ئەبێ‌و هەم بە سرکەییش و لە شیردا، هەم بە شیریش ئەبێ و هەم بە ژەنراویش، واتە بە دۆیی، بەو شەرتە ئاوی تێ‌نەکرابێ‌و ڕۆنەکەی لێ دەرهێنرابێ؛ بەڵام ئیمامی

«سُبْکی»، فەرموویە: ئەگەر ئاوێکی کەمی تێبکرێ، زیان نابەخشێ؛ هاوئەندازەیی پەنیرو کەشكو دۆ وشکە، کەڵکی نییە؛ هەروەها، هاوئەندازەیی هەرچی کە ئاگر کاری تێ کردبێ بە کوڵاندن یا برژاندن یا سوورەوە کردن، مەگەر کارتێکردنێکی کەم بۆ پاڵاوتنی هەنگوین یا هەڵقرچاندنی دووگو گرتنی رۆنەکەی.

هەر موعامەلەیەك دوو جینسی تیابوو لەو جینسانەکە سوودیان تیایەو جینسەکان جیاواز بوون، وەك کیلۆیەك خورماو درەمێك، بە کیلۆیەك خورماو دەرمێك، ئەوە ئەو موعامەلەیە دانامەزرێ؛ کەواتە، دروست نییە فرۆشتنی ئاڵتوونی ساغ بە ئاڵتوونێك کە زەردو شتیوای تیابێ، وەك ئەو خشڵانە کە برنجەو شتیوایان تێکەڵ ئەکەن؛ لە سوورەتیوادا، پێویستە ئەو جۆرە خشڵانە بە زیو بفرۆشرێن تا جینسەکەیان جیا بێ لە یەك وکەم و زیادی تیا دروست بێ. دروست نییە فرۆشتنی گۆشت بە حەیوانی زیندوو یا مردوو لە جینسی خۆی یا لە جینسێکی تر، ئیتر گۆشتی بخورێ یا نە.

## باسی هەندێ موعامەلەکە نەهییان لێ کراوە

ئەم موعامەلانە، دوو بەشن؛ بەشێکیان بەتاڵن لە بەر ئەوە کە نەهیەکە لەبەر بەجێهاتنی روکنێك یا شەرتێکی ئەو موعامەلەیەیە و بەشێکیان بەتاڵ نین، چونکە نەهیەکە لەبەر شتێکە کە پەیوەندی بە موعامەلەکە خۆیەوە نییە. لە بەشی یەکەمە، فرۆشتنی «ئاوی نێر»، یەعنی حەقی پەڕینی ئەسپ لە ماین ـ مەسەلا ـ ئەم موعامەلەیە، دانامەزرێو وەرگرتنی پارەی ئەو فرۆشتنەش حەرامە؛ هەروەها، فرۆشتنی بەچکەی بەچکە وەك عادەت بووە لەناو عەرەبا فرۆشتوویانە و فرۆشتنی شتێك بە قیمەتێك بەوادەی ئەوە کە فڵانە حەیوان بزێو بەچکەی ئەو بەچکەیەش لە دایك ببێ و فرۆشتنی بەچکە لە سکی دایکیا و فرۆشتنی توو لە پشتی نێردا و فرۆشتنی شتێك بەوجۆرە کە کڕیارەکە دەسبکوتێ لە شتە کڕراوەکە، جا بیکڕێ، لەسەر ئەساسی ئەوە ئەگەر چاوی پێ کەوتو دڵی نەیگرت، حەقی پەشیمان بوونەوەی نەبێ، یاخود کابرای فرۆشیار بە کڕیارەکە بڵێ: هەرکاتێك دەست لێدا، پێمفرۆشتی بەوەندە؛ هەر لەم

بەشەیە فرۆشتنی شتێك لەسەر ئەساسی ئەوەکە فڕێدانی ئەو شتە لەلای فرۆشیارەوە بۆ کڕیارەکە بە فرۆشتن دابنرێ وە بەردە فرۆش (بيعُ الحَصاة) بەو رەنگە کە فرۆشیارەکە بڵێ: ئەم بەردە فڕێ ئەدەم، کەوتەسەر هەرکام لەو جلانە، ئەوەیانم پێ‌فرۆشتی، یاخود هەر بەرد فڕەدانەکە بە فرۆشتن دابنرێ بە بێ‌سیغە، یاخود بڵێ: پێم‌فرۆشتی لەسەر ئەو قەرارە تا ئەو بەردە فڕێ‌ئەدەم، حەقی پەشیمان‌بوونەوەت ببێ. وە دوو فرۆشتن لە یەك موعامەلەدا، وەك ئەوەکە فرۆشیار بڵێ: ئەو ماڵەم پێ‌فرۆشتی بە دینارێکی حازر یا دوو دینار بەوادەی مانگێك ـ وەك لەپێشەوە باسمان کرد ـ لەبەرئەوە کە سیغەکە بە تەردیدەوەیەو دوودڵی تیایە.

هەر لەم جۆرەیە کە دانامەزرێ، فرۆشتن بە شەرتی فرۆشتن، خوا ئەم شەرتی فرۆشتنە بە ئاشکرا باس کرابێ، یا لە مەعنای سیغەی موعامەلەکە دەرکەوێ، وەك ئەوە کە بڵێ: وا ئەم ماڵەم پێ‌فرۆشتی بەوەندە، بەوقەرارەکە تۆیش خانووەکەتم پێ‌بفرۆشی بەوەندە وە فرۆشتن بە شەرتی قەرز یا هەر شەرتێکی‌تر، وەك ئەوەکە فرۆشیار بڵێ: وا ئەو خانووەم پێ‌فرۆشتی بەوەندە، بەو شەرتە تۆیش ئەوەندە دینارم بە قەرز بدەیتێ، یا خانووەکەتم بە کرێ بدەیتێ. فەرقی نییە بۆ دانەمەزرانی فرۆشتن بەشەرت، ئەوە کە شەرتەکە لەلایەن فرۆشیارەوە بێ، وەك لەو میسالانەدا کە باسمان کردن، یا لەلایەن کڕیارەوە بێ، وەك ئەوە کە بڵێ: ئەو دەغڵەم لێ کڕیت بەوندە، بەو شەرتە کە بۆم درەو بکەیت، یا ئەو قوماشەم لێ کڕیت، بەو شەرتە بۆم بدووری؛ بەڵێ، چەند حاڵەتێك هەیە جیاکراونەتەوە لە مەسەلەی فرۆشتن بە شەرت [کە] ئەو حاڵەتانە، دروستن، وەك فرۆشتن بە شەرتی حەقی پەشیمان بوونەوە تا سێ رۆژ بۆ فرۆشیار یا کڕیار یا هەردووکیان، وە وەك ئەوە فرۆشیار ماڵەکەی بفرۆشێ بەو شەرتە کە حەقی بەسەر عەیبیەوە نەبێ‌و بە هۆی عەیبەوە نەدرێتەوە بەسەریا، وەك لەمەولا باسی ئەکەین، وە وەك فرۆشتنی میوەی باخێك بەو شەرتە کە کڕیار بیبرێتەوە، وە وەك فرۆشتنی شتێك بەقەرز بە شەرتی ئەوە لەوادەیەکی دیاری کراودا پارەکەی بدا، یا شتێك لای فرۆشیار دابنێ بە رەهن لەجیاتی ئەو پارەیە تا تەسلیمی ئەکا، یا فلانکەس ببێ بە کەفیلی ئەو

پارەیە، یا بە شەرتی ئەوە چەند کەس شاهیدی ئەو موعامەلەیە بن؛ ئەمجۆرە کڕین‌و فرۆشتنانە، دروستن لەبەر ناچاری و بەهۆی ئەوەوە کە فرۆشیار پێویستی پێیان هەیە.

جا ئەگەر لەپاش فرۆشتنەکە، کابرای ماڵ‌کڕ رەهنی دانەنا لە جیاتی ئەو حەقەی لە ئەستۆیدایە، یا رەهنی دانا بەڵام عەینی ئەو شتە نەبوو کە فرۆشیارەکە دیاریی کردبوو، یا خود کابرای دیاری کراو نەبوو بە کەفیل، یاخود کابرای ماڵ‌کڕ شاهیدەکانی نەهێناو ئیقراری بە موعامەلەکە نەکرد لەلایان، ئەوە لەم سوورەتانەدا فرۆشیارەکە ئەتوانێ موعامەلەکە هەڵوەشێنێتەوە و ماڵەکەی خۆی نەدا بە کابرای کڕیار؛ بەڵام لە مەسئەلەی وەعدە دیاری کراوەکەدا، ئەگەر کڕیار پارەکەی نەدا، فرۆشیار بۆی نییە موعامەلەکە هەڵوەشێنێتەوە و ئەتوانێ بە زۆری حاکم ئەو پارەیە لەو وەعدەیەدا وەربگرێ لە کڕیار وە ئەگەر لە موعامەلەکەدا شەرتێکیان کرد کە کردن‌و نەکردنی فەرقی نەبوو وە لە عەقدی موعامەلەکە خۆیەوە پەیدا ئەبوو، وەك ئەوەکەکڕیار ماڵەکە وەربگرێ، یا ئەگەر عەیبدار بوو بیگێڕێتەوە بۆ فرۆشیار، یا شەرتێکی‌وایان کرد کە سوودێکی تیا نەبوو بۆ کەسیان، وەك ئەوە کە ئەو حەیوانە فلانە گیا بخوا، ئەوە دروستە و شەرتەکە زیان ناگەیەنێ.

ئەگەر شەرتی شتێکی‌واکرا کە مەبەست بوو، وەك جووت کردنی ئەو گاجووتە، یا وەك ئەوە کە ئەو مەرە ئاوس بێ یا شیرا بێ، ئەمەیش هەر دروستە و کڕیار ئەتوانێ ماڵەکە بداتەوە بەسەر خاوەنەکەیا ئەگەر ئەو شەرتەی تیا نەهاتەدی وە ئەگەر قسەیان یەکی نەگرت لەوەدا کە ئاخۆ شەرتەکە هاتووەتە دی یا نە، ئەوە سوێندی کڕیارەکە ئەدرێ لەسەر ئەوە کە شەرتەکەی تیادا نەهاتووەتەدی و کە سوێندی خوارد، ماڵەکە ئەدرێتەو بەسەر فرۆشیارەکەدا، بەڵام ئەگەر ماڵەکە لای کڕیار عەیبدار بووبوو، وەك شەل‌بوونی حەیوان، ئەوە رێگا لەوە ئەگرێ کە ماڵەکە بدرێتەوە بەسەر فرۆشیارەکەدا؛ بەڵێ کڕیار ئەتوانێ تۆڵەی عەیبی کۆن لە فرۆشیار وەربگرێ‌و ماڵەکەی نەداتەوە بەسەردا؛ حەقی پەشیمان بوونەوەی کڕیار، حەقێکی دەس‌بەجێیە، ئەگەر پاش پێ‌زانین تەفرەی دا، حەقی نامێنێ، مەگەر بڵێ کوت‌وپڕ پێم‌نەزانیوەو لەو نەزانینەدا بیانووی هەبێ. ئەگەر کەسێك حەیوانێکی ئاوسی فرۆشت، ئەوە سکەکەشی بەر فرۆشتنەکە ئەکەوێ بەو شەرتە کابرای فرۆشیار بە تایبەتی ناوی سکەکەی نەهێنابێ لە

فرۆشتنەکە ئەکەویٰ بەو شەرتەکابرای فرۆشیار بە تایبەتی ناوی سکەکەی نەهێنابیٰ لە فرۆشتنەکەدا، چونکە ئەگەر وتبێتی: وا ئەو حەیوانەو سکەکەیم پیٰ فرۆشتی، ئەو فرۆشتنە دانامەزریٰ، چونکە وەزعی هەندێکی ـ وەك بەچکەی ناوسکی حەیوانەکە بیٰ ـ دیاری نییە؛ هەروەها، ئەگەر تەنها سکەکەیشی بفرۆشیٰ، ئەو موعامەلەیە دانامەزریٰ، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد؛ هەروەها، فرۆشتنی حەیوانەکەش بەتەنها دانامەزریٰ، یەعنی جیای بکاتەوە لە سکەکەی‌و بلیٰ: ئەو حەیوانە ئاوسەم پیٰ‌فرۆشتی بێجگەلە سکەکەی و سکەکەی بۆ خۆم بیٰ.

بەشی دووهەمی ئەو موعامەلانە کە نەهییان لیٰ کراوە، ئەوەیە موعامەلەکە خۆی بەتاڵ نییە، بەڵام کابرا لە خەریك‌بوونی موعامەلەکەدا گوناهبار ئەبیٰ، لەبەر ئەوە کە نەهیەکە رووی کردووەتە شتێکی خارج لە شەرت‌و روکنی ئەو موعامەلەیە، وەك ئەوە کە شارستانی شت بۆ لادێیی بفرۆشی پاش ئەوەی کە بێتە ناو شار بە ماوەیەك؛ مەسەلا، کابرایەکی لادێیی حەیوان یا رۆن یا هێلکەو شتی‌وا ئەهێنیٰ بۆ شار، دوکانداریٚکی شارستانی لەولاوە پەیدا ئەبیٰ پێی ئەڵیٰ: ئێستا ئەم شتەت مەفرۆشە، دای‌بنیٰ لای من، بە مۆڵەت بۆت ئەفرۆشم بە نرخێکی گرانتر لە نرخی ئەمڕۆ وە وەك ئەوەکە شارستانی بڕوا بەپیری لادێییەوەو لەپێش‌ئەوەداکە بگاتە شارو نرخ تیٰ‌بگا، ماڵەکەی لیٰ بستێنیٰ؛ ئەمە، هەرچەند موعامەلەکە دائەمەزریٰ، بەڵام حەرامە و هەرچی وەختێك لادێییەکە لە زیانی خۆی ئاگادار بوو، ئەتوانیٰ پەشیمان بێتەوەو ماڵەکەی وەربگرێتەوە.

«اِحتِکار»، حەرامە کە ئەوەیە کەسێك لە گرانییا قووت بکڕیٰ و هەڵی بگریٰ بۆ ئەوەی بە گرانتر بیفرۆشیٰ؛ بەڵام ئەگەر ماڵەکە هەر هی خۆی بوو، یاخود لە هەرزانییا کڕیبووی، ئەوە حەرام نییە هەڵی بگریٰ تاکاتێك کە خەڵك زۆر پێویستیان پیٰ‌ئەبیٰ؛ ئەو کاتە، واجبە هەرچەندی زیاد بیٰ لە پێویستی خۆی، بیفرۆشی.

حەرامە سەودا لەسەر سەودای غەیر لەپاش بڕیاردانی نرخ ـ مەسەلا ـ کەسێك بیەویٰ ماڵێك بکڕیٰ بە چەند دینارێك، ئەمیش راست بێتەوەو بلیٰ بە کڕیارەکە: من وێنەی ئەو ماڵەت پیٰ‌ئەفرۆشم بە هەرزانتر، یا چاکتر لەوەت پیٰ‌ئەفرۆشم بەونرخە و

قسەکەی بکا بە راست.

فرۆشتن بەسەر فرۆشتنی کەسێکی ترا حەرامە لەپێش تەواوبوونی ماوەی پەشیمان بوونەوەدا، بەوجۆرە کە بڵێت بە کڕیارەکە: پەشیمان ببەرەوە! من هینەکەی خۆمت پێ ئەفرۆشم؛ هەروەها، حەرامە کڕین بەسەر کڕینی یەکێکی تردا، بەوجۆرە کە بڵێت بە فرۆشیارەکە موعامەلەکەی هەڵوەشێنێتەوەو پەشیمان ببێتەوە بۆ ئەوەی کە خۆی لێی بکڕێ بە گرانتر.

مەغروورکردنو تەفرەدانی خەڵك حەرامە، بەو رەنگە کە نرخی ماڵێکی فرۆتەنی زیاد بکا نەك لەبەر ئەوە کە ئارەزووی لە کڕینیەتی، بەڵکوو بۆ ئەوە کە کڕیار هەڵ بخەڵەتێنێ، یا بۆ ئەوە کە قازانج بە فرۆشیار بگەیەنێ و کارێك بکا ماڵەکەی بۆ بفرۆشرێ؛ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە: لەم حاڵەتەدا، کابرای کڕیار کە بەم فڕوفێڵەی زانی و تێ گەیشت خەڵەتاندوویانە، ناتوانێ پەشیمان ببێتەوە، چونکە ئەبوو لە کاتی خۆیدا ورد بوایەتەوەو گوێی خۆی نەخستایەتە مشتی کەسێکی تر.

فرۆشتنی روتابو ترێ حەرامە بە کەسێك کە لەو باوەڕەدا بین ئەیکا بە شەراب؛ هەروەها فرۆشتنی ئاورێشم حەرامە بە پیاوێك کە خۆی لەبەری بکا؛ فرۆشتنی چەکیش حەرامە بە کەسێك کە بە کاری بهێنێ بۆ خراپەو دزیو جەردەیی پێ بکا؛ بەڵێ، دروستە موعامەلە کردن لەگەڵ کەسێك کە ماڵی تێکەڵ بێ لە حەڵاڵو حەرام، مادام نەزانین عەینی ئەو شتەی کە ئەمانداتێ لە حەرامەکەیەتی، ئەگینا هەر موعامەلەیەك کە بەو عەینە بکرێ، دانامەزرێ، چونکە ماڵی خۆی نییە و تەسەڕوف تیاکردنی بەتاڵە.

## باسی فرۆشتنی شتی تێکەڵ لە حەڵاڵ و حەرام

ئەگەر کەسێك سرکەو شەرابی بەیەکەوە فرۆشت، یا ماڵی خۆیو کەسێکی تری فرۆشت بە بێ ئیزنی ئەو کەسە، یا ماڵێکی تێکەڵاوی خۆیو یەکێکی تری فرۆشت بێ ئەوەی ئەو رێگای دابێ، ئەوە هەر فرۆشتنی سرکەکەو بەشەکەی خۆی دروستە و

هی شەرابەکەو بەشی کابرای تر دانامەزرێ؛ بەنیسبەت کابرای کڕیاریشەوە، بە ئارەزووی خۆیەتی، ئەگەر رازی نەبوو، ئەتوانێ موعامەلەکە هەڵوەشێنێتەوە وە ئەگەر رازی بوو، ئەوە ئەو بەشەی کە فرۆشتنەکەی دامەزراوە، لە سەری دائەمەزرێ بە بەشێك لەو نرخەی کە موعامەلەکەی پێ کراوە بە گوێرەی نرخی بازار لەو رۆژەدا؛ کەواتە، ئەگەر بەشەکەی کابرای فرۆشیار لە بازاڕدا بایی دوو دینار و بەشی کابراکەی‌تر بایی چوار دینار بوو، ئەبێ کڕیارەکە سێ یەکی سەرجەمی نرخەکە بدا بە فرۆشیارەکە. هەروا، ئەگەر بەیەك موعامەلە کابرایەك دوو بزنی فرۆشت بە یەکێك و لە پێش ئەوەداکە کڕیارەکە وەریانبگرێ، یەکێکیان مرد، ئەوە کابرای کڕیار بەئارەزووی خۆیەتی یا موعامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوە، یا بە گوێرەی نرخی بازاڕ پارەی بزنە ماوەکەیان بدا بە فرۆشیارەکە.

ئەگەر کەسێك لە موعامەلەیەکدا دوو شتی‌وای یەك خست کە حوکمیان جیا بێ لەیەك، وەك فرۆشتن‌و بەکرێدان (إجارة) یا فرۆشتن‌و سەلەم، ئەوە هەردووکیان دائەمەزرێن‌و پارە ناوهێنراوە کە دابەش ئەکرێ بەسەر هەردووکیانا؛ مەسەلا، ئەگەر کەسێك بڵێ ئەو ئەسپەم پێ‌فرۆشتی‌و ئەو خانووەم پێدای بەکرێ بۆ ساڵێك، بە چل دینار و لە راستی‌دا قیمەتی ئەسپەکە بیست دینارو کرێی ساڵێکی خانووەکە دە دینار بوو، ئەبێ چل‌دینارەکە بکرێ بە سێ بەشەوە، دوو بەشی بۆ حەقی ئەسپەکەو بەشێکی بۆ کرێی خانووەکە وە ئەگەر لە یەك عیبارەتدا فرۆشتن‌و ژن بەشوودانی یەك خست، ئەوە هیچ قسەی تیا نییە کە ژن بەشوودانەکە دائەمەزرێ و فەرموودەی دیاریتر، ئەوەیە کە فرۆشتن‌و مارەییەکەش دامەزراون و ئەو پارەیەی کە ناوبراوە، بەش ئەکرێ بەسەر «مَهرُ المِثل»ی ژنەکە و قیمەتی ماڵە فرۆشرواەکەدا؛ کەواتە، ئەگەر «مَهر المثل»ەکە دوو ئەوەندەی قیمەتی ماڵە فرۆشراوەکە بوو، دووبەشی پارەکە ئەبێ بە مارەیی و بەشێکی ئەبێ بە قیمەتی ماڵە فرۆشراوەکە.

بزانن! موعامەلە، بە زیاتر لە یەك موعامەلە دائەنرێ ئەگەر لە یەك قیمەت زیاتری تیابوو، وەك ئەوە کە کابرای فرۆشیار بڵێ: وائەم ئەسپەم پێ‌فرۆشتی بە بیست دینارو

ئەم مەرە بە دوو دینار؛ هەروەها، ئەگەر فرۆشیار یا کڕیار لە یەك کەس زیاتر بن، وەك ئەوە کە دوو کەس ئەسپێك بفرۆشن بە یەکێك بە بیست دینار، یا یەك کەس بیفرۆشی بە دوو کەس بەو قیمەتە؛ موعامەلەکە لەم سوورەتانەدا بە دوو موعامەلە دائەنرێ وە ئەگەر دووکەس یەکێکیان کرد بە وەکیل، یا یەکێك دووکەسی کرد بە وەکیل، ئەوە راستتر ئەوەیە کە تەماشای زۆرو کەمی وەکیلەکە ئەکرێ.

## باسی پەشیمان بوونەوە لە مەجلیسدا

حەقی پەشیمان بوونەوە هەیە بۆ هەردوو لا لە هەر موعامەلەیەکداکە گۆڕینەوەیەکی رووت بێ؛ گۆڕینەوەی رووتیش، بریتییە لەو موعامەلەیە کە تێك بچێ بە هۆی خراپی ئەو شتەوە کە لە عیوەزی شتەکەی تردا دراوە، وەك فرۆشتنی نەخت بە نەخت و خواردەمەنی بە خواردەمەنی؛ هەروەها لە سەلەمدا وە لە تەولییەدا ـ کە بریتییە لەوە یەکێ ماڵێك بکڕێ و لە پاشا ئەو موعامەلەیە رووبەڕای یەکێکی تر بکاتەوە و ئەو کەسە بکا بە خاوەنی ئەو موعامەلەیە ـ وەك لەمەولا باسی دێت و لە شەریك کردناکە بریتییە لەوە یەکێ ماڵێك بکڕێ و لە پاشا کەسێکی تر بکا بە شەریکی خۆی لەو موعامەلەیەدا وە لە سوڵحی گۆڕینەوەدا، وەك ئەوە کە یەکێك داوای خانوویەك بکا لە کەسێك و پاش ئەوە کە ئەو کەسە پێی لێ نا ئەو خانووە هی کابرای داواکارە، سوڵحی لەگەڵ بکا لە سەر ئەوە کە شتێکی تری پێ بدا لە جیاتی خانووەکە؛ لە هەموو ئەم جۆرە موعامەلانەدا، هەردوولا حەقی پەشیمان بوونەوەیان هەیە لە مەجلیسی موعامەلەکەدا و هەرکامیان وتی: من پەشیمانم، موعامەلەکە هەڵئەوەشێتەوە؛ بەڵێ، ئەم حەقی پەشیمان بوونەوەیە تەواو ئەبێ بەوەکە هەردوولا بڕیاری ئەوە بدەن کە موعامەلەکەیان دامەزراوە و جێ گیر بووە؛ کەواتە، ئەگەر تەنها یەکێ لەوان ئیختیاری دامەزرانی موعامەلەکەی کرد، ئەوە حەقی پەشیمان بوونەوە بۆ تەنها ئەویانە ئەمێنێتەوە؛ هەروەها، ئەم حەقە ئەبڕێتەوە بەوە کە هەردوو موعامەلەچییەکە، لە یەك جیا ببنەوە، بەو رەنگە کە هەردووکیان لەو شوێنی موعامەلەیە دەرچن هەریەکێ بۆ لایەك، یا خود یەکێکیان بڕواو ئەویان بمێنێتەوە؛

کەواتە، ئەگەر هەردووکیان لە هەمان مەجلیسدا مانەوە، یا هەڵسـان بـەڵام پـێکـەوە ڕۆیشتن، ئەوە تا پێکەوە بن، حـەقی پـەشیمان بـوونەوەیان ئـەمێنـێ؛ لە مـەسەلەی جیابوونەوەدا ئەگەڕێنەوە سەر عورف و عادەت؛کەواتە، جیابوونەوە ئەوەیە کە خەڵك بە جیابوونەوەی دانێن و بەوجۆرە جیابوونەوەیە حەقی پەشیمان بوونەوە نامێنێ.

ئەگەر لە هەمان مەجلیسدا یەکێك لەو دوو موعامەلەچییە مرد یا خود شێت بوو، ئەوە قسەی راستتر ئەوەیە میراتگرانی کابرای مردوو، یا سەرپەرشتیکەری کاروباری کابرای شێت بوو، حەقی پەشیمان بوونەوەیان هەیە، تا هەڵئەسن لەو مەجلیسەدا کە خەبەرەکەیان پێ گەیشتووە تیایدا. ئەگەر موعامەلەچییەکان بوو بە هەرایان، یەکێکیان وتی: جیا بووینەتەوە، ئەویان ئینکاری کرد، بـاوەڕ بـەویانە ئـەکـرێ کـە ئـینکاری جیابوونەوە ئەکا، بەڵام سوێندێکی ئەدرێ، چونکە ئەسڵ ئەوەیە هێشـتا بـەیەکـەوە بووبن و جیا نەبووبنەوە؛ هەروەها، ئەگەر بوو بە هەرایان لە بارەی پەشیمان بوونەوەوە، ئەوە باوەڕ بەویانە ئەکرێ کە ئەڵێ پەشیمان نەبووینەتەوەو سوێندێکی ئەدرێ، چونکە ئەسڵ دامەزرانی موعامەلەکە و پەشیمان نەبوونەوەیانە.

**بزانن!** حەقی پەشیمان بوونەوە نییە لە گەردن ئازاد کردن و لە مارەبڕین و لە مارەیی و لە بەخشینا، چ بەرابەر بە شتێك بێ یا بە خۆڕایی بێ؛ هـەروەها حـەقی پـەشیمان بوونەوە نییە لە وەرگرتنی بەشدا بە «شُفْعة» و لە ئیجارەدا و لە باخەوانیدا کە پێی ئەڵێن: عەقدی «مُساقاة» و بریتییە لەوە کەسێك خزمەتکردنی باخێکی مێو یا خورما بگرێتە ئەستۆ بە بەشێك لە میوەکەی.

## باسی شەرتکردنی پەشیمان بوونەوە

دروستە هەردوو موعامەلەچییەکە، یا یەکێکیان، شەرتی ئەوە بکـەن کـە بـتوانـن پەشیمان بنەوە لەو موعامەلەیە کە ئەیکەن، لە هەموو جۆرە فرۆشتنێکدا، مەگـەر ئـەو فرۆشتنەی کە پێویست بێ تیایدا لە مەجلیسی موعامەلەکەدا عیوەزی ماڵە فرۆشراوەکە وەربگیرێ، وەك فرۆشتنی ئەو شـتانەی کـە سـوودیان تـیایە، هـەروەها سـەلەمیش؛

لەمانەدا، شەرتی پەشیمان بوونەوە دروست نییە. شەرتی پەشیمان بوونەوە نابێ لە سێ ڕۆژ تێبپەڕێ و ئەبێ ماوەکەی دیاری بکرێ ئاخۆ تا سێ ڕۆژە یا کەمتر؛ سەرەتای ئەو ماوەیە، دەس پێ ئەکا لە کاتی کردنی موعامەلەکەوە.

جا ئەگەر تەنها فرۆشیار یاکڕیار شەرتی پەشیمان بوونەوەی کرد، ئەوە لەو ماوەیەدا ماڵەکە بە موڵکی ئەو کەسەیان دائەنرێ کە شەرتەکەی کردووە و ئەگەر هەردووکیان شەرتی پەشیمان بوونەوەیان کرد، موڵکییەتی ئەو ماڵە رائەوەستێنرێ و بۆکەسیان نابێ تا ماوەی حەقی پەشیمان بوونەوەکە دوایی دێ؛ ئەگەر موعامەلەکەیان هەڵنەوەشاندەوە، دەر ئەکەوێ ماڵەکە هی کڕیارەکە بووە وە ئەگەر هەڵیانوەشاندەوە، دیارە هی فرۆشیارەکە بووە و هەر زیادەیەك لەو ماڵە فرۆشراوە پەیدابووبێ، ئەبێ بە هی ئەو کەسەی کە ئەبێ بە خاوەنی ماڵەکە.

هەڵوەشاندنەوەی ئەو موعامەلەیە یا دامەزراندنی، پێك دێت بە قسەیەك کە مەعنای هەڵوەشاندنەوە یا دامەزراندن بگەیەنێت؛ مەسەلا، بڵێ: وا ئەو موعامەلەیەم هەڵوەشاندەوە، یا بەتاڵم کردەوە، یا ئەو ماڵەم هێنایەوە بۆ خۆم یا ئەو موعامەلەیەم دامەزراند، یا بڕیارم لە سەردا، یا بڕیمەوە، یا رەوام بینی.

بزانن! ئەگەر فرۆشیار لە ماوەی حەقی پەشیمان بوونەوەدا ماڵەکەی فرۆشت بە کەسێکی تر، یا دای بە ئیجارە، یا نایە رەهنی خاوەن قەرزێکەوە، یا بەخشی بە کەسێك، یا وەقفی کرد، یا نەزری کرد لە کەسێ، هەرکام لەم تەسەڕوفانەی، دائەنرێ بە پەشیمان بوونەوە لە فرۆشتنەکەی پێشوو؛ بەڵام لە مەسەلەی رەهن و بەخشیندا، پێویستە کابرای رەهن وەرگرتوو و کابرای پێبەخشراو، ماڵەکە وەربگرن؛ هەروەها، قسەی راستتر ئەوەیە ئەگەر کڕیاریش یەکێك لەم کردەوانە بکا، بۆی دائەنرێ بە دامەزراندنی موعامەلەکە؛ بەڵام بە نیسبەت کڕیارەوە، کاتێك ئەتوانێ ئەم جۆرە تەسەڕوفاتە بکاکە حەقی پەشیمان بوونەوە تەنها بۆ خۆی بێ، یا خود فرۆشیار رێگای دابێ، ئەگینا دروست نییە؛ هەروەها، قسەی راستتر ئەوەیە نواندن و پیشاندانی ماڵە فرۆشراوەکە بە نیازی فرۆشتنێکی تازە، نە بە پەشیمان بوونەوە دائەنرێ لە لایەن فرۆشیارەوە، نە بە

دامەزراندن دائەنرێ لە لایەن کڕیارەوە.

**بێداری!** هەروەك شەرت کردنی پەشیمان بوونەوە لە ناو عەقدی موعامەلەکەدا دروستە، لە پاش عەقدەکەش دروستە، بە مەرجێ کە مەجلیسەکەیان بە جێ نەهێشتبێ و جیانەبووبنەوە لە یەك.

## باسی پەشیمان بوونەوە بە هۆی دەرکەوتنی عەیبێکی پێشووەوە

دروستە بۆ کڕیار پەشیمان ببێتەوە لەو موعامەلەیەی کە کردوویەتی، بە هۆی دەرکەوتنی عەیبێکی کۆنەوە لەو ماڵەدا کە کڕیویەتی؛ هەروەها بۆ فرۆشیاریش دروستە پەشیمان ببێتەوە ئەگەر عەیبێکی کۆنی دیبێتەوە لەو ماڵەدا کە لە جیاتی ماڵە فرۆشراوەکەی وەری گرتووە.

قاعیدەی ئەمەش، ئەوەیە هەر عەیبێ کە عەینی ماڵەکە کەم بکا یا نرخەکەی بشکێنێ بە ئەندازەیەك کە لە عورف و عادەتدا قەبووڵ نەکرێ و ئەو عەیبەیش لەو جینسەدا نەبێ ـ بە پێی عادەت ـ ئەبێ بە هۆی پەشیمانبوونەوە، ئیتر ئەو عەیبە لەگەڵ عەقدەکەدا پەیدا بووبێ یا لە بەینی عەقدەکەو وەرگرتنی ماڵەکەدا، بەو شەرتە کە کابرای کڕیار بە عەیبەکەی نەزانیبێ، هەروەها کابرای فرۆشیاریش بە عەیبی قیمەتەکەی نەزانیبێ.

لەو عەیبانەیە کە ئەبن بە هۆی دروست بوونی پەشیمان بوونەوە، خەسراوی حەیوانی نێرینە و سەرکێشی وڵاخی سواری و دەنگ لێوەهاتنی لە کاتی رەوەت و غار کردنا و گازگرتن و جووتەوەشاندنی وە هەڵخستنەوەی حەیوانی باری لە کاتی بار کردنا وە جووت نەکردنی گاجووت و نووستنی لە کاتی جووتکردنا و شیردانەدانی حەیوانی دۆشەنی و لەقەوەشاندنی لە کاتی دۆشینا و قۆچدانی لەوکەسەی کە ئەیدۆشی.

مایەی عەیبداربوونە بۆ خانوو ئەمە کە ئاوەزی بێ، یا لە دراوسێی ئەو خانووەدا شوێنی ئاسنگەرو گازریکەر هەبێ یا کاسبێکی وا کە ئەزیەتی دراوسێکانی بدا، یا لە نزیکی ئەو خانووەوە دووکەڵ لە حەمام دەرچێ، یا پلووسکی ماڵێکی بەرز داپەڕێ بە سەربانی ئەو خانووەدا، یا مردوو لە هۆدەیەکیا یا لە حەوشەکەیا دفن کرابێ، مادام

ئەوەندە کۆن نەبێ کە مردووەکە رزیبێ، یا لە نزیکی ئەو خانووەوە خانووی کەسێکی بێناموس و بێئابڕوو هەبێ، یا خود کاغەزێك دۆزرابێتەوە کە باسی وەقفییەتی ئەو خانووە یا ئەرزی ئەو خانووەی تیابێ، یا خود ئینسانێکی باوەڕ پێکراو خەبەر بدا بەو کە خانووەکە یا ئەرزەکەی وەقفە.

مایەی عەیبداربوونی زەوییەکیشە کە بۆ ئەوە کڕرابێ بکرێ بە باخ یا بکێڵرێ، ئەمە کە بەردەڵان بێ یا لمی تیابێ و کشت و کاڵی تیا دەس نەدا. قوماشیش بەوە عەیبدار ئەبێ کە لە عەمارا سووتابێ یا عەمارەپوو بێ. عەیبدار بوونی دەغڵیش بەوەیە کە ئەسپێ یا کرم تێی‌دابێ یا مۆرانە خواردبێتی، یا پووچەڵ بووبێ. میوەش بەوە عەیبدار ئەبێ کە گەنیبێ یا ترشابێ یا کرمۆڵ بووبێ یا تامی عادەتی خۆی نەبێ، وەك ئەوە کە کاڵەك ترش بێ لە نەوعی شیرینا.

ئەگەر کەسێك شتێکی فرۆشت بەو شەرتە کە حەقی نەبێ بە سەر عەیبی ئەو شتەوە، یەعنی هەرچەند عەیبی پێوە بێ، نەبێ بە هۆی ئەوە کە بدرێتەوە بە سەریا، ئەوە ئەگەر ئەو شتە گیانلەبەر نەبوو، کابرا لە هیچ عەیبێکی بەری نابێ، چ ئاشکرا و چ نهێنی و مادام عەیبێکی تیا دەرکەوت، کڕیارەکە ئەتوانێ بیداتەوە بە سەر فرۆشیارەکەدا وە ئەگەر گیانلەبەر بوو، بەری ئەبێ لە هەموو عەیبێکی نهێنی کە پێی نەزانیبێ و بەری نابێ لە عەیبی ئاشکرا و لە هەر عەیبێکی نهێنی کە پێی زانیبێ، چونکە ئەبوو لە کاتی فرۆشتنی گیانلەبەرەکەدا ناوی ئەو عەیبەی ببردایە، کە چی ناوی نەبردووە.

ئەگەر ماڵە فرۆشراوەکە لە لای کڕیارەکە فەوتا، ئەوجا بە عەیبە پێشووەکەی زانی، ئەتوانێ تۆڵەی ئەو عەیبە لە فرۆشیارەکە وەربگرێ کە بریتییە لە بەشێك لەو پارەیە کە داویە لە حەقی ماڵەکەدا کە نیسبەتی بە هەموو ئەو پارەیە، ئەوەندەی ئەوەیە کە عەیبەکە لە نرخی ماڵەکەی کەم کردووەتەوە لە بازارا؛ مەسەلا، ئەگەر ئەو ماڵە لە بازارا بە بێعەیب، بایی دە دینار بێ و بە عەیبەوە، بایی نۆ دینار بێ، پێویستە فرۆشیار دەیەکی پارەکە بداتەوە بە کڕیارەکە؛ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە بۆ بژاردنەوەی حەقی ئەو عەیبە، تەماشای کەمترین نرخێکی ماڵە فرۆشراوەکە ئەکرێ لە کاتی فرۆشتنیەوە تا

کاتی وەرگرتنی وە ئەگەر ماڵە فرۆشراوە عەیبدارەکە مابوو، بەڵام قیمەتەکەی بەلای فرۆشیارەکەوە نەمابوو، کڕیارەکە ئەتوانێ ماڵە عەیبدارەکە بداتەوە بە سەر خاوەنەکەیا و وێنەی قیمەتەکە ـ ئەگەر وێنەدار بوو ـ یا خود نرخەکەی ـ ئەگەر وێنەدار نـەبوو ـ وەربگرێ لە فرۆشیارەکە وە ئەگەر پاش ئەوە کە ماڵەکە کەوتە دەست یەکێکی تر، بە عەیبەکەی زانی، حەقی تولە وەرگرتنی نابێ لە فرۆشیارەکە؛ بەڵێ، ئەگەر جارێکی تر ماڵەکە کەوتەوە دەستی، ئەتوانێ تۆڵەی عەیبەکە لە فرۆشیارەکە وەربگرێ.

بزانن! گێڕانەوەی ماڵی عەیبدار، ئەبێ دەس بە جێ بێ؛ کەواتە، پێویستە کڕیار پەلە پەل بکا بۆ دانەدواوەی ئەو ماڵە بە پێی عادەت؛ مەسەلا، ئەگەر لە کاتی نوێژ کردنا بە عەیبەکەی زانی، ئەبێ پاش لێ بوونەوە لە نوێژەکە بە تەواوی، ماڵەکـە بگـێڕێتـەوە؛ مەبەست لە تەواوی، ئەوەیە لە نوێژەکەو سونەتی پاش نوێژ و لە تەسبیحات و زیکر بێتەوە وە ئەگەر لە شەودا بە عەیبەکەی زانی، ئەوە پاش رۆژ بوونەوەو نوێژ کردن و قاوەڵتی کردن و جل لەبەرکردن، ماڵەکە بەرێتەوە بۆ فرۆشیارەکە. جا ئەگەر کـابرای فرۆشیار لەو شوێنەدا بوو، ئەبێ کڕیارەکە، خۆی یا وەکیلی، ماڵەکـە بـەرێتـەوە بـۆ فرۆشیارەکە، خۆی یا وەکیلی و ئەگەر بیباتە لای قازیی ئەو شوێنە، ئەوە باشترەو ئەگەر [کابرا] لەو شوێنەدا نەبوو، ئەوە ماڵەکە بەرێت بۆ لای قازیی ئەو شوێنە و تەفرەی نەدا تا کابرا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنە یا تا خۆی ئەڕوا بۆ ئەو شوێنـەی کـە کـابرای تـیایە. فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەگەر کڕیارەکە لە بەر بیانوویەکی بە جێ پێی نەکرا ماڵەکە بەرێتەوە بۆ فرۆشیارەکە، ئەبێ لە جێگەکەی خۆیەوە بەیعەکە هەڵوەشێنێتەوە و شاهید لە سەر ئەو هەڵوەشاندنەوەیە بگرێ تا بۆی رێ ئەکەوێ ماڵەکە بەرێتەوە بۆ فرۆشیارەکە یا بیداتە دەستی قازی وە ئەگەر شاهیدی دەس نەکەوت، پێویست نییە خـۆی بـە دەم بەیانی هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتنەکە بکا، چونکە مادام کەس ئاگای لەوە نییە کە ئەو چی ئەڵێ، ئیتر ئەبێ سوودی وتنەکەی چی بێ؟

شەرتی گێڕانەوەی ماڵی عەیبدار ئەوەیە کابرای کڕیار ئەو شتە بـە کـار نـەهێنـێ؛ کەواتە، ئەگەر زینی کرد لەو ئەسپە کە ئەیباتەوە، یا خود وڵاخە عەیبدارەکەی بار کرد،

حەقی گێڕانەوەی نامێنێ؛ بەڵام دروستە سواری وڵاخی سەرکێش ببێ و بیباتەوە ئەگەر ئەو وڵاخە بە بێ ئەوەی یەکێك سواری ببێ نەئەچوو بەڕێدا؛ هەروەها، ئەگەر کڕیارەکە کابرایەکی خاوەن ڕێ و شوێن بێ و لە کاتێکا بە عەیبی وڵاخە کڕراوەکە بزانێ کە سواری بێ و بۆی دەس نەدا دابەزێ و بە پێ بڕوا، ئەوە بۆی دروستە بە سواری وڵاخەکە بمێنێتەوە تا ئەیداتەوە دەستی خاوەنی، یا خود ئەگەر جلە کڕراوەکەی لە بەردا بوو و بۆی دەرکەوت کە عەیبدارە و جلێکی‌تر لەویا نەبوو بیکاتە بەری، ئەوە دروستە جلەکان دانەکەنێ تا ئەگاتە لای فرۆشیارەکە؛ ئەگەر کڕیارکەمتەرخەمی کرد لە گێڕانەوەی ماڵی عەیبداراو حەقی گێڕانەوەی فەوتا، ئیتر ناتوانێ داوای تۆڵەی عەیبەکە بکا لە فرۆشیارەکە.

ئەگەر ماڵەکە عەیبێکی تازەی تیا پەیدابوو لای کڕیارەکە، بێجگە لە عەیبە پیشووەکە کە لای فرۆشیارەکە بووە، کڕیارەکە حەقی نابێ بەزۆر ئەو ماڵە بداتەوە بەسەر فرۆشیارەکەدا؛ جا ئەگەر لەم کاتەدا کابرای فرۆشیار رازی بوو بەوە کە ئەو ماڵە بەو عەیبە تازەوە وەربگرێتەوە، ئەوە پێویستە کڕیارەکە یا ماڵەکەی بداتەوە یاخود خۆی بە عەیبە کۆنەکەوە وەری‌بگرێ وە ئەگەر فرۆشیارەکە ماڵەکەی بەو عەیبە تازەوە وەرنەگرتەوە، ئەوە ئەبێ یا کڕیارەکە تۆڵەی عەیبە تازەکە بخاتە پاڵ ماڵەکە و بیداتەوە بەسەر فرۆشیارەکەدا، یاخود فرۆشیارەکە تۆڵەی عەیبە کۆنەکە بدابە کڕیارەکە و ماڵەکەی بەرێتەوە؛ جا ئەگەر هەردوولا لەسەر یەکێ لەم دوو ڕێگایە ڕێك کەوتن، ئەوە باشە، ئەگینا هەرکامیان داوای ئەوە بکا کە ماڵەکەی لەلابمێنێتەوە، شەرع لایەنی ئەوەیان ئەگرێ وە لەو سوورەتەشدا کە عەیبێکی تازە لای کڕیارەکە پیدا ببێ، پێویستە زوو خەبەر بە فرۆشیارەکە بدا کەوا عەیبێکی تازە لای ئەویش پەیدا بووە، بۆ ئەوە کە یەکێك لە دوو سوورەتە باس‌کراوەکە بۆ خۆی هەڵبژێرێ؛ ئەگەر ئاگاداری نەکردو بە بێ‌عوزر تەفرەی دا، نەحەقی دانەدواوەی ماڵەکەی ئەمێنێ و نە حەقی ئەبێ داوای تۆڵەی عەیبە کۆنەکە لە فرۆشیارەکە بکا، چونکە خۆی کەمتەرخەمی کردووە.

ئەگەر ماڵەکە لای کڕیار عەیبێکی‌وای لێ پەیدابووکە عەیبەکۆنەکە بەو عەیبە تازەیە

نەبوایە دەرنەئەکەوت، وەك شكاندنی هێلکە کە پیسی هێلکەکەی لێوە دەربکەوێ، وە لەتکردنی کاڵەك کە کرمۆڵی کاڵەکەکەی لێوە دیاری بدا، ئەوە کڕیارەکە ئەتوانێ ئەو ماڵە بداتەوە بەسەر فرۆشیارەکەدا و تۆڵەی عەیبە تازەکەشی ناکەوێتە سەر؛ بەڵێ، ئەگەر ئەم عەیبە تازەیە زۆر بوو وە عەیبە کۆنەکە بە کەمتر لەو ئەندازەیە دەرئەکەوت، کڕیار ناتوانێ بە زۆر ماڵەکە بداتەوە بەسەر فرۆشیاردا.

ئەگەر کەسێك دوو حەیوانی بە یەك موعامەلە کڕی و هەردوو حەیوانەکە عەیبدار بوون، ئەتوانێ هەردووکیان بداتەوە بەسەر فرۆشیارەکەدا وە ئەگەر یەکێکیان عەیبدار بوو، ئەبێ یا هەردووکیان گل بداتەوە یا هەردووکیان بداتە دواوە، ئیتر حەقی ئەوەی نییە عەیبدارەکەیان بداتە دواوەو ساغەکەیان رابگرێو داوای تۆڵەی عەیبدارەکە بکا، چونکە هەردوو حەیوانەکە بە یەك موعامەلە کڕاون.

وە ئەگەر کەسێك یەك حەیوانی کڕی لە دوو کەس و ئەو حەیوانە بە عەیبدار دەرچوو، بۆی هەیە بەشی یەکێکیان بداتە دواوەو بەشی ئەوەکەیان هەڵبگرێ، چونکە موعامەلەکە دوو بەیع بووە؛ هەروەها، ئەگەر دووکەس حەیوانێکیان کڕی لە یەك کەس و حەیوانەکە عەیبدار دەرچوو، دروستە یەکێك لەو دووکەسە رازی بێ بە بەشەکەی خۆیو ئەویان بەشەکەی بداتە دواوە، چونکە ئەم موعامەلەیەیش دوو بەیعە.

ئەگەر کڕیارو فرۆشیار بوو بە هەرایان لەوەداکە عەیبەکە کۆنە یا تازەیە، فرۆشیارەکە سوێند ئەدرێ بەپێی ئەو جوابەی کە جوابی کڕیارەکەی پێ ئەداتەوە؛ مەسەلا، ئەگەر وتی: بە بێ عەیبی نەبێ ئەو ماڵەم نەداوەتە دەستت یا: بە بێ عەیبی پێم داوی، هەر بەو جۆرەش سوێندی ئەدرێ وە ئەگەر وای جواب دایەوە کە: پێویست نییە لەسەرم وەری بگرمەوە، یا حەقی ئەوەت نییە بیدەیتەوە بەسەرما، هەر بەوجۆرە سوێندی ئەدرێ و داوای لێ ناکرێ لە سوێندەکەیا باسی ئەوە بکا کە ئەو عەیبە لای ئەو نەبووە و لای کڕیار پەیدا بووە، چونکە رێی تێ ئەچێ وەختی خۆی کڕیارەکە بەو عەیبەی زانیبێو پێی رازی بووبێو ئەگەر ئێستە فرۆشیار باسی ئەوە بکا، ئەبێ بە شاهید ئیسپاتی بکاو شاهیدیشی نییە.

**بزانن!** سوێنددانی فرۆشیار لەکاتێکا ئەبێ ئەگەر راستی قسەکەی بەقەتعی دیار

نەبێ، ئەگینا ئەگەر عەیبەکە برینێکی تازە بێو بەیعەکە ماوەیەکی زۆری بەسەرا تێپەڕیبێ، ئەوە باوەڕ بە فرۆشیار ئەکرێ و پێویست بە سوێنددانی نییە؛ هەروەها، ئەگەر راستی قسەی کڕیارەکە دیار بوو، وەك ئەوە کە عەیبەکە برینێکی کۆنی خۆشەوەبوو بێو بەیعەکەش چەند رۆژێك بێ کرابێ، باوەڕ بە قسەی کڕیارەکە ئەکرێو سوێندی نادرێو ماڵەکە ئەدرێتەوە بەسەر فرۆشیارەکەدا.

هەروەها، ئەگەر کڕیار ئیددیعای دوو عەیبی کۆنی ئەکردو فرۆشیاریش پێی‌لێ‌ناکە یەکێکیان لای ئەو بووە، بەڵام وتی: ئەویان لای کڕیار پەیدا بووە، لەم سوورەتەیشدا هەر باوەڕ بە کڕیار ئەکرێ و سوێندی ئەدرێ، چونکە بە پێ‌لێ‌نانی فرۆشیار لە عەیبێکیان، حەقی دانە دواوەی ماڵەکە بۆ کڕیارەکە جێ‌گیر بووەو ئەسڵیش وایە ئەم حەقە سابتە ولاناچێ.

جا لەپاش ئەوەکە کڕیار بەیعەکەی هەڵوەشاندەوە، هەر زیادەیەك بەوماڵەوە هەبێو لێی جیا نەبێتەوە، وەك قەڵەوبوونی حەیوان و ئاوس بوونێك کە لای فرۆشیار پەیدا بووبێ، خواه لای کڕیار لەدایك بووبێ یا نە، وە وەك گەورەبوونی درەختی باخ، ئەوە هەمووی تابیعی ماڵەکەیەو ئەگەڕێتەوە بۆ فرۆشیار وە هەر زیادەیەك کە جیاببێتەوە لە ماڵەکە، وەك بەچکەیەك کە لای کڕیار خولقابێو لەدایك بووبێ و وەك میوەی باخ کە لە پاش کڕینی باخەکە لای کڕیارەکە پەیدا بووبێ و وەك خوری و مەرەز و موویەك کە لە موڵکی کڕیارەکەدا پەیدا بووبن، ئەوانە هەموویان هی کڕیارەکەن؛ هەروەها، هەر کرێیەك کە کڕیار وەری گرتبێ لەجیاتی بەکرێدانی ولاخی باریو سواریو بەکرێدانی خانووی کڕراو، ئەوەش هەمووی هی کڕیارەکەیە؛ هەروەها، هەر سکێکیش کە لە موڵکی کڕیارەکەدا پەیدا بووبێ، هی کڕیارەکە خۆیەتی، هەرچەند پێش لەدایك بوونیشی دایکی بداتەوە بەسەر فرۆشیارەکەدا، بەڵام هەر حەیوانێ لە کاتی کڕینیا خوری یا مەرەزی پێوەبووبێو لای کڕیارەکە درێژ بووبێ، ئەوە تێکەڵە لەنێوان فرۆشیارو کڕیاردا.

فرۆشیار بە هیچ جۆرێ حەقی ئەوەی نییە داوای ئەو قازانجانە بکا کە کڕیار وەری

گرتووە لە ماڵە کڕاوەکە، چونکە لە موڵکی خۆیدا پەیدا بوون؛ هەروەها کڕیاریش حەقی داواکردنەوەی ئەو مەسرەفانەی نییە کە کردوویە بۆ ماڵەکە، چونکە مەسرەفی بۆ موڵکی خۆی کردووە.

ئەم حوکمانەی کە باسمانکردن، حوکمی ماڵێك بوون کە بە شێوەیەکی راست کڕرابن؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك ماڵێکی کڕی بە شێوەیەکی نادروست و لەپاشا دەرکەوت موعامەلەکە دانەمەزراوە، یاخود ماڵەکە بە ماڵی یەکێکی تر دەرچوو، ئەوە هەر زیادەیەك لەو ماڵەدا پەیدابووبێ هەمووی ئەگەرێتەوە بۆ خاوەن ماڵەکە و خاوەنماڵەکە حەقی هەیە داوای کرێی ئەو ماوەیەیش بکا کە ماڵەکەی لای کڕیارەکە بووە، خواە بەکاری هێنابێ یا نەو هەرچی بەرهەمی ئەو ماڵە هەیە، وەك شیرو ماستو رۆنو کەشكو کرێبارو کرێی خانوو [و] میوەی باخو شتیوا، هەمووی لێ ئەسێنێتەوە و هەر مەسرەفێکیش کە کابرای کڕیار لە ماڵەکەدا کردبێتی، هەمووی بە زایە ئەچێو ناتوانێ داوای بکاتەوە لە خاوەن ماڵەکە، هەرچەند ماڵەکەشی لەسەر ئەوە لێ کڕیبێ کە ماڵی خۆیەتی، چونکە لە راستیدا ماڵی ئەو نەبووە و گوێ نادرێ بەوە کە کڕیار بەوەی نەزانیوە؛ بەڵام ئەگەر لە چەشنی ماڵە کڕراوەکە کەوتبێتە ناویەوە، وەك ئەوە کە باخێکی کڕیبێو لە دەرەوە نەمامێکی تری هێنابێ تیایدا ناشتبێتی، یا زەوییەکی کڕیبێو بە دارو بەردو خشتی خۆی خانوویەکی تیا کردبێتەوە، ئەتوانێ ئەو نەمامەو ئەو دارو بەردو خشتەی بەرێتەوە بۆخۆی [و] کابرای خاوەن زەویش ئەتوانێ لەپاش تێکدانی خانووەکە، شوێنەکەی پێ تەختبکاتەوە، وەك لەوەپێش چۆن بووە وەها وە ئەگەر بە دارو بەردو گڵی خاوەنماڵەکە خانووەکەی دروست کردبێ، هەمووی ئەبێ بە هی ئەوو رەنجو زەحمەتی کابرای کڕیار هەمووی بە هیچ ئەڕوا.

## باسی ئەو عەیبانەی کە بە فڕوفێڵی فرۆشیار پەیدا بوون

هەر عەیبێ لە ماڵی فرۆشراوا دەربکەوێ و لە ئەنجامی فڕوفێڵی فرۆشیاردا پەیدا بووبێ، ئەبێ بە هۆی ئەوە کە کڕیار حەقی پەشیمان بوونەوەی ببێ، وەك ئەوە کە فرۆشیار بەری ئاوی ئاش بگرێ و لە کاتی فرۆشتنی کارێزەکە یا ئاشەکەدا بەری بدا بۆ

ئەوەی کڕیارەکە وا تێبگا ئەو کارێزە یا ئەو ئاشە ئاوێکی زۆری هەیە و پاش ماوەیەك ئاوەکە کەم ببێتەوە و عەیبەکە دەربکەوێ وە وەك ئەوە کە فرۆشیار حەیوانەکەی نەدۆشێ و گوانی بە پڕی بهێڵێتەوە تا کڕیار وابزانێ شیری زۆرە؛ لەم حاڵەدا، کڕیار هەرکە بە فێڵەکەی زانی، ئەتوانێ دەس بە جێ پەشیمان ببێتەوە و حەیوانەکە بداتە دواوە؛ هەندێ لە زانایانی شەرع، فەرموویانە: کڕیار لە حاڵی وادا تا سێ رۆژ حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە بۆ ئەوەی زۆر چاك شارەزای حەیوانەکە ببێ؛ پاش ئەوەی کە حەیوانەکەی دایەدواوە، هەر شیرێ کە لەو حەیوانەی دۆشیبێ و لای مابێ ئەبێ بیداتەوە بە فرۆشیارەکە و بەرامبەر بە شیری فەوتاوی ئەو حەیوانە، ئەبێ یەك «صاع» خورما بدا بە خاوەنەکەی؛ بەڵام ئەگەر هەردوولا رێك کەوتن لە سەر ئەوەکە لە جیاتی شیرەکە پارەکەی بدا، ئەوە دروستە وە ئەگەر حەیوانەکە گۆشتی نەئەخورا، ئەوەکابرای کڕیار تەنها حەقی هەڵوەشاندنەوەی موعامەلەکەی هەیە و پێویست نییە لە جیاتی شیری فەوتاو هیچ بدا بە فرۆشیار.

**بزانن!** لەمەوەکە رابورد، دەرکەوت حەقی پەشیمان بوونەوە بۆ کڕیار روخسەتێکە شەرع داویەتی لە بەر دوو مەبەست؛ یەکەم: بۆ تێفکرین و بەرچاورۆشنی لەو موعامەلەیەدا و دووهەم: بۆ دەفعی زەرەرو زیان؛ جا بەشی یەکەمیش، دوو جۆرە؛ یەکەم: پەشیمان بوونەوە لە مەجلیسی موعامەلەکەدا؛ دووهەم: پەشیمان بوونەوە تا ماوەی سێ رۆژ یا کەمتر بە هۆی بڕیاردانەوە؛ بەشی دووهەمیش، سێ جۆرە؛ یەکەم: دەرکەوتنی عەیبێکی وا کە بە عورف و عادەت بە عەیب دابنرێ‌و وەختی خۆی لای فرۆشیارەکە بووبێ؛ دووهەم: بە جێ‌نەهاتنی سیفەتێکی مەقسوودی وەها کە کڕیارەکە بڕیاری دابێ؛ سێهەم: کردەوەیەکی ناپەسەندی‌وا کە فرۆشیار کردبێتی بۆ هەڵخەڵەتاندنی کڕیارەکە.

ئەمجار، چەند سوورەتێکی تر ماوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی بەیع:

یەکەم، ئەوەیە ماڵە فرۆشراوەکە بفەوتێ بەرلەوەی کە کڕیارەکە وەری بگرێ؛

دووهەم، ئەوەیە کڕیار و فرۆشیار ببێ بە هەرایان لە بارەی ئەندازەی پارەی ماڵە فرۆشراوەکەوە و هەردووکیشیان سوێند بخۆن لە سەر راستی قسەی خۆیان و بە

درۆخستنەوەی قسەی ئەولایان ـ وەك لە مەوپاش باسی ئەکەین ـ.

سێهەم، لات کەوتنی کڕیار؛

چوارەم، ئەوەیە کڕیار بڕوا بەدەم کاروانەوە و بەرلەوەی بگەنە شار و نرخی بازاڕ بزانن، ماڵەکەیان لێ بکڕێ ـ وەك لەمەوپێش باسمان کرد ـ؛

پێنجەم، ئەوەیە کڕیارەکە پارەی حازری لا نەبێ و ماڵی ئەوەندەی ئەو مەسافەیە دوور بێ کە دروستە نوێژی تیا کورتبکرێتەوە؛

شەشەم، ئەوەیە کەسێك لە نەخۆشی مردنیا بە هۆی چاوپۆشی و پیاوەتی خۆیەوە ماڵی خۆی بە نرخێکی هەرزان بفرۆشێ بە یەکێك لە میراتگرەکانی، ئیتر ئەندازەی هەرزانی ماڵە فرۆشراوەکەی هەرچەند بێ، یا بیفرۆشێ بە یەکێکی بێگانە و ئەندازەی هەرزانی ماڵە فرۆشراوەکە زیاتر بێ لە سێ یەکی تێکڕای ماڵەکەی.

جگە لەم سوورەتانەش، بەیع هەڵئەوەشێنرێتەوە بە هۆی ئەوەوە کە فرۆشیار یا کڕیار پەشیمان بن لەو موعامەلەیە؛ لەم سوورەتەیشدا، سوننەتە ئەوی تریان ئەو هەڵوەشاندنەوەیەی لێ قەبووڵ بکا بۆ ڕەزامەندی خوا؛ سیغەی ئەم بەیع هەڵوەشاندنەوەیە، ئەوەیە هەردووکیان بڵێن: وا ئەم بەیعەمان هەڵوەشاندەوە، یا خود کڕیارەکە، بڵێ: وا ئەم بەیعەم هەڵوەشاندەوە و فرۆشیاریش، بڵێ: وا هەڵوەشاندنەوەکەم لێ قەبووڵ کردی.

## باسی ماڵی فرۆشراو بەرلەوەی کە کڕیار وەری بگرێ

ماڵی فرۆشراو بەرلەوەی کڕیار وەری بگرێ، لە ئەستۆی فرۆشیارەکەیدایە؛ کەواتە، ئەگەر بە هۆی ئافەتێکی ئاسمانییەوە لای فرۆشیارەکە خۆی فەوتا، فرۆشتنەکە هەڵئەوەشێتەوە و نرخەکەی لە سەر کڕیارەکە نامێنێ؛ هەروەها، ئەگەر فرۆشیارەکە خۆی ماڵەکەی فەوتاند؛ لەم سوورەتەدا، ئەگەر لەو موعامەلەیەدا حەقی پەشیمانبوونەوە بۆ کەسیان دانەنرابوو، یا خود بۆ هەردووکیان دانرابوو، ئەوە هەر زیادەیەك لەو ماڵە فرۆشراوە جیابووبێتەوە، وەك بەچکەو شیر و خوری، ئەوە هەمووی ئەدرێ بە کڕیارەکە وە ئەگەر حەقی پەشیمان بوونەوە تەنها بۆ فرۆشیار بوو، ئەو شتانە بۆ ئەون وە ئەگەر کڕیار لە پێش فەوتانی ماڵەکەدا فرۆشیاری ئازاد کرد لەم زامنییە، هیچ سوودێك

نابەخشێ و مەسەلەکە ناگۆڕێ.

ئەگەر کڕیار خۆی ماڵەکەی فەوتاند، ئەوە ئەگەر ئەیزانی ئەو ماڵە، ماڵە فرۆشراوەکەیە، ئەوە بە وەرگرتن دائەنرێ و پێویستە قیمەتەکەی هەموو بدا بە فرۆشیارەکە وە ئەگەر نەیئەزانی ماڵە فرۆشراوەکەیە، ئەوە دوو فەرموودەی تیایە؛ ئاشکراتریان، ئەوەیە کە بە وەرگرتن دائەنرێ، وەك ئەوە کەسێکی زەوتکەر ماڵی زەوتکراو دابنێ لە بەردەمی کابرای خاوەن ماڵەکەدا بۆ ئەوە بیخوا یا خەرجی بکاو ئەویش بیخوا، یا خەرجی بکا.

ئەگەر فرۆشیارو کڕیار، بە هەردووکیان، ماڵە فرۆشراوەکەیان فەوتاند، بەیعەکە لە نیوەی ماڵەکەدا دائەمەزرێ و لەو نیوەکەیا هەڵئەوەشێتەوە، یەعنی نیوەی نرخی ماڵەکە لە سەر کڕیار لا ئەچێ و ئەبێ ئەو نیوەکەی بدا بە فرۆشیارەکە وە ئەگەر کابرایەکی تر فەوتاندی، ئەوە فەرموودەی رەواتر ئەوەیە بەیعەکە هەڵناوەشێتەوە، بەڵکوو بە ئارەزووی کڕیارەکەیە، یا رێگای بەیعەکە بدا و پارەی ماڵەکە بدا بە فرۆشیار و بە کابرای ماڵ فەوتێنی بژێرێ، یا خود هەڵیوەشێنێتەوە و کابرای خاوەن ماڵ ماڵەکەی بژێرێ بەوەی کە فەوتاندوویە.

ئەگەر ماڵە فرۆشراوەکە بە ئافەتێکی ئاسمانی عەیبدار بوو بەر لەوەی کڕیارەکە وەری بگرێ، ئەوە ئەگەر کڕیارەکە بەوجۆرە پێی رازی بوو، وەری ئەگرێ بە تەواوی قیمەتەکەی وە ئەگەر پێی رازی نەبوو بەو عەیبەوە، بۆی هەیە دەس بە جێ بەیعەکە هەڵوەشێنێتەوە و قیمەتەکەی لە سەر لائەچێ وە ئەگەر فرۆشیار خۆی عەیبداری کرد، ئەوە «مەذهەب»، ئەوەیە کە کڕیار حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە؛ جا ئەگەر پەشیمان بووەوە، ئەوە قیمەتەکەی لە سەر نامێنێ وە ئەگەر پێی رازی بوو بەو عەیبەوە، ئەوە ئەبێ بە هەموو قیمەتەکەی وەری بگرێ و بۆی نییە حەقی عەیبەکە بە فرۆشیارەکە بژێرێ وە ئەگەر کڕیارەکە خۆی عەیبداری کرد، ئەوە حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە و پێویستە لە سەری، ماڵەکە بە تەواوی قیمەتەکەی وەربگرێ وە ئەگەر کابرایەکی تر غەیری ئەم دوانە عەیبداری کرد، ئەوە کڕیار حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە؛ جا ئەگەر پەشیمان بووەوە، ئەوە دیارە وە ئەگەر رێگای بەیعەکەی دا، ئەوە ئەتوانێ تۆڵەی عەیبەکە بەو

کابرایە ببژێرێ.

**بزانن!** فرۆشتنی ماڵی کڕراو دروست نییە تا کڕیارەکە وەری نەگرێ، ئیتر چ بە فرۆشیارەکە خۆی بفرۆشێتەوە یا بە یەکێکی تر؛ هەروەها، دروست نییە بیدا بەکرێ یا بیخاتە ڕەهنەوە یا نەزری بکا یا بیبەخشێ یا بیکا بە سەدەقە، هەروەکوو دروست نییە بیدا بە قەرز، یا بیدا لە مارەیی ژنا یا بیکا بە عیوەزی خولع یا بە سەرمایەی سەلەم، بەڵام دروستە بەشی بکا لە بەینی خۆی و هاوبەشدا، یا حەڵاڵی بکا بۆ فەقیر و هەژار، یا وەقفی بکا، یا وەسیەت بکا کە لە پاش مردنی خۆی بیدەن بە یەکێك.

هەروەها، ئەو قیمەتەش کە دیاری کرابێ، ئەویش لە هەموو ئەم حوکمانەدا وەك فرۆشراوی پێش وەرگرتن وایە؛ کەواتە، فرۆشیار بەر لەوەی ئەو قیمەتە وەربگرێ، ناتوانێ بیفرۆشێ، بەڵام قیمەتێك کە لە ئەستۆدابێ، ئەوە دروستە ئاڵ و گۆڕی تیا بکا بە پێی ئەو شەرتانەی کە لەمەو پاش باسیان ئەکەین.

دروستە کەسێك ماڵێکی خۆی بفرۆشێ کە بە ئەمانەت لە دەستی خەڵکا بێ، وەك ماڵێك کە لای کەسێك دایناببێ و ماڵی هاوبەشی و ماڵی ڕەهن کراو پاش دەرهێنانی لە ڕەهن و میراتێك کە بۆی هاتبێتەوە و هێشتا وەری نەگرتبێ و ماڵێك کە لە دەستی «وەلی ئەمر»یا بێ پاش ئەوەی خۆی گەیشتبێتە عومری ڕوشد پەیداکردن؛ هەروەها ماڵێك کە بە خواستەمەنی (عارية) بردبێتیان و ماڵێك کە بە سەودا کردن وەرگیرابێ؛ بەڵام دروست نییە بەر لە وەرگرتنی ئەو ماڵەی کە سەلەمی تێداکراوە شتێك لە جیاتییدا وەربگرێ؛ جا لە حاڵەتی‌وادا، ڕێگای ئاڵ و گۆڕ کردن ئەوەیە هەردوولا عەقدی سەلەمەکە هەڵوەشێننەوە تا ئەو پارەیەی کە دراوە، ببێ بە قەرز لە ئەستۆیدا، جا لە جیاتی ئەو قەرزە، شتێکی تر وەربگرێ کە ئارەزووی لێیەتی. بە پێی فەرموودەی تازەی ئیمامی شافیعی، دروستە لە جیاتی ئەو قیمەتەی کەوا بە سەر مەعمیلەکەوە، شتێکی تر وەربگیرێ، وەك ئاڵتوون لە جیاتی زیو وگەنم لە جیاتی برنج و پۆشاك لە جیاتی پارە، هەتا وەکوو ئەگەر ئەم ئاڵ وگۆڕە بەر لەوەیش بێ کە فرۆشیار ماڵە فرۆشراوەکە بداتە دەس کڕیارەکە، هەر بەو شەرتە کە موعامەلەکە دامەزرابێ و لە ماوەی پەشیمانیدا نەبێ.

هەروەها، دروستە ئاڵ و گۆڕ لە کرێی کرێکارا و لە مارەیی ژنا لە سەر مێرد و لە

عیوەزی خولعدا و لە هەر ماڵێکی تردا کە بە هۆی عەقدێکەوە پەیدا بووبێ؛ جا ئەگەر ئەو شتە کە وەری ئەگرێ لە جیاتی حەقەکەی خۆی لە سەر کابرا، وەك ئەو حەقەی خۆی وا بوو لە عیللەتی سوود (علّة الرّبا)دا، بەو جۆرە کە هەردووکیان نەخت یا خواردەمەنی بوون، ئەوە پێویستە هەر لە مەجلیسی ئاڵ و گۆڕەکەدا ئەو شتە وەربگرێ وە ئەگەر وەك ئەو وانەبوو و جیابوون لە یەك، وەك گەنم لە جیاتی پارە، ئەوە پێویست نییە؛ هەروەها پێویست نییە لە کاتی عەقدی ئاڵ و گۆڕەکەدا ئەو شتەی کە کابرا وەری‌ئەگرێ لە جیاتی حەقەکەی خۆی شتێکی دیاری و لەبەرچاوا بێ، بەڵکوو ئاڵ و گۆڕەکە دائەمەزرێ هەرچەند ئەو شتە لە ئەستۆدا بێ، وەك ئەوەکە فرۆشیار، بڵێ: وا ئەو دوو لیرەی منەکە لە سەرتە، گۆڕیمەوە بە چل درهەم و ئەو دە کیلۆ گەنمەم کە لە سەرتە، گۆڕیمەوە بە بیست کیلۆ جۆ و کابرای قەرزاریش قەبووڵی بکا، جا پاش ئەوە بەدەڵەکە حازر بکا و تەسلیمی بکا.

ئەگەر کەسێك دەست‌قەرزێکی بە سەر کەسێکەوە بوو، یا تۆڵەی ماڵێکی فەوتاوی بە سەریەوە بوو، دروستە ئاڵ و گۆڕیان تیا بکا و شتێکی تریان لە بریتی‌دا وەربگرێ، بەو جۆرە کە پێشان باسمان کرد؛ بەڵام دروست نییە ئەو قەرزەت کە بە سەر کەسێکەوەیە، بیفرۆشی بە کەسێکی تر، هەروەك دروست نییە ئەگەر دووکەس قەرزیان بە سەر دوو کەسەوە ببێ، ئەو قەرزەیان بفرۆشن بە یەکتر.

## باسی وەرگرتنی ماڵی فرۆشراو

ماڵی فرۆشراو، یا لەوانەیە بگوێزرێتەوە، یا لەوانە نییە. وەرگرتنی ماڵی نەگوێزراوە، وەك زەوی و باخ و داری نێژراوو خانوو [و] ئەم جۆرە شتانە، بەوە ئەبێ کە فرۆشیار بە وتن رێگای کڕیارەکە بدا تەسەڕوفیان تیا بکا؛ مەسەلا، بڵێ: وا رێگام‌دای بۆ وەرگرتنی ئەو ماڵە و ماوەی تەسەڕوف تیاکردنەکەشی بدا، بەو جۆرە ئەگەر فرۆشراوەکە خانوو بوو، کلیلەکەی بداتە دەستی و کەل و پەلی خۆی تیا نەهێڵێتەوە، هەروەها هی کرێچی یا کەسێك کە بە ئەمانەت شتی خۆی تیا دانابێ؛ جا ئەگەر خانووەکە کەل و پەلی

فرۆشیارەکەی تیا بوو، وە فرۆشیار گواستیەوە بۆ سووچێکی خانووەکە، بەوە وەرگرتنی ئەو بەشەکانی خانووەکە تەواو ئەبێ وە ئەگەر کەل و پەلی کابرای کڕیاری تیابوو، ڕێگای وەرگرتنی ناگرێ؛ جائەگەر هەردوو لا حازر بوون ئەوە باشە وە ئەگەر هەردوولا حازری لای ماڵەکە نەبوون، ئەوە بۆ دامەزرانی وەرگرتنی ئەو ماڵە، پێویستە ئەوەندە وەخت تێپەڕ ببێ کە قابیل بێ لەو ماوەیەدا کابرای کڕیار خۆی یا جێ‌نشینی بگا بەو ماڵە و وەری بگرێ.

وەرگرتنی ماڵی گوێزراویش بەوە ئەبێ کە کڕیار خۆی یا جێ‌نشینی بە هەر هۆیەك بووە، بیگوێزێتەوە لەو شوێنەی کە واتیایدا، خواه ڕای بکێشێ یا هەڵی بگرێ؛ بەڵام کافییە لە جیاتی گواستنەوە، لێ‌خوڕینی حەیوان و سواربوونی، هەرچەند پاش سواربوونیشی نەجووڵێ؛ هەروەها، کافییە دانیشتن لە سەر فەرش؛ بەڵام پێویستە کڕیار خۆی یا جێ‌نشینی، لە کاتی گواستنەوەی ماڵەکەدا چاوی لێوە بێ وە ئەگەر ماڵە فرۆشراوەکە لەو شوێنەدا نەبوو، پێویستە ماوەیەکی‌وا تێ‌بپەڕێ کە لەوانەبێ کڕیارەکە بگاتە لای ماڵەکە تیایداو بیگوێزێتەوەو ئەگەر فرۆشتنەکە لە شوێنێکی‌وادا کرا کە هیچ پەیوەندێکی نەبوو بە کابرای فرۆشیارەوە، ئەوەندە بەسە کە ماڵەفرۆشراوەکە لەو شوێنە هەڵگیرێ و بخرێتە شوێنێکی‌تر کە ئەویش هی فرۆشیارەکە نەبێ، خواه حەڵاڵ بێ بگوێزرێتەوە بۆ ئەو جێگەیە، وەك موڵکی کڕیارەکە و ڕێگای گشتی و مزگەوت و موڵکی یەکێکی‌تر کە گومانی ڕەزامەندی لێ بکرێ، یا حەڵاڵ نەبێ، وەك موڵکێکی زەوتکراو؛ بەڵکوو هەندێ لە زانایانی دین، فەرموویانە: ئەگەر ئەو ماڵە فرۆشراوە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی زەوتکراویش، هەر کافییە؛ بەڵام ئەگەر ئەو شوێنەی ماڵەکەی بۆ ئەگوێزرێتەوە موڵکی فرۆشیارەکە بوو، ئەبێ ڕێگای ئەوە بدا کە ئەو ماڵە فرۆشراوەی تیا دابنرێ، ئەگینا بە گواستنەوە دانانرێ.

**بێداری!** کڕیار، ئەتوانێ خۆی سەر بە خۆ ماڵە کڕراوەکە وەربگرێ و بیگوێزێتەوە، هەرچەند فرۆشیاریش ڕێگای نەدابێ، بەو شەرتە وەعدەیەك دانرابێ بۆ تەسلیم کردنی نرخەکەی، یا خود کڕیار نرخەکەی تەسلیمی فرۆشیار کردبێ.

هەر ماڵێك لە سەر حیسابی پێوانەو کێشانە فرۆشرابێ، ئەگەر هەر لەو شوێنەشدا

فرۆشرایەوە، ئەبێ دیسانەوە بپێورێتەوە یا بکێشرێتەوە.

ئەگەر یەکێك دە مەن گەنمی لە سەر یەکێکی تر بوو و دە مەنی کابرایەکـی تریش قەرزار بوو، ئەبێ کە قەرزەکەی خۆی وەر ئەگرێتەوە، بیپێوێ و کە ویستی هەر ئەو دە مەنە بداتەوە لە جیاتی ئەو قەرزەدا کە لە سەریەتی، ئەبێ جارێکی تر بیپێوێتـەوە بـۆ ئەویش وە ئەگەر یەکێك دە مەن گەنمی کەسێك قەرزار بوو و دە مـەنیشی بـە سـەر یەکێکی ترەوە بوو و خاوەن قەرزەکەی خۆی نارد بڕوا ئەو دە مەنە گەنمە قەرزە کـە هەیەتی بە سەر ئەو کابرای ترەوە، وەری بگرێتەوە بۆ خۆی و ئەمیش ڕۆیشت و پێوای و وەری گرت، ئەوە دروست نییە، چونکە لە لایەکەوە وەکیلی قەرز وەرگرتنەوەیە بۆ کابرایەکی تر و لە لایەکی ترەوە حەقی خۆی وەرئەگرێتەوە و ئەم دوو کردارە بە یەك پێوانە جێ بە جێ ناکرێ.

## باسی بە دەستەوەدانی ماڵی فرۆشراو و نرخەکەی

هەرکاتێك کەسێك ماڵێکی فرۆشت، ئەگەر فرۆشیار و کـڕیـار مـاوەی پـەشیمان بوونەوەیان دانا، ئەوە لەو ماوەیەدا کەسیان ناچار ناکرێ ئەوەی لایەتی بیدا بەویان وە ئەگەر یەکێکیان بە پیاوەتی خۆی، ئەوەی لایەتی دای بەویان، ئەوی تریان ناچار ناکرێ کە چی لایە بیدا، چونکە ماوەی پەشیمان بوونەوە دوایی نەهاتووە و هەڵنەوەشاوەتەوە بەوە کە یەکێکیان ئەوەی لایەتی داویەتی بەمیان.

لە پاش تەواو بوونی ماوەی پەشیمان بوونەوە، ئەگەر ماڵەفرۆشراوەکەوقیمەتەکەی، هەردووکیان دیاری کراوبن و لە بەرچاوا بن، کڕیار و فرۆشیار نـاچار ئـەکـرێن کـە بیاندەن بە یەکتر و ئەگەر هەریەکێکیان دیای کراو بوو و ئەویان لە ئەستۆدا بوو، خاوەنی دیاری کراوەکەیان ناچار ئەکرێ کە بیدا بە دەستەوە، چونکە وەختی خۆی ڕازی بووە بەوەکە برادەرەکەی ماڵەکەی لە ئەستۆدا بێ؛ جا هەرکامیان لە پێشا ماڵەکەی خۆی دا بە دەستەوە، پاش ئەو برادەرەکەشی ناچار ئەکرێ ئەوەی لایەتی بیدا بە دەستەوە؛ کەواتە، ئەگەر فرۆشیار ماڵە فرۆشراوەکەی تەسلیم کرد و کڕیار قیمەتەکەی نەدا لە بەر لاتی و

نەبوونی، فرۆشیار ئەتوانێ پەشیمان ببێتەوە بە هوێ لاتکەوتنی کڕیارەوە وە ئەگەر کڕیار ماڵی حازری بوو لەو شوێنەدا کە موعامەلەکەی تیا کراوە یا لە نزیکی ئەو شوێنەدا، ناچار ئەکرێ کە بیهێنێ و بیداتە دەستی فرۆشیار و لەو ماوەیەدا کە ماڵەکەی ئەهێنێ قازی ئەتوانێ لە سەر داوای فرۆشیار «حیجر» بخاتە سەری و نەهێڵێ تەسەڕوف لە ماڵی خۆیدا بکا بۆ ئەوەکە حەقی فرۆشیارەکە نەفەوتێ و ئەگەر ماڵەکەی لە مەسافایەکدا بوو کە نوێژی تیا کورت ئەکرێتەوە، ئەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە فرۆشیار ناچار ناکرێ خۆی بگرێ تا کڕیار ئەچێ ماڵەکەی ئەهێنێ و ئەتوانێ دەس‌بەجێ، بەیعەکە هەڵوەشێنێتەوە وە ئەگەر هەڵینەوەشاندەوەو داوایکرد حیجر بنرێتە سەر کڕیارەکە، بە گوێی ئەکرێ و حیجرەکە هەڵناگیرێ تا قیمەتی ماڵەکە دێنێ بۆ فرۆشیار.

ئەمەی کە وتمان، هەمووی لە کاتێکایە قیمەتی ماڵەکە پاش نەخرابێ؛ ئەگەر پاش خرابوو، فرۆشیار نە حەقی هەڵوەشاندنەوەی بەیعەکەی هەیە و نە حەقی داوای حیجر و ئەبێ سەبر بکا تا وادەی حەقەکەی دێت.

**ئاگاداری!** فرۆشیار لە کاتێکا ناچار ئەکرێ ماڵە فرۆشراوەکە بدا بە دەستەوە کە ترسی فەوتاندنی قیمەتی نەبێ؛ ئەگینا، بۆی هەیە ماڵە فرۆشراوەکە لای خۆی بهێڵێتەوە تا قیمەتەکەی ئەدرێتە دەست و ئەم حوکمە، خیلافی تیا نییە.

## باسی بەرەو ڕووکردنەوە (تَولية) و هاوبەش کردن (إشراك) و فرۆشتنەوە بە قازانج (مُرابَحَة)و فرۆشتنەوە بە زیان (مَحاطة)

مەبەست لە بەرەوڕووکردنەوە (تولية)، ئەوەیە کەسێك پاش ئەوەی ماڵێکی کڕی، هەر بەو قیمەتە بیخا بە سەر یەکێکی ترا؛ مەبەستیش لە هاوبەش کردن (إِشراك)، ئەوەیە کەسێك پاش ئەوەی ماڵێکی کڕی، کەسێکی تر بکا بە هاوبەشی خۆی لەو موعامەلەیەدا؛ مەبەستیش لە فرۆشتنەوە بە قازانج (مرابَحَة)، ئەوەیە ئەو ماڵەی کە کڕیویەتی، بیدا بە کەسێکی تر بە ئەندازەیەك قازانج؛ مەبەستیش لە فرۆشتنەوە بە زیان (محاطة)، ئەوەیە ئەو ماڵەی کە کڕیویەتی بیفرۆشێتەوە بە کەسێکی تر و ئەندازەیەکیش

له پاره‌كه‌ی كه‌م بكاته‌وه.

جا هه‌ر كاتێ كه‌سێك شتێكی كڕی به‌ قیمه‌تی چه‌شنی ئه‌و شته ـكه مه‌به‌ست له چه‌شن له‌م شوێنه‌دا ئه‌وه‌یه پاره‌ی نه‌خت بێ ـ و له پاشا وتی به كه‌سێكی‌تر كه ئه‌و ماڵه‌ی دیبێ و ئاگای له قیمه‌ته‌كه‌شی هه‌بێ، وا تۆم كرد به خاوه‌نی ئه‌م موعامه‌له‌یه و ئه‌ویش قه‌بووڵی كرد، ئه‌وه ئه‌و ماڵه ئه‌بێ به ماڵی ئه‌و كه‌سه به قیمه‌تێكی وه‌ك قیمه‌تی موعامه‌له‌ی پێشوو له جۆر و ئه‌ندازه و چۆنیه‌تی (جنس و مقدار و صِـفة)دا؛ هه‌تا وه‌كوو ئه‌گه‌ر فرۆشتنی یه‌كه‌م به قیمه‌تێكی «مُـؤجَّل» (وه‌عـده بـۆ دانـراو) بـووبێ، فرۆشتنی دووهه‌میش هه‌روه‌ها به وه‌عده بۆ دانراو دائه‌مه‌زرێ.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر كڕیاری یه‌كه‌م ماڵه‌كه‌ی به شتێكی‌واكڕیبوو كه ئه‌بوو نرخی بۆ دابنرێ، وه‌ك گه‌نم و جۆو حه‌یوان و ماڵی بازرگانی، پێویسته له‌م سووره‌ته‌دا ناوی ئه‌و شته بباو باسی قیمه‌ته‌كه‌یشی بكا؛ مه‌سه‌لا، بڵێ: وا تۆم‌كرد به خاوه‌نی ئه‌و موعامه‌له‌یه‌كه بریتییه له كڕینی فڵانه شت به ئه‌سپێك كه قیمه‌ته‌كه‌ی ئه‌وه‌نده‌یه؛ به‌ڵێ، ئه‌گه‌ر وا رێكه‌وت ئه‌و شته كه كڕیار داویه به فرۆشیار له جیاتی ماڵه كڕراوه‌كه كه‌وته لای كڕیاری دووهه‌م، ئه‌وه دروسته عه‌قدی به‌ره‌وڕوو كردنه‌وه‌كه هه‌ر به‌و شته بكرێ به بـێ بـاس كـردنی نرخه‌كه‌ی.

عه‌قدی به‌ره‌وڕوو كردنه‌وه وه‌ك فرۆشتن وایه له هه‌موو حوكمێكا؛ به‌ڵام ناوبردنی قیمه‌ت له‌مدا پێویست نییه وه ئه‌گه‌ر قیمه‌تی ماڵه فرۆشراوه‌كه له سه‌ر كڕیاری یه‌كه‌م لاچووبوو به هۆی به‌خشین و شتی واوه، ئه‌وه له سه‌ر ئه‌م كـڕیـاره دووهـه‌مه‌یش لا ئه‌چێ. عه‌قدی به‌ره‌وڕوو كردنه‌وه، وه‌ك له فرۆشتنا ئه‌بێ، له ماره‌یی ژن و عـیوه‌زی خولعیشا دا ئه‌مه‌زرێ؛ هه‌روه‌ها، له به‌كرێ؛ دانیشا ئه‌بێ؛ مه‌سه‌لا، یه‌كێك خانوویه‌كی به‌كرێ گرتووه ساڵی به ده دینار، ئه‌وه ئه‌توانێ بیدا به یه‌كێكی‌تری وه‌ك خۆی به هه‌مان كرێ و ئه‌و له جیاتی ئه‌م ئه‌بێ به كرێچی.

له باره‌ی هاوبه‌ش كـردنیشه‌وه، ئـه‌گـه‌ر كـه‌سێك پـاش ئـه‌وه‌ی مـاڵێكـی كـڕی یه‌كێكی‌تری‌كرد به هاوبه‌شی خۆی، ئه‌وه‌یش دروسته، ئه‌گه‌ر به‌یانی ئه‌و ئه‌ندازه‌یه بكا كه ئه‌و كابرا وه‌ری‌ئه‌گرێ، وه‌ك نیوه یا چواره‌یه‌كو ئه‌گه‌ر هه‌ر ناوی شه‌راكه‌تی رووتی

برد، ئەوە ئەچێتە سەر نیوەیی.

فرۆشتنەوە بە قازانجیش دروستە، بەو شەرتە کابرای کڕیار بزانێ ئەو ماڵە بە چەند کڕاوە و فرۆشیارەکەش باسی ئەندازەی قازانجەکە بکا؛ مەسەلا، بڵێت: وا ئەم ماڵەم پێ‌فرۆشتی بە قازانجی دە یازدە، یەعنی لە هەر دە درەمێکا، درەمێك قازانجم بدەیتێ، ئەویش دەس‌بەجێ قەبووڵی بکا.

فرۆشتنەوە بە زیانیش دروستە، بەوجۆرە کە کابرا بڵێ: وا ئەم ماڵەم پێ‌فرۆشتی بە نوقسانی دەیەك، یەعنی لەجیاتی هەر دینارێك، نۆ دینارم پـێ‌بـدەی‌و پـێوسـتە لەم موعامەلەیەشدا کابرای کڕیار بزانێ ئەو ماڵە بە چەند کڕاوە؛ جا ئەگەر فرۆشیار وتی: پێم‌فرۆشتی بەو قیمەتەی کە پێم‌کڕیوە، ئەوە هەر ئەسڵی قیمەتەکەی ئەکەوێتە سـەر کڕیارەکە وە ئەگەر وتی: وا پێم‌فرۆشتی بەوەی کە لەسەرم بووە بە ماڵ، ئەوە لەم کاتەدا هەر مەسرەفێکی بۆ ئەو ماڵە کردبێ، وەك کرێی حەماڵ و پێوانەکەرو کرێی خانوو و شتی‌وا، هەمووی ئەکەوێتە سەر کڕیارەکە؛ بەڵام هەر ئـیشێك کـە خـۆی کـردبێتـی، کرێکەی ناکەوێتە سەر کڕیارەکە، چونکە بەرابەر بەو ئیشانە پارەی نەداوەو پێوستە کڕیارەکە لەپێش قەبووڵ کردنی بەیعەکەدا، ئاگادار بێ لە قیمەتی ماڵەکەو [لە] ئەندازەی ئەو مەسرەفەکە فرۆشیارەکە کردوویەتی، هەروەها ئەبێ فرۆشیارەکەیش ئاگای لەوانە بێ؛ جا ئەگەر لایەکیان یا هیچ‌کامیان ئاگایان لەوە نەبوو، ئەو موعامەلەیە دانامەزرێ.

هەروەها، واجبە کابرای فرۆشیار بەڕاستی قسە بکا، چ لە قیمەتی ماڵەکەدا و چ لە ئەندازەی ئەو مەسرەفەداکە کردوویەتی و چ لە ئەندازەی ماوەیشدا، ئەگەر قیمەتی ئەو ماڵەی کڕیوەیەتی وەعدەدار بێ و ئەبێ بەڕاستی بەیانی ئەو عەیبانەش بکا کە لای ئەو پەیدا بوون؛ ئەگەر هات‌و درۆی کردو لەپاشا درۆ کە دەرکەوت، ئەوە هەرچی زیـاد وتووە، لەسەر کڕیارەکە لائەچێ، بەڵام حەقی پەشیمان بوونەوەی نابێ‌و ئەگەر کڕیاری یەکەم لەپێشا ناوی قیمەتێکی برد و لەسەر ئەو قیمەتە مامەڵەکە تەواو بوو، وە لەپاشا ئیددیعای کرد کە قیمەتەکە زیاتر بووە و وتی: سەهوم کردووە لە بەیانی قیمەتەکەدا، ئەوە ئەگەر بۆ ئەم سەهو و غەڵەتەی بیانوویەکی عـەقڵ گـرتووی نـەهێنـایەوە، ئـەو

دووهەم بدا کە نەیزانیوە بەو قیمەتە راستەقینەیە؛ جا ئەگەر سوێندی خوارد، ئەوە باشە وە ئەگەر سوێندی نەخوارد، ئەوە سوێندەکە ئەگەڕێتەوە بۆ سەر فرۆشیارەکە و کە ئەم سوێندی خوارد بەو قیمەتە زۆرەی کڕیوە، زیادەکە بەمسوێندە دانامەزری، بەڵکوو، کابرای فرۆشیار حەقی ئەوە پەیدا ئەکا کە یا ڕێگای دامەزرانی موعامەلەکە بدا بە قیمەتە کەمەکە کەپێی کڕاوە، یا موعامەلەکە هەڵوەشێنێتەوە وە ئەگەر عوزرێکی راستی هێنایەوە بۆ غەڵەتەکەی، ئەوە ئیددیعاکەی قەبووڵ ئەکری وە ئەگەر شاهیدی بوو، شاهیدەکەی لێوەرئەگیرێو ئەگەر شاهیدی نەبوو، ئەتوانێ سوێندی کڕیاری دووهەم بدا کە بەوقیمەتە زۆرەی نەزانیوە؛ جا ئەگەر سوێندی خوارد، ئەوە باشەو ئەگەر سوێندی نەخوارد، سوێنەکە ئەگەڕێتەوە بۆسەر کڕیاری یەکەم؛ جا کە ئەم سوێندی خوارد، ئەتوانێ یا ڕێگای موعامەلەکە بدا بە نرخە کەمەکە، یا هەڵیوەشێنێتەوە.

## باسی فروشتنی «أُصول»

ئەگەر کەسێك وتی بە کەسێکی‌تر: وا ئەو زەوییە یا ئەو عەرسە یا ئەو مەیدانەم پێفرۆشتی، ئەوە وەکوو زەوییەکە ئەفرۆشرێ، هەرچیشی تیابێ لە خانوو [و] درەختی سەوزو شتیوا، بەشێك ئەبن لە فرۆشراوەکە؛ بەڵام داری کەوتوو یا داری وشكبوو، بەر فرۆشتنەکە ناکەون؛ هەروەها، هەر شەتڵێ کە لەو شوێنەدا کرابێ، چونکە شەتڵ بە نیازی گواستنەوە ئەنێژرێ؛ هەروەها، هەر بیرێکیش کە لەو شوێنەدا هەڵکەنرابێ، بەری فرۆشتنەکە ئەکەوێ، بەو شەرتە کە فرۆشیار باسی ئاوی ناوبیرەکە بکا لە کاتی فرۆشتنەکەدا، ئەگینا بەیعەکە بەتاڵ ئەبێتەوە، وەك لە «مُغني المُحتاج»دا بەیان کراوە. ئەو شتانە کە بەر فرۆشتنی زەوی ئەکەون، بە بێناوبردنیان، بەر رەهن ناکەون ئەگەر شوێنەکەیان خرایە رەهنەوە، مەگەر کابرای رەهن کەر بەتایبەتی باسیان بکا.

وەك بەیع وایە لەم حوکمانەدا کە بەیانمان کردن هەر سیغەیەك کە موڵکییەتی شتێك لەکەسێکەوە بگوێزێتەوە بۆ کەسێکی‌تر، وەك وەقفو بەخشینو وەسیەتو مارەیی‌دانانو عیوەزی خولعو کرێ؛ بەم رەنگە ئەگەر یەکێك ئەرزێك بدا بەکرێی

خانوویەکاکە بەکرێی گرتبێ، ئەوە هەر دارێکی سەوز لەو ئەرزەدا بێ، ئەکەوێتەبەر ئەو موعامەلەیە.

وە وەك رەهن وایە هەر سیغەیەك کە موڵکییەتی شتێك لە کەسێکەوە نەگوێزێتەوە بۆ کەسێکی تر، وەك پێ‌لێ‌نان‌و خواستن‌و بەکرێ‌دان؛ یەعنی ئەگەر کەسێك پێی‌لێ‌نا کە ئەو زەوییە ماڵی فلانکەسە، یا زەوییەکی بە شێوەی خواستن‌دا بە یەکێك یا پێی‌دا بە کرێ، ئەوە دارو درەختی ناو زەوییەکەی بەرناکەوێ.

ئەگەر کەسێك زەوییەکی فرۆشت کە حەقی ئاوی لە ئاوێکی حەڵاڵا هەبوو، وەك ئاوی چەم‌و باراناوو بەهاراو، ئەوە ئەو بەشە ئاوە بەر فرۆشتنەکە ئەکەوێ هەرچەند باسیشی نەکرابێ‌و ئەگەر زەوییەکەی فرۆشت بە چەندکەس وەك یەك یا بە زیادو کەم، ئەوە هەر بەشێکی بەپێی خۆی حەقی خواردنەوەی هەیە لەو ئاوە؛ هەروەها، ئەگەر ئاوی ئەو ئەرزە لەناو خۆیا یا لە سنووریدا بێ‌و موڵکی خاوەن زەوییەکە بێ، ئەوە هەرچەند باسیشی نەکا، هەر بەر فرۆشتنەکە ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر ئەو ئاوە کەموڵکی فرۆشیارەکەیە لە دەرەوەی سنووری زەوییەکەدا بوو، بەر فرۆشتنەکە ناکەوێ، تا فرۆشیار بەتایبەتی ناوی نەبا، بەوجۆرەکە بڵێت: وا ئەو زەوییەم پێ‌فرۆشتی لەگەڵ ئەو ئاوەی خۆیدا یا لەگەڵ حەقی ئاوخواردنەوەدا؛ ئەوکاتە، ئاوەکەشی بەرئەکەوێ.

بزانن! دروست نییە فرۆشتنی حەقی ئاوخواردنەوەی زەوی بە بێ‌فرۆشتنی زەوییەکە، وەك چۆن دروست نییە فرۆشتنی حەوشی خانوو بە بێ‌فروشتنی خانووەکە، چونکە ئەمانە فەرعن و تابیعی ئەسڵن‌و فەرع بە بێ‌ئەسڵ نافرۆشرێ، بەڵام ئەسڵ بە بێ‌فەرع ئەفرۆشرێ.

هەروەها بەر فرۆشتنی زەوی ئەکەوێ بنی هەر گیایێ کە جار لەدوای جار، گیاکە ببڕرێ‌و هەڵبداتەوە، وەك کەوەرو کەرەوزو نەعناو تەرەتیزەو وەنەوشەو نێرگس‌و کاڵەك‌و خەیارو ترۆزی؛ ئەمانە هەموویان بنەکەیان بەر فرۆشتنی زەوییەکە ئەکەوێ؛ بەڵام ئەو ئەندازە گیایە کە لەکاتی فرۆشتنەکەدا بەدەرەوە بێ، ئەوە هی فرۆشیارەکەیەو پێویستە شەرتی بڕینی بکرێ ئەگەر گیای کۆن‌و تازەی زووبەزوو تێکەڵی یەك ئەبوون.

ئەو گیایانەکە بەیەك جار ئەبڕرێن، وەك گەنمو جۆو گێزەرو توورو چەوەنەرو سیرو پیاز، نە خۆیانو نەبنەکەیان بەر فرۆشتنی زەوییەکە ناکەون، مەگەر کابرای فرۆشیار بڵێ: وا ئەو زەوییەم پێ‌فرۆشتی لەگەڵ ئەو زەرعاتەی تیایدا کراوە، بەو شەرتە زەرعاتەکە رێگای چاوپێ‌کەوتنی زەوییەکە نەگرێو تێکڕا بەشێوەیەکی عادەتی تەماشای بکرێو ببینرێ.

دروستە فرۆشتنی زەوییەك کە زەراعەتی تیاکرابێ مادام زەراعەتەکە زەوییەکەی دانەپۆشیبێ و کڕیار حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە ئەگەر نەیزانیبێ ئەو زەوییە زەراعەتی تیاکراوە وە ئەگەر بەیعەکەی رەوا بینی، زەوییەکە لەدەستی کڕیارەکەدا ئەبێو زەراعەتەکە لەدەستی فرۆشیارەکەدا و زەراعەتەکە رێگا لەوە ناگرێ کە زەوییەکە لەدەستی کڕیارەکەدا بێ.

هەر تووێك وەشێنرابێ بە زەویدا، وەك زەراعەت وایە؛ ئەگەر ئەو زەراعەتە کە لەو تووە پەیدا ئەبێ بمێنێتەوە، یەعنی بۆ ئەوە دەس‌بدا چەند جار ببڕرێو هەڵبداتەوە، ئەوە تووەکە بەر بەیعەکە ئەکەوێ وە ئەگەر زەراعەتەکە بەکەرەتێك ببڕرێتەوە، ئەوە بەر بەیعەکە ناکەوێو بە دەستی فرۆشیارەوە ئەمێنێتەوە؛ لەم جۆرە حاڵەتەدا فەرموودەی راستتر، ئەوەیە کڕیار حەقی زەوییەکەی نییە بۆ ئەو ماوەیەکە زەراعەتەکە لە زەوییەکەدا ئەمێنێتەوە.

تائێستە قسە لەوەبوو فرۆشیار هەر باسی زەوییەکە بکا لە بەیعەکەدا وە ئەگەر باسی ئەرزەکە و تووەکەی کرد و وتی: ئەو زەوییەم پێ‌فرۆشتی لەگەڵ تووەکەدا یا لەگەڵ ئەو زەراعەتەدا، وە زەراعەتەکەش لەوانەبێ کە بەتەنها فرۆشتنی دروست نەبێت، یاخود بەتەنها هەر تووەکە یا هەر زەراعەتەکەی فرۆشت، ئەوە لەم سوورەتانەدا ئەو بەیعە دانامەزرێ.

بەڵام زەراعەتێك کە بەتەنها بفرۆشرێ، وەك قەرسیلی گەنمو جۆو شتیواکە هێشتا گوڵی نەکردبێت، یا زەراعەتێك کە گوڵی کردبێو دەنکەکانی تیا ببینرێ، وەك گەنمە شامی، ئەوە دروستە بەتەنها بفرۆشرێ.

هەروەها بەر بەیعی زەوی ئەکەوی ئەو بەردەی کە خوا خەلقی کردووە لەو زەوییەدا یاخود قایم کراوە تیایدا بەهۆی بینای حەسارو خانووەوە؛ بەڵام ئەو بەردانەی کە شاررابنەوە تیایدا، ئەوانە بەر بەیعەکە ناکەون و کڕیاریش حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە ئەگەر زانیبێتی ئەو بەردانە وان لەو زەوییەدا یاخود نەی زانیبێ، بەڵام هەڵکەندنیان زیانی بۆ زەوییەکە نەبێ و لەم کاتەدا، پێویستە لەسەر فرۆشیار ئەو بەردانە بگوێزێتەوەو ئەرزەکەش تەخت بکاتەوە وە ئەگەر کڕیار نەیزانیبێ بەوبەردانەو گوێزانەوەشیان زیان بگەیەنێ بە زەوییەکە، حەقی پەشیمان بوونەوەی ئەبێ؛ جا ئەگەر ڕێگای بەیعەکەی دا، ئەوە واجبە لەسەر فرۆشیار ئەو بەردانە بگوێزێتەوەو زەوییەکەش تەخت بکاتەوە؛ بەڵکوو ئەگەر لەپاش وەرگرتنی زەوییەکە لەلایەنی کڕیارەوە بەردەکانی گوێزایەوە، کرێی زەوییەکەی بۆ ئەو ماوەیە ئەکەوێتە سەر.

ئەگەر کەسێ باخێکی فرۆشت، ئەرزی ئەو باخەو داری تەڕو دیوارو هەر خانوویەكو کەپرو کەوێڵێك لەو باخەدا کرابێتەوە، بەر بەیعەکە ئەکەوێ، هەروەها بنی هەر گیایەك کە دەوامدار بێ، وەك کەوەر، بەڵام گیایەك کە لە کاتی بەیعەکەدا بەرز بووبێتەوە، ئەوە هی فرۆشیارەکەیە.

ئەگەر کەسێك دێیەکی فرۆشت، هەموو خانووەکانی ئەو دێیەو بۆشایی بەینی خانووەکانو دەوری خانووەکان ـ کە لەمدیوی حەساری دێیەکەوە بێ ـ بەر بەیعەکە ئەکەون، هەروەها حەساری دێکەیش بەر بەیعەکە ئەکەوێ؛ بەڵام ئەو کێڵگانەی کە لەودیوی حەسارە کەوەن بەرناکەون، هەرچەند لکابن بە حەسارەکەشەوە وە ئەگەر دێیەکە حەساری نەبوو، هەر شوێنێ کە بەپێی عورفو عادەت وا دابنرێ کە لکاوە بە بیناو خانووی دێکەوەو بە بەشێك لە دێکە دابنرێ، بەر فرۆشتنەکە ئەکەوێ؛ هەروەها، حەریمی دێکەیش، یەعنی ئەو شوێنانە کە پێویستن بۆ ئاوەدانی دێکە، وەك شوێنی فڕەدانی زبڵو خۆڵەمێشو کانیو ئاوی ناودێو جێگەی مۆڵدانی رانو دۆشینی حەیوانو شوێنی غارکردنی ئەهلی ئاوایی و شوێنی وڵاخ تەعلیم کردن و شوێنی یاری کردنی منداڵان، هەموو بەر فرۆشتنەکە ئەکەون؛ هەروەها، ئەو شوێنانەش بەری

فرۆشتنەکە ئەکەون کە گیایان لیّ ئەبڕن و داریان لیّ ئەهێنن بۆ سووتاندن کە پێویست بن بۆ مانەوەو ژیانی دێکەو ئەهلی دێکە.

ئەگەر لەپاڵ دیّ فرۆشراوەکەدا، دێیەك یازیاتر هەبوو و نەمانزانی ئاخۆ لەپاش ئاوەدان کردنەوەی ئەو دێیەدا ئاوەدان کراوەتەوە یا لەپێشیا، ئەوە ئەمانیش لەگەڵ ئەهلی ئەم دێیەدا خاوەن حەقن لە حەریمی دیّ فرۆشراوەکەدا، بەپێی عورفو عادەتی پێشوو.

ئەگەر کەسێك خانوویەکی فرۆشت، ئەوە ئەرزەکەیو هەموو بیناو هۆدەکانیو داڵانو پشت دەرگاو هۆدەیەکیش ـکە دەرگای لەسەر قاپی گەورەنەبیّ ـ ئەکەوێتە بەر فرۆشتنەکە؛ هەروەها، حەمامو ئەدەبخانەو سەرتەنوورو چێشتخانەو هەر درەختێکی سەوز کە لەو خانووەدا بیّو دارێکی وشك کە لە جیاتی کۆڵەکە لەو خانووەدا بەکارهێنرابیّو ئەگەر کەسێك سەرخانیماڵی خۆی فرۆشت، ئەوە فەرموودەی بەهێز ئەوەیە ئەگەر ناوی سەقفی هۆدەی ژێروو نەبا، ئەوە بەر بەیعی خانووی سەرەوە ناکەویّ، بەڵام هەتا ئەو خانووەی سەرەوە مابیّ خاوەنەکەی حەقی ئەوەی هەیە قازانج لەو سەقفە وەربگریّ وە ئەگەر هاتو سەقفەکە رووخا،کابرای خاوەنی ناچار ناکریّ کە دروستی بکاتەوە.

هەروەها، بەر بەیعی خانوو ئەکەویّ دەرگای قایم کراوو حەڵقەو دوولایی دەرگاو رەفەو پەیژەی قایمکراوو بەردی ژێرووی دەستاڕ کە لەناو خانوودا بیّ و بەردە سەرووەکەش بە پێی فەرموودەی راستتر؛ هەروەها، هەرشتێکی گوێزراوەی واکە پێویست بیّ بۆ کەڵكوەرگرتن لە شتیّ کە نەگوێزرێتەوە، وەك بەردی سەرتەنوورو دۆڵەی لای دەستاڕو دەڕابەی دووکان؛ بەڵام شتێکی گوێزراوەی واکە لەم جۆرە نەبیّ، وەك دۆڵچەی بیرو بەکرەکەیو کورسیو سندووقو شتیوا، ئەوە بەر فرۆشتنەکە ناکەویّ.

ئەگەر کەسێك وڵاخێکی فرۆشت، ئەوە ناڵی وڵاخەکە بەر فرۆشتنەکە ئەکەویّو لە فرۆشتنی حوشتردا، حەڵقەی لووتی وشتر بەرئەکەویّ؛ بەڵام رەشمەو سەر کەللەو لەغاوو کۆپانو زینو سەرزینو سەرجلو شتیوا بەرناکەویّ، مەگەر کابرای فرۆشیار بەتایبەتی ناویان بەریّو بەر فرۆشتنەکەیان بخا.

ئەگەر کەسێك داری تەڕی فرۆشت، هەموو ریشەو رەگەکانی و لقە تەڕەکـانیو گەڵاکانی بەر ئەکەون؛ بەڵام لە وڵاتێکا کە کرمی ئاورێشم پەروەردە بکرێ، بە فەرموودەی هەندێ لە زانایان، گەڵای دارتوو ناکەوێتە بەر فرۆشتنی درەختی توو، چـونکە ئـەو گەڵایە وەك میوە وایەو ئەفرۆشرێ بۆ خۆراکی کرمی ئاورێشمەکانو بە هیچ جۆرێ، لقی وشکی دەرەختی تەڕی فرۆشراو بەر فرۆشتن ناکەوێ؛ فرۆشتنی درەخـتی تـەڕ دروستە بەشەرتی هەڵکەندنو بڕینو هێشتنەوە وە ئەگەر باسی هیچکام لەمانە نەکرا، درەختەکە ئەهێڵرێتەوە. فەرموودەی راستتر، ئەوەیە شوێنی درەختی تەڕ ناکەوێتە بەر فرۆشتنی درەختەکە، هەروەها دەوروپشتی بنەکەشی؛ بەڵێ، کابرای کڕیار حەقی هەیە هاتوچۆ بکا بە بنی ئەو درەختەدا هەتا درەختەکە مابێ وە ئەگەر ئەو درەختە کەوتو ئەتوانرا بچەقێنرێتەوەو وشك نەبێ، دروستە بۆ خاوەنەکەی دایچەقێنێتەوە، بەڵام ئەگەر لەو شوێنەدا لابرا، دروست نییە خاوەنەکەی دارێکی تر لەو شوێنەدا بڕوێنێ.

ئەگەر کەسێك دارێکی داچەقاوی وشکی فرۆشت، رەگی دارەکەو لقەکانی بـەر فرۆشتنەکە ئەکەون، بەڵام زەوی بنی ئەو دارەو جـێی داچـەقاندنی بـە هـیچ جۆرێ بەرناکەون؛ دروستە فرۆشتنی ئەو دارە بەشەرتی بڕینەوەو هەڵکەندنی، بەڵام دروست نییە بەشەرتی هێشتنەوەی، مەگەر لەبەر مەبەستێکیوا کە عەقڵ بیگرێ، وەك ئەوە کە بکرێ بە کۆڵەکەی کەپرێك یا بینایەك لەو شوێنەدا وە ئەگەر لە فرۆشتنەکەیدا ناوی هیچ نەبرا، پێویستە کە ببڕرێو لابرێ، چونکە عورفو عادەت وایە داری وشك لابرێ.

هەر سەمەرێك کە بە داری خورماوە بێ لە کاتی فرۆشتنی ئەو دارەدا، ئەگەر شەرت کرا بۆ فرۆشیارەکە یاکڕیارەکە، ئەوە بۆ ئەو کەسە ئەبێ کە بۆی شەرت کراوە وە ئەگەر ناوی کەسیان نەبرا، ئەوە ئەگەر سەمەری دار خورماکە هیچی دەرنەکەوتبوو، هەمووی بۆکڕیارەکەیە وە ئەگەر هەمووی دەرکەوتبوو، بۆ فرۆشیارەکەیەو ئەگەر هێشتا هەمووی دەرنەکەوتبوو، ئەوەی کە دەرکەوتووە، بۆ فرۆشیارەو ئەوەیشی لەمەوپاش دەرئەکەوێ، بۆ کڕیارەکەیە.

هەر درەختێکی تری بەردار کە بفرۆشرێ، ئەگەر بەرەکەی بـێ گـوڵ دەرئـەچوو، وەکوو هەنجیر و ترێ، ئەوە ئەگەر بەرەکەی دەرکەوتبوو، بۆ فرۆشیارەکەیە وە ئەگەر

دەرنەکەوتبوو، بۆ کڕیارەکەیە وە ئەگەر بەرەکەی لەگوڵا دەرئەچوو و لەپاشاناگوڵەکەی دائەوەری، وەکوو هەڵووژە و سێوو قەیسی، ئەوە ئەگەر بەرەکەی گرێی نەکردبوو، یا گرێی کردبوو، بەڵام گوڵی نەوەراندبوو، ئەوە هی کڕیارەکەیە وە ئەگەر گوڵی داوەراندبوو، ئەوە هی فرۆشیارەکەیە.

ئەگەر کەسێك کۆمەڵێك دارخورمای فرۆشت کە لە یەك باخا بوون و ئەو دارخورمایانە «طَلع»یان ـ دەرکردبوو ـ کە شتێکە لە دارخورما دەرئەچێ وەك دوو ناڵی یەك‌لەسەریەك و بەرەکەیش وا لەبەینیاندا، وە هەندێکیش لەو دارانە پەیوەند (تلقیح) کرابوون، ئەوە هەموو ئەو بەرە هی فرۆشیارەکەیە؛ ئەگەر ئەوانەیان کە پەیوەند نەکراون بەجیا فرۆشران، ئەوە بەرەکەیان بۆ کڕیارەکەیە وە ئەگەر ئەو دارانە لە دوو باخا بوون‌و داری باخێکیان پەیوەند کرابوو و داری باخەکەی‌تریان پەیوەند نەکرابوو، ئەوە هەر یەکێ لەم‌باخانە، حوکمی سەربەخۆیە، یەعنی بەری یەکێکیان هی فرۆشیارەو هی ئەویان هی کڕیارە.

هەرکاتێ سەمەر بوو بە ماڵی فرۆشیار، ئەوە ئەگەر لە موعامەلەکەدا شەرتی بڕینی کرابوو، پێویستە لەسەر فرۆشیار ئەو سەمەرە ببڕێ، ئەگینا ئـەتوانـێ وازی لێ‌بـێنێ تاکاتی بڕینەوەی سەمەرەکە دێت‌و لەم سوورەتەدا، دروستە بۆ هەردوولا ئاوی دارەکان بدەن، ئەگەر ئاودان سوودی هەبوو بۆ دارەکان‌و بۆ سەمەرەکەیشیان و کەسیان ناتوانێ مەنعی ئەولایان بکا لەو ئاودانە، چونکە قازانجەکەی بۆ هەردولایانە وە ئەگەر ئاودانی ئەو دارانە زیانی هەبوو بۆ هەردوولایان، ئەوە دروست نییە بۆ کەسیان ئاویان بدا بـە بێ‌ڕەزای ئەولا وە ئەگەر هەر بۆ لایەکیان زیانی هەبوو و هەرایان لەبەینا پەیدابوو، ئەوە ئەو موعامەلەیە فەسخ ئەکرێتەوە، مەگەر لە کاتێکا ئەوکەسیانە کە زیانەکەی تـووش بووە، چاوپۆشی بکا لە زیانەکەی خۆی وە ئەگەر سەمەری دارەکان تەڕایی دارەکانی ئەمژی، ئەوە واجبە لەسەر فرۆشیار ئەو سەمەرە لابەرێ یاخود ئاوی دارەکان بدا.

## باسی فرۆشتنی سەمەر

سەمەر، یا قازانج و سوودی دەرکەوتووە یـا نـە؛ درکـەوتنی سـوود و قـازانـجی سەمەریش، بەوەیە ئەگەر ئەو سەمەرە ڕەنگ بگرێ، ئەو ڕەنگەی تـیا دەربکـەوێ و

دەست بکا بە سووربوون لە میوەی سووردا و بە رەش بوون لە میوەی رەشدا وە بەم جۆرە... وە لەو میوانەدا کە خۆرەنگ بن، بەوە ئەبێ کە دەس بکا بە گەیشتن و لە دانەدا، بەوە ئەبێ کە دەنکەکەی رەق ببێ و لە چەشنی خەیار و ترۆزی و شتی وادا، بەوە ئەبێ کە بە پێی عورف و عادەت بگاتە کاتی چنین و لێ کردنەوە.

جا، سەمەر ئەگەر قازانج و سوودی دەرکەوتبوو ـبا لە هەندێکیشیا بێ ـ ئەوە دروستە بفرۆشرێ بە بێ‌شەرت و بە شەرتی برین و بە شەرتی هێشتنەوە؛ ئەگەر بە بێ شەرت فرۆشرا، کڕیار حەقی هەیە بیهێڵێتەوە تا بە عادەت ئەبڕرێ. ئەگەر ئەو سەمەرەی کە ئەیفرۆشێ سەمەری یەك باخ بێ و قازانجی هەمووی یا هەندێکی دەرکەوتبێ، ئەوە باشەو ئەگەر سەمەری دوو باخی فرۆشت کە قازانجی سەمەری یەکێکیان دەرکەوتبوو و هی ئەویان دەر نەکەوتبوو، ئەوە هەر باخێك، بە جیا حوکمی خۆی هەیە، یەعنی فرۆشتنی سەمەری باخی یەکەم دروستە و هی باخی دووهەم دروست نییە و هەر سەمەرێك کە کابرای فرۆشیار لە پاش فرۆشتنی حەقی هێشتنەوەی هەبوو، پێویستە فرۆشیارەکە ئاوی دەرختەکانی بدا، چ لە پێش خاڵی کردنیا بۆ کڕیارو چ لە پاش خاڵی کردنی و کڕیاریش ئەتوانێ تەسەڕوفی تیا بکا پاش رێگادانی لە لایەن فرۆشیارەوە.

هەر سەمەرێك لە کاتی فرۆشتنیا شەرتی بڕینی کرابوو، پێویست نییە لە سەر فرۆشیار ئاوی دارەکانی بدا لەبەر خاتری سەمەرەکە، مەگەر سەمەرەکە زۆربێ و بڕینەکەی ماوەیەکی زۆری پێ بچێ، ئەو کاتە واجبە لە سەری ئاوی دارەکان بدا بۆ ئەوە کە سەمەرەکە خراپ نەبێ و ئەم کردەوەیە پێویستی بە جێ‌هاتنی بە دەستەوەدانی سەمەرەکەیە بە شێوەیەکی شەرعی.

ئەگەر بەڵایەك بە سەر ئەم سەمەرەدا هات، وەك سەرما و تەرزە و کولە و شتی وا، بەرلەوەی کڕیارەکە وەری بگرێ، ئەوە ئەو سەمەرە لە ئەستۆی فرۆشیارەکەدایە و حەقی وەرگرتنی قیمەتی نییە وە ئەگەر وەریشی گرتبێ، واجبە بیداتەوە بە کڕیارەکە وە ئەگەر ئەم ئافەتانە لە پاش وەرگرتن بوو، ئەوە لە ئەستۆی کڕیارەکە خۆیدایە چونکەماڵەکەی وەرگرتووە، بە تایبەتی ئەگەر واجب بێ لە سەری سەمەرەکە ببڕێ، خواە قازانج و

کەڵکی ئەو سەمەرە دەرکەوتبێ و شەرتی بڕینی کرابێ، یا خود دەر نەکەوتبێ لە کاتی فرۆشتنەکەدا.

وە ئەگەر ئەو سەمەرە بە هۆی کەمتەرخەمی فرۆشیارەکەوە فەوتا؛ مەسەلا، ئاوی دارەکانی نەدا بۆ ئەوەی بفەوتێن، ئەوە فرۆشیارەکە زامنی ئەبێ و لەم کاتەدا کڕیار حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە دەس بە جێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئاوی باخەکە وشکی کردبوو، یا خود فرۆشیار بیانوویەکی شەرعی هەبوو لە ئاونەدانا، ئەوە هیچ ناکەوێتە ئەستۆی، چونکە کەمتەرخەمی و درێغی نەکردووە.

ئەگەر کەڵك و قازانجی ئەو سەمەرە دەر نەکەوتبوو، ئەوە دروست نییە بفرۆشرێ مەگەر بە دوو شەرت: یەکەم، شەرتی بڕین و لابردنی؛ دووهەم، ئەوە کە سەمەرە بڕاوەکە قازانجێکی عادەتی هەبێ، وەك بەرسیلە و بادەم، نەك وەکوو هەرمێ و بەهێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو سەمەرە لە سەر دارێکی بڕاو یا دارێکی وشك بێ، ئەوە فرۆشتنی دروستە بە بێ شەرتی بڕین، هەروەها ئەگەر دارەکەی هی کڕیارەکە بوو؛ بەڵکوو ئەگەر لەم کاتەدا فرۆشیار شەرتی بڕینی ئەو سەمەرە بکا، پێویست نییە کڕیار ئەو شەرتە بە جێ بێنێ وە ئەگەر سەمەرەکە لەگەڵ دارەکەدا فرۆشرا، ئەوە دروستە بە بێ‌شەرتی بڕین بیفرۆشێ؛ بەڵکوو ئەم شەرتی بڕینی سەمەرە لەم وەختەدا، بەیعەکە هەڵئەوەشێنێتەوە، چونکە ئەبێ بە شەرتی شتێکی ناشەرعی لە سەر ماڵی غەیر، ئەمەیش بەیعەکە لە ئامانجی شەرعی لا ئەدا.

بەتاڵە بەیعی توو لە ناو خاکدا و حەرامە فرۆشتنی زەراعەتی سەوز، مەگەر بە دوو شەرت: یەکەم، شەرتی بڕینی ئەو زەراعەتە؛ دووهەم، ئەوە کە ئەو زەراعەتە سەوزە قازانجێکی هەبێ، وەك قەرسیل بۆ حەیوان؛ بەڵام ئەگەر ئەو زەراعەتە لەگەڵ ئەرزەکەدا فرۆشرا، ئەوە دروستە. هەروەها، دروستە فرۆشتنی زەراعەت بە تەنها لە پاش ڕەق بوونی دەنکەکانی بەو شەرتە کە ئەو دەنکانە دیار بن، وەك دەنکی جۆ لە ناو گوڵا، ئەگینا بەتاڵە، وەك فرۆشتنی گەنم لە ناو گوڵا، چونکە دەنکە کانی، بە دەرەوە نییە؛ بەڵێ، دروستە فرۆشتنی شتێ لە ناو بەرگێکا کە لانەچێ مەگەر لە کاتی خواردنا، وەك توێکڵی هەنار؛ هەرشتێ کە دوو بەرگی هەبێ، وەك گوێز و بادام و باقلە، ئەوە بە توێکڵە

ژێرووەکەیەوە ئەفرۆشرێ و دروست نییە بە هەردوو توێکڵەکەیەوە بفرۆشرێ. بەڵام ئەگەر لەوانە بوو کە بە تەڕی ئەخورێن، وەك پاقلە و لۆبیا و بادام، ئەوە دروستە.

ئەگەر کەسێك سەمەرێکی وای فرۆشت کە تازەی لەگەڵ کۆنەی تێکەڵ ئەبوو، ئەوە دروست نییە بە بێ‌شەرتی بڕینی ئەو سەمەرە، بۆ ئەوەکە ماڵی فرۆشیار و کڕیار تێکەڵی یەك نەبن‌و ئەگەر تێکەڵ بوونی تازە و کۆنە لەو سەمەرەدا شتێکی نایاب بوو و بەڕێکەوت تێکەڵ ئەبوون، ئەوە بەیعەکە هەڵناوەشێتەوە بەم تێکەڵبوونە؛ جا ئەگەر فرۆشیار چاوپۆشی کرد لە حەقی خۆی بۆ کڕیارەکە، ئەوە باشە، ئەگینا کڕیار حەقی هەیە پەشیمان بێتەوە.

دروست نییە فرۆشتنی گەنمی ناو پەڵە (حِقل) بە گەنمی پاك کە پێی ئەڵێن: «مُحاقَلَة»؛ هەروەها، دروست نییە فرۆشتنی خورما بە دارەوە بە خورمای لێ کراوە کە پێی ئەڵێن: «مُزابَنَه»؛ هەروەها، دروست نییە فرۆشتنی ترێی ناو رەز بە مێوژ؛ بەڵێ، شەرع روخسەتی داوە بۆ فرۆشتنی ئەم جۆرە میوانە بەو شەرتە لە پێنج «وِسق» تێ نەپەڕێ کە ئەکاتە چل و پێنج تەنەکە و فرۆشتنی زیاتر لەو ئەندازەیە دروست نییە، مەگەر بە دوو موعامەلە و کە موعامەلەیەك کرا [و] کەمتر بوو لەو ئەندازەیە، واجبە کابرای خاوەنی خورمای تەڕو کابرای خاوەن‌ترێ، دەس بە جێ رێگای درەختەکە چۆڵ بکەن بۆ کڕیارەکە و ئەبێ ئەویش دەس بە جێ ماڵەکەی خۆی تەسلیم بکا بە فرۆشیار؛ وەنەبێ ئەم جۆرە موعامەلەیە تەنها لەگەڵ فەقیری بێ‌دەسەڵاتدا دروست بێ، بەڵکوو لەگەڵ دەوڵەمەندیشدا دروستە؛ فەرموودەی ئاشکراتر ئەوەیە ئەم موعامەلەیە لە غەیری خورمای تەڕ (رُطَب) و ترێ‌دا دروست نییە؛ کەواتە، قەیسی و هەڵووژە و هەنجیری تەڕو میوەی‌تر نافرۆشرێن بە هاوچەشنی وشکی خۆیان.

## باسی یەك نەکەوتنی فرۆشیار و کڕیار

ئەگەر فرۆشیار و کڕیار قسەیان یەك نەکەوت لە بارەی ئەسڵی موعامەلەوە، یەعنی کڕیار وتی: ئەم ماڵەم کڕیوە لێت‌و فرۆشیار وتی: نەم فرۆشتووە، ئەوە فرۆشیار سوێند ئەدرێ، چونکە ئەڵێ، عەقدەکە نەبووە و بە دەستووری شەرع، هەرکەسێ نەفیی عەقد

بكا ئەوە سوێند ئەدرێ وە ئەگەر قسەیان یەك نەكەوت لە بارەی دامەزران و دانەمەزرانی موعامەلەكەوە ـ مەسەلا ـ فرۆشیار وتی: سیغەی فرۆشتنمان بەدەمدا نەهاتووەو كڕیار وتی: بە دەممانا هاتووە، یا خود فرۆشیار وتی بە كڕیار: تۆ قەبووڵت نەكردووەو كڕیار وتی: قەبووڵم كردووە، یا خود فرۆشیار وتی: بەینێكی زۆر كەوتووە لە بەینی پێفرۆشتنی من و قەبووڵ كردنی كڕیارداو كڕیار وتی: بەینی نەكەوتووە یا بەینەكەی زۆر نەبووە، یا خود فرۆشیار وتی بەكڕیار: چاوت بە فرۆشراوەكە نەكەوتووە وكڕیار وتی: چاوم پێ كەوتووە، یا بە پێچەوانەی ئەمانەوە كە وتمان، وە شاهیدیش لە بەینا نەبوو، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، ئەو كەسەی كە ئیددیعای دامەزرانی فرۆشتنەكە ئەكا ئەوە سوێند ئەدرێ و فرۆشتنەكە بە دروست و دامەزراو دائەنرێ، چونكە پەیڕەوێكی شەرعی هەیە، ئەڵێت: «زیاتر باوەڕ بەو كەسە ئەكرێ كە ئیددیعای دامەزرانی موعامەلە ئەكا»؛ جارجاریش باوەڕ بەو كەسە ئەكرێ كە قسەكەی ئەبێ بە هۆی دانەمەزرانی موعامەلەكە، وەك ئەوە كەسێك گەزێك زەوی بفرۆشێ لە زەوییەكی وادا كە ئەندازەكەی دیاری بێ و كابرای فرۆشیار ئیددیعای ئەوە بكا كە ئەو گەزە زەوییە لە عەقدەكەدا دیاری كراوە و مەبەستی لەمە هەڵوەشاندنەوەی موعامەلەكە بێ ـ چونكە گەزێك زەوی دیاریكراو لە وانەیە كەڵكی لێوەرنەگیرێ، بە پێچەوانەی زەوی دیارینەكراوەوە، چونكە ئەڵێن فلانكەس هاوبەشە لەو زەوییەدا و چەندیەكی هەیە ـ وكڕیاریش بڵێ: نەخەیر، ئەوگەزە زەوییە دیاری نەكراوە، ئەوە لەم حاڵەدا باوەڕ بە فرۆشیار ئەكرێ و فرۆشتنەكە بەتاڵ ئەكرێتەوە.

هەر لەو سوورەتانەیە كە باوەڕیان تیا ئەكرێ بە قسەی ئەو كەسە كە قسەی ئەبێ بە هۆی دانەمەزرانی موعامەلەكە، ئەمە كە فرۆشیار ئیددیعا بكا بڵێ، لەو كاتەدا كە ئەو ماڵەم فرۆشتووە، منداڵ بووم یا شێت بووم، یا قازی حیجری لە سەر دانابووم و لە راستیشدا وەختی خۆی شێتی بە سەردا هاتبێ یا حیجری لە سەر دانرابێ، ئەوە سوێند ئەدرێ و عەقدەكە بەتاڵ ئەكرێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر زوو لەكاتی فرۆشتنەكەدا پێی لێ نابوو كە بە شەیتانی بوون (إحتلام) باڵغ بووە، ئێستە پێچەوانەی ئەو قسەیەی لێ نابیسرێ.

وە ئەگەر فرۆشیار و کڕیار هاوقسە بوون لەوەداکە فرۆشتنەکە دامەزراوە، بەڵام یەك نەکەوتن لە ئەندازەی ماڵە فرۆشراوەکەدا، فرۆشیارەکە ئەیوت دوو گەزەو کڕیارەکە ئەیوت چوار گەزە، یا لە ئەندازەی قیمەتەکەیداو فرۆشیار داوای زیاتری ئەکرد، یا خود یەك نەکەوتن لە جینسی قیمەتەکەدا ئاخۆ ئاڵتوونە یا زیوە، یا لە سیفەتی قیمەتەکەدا ئاخۆ ئاڵتوونی تێزابە یا نە، یا لە شەرتی رەهنا یاکەفالەتا یا لە شەرتی ئەوەدا کە حەیوانەکە شیری زۆر بێ و هیچ کامیشیان شاهیدیان نەبوو، یا خود هەردووکیان شاهیدیان هەبوو و شەهادەتەکەیان «تَعارُض»ی، کردبوو لە بەر ئەوە کە هەردوولا بە موتڵەقی شەهادەتی دابوو، یا خود یەکێکیان شەهادەتەکەی موتڵەق بوو و شەهادەتی ئەویان «مُقیَّد» بوو، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، پێویستە هەردوولایان یەکێ سوێندێك بخۆن [و] نەفی و ئیسباتی تیا کۆبکەنەوە، یەعنی نەفیی ئیددعای ئەویان و ئیسپاتی ئیددیعای[1] خۆیان، جا کە هەردوولا سوێندیان بەم جۆرە خوارد، ئەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە عەقدەکە بەم سوێنانە بەتاڵ نابێتەوە، بەڵکوو ئەگەر هەردوولا لە پاشاناکەوتنەیەك و ناکۆکییان لە بەینا نەما، ئەوە باشە، ئەگینا هەردووکیان یا یەکێکیان، یا حاکمی شەرع، فرۆشتنەکە هەڵئەوەشێنێتەوە و دوایی پێ ئەهێنێ؛ ئەمجار پێویستە لە سەر فرۆشیار ئەگەر قیمەتی ماڵەکەی وەرگرتبوو، بە خۆی و هەر زیادەیەکەوە کە پێیەوە بێ، بیداتەوە بە کڕیار؛ هەروەها، واجبە لە سەر کڕیاریش ماڵە فرۆشراوەکە بە خۆی و هەر زیادەیەکەوەکە پێیەوەیە، بیداتەوە بە فرۆشیارەکە وە ئەگەر کڕیارەکە لەو ماوەیەدا ماڵەکەی وەقف کردبوو یا فرۆشتبووی یا مردبوو لای، ئەوە لازمە قیمەتەکەی بداتەوە بە فرۆشیارەکە و ئەو قیمەتەیش بە پێی رۆژی فەوتانی ماڵەکە حیساب ئەکرێ وە ئەگەر ماڵەکە عەیبدار بووبوو لای، پێویستە بیداتەوە لەگەڵ بژاردنی زیانی عەیبدارییەکەیدا. یەك نەکەوتنی قسەی میراتگرانی فرۆشیار و کڕیاریش، وەك یەك نەکەوتنی قسەی خۆیانە، بەو چەشنەی کە باسمان کرد.

---

١. سوننەتە لەو سوێنانەدا نەفیەکە بخرێتە پێش ئیسباتەکەوە؛ مەسەلا، فرۆشیار بڵێ: قەسەم بەخوا فلانە شتم نەفرۆشتووە بەوەندە، بەڵکوو بەوەندەم فرۆشتووە و کڕیاریش قەسەم بخوا، بڵێ: فلانە شتم بەوەندە نەکڕیوە، بەڵکوو بەوەندەم کڕیوە.

ئەگەر خاوەنی پێشووی ماڵەکە، وتی: ئەم ماڵەم پێ فرۆشتووی و ئەوی‌تر وتی: نەخەیر پێت بەخشیوم، ئەوە لەم حاڵەدا لە سەر شێوەکەی پێشوو سوێندی یەکتر نادەن، بەڵکوو پێویستە هەردووکیان سوێند بخۆن و هەرکامیان نەفیی ئیدیعای ئەوی‌تریان بکا؛ جا کە سوێندەکەیان خوارد، پێویست ئەبێ لە سەر ئەوەیان کە ئیدیعای بەخشینی ماڵەکەی کردووە، بیداتە دواوە بۆ خاوەنی پێشووی بە هەموو زیادەیەکەوە کە پەیدا بووە لێی، چ ئەوەی کە پێیەوە بێ، وەك خوری و قەڵەوی، یا جیابێ، وەك رۆن و دۆو بەچکەو بەری باخ؛ بەڵام ئەوەندە هەیە خاوەنی ماڵەکە کرێی ئەوماوەیەی ماڵەکەی ناکەوێتە سەر کە ئەوی‌تر ئیدیعای بەخشینی کردووە، چونکە بە بڕیاری هەردوولایان، ئەم کابرا ماڵی خۆی بە کار هێناوە، ئەوەندە هەیە یەکێکیان ئیدیعای فرۆشتنی ئەکا و ئەویان ئیدیعای بەخشینی؛ هەروەها، ئەگەر کابرایەك وڵاخێکی لە ژێر دەستی یەکێکا بێ‌و بڵێ: پێم فرۆشتووە و ئەویش بڵێ: بە خواستن خواستوومە و شاهید نەبوو لە نێوانیانا و ئەم کابرایە سوێندی خوارد کە نەیکڕیوە لەو خاوەن ماڵە، ئەوە لێرەیشدا کابرای خاوەن ماڵ کرێی ناکەوێ.

وە ئەگەر کەسێك دارێکی بەرداری کڕی لە یەکێك‌و لەپاش وەرگرتنی بەروبوومی ئەو دارە، کابرای خاوەن‌دار، وتی: ئەو دارەم پێ‌فرۆشتووی‌و قیمەتەکەیم ئەوێ، ئەویش وتی: نەم‌کڕیوەو سوێندی لەسەر خوارد، ئەوە پێویستە ماڵەکەی بداتەوە، بەڵام خاوەن‌ماڵ ناتوانێ بەروبوومی دارەکەی لێ‌بسێنێتەوە، چونکە ئیدیعای ئەوەی کردووە کە ئەو شەخسە کڕیویەتی و تەنها داوای قیمەتی کردووە، ئەویش بە هۆی سوێنەکەیەوە خۆی لەوە رزگارکردووەو لە واقیعدا قابیلە بەهۆیەکی‌ترەوە ئەو کابرا بەروبوومی دارەکەی وەرگرتبێ، وەکوو نەزری سەمەر یا حەڵاڵ کردنی یا بەخشینی... و لەم کاتەدا، خاوەن‌ماڵ، لەبەینی خۆی‌و خوادا حەقی هەیە ئەو بەیعە هەڵوەشێنێتەوە بۆ ئەوەی ماڵەکە لە راستی‌دا بیێتەوە بە ماڵی خۆی.

ئەگەر کەسێك ماڵێکی لەبەرچاوی فرۆشت و لەپاشا کابرای کڕیار ماڵێکی عەیبداری بۆ هێنایەوەو وتی: ئەوە ماڵە فرۆشراوەکەیەو فرۆشیار، ئینکاری کرد کە ئەوە ماڵە فرۆشراوە کە بێ، لەو حاڵەدا سوێندی فرۆشیار ئەدرێ، چونکە ئەسڵ ئەوەیە

ماڵەکە عەیبدار نەبووبێ‌و موعامەلەکە بە ساغی بمێنێتەوە؛ بەڵام لەم‌چەشنە موعامەلەیەدا لە سەلەمدا، ئەگەر کابرای ماڵوەرگر سەرێ حەیوانی بە سەلەم لە خاوەن ماڵێك وەرگرت و لەپاش ماوەیەك هێنایەوە بۆلای بە بەهانەی ئەوەوە کە عەیبدارە و کابرای خاوەن‌ماڵ وتی: ئەمە ماڵەکەی من نییە، ئەوە ئەو کەسە سوێند ئەدرێ کە ماڵەکەی وەرگرتووە، چونکە ئەسڵ ئەوەیە ماڵەکە هێشتا لەئەستۆی خاوەنەکەیدا بێ (یەعنی زیممەی خاوەن‌ماڵەکە مەشغووڵ بێ)؛ بە کورتی، ئوسووڵی ئەم شوێنە، ئەوەیە هەرکاتێك عەقد لەسەر ماڵی دیاری‌و لەبەرچاو کرا، ئەوە ئەو کەسە کە ماڵەکەی تەسلیم کردووە، ئەوە جێگای باوەڕە لەسەر سەلامەتی ماڵەکەی و هەرکاتێك عەقد لەسەر ماڵی وەسف‌کراوی لە ئەستۆدا بوو (مَوصوفٌ فِي الذِّمة) کرا، ئەوە باوەڕ بە سوێنی ماڵ وەرگرەکە ئەکرێ کەوا ئەو ماڵەی کە وەری‌گرتووە، عەیبدار بووە.

## باسی سەلەم

سەلەم بریتییە لە فرۆشتنی شتێ کە لەبەرچاوا نەبێ، بەڵکوو وەسف کرابێ و ناوونیشانی درابێ‌و لە ئەستۆی خاوەن‌ماڵەکەدا بێ، بەو شەرتە کە بەلەفزی «سەلەم» یا «سەلەف» یا تەرجەمەی ئەمانە بکرێ.

بۆ دامەزرانی سەلەم، حەوت شەرت پێویستە زیاد لەو شەرتانەی کە بڕیاردراون بۆ دامەزرانی فرۆشتنی هەرشتێك کە سوود (ربا)ی تیا نەبێ، بێجگە لە چاوپێ کەوتنی ماڵەکە؛ ئەو حەوت شەرتەش، ئەمانەن:

[شەرتی] یەکەم، ئەوەیە هەر لەو مەجلیسەدا کە عەقدەکەی تیا ئەکرێ، کابرای سەلەم‌دادەر (مُسلِم)، بریتی (بَدل)ی ماڵە سەلەم‌تیاکراوەکە بدا بە کابرای سەلەم‌کەر (مُسلَم إليه)، یەعنی بەرلەوەی کە جیابینەوە؛ کەواتە، قابیل نییە تەفرەدانی تەسلیم‌کردنی ئەو سەرمایەیە کە کابرای سەلەم‌دادەر ئەیدا بە کابرای سەلەم‌کەر.

وە ئەگەر کابرای سەلەم‌دادەر لەپێشا سەرمایەکەی نەخستە بەرچاو؛ مەسەلا، وتی: وا دینارێکم پێدای بە سەلەم بە فلانە شت، بەڵام لەپاش عەقدەکە خستیە بەرچاو و تەسلیمی کرد، ئەوە دروستە.

چاوپێ‌کەوتنی سەرمایەکافییە لەجیاتی زانینی ئەندازەکەی، ئیتر چ وێنەدار (مِثلی) بێ یا قیمەت‌دار (مُتقَوِم). ئەگەر کابرای سەلەم‌دادەر کابرای سەلەم‌کەری حەواڵەکرد بۆ سەر کەسێکی‌تر کە قەرزی بەلایەوە بوو، بۆ ئەوەی پارەکەی بداتێ و ئەمیش هەر لەو مەجلیسەدا پارەکەی وەرگرت، ئەوە دروست نییە، چونکە قابیل نییە کابرای حەواڵەکراو لە یەك‌کاتا بێ بە ماڵ تەسلیم‌کەرو ماڵ‌وەرگر، بەلام ئەگەر وەری‌گرت‌و دایەوە بە سەلەم‌دادەرەکەو ئەویش دایەوە بەم، ئەوە دروستە.

ئەگەر کابرای سەلەم‌کەر لەپاش وەرگرتنی سەرمایەکە، عەینی ئەو ماڵەی دایەوە بە کابرای سەلەم‌دادەر بە قەرز یا لەجیاتی حەقێکی کە لەسەری بووە، یا بەئەمانەت، ئەوە دروستە و دروستە سەرمایەی کابرای سەلەم‌دادەر عەین بێ یا قازانج بێ؛ مەسەلا، بڵێت: وا قازانجی ئەم جووتەگایەم لە ماوەی ساڵێکا لەرۆژی ئەمڕۆوە داپێت بە دوو تەغار گەنم کە لە فلان رۆژا بمدەیتێ، ئەویش قەبووڵی کرد، ئەوە دروستە؛ کابرای سەلەم‌کەر ئەو قازانجە وەرئەگرێ بەوە کە هەر لە مەجلیسی موعامەلەکەدا ئەو ماڵە وەربگرێ کە قازانجەکەی لێ پەیدا ئەبێ؛ هەروەها سەلەم‌دادان دروستە لە مەنفەعەتدا، ئەگەر لەئەستۆدا بێ، وەك ئەوە کە بڵێ: وا ئەم دینارەم داپێتێ بۆ برنج کوتانی رۆژی عەرەفە. هەرکاتێك عەقدی سەلەم هەڵوەشێنرایەوە بەهۆی شتێکەوە، وەك فەوتان‌و برانی ماڵە سەلەم تیا کراوەکە، ئەوە ئەگەر سەرمایەکە مابووەوە، پێویستە بدرێتەوە بە سەلەم‌دادەرەکە وە ئەگەر نەمابوو، ئەبێ سەلەم‌کەرەکە بۆی بژێرێ، جا ئەگەر هاوچەشنی هەبوو، بیدا، ئەگینا قیمەتەکەی بداتێ.

**شەرتی دووهەمی سەلەم**، ئەوەیە ماڵە سەلەم تیاکراوەکە حازرو لەبەرچاو نەبێ، ئیتر بە حازر بڕیار بدرێ یا وەعدەی بۆ دابنرێ؛ کەواتە، ئەگەر یەکێ وتی: وا ئەم دینارەم بە سەلەم دا بە تۆ بەم عابایە، ئەوە ئەو موعامەلەیە نە فرۆشتنەو نە سەلەمە؛ سەلەم نییە، چونکە ماڵەکە لەبەرچاودایە و فرۆشتنیش نییە، چونکە لەفزی سەلەمی تیا هێنراوە، بەلام ئەگەر سەلەم‌دادەرەکە وتی: واکیلۆیەك رۆنی وەهاو وەهام لێ کڕیت بەم دینارە، ئەویش وتی: وا پێم‌فرۆشتی، ئەوە ئەم موعامەلەیە بە فرۆشتن دائەمەزرێ‌و حوکمی فرۆشتنی بەسەرا ئەڕوا.

**شەرتی سێهەمی** سەلەم، ئەوەیە ئەگەر ئەو شوێنەی سەلەمەکەی تیا ئەکرێ قابیل نەبوو، بۆ تەسلیم کردنی ماڵەکە، یا قابیل بوو بەڵام بە زەحمەت ماڵەکە ئەگەیشتە ئەو شوێنە، ئەبێ شوێنی تەسلیمکردنی ماڵەکە بەیان بکرێ وە ئەگەر وانەبوو، پێویست ناکاو هەر ئەو شوێنەکە موعامەلەکەی تیاکراوە، ئەبێ بە شوێنی تەسلیمکردنی ماڵەکە؛ جا ئەگەر ئەو شوێنە لەپاشا دەستی نەدا بۆ ئەوە ماڵەکەی تیا تەسلیمبکرێ، وەك ئەوەکە سووتابوو یا لافاو بردبووی، ئەوە نزیکترین شوێنێك بەوجێگایە کە دەسبدا بۆ تەسلیمکردنی ماڵەکە، ئەکرێت بە جێگای تەسلیمکردنی. دروستە سەلەم وەعدەدار بێ یان بێوەعدە بێ، یەعنی حازر بێ، جا ئەگەر کابرا باسی هیچی نەکرد، ئەوە ئەو سەلەمە دائەمەزرێ بە حازر.

**شەرتی چوارەم**، ئەوەیە هەر سەلەمێ کە وەعدەدار بێ، وەعدەکەی دیاری کراوبێ؛ دروست نییە وەعدەیەکیوا دابنرێ کە بۆ چەندکاتی جیاجیا دەسبدا وەك کاتی نوخشە یا کاتی درەو؛ جا ئەگەر سەلەمدادەر مانگی عەرەبی یا رۆمی یا ئێرانی یا هەر جۆرە مانگێکی تری دیاری کرد، ئەوە تەواوە وە ئەگەر تەنها ناوی مانگی برد؛ مەسەلا، وتی: بە وادەی چوار مانگ، ئەوە مەعنای بە مانگی عەرەبی لێئەدرێتەوە؛ جا ئەگەر کاتی سەلەمەکە ئەوەڵی مانگ بوو، ئەوە باشە وە ئەگەر لە ئەوەڵی مانگا نەبوو، ئەوە مانگە ساغەکان ئەبرێنەسەر بە بێ گوێدانە ئەوەکە تەواو بن یا کەم یەك بن و مانگێکی تەواویش ئەبرێتەسەر بە چەند رۆژە ماوەکەی ئەو مانگەوەکە سەلەمەکەی تیا کراوە؛ فەرموودەی راستر، ئەوەیە کە دروستە وادە بۆ سەلەم دابنرێ بە وادەی وەك جەژن و مانگی «ربیع»و «جمادي»و «کانوون»و «تشرین»و شتیوا و لەم سوورەتەدا، ئەم جەژنەو ئەو مانگانە، بە نزیکترینیان لە کاتی سەلەم کردنەکە مەعنایان لێئەدرێتەوە.

**شەرتی پێنجەم**، ئەوەیە ئەو ماڵەی کە سەلەمی بۆ ئەکرێ، لەوانەبێ خاوەنماڵ بتوانێ لە وەختی خوێدا تەسلیمی بکا؛ جا ئەگەر ئەو ماڵە لەوانەبێ لەو وڵاتەدا دەسبکەوێ، ئەوە باشە وە ئەگەر لە وڵاتێکی تریش دەس ئەکەوت، هەر دروستە، بەو شەرتەکە هێنانی ئەو ماڵە بۆ ئەو وڵاتە کە سەلەمەکەی تیا کراوە، شتێکی عادەت بێ؛ ئەگینا ئەو سەلەمە بەتاڵە.

ئەگەر کەسێك سەلەمی دادا لە شتێکی وادا کە لەو شوێنەدا هەبوو، بەڵام بە قەزاو بەلا لەکاتی تەسلیمکردنیا فەوتا، ئەوە ئەو فەوتانە نابێ بەهۆی هەڵوەشانەوەی سەلەمەکە، بەڵکوو کابرای سەلەمدادەر بۆی هەیە سەلەمەکە هەڵوەشێنێتەوەو پارەکەی خۆی وەربگرێتەوە، یا سەبر بکا تاکاتێك کە ماڵە سەلەم تیاکراوەکە دەس ئەکەوێ وە ئەگەر لەپێش وادەی تەسلیم کردنا، زانرا کە ئەو ماڵە لە وەختی خۆیا دەس ناکەوێ، ئەوە کابرای سەلەمدادەر حەقی نییە هەر لەئێستەوە سەلەمەکە هەڵوەشێنێتەوە، بەڵکوو ئەبێ سەبر بکا تا وادەی دێ، ئەو کاتە ئەگەر ماڵەکە دەس‌نەکەوت، بۆی هەیە یا سەلەمەکە هەڵوەشێنێتەوەو پارەکەی وەربگرێتەوە، یا چاوەڕوان بێ تا ئەو ماڵە بە شینەیی دەس ئەکەوێ.

**شەرتی شەشەم**، ئەوەیە ئەو ماڵە مەعلووم بکرێ لە عەقدەکەدا کەوا بە پێوانەیە یا بە کێشانە یا بە ژمارە یا بە پێوان بەگوێرەی جۆری ماڵەکە کە سەلەمی تیاکراوە؛ دروستیشە ماڵێك کە بە پێوانە بفرۆشرێ ئەمان بڕیاری لەسەر بدەن بە کێشانە و پێچەوانەی ئەمەش دروستە؛ ئەگەر کەسێك سەلەمی دادا لەشتێکاو بڕیاری دا بە کێشانەیش‌و بە پێوانەیش بێ؛ مەسەلا، سەلەمی‌دادا بۆ تەغارێك گەنم بەو شەرتە بە کێشانە تەنێکی لی‌دەرچێ، ئەوە ئەو سەلەمە دانامەزرێ.

بۆ سەلەم کردن لە کاڵەکو شووتی‌و کوولەکەو خەیارو ترۆزی‌و بامیەو تەماتەو بایجان‌و هەنارو بەهێ‌و سێوو هەرمێ‌و پرتەقاڵ‌و لیمۆو شتی‌وادا، بەشەرتگیراوە دیاری‌کردنی ماڵەکە بە کێشانە و لە وێنەی گوێزو بادام‌و فستق‌و سرنچك‌و عەناب‌و خورمای دەنك‌و مێوژو توو و هەڵووژەو قەیسی‌و وردەمیوەی‌تردا، دروستە ئەندازەکەیان بە کێشانە دیاری بکرێ؛ هەروەها، سەلەم لەمانەدا بە حیسابی پێوانەیش دروستە.

دروستە سەلەمدادان لە خشتی کاڵدا بە ژمارە لەگەڵ بەیان کردنی پانی‌و درێژی‌و ئەستووری خشتەکەدا؛ سوننەتە ئەندازەشی بەکێشانە دیاری بکرێ، چونکە ڕاگرتنی ئەندازەی کێشانە لەمجۆرە خشتەدا ئاسانە؛ لە خشتی سوورەوە کراویشدا ئەبێ بە ژمارە بێ لەگەڵ بەیانی پانی‌و درێژی‌و ئەستوورییدا.

ئەگەر سەلەمدادەرەکە ربەیەك یا قزناخێك یا عەلبەیەکی تایبەتی دیاری کرد، ئەوە ئەو سەلەمە دانامەزرێ مەگەر پێوانەکردن لەو شوێنەدا بەو پێوانەیە کرابێ بەعادەت وە ئەگەر سەلەمی دادا لە سەمەری دێیەکی بچووکدا کە بە عادەت ئەوەندەی سەمەر نەبێ کە ئەیەوێ، ئەوە بەتاڵە، بەڵام ئەگەر دێکە گەورە بوو و ئەو ئەندازە سەمەرەی تیا ئەبوو، ئەوە دروستە.

شەرتی حەوتەم، ناسینی ئەو سیفەتانەیە کە مەبەستی سەلەمەکە ئەگۆڕێ بە نەهاتنەدییان و ئەبێ باس بکرێن بە جۆرێك کە نەبێ بە هۆی نایابی و دەس‌نەکەوتنی ماڵەکە؛ کەواتە، سەلەم دروست نییە لەو شتانەدا کە مەبەست تیایاندا دەرنەکەوێ، وەك هەریسەو حەلوایەك کە لە چەند شت دروست کرابێ و لەو جۆرە «خُـف»انەدا کە بەروپشت‌و ناواخنیان هەبێ و لە دەرمانێکا کە لە چەند مادە پێکهاتبێ‌و ئەندازەی هەرکام لەو مادانە دیاری نەبێ؛ بەڵام دروستە لە شتێکی تێکەڵدا کە ئەندازەی بەشەکانی دیاری بێ، وەك قوماشێك کە مەعلووم بێ‌چەندی لە لۆکەیەو چەندی لە خوری یا لە ئاورێشم یا شتێکی‌ترە؛ هەروەها، دروستە سەلەم‌کردن لە پەنیرو کەشك‌و هەنگوێن‌و سرکەی خورما و سرکەی مێوژداو ئەو ئەندازە ئاوەی کە تێیان کراوە، زیان ناگەیەنێ، چونکە بۆ قازانجی سرکەکە تێی کراوە؛ بەڵام سەلەم دروست نییە لە کولێرەدا، چونکە نازانرێ ئاگرە کە چەند کاری تێ کردووە؛ هەروەها، سەلەم دروست نییە لەشتێکا کە نایاب بێ، وەك گۆشتی نێچیر لە وڵاتێکا کە نێچیری تیا نەبێ‌و لە دەرەوەشەوە بۆی نەیەت و لە هەر شتێکی‌وادا کە ئەگەر ئەوسافەکانی باس بکرێت، نایاب بێ‌و دەس نەکەوێ، وەك گەوهەری گەورەو یاقووت‌و بزن لەگەڵ کارژەلەدا.

سەلەم دروستە لە حەیوانات‌و لە پۆشاك‌و لە خواردەمەنی‌و لە قاپ‌و قاچاخدا؛ جا پێویستە بۆ سەلەم لە وشترو گاو مانگاو ئەسپ‌و ماین‌و ئێسترو گوێدرێژو شتی‌وادا، ناوبردنی نێرو مێ‌و باسی رەنگ‌و عومرو جۆرو باسی سینف لەو حەیوانانەدا کە چەند سینفی جیاجیان هەبێ‌و سینفەکان فەرقیان هەبێ لە چاکی‌و خراپیدا.

پێویستە بۆ سەلەم لە باڵدارا، باسی نەوع‌و گەورەیی‌و بچووکی لەشی و بۆ سەلەم لە گۆشتدا، پێویستە باسی ئەوە بکرێ کە گۆشتی چ حەیوانێکە و حەیوانەکە نێرە یا مێیەو

ئەگەر نێرە کەڵە یا خەسێنراوە وە ئەگەر بچکۆلە بوو، شیرەخۆرە یا ئەلەوەڕێو ئاڵف ئەخوا؛ هەروەها، ئەبێ باسی ئەوە بکرێ کە گۆشتی کام‌لای حەیوانەکەیە؛ لە سەلەمی گۆشتدا، بەپێی عادەت ئێسقانیش وەرئەگیرێ لەگەڵ گۆشتەکەداو لە سەلەمی پۆشاکدا، ئەبێ باسی ئەوە بکرێ ئاخۆ لە خورییە یا لۆکەیە یا لە چییە و پانیو درێژیو ئەستووریو باریکیو سفتیو زبری، چۆنە، هەروەها ئەبێ باسی ڕەنگیشی بکرێ وە ئەگەر لە سەلەمی قوماشدا باسی «جاو» کرا، ئەوە بە جاوی گازری نەکراو مەعنای لێ ئەدرێتەوە؛ هەروەها، دروستە سەلەم لە جلی گازری نەکراوا و لەو جلانەداکە لەپێش تەنین، تانو پۆیان ڕەنگ ئەکرێ، بەڵام ئەگەر لەپاش تەنین تانو پۆیان ڕەنگ‌کرا، ئەوە سەلەمیان تیا دروست نییە.

لە سەلەمی خورمادا، ئەبێ باسی ڕەنگو نەوعو شارو گەورەییو بچووکی دەنکەکانیو کۆنیو تازەیی بکرێت؛ ئەم‌جۆرە باسانە پێویستن لە سەلەم لە هەمووجۆرە دانەوێڵەیەکدا، وەك گەنمو جۆو شتیوا؛ بەڵام سەلەم لە چەڵتووکدا دروست نییە.

لە سەلەمی ڕۆنیشدا، ئەبێ باسی ئەوە بکرێت ئاخۆ ڕۆنی مەڕە یا هی بزنە یا هی مانگایە و لە هەنگوینیشا، ئەبێ باسی ئەوە بکرێ کە هەنگوینی ماڵییە یا هەنگوینی کێوییە و هاوینەیە یا پایزەیە و سپییە یا زەردە، بەڵام باسی کۆنیو تازەیی، پێویست نییە.

سەلەم دروست نییە لە شتی کوڵاوو برژاودا، بەڵام زەرەری نییە ئەگەر ئەو شتە کەسەلەمی تیا ئەکرێ درابێتە بەرخۆرو هەتاو کاری تێ‌کردبێ؛ فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە سەلەم دروست نییە لە سەلکی حەیوانا و لە شتێکا کە هەر دانەیەکی بەجۆرێك بێ، وەك گۆزەو دێزەی دەست‌کرد و هەر قاپو قاجاغێك کە بە قاڵب دروست نەکرێو هەر دانەیەکی جیا بێ لە دانەیەکی تری لەبارەی باریکیو ئەستووریو شتیواوە، بەڵام ئەگەر یەکەیەکەی ئەو قاپو قاجاغانە وەك یەك وابوون، سەلەمیان تیا دروستە و پێویست نییە باسی ئەوە بکرێ کە قاپو قاجاغی چاك بن، چونکە بەپێی عادەت ئەبێ ماڵە سەلەم تیاکراوەکە چاك بێ.

پێویستە کە سەلەمکەرو سەلەمدادەر، هەردووکیان، لەگەڵ دوو پیاوی تری دادپەروەردا، بە باشی ئاگاداری ئەو شەرتانە بن کە بەشەرت گیراون لە ماڵە سەلەم تیاکراوەکەدا.

## باسی گۆڕینەوەی ماڵی سەلەم تیاکراو و هەندێ وردە بابەتی تر

دروست نییە لە جیاتی ئەو ماڵەی کە سەلەمی تیا کراوە، شتێکی تر وەربگیرێ لە غەیری جینس و نەوعی خۆی؛ کە واتە، دروست نییە گەنم لە جیاتی جۆ و گەنمەرەشگوڵ لە جیاتی قەندەهاری وەربگیرێ؛ بەڵێ، هەندێ لە زانایانی شەریعەت فەرموویانە: دروستە لە جیاتی جۆرێك جۆرێکی تر وەربگیرێ، بەڵام واجب نییە لە سەر کابرای سەلەمدادەر وەری‌بگرێ؛ هەروەها، دروست نییە لە شتێکا کە بە حیسابی پێوانە سەلەمی تیاکرابێ، بە حیسابی کێشانە وەری بگرێ، یا بە پێچەوانەوە. دروستە کابرای سەلەمدادەر لە عەینی ئەو نەوعەدا کە سەلەمی بۆ داداوە، ماڵێك وەربگرێ کە لە بارەی ئەو سیفەتانەوە کە بڕیار دراون، کەمتر بێ لەوەی کە بڕیار دراوە مادام دڵی بهێنێ چاوپۆشی بکا، بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێك واجب نییە وە ئەگەر سەلەمکەرەکە جۆرێکی باشتری دا بە سەلەمدادەرەکە لەوەی کە بڕیار دراوە، ئەبێ وەری بگرێ.

ئەگەر کابرای سەلەمکەر لە پێش وادەدا ماڵەکەی حازر کرد، بەڵام سەلەمدادەرەکە وەری نەگرت، ئەوە تەماشائەکەین، ئەگەر سەلەمدادەرەکە بیانوویەکی وای هەبوو عەقڵ بیگرێ وەك ئەوەکە ماڵەکە حەیوان بێ و مەسرەفی پێویست بێ، یا وەختەکە وەختێکی ناخۆش بێ و تاڵان و بڕۆ لە ناوا بێ، ئەوە لەو حاڵەدا ناچار ناکرێ بۆ وەرگرتنی ماڵەکەو ئەگەر بیانوویەکی وای نەبوو کە عەقڵ بیگرێ، تەماشا ئەکەین، ئەگەر کابرای سەلەمکەر مەبەستێکی باشی هەبوو لە تەسلیم کردنی ئەو ماڵەدا پێش وەعدە، وەك کردنەوەی رەهن، یا ترسی ئەوە کە لە کاتی داهاتنی وەعدەی تەسلیم کردنی ماڵەکەدا ئەو ماڵە نەمێنێ، یا وەك رزگار کردنی کەفیلێك، ئەوە لەم حاڵەتانەدا کابرای سەلەمدادەر ناچارئەکرێ ئەو ماڵە وەربگرێ؛ هەروەها، ئەگەر مەبەستی سەلەمکەرەکە ئەوە بێ حەقی سەلەمدادەرەکەی بە سەرەوە نەمێنێ.

ئەگەر لە پاش داهاتنی وادەی تەسلیم کردنی ماڵەکە، کابرای سەلەمدادەر سەلەمکەرەکەی دی لە غەیری ئەو شوێنەداکە ئەبێ سەلەمکەر ماڵەکەی تیا تەسلیم بکا، ئەوە واجب نییە سەلەمکەر ماڵەکە لەو شوێنەدا تەسلیم بکات، ئەگەر گواستنەوەی ماڵەکە لە شوێنی خۆیەوە بۆ ئەو شوێنە مەسرەفی پێویست بوو و لەم کاتەدا، کابرای سەلەمدادەر حەقی ئەوەی نییە داوای قیمەتی ماڵەکە بکاتەوە لە سەلەمکەرەکە بە بیانووی ئەوەوە کە ماڵەکەی تەسلیم نەکردووە وە ئەگەر کابرای سەلەمکەر ماڵەکەی تەسلیم کرد لە غەیری ئەو شوێنەداکە بڕیار دراوە بۆ تەسلیم کردن و سەلەمدادەرەکە وەری نەگرت، ئەوە ئەگەر گواستنەوەی ماڵەکە بۆ ئەو شوێنەی کە بڕیاردراوە تیا تەسلیم بکرێ مەسرەفی ئەویست، یا خود ئەو شوێنە شوێنێکی مەترسیدار بوو، سەلەمدادەرەکە ناچار ناکرێ وەری بگرێ، ئەگینا، فەرموودەی راستتر ئەوەیە ناچار ئەکرێ.

## باسی قەرزدان

قەرزدان، بریتییە لەوەکە کەسێك شتێك بدا بە کەسێك لە سەر ئەساسی ئەوە ئەمیش وێنەی ئەو شتەی بداتەوە؛ قەرزدان، سوننەتە و لە حەدیسی پیرۆزا ئەفەرموێت: «یەکێك دوو جار قەرز بدا بە شەخسێك لە بەر رەزامەندی خودای تەعالا، ئەوە وەکوو ئەوە وایە جارێك ئەو ماڵە بدا بە سەدەقە و ئیحسان»؛ بەڵێ، وا ئەبێ قەرزدان حەرام ئەبێ، وەکوو قەرزدان بە یەکێ کە بزانێ لە ئیشی حەراما سەرفی ئەکا؛ هەروەکوو جاربەجاریش واجب ئەبێ، وەکوو قەرز بە یەکێ کە ناچار کەوتبێ بۆ نەفەقەی ماڵ و خێزانی و قەرز کردن حەرامە بۆ کەسێك کە ئومێدی ئەوەی نەبێ بتوانێ لە کاتی خۆیا ئەو قەرزە بداتەوە، مەگەر خاوەن ماڵەکە بە حاڵی ئەو شەخسە بزانێ و لەگەڵ ئەوەیشا قەرزەکەی بداتێ.

ئەرکانی قەرزدان، چوارە: قەرزدەر، قەرزکەر، ئەو ماڵەی کە ئەدرێ بە قەرز و سیغەی عەقدەکە. بۆ قەرز، سیغەی سەریح زۆرە، وەك ئەمانە [کە بڵێ]: ئەم ماڵەم پێدای

بە قەرز، ئەم ماڵەم کرد بە موڵکت لە سەر ئەساسی ئەوە کـە وێنـەکـەیم بـدەیتەوە و کابرایش دەس بەجێ قەبووڵی بکا وە ئەگەر هەر تەنها وتی: ئەم ماڵەم کرد بە موڵکت، ئەوە ئەبێ بە «هِبة» (بەخشین)و ئەگەر لە پـاشانا ئـیختیلافیان بـوو لە بـاس کـردنی دانەوەی بەدەلی قەرزەکەدا و شاهیدیش نەبوو، ئەوەکابرای ماڵوەرگر سوێند ئەدرێ و ئەبێ بە بەخشین؛ بەڵێ، ئەگەر کەسێك خۆراکێکی دا بە ئینسانێکی ناچاری برسیو لە پاشانا ئیختیلافیان بوو لە ناوبردنی دانەوەی بـەدەڵدا، ئـەوە کـابرای خـاوەنخۆراك سوێند ئەدرێ و بەدەڵی ئەو خۆراکە لە کابرا وەر ئەگرێتەوە، چونکە ئەگەر ناچارەکە سوێند بدرێو ماڵی خاوەن ماڵەکە بفەوتێ، ئیتر خەڵك لەم ئیشە باشە ـکە فریاکەوتنی برسی و ناچارە ـ دەسبەردار ئەبن.

هەندێ قەرزی حوکمی هەیە سیغەی پـێ نـاوێ و تـەنها نـییەتی وەرگـرتنەوەی بەدەڵەکەی کافییە، وەکوو خۆراك دان بە ئینسانی برسی و داماو و پۆشاك دان بە رووت و مەسرەف کردن بۆ منداڵی فڕێ دراو و فیدیەدان بۆ رزگار کردنی دیل.

شەرتی کابرای قەرزدەر، ئەوەیە کە بە پێی ئوسووڵی شەرع، شایان بێ بۆ پیاوەتی و خێرۆمەندی، یەعنی باڵغ و عاقڵ و خاوەن روشد و خاوەن ئیختیار بێ. قەرز، هەمیشە لە سەر «تَنْجیز»ە، یەعنی هەرچەند وەعدەیش دابنرێ بۆ دانەوەی، ئەو وەعدەیە بـە شەرع جێی ئیعتیبار نییە و خاوەن ماڵ ئەتوانێ هەموو وەختێ داوای بەدەڵی ئەو قەرزە بکاتەوە و هەر خاوەن ماڵێك لە سەر وەعدە داوای بەدەڵی قەرزەکەی نەکاتەوە، ئەوە لە سەر ئەساسی پیاوەتییە، هەروەکوو لە ئەساسا قەرزدان بە پیاوەتی دائـەنرێ، بـەڵام فرۆشتنی ماڵێك بە قیمەتێك بە وەعدەیەکی تایبەتی، ئەوە بـە شـەرع دائـەمەزرێ و خاوەن حەق تا وادەکە نەیەت ناتوانێ داوای ئەو حەقە بکا، چونکە ئەمە موعامەلەیەو بە پیاوەتی دانانرێ.

هەر لە سەر ئەم ئەساسە، لە بەیعا رەوایە ئەگەر بەیعەکە بەرابەر بە پارەی نەخت و حازر بێ، قیمەتی ماڵەکە کەم بێ وە ئەگەر بەرابەر بە جینس یا پارەی وادەدار بـێ، قیمەتەکەی زۆر بێ و ئەمە لە شـەرعا پـێی ئـەوترێ: بـەیعی «مُـؤَجَّل» (فـرۆشـتنی

وەعدەدار)؛ گەلێ کەس لەم مەسئەلەدا کەوتوونەتە ئیشتیباهەوە لە بەر ئەوەکە لە زوبانی کوردیدا بە هەردووکیان ئەڵێن: قەرز و وەها تێ گەیشتوون کە قابیل نییە فەرقی فرۆشتن بە نەختی حازر و فرۆشتن بە قیمەتی وەعدەدار ببێ لە کەم و زۆریدا؛ ئەم بیرە، نارەوایە، وەکوو لە کتیبە گەورەکانا باسی ئەوە کراوە کە ئەم دوو مەسئەلەیە جیان لە یەك.

مادام شەرتی قەرزدەر ئەوانە بوو کە وتمان، دروست نییە قەرزکردن لە منداڵ و شێت و سەفیهـ و زۆر لێ کراو؛ بەڵێ باوکی منداڵ ئەتوانێ ماڵی منداڵەکەی بدا بە قەرز لە بەر مەسڵەحەت و لەم کاتەدا، واجبە کابرای قەرزکەر دەستی بڕوا قەرزەکەی بداتەوە و ئەمین بێ و ماڵەکەی حەرام نەبێ؛ هەروەها، واجبە چاودێریکەری منداڵەکەیش شاهید بگرێ لە سەر ئەو قەرزە و واجبە بەرابەر بەو قەرزە رەهن وەربگرێ لە قەرزکەرەکە، ئەگەر قازی بە مەسڵەحەتی بزانێ؛ بەڵێ سەفیهی بەربەرەڵڵا، یەعنی کەسێ کە لە پاش ئەوەی بە رەشیدی باڵغ بوو، دەستی کرد بە سەفاهەت و قازی حیجری لە سەر دانەنا، ئەوە ئەم شەخسە دروستە موعامەلە بکا و قەرز بدا و قەرزیش بکا.

شەرتی ئەو ماڵەی عەقدەکەی لە سەر ئەکرێ یەعنی ئەدرێ بە قەرز، ئەوەیە سەلەمی تیا دروست بێ؛ هەرشتێ سەلەمی تێدا بکرێ، دروستە بدرێ بە قەرز، مەگەر «جاریە» (کەنیزەکێك) کە مەحرەم نەبێ بە قەرزکەرەکە، ئەوە دروست نییە بدرێ بە قەرز لە ترسی ئەوەکە نە وەك ئیشی ناشەرعی لە گەڵدا بکا. هەرچیش سەلەمی تیا نەکرێ، بە قەرزیش نادرێ.

دروستە بە قەرزدانی ئەندازەیەك پارە کە لەو کاتەدا مەعلووم نەبێ چەندێکە، چونکە لە دواییدا دەر ئەکەوێ؛ هەروەها، دروستە بە قەرزدانی پارەی مەغشووش، یەعنی پارەیەك کە ئاڵتوونەکەی یا زیوەکەی شتێکی تری لە گەڵ تێکەڵ کرابێ، هەرچەند ئەندازەی غەشەکەیش دیار نەبێ چەندە، چونکە ئەم نەختە مەغشووشانە، «مِثلی» (وینەدار)ن و موعامەلەیان تیا دروستە.

واجبە لە سەر قەرزار لە جیاتی شتی وێنەدار، وێنەکەی بداتەوە، هەرچەند ئەو شتە پارەیەکی نەختی وایش بێ کە حوکوومەت رەواجی بەتاڵ کردبێتەوە و لە جیاتی شتی

قیمەت بۆ دانراو (مُتقوِّم) ئەبێ شتێك بداتەوە کە لە سوورەتدا وەك ماڵە قەرزکراوەکە وابێ و لەو سیفەتانەدا کە ئەبن بە هۆی قیمەت وەك ئەو وابێ؛ جا ئەگەر قەرزارەکە شتێکی چاکتری دایەوە لە ماڵە قەرزکراوەکە، واجبە خاوەن ماڵەکە وەری بگرێ وە ئەگەر خاوەنماڵەکە لە جیاتی ئەو شتەی کە داویە بە قەرز، شتێکی تری وەر ئەگرت، ئەوە «اِستِبْدال»ە، یەعنی ئاڵوگۆڕە لە ماڵەقەرزکراوەکەدا و حوکمی ئەم گۆڕینەوەیە، وەك گۆڕینەوەی قیمەتی ماڵە فرۆشراوەکەیە، یەعنی لەو شتانەدا کە سوود (ربا)یان تیا هەبێ، حازری و وەرگرتنی هەردوولا و هاوچەشنی (حُلول و تَقابُض و تَماثُل) پێویستە بە مەرجی یەکییەتی عیللەت؛ ئەگینا هەر حازری و وەرگرتنی هەردوولا پێویستە و هاوچەشنی شەرت نییە ـ وەك لە پێشەوە باس کرا ـ. لە بارەی شوێنی دانەوەی قەرزەوە، قەرزیش وەك سەلەم وایە؛ بەڵێ، ئەگەر خاوەن قەرزەکە گەیشت بە قەرزارەکە لە غەیری شوێنی دانەوەی قەرزەکەدا و گواستنەوەی ئەو ماڵە قەرزکراوە بۆ وڵاتی خاوەنماڵەکە مەسرەفی ئەویست، ئەوە کابرای خاوەن قەرز ئەتوانێ داوای قیمەتی ماڵەکەی بکا لێی بە پێی حیسابی قیمەتی لەو وڵاتەدا کە قەرزەکەی تیاداوە.

دروست نییە لە سیغەی قەرزدانا، چ لە نەخت و چ لە غەیری نەختا، شەرتی ئەوە بکرێ کە قەرزارەکە شتێ زیادە بداتەوە، یا شەرتی هەرشتێ بکرێ کە قازانجێکی تیا بێ بۆ خاوەن ماڵەکە، چونکە حەزرەت، فەرموویەتی: «هەر قەرزێك قازانجێ رابکێشێ، ئەوە سوودە»؛ بەڵێ، ئەگەر قەرزار بە بێ شەرت کردن، زیادەیەکی دا بە خاوەنقەرزەکە، ئەوە شتێکی باشی کردووە و بە ئیحسان ئەنووسرێ بۆی. زیانی نییە کەسێك قەرزێك بدا بە کەسێکی تر و بڵێ بەو شەرتە کە ئەمیش قەرزێك بدا بەو، بەلام شەرتەکە جێبەجێ ناکرێ؛ ئەگەر خاوەنقەرزەکە بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکەی وادەیەکی شەرت کرد، ئەوە ئەگەر مەبەستی تەنها دانەوەی قەرزەکەی بوو لەو وادەیەدا، ئەوە عەقدەکە دروستە و شەرتەکە بەتاڵە وە ئەگەر مەبەستێکی وای هەبوو کە قازانجێکی خۆی تیابێ، ئەوە وەکوو شەرتی زیادە وایە و عەقدەکە بەتاڵە؛ بەڵێ، دروستە بۆ خاوەن ماڵ شەرتی شتێکی وا بکا کە ببێ بە هۆی پاراستنی ماڵەکەی خۆی، وەك شەرتی ئەوەکە قەرزارەکە

رەهنێك دابنێ یا کەفیلێك بدا یا ئیقرار بکا لای قازی یا شاهید بگرن لە سەر ئەو قەرزە؛ ئەگەر قەرزارەکە ئەم شەرتانەی نەهێنایەدی، ئەوە خاوەن ماڵەکە حەقی هەڵوەشاندنەوەی ئەو عەقدەی هەیە.

لە پاش عەقدەکە، کابرای قەرزار ئەبێ بە خاوەنی ئەو ماڵە بەو شەرتە کە وەری گرتبێ؛ دروستە بۆ خاوەنماڵەکە لەو عەقدە پەشیمان ببێتەوە و ماڵەکەی خۆی وەربگرێتەوە لە قەرزارەکە، مادام عەینی ئەو ماڵەی لە لا مابێ؛ هەروەها، دروستە بۆ قەرزکەریش عەینی ئەو ماڵە بداتەوە بە خاوەن ماڵەکە وە ئەگەر لە کاتی هێنانەوەیدا ئەو ماڵە عەیبدار بوو، وە خاوەن ماڵەکە وتی: ماڵەکەی من بێعەیب بووە و قەرزاریش وتی: ئەم عەیبە هەر لە لای تۆ بووە، ئەوە قەرزارەکە سوێند ئەدرێ، چونکە ئەسڵ بەرائەتی زیممەی قەرزارەکەیە لە تۆڵەی ئەو عەیبە.

## باسی رەهن

«رَهن» بە عەرەبی، یەعنی راگرتن و ماتڵ کردن، وە لە عورفی شەرعدا، بریتییە لەوەکە ئینسان عەینی ماڵێك بکا بە بارمتەی حەقێك کە بە سەریەوەیە بۆ ئەوە ئەگەر لە پاشەڕۆژدا حەقەکەی نەبوو بیداتەوە بە خاوەنحەقەکە، ئەو حەقە لەو ماڵە جێبەجێ بکرێ.

ئەرکانی رەهن، پێنجن:

ئەو کەسە کە ماڵ ئەخاتە رەهنەوە (راهِن)؛

ئەو کەسە کە ماڵەکە خراوەتە رەهنیەوە (مُرْتِهن)؛

ماڵەکە کە خراوەتە رەهنەوە (مَرهون)؛

ئەو قەرزەی کە ماڵەکە لە بەرابەریا خراوەتە رەهنەوە (مَرْهونٌ بِه)؛

ئەو قسەیە کە لە بەینی ئەو دووکەسەدا تیئەپەڕێ (صیغة)؛

سیغەش بریتییە لە دان و وەرگرتن (ایجاب و قبول) بەو شەرتانەوە کە لە سیغەی بەیعدا رابوردن؛ کەواتە، لێرەیشا رووتێ کردنی قسە (خطاب) پێویستە هەرچەند

کابرای رەهن وەرگر وەکیل بێ، یەعنی رەهن دانەرەکە بڵێ بەووەکیلە: وا ئەم ماڵەم خستە رەهنی تووەو ئەویش قەبووڵی بکا.

ئەگەر لە عەقدی رەهندا شەرتی شتێکی واکراکە لازمی رەهنەکە بێ، وەك بە شەرت گرتنی پێش کەوتنی رەهن وەرگر لە قازانج وەرگرتنا لە سەر غەیر ئەگەر خاوەن قەرز هێرشیان هێنا بۆ سەر قەرزارەکە، یا شەرتی شتێکی واکراکە ببێ بە هۆی مەسڵەحەتی عەقدەکە، وەك شاهید گرتن لە سەر ئەو عەقدە، ئەوە شەرتەکەیش و عەقدەکەیش دروستن وە ئەگەر شەرتی شتێکی واکراکە هیچ مەبەستێکی تیا نەبێ، وەك ئەوەکە بە شەرتی بگرن ماڵە رەهن کراوەکە تەنها فلانە خواردنی دەرخوارد بدرێ، ئەوە عەقدەکە دروستە و شەرتەکە بەتاڵە وە ئەگەر شەرتی شتێکی واکراکە زەرەری تیابێ بۆ رەهن وەرگرەکە، وەك ئەوە کە ماڵە رەهنکراوەکە نەفرۆشرێ بۆ دانەوەی حەقی خاوەن ماڵەکە، ئەوە شەرتەکەیش و عەقدەکەیش بەتاڵن وە ئەگەر شەرتی ئەوە کرا هەرچی زیادە پەیدا ببێ لە ماڵە رەهن کراوەکەدا ئەوەیش لە رەهندا بێ، ئەوە شەرتەکە بەتاڵە.

**بزانن!** لە هەرلایەکا شەرت بەتاڵ بێ، ئەوە عەقدەکەیش بەتاڵ ئەبێ، مەگەر لەو شوێنەداکە شەرتەکە هیچ مەبەستێکی تیا نەبێ.

شەرتی ئەو کەسەی کە عەقدی رەهنەکە ئەکا، ئەوەیە کە دروست بێ تەسەرروف بکا لەو ماڵەداکە ئەیخاتە رەهنەوە؛ کەواتە، دروست نییە سەرپەرشتیکەری مناڵ و شێت، ماڵی ئەمانە بخاتە رەهنەوە، مەگەر لە بەر ناچاری، وەك ئەوەکە پێویست بێ رزقیان بۆ بکرێ و بە بێ رەهن دەستی نەکەوێ؛ هەروەها، ناتوانێ رەهنیشیان بۆ وەرگرێ مەگەر لە بەر ناچاری یا لە بەر قازانجێکی ئاشکرا و دیاری، وەك ئەوەکە لە کاتی تاڵان و برۆدا لە ترسی فەوتانی ماڵەکەیان، ئەو ماڵە بدا بە قەرز و رەهن وەربگرێ لە جیاتی ئەو قەرزە.

شەرتی ماڵی رەهن کراویش، ئەوەیەکە عەینێکی وابێ فرۆشتنی دروست بێ، [ئیترا] موڵکی تایبەتی یا تێکەڵ بێ؛ کەواتە رەهن کردنی مەنفەعەت دروست نییە چونکە سەعات بە سەعات رووی لە فەوتان و تەواو بوونە. دروستە رەهن کردنی عەینێك کە تێکەڵ بێ لە بەینی رەهنکەرو کەسێکی ترا، خواە بیدا بە شەریکەکەی یا بە کەسێکی تر و وەرگرتنی ئەو ماڵە بە وەرگرتنی هەموویەتی؛ جا ئەگەر ئەو عەینە لەوانە نەبوو کە

بگوێزرێتەوە، وەکوو خانوو، ئەوە ئیزنی شەریکەکەی ناوێ وە ئەگەر لەوانەبوو کە بگوێزرێتەوە، ئیزنی ئەویشی ئەوێ؛ جا ئەگەر ئیزنی‌داکە لە لای ڕەهن وەرگرەکە بێ، یا خود کابرای ڕەهن‌وەرگر رازی بوو بەوەکە ماڵەکە لای شەریکەکە بمێنێتەوە، ئەوە باشە، ئەگینا پێویستە قازی شەخسێکی راساڵ دیاری بکاکە ئەو عەینەی لە لا دابنێن.

ئەگەر کەسێك شتێکی وای خستە ڕەهنەوە کە نزیك بێ خراب ببێ، ئەوە ئەگەر قابیل بێ وشك بکرێتەوە، وەك هەنجیر، پێویستە وشك بکرێتەوە وە ئەگەر قابیل نەبوو وشك بکرێتەوە، ئەمجار ئەگەر لە ڕەهنی قەرزێکی حازریدا دانابوو یا لە ڕەهنی قەرزێکی وەعدەداری وەهادا کە لە پێش خراپ بوونی ماڵە ڕەهن کراوەکەدا وادەی ئەهات و یا خود شەرتی ئەوە کرابوو کە لە کاتی ترسی خراپ بوونی ماڵە ڕەهن کراوەکەدا بفرۆشرێ و قیمەتەکەی دابنرێ لە ڕەهندا، ئەوە لەم سوورەتانەدا ڕەهنەکە دروستە، ئەگینا ڕەهنەکە بەتاڵە؛ هەروەها بەتاڵە ئەگەر بە بێ قەید و شەرتیش بخرێتە ڕەهنەوە وە ئەگەر نەئەزانرا ئاخۆ لە پێش وادەی قەرزەکەدا خراپ ئەبێ یا نە، ئەوەیش ڕەهنی دروستە.

وە ئەگەر کەسێك شتێکی وای خستە ڕەهنەوە کە زوو خراپ نەئەبوو، بەڵام بە ڕێکەوت وەزعێکی وای بەسەرا هات ئامادەی کرد بۆ خراپ بوون، وەکوو گەنمێ کە تەڕ ببێ، ئەوە بەو کارەساتە ڕەهنەکە بەتاڵ نابێتەوە، بەڵکوو لەو کاتەدا کە نزیکە خراپ ببێ ئەفرۆشرێ و قیمەتەکەی دائەنرێ لە ڕەهندا. ئینسان وەك چۆن مولکی خۆی ئەخاتە ڕەهنەوە، دروستە شتێکیش بخوازێ بۆ ئەوەی دای‌بنێ لە ڕەهنا و ئەو ماڵەی خواستی و داینا لە ڕەهنا لە پاش دامەزرانی ڕەهنەکە، حوکمی عاریەی نامێنێ، بەڵکوو ئەبێ بەوە کە خاوەن ماڵەکە ببێ بە زامنی ئەو قەرزە کە لە سەر ڕەهن‌کەرەکەیە، بە زامنییەکی وەهاکە بەسرابێ بە عەینی ئەو ماڵەوە، یەعنی ئەگەر قیمەتەکەی بە ئەندازەی قەرزەکە بوو، ئەوە باشە وە ئەگەر زیاتر بوو لە قەرزەکە، خاوەنەکەی زیادەکەی بباتەوە وە ئەگەر کەمتر بوو لە قەرزەکە، ئەوە ئیتر کابرای خاوەن ماڵ حەقی بە سەریەوە نییە؛ کەواتە، شەرتی دروست بوونی ئەم ماڵخواستنە بۆ ڕەهن، ئەوەیە کابرای ماڵخواز

باسی جینسی قەرزەکە بکا؛ مەسەلا، زیوە یا ئاڵتوونە و ئەندازەی چەندە و سیفەتی چۆنە، ئاخۆ بێوادەیە یا وادەدارە؛ هەروەها واجبە ناوی ئەو کابرایشە بیا کە ماڵەرەهن کراوەکەی لا دائەنێ؛ کەواتە، ئەگەر ئەو ماڵە لە پێش ئەوەدا کە بخرێتـە رەهـنەوە، لە دەستی رەهنکەرەکەدا فەوتا، ئەوە زامن ئەبێ وە ئەگەر لە پاش رەهن کردنەکەی فەوتا لە دەستی رەهن وەرگرەکەدا، ئەوە نە رەهنکەرو نە رەهن وەرگر کەسیان زامنی نابن، بەڵام حەقی رەهنوەرگر لە سەر رەهنکەرەکە ئەمێنێ. خاوەنماڵ لە پاش وەرگرتنی ماڵەکە لە لایەن رەهن وەرگرەکەوە، حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە؛ جا هەرکاتێ وادەی قەرزی رەهن وەرگرەکە هات، یا خود هەر لە ئەساسدا قەرزەکە حازری بوو، پێویستە کابرای رەهنکەر بچێتە سەر کابرای خاوەن ماڵ، جا ئەگەر قەرزەکەی بژاردەوە، ئەوە ماڵەکەی نافرۆشرێ، ئەگینا ئەیفرۆشن بۆ دانەوەی حەقی رەهن وەرگرەکە و لە پاشا ئەو حەقەکە لە رەهنکەرەکە ئەسێنێتەوە.

شەرتی ئەو ماڵەش کە رەهنی بۆ دائەنرێ، ئەوەیە قەرزێکی دامـەزراو (ثـابِت) و پێویست (لازِم) بێ؛ کەواتە، دروست نییە رەهن دابنرێ بەرامبەر بە عەینێك کە لە ژێر دەستێکی زامندا بێ، وەك عەینی وەرگیراو بە موعامەلە یا بە بەیعی دانەمەزراو یا بـە خواستەمەنی یا عەینی زەوتکراو؛ هەروەها، دروست نییە رەهن دانانی ئـێستا بـۆ ماڵێك کە لەمەولا قەرزی ئەکا، یا رەهن دانان بۆ نەفەقەی لەمەولای ژنەکەی، چونکە هێشتا نە ئەو ماڵە قەرزکراوە و نە نەفەقەی ژنەکە واجب بووە؛ هەروەها، رەهن دروست نییە بۆ ئەو پارەیەی کە دائەنرێ بۆ کرێکارێك بەرامبەر بە ئیشێکی دیاری وەك دەرمان کردنی بریندارێك، یا ئیشێکی نادیاری وەك دۆزینەوەی حەیوانێکی ون بوو، بەرلەوە کە ئیشەکە تەواو بکا کە ئەوەش پێی ئەوترێ «جعالة»؛ بەڵام دروستە رەهندانان بـۆ قیمەتی ماڵی فرۆشراو لەو ماوەیەدا کە حەقی پەشیمان بوونەوە هەبێ، چونکە فرۆشتن لە سەر بنچینەی جێگیربوون دائەمەزرێ، واتە زۆرتر وایە فرۆشتن بـۆ هـەمیشە و جێگیر بوونە، بەڵام کرێکاری جەعالە گەلێ جار ئیشەکەی تەواو ناکا و حەقەکەی ئەفەوتێ.

ئەگەر کەسێك وتی: وا ئەم پارەیەم پێدای بە قەرز و ئەو خانووەم لێ وەرگرتی بە رەهن و کابرای‌تریش وتی: وا قەبوولم کرد و خانووەکەم دانا بـە رەهـن لات، ئـەوە دروستە و قەرزەکە و رەهنەکە دائەمەزرێن [و] هەروەها ئەگەر کەسێك بە کەسیکی تری وت: وا ئەو ماڵەم پێ فرۆشتی بە دە دینار و خانووەکەتم وەرگرت بە رەهنی ئـەو دە دینارە و ئەویش وتی: وا قەبوولم کرد و خانووەکەم خستە رەهنتەوە. دروستە لە جیاتی یەك قەرز دوو رەهن دابنرێ، یەك لە دوای یەك، بەڵام دروست نییە ماڵێك کە خرابێتە رەهنی قەرزێکەوە، بخرێتە رەهنی قەرزێکی ترەوە.

**بزانن!** عەقدی رەهن قەرار ناگرێ و رەهن جێ‌گیر نابێ، مەگەر بەوە کە کـابرای رەهن‌وەرگر ماڵەکە وەربگرێ و بەو شەرتە کە وەرگرتنەکەی دروست بێ، یەعنی کابرا باڵغ و عاقڵ و خاوەن روشد بێ و بە ئارەزووی خۆی ماڵەکە وەربگرێ؛ کەواتە، ماڵ وەرگرتنی منداڵ و شێت و نەفام و زۆرلێ‌کراو، دروست نییە.

دروستە رەهن وەرگرەکە یەکێك بکا بە جـێ‌نشـینی خـۆی بـۆ وەرگـرتنی مـاڵە رەهن‌کراوەکە، بەو شەرتە کە کابرای رەهن‌کەر خۆی نەبێ، چونکە یـەك کـەس هـەر دووسەری ئەم بە دەستەوەدان و وەرگرتنەی پێ ناکرێ. ئەگەر کەسێك مـاڵێکـی بـە ئەمانەت دانراو یا زەوت‌کراوی لای کەسێك هەبوو و لە پاشا قەرزێکی ئەو کـەسەی کەوتەسەر، دروستە ئەو ماڵە بە ئەمانەت دانراوە یا ئەو ماڵە زەوت‌کراوە بکا بە رەهنی ئەو قەرزە، بەڵام ئەبێ ئەوەندە وەخت بە سەر رەهن کردنەکەدا تێ بپەڕێ کە کابرای رەهن‌کەر بتوانێ لەو ماوەیەدا ماڵەکە بدا بە دەستی رەهن وەرگرەکەوە، ئەوجا ماڵەکە بە وەرگیراو دائەنرێ و رەهنەکە دائەمەزرێ؛ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە پـێویسـتە بـۆ دامەزرانی وەرگرتنی ماڵە بە ئەمانەت دانراوەکە یا ماڵە زەوت‌کراوەکە، کابرای خاوەن ماڵ رێگا بدا بۆ وەرگرتنی ماڵەکە؛ هەروەها، فەرموودەی راستتر، ئەوەیە دانانی ماڵی زەوت‌کراو لە رەهندا، کابرای زەوت‌کەر رزگار ناکا لە زامن بوونی ئەو ماڵە، مـەگـەر کابرای خاوەن ماڵ بە ئاشکرا، بڵێ: وا تۆم کرد بە ئەمین لە سەر ئەو ماڵەم کە لە لاتە، ئەو کاتە لە زەمانەتی دەرئەچێ.

دروستە رەهن‌کەر پەشیمان ببێتەوە لە عەقدی رەهن بەر لەوەی کە رەهن‌وەرگرەکە ماڵەکە وەربگرێ و ئەم پەشیمان بوونەوەیە، هەروەکوو بە قسە دێتە جێ، هەروەهاش دێتە جێ بە هەر کردەوەیەکی واکە مولکییەتی رەهن‌کەرەکە لە سەر شتەکە لاببا، وەك ئەوەکە ئەو ماڵە ببەخشێ و کابرای ماڵ پێ بەخشراویش وەری بگرێ، یا خود بیفرۆشێ یا نەزری بکا لەکەسێك یا وەقفی بکا؛ هەروەها، پەشیمان بوونەوە دێتە جێ بەوەکە رەهن‌کەرەکە ماڵەکە بخاتە رەهنی کەسێکی ترەوە و ئەویش وەری بگرێ وە ئەگەر رەهن‌کەر یا رەهن‌وەرگر شێت بوون یا مردن لە پێش وەرگرتنی ماڵە رەهن‌کراوەکەدا، ئەوە ئەو رەهنە بەتاڵ نابێتەوە، بەڵکوو میراتگر لە جێگای مردوو و وەلی‌ئەمر لە جیاتی شێت بوو دائەنیشێ.

دروست نییە رەهن‌کەر تەسەڕوف بکا لە ماڵی رەهن کراودا لە پاش ئەوەی کە رەهن‌وەرگرەکە وەری‌بگرێ، بە تەسەڕوفێکی‌واکە ببێ بە هۆی دەرچوونی ئەو ماڵە لە مولکییەتی، وەك فرۆشتن و بەخشین و ئەم‌جۆرە تەسەڕوفاتە، بەتاڵن و دانامەزرێن؛ هەروەها، دروست نییە کە ماڵە رەهن‌کراوەکە بخاتە رەهنی کەسێکی‌ترەوە و دروست نییە بیدا بەکرێ ئەگەر قەرزەکە بێ‌وەعدە بێ یا خود لە پێش تەواوبوونی ماوەی بەکرێ دانەکەدا وەعدەی قەرزەکە بێتە پێشەوە؛ بەڵێ، دروستە بۆی تەسەڕوفێکی وای تیا بکا کە نەبێ بە هۆی کەم‌بوونەوەی نرخی، وەك سواربوونی وڵاخ و دانیشتن لە خانوودا بە بێ‌گەیاندنی زیان پێی؛ دروست نییە بۆ رەهن‌کەر دار بنێژێ یا خانوو بکاتەوە لە زەویی رەهن‌کراودا وە ئەگەر ئەوەی کرد، لە پێش هاتنی وەعدەی قەرزەکەدا، ئەو دارو خانووە بە ناچاری لانابرێن؛ جا کە وەعدەی قەرزەکە هات، تەماشا ئەکەین، ئەگەر قیمەتی زەوییەکە بەو شێوەیە بەشی قەرزەکەی نەئەکرد، بەڵام بە بێ‌دار یا خانووەکە بەشی ئەکرد، ئەوە واجبە ئەو دارانەو ئەو خانووە هەڵبکەنرێن بەو شەرتە کابرای رەهن‌کەر رێگا نەدا زەوییەکە لەگەڵ دار و خانووەکەدا بفرۆشرێن و بە هۆی لاتی و بێ‌دەسەڵاتیشەوە حیجر نەنرابێتە سەری و رێگای تەسەڕوف‌کردنی لێ نەگیرابێ؛ بەڵام ئەگەر قیمەتی زەوییەکە بەو شێوەیە بەشی قەرزەکەی ئەکرد، ئەوە ئەو دارو

خانووە هەڵناکەنرێن و زەوییەکە بە تەنها ئەفرۆشرێ؛ هەروەها، ئەگەر قیمەتی زەوییەکە بەشی قەرزەکەی نە ئەکرد و بە هۆی هەڵکەندنی دارو خانووەکەیشەوە زیادی نە ئەکرد، هەر بە تەنها ئەفرۆشرێ وە ئەگەر بە هۆی هەڵکەندنی دار و خانووەکەوە قیمەتی زەوییەکە زیادی ئەکرد، بەڵام کابرای ڕەهنکەر حیجری لە سەر دانرابوو، یا خود ڕەهنکەر ڕێگای ئەدا تێکڕای زەوییەکە و دارو خانووەکە بفرۆشرێن و قیمەتی زەوییەکە بەڕووتی زیاتر نەبوو لە قیمەتی لەگەڵ دارو خانووەکەدا، ئەوە هەردووکیان بە یەکەوە ئەفرۆشرێن و قیمەتەکەیان بەش ئەکرێ بە سەر زەوی و دارو خانووەکەدا و قیمەتی زەوییەکە ئەدرێ بە ڕەهن وەرگرەکە و لەم سێ سوورەتەی دواییدا، هەر کەم و کورتییەك هەبێ، لە سەر کابرای ڕەهنکەر حیساب ئەکرێ و تەواوی ئەکا بۆ کابرای ڕەهن وەرگر.

بزانن! ئەو جۆرە تەسەڕوفانەی کە دروستن بۆ ڕەهنکەر، ئەگەر دەستیان ئەدا بە بێ ئەوە کە ماڵە ڕەهنکراوەکە بسێنێتەوە لە ڕەهنوەرگر، وەك دۆشینی حەیوانی ڕەهنکراو لە هەموو ڕۆژێکا، ئەوە لەو سوورەتەدا ماڵە ڕەهنکراوەکە هەر لای ڕەهنوەرگرەکە ئەبێ وە ئەگەر پێویستی بەوە ئەکرد کە وەری بگرێتەوە لێی، وەك بارکێشان بە وڵاخی ڕەهنکراو و سواربوونی بۆ سەفەر، ئەوە لەکاتی بەکار هێنانیا وری ئەگرێتەوە لە ڕەهنوەرگرەکە وە ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە باوەڕی نەبوو بە ڕەهنکەرەکە، ئەتوانێ دوو شاهیدی لێ بگرێ کە ماڵەڕەهن کراوەکەی بردووە بۆ بەکارهێنانی؛ هەر تەسەڕوفێك کە دروست نەبێ بۆ ڕەهنکەرەکە، ئەگەر ڕەهنوەرگرەکە ڕێگای دا، ئەوە دروستە ئەو تەسەڕوفاتە بکا لە ماڵە ڕەهن کراوەکەدا.

دروستە بۆ ڕەهنوەرگر پەشیمان ببێتەوە لەو ئیجازەیەی داویەتی بە ڕەهنکەر وە ئەگەر ڕەهنکەر لەو بەینەدا، لە پێش ئەوەدا کە بە پەشیمان بوونەوەی ڕەهنوەرگر بزانێ، تەسەڕوفی کرد لە ماڵە ڕەهنکراوەکەدا، ئەوە هەر تەسەڕوفێکی بکەوێتە پاش پەشیمان بوونەوەی ڕەهن وەرگر، بەتاڵە وە ئەگەر ڕەهنوەرگر ڕێگای ڕەهنکەری دا کە ماڵە ڕەهنکراوەکە بفرۆشێ بەو شەرتە لە قیمەتەکەی قەرزەکەی ئەو بداتەوە و هێشتا وادەی

قەرزەکەیشی نەهاتبوو، ئەوە ئەو فرۆشتنە بەتاڵە؛ هەروەها، ئەگەر ئەو ڕێگادانە بەو شەرتە بێ کە قیمەتی ماڵەرەهنکراوەکە دابنێ بە رەهن لە لای رەهن وەرگرەکە.

## باسی هەندێك حوکمی رەهنو ماڵی رەهنکراو

کە عەقدێ رەهنکرا و رەهن وەرگر ماڵە رەهنکراوەکەی وەرگرت، ئەوە رەهنەکە جێ گیر ئەبێو دائەمەزرێ؛ جا ئەگەر لە عەقدەکەدا بڕیاریان دابوو ئەو ماڵە رەهنکراوە لای رەهن وەرگرەکە بێ، ئەوە لە دەستی ئەودا ئەمێنێتەوەو لە ژێردەستی لانابرێ، مەگەر بۆ قازانج لێوەرگرتنی رەهن کەرەکە، وەك باسمان کرد وە ئەگەر شەرتیان کردبوو کە لەلای کەسێکی دادپەروەر دابنرێ، ئەوەیش هەر دروستە و لەپاش ئەوەکە رەهنوەرگرەکە وەری گرت، ئەدرێتە دەستی ئەو کەسە دادپەروەرە وە ئەگەر بڕیاریان دابوو لای دووکەس دایبنێن، ئەوە ئەگەر وتبوویان کە هەردووکیان یا یەکێکیان چاودێری بکەن، ئەوە باشە، ئەگینا دروست نییە یەکێك لەوان بەتەنها پارێزگاری ئەو ماڵە رەهنکراوە بکا و ئەبێ بە بڕیاری هەردووکیان چاودێری بکرێ وە ئەگەر کابرای دادپەروەر مرد یا فاسق بوو، ئەوە لەسەر ئارەزووی هەردووکیان ئەتوانن لە جێگایەکی باشا دایبنێن وە ئەگەر قسەیان نەکەوتەیەك، ئەوە پێویستە قازی لە شوێنێکی باشا دایبنێ.

بزانن! ماڵی رەهنکراو، هەر کە وەعدەی قەرزەکە دوایی هات، وەختی فرۆشتنی دێت. جا کە فرۆشرا، رەهنوەرگرەکە پێشئەکەوێ لە وەرگرتنەوەی حەقی خۆیدا لە پارەکەی. فرۆشتنی ماڵی رەهنکراو لەلایەن کابرای رەهنکەر یا وەکیلەکەیەوە ئەبێ، بەڵام بە ڕێگادانی رەهن وەرگرەکە؛ ئەگەر هاتو رەهنوەرگر ڕێگای نەدا بفرۆشرێ، ئەبێ قازی پێی بڵێ: یا رەهنکەرەکە ئازاد بکا لە قەرزەکەی یا ڕێگای بدا ماڵە رەهن کراوەکە بفرۆشێو ئەگەر رەهنوەرگرەکە داوای فرۆشتنی ئەکردو رەهنکەرەکە نەیئەفرۆشت، پێویستە قازی زۆری لێبکا بۆ دانەوەی قەرزەکە یا بۆ ڕێگادانی فرۆشتنی ماڵە رەهنکراوەکەو ئەگەر وەختی خۆی بڕیاردرابوو کەسێکی دادپەروەر

بیفرۆشێ، ئەوەش دروستە و لەمكاتەدا پێویست نییە بگەڕێنەوە سەر ڕەهنكەرەكە؛ جا هەركاتێ ئەو كەسە دادپەروەرە فرۆشتی، ئەوە تا قیمەتەكەی لەلای ئەو بێ، هەر وا لە زەمانەتی ڕەهنكەرەكەدا تا ڕەهنوەرگرەكە وەری ئەگرێ وە ئەگەر قیمەتەكە لەدەستی ئەوكەسەدا فەوتا و ماڵەڕەهنكراوەكەیش بە ماڵی خەڵك دەرچوو، ئەوە ئەگەر كڕیارەكە ئارەزووی بوو، بگەڕێتەوە بۆسەر كابرای ڕەهنكەر و لەئەنجاما، مەسەلەكە هەر دێتەوە سەر كابرای ڕەهنكەر. دروست نییە ئەو كابرا دادپەروەرە ماڵە ڕەهنكراوەكە بفرۆشێ بە غەیری پارەی نەختی ڕەواجی ئەو وڵاتە و ئەبێ بە قیمەتێكی باش و بە حازری بفرۆشێ وە ئەگەر ماوەی پەشیمانییان دانابوو و لەو ماوەیەدا یەكێك پەیدابوو زیادی كرد لەسەر ئەو قیمەتە، پێویستە ئەوكابرا دادپەروەرە فرۆشتنە پێشووەكە هەڵوەشێنێتەوەو بیفرۆشێ بەم قیمەتە تازەیە كە زیاترە لەوەی پێشوو.

هەرچی مەسرەف و پێویستییەكی ماڵی ڕەهنكراوە لەسەر كابرای ڕەهنكەرە و ناچار ئەكرێ كە مەسرەف بكا بۆ ئەو ماڵە بۆ ئەوە حەقی ڕەهنوەرگرەكە نەفەوتێ. ڕەهنكەر مەنع ناكرێ لە هەرشتێ كە مەسڵەحەتی ماڵەڕەهنكراوەكەی تیابێ، وەك ناڵكردنی وڵاخی ڕەهنكراوو قاشاودانی و خزمەتی تری.

ماڵی ڕەهنكراو ئەمانەتە لەدەستی ڕەهنوەرگردا تا وادەی قەرزەكەی تەواو ئەبێ و بەهۆی فەوتانی ئەو ماڵەوە هیچ لە قەرزەكە لاناچێ، مادام كەمتەر خەمی نەكردبێ لە چاودێری كردنیا وە ئەگەر ڕەهنكەر ئیددیعای كرد كە ڕەهنوەرگر كەمتەرخەمی كردووە، ئەگەر شاهیدی نەبوو، ئەوە ڕەهن وەرگرەكە سوێند ئەدرێ.

عەقدی ڕەهن، چ دامەزرابێ و چ دانەمەزرابێ، حوكمی ئەمانەتی ڕەهن وەرگرەكە ناگۆڕێ، چونكە تێكڕا هەرچی عەقدێكی دانەمەزراو هەیە، وەك عەقدی دامەزراو وایە لە زەمانەت و ئەمانەتدا ـ مەسەلا ـ لە عەقدی خواستنی خواستەمەنی (عـارية)دا، چ دامەزرێ و چ دانەمەزرێ، كابرای ماڵخواز (مُستعير)، زامنە و لە عەقدی ڕەهن‌دا، چ دامەزرێ و چ دانەمەزرێ، كابرای ڕەهنوەرگر بە ئەمین ئەناسرێ. ئەگەر شەرتیان كردبوو ئەو ماڵە لەڕەهندابێ تا وادەی قەرزەكە تەواو ئەبێ و پاش ئەوە فرۆشراو بێ بە

رهن‌وەرگرەکە، ئەوە رەهن‌و فرۆشتنی هەردووکیان بەتاڵن؛ رەهنەکە لەبەر ئەوە بەتاڵە کە وەختی بۆ دانراوە، فرۆشتنەکەش لەبەر ئەوە بەتاڵە کە بەسراو (مُعلَّق)ە بە هاتنی وادەی قەرزەکەوە؛ جا لەم سوورەتەیشدا، هەر لەسەر ئوسووڵی پێشوو، کابرای رەهن‌وەرگر لە ماوەی رەهنەکەدا ئەمینە چونکە رەهنی دانەمەزراو وەك رەهنی دامەزراو وایە لە ئەمانەتدا و لەپاش هاتنی وادەی قەرزەکەش بە زامن دائەنرێ، چونکە شتێك بە فرۆشتنێکی دانەمەزراو فرۆشرابێ، وەك شتێك‌وایە بە شێوەیەکی دامەزراو فرۆشرابێ [و] لە ژێردەستی زامندایە.

ئەگەر رەهن‌وەرگر ئیددیعای فەوتانیماڵە رەهن‌کراوەکەی کرد، سوێند ئەدرێ وە ئەگەر ئیددیعای کرد کە ناردوویەتەوە بۆ رەهن‌کەرەکە، باوەڕی پێ‌ناکرێ، بەڵکوو باوەڕ بە رەهن‌کەرەکە ئەکرێ، چونکە رەهن‌وەرگر، وەختی خۆی، بۆ مەسڵەحەتی خۆی ئەو رەهنەی وەرگرتووە و لەپاش وەرگرتنی، قسەی بەجێ ئەوەیە نەیدابێتەوە.

ئەگەر ماڵە رەهن‌کراوەکە بەدەستێکی تاوان فەوتا و لە جیاتی ئەو شتێك لە کابرای تاوانبار وەرگیرا، ئەوە ئەو شتە لە خۆیەوە ئەکەوێتە رەهنی کابرای رەهن‌وەرگرەوە بە بێ‌ئەوە کە عەقدێکی رەهنی تازەی بۆ بکرێ، هەروەها ئەگەر رەهن‌وەرگرەکە خۆی ماڵەکەی فەوتاندو شتێکی لە جێگەیدا دانا، بەڵام ئەگەر رەهن‌کەرەکە فەوتاندی، ئەوە پێویستە لەجیاتییدا شتێك بهێنێ و بە عەقدێکی تازە بیخاتە رەهنی رەهن وەرگرەکەوە.

حەقی داواکردنی بەدەڵی ماڵی رەهن‌کراوی فەوتاو، بۆ رەهن‌کەرەکەیە؛ ئەگەر ئەو داوای نەکرد، رەهن‌وەرگر حەقی داواکردنی نییە، بەڵکوو حەقی ئەوەی هەیە داوای رەهنێکی تر بکا لە رەهن‌کەرەکە و رەهن‌وەرگر بە هیچ‌جۆرێ حەقی ئەوەی نییە لەو کابرا خۆش ببێ کە ماڵە رەهن‌کراوەکەی فەوتاندووە.

بزانن! رەهن، ئەڕوا بەسەر هەر زیادەیەکدا کە پەیدا ببێ لە ماڵە رەهن‌کراوەکەداو پێیەوە لکابێ، وەك قەڵەوبوونی حەیوان‌و گەورەبوونی درەخت؛ بەڵام ناڕوا بەسەر زیادەیەکدا کە جیا بێ لە ماڵە رەهن‌کراوەکە، وەك سەمەری باخ‌و بەچکەی حەیوانی رەهن‌کراو، بەو شەرتە کە حەیوانەکە ئاوس نەبووبێ لەو کاتەدا کە خراوەتە رەهنەوە؛

کەواتە، ئەگەر کەسێك حەیوانێکی نایە ڕەهنەوە، ئەوە ئەو حەیوانە بەخۆیو سکەکەیەوە لە ڕەهندایە، چونکە مادام ئەو سکە لەکاتی ڕەهن دانانەکەدا بووە، بە زیادە ناناسرێ، خواە هەر بە ئاوسی بفرۆشرێ بۆ دانەوەی حەقی ڕەهن وەرگرەکە، یا لەپاش زایینی بفروشرێو ئەگەر حەیوانەکە ئاوس نەبوو لەو کاتەدا کە نراوەتە ڕەهنەوەو لەکاتی فرۆشتنیدا بۆ قەرزەکە ئاوس بوو، یاخود لە بەینی خستنە ڕەهنیو فرۆشتنیدا ئاوس‌بوو، ئەوە سکەکەی ناکەوێتە ڕەهنەوە، چونکە ئەو بەچکەیە هەرچەند لە سکی دایکیا بێ، هەر حوکمی زیادەی جیاوازی هەیە؛ جا ئەگەر لەپێش ئەوەدا کە ئەو حەیوانە ڕەهنکراوە بزێت، وادەی قەرزەکە هات، ئەوە ئەو حەیوانە لەو کاتەدا نافرۆشرێت هەتا سکەکەی لێ ئەبێتەوە، چونکە بەشێك نەبووە لە ماڵە ڕەهنکراوەکە و قیمەتیشی دیار نییە، مەگەر کابرای ڕەهنکەر چاوپۆشی بکاو ڕێگا بدا حەیوانەکە بە ئاوسی بفرۆشرێو حەقی ڕهنوەرگرەکەی لێ بدرێو ئەگەر لەپاش تەواوبوونی وادەی قەرزەکە بزێ، ئەوە هەردووکیان ئەفرۆشرێن لەبەر مەسڵەحەتی بەچکەکە، بەڵام قیمەتی بەچکەکە هی کابرای ڕەهنکەرە.

## باسی فەوتانی ماڵی ڕەهنکراو

ئەگەر ماڵە ڕەهنکراوەکە فەوتا بە ئافەتێکی ئاسمانی یا بەدەستی کەسێك کە زامن نەبێ، وەك کافرێك کە لە حاڵی جەنگدا بێ لەگەڵ ئیسلام، ئەوە ئەو ڕەهنە بەتاڵ ئەبێتەوە؛ هەروەها، ڕەهنەکە بەتاڵ ئەبێتەوە بەوە کە ڕەهنوەرگر عەقدەکە هەڵوەشێنێتەوە، هەرچەند ڕەهنکەرەکەش ڕازی نەبێ، چونکە ڕەهن لەلایەنی ڕەهنوەرگرەوە عەقدێکی دروستە و قابیلی تێکدانە، هەرچەند لەلایەنی ڕهنکەرەوە عەقدێکی پێویستە و قابیلی تێکدان نییە؛ هەروەها، ڕەهن بەتاڵ ئەبێتەوە بەهۆی ئازادبوونی قەرزارەوە لە قەرزەکەی کە لەسەری بووە، خواە خۆی قەرزەکە بداتەوە یا کەسێکی تر بۆی بداتەوە یا خاوەن قەرزەکە ئازادی بکا وە ئەگەر هەندێك لە قەرزەکە درایەوە، ئەوە هیچ بەشێك لە ڕەهنەکە ناکرێتەوە.

وە ئەگەر کەسێك نیوەی خانوویەکی دانا لە رەهنی قەرزێکداو نیوەکەی تری دانا لە رەهنی قەرزێکی ترا، و پاشان رزگاریی بوو لە یەکێك لەو دوو قەرزە، ئەوە بەشی رەهنی ئەو قەرزەی لەسەر هەڵئەگیرێو ئەگەر دووکەس خانوویەکیان بوو، وە دایاننا لە رەهنی قەرزێکا کە لەسەریان بوو، وە یەکێك لەوان بەشە قەرزەکەی خۆی دایەوە، ئەوە بەشە خانووەکەی ئەو لە رەهن دەرئەچێ.

## باسی یەك نەکەوتنی قسەی رەهنکەرو رەهنوەرگر لەگەڵ چەند بابەتێکی تر

ئەگەر دووکەس ناکۆکییان لەبەیندا پەیدابوو، یەکێکیان وتی: من ئەوماڵەم دانەناوە بە رەهن، ئەویشیان وتی: نەخەیر داتناوە لە رەهنا، یاخود ناکۆکییان لە نێواندا پەیدابوو لەبارەی ئەندازەی ماڵە رەهنکراوەکەوە، یەکێکیان وتی: یەك خانوو خراوەتە رەهنەوەو ئەویان وتی: دوو خانوو خراوەتە رەهنەوە، تەماشا ئەکەین، ئەگەر رەهنەکە لەسەر بنچینەی پیاوەتی کرابێ، لەو سوورەتەدا رەهنکەرەکە سوێند ئەدرێ وە ئەگەر لەسەر بنچینەی ئەوە کرابێ کە بەشەرت گیراوە لە عەقدی موعامەلەکەدا، ئەوە هەرکامیان سوێند ئەخوا لەسەر راستی ئیددیعای خۆیو درۆیی ئیددیعای ئەویان، جا رەهنەکە فەسخ ئەکرێتەوە و هەڵئەوەشێنرێتەوە.

ئەگەر رەهنوەرگر ئیددیعای کرد وتی: ئەو دووکەسە خانوویەکیان داومەتێ لە رەهنی سەد دینارا و یەکێ لەو دووکەسە باوەڕی پێکرد و ئەویان باوەڕی پێنەکرد، ئەوە بەشی باوەڕکردووەکە ئەبێ بە رەهن لە جیاتی نیوەی پارەکە، بەڵام بۆ بەشی ئەویتریان کابرای رەهنکەر سوێن ئەدرێ و لەموەختەدا، شایەتی کابرای باوەڕکردوو قەبووڵ ئەکرێ؛ جا ئەگەر شاهیدیتری هەبوو شەهادەت بدا لەگەڵیا باشە، ئەگینا، خۆی ئەتوانێ سوێند بخوا لەگەڵ ئەو تاقە شاهیدەدا.

وە ئەگەر هەردوولا قسەیان یەکی نەگرت لە مەسەلەی وەرگرتنی ماڵە رەهنکراوەکەدا، یەعنی رەهنوەرگر وتی: وەرمگرتووەو رەهنکەر وتی: وەرت نەگرتووە، ئەوە رەهنکەر

سوێن ئەدرێ؛ هەروەها، ئەو ماڵەم بە هۆی شتێکی ترەوە پێداوی، وەك «عارية» یا «وَديعة» یا «إجارة»، ئەوە هەر ڕەهنکەرەکە سوێن ئەدرێ وە ئەگەر ڕەهنکەر پێی لێ نا کە ڕەهنوەرگر ماڵەکەی وەرگرتووە، بەڵام لەپاشا وتی: ئەو پێ لێنانەم بەڕاستی نەبووە، ئەوە ڕەهنکەر ئەتوانێ سوێنی ڕەهنوەرگر بدا لەسەر ئەوەکە ئەو پێ لێنانە ڕاست بووە؛ جا ئەگەر سوێندی خوارد، باشە، ئەگینا ڕەهنکەر سوێند ئەخوا کە پێ لێنانەکەی ڕاستنەبووە. ئەگەر ڕەهنوەرگر ڕێگای ڕەهنکەری دا بۆ فرۆشتنی ماڵە ڕەهنکراوەکە و فرۆشراو [و] لەپاشا ڕەهنوەرگر وتی: لەپێش ئەو فرۆشتنەدا لە ڕێگادانەکەم پەشیمان بوومەتەوە و فرۆشتنەکە بەتاڵە و ڕەهنکەریش وتی: لەپاش فرۆشتنەکە پەشیمان بوویتەوە، ئەوە قسەی ڕاستتر ئەوەیە کە ڕەهنوەرگر سوێند ئەدرێ.

ئەگەر کەسێك دوو هەزار دیناری بە دووجار قەرز کرد و ڕەهنی دانا بۆ هەزار دیناریان، لەپاشا هەزار دیناری دایەوە و وتی: ئەو هەزار دینارە ئەوە بووە کە ڕەهنەکەم بۆ دانابوو، ئەوە ئەو سوێند ئەدرێ لەسەر قسەکەی و باوەڕی پێ ئەکرێ وە ئەگەر وەختی خۆی نیازی هیچکامیانی نەکردبوو، ئەوە ئێستە ئەتوانێ بڕیاری بدا بۆ هەرکامیان کە مەیلی هەبێ.

## باسی ئەوەکە ماڵی مردوو لە ڕەهنی حەقی خواو ئادەمیزادا بێ

ئەگەر کەسێك مردو حەقی ماڵی خوا یا ماڵی ئادەمیزادێکی لەسەربوو لە غەیری میراتگرەکان، ئەوە ئەو حەقە پەیوەند (تعلّق) پەیدا ئاکا بە میراسی ئەوکەسەوە وەك پەیوەندی قەرز بە ماڵی ڕەهن کراوەوە، بە ڕەهنێکی دەسکردیوا کە ڕەهنکەرەکانی زۆر بن؛ کەواتە، تا بەشێك لەو حەقە مابێت، دروست نییە میراتگرەکان تەسەڕوف بکەن لەو میراتەدا، خواە ئەو حەقە هەموو میراتەکەی گرتبێتەوە یا نە و خاوەن قەرزەکان ڕازی بن یا نە؛ بەڵێ، هەرکام لە میراتگرەکان بەشە قەرزەکەی خۆی دایەوە، ئەوە بەشە میراتەکەی بەرئەبێ و لە فەرموودەیەکی تری ئیمامدا، ئەو حەقە پەیوەند پەیدا ئەکا بەو میراتەوە وەك پەیوەند پەیداکردنی تۆڵەی پیاوکوشتنی بەندەیەك بە

گەردنی ئەو بەندەیەوە، یەعنی ئەو حەقە پەیوەند پەیدا ئەکا بە ئەندازەی خۆی لە میراتەکەوە و هەرچی لە میراتەکە زیاد بوو لە حەقەکە، ئەوە بەرەڵڵایە؛ ئەم فەرموودەیە دروستە ئینسان رەفتاری پێبکا بۆ خۆی، بۆ ئەوە لەکاتێکا حەقەکە کەمتر بێ لە میراتەکە، بۆی دروست بێ تەسەڕوف بکا لەو میراتەداو گوناهبار نەبێ.

بەڵێ، لەسەر فەرموودەی بەهێز، حەقی بێگانەیەك کە مەئیووس بووبین لە دۆزینەوەی جێگای و حەقی ماڵێکی دۆزراوەی‌وا کە هەڵگرەکەی کردبێتی بە موڵك بۆ خۆی‌و خاوەنی دیار نەبێ، ئەمانە پەیوەندیان نییە بە میراتەکەوە، ئەگینا، ئەبێ ئەو میراتە تا ماوەیەکی بێ‌ئەندازە ماتڵ بکرێ، بەتایبەتی لەم زەمانەدا کە قازی دادپەروەری ئەمین زۆرکەم دەس‌ئەکەوێ تا حەقی خاوەن حەقی بدرێتە دەست.

جا ئەگەر میراتگر تەسەڕوفی کرد لە میراتەکەدا لە وەختێکا کە قەرز دیار نەبوو و لەپاش تەسەڕوفەکە قەرز دەرکەوت لەسەر میراتەکە، ئەوە راستتر ئەوەیە ئەو تەسەڕوفانە بەتاڵ نابنەوە، مادام میراتگر قەرزەکە بداتەوە؛ ئەگەر قەرزەکەی نەدایەوە، ئەو تەسەڕوفانە بەتاڵ ئەکرێنەوە. بە ئیتتیفاقی ئیمامەکان، میراتگر ئەتوانێ عەینی میراتەکە وەربگرێ بۆخۆی‌و ئەو قەرزو حوقووقە لە ماڵی خۆی بداتەوە؛ هەروەها، راست ئەوەیە کە پەیوەندی قەرز بە میراتەوە، رێگا لەوە ناگرێ کە میراتەکە ببێ بە موڵکی میراتگرەکان؛ کەواتە، هەر زیادەیەك لەکاتی مردنی کابراوە پەیدا ببێ، هەمووی موڵکی میراتگرەکانە.

بزانن! ئەم قەرزە کە پەیوەندی هەیە بە میراتەوە، پەیوەندی بە بەشی هەر میراتگرێکەوە بەنیسبەتی بەشی میراتگرەکەیە؛ مەسەلا، یەکێك مرد کچێك‌و خوشکێك‌و دایکی لەپاش بەجێ‌ما، ئەوە شەش‌یەکی قەرزەکەی لەسەر دایکی‌و نیوەی لەسەر کچەکەی‌و ئەوی‌تری لەسەر خوشکەکەیەتی؛ ئەگەر ئەم کابرا شەست دیناری میرات بەجێ هێشت‌و بیست‌و چوار دینار قەرزار بوو، دایکەکەی چوار دینارو کچەکەی دوانزە دینارو خوشکەکەی هەشت دینار لەو قەرزە ئەداتەوە و دایکەکە شەش دینارو کچەکەی هەژدە دینارو خوشکەکەی دوانزە دیناری بۆ ئەمێنێتەوە؛ بەڵام ئەگەر کابرا

قەرزاری میراتگری خۆی بوو، ئەوە لە قەرزی ئەو میراتگرە بە پێی نیسبەتی میراتی خۆی، لە قەرزەکەی لائەچێ؛ کەوابوو، ئەگەر یەکی مرد و دە دینار میراتی بەجێ‌هێشت‌و دە دینار قەرزاری میراتگر بوو کە تاقە برایەك بێ، ئەوە هەموو قەرزەکەی ئەکەوێ، وەك بڵێی: پاش ئەوەی میراتەکە بوو بە ماڵی براکەی، هەمووی لێ‌وەرگیراوە بۆ حەقی قەرزەکەو دراوەتەوە بە خۆی! هەروەها ئەگەر لە دە دینار کەمتر قەرزار بوو، یا ئەگەر کابرا قەرزاری چەند میراتگرێك بوو.

وە ئەگەر یەکێك لە میراتگرەکان خاوەن قەرز بوو و ئەوانی تریان قەرزیان لەسەری نەبوو، ئەوە لە بەشی خاوەن قەرزەکە بەنیسبەتی بەشی خۆی لە قەرزەکە ئەکەوێ، بەڵام هەر ئەدرێتەوە بە خۆی و لە بەشی میراتگرەکانی تریش، بە نیسبەتی بەشەکەیان لەو قەرزە ئەکەوێ‌و ئەدرێ بەو میراتگرە کە قەرزی بەسەر مردووەکەوە هەیە؛ بۆ وێنە، کەسێك مرد، میراتگری، ژنێك‌و برایەکی بوو و میراتەکەی عەینێك بوو کە بایی هەزارو دووسەد دینار بوو و هەزارو سەد دیناری ژنەکەی قەرزار بوو، لەم سوورەتەدا، لە بەرئەوە کە چواریەکی ئەو عەینە ـکە بایی سێسەد دینارە ـ بۆ ژنەکەیەتی و سێ روبعیشی ـکە بایی نۆسەد دینارە ـ بۆ براکەیەتی، لە قەرزی ژنەکەیا ـکە هەزارو سەد دینارە ـ چواریەکی ـکە بریتییە لە دووسەد و حەفتاو پێنج دینار ـ لائەچێ، یەعنی وەك بڵێی: لە ژنەکە وەرئەگیرێ‌و ئەدرێتەوە بە خۆی لەجیاتی قەرزەکەی‌و لە سێ‌روبعی براکەی ـکە نۆسد دینار بوو ـ سێ‌روبعی قەرزەکە ـکە بریتییە لە هەشت‌سەدو بیست‌و پێنج دینار ـ وەرئەگیرێ‌و ئەدرێ بە ژنەکەی‌و لە بەشەکەی، تەنها حەفتاو پێنج دیناری بۆ ئەمێنێتەوە، هەروەکوو لە بەشی ژنەکە، بیست‌و پێنج دینار زیادە لە ئەندازەی بەشی قەرزەکە ئەمێنێتەوە بۆی.

## باسی جارِدانی لات‌کەوتن (تَفلیس)

«تَفلیس»، بەوە ئەڵێن کە قازی حیجر لەسەر قەرزارێك دانێ بەو شەرتانە کە باسیان ئەکەین؛ کەواتە، ئەگەر یەکێك قەرزار بێ، بەڵام قەرزەکان وەعدەیان هەبێ‌و

هێشتا وەعدەیان نەهاتبێ، یاخود قەرزار بێ بە قەرزی حازر یا بە قەرزێکی وەعدەدارو وەعدەیان هاتبێتەجێ، بەڵام کابرا ماڵی لەو قەرزانە زۆرتر بێ، یا ئەوەندەی ئەو قەرزانە بێ، ئەوە حیجری نانرێتە سەر، چونکە ئەتوانێ قەرزەکان بداتەوە وە ئەگەر خۆی بەئارەزووی خۆی قەرزەکەی نەدایەوە، قازی ئەتوانێ زۆری لێ بکا، هەروەها ئەگەر قەرزێکی وای بەسەرەوەبوو کە زۆرتر بێ لە ماڵەکەی، بەڵام خاوەن قەرزەکان داوا نەکەن کە حیجری بخرێتەسەر؛ بەڵام ئەگەر قەرزەکان زۆرتر بن لە ماڵەکەی و خاوەن قەرزەکانیش داوا بکەن لە قازی کە حیجر بنێتە سەری، ئەوە واجبە لەسەری کە ئەو حیجرە دابنێ، یەعنی مەنعی بکا لە تەسەرروف کردن لەو ماڵەدا لەبەر مەسڵەحەتی ئەو خاوەن قەرزانە، بۆ ئەوەی قەرزەکەیان نەفەوتێ، هەروەها ئەگەر یەکێکیش لە خاوەنقەرزەکان، داوای ئەم حیجر دانانە بکا لە قازی و قەرزەکەیش لە ماڵەکە زۆرتر بێ؛ حیجر دانانیش، بەوە ئەبێ کە قازی بە لەفز، بڵێت: وا حیجرم دانا لەسەر فلانەکەس و مەنعم کرد لە تەسەرروف کردن لە ماڵی خۆیا. هەروەها، واجبە قازی حیجر بنێتە سەر کابرا لەسەر داواکردنی خۆی یا وەکیلی، پاش سابت بوونی قەرزەکە لەسەری و سوورەتی ئەم مەسئەلەیە، بەمجۆرەیە کە خاوەن قەرز داوای قەرزەکەی خۆی بکا لای قازی و کابرای قەرزاریش دان بنێ بەو قەرزەدا یا بە شاهید سابت بێ لەسەری، ئیتر خاوەن قەرزەکان داوای حیجر نەکەن و کابرا خۆی داوای ئەوە بکا کە قازی حیجر بنێتە سەری.

سوننەتە قازی شاهید بگرێ لەسەر ئەو حیجردانانە، هەروەها فەرمان بدا کە جاربدەن بە حیجری کابرا بۆ ئەوەکە خەڵك تەرێز بکەن لە موعامەلەکردن لەگەڵی و لە قەرز پێدانی؛ جا کە حیجر نرایە سەر قەرزارێك، ئیتر حەقی خاوەن قەرزەکان ئەبەسرێ بە ماڵی کابراوە، چ لە کەلو پەلو چ لە نەختو چ لە حازرو لە قەرز و بە هیچ جۆرێ دروست نییە کابرا تەسەرروف بکا لەو ماڵەدا، یا قەرزارێکی ئازاد بکا، چونکە ماڵەکە لەدەستی ئەو دەرچووە. کە قازی حیجری دانا لەسەر کابرا، بەو حیجردانانە قەرزە وەعدەدارەکان نابن بە حازری، بەڵکوو لەسەر وەعدەی خۆیان ئەمێننەوە تا

وەعدەیان دێت. ئەگەر قەرزارەکە لەپاش حیجردانان لەسەری، شتێکی لە ماڵی خۆی فرۆشت یا بەخشی بەکەسێك، ئەوە بەتاڵە، هەتاوەکوو ئەگەر بە خاوەن قەرزەکەشی بفرۆشێ لەجیاتی قەرزەکەی، ئەوەش هەر بەتاڵە وە ئەگەر شتێکی وەسفکراوی لە ئەستۆی خۆیدا فرۆشت بە عەقدی سەلەم، یا شتێکی کڕی بە قەرز لە ئەستۆی خۆیدا، ئەوە دروستە و ئەکەوێتە ئەستۆی، چونکە پەیوەندی نییە بەوماڵەیەوە کە ئێستە هەیەتی و حیجری لەسەر دانراوە؛ هەروەها، دروستە ژن بهێنێ و ژن تەڵاق بدا بە خوڕایی یا لەسەر پارە و تۆڵەی خوێن وەربگرێ لە دوژمنی خۆی و تۆڵەی خوێن لەئەستۆی خۆیدا نەهێڵێ، بەم رەنگە تووانای خاوەن حەق بدا قیساسی خۆی وەربگرێ[1].

ئەگەر پاش حیجر لەسەردانان، پێی لێنا کە عەینێك لە ماڵەکەی، ماڵی خەڵکە، یا دانی نا بە قەرزێکا کە لەپێش ئەو حیجردانانەدا کەوتووەتە سەری، ئەوە پێ لێنانەکەی قەبووڵ ئەکرێ دەرحەق بە خاوەن قەرزەکان؛ هەروەها، ئەگەر وتی: بەهۆی جینایەتێکەوە کە لەپاش حیجرەکە کردوویەتی، کەوتووەتە سەری، هەر قەبووڵ ئەکرێ وە ئەگەر لەپێش حیجرەکەدا ماڵێکی عەیبداری کڕیبوو، ئێستە بۆی دروستە بیگێڕێتەوە، ئەگەر سوود لە گێڕانەوەیدا بێ و فەرموودەی راستتر، ئەوەیە حیجر ئەڕوا بەسەر ئەو ماڵانەشدا کە لەپاش حیجرەکە دەستی ئەکەوێ بەهۆی راوکردنو داونانەوەوە، یا بەهۆی ئەوەوە کە کەسێك وەسیەتێکی بۆ کردبێ یا شتێکی پێ بەخشیبێ؛ ئەگەر لەپاش حیجر، کەسێك شتێکی پێ فرۆشت، ئەوە ئەگەر بە حاڵی ئەم کابرایەی زانیبوو، ئێستە ناتوانێ پەشیمان ببێتەوەو عەینی ماڵەکەی خۆی بباتەوە، بەڵکوو قیمەتەکەی لە زیممەی کابرای مەحجووردا ئەمێنێتەوە تا هەرکاتێ دەستی ئەڕوا بیداتەوەو ئەگەر بە حاڵی ئەو کابرای نەزانیبێ، دروستە پەشیمان ببێتەوەو ماڵەکەی خۆی بباتەوە؛ ئەگەر ماڵەکەی فەوتابوو، ناتوانێ ببێ بە شەریکی خاوەنقەرزەکان لە ئەندازەی قیمەتی ماڵەکەی خۆیا، بەڵکوو پاش تەواوبوونی حەقی ئەوان، ئەیبژێرێتەوە بۆی.

---

١. مەبەست ئەوەیە؛ مەسەلا، ئەگەر دەستی یەکێکی بڕیبێ، قابیلە دەستی ببڕێ؛ ئەگینا، مەبەست وەرگرتنی خوێن نییە، چونکە خوێنیش وەك قەرز وایە.

## باسی ئەحواڵی قازی نیسبەت بە ماڵی لاتکەوتوو

پێویستە لەسەر قازی پاش ئەوە کە مەنعی قەرزارەکەی کرد لە تەسەڕوف کردن لە ماڵەکەیا، پەلەپەل بکا بۆ فرۆشتنی ماڵەکەی‌و بیداتەوە بە خاوەن قەرزەکان؛ جا هەر ماڵێك کە ترسی خراپبوونی لێ ببێ وەك گۆشت‌و میوەو شتی‌وا، زوو بیفرۆشێ، پاش ئەوە حەیوانات، چونکە مەسرەفیان ئەوێ، پاش ئەوە هەر ماڵێ کە بگوێزرێتەوە، ئەوجا ئەرزو ئاو و خانوو و دووکان‌و هەرجۆرە بینایەکی تر.

پێویستە ئەم فرۆشتنە بە حوزووری قەرزارەکەو خاوەن قەرزەکان بێ و هەرشتێ لە بازاڕی خۆیا بفرۆشرێ بە قیمەتی عادەتی خۆی‌و بە پارەی نەخت‌و ڕەواجداری ئەو شوێنە؛ جا ئەگەر حەقی خاوەن‌قەرزەکان لەپارەی نەخت نەبوو و داوای ماڵەکەی خۆیانیان ئەکرد، پێویستە قازی لە جینسی ماڵەکەی خۆیانیان بۆ بکڕێ وە ئەگەر نەبوو پارەی نەختیان بداتێ مەگەر لە عەقدی سەلەمدا، کە پێویستە ماڵە سەلەم بۆکراوەکە پەیدا بکا بۆیان. دروست نییە قازی هیچ ماڵێ تەسلیمی کڕیار بکا تاقیمەتەکەی وەرنەگرێ و هەرچی وەرگرت، ئەبێ زوو بەشی بکا لەناو خاوەن قەرزەکانا، مەگەر زۆر کەم بێ، ئەوە گردی بکاتەوە تا زۆر ئەبێ، ئەوجا دابەشی بکا بەسەریانا.

بزانن! لە کاتی بەش‌کردنی ماڵەکەدا، خاوەن قەرز داوای شاهیدی لێناکرێ لەسەر ئەوەکە غەیری ئەو خاوەن قەرزێکی تر نییە؛ ئەگەر شایەد لەپاش دابەش کردن، خاوەن قەرزێکی تر پەیدابوو، ئەویش ئەبێ بە بەشداری خاوەن قەرزەکان بە ئەندازەی خۆی.

ئەگەر قەرزارەکە لەپێش حیجرەکەدا ماڵێکی فرۆشتبوو و لەدواییدا دەرکەوت ماڵی کەسێکی ترە و قەرزارەکە پارەکەیشی خواردبوو، ئەوە وەك خاوەن قەرزێکی تازە پەیدا بووبێ، وەهایە، بەڵام ئەگەر شتێ کە قازی فرۆشتبووی بە ماڵی غەیر دەرچوو، ئەوە پێویستە لەپێشا حەقی ئەوکەسە بداتەوە.

وە واجبە لەسەر قازی هەتا ئەو ماڵە دابەش ئەکا مەسرەفی ئەو کەسانە بدا کە مەسرەفیان لەسەر کابرایە، مەگەر کابرا ئیحتیاجی نەبێ بە مەسرەف بەهۆی کەسابەتی

خۆیەوە و ئەسەح وایە کە خانووی کابراش ئەفرۆشرێ، بەڵام پێویستە دەستێ بەرگی بەکار بهێڵێتەوە بۆ ئەوکابرایە و بۆ ئەوانەی مەسرەفیان لەسەریەتی بەپێی عادەتی وڵات و بە پێی وەخت کە وەختی گەرما یا سەرما بێ، هەروا قووتی رۆژی بەشکردنی ماڵەکەیشیان بۆبەجێ بهێڵێ.

لەپاش دابەشکردنی ماڵی قەرزارەکە، ئیتر واجب نابێ لەسەری کاسپی بکا بۆ بژاردنەوەی هەر قەرزێکی تر کە لەسەری مابێ، بەڵام ئەگەر موڵکێك وەقف کرابێ لەسەری، واجبە بیدا بە کرێ بۆ دانەوەی ئەو قەرزانە. ئەگەر کەسێك ئیددیعای کرد کە لاتکەوتووە، یاخود لەپاش دابەشکردنی ماڵەکە، وتی: هیچ ماڵێکی ترم نییەو خاوەنقەرزەکان باوەڕیان نەکرد، ئەوە ئەگەر کابرا بەهۆی بازرگانییەوە قەرزار بووبوو، پێویستە لەسەر ئیددیعاکەی خۆی شاهیدی ببێ، ئەگینا هەر بە سوێندی خۆی باوەڕی پێ ئەکرێ و قەبووڵ ئەکرێ لە شاهید شەهادەت بدا لەسەر لاتی ئێستای، بەڵام شەرتی شاهیدەکە ئەوەیە ئاگادار بێ لەسەر وەزعی پەنامەکی لاتەکە و شەهادەتەکەی وەهابێ بڵێ: ئێستە ئەم شەخسە لاتەو بێجگە لە نەفەقەی خێزانی نییە و نابێ بە نەفیی رووت بڵێت: هیچ ماڵی نییە چونکی ئاگاداریی بەمجۆرە، شتێکی نایابە؛ جاکاتێ کە لاتی کابرا سابت بوو، دروست نییە حەپس بکرێ، بەڵکوو مەجالی پێئەدرێ تا هەرکاتێ کە دەوڵەمەند ئەبێ و لاتێ کە غەریب بێو شاهیدی نەبێ بۆ ئیسپاتکردنی لاتی خۆی، پێویستە قازی پیاوێکی ئەمینو هۆشیار راسپێرێ بۆ ئەوە کە لە حاڵی بکۆڵێتەوە. جاکە [ئەویش] بەگومانی خۆی حاڵی بوو ئەوکەسە لاتە، ئەوسا لەلای قازی شەهادەت بدا لەسەر لاتی ئەوکەسە.

## باسی پەشیمان بوونەوەی کەسێك ماڵێکی فرۆشتبێ بە لاتێك

ئەگەر کەسێ ماڵێکی فرۆشت بە کەسێ بە قیمەتێك لە ئەستۆی ئەوکەسەدا و پارەکەی وەرنەگرت تا حیجریان لەسەر دانا لەبەر لاتی، ئەوە دروستە فرۆشتنەکەی هەڵوەشێنێتەوەو عەینی ماڵەکەی خۆی بهێنێتەوە؛ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەم

پەشیمان بوونەوەیە ئەبێ دەس‌بەجێ بێ و بە دەم بڵێ: وا فرۆشتنەکەم هەڵوەشاندەوە. پەشیمان بوونەوە، بەوە نابێ کابرای ماڵفرۆش بڕوا ئەم ماڵە بفرۆشێ بە کەسێکی‌تر یا ببەخشێ یا بیکا بە مارەیی ژن. فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەم حەقی پەشیمان بوونەوەیە هەیە لە هەموو موعامەلەیەکدا کە لەسەر بنچینەی گۆڕینەوە بێ، وەك عەقدی سەلەم‌و ئیجارەو قەرزدان؛ بەڵام ئەم هەڵوەشاندنەوەیە، چەند شەرتێکی هەیە؛ یەکەم، ئەوە کە موعامەلەکە بە حازر کرابێ نەك بە قەرزێکی وەعدەدار؛ دووهەم، ئەوەیە کە فرۆشیارەکە حەقەکەی خۆی دەسگیر نەبێ بەهۆی لاتی کابراکەوە؛ ئەگەر قابیل بوو پارەکەی خۆی دەس‌بکەوێ لە ماڵێك کە بە رەهن لای دانرابێ، یاخود کەسێك بە ئیزنی کابرای لاتکەوتوو بوو بە زامنی پارەی ماڵەکە، ئەوە فرۆشیار حەقی هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتنەکەی نامێنێ، وەك چۆن ئەگەر کڕیارەکە دەوڵەمەند بێ‌و بەئارەزوو پارەکە نەداتەوە، یاخود بە دەوڵەمەندی لەو شوێنە رابکا، لەم حاڵەتانەدا حەقی هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتنەکەی نییە وە ئەگەر خاوەن قەرزەکان وتیان: فرۆشتنەکە هەڵمەوەشێنەرەوە و ئێمە تۆ پێش‌ئەخەین لە وەرگرتنەوەی حەقەکەتا، ئەوە ئەتوانێ ئەو فرۆشتنە هەڵوەشێنێتەوەو ئەم منەتە هەڵنەگرێ؛ شەرتی سێهەم، ئەوەیە ئەو ماڵە فرۆشراوە لە موڵکی کڕیارە لاتکەوتووەکەدا مابێتەوە؛ کەواتە، ئەگەر ئەو ماڵە فەوتابوو بەهۆی مردنیەوە، یاخود فرۆشرابوو و ماوەی پەشیمان بوونەوەیش نەمابوو، یا وەقف کرابوو، یا بەخشرابوو و کابرای ماڵ پێ‌بەخشراویش وەری گرتبوو، ئەوە حەقی پەشیمان بوونەوەی فرۆشیارەکە نامێنێ؛ بەڵێ، ئەگەر فرۆشرابوو و لە ماوەی حەقی پەشیمان بوونەوەدا حیجری نرایەسەر، یاخود کابرای لاتکەوتوو ئەو ماڵەی بەخشیبوو بە ئەولادی خۆی، ئەوە فرۆشیار حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە لەبەرئەوە کە کابرای لاتکەوتوو لە ماوەی حەقی پەشیمان بوونەوەدا ئەتوانێ پەشیمان ببێتەوە؛ جا لەبەر حەقی فرۆشیارەکە، ناچار ئەکرێ بۆ پەشیمان بوونەوە؛ هەروەها، ئەیشتوانێ ئەو ماڵە کە بەخشراوە بە کوڕەکەی، وەری‌بگرێتەوەو تەسلیمی فرۆشیارەکەی بکاتەوە.

ئەگەر ئەو ماڵە لەلای کابرای لاتکەوتوو عەیبدار بووبوو بە دەردێکی خوایی، پێویستە کابرای فرۆشیار یا بە عەیبەکەیەوە وەری‌بگرێتەوە، یاخود ببێ بە هاوبەشی

خاوەن قەرزەکان لە وەرگرتنی قیمەتی ئەو ماڵەدا بە نیسبەتی حەقەکەی خۆی وە ئەگەر بە تاوانی بێگانەیەك یا بە تاوانی فرۆشیارەکە خۆی عەیبدار بووبوو، ئەوە فرۆشیار ئەتوانێ وازی لێبهێنێ و بە قیمەتی ئەو ماڵە ببێ بە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان و ئەیشتوانێ فرۆشتنەکە هەڵوەشێنێتەوەو ماڵەکەی خۆی بباتەوە و ببێ بە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان لە تۆڵەی عەیبی ماڵەکەیدا بەنیسبەتی کەمبوونەوەی نرخی ئەو شتە لە بازاڕی ئەو ڕۆژەدا؛ بۆ وێنە کەسێك ئەسپێکی فرۆشت بە سێ دینار و ئەو ئەسپە لە بازاڕا چل دیناری ئەکرد و لەلای کڕیارەکە عەیبدار بوو بە دەردێکی خوایی و چاوێکی کوێر بوو و بەهۆی کوێربوونی ئەو چاوەیەوە، نیوەی نرخی بازاڕی کەمبووەوە، ئەوە فرۆشیارەکە ئەتوانێ فرۆشتنەکە هەڵوەشێنێتەوەو ببێ بە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان بۆ وەرگرتنەوەی نیوەی ئەو پارەیەی کە ئەسپەکەی پێفرۆشتووە کە ئەکاتە پانزە دینار، بەڵام کڕیاریش ئەتوانێ ئەو ئەندازەیەی کە لە قیمەتی ئەسپەکە کەمبووەتەوە ـ کە بریتییە لە بیست دینار ـ وەریبگرێتەوە لە فرۆشیارەکە و لە سوورەتێکا کە ئەسپەکە بەتاوانی بێگانەیەك عەیبدار بووبێ، لەو بێگانەیەی ئەسێنێتەوە؛ جا لەم جۆرە میسالانەدا، ڕێئەکەوێ ئەو قیمەتە کە کابرا ماڵەکەی پێفرۆشتووە لەگەڵ قیمەتی بازاڕا وەك یەك ئەبن، یا قیمەتی بازاڕ زیاتر ئەبێ لە قیمەتی کابرای فرۆشیار، یا کەمتر ئەبێ لەو قیمەتە؛ کەواتە، فرۆشیار کە تۆڵەی عەیب ئەداتەوە لەسەر نەفسی قیمەتی بازاڕ و تۆڵەی عەیبداربوون وەرئەگرێ لەسەر حیسابی ئەو قیمەتەی کە خۆی ماڵەکەی پێفرۆشتووە، جار جار، زەرەر ئەکا و جار جار، قازانج ئەکا و جار جار، سەربەسەر دەرئەچێ بۆی.

عەیبداربوونی ئەو ماڵە بە دەستی کڕیارەوە، وەك عەیبداربوونی وایە بە دەردێکی خوایی؛ جا کابرای فرۆشیار ئەتوانێ واز لە ماڵەکەی بێنێ و ببێ بە هاوبەشی خاوەن قەرزەکان بە قیمەتی ماڵەکەی و ئەیشتوانێ بەیعەکە هەڵوەشێنێتەوەو ماڵەکەی بهێنێتەوە؛ ئیتر حەقی تۆڵەی عەیبی نییە لەسەر کابرای کڕیار، چونکە ماڵەکە لە دەستی خۆیا زەرەری تووش بووە.

ئەگەر کەسێك دوو حەیوانی فرۆشت بە لاتێك و یەکێك لەو دوو حەیوانە لای لاتەکە فەوتا، ئەوە فرۆشیارەکە ئەتوانێ واز لە قیمەتی هەردوو حەیوانەکەی بهێنێ و ببێ بە

هاوبەشی خاوەن قەرزەکان و ئەیشتوانێ حەیوانە ماوەکەیان وەربگرێتەوەو بۆ قیمەتی ئەویان، ببێ بە هاوبەشی قەرزارەکان بەنیسبەتێ لە قیمەتی هەردووکیان، یەعنی ئەگەر قیمەتی فەوتاوەکە دە دینارو قیمەتی زیندووەکە پێنج دینار بوو، ئەوە کابرا ئەبێ بە شەریکی خاوەن قەرزەکان لە کاتی بەشکردنی ماڵی کابرای لاتدا بە سێیەکی ئەو قیمەتەکە هەردوو حەیوانەکەی پێ فرۆشتووە.

هەروەها ئەگەر وەختی خۆی هەندێ لە قیمەتی حەیوانەکانی وەرگرتبوو، حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە؛ مەسەلا، ئەگەر ئەو دوو حەیوانە قیمەتیان وەکوو یەك بێ‌و نیوەی قیمەتەکەیانی وەرگرتبوو، ئێستا ئەتوانێ حەیوانەکەیان کە ماوە وەریبگرێتەوە لە جیاتی نیوەی حەقەکەیان وە ئەو پارەیەش کە وەریگرتووە، لە بەرابەری فەوتاوەکەدا بێ.

بزانن! هەر زیادەیەك کە پەیدا ببێ لە ماڵە فرۆشراوەکەدا، ئەگەر «مُتَّصل» بێ پێیەوە، وەك قەڵەو بوونی حەیوان‌و گەورە بوونی‌دار، ئەوە بۆ فرۆشیارەکەیە وە ئەگەر «مُنفَصِل» بێ لێی، وەك شیرو میوە، ئەوە بۆ کڕیارەکەیە، بەو شەرتە کە لەپاش فرۆشتنەکە پەیدابووبێ‌و لەپێش گەڕانەوەیدا بۆ فرۆشیار لێی جیا بووبێتەوە؛ جا ئەگەر فرۆشراوەکە بەچکەیەکی بچکۆلەی بوو و فرۆشیارەکە قیمەتی ئەو بەچکەیەی دا بە کڕیارەکە، ئەوە لەگەڵ دایکەکەیدا ئەیباتەوە، ئەگینا هەردووکیان ئەفرۆشرێن‌و بەشە قیمەتی دایکەکە ئەدرێ بە فرۆشیارو بەشە قیمەتی بەچکەکە ئەدرێ بە کڕیار.

ئەگەر ئەو حەیوانە فرۆشراوە لە کاتی پەشیمان بوونەوەی فرۆشیارا ئاوس بوو نەك لەکاتی فرۆشتنەکەیا، یاخود لەکاتی فرۆشتنەکەیا ئاوس بوو و لەکاتی پەشیمان بوونەوەدا زابوو، ئەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە لەم دوو سوورەتەدا، پەشیمان بوونەوەی فرۆشیار لە فرۆشتنی دایکەکە، بەچکەکەشی ئەگرێتەوە.

داپۆشراویی میوە لەناو بەرگەکەیاو دەرچوونی لە بەرگەکەی، وەك داپۆشرانی بەچکەیە لە سکی دایکیاو جیابوونەوەیەتی لە دایکەکەی؛ کەواتە، ئەگەر سەمەری درەختی ناوباخ لەکاتی فرۆشتنی درەختەکەدا هەبوو ولەکاتی پەشیمان بوونەوەی فرۆشیارا باش دەرکەوتبوو، ئەوە کابرای فرۆشیار لەگەڵ ئەو باخەدا ئەو سەمەرەش وەرئەگرێتەوە، بەڵکوو وەرگرتنەوەی ئەو سەمەرە موناسبترە لە وەرگرتنەوەی بەچکەی

حەیوان، چونکە سەمەر ئەبینرێو بەچکەلە سکی حەیواندا نابینرێ، بۆیە لە شێوەیەکی نەقڵی زاناکانی مەزهەبی شافیعیدا، بڕیار وایە کە فرۆشیار هەمیشە ئەتوانێ لەگەڵ وەرگرتنەوەی باخی فرۆشراوا، سەمەرەکەیش بباتەوە.

ئەگەر یەکێ ئەرزێکی فرۆشتو قیمەتەکەی وەرنەگرت و کڕیاری لات درەختی تیادا ناشت یا خانووی تیاکردەوە و بەهۆی قەرزاریشەوە حیجری نرایەسەر، خواهبەر لە ناشتنی درەختو خانووکردنەوەکە یا پاش ئەوە، لەم سوورەتەدا، ئەگەر کڕیارەکەو خاوەن قەرزەکان رازیبوون بەوە کە درەختەکە هەڵکێشنو خانووەکە بڕووخێننو فرۆشیار ئەرزەکە بەڕووتی بەرێتەوە، ئەوە باشە وە ئەگەر رازی نەبوون، ئەوە ناچار ناکرێن؛ جا لەم کاتەدا، ئەبێ یا فرۆشیارەکە ئەو دارو خانووە هەڵبگرێ بەقیمەت و لەگەڵ ئەرزەکەدا هەموویان بباتەوە، یا دارەکان هەڵکێشێو خانووەکە بڕووخێنێو عەینی دارو بەردو ئەجزاکان بداتەوە بە کڕیارە لاتەکە لەگەڵ تۆڵەی کەمبوونەوەی قیمەتی ئەو دارو خانووەدا؛ فەرموودەی دیاریتر، ئەوەیەکە فرۆشیار حەقی نییە ئەرزە کە بەرێتەوە بۆ خۆیو دارو خانووەکە بهێڵێتەوە بۆ کڕیارە لاتەکە، چونکە ئەو دارو خانووە بە بێموڵکییەتی ئەرزەکە قیمەتێکی وایان نییەو ئەم کردەوەیە ئەبێ بەهۆی زیان پێگەیشتنی خاوەن قەرزەکان و کڕیارە لاتکەوتووەکە.

ئەگەر ئەو ماڵەی کە فرۆشراوە بە کابرای لاتکەوتوو، دانەوێڵەیەك بوو وەك گەنم و ئەویش تێکەڵی کردبوو بە گەنمێکی وەك ئەو گەنمە یا خراپتر لەوە، ئەوە فرۆشیار ئەتوانێ ئەندازەی گەنمەکەی خۆی لەو کۆگا گەنمە هەڵبگرێتەوە وە ئەگەر تێکەڵی گەنمێکی چاکتری کردبوو، ناتوانێ، بەڵکوو پێویستە لەگەڵ خاوەن قەرزەکانا ببێ بە هاوبەش بەنیسبەتی بەشی خۆی.

ئەگەر کڕیارەکە ئەو گەنمەی هاڕی، یا ئەو جاوەی کە کڕیبووی گازریی کرد، ئەوە ئەگەر قیمەتیان زیادی نەکردبوو، فرۆشیارەکە ئەتوانێ ئەو ئاردە یا ئەو خامە گازری کراوە وەربگرێتەوەو کابرای کڕیاری لاتکەوتوو، هیچی ناکەوێ وە ئەگەر قیمەتی ئاردەکە یا خامە گازری کراوەکە زیاتر بوو، ئەوە فەرموودەی دیاریتر، ئەوەیە ئەفرۆشرێنو کابرای لاتکەوتوو بەشدار ئەبێ لە قیمەتەکەدا بەنیسبەتی ئەو زیادەیەکە

بە هاڕینی گەنمەکەو بەگازری کردنی خامەکە پەیدا بووە؛ بۆ وێنە، ئەگەر گەنمەکە بایی چوار دینار بوو و بە هاڕینی بوو بە بایی پێنج دینار، ئەوەکابرای لاتکەوتوو پێنج یەکی قیمەتەکەی ئەکەوێ.

وە ئەگەر کڕیارەکە جلە کڕاوەکەی ڕەنگ کردبوو بە ڕەنگی خۆی، ئەگەر قیمەتی جلەکە ئەوەندەی ڕەنگەکە زیادی کردبوو، کابرای فرۆشیار جلەکە ئەباتەوە بە ڕەنگ کراوی و کابرای لاتکەوتوویش هاوبەشیەتی بە ئەندازەی ڕەنگەکە؛ جا ئەگەر فرۆشیارەکە پارەی ڕەنگەکەی پێدا، ئەوە باشە، ئەگینا پێویستە ئەو جلە بفرۆشرێو قیمەتی جلەکە بدرێ بە فرۆشیارەکە وە ئەگەر زیادبوونی قیمەتی جلە ڕەنگ کراوەکە کەمتر بوو لە قیمەتی ڕەنگەکە، ئەوە ئەو ناتەواوییە هەر لەسەر قیمەتی ڕەنگەکەیەو زەرەر لە کابرای لاتکەوتوو ئەکەوێ وە ئەگەر قیمەتی جلە ڕەنگکراوەکە زیاتر لە قیمەتی ڕەنگەکە زیادی کرد، ئەوە ئەو زیادەیە هەمووی ئەگا بەکڕیارەکە وە ئەگەر کڕیار جلەکەو ڕەنگەکەشی لەو فرۆشیارە کڕیبوو، فرۆشیار هەردووکیان ئەباتەوە، مەگەر قیمەتی جلە ڕەنگکراوەکە ئەوەندەی قیمەتی نەفسی جلەکە بێ، ئەوە لەم کاتەدا، فرۆشیار جلەکە بە ڕەنگکراوی ئەباتەوەو ئەبێ بە هاوبەشی خاوەن قەرزەکانیش بەنیسبەتی قیمەتی ئەو ڕەنگە کە دابووی بە کابرای لاتکەوتوو وە ئەگەر کڕیارەکە، هەرکامی لە جلو لە ڕەنگەکە، لە یەکێکی جیا کڕیبوو، ئەوە ئەگەر قیمەتی جلەکە بە ڕەنگەکەوە زیاتر نەبوو لە قیمەتی جلەکە خۆی بەتەنها، ئەوە لەم سوورەتەدا، ئەو خاوەن ڕەنگە، ڕەنگەکەی لەدەس دەرچووەو ئەبێ بە هاوبەشی خاوەنقەرزەکان بۆ قیمەتی ڕەنگەکە وە ئەگەر قیمەتی جلەکە بە ئەندازەی قیمەتی ڕەنگەکە زیادی کردبوو، ئەوە خاوەنی جلەکەو خاوەنی ڕەنگەکە، هەردووکیان، ئەبن بە هاوبەشی یەك لە وەرگرتنەوەی ماڵی خۆیاندا، یەعنی قیمەتی جلەکە بۆ خاوەن جلەکەیەو قیمەتی ڕەنگەکە بۆ خاوەن ڕەنگەکەیە وە ئەگەر قیمەتی جلە ڕەنگ کراوەکە زیادی کرد لەسەر قیمەتی جلەکەو ڕەنگەکە، ئەوە ڕاستتر ئەوەیە کە کڕیارە لاتکەوتووەکە ئەبێ بە هاوبەشیان لە ئەندازەی ئەو زیادەیەدا و ئەبێ ئەو زیادەیەی بۆ بگێڕنەوە.

## باسی نەهێشتنی تەسەڕوفکردنی کەسێك لە ماڵی خۆیدا (حِجْر)

نەهێشتنی تەسەڕوف کردنی کەسێك لە ماڵی خۆیدا، یا لەبەر پاراستنی قازانجی کەسێکی تره، وەك ئەوە کە نەهێڵرێ کەسێکی لاتکەوتوو ماڵی خۆی سەرف بکا بۆ ئەوەی قازانجی خاوەنی قەرزەکان نەفەوتێ و وەك ئەوە کە نەهێڵرێ نەخۆش زیاتر لە سێ یەکی ماڵی خۆی سەرف بکا بۆ ئەوەی قازانجی میراتگرەکان نەفەوتێ، یا لەبەر پاراستنی قازانجی ئەوکەسە خۆیەتی، وەك ئەوە کە نەهێڵرێ شێتو مندالو نەفام، تەسەڕوف لە ماڵی خۆیانا بکەن، چونکە چاكو خراپی خۆیان نازانن؛ ئێمە، لێرەدا، باسی ئەمجۆرە ئەکەین بەدرێژی.

شێت، تا چاك ئەبێتەوە لە شێتییەکەی، مەنعی هەموو جۆرە تەسەڕوفێکی لێ ئەکرێ و موعامەلەو قسەی ئیعتیباری نییە، چ بۆ ژنهێنانو چ بۆ فرۆشتن یا بە کرێدان یا بەخشینی ماڵ؛ هەروەها، منداڵی نابالغیش قسەی ئیعتیباری نییە مەگەر بۆ هێنانی دیارییەك کە کەسێك ناردبێتی پیایدا، یا بۆ رێگادانی هاتنەژوورەوەی کەسێك کە تەقەی دابێ لە دەرگا، یا بۆ بانگ کردنی کەسێك بۆسەر دەعوەت و ئەم جۆرە بێ ئیعتبارییەی قسەی، ئەمێنێ تا گەورە ئەبێو بالغ ئەبێ، بەو شەرتە لە کاتی بالغ بوونەکەیدا فامیدە بێ. بالغبوونی کوڕوکچ، بەوە ئەبێ کە پانزە ساڵی دوانزە مانگی تەواو بکەن یا مەنی لە زەکەری کوڕو فەرجی کچەوە دەرچێ؛ لای کەمی عومرێك کە رێی تێبچێ مەنی تیا دەربچێ لە کوڕو کچەوە، نۆ ساڵانە؛ هەروەها، کچ بالغ ئەبێ بەوە کە حەیزی پیابێت یا سکی پڕ ببێ.

سەوزبوونی مووی زبری بەر، ئەبێ بە نیشانە بۆ بالغبوونی منداڵی کافر نەك موسوڵمان، چونکە ئیسپاتکردنی بالغبوونی منداڵی موسوڵمان بە ساڵ، ئاسانە؛ بەڵێ، منداڵێ کە باوكو کەسو کارو عەشرەتی دیار نەبنو نەزانرێ کەی لەدایك بووە، بالغبوونی ئەویش ئیسپات ئەبێ بە دەرچوونی مووی زبری بەرو مووی زبری ریشو سمێڵ.

فامیدەیی (رُشد)، بریتییە لەوە کە ئەو کەسە لەکاتی باڵغ بوونیا مەسڵەحەتی دین‌و دنیای خۆی بزانێ، واتە کردەوەی حەرام‌و نارەوای وای لێنەوشێتەوە کە عەدالەتی پێبفەوتێ، یەعنی هیچ گوناهێکی گەورە نەکا و دەوامیش نەکا لەسەر گوناهی بچووك، بە جۆرێك کە فەرمانبەرداری کردنی خوای، زاڵ نەبێ بەسەر گوناهکردنیا، بەڵام ئەگەر فەرمانبەرداری کردنی زۆرتر بێ لە گوناهکردنی، ئەوە دەوامی لەسەر گوناهی بچووك زیانی نییە؛ زانینی مەسڵەحەتی دنیایش بەوە ئەبێ کە ماڵی خۆی بە فیرۆ نەفەوتێنێ‌و لە کڕین‌و فرۆشتنا قەبوولی زەرەرێکی زۆر نەکا کە بە عادەت پەسەند نەبێ و ماڵی خۆی لە کردەوەی حەراما نەوفەوتێنێ، فەرموودەی راستتر، ئەوەیە سەرفکردنی ماڵ لە پۆشاك‌و نان‌و ئاودا، هەرچەند زیادیش بێ لە ئەندازەی پایەی ئەو کەسە، بە فەوتاندنی ماڵ نادرێتە قەڵەم؛ هەروەها، سەرفکردنی ماڵ لە خێرات‌و پیاوەتی‌دا قەیدی نییە، بەڵام قەرزی بێ‌جێگە کە ئومێدی دانەوەی نەبێ‌و بە ناچاری بێ، ئەوە ئەبێ بەهۆی نەفامی ئەو کەسەی داویەتی.

واجبە لەسەر سەرپەرشتی‌کەری مناڵ، وەك باوك‌و باپیرەو ئەو «وَصي» و «قيّم»ەی کە قازیی شەرع داینابێ، لەپێش باڵغ‌بوونی مناڵەکەدا، روشدو شوعووری تاقی بکاتەوە، ئەم روشدە، بەپێی وەزعی مناڵەکە ئەگۆڕێ؛ بۆنموونە، مناڵی بازرگان بە کڕین‌و فرۆشتن‌و سەوداکردن تاقی ئەکرێتەوە و ئاخۆ چەند خۆی رائەگرێ لە مامەڵەدا تا زیانی تووش نەبێ و کوڕی زەرعاتکار بە زەراعەت‌و مەسرەفکردن بۆ جووت‌و جووتیارو ئەسبابی جووتەکەی؛ تەجرەبەی کچیش بەوئیشانە ئەکرێ کە ژنانی ئەو وڵاتە عادەتە بیکەن، وەك درووman‌و چێشت‌لێنان‌و نان‌کردن‌و پاراستنی گۆشت‌و رۆن‌و حەیوانداری‌و ئەو جۆرە ئیشانە؛ پێویستە ئەم تاقی کردنەوەیە چەندجار دووبارە بکرێتەوە تاباش لە حاڵی ئەو کەسە شارەزا ببین‌و بزانین بەراستی فامیدەیە یا نە؟ وە ئەگەر بە سەوداو مامەڵە تاقی‌کرایەوە، ئەبێ سەرپەرشتی‌کەرەکەی عەقدی مامەڵەکە بکا، چونکە هێشتا خۆی حەقی شەرعی ئەوەی نییە.

ئەگەر مناڵەکە بە نەفامی باڵغ بوو، ئەوە بە نەفام ئەناسرێ و هەروەکوو پێش باڵغ‌بوونی، رێگای نەئەدرا تەسەڕوف لە ماڵی خۆیا بکا، لەپاش باڵغ بوونیش هەر رێی

نادرێ و ئەوکەسەی کە پێش باڵغبوونی سەرپەرشتی کاروباری کردووە، هەر ئەوکەسە سەرپەرشتی کاروباری لەوەپاشیشی ئەکا وکە ئەمکەسە نەما، قازی، یا خۆی تەسەڕوفی بۆ ئەکا یا کەسێکی بۆ دائەنێ؛ جا ئەگەر ئەم نەفامە پاش ماوەیەك گۆڕاو رووی کردە عەداڵەتو فامی پەیدا کرد، ئەو کاتە مەنعەکەی لەسەر هەڵئەگیرێ و بە ئارەزووی خۆی توانای تەسەڕوفکردنی ئەبێ.

وە ئەگەر منداڵ بە فامیدەیی باڵغ بوو، ئەوە هەر بە باڵغبوونەکەی ئەو مەنعی تەسەڕوفەی لەسەر هەڵئەگیرێ. مەبەست لە باڵغبوون بە فامیدەیی، ئەوەیە بەهۆی تەماشاکردنی وەزعو حاڵیەوە دەربکەوێ کە فامیدەیە، ئەمەش، ماوەیەکی ئەوێ پاش باڵغبوونی و تەنها بە باڵغبوونەکە دەرناکەوێ، مەگەر گەلێجار پێش باڵغبوونی تاقیکرابێتەوەو بە جۆرێك جووڵابێتەوە کە گومانی بێڕوشدیو نەفامی پێنەبرێ وە ئەگەر پاش ئەوەی بە فامیدەیی باڵغبوو، تا ماوەیەك کرداری باش بوو، ئەوجا لەو وەزعە باشە لایداو لەبارەی ئایین پەرستییەوە رووی کردە کزیو دەسی کرد بە گوناهکردن، بەڵام مامەڵەی دنیایی باش بوو، ئەوە بەهۆی ئەو فاسق بوونەوەیەوە مەنعی تەسەڕوفکردنی لە ماڵی خۆیدا لێناکرێ، چونکە ئیمامانی پێشووی ئیسلام مەنعی تەسەڕوفی ئەم جۆرەکەسانەیان نەکردووە و رێگای سەوداو مامەڵەیان داون؛ بەڵێ، بە ئەسڵی مەزهەبی شافیعی، دروست نییە ژن مارە ببڕێ، یەعنی ویلایەتی عەقدی نیکاحی لێئەسەنرێتەوە وە ئەگەر کچەکە وەلیئەمرێکی تری هەبوو، ئەو مارەی ئەکا، ئەگینا قازی مارەی ئەکا وە ئەگەر گۆڕانی وەزعی لەبارەی فامیدەییەوە، بەهۆی ماڵ بەفیڕۆدانو سەرفی حەرامو مامەڵە نەزانینەوە بوو، ئەوە واجبە قازی مەنعی تەسەڕوفی لێبکا لە ماڵی خۆیدا، چونکە ئەم مەسەلەیە وەك فاسق بوون نییە کە زیانێکی شەخسی هەبێ؛ جا کە قازی مەنعی تەسەڕوفی لێکردو حیجری نایەسەر، ئیتر ناتوانێ تەسەڕوف لەو ماڵەیدا بکا و نابێ بکڕێو بفرۆشێو ژن مارە ببڕێ بە بێئیزنی وەلی ئەمرەکەی، یا ئەبێ ئەو وەلی ئەمرە خۆی ئەم ئیشانەی بۆ بکا وە ئەگەر سەربەخۆ شتێکی کڕی یا شتێکی فرۆشت، ئەوە مامەڵەکەی بەتاڵە وە ئەگەر پارەی ماڵەکەی

وەرگرت و لەدەستیا فەوتا یاخود فەوتاندی، ئەوە ئەو نابێ بە زامن، نە ئێستەو نە لەپاش ئەوەش کە حیجری لەسەر هەڵبگیرێ، خواه ئەو کەسەی کە مامەڵەکەی لەگەڵ کردووە شارەزای حاڵی بێ یا نە؛ هەروەها، ئەگەر ئینسانی نەفام دانبنێ بە قەرزێکا کە لەپێش حیجر لەسەر دانانی یا لەپاش ئەوە کردبێتی، ئەو دانپیانانەی دانامەزرێ؛ هەروەها، ئەگەر پێ لەوە بنێ کە ماڵی کەسێکی فەوتاندووە، ئەو پێ‌لێنانەشی دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر ئیقراری کرد کە حەددێك یا قیساسێکی لەسەرە، یا ژنی تەڵاق داوە، یا خولعی کردووە، یا زیهاری کردووە، یا نەفیی نەسەبی کردووە، ئەوانە هەموو دائەمەزرێن. لەبارەی عیبادەتەوە، حوکمی ئینسانی نەفام، وەك حوکمی ئینسانی فامیدە وایە، بەڵام ناتوانێ خۆی زەکاتی ماڵی دابەش بکا بەسەر موستەحەقاندا و هەر کاتێ کە ئیحرامی بەست بۆ حەجی فەرز، ئەبێ وەلی‌ئەمرەکەی مەسرەفی حەجەکەی بۆ بداتە دەس کەسێکی ئەمین بۆی خەرج بکا وە ئەگەر ئیحرامی بۆ حەجی سوننەت دابەستو مەسرەفی رێگەی لە مەسرەفی ماڵی زۆرتر بوو، ئەوە وەلی‌ئەمرەکەی ئەتوانێ رێگای ئەو حەجەی لێ‌بگرێ، لەم کاتەدا، ئەو ئینسانەنەفامە، وەك کەسێك وایە «إحصار» کرابێ، یەعنی رێگای نەبێ بچێ حەج بکا؛ کەواتە، ئەبێ ئیحرامەکەی بەتاڵبکاتەوە و مادام بۆ ئەم حەج بەتاڵ‌کردنەوەیە حەیوانێکی خۆڕایی دەس‌نەکەوێ کە سەری ببڕێ، ئەبێ رۆژوو بگرێ بەو جۆرەی کە لەباسی حەجدا بەیانکرا، چونکە ئەمکەسە رێگای نییە ماڵ سەرف بکا، بەڵام ئەگەر کاسبییەکی ئەزانی و لەو ماوەیەدا ئەیتوانی ئەو کاسبییەی بکاو مەسرەفە زیادەکەی خۆی پەیدا بکا، ئەوە وەلی ئەمرەکەی ناتوانێ رێگای ئەو حەجەی لێ‌بگرێ.

ئەگەر ئەم شەخسە، لەپاش ئەوەی بە فامیدەیی باڵغبوو، دەسی کرد بە ماڵ بەفیڕۆ فەوتاندن و قازی گوێی نەدایەو حیجری نەنایە سەر یاخود ئەو وڵاتە قازی تیا نەبوو، ئەوە هەموو تەسەڕوفێکی دروستە؛ ئەمجۆرەنەفامانە لەشەرعا پێیان ئەوترێ نەفامی بەرەڵڵا، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەبێ حیجریان لەسەر دابنرێ، کەس گوێی نەداونەتێ.

**بزانن!** تائێستا باسمان لەو جۆرە کەسانە بوو کە حاڵی فامیدەیی و نەفامییان دیارەو ئەزانین ئاخۆ بە فامیدەیی یا بە نەفامی باڵغبوون ـوەکوو باسمان کـرد ـ بـەڵام ئـەو کەسانە کە باڵغ ئەبن و کەس گوێی نەداونەتێ و نازانین ئاخۆ لەگەڵ فامیدەیی دیـنی و دنیایی‌دا باڵغبوون ـکە ئەمە زۆر کەمو نایابە ـ یا بە پێچەوانەوە ـکە زاهیری حـاڵ لە ئەمڕۆدا وایە ـ ئەمانە، بەشەرع، موعامەلەیان دروستەو نـیکاحو تـەڵاقو هـەرجـۆرە موعامەلەیەکی‌تریان جێگەی باوەڕو ئیعتیبارە؛ شێخـی «ابـن حـجر»، ئـەفەرموێت: چونکە رێی تێ‌ئەچێ هەرچەند بە نەفامی باڵغ بووبن، بەڵام لەپاش باڵغ بوونەکەیان تۆبەیان کردبێ و پەشیمان بووبنەوە لە گوناه و فامی دینییان پەیدا کردبێتـەوە؛ ئـیمام «عزّالدین بن عبدالسّلام»، ئەفەرموێت: بۆیە مامەڵەی ئەمانە دروستە، چونکە فام تەنها بریتییە لەوە کە ئینسان مەسڵەحەتی دنیایی خۆی بفامێ و دیـنداری لە مـوعامەلەدا شەرت نییەو ئەم جۆرەکەسانەش، بەمەعنا، خاوەن روشدو فامن و مـادام وەزعـی دنیایان باشە، تەسەڕوفیان دائەمەزرێ؛ هـەندێ لە زانـایان، وەك «سـەیید عـومەری بەسەری»، ئەفەرموون: سەبەبی دامەزرانی موعامەلەی ئەمانە، تەنها ناچارییە، چونکە فاسقی، بڵاوبووەتەوە وە ئەگەر موعامەلەی فاسق دانەمەزرێ، ئیش و کار رائەوەستێ و ژیانی کۆمەڵی ئادەمیزاد ناچێتەسەر و ئیمامی شافیعی، خوێشـی فـەرموویەتی: «إِذَا ضَاقَ الأَمرُ، اِتَّسَع»، یەعنی: کاتێك کە ئیش تەنگ بوو، ئەکرێتەوە؛ هـەندێکـی‌تر لە زانایانی شەرع، ئەفەرموون: لەئەساسا، ئێمە ناتوانین‌وا بڕیار بـدەین ئـەم‌کەسانە بـە سەفیهی و نەفامی باڵغبوون، چونکە هەرکەس حیجری وەلی‌ئەمری لەسـەر نـەبوو و حاڵی نادیار بوو، ئەوە ئەسڵ لەوکەسەدا ئەوەتە فامیدە بێ و بە فامیدەیی باڵغ بووبێ؛ جا ئەگەر لەپاش باڵغبوون، دەسی کرد بە فیڕۆدانی ماڵی خۆی و حیجری نەنرایە سەرو مەنعی تەسەڕوفی لێ‌نەکرا لە ماڵی خۆیدا، ئەوە بە سەفیهی بەرەڵڵا ئەناسرێ و دووبارە موعامەلەی دروست و دامەزراوە؛ ئەمە، بەنیسبەت ئـەو مـوعامەلانەوە کـە ئـێستە ئەمانەوێ بیانکەین، بەنیسبەت ئەو مـوعامەلانەشەوە کـە زوو کـردوویانە، ئـەوە بـە بێ‌گومان، دروست بوون، چونکە ئەسڵ لە عـەقدو مـوعامەلاتا ئـەوەیە بـەڕاسـتی و

دروستی تەواو بووبێ، مادام بە دەلیلێکی قەتعی دەرنەکەوێ کە بەتاڵ بووە، دیارە ئەو دەلیلەیش دەسی ئێمە ناکەوێ.

## باسی کاربەدەست (ولي‌أمر)ی مناڵ

کاربەدەستی مناڵ، کوڕ بێ یا کچ، تا باڵغ ئەبێ بەفامیدەیی، باوکیەتی؛ ئەگەر باوکی نەبوو، باوکی باوکیەتی و بەمجۆرە تا ئەڕوا؛ ئیتر، باقی ماندەی (عَصَبات) نابن بە وەلی‌ئەمری ماڵ، هەرچەند ئەبن بە وەلی‌ئەمری نیکاح؛

بەڵێ، ئەگەر باوك و باپیرە نەبوون یاخود دووربوون، ئەو عەسەبەی عادڵ، وەك براو مام، ئەتوانن سەرفی ماڵی ئەو منداڵە بکەن بۆ نەفەقەو تەمێ‌و پەروەردەکردنی ئەو مناڵە، هەرچەند ئەو وڵاتە قازیشی تیابێ، بەو شەرتە کە ترسمان ببێ لە جەوری قازی؛ بەڵکوو لەم کاتا، دروستە یاخود واجبە لەسەر پیاوچاکانی وڵات ـ هەرچەند خزمیش نەبن ـ هەموو تەسەڕوفێکی بەکەڵك بکەن لە ماڵی ئەو مناڵەدا، بەورەنگە هەموو بە کۆمەڵ گردبینەوە ئیشەکەی بۆ بکەن، یاخود پیاوێکی باش هەڵبژێرن‌و ئیشی ئەو منداڵە بدەنە دەستی، هەتا ئەگەر ئەو کابرا داوای کرێی ئەکرد، پێویستە کرێی بدرێتێ، وەکوو لە کتێبی «المَجموع»ی ئیمامی «نَـوَوي»یەوە دەرئەکەوێ؛ زانای گەورە، «ابنُ الصّلاح»، فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك هەتیوێکی بێگانەی لەلابوو کە ئەگەر ئەو هەتیوە بداتە دەستی قازی، تووشی زیان ببێ، ئەوە بۆی دروستە خۆی سەربەخۆ تەسەڕوف بکا لە ماڵی ئەو منداڵەداو بەخێوی بکاو چی پێویستە بۆ پەروەردەکردن و تەمێ‌کردنی، سەرفی بکا؛ هەر کەس، بۆی دروستە تەقلیدی ئەم فەرموودەیە بکا بۆخۆی، لەبەر مەسڵەحەتی موسوڵمانان.

فەرموودەی راستتر، ئەوەیە دایکی مناڵ نابێ بە کاربەدەستی مناڵ، بەڵام فەرموودەیەکی ئیمام هەیە، ئەڵێ: ئەگەر مناڵەکە باوك‌و باپیری نەبوو، دایکی حەقی هەیە کاروباری بگرێتە دەست و ببێ بە وەلی‌ئەمری ماڵی ئەو منداڵە و پێش‌ئەخرێ لەسەر وەسیی باوك‌و باپیرە، بەو شەرتە کە ئەمین بێ؛ کەواتە، بە تەقلید کردنی ئەم

فەرموودەیە، دروستە بۆ دایکی منداڵ تەسەڕوف بکا لە ماڵی ئەو منداڵەدا بەپێی مەسڵەحەت و نانو بەرگو پێویستی بۆ جێبەجێ بکاو لەکاتی ناچاریدا، قەرزی بۆ بکا زەکاتی بۆ وەربگرێو زەکاتی ماڵی دەربکا.

شەرتی ویلایەتی باوكو باپیرەو وەسی و قەیم، ئەوەیە ئازادو موسوڵمان و عادڵ بن. ئەگەر وەلی‌ئەمری عادڵ فیسقی بەسەراهات، ویلایەتەکەی ئەفەوتێ وە ئەگەر تەوبەی کرد، بۆی ئەگەڕێتەوە. هەندێ لە ئیمامەکان فەرموویانە لە زەمانێکا فیسق بڵاو بووبێتەوە بە وڵاتداو ناچار بین بۆ ئەوە ئینسانی فاسق بکەین بە وەلی ئەمر، لەوکاتەدا، دروستە باوكو باپیرەی فاسق ببن بە وەلی‌ئەمری منداڵ وە ئەگەر ئەوان نەبوون، دروستە نەفەقەی منداڵ بدرێتە دەستی دایکی منداڵ با فاسقیش بێ بەهۆی تەرکی نوێژەوە، بەو شەرتەکە ئەمین بێ لەسەر ماڵی منداڵەکە. ئەگەر منداڵەکە باوكو باپیری نەبوو، کاروباری ئەدرێتە دەست ئەو وەسییەی لەلایەنی ئەوانەوە دانرابێ وە ئەگەر وەسی نەبوو، کاروباری ئەدرێتە دەستی قازی. واجبە لەسەر ئەو کەسەی کاروباری منداڵی ئەدرێتە دەست، بەهەرجۆرێك کە قازانجی منداڵەکانی تیابێ، تەسەڕوف بکا لە ماڵی ئەو منداڵانەدا و ماڵەکەیان بپارێزێ لە ئافەت، ئەوەندەی لەتوانایا بێ و تێبکۆشێ بۆ زیادبوونی ماڵەکەیان بەقەدەر ئەوەندەی کە پێویست بێ بۆ مەسەرەفو نەفەقەیان وە ئەگەر خانوویەکیان هەبوو نزیك بوو بڕووخێ یا باخێکیان بوو خەریك بوو وێران ببێ، واجبە هەوڵ بدا بۆ ئاوەدان کردنەوەیان وە ئەگەر بە دەسەنقەست گوێی نەدایە تا ماڵەکە رووخا یا باخەکە وشك بوو، ئەوە ئەبێ بە زامنی ئەو باخو خانووە و واجبە هەر کڕینو فرۆشتنێك لە ماڵی ئەو منداڵانەدا ئەیکا، بەپێی مەسڵەحەت بێ؛ کەواتە، دروستە بەپێی مەسڵەحەت ماڵی منداڵەکان بفرۆشێ بە نەختو بە کەلوپەل و بیدا بە قەرز بەو شەرتە کە ماڵکڕەکە دەوڵەمەند بێو عادڵو ئەمین بێ و ئەبێ شاهید بگرێ ئەگەر ماڵی ئەو منداڵانەی دا بە قەرز و ڕەهنیش وەربگرێ لەجیاتی ئەو قەرزە؛ بەڵام ئەگەر وەختو وەزع وابوو ناچاربوو ماڵی ئەو منداڵانە بدا بە قەرز؛ مەسەلا، وەختەکە وەختی تاڵانو ئاشووب بوو، ئەوە ڕەهن وەرگرتن پێویست ناکا، وەك دروستە لەبەر ناچاری بە کەمتر

لە قیمەتی عادەتی ماڵیان بفرۆشێ و هەندێ لە ماڵەکەیان بدا بە زۆرداریێك بۆ پاراستنی ئەوی تری و بۆی دروستە ماڵی ئەو منالانە لەگەڵ ماڵی خۆیا تێکەڵ بکاو پێکەوە لێی بخۆن و جلی لێ بکەن و دروستە بۆ ئەو کەسەی کاروباری منالەکانی بەدەستەوەیە، میوانداری بکا لەسەر ئەوماڵە کە تێکەڵی ماڵی منالەکان کراوە، بەو شەرتە منالەکان حەقی خۆیان دەسگیر ببێ؛ هەروەها، دروستە ماڵی سێ چوار هەتیو تێکەڵ بکا، هەرچەند هەندێکیان زیاتر بخۆن لە هەندێکی تریان، ئەگەر زەحمەت بێ بەشی هەر کامیان جیا بکرێتەوە لە بەشی ئەویان. هەروەها دروستە باوکی منداڵ هەندێ لە ماڵی ئەو منالە بکڕێ بۆ خۆی بەقەرزو رەهنیش دانەنێ و لەمسوورەتەدا خۆی بەتەنها هەردوو سەری عەقدەکە جێبەجێ ئەکا وکاتێ کەکەوتە فرۆشتنی ماڵی منداڵ، لەپێشا ئەو ماڵەی بفرۆشێ کە قازانج لە فرۆشتنیایە و تا ناچار نەبێ، ئەوەیان نەفرۆشێ کە قازانج لە مانەوەیدایە، وەك دووکانو خانوو ئاوو زەوی و کە ناچاری فرۆشتنی ئەوانەش بوو، تا پێی بکرێ، بەجارێك نەیانفرۆشێ؛ مەسەلا، ئەگەر پێویستی منداڵەکە بە فرۆشتنی ئەندازەیەك لە ماڵەکەی جێبەجێ ئەبوو، دروست نییە لەوە زیاتری لێ بفرۆشێ، چونکە زەرەری هەیە بۆ پاشەڕۆژی منالەکە؛ هەروەها، بەپێی مەسڵەحەت، ئەتوانێ موڵکی بۆ وەربگرێ بە شوفعە، یا دەس لە شوفعە هەڵبگرێ و پێویستە زەکاتی ماڵی دەربکا و ئەبێ هەر مەسرەفێکی بۆ بکا، لەعادەت دەرنەچێ و بە پێی توانای خۆی درێغی نەکا لە هەوڵدانا بۆ رابواردنی ئەو منالە بەخۆشی. ئەتوانێ خۆیشی کرێی زەحمەتی خۆی لە ماڵی ئەو منالە وەربگرێ وە ئەگەر خۆی ئیشی پێ نەئەکرا، واجبە لەسەری رەنجبەرێکی بۆ بگرێ و ئەوکەسەی مامەڵە بۆ ئەو منالە ئەکاو خزمەتی ئەکا، ئەگەر داوای کرێی ئەکرد، بە ئەندازەی عادەتی، کرێی بداتێ. جاکە منالەکە باڵغ بوو، ئەگەر ئیددیعای جەورو ستەمی کرد لە تەسەڕوفی وەلیئەمرەکەیدا، تەماشا ئەکەین، ئەگەر ئەو وەلیئەمرە باوك یا باپیرە یا قازییەکی دادپەروەرو ئەمین بوو، سوێند ئەدرێنو باوەڕ بە قسەیان ئەکرێ و ئەگەر وەسی یا قەیم بوو، ئەوە مادام شاهیدیان نەبوو کە تەسەڕوفیان شەرعی بووە، منالەکە سوێند ئەدرێو باوەڕی پێ ئەکرێ.

## باسی ڕێك كەوتن (صُلْح)

ڕێك كەوتن، چەند جۆری هەیە؛ ڕێك كەوتنی بەینی موسوڵمانانو كافران و ڕێك كەوتنی بەینی گەورەی موسوڵمانانو ئەو كەسانە كە لە فەرمانی دەرئەچن و ڕێك كەوتنی بەینی ژن و مێرد و ڕێك كەوتنی دووكەس لە قەرزو موعامەلەدا؛ ئێمە، لێرەدا، مەبەستمان لەمجۆرەی دواییە.

ئەمجۆرە ڕێك كەوتنە، دووبەشە: ڕێك كەوتنی بەینی «مُـدَّعي و مـدّعیٰ علیه» و ڕێك كەوتنی بەینی موددەعی و كابرایەكی بێگانە؛ بەشی یەكەم، سوڵحە لەسەر ئەساسی ئەوە كە «مُدّعیٰ علیه» دان بنێ بە حەقی موددەعییەكەدا، یاخود موددەعی بە شاهید ئیسپاتی حەقەكەی خۆی بكا؛ جا ئەگەر ئەو سوڵحە كرا لەسەر عەینێك كە غەیری ئەو عەینە بێ كە كابرای موددەعی داوای ئەكا؛ مەسەلا، ئەو داوای خانوویەكی كرد لای قازی یالەلای كەسێك كە كردبێتیان بە حەكەم، ئەمیش وتی: ڕاستە ئەو خانووەم بەدەستەوەیەو ماڵی تۆیە، بەڵام تۆ لەگەڵم ڕێك بكەوەو خانووەكەم بدەرێ بەو دووكانە یا بەو سەد دینارە و موددەعییەكەش قەناعەتی كرد و سیغە لەبەینیانا جاری بوو، مەسەلا، موددەعی وتی: وا لەگەڵت ڕێك كەوتمو سوڵحم لەگەڵ كردی بە سەد دینار لەجیاتی خانووەكەم، «مُدّعیٰ علیه»یەكەیش وتی: وا قەبووڵم كرد، ئەوە فرۆشتنە بە لەفزی سوڵح و هەرچی حوكمی بەیعە لێرەدا جاری ئەبێ، وەك چاوپێ كەوتنی خانووەكەو حەقی پەشیمان بوونەوە لە مەجلیسی موعامەلەكەداو حەقی پەشیمان بوونەوە بەشەرت گرتنو دانەدواوە بەهۆی عەیبەوەو حەقی شوفعە و دروست نییە تا موددەعییەكە ئەو ماڵەوەرنەگرێ، تەسەڕوفی تیا بكا وە ئەگەر هەردوو ماڵەكە هاوعیللەت بوون لە سوود (رِبا)دا، ئەبێ هەردوو كابراكە لە هەمان مەجلیسدا حەقی خۆیان وەرگرن وە ئەگەر هاوجۆریش بوون، ئەبێ ئەوەندەی یەك بن وە ئەگەر سوڵحیان كرد لەسەر قازانجی عەینێك؛ مەسەلا، كابرای «مُدّعیٰ علیه» وتی: ئەم عەینە بۆ من بێ و حەقی دانیشتن لە فڵانە خانووی منیشدا بۆ تۆ بێ تا دە ساڵ، ئەمە عەقدی بەكرێدانە بە

لەفزی سولح و حوکمی ئیجارە لەم سوڵحەدا جاری ئەبێ وە ئەگەر سوڵحەکە لەسەر بەشێکی ئەو عەینە بوو؛ مەسەلا، بڕیاریاندا نیوەی خانووەکە بۆ «مُدَّعِي» بێ و نیوەی بۆ «مدَّعیٰ‌علیه» بێ و سیغەیان بەدەما هات، ئەوە ئەم عەقدە ئەبێ بە بەخشش (هِبَة) لەلایەنی موددەعییەوە بۆ نیوەی عەینەکە بە «مدّعیٰ‌علیه»یەکە و حوکمی بەخشش لەم‌عەقدەدا دێتەجێ؛ مەسەلا، ئیجاب و قەبووڵی ئەوێ و پێویستە کابرای ماڵ پێ‌بەخشراو نیوەی ماڵەکە وەربگرێ بەئیزنی موددەعییەکە، ئەوجا ئەبێ بە ماڵی و لەپێش وەرگرتنی ئەو نیوەیە، کابرای موددەعی ئەتوانێ پەشیمان ببێتەوە؛ جا مادام بڕیارماندا ئەبێ ئەم سوڵحە لەپاش دەعوا بێتەجێ، ئەگەر هات و یەکێك راستەوخۆ وتی بە کەسێك: سوڵحم لەگەڵ بکە لە جیاتی ئەو خانووە لەسەر دووکانەکەم، ئەویش عەقدی سوڵحی لەگەڵ کرد، ئەوە بەتاڵە، چونکە لەپێشا دەعوایان لەبەینا رانەبوردووە.

ئەگەر کەسێك قەرزێکی لەسەر یەکێك هەبوو ـ غەیری ماڵی سەلەم تیاکراو ـ و ویستی سوڵح بکا لەجیاتی ئەو قەرزە بەعەینێك، وەك خانوویەك یاگەنمێك یا پارەیەك و سیغەی سوڵحیان لەسەر جاری کرد، ئەوە دروستە؛ جا ئەگەر هەردوو ماڵەکە هاوعیللەت بوون لەسووددا؛ مەسەلا، هەردووکیان خواردەمەنی بوون یا پارە بوون، ئەوە پێویستە کابرای موددەعی لە هەمان مەجلیسی سوڵحدا حەقی خۆی وەربگرێ وە ئەگەر سوڵحەکە لەسەر عەینێك نەکرا، یەعنی لەسەر شتێك نەکرا کە لەپێش چاوا بێ، بەڵکوو لەسەر قەرز بوو، یەعنی لەسەر شتێکی مەوسووفی‌وا بوو کە لەئەستۆدا بوو؛ مەسەلا، بڵێت: لە جیاتی ئەو دە دینارە کە لەسەرتە، دوو تەنەکە رۆنم بدەرێ و سیغە لەسەر ئەمە جاری بوو، ئەوە پێویستە ئەو قەرزە لە هەمان مەجلیسدا بێتە پێش‌چاو، با نەبێ بە فرۆشتنی قەرز بە قەرزی رووت؛ بەڵام بۆ وەرگرتنی عەینەکە لەپاش ئەوە کە هاتە پێش‌چاو، دوو قسە هەیە؛ راسترینیان، ئەوەیە شەرت نییە هەر لەو مەجلیسەدا وەری‌بگرێ، مادام چاوی پێ‌کەوتووە، با وەرگرتنەکەشی لە کاتێکی ترا بێ.

ئەگەر کەسێ سوڵحی کرد لەجیاتی قەرزێك کە لەسەر شەخسێك بوو بە نیوەی ئەو قەرزە و سیغە لەسەر ئەم ئەساسە لەبەینیانا جاری بوو، ئەوە ئەم سوڵحە ئەبێ بەوە کە

«مُدَّعي مُدَّعىٰ علیه»یەکەی لە نیوەی قەرزەکە ئازاد کردبێ و ئەم عەقدە بە لەفزی سوڵح و ئازادکردنو لابردنو بەخشین دێتەجێ؛ بەڵێ، ئەگەر سوڵحی کرد لە جیاتی قەرزی وەعدەدار بە حازر، یا بەپێچەوانەوە، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵام ئەگەر لەسوورەتی تەعجیلو زوو تەسلیم کردنی قەرزی خاوەن وەعدەدا، کابرا پارەکەی تەسلیمکردو نەیزانی ئەم سوڵحە بە تاڵە، ئەوە ئەو تەسلیمکردنە دروستەو ناتوانێ پارەکە بسێنێتەوە لە خاوەنقەرزەکە وە ئەگەر سوڵحی کرد لە جیاتی دە دیناری حازر لەسەر پێنج دیناری وەعدەدار، ئەوە کابرای قەرزار لە پێنج دینار ئازاد ئەبێ و پێنج دینارەکەی تری بە حازری لەسەر ئەمێنێتەوە وە ئەگەر سوڵحی کرد لەجیاتی پێنج دیناری حازر بە دە دیناری وەعدەدار، ئەوە بەتاڵە.

بەشی دووهەم کە سوڵحە لەسەر پێ‌لێ‌نەنانی ئەو حەقەی ئیددیعای ئەکرێ، ئەوە سوڵحێکی بەتاڵە، خواه لەسەر نەفسی ئەو عەینە بێ یا لەسەر بەشێکی یا لەسەر غەیری ئەو عەینە وە ئەگەر کابرا بڵێت: سوڵحم لەگەڵ بکە لەجیاتی ئەو عەینەی کە ئیددیعای ئەکەی، ئەوە نابێ بە پێ‌لێنان.

بەڵام ئەو سولحەی کە لەبەینی موددەعیو کابرایەکی بێگانەدا بێتەجێ، ئەوە ئەگەر ئەو بێگانەیە وتی: کابرای «مُدَّعىٰ علیه» کردوومی بە وەکیلی خۆی لەسوڵحدا و دان بە حەقەکەی تۆدا ئەنێ، ئەوە دروستە وە ئەگەر ئەو شەخسە سوڵحەکەی لەسەر خۆی کرد، یەعنی عەینە داواکراوەکە بۆ ئەم بێ، ئەوە لەکاتی پێ‌لێنانی «مُدَّعىٰ علیه»دا بە حەقەکە، دروستە و لەڕاستیدا، ئەبێ بەوە کە کابرای بێگانە ئەو عەینەی کڕیبێ لە خاوەنەکەی بەوقیمەتەی کە پێی ئەدا وە ئەگەر «مُدَّعىٰ علیه» ئینکاری حەقەکەی ئەکرد و ئەم بێگانەیە ئەیوت: ئەو کەسە لەم ئینکارکردنەیا بە ناحەق ئەڕوا، ئەوە وەك کڕینی ماڵی زەوتکراوە لە خاوەنەکەی، یەعنی ئەگەر ئەو بێگانەیە ئەیتوانی ئەو عەینە لە «مُدَّعىٰ علیه» بسێنێتەوە بەزۆر، ئەوە ئەم سوڵحە دروستە، ئەگینا دروست نییە وە ئەگەر نەڵێت: ئەو «مُدَّعىٰ علیه»یە لە ئینکارەکەیا بە ناحەق ئەجووڵێتەوە، ئەوە ئەم سوڵحە بەتاڵە.

**بزانن!** لەمزەمانەدا هەندێ لە زانایانی شەرع، سوڵح ئەکەن لە نێوانی دووکەسا کە ناکۆکییان هەیە لەسەر ماڵێك و «مُدّعیٰعلیه» دانانێ بە حەقی «مُدَّعي»یەکـەدا لەو ماڵەدا، ئەو زانایانە، ئەکەونە بەینی ئەم دووکەسەوە و کارێك ئەکەن کە «مُدّعي» دەس لە هەندێ لە ئیددیعاکەی خۆی هەڵبگرێ و «مُدّعیٰعلیه»یش بۆ بڕانەوەی ناکۆکییەکە، ئەندازەیەك پارە بدا بە «مُدَّعي» یەکە؛ ئەمە، لەم سوڵحە نییە کە باسمان کرد و ئەمەیش بەپێی شەرع دروستە، بەو شەرتە «مُدَّعي» هەندێ لە حەقەکەی خـۆی نـەزر بکـا لە «مُدَّعیٰعلیه» و «مُدّعی‌علیه»یش ئەو ماڵەی ئەیدا بە «مُدّعي» بە نەزری شەرعی، لێی نەزر بکا؛ ئەم جۆرە ئیشە، بۆ ئاشت کردنەوەی موسوڵمانان، شتێکی چاکە.

## باسی کۆبوونەوە لەسەر حوقووقی تێکەڵ

هەر ڕێگەیەك کە دەربچێ و کرابێ بە ڕێگەی هاتوچۆ بە پێکهاتنی ئەو کەسانە کە ئەو شوێنانەیان ئاوەدان کردووەتەوە ئەوەڵ جار، یا هەر بەهۆی ئەوەوە کە ئەو کەسانەی هاتوچۆ ئەکەن بە وڵاتێکا، ڕێگەیەکیان بۆ خۆیان بڕیار دابێ، ئەو ڕێگەیە تێکـەڵە لە نێوان ئەو ڕێبوارانەدا و دروست نییە هیچکەسێك تەسەڕوف بکا لەو ڕێگەیەدا یـا لە ئەملاو ئەولای ئەو ڕێگەیەدا بەجۆرێ کە زیان بگەیەنێت بەوانەی هـاتوچۆ ئـەکـەن بەویادا وە ئەگەر کەسێك دیواری ماڵی لە قەراغی ئەو جادەیەدا بـوو، دروست نـییە جەناحێك لەو دیوارەوە دەربکا بۆ هەوای ئەو ڕێگەیە بـە جـۆرێ کـە زەرەر بـدا لە ڕێبواران، بەڵکوو پێویستە ئەوەندە بەرزی دروست بکا ئەوانەی کە هاتوچۆ ئـەکـەن بەژێریا، تووشی زەحمەت نەبن وە ئەگەر جادەکە ڕێگوزەری سوارەو کاروانی بوو، پێویستە کە وڵاخی زۆر بەرز بە بارو بارگەی بەرزەوە، بە بێ‌زیان بە ئاسانی بەژێریـا گوزەر بکا.

دروست نییە نە بۆ کاربەدەستی موسوڵمانان و نە بۆ هـیچکەسی‌تر، ڕێك‌بکـەوێ لەگەڵ کەسێك بەرامبەر بە پارەیەك بۆ ئەوە کە شانشینێك لە دیواری قەراغ شەقامەوە دەربکا، چونکە ئەگەر دەرکردنی ئەو شانشینە زیانی ئەگەیاند بە موسوڵمانان، ئەوە بە

هەموو جۆرێك حەرامە وە ئەگەر زیانی نەئەگەیاند، ئەوە پارە لەسەر وەرگرتنی حەرامە. هەروەها، حەرامە کەسێك لە چەقی رێگایەکدا سەکۆیەك دروست بکا یا دارێك بنێژێ یا دایچەقێنێ. هەروەها حەرامە دەرکردنی شانشین بەسەر شوێنێکا کە وەقف کرابێ لەسەر جیهەتێکی گشتی، وەك مزگەوت و قوتابخانە و تەکیە و میوانخانەو نەخۆشخانەی گشتی؛ هەروەها، لە حەوشەی ئەمشوێنانەشدا حەرامە، لەبەر ئەوە دروست نییە لادان لەو پەیڕەوە کە بۆ ئەمانە دانراوە، مەگەر خاوەن حەقەکان رێگە بدەن، دیارە لەمجۆرەشوێنانەشدا، خاوەن حەق لە ژمارە نایەن و ئەوە کەڵکی نییە کە سەرپەرشتیکەری ئەو شوێنە وەقفکراوە رێگە بدات؛ هەروەها، کەڵکی نییە ئەگەر چینی ئێستای وەقف لەسەرکراوەکان رێگە بدەن، چونکە وەقفەکە تەنها لەسەر ئەوان نەکراوە؛ بەڵام لەشوێنێکا کە وەقف کرابێ لەسەر نەتەوەی کەسێك بەتەرتیب و بەرودوا، ئەوە بۆ چینی یەکەمیان دروستە رێگەی دەرکردنی ئەو شانشینە بدا و پاش بڕانەوەی ئەو چینەو داهاتنی چینی نوێ، ئەوان ئەتوانن ئەو کابرا ناچار بکەن کە شانشینەکەی فڕێ بدا.

هەروەها، دروست نییە بەردانەوەی ئاو بۆ سەر شەقام، یا خەوش‌وخاڵ تێ کردنی، چونکە خاوەن حەق لەم شەقامەدا زۆرن و لەژمارە نایەن و ئاگاداری کردنی قازانجی گشتیش شتێکی پێویستە. دروست نییە شانشینێك دەربکرێ بەسەر گۆڕستانێکی گشتیدا و دروست نییە خانووی تیا بکرێتەوە، خواە بزانرێ ئەو شوێنە وەقف کراوە بۆ گۆڕستان یا هەر بە عادەت‌لەویادا مردوو بنێژرێ و هەر رێگەیەك کە دەرنەچێ، وەك کۆڵانێك کە سەرێکی لەسەر شەقام بێ و ئەوسەرەکەی گیرابێ و چەند دەرگایەك لەسەر ئەو شەقامە بێ، ئەوە بەتایبەتی بۆ خاوەنی ئەو دەرگایانەیەو پەیوەندی کەسێکی تری پێوە نییە، هەرچەند دیواریشیان پاڵی‌دابێ بەوکۆڵانەوە؛ کەواتە، بۆ غەیری ئەوانەی کە دەرگایان لەسەر ئەو کۆڵانەیە، دروست نییە [و] هەروەها، تەنها بۆ هەندێك لەخۆیان، دروست نییە تەسەڕوف بە هیچ‌جۆرێك لەو کۆڵانەدا بکەن، مەگەر تێکڕای خەڵکی کۆڵانەکە، رازی بن؛ حەقی هەرکام لە دانیشتوانی ناو ئەو کۆڵانە، لە سنووری سەرەتای

شەقامەکەوەیە تا بەردەرگاکەی خۆی و لەوە بەرەوژوور، هیچ حەقێکی نییە؛ دروست نییە بۆ کەسێکی بێگانە لەو کۆڵانە دەرگایەکی بخاتەسەر بە بێڕەزامەندی تێکڕای دانیشتوانی ناوکۆڵانەکە وە ئەگەر کەسێك بە ئیجازەی ئەوان دەرگای خستە سەر ئەو کۆڵانە، ئەوان ئەتوانن پاشان پەشیمان ببنەوە؛ بەڵام دروستە کەسێکی بێگانە قاپی بخاتە سەر ئەوکۆڵانەو بە بزمار توندی بکا بۆ ئەوەی نەکرێتەوەو هاتوچۆی پیا نەکرێ، یا دەلاقەیەکی بخاتە سەر بۆ رووناکی، هەرچەند لەوانەش بێ لەو دەلاقەیەوە سەیری حەوشەی یەکێ لەو ماڵانە بکرێ کە لەسەر کۆڵانەکەن، چونکە کابرا بەم کردەوەیە تەسەروفی لە ماڵی خۆیدا کردووە، بەڵام ئەگەر پاش کردنەوەی دەلاقەکە، سەیری حەوشی ماڵێکیان لێوە کرد، ئەهلی ئەو ماڵە ئەتوانن خەبەر بە حاکمی شەرع بدەن‌و رێگەی لێبگرن وە ئەگەر حاکمی شەرع نەبوو، ئەتوانن خۆیان مەنعی بکەن.

ئەگەر یەکێك لە ئەهلی ئەو کۆڵانە، واتە ئەوانەی دەرگایان لەسەر ئەوکۆڵانەیە، ویستی دەرگای ماڵەکەی هەڵبگرێ و دەرگایەکی تر بکاتەوە، ئەگەر ئەو دەرگا تازەیە دوورتر بێ لەسەرەتای شەقامەکەوە، ئەوە دروست نییە وە ئەگەر نزیکتر بێ، دروستە، هەرچەند ببێ بەهۆی زۆربوونی قەرەباڵغ لای دەرگای دراوسێکەیەوە، وەك «ابنُ حَجَر» فەرموویەتی؛ بەڵام گەلێك لە زانایانی شەرع، فەرموویانە: لەم سوورەتەدا کە کردنەوەی ئەم دەرگایە قەرەباڵغ زۆر بکا لای دەرگای دراوسێی کابراوە، بە بێ رێگادانی ئەو دروست نییە.

دروستە بۆ کەسێك کە دەرگای خانووەکەی لەوپەری کۆڵانەوە بێ، ئەو دەرگایە بێنێتە پێشەوە بۆ نزیکی سەرکۆڵانەکە و ئەوپەری کۆڵانەکە بکا بە داڵان بۆخۆی، بەو شەرتە کە تەنها خۆی لەوپەڕەوە بێ وە ئەگەر لەوپەری ئەو کۆڵانەوە دوو دەرگا بەرانبەری یەك هەبوو، دروست نییە یەکێکیان دەرگاکەی خۆی بگوێزێتەوە بۆ ئەوپەری ئەو کۆڵانە، چونکە ئەوپەری ئەو کۆڵانە هاوبەشییە لەنێوانی هەردووکیاناو ئەگەر یەکێکیان بڕوا بەولاوەو ماوەیەکی بەسەرا بڕوا، لەوانەیە گومان ببرێ هەرچی لەو کۆڵانە ماوەتەوە تێکەڵە لەبەینی ئەو شەخسەو کابرای بەرانبەریا، لەکاتێکا کە ئەو بەشی خۆی

بردووەو ئەوەی ماوەتەوە هی کابرای بەرانبەریەتی یا زۆرتری هی ئەوەو کەمێکی هی ئەمخۆیەتی وە ئەگەر کەسێك لەوانە کە خانوویان لە ئاخری کۆڵانەکەوەیە، دەرگای خانووەکەی ئەوەندە گەورە بوو گەیشتبووە ئەوپەڕی کۆڵانەکە، ئەوە هەرچی لەوبەرەوە ماوە، ئەبێ بە بەشی خاوەنی دەرگای بەرانبەر.

ئەگەر کەسێك دوو خانووی هەبێ کە دەرگای هەرکامیان لەسەر کۆڵانێکی جیاواز بێ و خانووەکان پشتیان دابێ بەیەکەوە، ئەوە ئەتوانێ لەبەینی ئەو دووخانووەدا دەرگایەك بکاتەوە بۆ ئەوەی لەم خانووەکەوە هاتوچۆ بکرێ بۆ ئەو خانووەکە.

**بزانن!** لەهەرشوێنێکا ئەو خەڵکە بتوانن نەهێڵن کەسێك دەرگایەکی تازە بکاتەوە، ئەتوانن لەگەڵ ئەو کەسەدا رێك کەون کە داوای دەرگای تازە ئەکات لەسەر ئەندازەیەك پارە، خواه بە سوورەتی فرۆشتن بێ یا بە سوورەتی بەکرێدان، بەو شەرتە ئەو کۆڵانە مەوقووفەیەکی گشتیی تیا نەبێ، وەك مزگەوت، ئەگینا بە شێوەی فرۆشتن دروست نییە، بەڵام بە شێوەی بەکرێدان دروستە، بەو شەرتە قازانجی ماڵە وەقف کراوەکەی تیابێ. هەروەها، دروستە سوڵح لەگەڵ ئەهلی ئەو کۆڵانەدا بکرێ بۆ دەرکردنی ئاوی پلووسكو داکردنی بەفر لەو کۆڵانەدا و دروستە بۆ کەسێك کە دیواری لەسەر کۆڵانێك بێ، دەلاقەیەك بکاتەوە بۆ هەوا وەرگرتنو رووناك کردنەوەی ناوماڵەکەی، هەرچەند خەڵکەکەی تر رازی نەبن، چونکە تەسەڕوفی لە ماڵی خۆیدا کردووە.

هەر دیوارێك لەبەینی دووخانوودا بێ، یا بە تایبەتی موڵکی یەکێك لەو دوو خاوەن خانووەیە، یا تێکەڵاوە لەنێوانیانا؛ ئەگەر موڵکی یەکێکیان بوو، ئەوە بۆ ئەویان دروست نییە تەسەڕوف بکا لەو دیوارەدا بەجۆرێك کە زیان بگەیەنێ بە خاوەنەکەی؛ کەواتە، دروست نییە داری بخاتە سەر یا بینای لەسەر بکاتەوە بە بێ‌ئەوەی خاوەنەکەی رێگای بدا و ئەو خاوەن خانووە ناچار ناکرێ بۆ ئەوەی رێگای ئەم بدا تەسەڕوف بکا لە خانووەکەیدا وە ئەگەر رێگای‌دا دار بخاتە سەری بە خۆڕایی، ئەوە وەك شتێکی بە خواستەمەنی (عارية) دابێتێ، وایە و هەر کاتێك ئارەزووی ببێ، ئەتوانێ پەشیمان بێتەوە، چ لە پێش دانانی دارەکەو چ لە پاش دانانی؛ بەڵام لەم‌کاتەدا ئەبێ یا رێگای

هێشتنەوەی دارە دانراوەکە بدا بە کرێ، یا ئەو بینایە لابەرێو زەرەری خاوەن دار و بیناکە بژێرێتەوە بۆی وە ئەگەر بەرابەر بە پارەیەك رێگای‌دا، ئەوە ئەگەر سەری دیوارەکەی پێ‌بدا بە کرێ، ئەوە عەقدی ئیجارەیە وە ئەگەر بڵێت: سەری ئەو دیوارەم پێ‌فرۆشتی بۆ ئەوەکە بینای لەسەر بکەیتەوە بە دە دینارمەسەلا، ئەوە ئەم عەقدە تێکەڵە لە فرۆشتن‌و بەکرێ‌دان؛ فرۆشتنە، چونکە عەقدێکی دەوام‌دارەو رادەی بۆ دانەنراوە و بەکرێ‌دانە، چونکە لە ئەنجاما دێتەوە سەر قازانجی دیوارەکە و هەرچەند بەکرێ‌دان بۆ هەمیشە نابێ، بەڵام ئەم‌جۆرە بەکرێ‌دانە لەبەر ناچاری دروستە بۆ هەمیشە، وەك بەکرێ‌دانی زەوی بە کەسێك بۆ هاتوچۆ و رەوان بوونی ئاوو داکردنی بەفرو مۆڵ‌دان‌و پەچەی ران‌و خەوش‌وخاڵ رشتن‌و شتی‌تری لەم چەشنە؛ جا ئەگەر کابرا خانووی لەسەر ئەو دیوارە کردەوە، ئەوە خاوەن دیوارەکە ناتوانێ خانووەکە برووخێنێ وە ئەگەر ئەو دیوارە رووخا و خاوەنەکەی تازەی کردەوە، دووبارە ئەم کابرا ئەتوانێ خانووەکەی خۆی لەسەر بکاتەوە.

هەرکاتێك خاوەنی دیوار رێگای‌دا بینا لەسەر ئەو دیوارە بکرێتەوە، چ بەخۆڕایی‌و چ بەپارە، ئەبێ ئەندازەی ئەو خانووە لە بەرزی‌و پانی‌و درێژیدا دیاری بکرێ، هەروەها بەیانی ئەوەیش بکرێ کە دیواری ئەو خانووەی بەسەریەوە ئەکرێ، دیوارێکی پڕ کراوە بێ یا دیوارێکی بۆش بێ و ئەندازەی بەرزیشی باس بکرێ و بەیانی سەرمیچەکەشی بکرێ، ئاخۆ گومەز یا بە دارو رایەڵە، چونکە دیوار هێزێکی مەحدوودی هەیە وە ئەگەر ئەو خانووەی بەسەریەوە ئەکرێتەوە بەنیسبەتی هێزەکەی ئەو نەبێ، ئەڕووخێ؛ بەڵام ئەگەر کەسێك رێگای کەسێکی دا خانوو لەزەوی ئەودا بکاتەوە، ئەوە هەر بەیانی ئەندازەی درێژی‌و پانی خانووەکە ئەکرێت، چونکە زەوی هەمووجۆرە بینایەك هەڵئەگرێ وە ئەگەر دیوارێك تێکەڵ بوو لە بەینی چەند هاوبەشێکدا، دروست نییە هیچ کام لەوانە دار بخاتە سەر ئەو دیوارە تا باقی هاوبەشەکان رێگەی نەدەن؛ هەروەها، حەقی نییە مێخی پیا داکوتێ یا دەلاقەی تیا بکاتەوە، بەڵام دروستە پاڵی پێوە بدا یا پاڵی شتێکی پێوەبدا کە زیان نەگەیەنێ بە

دیوارەکە؛ ئەمجۆرە کردەوانە، لە دیواری خەڵکیشا دروستە. ئەگەر کۆمەڵێك هاوبەش بن لە دیوارێك یا لە خانوویەکدا و ئەو دیوارە یا ئەو خانووە رووخا، کەسیان بۆی نییە زۆر لەوانی‌تر بکا کە بیکەنەوە؛ بەڵام هاوبەشی خانووی وەقف یا سەرپەرشتی‌کەری منداڵ، زۆریان لێ ئەکرێ بۆکردنەوەی، لەبەر مەسڵەحەتی ئەوکەسانەکە خانووەکەیان لەسەر وەقف کراوە یا لەبەر قازانجی مناڵەکە وە ئەگەر یەکێك لەو هاوبەشانە ویستی خانووە موشتەرەکە رووخاوەکە بکاتەوە، ئەوە ئەگەر هاوبەشەکەی رێکەوت لەگەڵیا بەیەکەوە بیکەنەوە، ئەوە باشە و لەمکاتەدا، کابرا ناتوانێ بە تەنها خۆی و بە ئەسبابی خۆی دروستی بکاتەوە وە ئەگەر بەتەنها بەئەسبابی خۆی کردیەوە، ئەوە هاوبەشەکەی ئەتوانێ ئەو خانووە بڕوخێنێ و ئەیشتوانێ وازی لێ‌بهێنێ و مەسرەفی بەشەکەی خۆی بداتەوە بەوکەسەکە بیناکەی کردووەتەوە و خانووەکە وەك ئەوسا ئەبێتەوە بە هاوبەشی لەبەینی هەردوکیانا وە ئەگەر کابرای هاوبەش کەللەڕەقی کردو نە لەگەڵ هاوبەشەکەیدا خانووەکەی کردەوەو نە رێگای‌دا ئەم بیکاتەوە، لەمسوورەتەدا ئەو هاوبەشەکە ئەتوانێ بە ئەسبابی خۆی خانووەکە بکاتەوەو هەرچی دروست کرد بەتەنها، ئەبێ بە موڵکی خۆی و هەرکاتێ کە ئارەزووی بوو، ئەتوانێ بیڕووخێنێ، لەم کاتەدا، ئەگەر هاوبەشەکەی وتی: مەیڕووخێنە من بەشە مەسرەفی خۆم ئەدەم، ئەوە ئەتوانێ بەگوێی نەکاو بیڕووخێنێ، چونکە بەئەسبابی خۆی کردوویەتیەوە وە ئەگەر خانووەکە مایەوە، ئەوە ئەو هاوبەشە لەکرێی زەوییەکە یا بنچینەی بەشە دیوارەکەی خۆی بەولاوە، هیچی ناکەوێ.

ئەگەر خانوویەکی سەرخانو ژێرخان هەبوو، سەرخانەکەی هی یەکێك و ژێرخانەکەی هی یەکێکی‌تر بوو و ئەو خانووە رووخاو خاوەنی ژێرخانەکە ژێرخانەکەی کردەوە، خاوەنی سەرخانەکەش ئەتوانێ سەرخانەکەی بکاتەوە، وەك ئەوسا وە ئەگەر خاوەنی ژێرخانەکە ژێرخانەکەی نەکردەوە، خاوەنی سەرخانەکە ناتوانێ زۆری لێ‌بکا پێی‌بکاتەوە؛ بەڵێ، لەمکاتەدا خاوەنی سەرخانەکە ئەتوانێ ژێرخانەکە بە ئەسبابی خۆی بکاتەوە هەتا بگات بە حەقی خۆی لە سەرخانەکە و

لەپاش کردنەوەش، ئەتوانیٚ ئەو ژێرخانە بڕووخێنیٚو چاوپۆشیٚ لە حەقی خۆی لە سەرخانەکە وە ئەگەر خاوەنی ژێرخانەکە وتی: مەیڕوخێنەو هەرچی مەسرەفت کردووە ئەتدەمەوە، ئەتوانیٚ گوێی نەداتیٚ و لەمسوورەتەدا، ئەگەر کابرا ژێرخانەکە نەڕووخێنیٚ کابرای خاوەنی پێشووی، ناتوانیٚ بیڕووخێنیٚ و نایشتوانیٚ بیکا بە موڵکی خۆی بە قیمەت، چونکە وەختی خۆی کەمتەرخەمی کردووە لە کردنەوەیا و حەقی هیچی نییە تەنها حەقی کرێی زەوی ژێرخانەکە نەبیٚ؛ بەڵام ئەگەر خاوەن سەرخانەکە بە بیٚ‌پرسی خاوەن ژێرخانەکە، لە خۆیەوە ئەو ژێرخانەی کردەوە، ئەوە خاوەنی ژێرخانەکە ئەتوانیٚ بیڕووخێنیٚ مادام سەرخانەکەی لەسەر نەکرابێتەوە وە ئەگەر سەرخانەکەی لەسەر کرایەوە، ئیتر ناتوانیٚ بیڕووخێنیٚ؛ بەڵیٚ، حەقی هەیە ئەو ژێرخانە وەرگریٚ بۆخۆی بەقیمەت و ئەیشتوانیٚ وازی لیٚ‌بێنیٚ بۆی و کرێی ئەرزەکە وەربگریٚ؛ ئەگەر یەکێك لە دوو هاوبەش ئەیویست بە دارو بەردی تێکەڵی هەردووکیان ئەو دیوارە یا ئەو خانووە رووخاوە بکاتەوە، ئەوە ئەو هاوبەشەکەی‌تر ئەتوانیٚ نەهێڵێت وە ئەگەر هەردووکیان بە دارو بەردی تێکەڵیان کردیانەوە، ئەوە وەك ئەوسا بە هاوبەشی ئەمێنێتەوە لەبەینیانا و دروستە یەکێك لە هاوبەشەکان رێگای ئەویان بدا بە کەرەستەی تێکەڵاوی هەردووکیان خانووەکە بکاتەوەو بەرامبەر بەم رەنجە، بەشی هاوبەشییەکەی زیاد بکا؛ مەسەلا، لەپێشا بە نیوەیی بووبیٚ و ئێستا ببیٚ بە سیٚ بەشی. ئەگەر دووکەس هەرایان بوو لەسەر دیوارێك کە لەبەینیانا بیٚ و هەرکامیان ئەیوت تەنها هی خۆیەتی، ئەوە ئەگەر هەر یەکێکیان شاهیدی هەبوو، ئەوە بۆ ئەوەیان ئەبیٚ وە ئەگەر هیچیان شاهیدی نەبوو، یاخود هەردوولایان شاهیدی هەبوو و تەعاروزیان کرد، لەم کاتەدا، تەماشا ئەکەین، ئەگەر ئەو دیوارە نووسابوو بە بینای یەکێکیانەوە بەجۆریٚ کە بزانین ئەو دیوارە لەگەڵ ئەو بینایەدا کراوەتەوە لەبەر ئەوە کە لەسووچەکانیا خشتو بەردی دیوارەکە لەگەڵ خشتو بەردی بیناکەدا چووبن بەیەکدا، یاخود گومەزێك لەسەر دیوارو بیناکە دروست کرابوو، ئەوە ئەو کەسە بە خاوەن دەست ئەناسریٚ لەبەر ئەو نیشانەکە نیشانەی خاوەن موڵکییەتیە؛ کەوابوو، سوێند ئەدریٚ لەسەر ئیددیعاکەی

و حوکم ئەدرێ کە دیوارەکە هی ئەوە وە ئەگەر هەردووکیان سوێندیان خوارد یاخود نکوولیان کرد، ئەوە ئەو دیوارە قەرار ئەدرێ بۆ هەردووکیان بە هاوبەشی.

بزانن! ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا، یەکێك لەو دووکەسە دارێکی بەسەر دیوارەکەوە بوو، ئەوە نابێ بە نیشانەی ئەوەکە خاوەن دەستە، چونکە ئەم جۆرە نیشانانە بێ‌هێزن، بەڵام ئەو دارەیش لەسەر دیوارەکە لانابرێ، هەرچەند لەئەنجاما ببێ بەماڵی ئەویان و حەقی کرێیشی نییە بۆی، چونکە وادیارە وەختی خۆی ئەو دارە بە سوورەتێکی شەرعی دانرابێ، وەك بەکرێ‌دانی هەمیشەیی یا نەزر کردن یا حەڵاڵ کردن یا شتێکی تر.

ئەگەر دووکەس هەرایان بوو لەسەر سەقفێك کە لەنێوانی سەرخانو ژێرخانێکا بێ، ئەوە ئەگەر قابیل بێ ئەو سەقفە لەپاش بینای سەرخانەکە کرابێ بەوجۆرە کە دار خرابێتە ناو دوو دیواری بەرانبەر لە خانووێکا کە وەختی خۆی تەنها خانوویەك بووبێ‌و کرابێ بە دوو خانووی سەرخانو ژێرخان بەهۆی ئەو سەقفەوە کە لەناوا دروست کراوە، ئەوە لەم کاتەدا ئەو سەقفە هاوبەشییە لەبەینی هەردوولایانا وە ئەگەر سەقفەکە لەگەڵ ژێرخانەکەدا دروست کرابێ، ئەوە ئەو سەقفە بەپێی شەرع وا لە ژێردەستی خاوەن ژێرخانەکەدا؛ کەواتە، ئەبێ ئەو سوێند بدرێ‌و حوکمی بۆ ئەدرێ.

دروستە ئینسان لەگەڵ کەسێکا رێك‌بکەوێ بەرابەر بە ئەندازەیەك پارە بۆ دەرکردنی ئاوی بەفرو باران لەسەربانی ئەو کەسەوە، بەو شەرتە رێگەیەکی تر نەبێ؛ هەروەها، بۆ رەوانەکردنی ئاوی جۆگەیەك لە ئەرزو موڵکی غەیرەوە بۆ موڵکی خۆی و ئەم سوڵحە دروستە بە لەفزی بەیع‌و سوڵح‌و ئیجارە و لەسوورەتی ئیجارەدا، چاوپۆشی ئەکرێ لەوەی کە نەزانین ئەندازەی ئەو ئاوەی کە بە جۆگەکەدا دێت چەندە، هەروەها لەوەیش کە بەئەبەدی بێ، هەرچەند ئیجارە ئەبێ ماوەیەکی تایبەتی هەبێ؛ بەڵێ، ئەوەندە هەیە پێویستە بەیانی شوێنی جۆگەو درێژی‌و پانی‌و قووڵی بکرێ وە ئەگەر ئیجارەکە بۆ ماوەیەکی تایبەتی بوو، پێویستە ناوی ماوەی ئەو وەختە ببرێ کە ئاوەکەی پێدا دێ وە ئەگەر بەلەفزی بەیع بوو، تەماشا ئەکەین، ئەگەر کابرا وتی: وا حەقی ئاوبردنم

پێفرۆشتی، کڕیار نابێ بە خاوەنی ئەرزی جۆگەکە و تەنها حەقی ئاوبردنی هەیە وە ئەگەر بڵێ: واشوێنی رەوانبوونی ئاوەکەم پێفرۆشتی، ئەوە کڕیار ئەبێ بەخاوەنی ئەرزی جۆگەکە و لەمکاتەدا، پێویستە باسی قووڵیو پانیو درێژیی جۆگەکە بکرێ وە ئەگەر ویستی لەگەڵی رێك کەوێ لەسەر ئاودانی باخی خۆی بە ئاوی ئەو، لەمکاتەدا پێویستە بەشێك لە جۆگەکەی لێ بکڕێ، جا ئاوەکەیش بەهۆی ئەوەوە ئەبێ بە موڵکی وە ئەگەر ئاوەکە بەتەنها بکڕێ، بێسوودە، لەبەرئەوە کە ئەو ئەندازەیەی کە حازرەو هەیە لەو جۆگەیەدا، ئەفرۆشرێ؛ ئیتر نابێ بە خاوەنی باقی ئاوەکە.

ئەگەر لقی داری دراوسێ یا ریشەی دارەکەی هات بۆ سەر زەوی باخی ئەم، بەجۆرێك کە زەرەری لێبدا، ئەوە بۆی دروستە ناچاری بکا لەسەر لادان یا بڕینی ئەو لقەدارە یا ئەو ریشەیە؛ ئەگەر ئەوکەسە گوێی نەدایە، ئەتوانێ شکات بەرێتە لای قازی وە ئەگەر قازی نەبوو، ئەوە بۆخۆی دروستە ئەو لقەدارە یا ئەو ریشەیە ببڕێ بۆ ئەوەی زیانی لێنەکەوێ.

## باسی حەواڵە

حەواڵە، بریتییە لە عەقدێك کە ببێ بەهۆی لادانی حەقێك لەئەستۆی کەسێکا بۆ ئەستۆی کەسێکی تر؛ حەواڵە، پێویستی بە حەوت شت هەیە: حەواڵەکەر، حەواڵەکراو، حەواڵە بۆ سەرکراو، قەرزی حەواڵەکەر لەسەر ئەوکەسەی حەواڵەکەی کراوەتەسەر، قەرزی حەواڵەکراو لەسەر حەواڵەکەرەکە، سیغەی ئیجابو قەبوول، مەسەلا، حەواڵەکەرەکە، بڵێ بە حەواڵەکراوەکە: وا حەواڵەم کردی بۆسەر فلانکەس بۆ وەرگرتنی ئەو حەقەی کەهەتە بەسەر منەوە لەوکەسە و ئەویش، بڵێ: وا قەبووڵم کرد.

بۆ دامەزرانی حەواڵە، پێویستە کابرای حەواڵەکەر و حەواڵەکراو رازی بن؛ ئیتر رەزامەندیی حەواڵە بۆسەرکراوەکە پێویست نییە؛ هەروەها، پێویستە هەردوو قەرزەکە، یەعنی قەرزی کابرای حەواڵەکراو لەسەر حەواڵەکەرەکە و قەرزی کابرای حەواڵەکەر لەسەر کابرا حەواڵە بۆ سەرکراوەکە، سابت بن؛ کەواتە، دروست نییە حەواڵە بۆسەر کەسێ کە قەرزی لەسەر نەبێ و دروستە حەواڵەکردنی قەرزێك کە ئێستە لازم بێ یا

لەمەوپاش لازم بێ، وەك حەقی ماڵی کڕاو لەماوەی حەقی پەشیمان بوونەوەدا؛ هەروەها، دروستە حەواڵە لەسەر قەرزێك کە لەمەولا لازم بێ، خواه وێنەدار (مِثل)ی بێ، وەك ئەوەی بەکێشانەو پێوانەو پێوان ئەندازەی دەرئەکەوێ، وەك گەنمو رۆنو پارەی نەخت، یا تەماشای نرخی بکرێ «متقوِّم» بێ، وەك حەیوانات؛ کەواتە، حەواڵە کردنی قیمەتی ماڵی فرۆشراو لەماوەی پەشیمان بوونەوەدا دروستە؛ هەروەها، حەواڵەکردن بۆسەر قیمەتی ئەو ماڵە فرۆشراوەش دروستە لەو ماوەیەدا و لەمسوورەتەدا، ئەگەر ماڵ کڕەکە موعامەلەکەی بردەسەرو پەشیمان نەبووەوە، ئەوە حەواڵە بۆسەرکراوەکە، پارەکە ئەداو حەواڵە کە بە دروست دەرئەچێ وە ئەگەر پەشیمان بووەوە، حەواڵە کە بەتاڵ ئەبێتەوە.

شەرتە حەواڵەکەرو حەواڵەکراو ئەندازەی ئەو حەقە بزانن کە حەواڵە ئەکرێ لەگەڵ ئەندازەی ئەو حەقەدا کە حەواڵەی کراوەتەسەر؛ هەروەها، ئەبێ سیفەتی ئەو حەقانەیش بزانن، ئاخۆ حازرن یا وەعدەدارن، ئاڵتوونن یا زیون و شەرتە هەردوو حەقەکە بەقەدەر یەك بن لە جینسو لە ئەندازەو سیفەتا و لەحازریو وەعدەداریدا؛ کەواتە، حەواڵەی زیو بۆ سەر ئاڵتوونو پێچەوانەی ئەمە، بەتاڵن؛ هەروەها حەواڵەی نۆ درهەم بۆسەر دە درهەم، بەتاڵە، مەگەر بڵێت: حەواڵەم کرد بۆ نۆ درهەم لەو دە درەمە و قەرزێك کە وادەی هاتبێ حەواڵە ناکرێ بۆسەر قەرزێك کە هێشتا وادەی نەهاتبێ.

بەهۆی حەواڵەوە، حەواڵەکەر لە قەرزی حەواڵەکراو و حەواڵە لەسەرکراو لە قەرزی حەواڵەکەر رزگار ئەبن و حەقی حەواڵەکراوە کە نەقڵ ئەبێ بۆ ئەستۆی حەواڵە لەسەرکراوەکە؛ جا ئەگەر قابیل نەبوو کابرای حەواڵەکراو حەقەکەی وەربگرێ لە کابرای حەواڵە لەسەرکراو، خواه لەبەر لاتی یا لەبەر مانیعێکی تر، وەکوو مردن، ئەوە حەواڵەکراوە کە ناگەڕێتەوە بۆسەر کابرای حەواڵەکەر، چونکە وەختی خۆی قوسووری کردووە کە ورد نەبووەتەوە لە حاڵی حەواڵە بۆسەر کراوەکەو ئەو حەواڵەیەی قەبووڵ کردووە.

ئەگەر کڕیار، فرۆشیاری حەواڵە کرد بۆ سەر کەسێك و لەئەنجاما، بەهۆی عەیبەوە ماڵەکەی ناردەوە بۆ فرۆشیارەکە، ئەوە، ئەو حەواڵەیشە بەتاڵ ئەبێتەوە؛ بەڵام ئەگەر

فرۆشیار کەسێکی حەواڵە کردبوو بۆسەر کڕیارەکە بەو ئەندازە پارەیە و کڕیار ماڵەکەی بەهۆی عەیبەوە ناردەوە، ئەوە حەواڵەکە بەتاڵ نابێتەوە؛ جیاوازی ئەم دوو مەسئەلەیە، ئەمەیە لە یەکەمیانا حەواڵەکە وا لە بەینی ماڵکڕو ماڵفرۆشدا و قیمەتی ماڵەکەیش بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی بەیعەکەوە لەئەستۆی کڕیاردا نەماوە، بەڵام لەدووهەمدا، هەرچەند بەیعەکە هەڵوەشێنراوەتەوەو قیمەتەکەی لەسەر کڕیار نەماوە، بەڵام حەقەکە چووەتە ئەستۆی کەسێکی تری غەیری کڕیارو فرۆشیار و حەقی ئەو بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی عەقدەکەوە لاناچێ[1] و کڕیار کە پارەکەی دا بە کابرای حەواڵەکراو، ئەگەڕێتەوە بۆ سەر فرۆشیار، وە ئەو پارەیەی لێ ئەسێنێتەوە.

ئەگەر قەرزارەکە وتی بەوکەسە کە ئەڵێ حەواڵە کراوم: من تۆم حەواڵە نەکردووە، بەڵکوو تۆم کردووە بە وەکیلی خۆم ئەو حەقەم بۆ وەربگری کە لەسەر فلانکەسە، ئەویش وتی: نەخەیر، حەواڵەت کردووم، ئەوە باوەڕ بە کابرای قەرزار ئەکرێ لەڕێگای سوێنەوە؛ هەروەها، ئەگەر قەرزارەکە وتی: بەڵێ، من لەفزی حەواڵەم بە دەما هاتووە، بەڵام مەبەستم وەکالەت بووە و خاوەن قەرزیش وتی: نەخەیر، مەبەستت حەواڵە بووە، ئەوە هەر قەرزارەکە سوێند ئەدرێ.

ئەگەر کابرای قەرزار، وتی: من تۆم حەواڵەکردووە بۆ سەر فڵانەکەس، ئیتر حەقت لەسەر من نەماوە، ئەویش وتی: نەخێر، من وەکیلی تۆ بووم بۆ داواکردنی قەرزەکەت لەو شەخسە و حەقی من وا لەئەستۆی تۆدا، ئەوە ئەم خاوەن قەرزە کە ئیددیعای وەکالەت ئەکا سوێند ئەدرێ و باوەڕی پێ ئەکرێ.

## باسی زامنی

زامنی، بریتییە لەوە کەسێك بڕواتە ژێر ئەوە کە حەقێك کە بەسەر یەکێکەوەیە، بیداتەوە یاخود کەسێك یا عەینی ماڵێك لە وەختێکی تایبەتییا حازر بکا؛ ئەم زامنییە،

---

١. وەك ئەوە کە فرۆشیار تەسەڕوف بکا لەو ماڵەدا کە وەریگرتووە لە کڕیار؛ مەسەلا، ببیەخشێ و پاشان، کڕیار ماڵەکە بەهۆی عەیبەوە بداتە دواوە.

وەستاوە لەسەر بوونی «ضامِن» کە ئەو کەسەیە ئەرکەکە ئەگرێتە ئەستۆی خۆی و «مَضمونٌ لَه» کە ئەو خاوەن حەقەیە ئەرکەکەی بۆ ئەگیرێتە ئەستۆ و «مَضمونٌعَنه» کە ئەو کەسەیە حەقەکە لەجیاتی ئەو ئەدرێتەوە و «مَضمُون» کە تەسلیم کردنی ماڵەکە یا حازرکردنی کەسەکە یا ماڵەکەیە و «صیغة» کە ئەو قسەیەیە بە دەمی کابرای زامندا دێت.

شەرتی «زامن»، ئەوەیە کە روشدی ببێ؛ کەواتە دروست نییە منداڵو شێتو سەفیهـ ببن بە زامن و زەمانەتی کەسێك کە حیجری لەسەر دانرابێ بەهۆی لات کەوتنەوە، وەك ئەوە وایە کە شتێك بکڕێ، یەعنی مادام ئەو زەمانەتە لەسەر زیممە بێ، ئەوە دروستە، لەبەرئەوە کە ئەم کابرای لاتکەوتووە هەرچەند نەتوانێ حەقە زەمانەت بۆ کراوەکە لە ماڵی خۆی جێبەجێ بکا، قابیلە لە دوارۆژا ماڵی دەس بکەوێو جێبەجێی بکا؛ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەبێ، کابرای زامن شەخسی ئەو کەسە بناسێ کە ئەبێ بە زامنی حەقەکەی، بەڵام قەبووڵو رەزامەندیی ئەو کەسە پێویست نییە، چونکە زەمانەت، عەقدی گۆڕینەوە (مُعاوَضَة) نییە و هەر ئەوەندەیە کە ئەم زامنە ئەو حەقە ئەگرێتە ئەستۆی خۆی؛ هەروەها، بە قەتعی، پێویست نییە رەزامەندیی ئەوکەسە کە ئەم شەخسە ئەبێ بە زامنی، هەروەها ناسینیشی پێویست نییە. وائەبێ کەسێك حەقێك ئەداتەوە کە بەسەر کەسێکی ترەوەیە، تەنها لەبەر رەزای خوا، بەبێ ئەوە بیناسێو ئەویش پێی بزانێ.

شەرتی «مضمون»یش، ئەوەیە حەقێکی سابت (دامەزراو) بێ، بەڵام مەزهەبی ئیمام، لەسەر ئەوەیە «ضِمانُالدَّرك» دروستە کە بریتییە لەوە پاش ئەوە کەسێك ماڵێکی فرۆشتو پارەکەی وەرگرت، یەکێ ببێ بە زامنی ئەوپارەیە کە کڕیارەکە تەسلیمی کردووە، ئەگەر ماڵە فرۆشراوەکە بە ماڵی غەیر یا عەیبدار دەرچوو یاخود ناتەواو بوو، یا ببێ بە زامنی ئەو عەینە کە فرۆشیار فرۆشتوویەو قیمەتەکەی وەرگرتووە، ئەگەر ئەو قیمەتە بە ماڵی غەیر دەرچوو. هەروەها، شەرتە ئەو حەقە لازم (پێویست) بێ، ئێستە یا لەمەوپاش؛ کەواتە، دروستە زەمانەتی قیمەتی ماڵی فرۆشراو لەماوەی حەقی پەشیمان بوونەوەدا. هەروەها، دروستە زەمانەتی ئەو ماڵەی بڕیار دراوە بۆ کرێکاری «جَعالة» بۆ

ئەو ئیشەی کە بڕیار دراوە بیکا. هەروەها، شەرتە ئەو حەقە مەعلووم بێ؛ کەواتە، زەمانەتی حەقی نامەعلووم دروست نییە، تەنها لە وشتری دیەدا نەبێ کە حەقی خوێنی کەسێکی کوژراو یا ئەندامێکی لەشی ئینسانە. ئەگەر کابرای زامن وتی: وا بووم بە زامنی ئەوحەقەی کە تۆ هەتە بەسەر فلانەکەسەوە لە درەمێکەوە تا دە درەم، ئەوە دروستە و لەسەر ئەم قسەیە، کابرا ئەبێ بە زامنی نۆ درەم.

بزانن! هەروەکوو زەمانەتی نامەعلووم دروست نییە، «إبراء»، یەعنی ئازادکردنی کەسێکیش لە حەقێکی نامەعلووم دروست نییە؛ درێژەی باسی «إبراء»، ئەمەیە: ئیبراء چەند شەرتێکی هەیە:

یەکەم، ئەوەیە ئەو کەسە کە یەکێك ئازاد ئەکا، ئەبێ خاوەن روشد بێ؛ کەواتە ئازادکردن لەلایەن منداڵو شێتو نەفامەوە دروست نییە؛

دووهەم، ئەوەیە ئەو کەسە لەوانەبێ بتوانێ پیاوەتیو خێر لە ماڵی خۆیدا بکا؛ کەواتە، کەسێکی حیجر لەسەر دانراو بەهۆی لاتکەوتوویەوە، دروست نییە قەرزاری خۆی ئازاد بکا؛

سێهەم، ئەوەیە ئەو ئازادکردنە بۆ ماوەیەکی تایبەتی نەبێ؛ کەواتە، دروست نییە یەکێ بڵێ بە قەرزاری خۆی: وا تۆم ئازاد کرد لەماوەی ساڵێکدا؛

چوارەم، ئەوەیە ئەو ئازادکردنە بەشەرت نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر یەکێك وتی بە قەرزارەکەی: هەر کاتێك جەژنی رەمەزان هات، ئازاد بە لەو قەرزە، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵام بەستنی ئازادکردن بە مردنو پاش مردنەوە دروستە؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك بڵێت: هەرکاتێ کە مردم، فلانکەس ئازاد بێ لەو قەرزەی لەسەریەتی، ئەوە دروستەو بە وەسیەت دائەنرێ؛ جا ئەگەر ئەو قەرزە لە سێ یەکی ماڵی کابرا زیاتر نەبوو و ئازادکراوەکەش میراتگری ئەم خاوەنقەرزە نەبوو، ئەوە ئازاد ئەبێ وە ئەگەر قەرزەکە زیاتر بوو لە سێ یەك، یاخود کابرا میراتگری خاوەن قەرزەکە بوو، ئەوە بە بێ ڕێگادانی میراتگرەکانی تر دانامەزرێ[١]؛

١. بۆ میراتگرەکە، لە هیچیا و بۆ بێگانەکە، لە ئەندازەی زیادەی لە سێ یەکەکەدا.

پێنجەم، ئەوەیە ئەو شتەی کابرای لێ ئازاد ئەکا، عەین نەبێ؛کەواتە، ئەگەر یەکێك کتێبێکی لای کەسێك هەبێ و پێی بڵێت: وا لەو کتێبە ئازادم کردی، ئەوە بەتاڵە، بەڵکوو ئەبێ بە نەزر یا بە بەخشین یا بە وەقف ـمەسەلا ـ بیداتێ؛

شەشەم، ئەوەیە ئەندازەی ئەو ماڵە دیاری بێ؛ جا ئەگەر شوێنەکە شوێنی گۆڕینەوە بوو، وەك ئەوە ژنێك مێردەکەی ئازاد بکا لە مارەییەکەی بەرابەر بەوەکە ئەویش تەڵاقی بدا، ئەوە پێویستە هەردوولا، یەعنی ئازادکەرو ئازادکراو، بە ئەندازەی ئەو ماڵە بزانن وە ئەگەر شوێنی گۆڕینەوە نەبوو، ئەوە هەر زانستی کابرای ئازادکەر پێویستە؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك حەقێکی لەسەر کەسێك هەبێو نەزانێ چەندە و بڵێ: ئازادم کردی لە هەر حەقێك کە لەسەرتە، ئەوە ئەو ئازادکردنە بەتاڵە و ڕێگەی ئازادکردن لەشتی نادیاری، ئەوەیە کابرا ناوی ئەندازەیەك ببا کە قەرزەکە لەوە کەمتر نەبێ و لە ژووریشیەوە ناوی ئەندازەیەك ببا کە لەوە زیاتری لەسەر کابرای قەرزار نەبێ؛ مەسەلا، بڵێت: لە فلسێکەوە تا هەزار دینار حەقم لەسەر تۆ، گەردنت ئازادبێ لێی!. ئەوە لەم سوورەتەدا، دروستە.

بزانن! حوکمی دروست نەبوونی ئازادبوون لە نامەعلووم، بۆ دنیایە، بەڵام بۆ قیامەت دروستەو کابرای ئازادکراو لە قیامەتا پرسیاری ئەو حەقەی لێ ناکرێ، وەك «شیروانی» ئەیگێڕێتەوە لە «علي الشّبراملسي»یەوە؛ هەروەها، حەقی غەیبەت، ئەوە ئەگەر نەگەیشتبووەوە بە کابرای غەیبەت کراو، کابرای غەیبەتکەر ڕزگار ئەبێ بەوەکە داوای لێبووردن بکا لە خوا بەرابەر بەوگوناهە، بەڵام ئەگەر گەیشتبووەوە بە کابرای غەیبەت کراو، ئەبێ باسی ئەو قسانەی لابکا کە لەبارەی ئەوەوە کردوویەتی و داوای خۆشبوونی لێبکا تا ئەویش ئازادی بکا، هەتاوەکوو ئەگەر بەرابەر بە ماڵی دنیایش لێی ڕازی بێ، تەسلیمی بکا؛ بەڵێ، ئەگەر لە باسکردنی ئەو قسانەدا ترسی فیتنەو ئاشووب هەبوو، ئەوە دروستە باسیاننەکاو داوای خۆشبوون بکا لە بارەگای خوادا؛ هەروەها، ئەگەر کەسێك خەیانەتی لە ناموسی کەسێك کردبێ و ترسی بەرپابوونی ئاشووبی هەبێ ئەگەر بیگێڕێتەوە بۆ ئەوکەسە، ئەوە لەم حاڵەشا ئەوەندە بەسە کە لەدڵی خۆیا پەشیمان ببێتەوەو داوای خۆشبوون بکا لە بارەگای خوادا.

حەوتەم، ئەوەیە کابرای ئازادکراو مەعلووم بێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك قەرزی لەسەر دووکەس هەبوو و وتی: وا یەکێك لە ئێوەم ئازاد کرد، ئەوە بەتاڵە و پێویستە شەخسی ئازادکراو دیاری بکرێ.

## باسی کەفالەت

مەزهەبی ئیمامی شافیعی ـ خوای لێ رازی بێ ـ لەسەر ئەوەیە دروستە کەسێك ببێ بە کەفیل بۆ حازرکردنی کەسێك لەکاتێك و شوێنێکی دیارییا؛ کەواتە، دروستە یەکێك ببێ بە کەفیل بۆ حازرکردنی کەسێکی قەرزار لە دادگادا. پێویست نییە بۆ دروستبوونی کەفالەت ئەو کەفیلە بزانێ ئەو ماڵەی لەسەر کابرای کەفالەت کراوە، چەندێکە؛ هەروەها، پێویستە ئەو حەقەی کە لەسەر کابرای کەفالەت کراوە، لەوانەبێ دروستبێ یەکێك ببێ بە زامنی. دروستە کەفالەت بۆ حازرکردنی کەسێك کە تاوانێکی کردبێ و حەقی ئینسانێکی لەسەر بێ، وەك حەقی خوێن «قِصاص»، بەڵام دروست نییە لە حەدی خوادا، وەك حەدی شەراب خواردنەوە؛ دروستە کەفالەتی حازرکردنی منداڵ و شێت و زیندانی و نادیارو مردوو بۆ ئەوەی شاهیدی لەبارەی سەرو سووڕەتیانەوە بدرێ. جا ئەگەر شوێنێك ناوبرا بۆ حازرکردنی شەخسەکە، ئەوە باشە. ئەگینا، پێویستە لەشوێنی کەفالەتەکەدا حازریان بکاو بەو حازرکردنە کەفیلەکە رزگار ئەبێ، بەو شەرتە لەو شوێنەدا شتێك رێنەگرێ لە وەرگرتنی شەخسە حازرکراوەکە؛ هەروەها، کەفیلەکە رزگار ئەبێ ئەگەر ئەوکەسەی کەفالەتەکەی کراوە بە نەفسی خۆی حازر ببێ و بڵێ وا خۆم دا بەدەستەوە لەجیاتی کەفیلەکەم. بەڵام ئەگەر ئەم قسەیە نەکا ئەوە بێسوودەو کەفیلەکە رزگار نابێ.

ئەگەر ئەو کەسەی کەفالەتی کراوە دیار نەبوو و شوێنیشی نەئەزانرا، ئەوە واجب نییە لەسەر کەفیلەکە بگەڕێ بەدوایا، چونکە ئەوە ئەبێ بە زەحمەتێکی نابار و کەفیلەکەیش باوەڕی پێ ئەکرێ کە سوێندی خواردو وتی: ئاگام لە شوێنی نییە وە ئەگەر شوێنەکەی دیاری بوو، ئەوە ئەبێ بڕوا بەدوایاو حازری بکا لەو شوێنەدا کە بڕیاری

لەسەر دراوە و مۆڵەتی ئەدرێ بۆماوەی ڕۆیشتن و هاتنەوەی وە ئەگەر ئەو ماوەیە رابوردو شەخسەکەی حازر نەکرد، ئەوە کەفیلەکە ئەخرێتە زیندانەوە تاکابرا خۆی ئەدا بەدەستەوە؛ بەڵێ، ئەگەر کەفیل ئەو ماڵەی دا کە داوای ئەکرێ لە کابرای کەفالەت کراو، ئەوە بەرەڵڵا ئەکرێ؛ فەرموودەی ڕاستتر، ئەوەیە ئەگەر ئەو کابرایە مرد و خرایە قەبرەوە، ئەوە داوای ماڵەکە لە کەفیلەکە ناکرێ، هەتا وەکوو ئەگەر وەختی خۆیشی شەرت کرابوو لە کەفالەتەکەدا ئەگەر کابرا حازر نەبوو، کەفیلەکە ئەو ماڵە بدا، ئەوە ئەو کەفالەتە بەتاڵە.

بزانن! کەفالەت، بە بێ ڕەزامەندی ئەو کەسەی کەفالەتی ئەکرێ، بەتاڵەو دانامەزرێ.

شەرتە لە زەمانەت و کەفالەتا لەفزێکی وەها بێ کە ئەوە بگەیەنێ ئەم کەسە ڕۆیشتووەتە ژێر ئەو ماڵە تەسلیمی بکا، یا لەئەستۆی خۆی گرتووە ئەو کەسە حازر بکا؛ مەسەلا، بڵێت: وا بووم بە زامنی ئەو قەرزە کە تۆ هەتە لەسەر فڵانەکەس، یا: ئەو قەرزەم هەڵگرت، یا: وا ئەو قەرزەم خستە گەردنی خۆم، یا: وا بووم بە کەفیلی ئەو کەسە کە لە فڵان ڕۆژا حازری بکەم، یا: من کەفیلی حازرکردنی ئەو شەخسەم؛ ئەگەر وتی: من ئەو حەقە جێبەجێ ئەکەم، یا وتی: ئەو شەخسە حازر ئەکەم، ئەمە، بە وەعدە دائەنرێ و نابێ بە زەمانەت یا بە کەفالەت، چونکە لەفزێکی تیا نییە ئەوە بگەیەنێ چووەتە ژێری ئەوە کە ئەو شتە بداتەوە، یا ئەو شەخسە حازر بکا. فەرموودەی ڕاستتر، ئەوەیە دروست نییە زەمانەت یا کەفالەت، ببەسرێن بەشتێکەوە؛ مەسەلا، بڵێت: ئەگەر باوکم ڕازی بوو، وا ئەو حەقەم گرتە گەردنی خۆم، یا: وا بووم بە کەفیلی ئەو شەخسە حازری بکەم؛ بەڵێ ئەگەر بە یەکجاری بڕیاری زەمانەت یا کەفالەتەکەی دا و شەرتی ئەوەی کرد کە لەپاش مانگێ ئەو حەقە جێبەجێ بکا، یا شەخسی فڵانکەس حازر بکا، ئەوە دروستە. فەرموودەی ڕاستتر، ئەوەیە دروستە زەمانەتی قەرزی حازر بە قەرزی وەعدەدار؛ مەسەلا، بڵێت: وا من بووم بە زامنی ئەو قەرزە حازرە کە هەتە بەسەر فڵانکەسەوە، لەپاش مانگێك تەسلیمی بکەم؛ هەروەها، دروستە ببێ بە زامنی قەرزی وەعدەدار بە حازر، بەڵام واجب نییە لەسەری گورج ئەو حەقە بداتەوە.

بزانن! دروستە بۆ خاوەنحەق داوای حەقەکەی لە زامنەکە بکا یا لەوەی کە حەقەکەی بەلاوەیە. دروستنییە زەمانەت کردنی قەرزێك بەو شەرتە کە ئەو کابرایەی حەقەکەی بەلاوەیە ئازاد ببێ، چونکە مەعنای زەمانەت ئەوەیە ئەوەی حەقەکەی بەلاوەیە قەرزارە، کە ئەو ئازاد بوو، ئیتر مەعنای زەمانەت چییە؟! کەواتە، دروست نییە میراتگر بڵێت بە یەکێك کە قەرزی لەسەر مردووەکەی هەبێ: وا بووم بە زامنی ئەو قەرزە بەو شەرتە گەردنی مردووەکەم ئازاد بکەی وە ئەگەر خاوەن قەرزەکە لەسەر ئەم بڕیارە مردووەکەی ئازاد کرد، ئەوە ئەو ئازادکردنە بەتاڵە، چونکە ئەو بە گومانی ئەوە ئازادی کردووە کە زەمانەتەکە دائەمەزرێ و زەمانەتەکەیش بەتاڵ بووە؛ کەواتە، ئەم ئازادکردنەیش بەتاڵە. ئەگەر خاوەن قەرز قەرزارەکەی ئازاد کرد، زامنەکەیش رزگار ئەبێ بەڵام پێچەوانەی ئەمە نییە، یەعنی ئەگەر کابرا زامنەکەی لە زەمانەت یا لە حەقەکە ئازادکرد، قەرزارەکە ئازاد نابێ. ئەگەر یەکێك لە قەرزارو لە زامن وەفاتی کرد، ئەوە هەر حەقێکی وەعدەدار لەسەر مردووەکە هەبێ ئەبێ بە حازر، لەبەر ئەوە کە مردووەکە لەپاش مردن، «ذِمّة»ی نامێنێ و حەق رووئەکاتە میراتەکەی؛ کەواتە، ئەگەر قەرزارەکە مرد، بۆ خاوەن قەرز دروستە بێت حەقی خۆی لە میراتی ئەو کابرا وەربگرێ، وە ئەگەر زامنەکە مرد دروستە بۆ خاوەن حەق بێت حەقەکەی لە میراتی ئەم وەربگرێ، جا کە وەریگرت، میراتگری زامنەکە ئەڕۆنە سەر کابرای قەرزار و حەقی خۆیانی لێوەرئەگرنەوە. هەرکاتێك خاوەن حەق داوای حەقەکەی کرد لە زامنەکە، دروستە بۆ ئەو زامنەش بڕوا داوی حەقەکەی بکا لە قەرزارە کە بۆ ئەوەی تەسلیمی خاوەن حەقەکەی بکا، بەو شەرتە بە ئیزنی ئەو بووبێ بە زامن؛ فەرموودەی راستتر ئەوەیە تا داوای حەقەکە نەکرێ لە زامنەکە، دروست نییە ئەم بڕوا داوای ئەو حەقە بکا لە قەرزارەکە و ئەگەر حەقەکەی لە ماڵی خۆی دایەوە، ئەتوانێ بچێتەسەر قەرزارەکەو هەرچیداوە بە خاوەن حەق لەوی وەربگرێتەوە بەو شەرتە ئەم زامنە لەسەر ئیزنی ئەو قەرزارە بووبێ بە زامن و لەسەر ئیزنی ئەویش قەرزەکەی دابێتەوە، هەروەها، ئەگەر تەنها ئیزنی لە زەمانەتەکەدا دابێ. وە ئەگەر نە ئیزنی لە زەمانەتەکەدا دابوو وە نە لە

بژاردنەوەی حەقەکەدا، ئەوە ناتوانێ بگەڕێتەوە سەر قەرزارەکە بۆ داوای بژاردنەوەی ئەوەی داویەتەوە، هەروەها، ئەگەر هەر ئیزنی بۆ دانەوەی حەقەکە دابێ، چونکە دانەوەی ئەو حەقە لەسەر ئەساسی زەمانەتەکەیەو ئەویش ئیزنی بۆ زەمانەت نەداوە. ئەگەر زامنەکە سکەیەکی مەخشوشی دا بە خاوەن قەرزەکە لەجیاتی سکەی پاك، یاخود سوڵحی کرد لەگەڵیا کە لەجیاتی سەد دینار قەرز، پارچەو کەلوپەلی بداتێ، ئەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە ئەگەڕێتەوە بۆسەر قەرزارەکە بەو ئەندازەیەکە دوایەتی بە خاوەن قەرزەکەو ناتوانێ داوای ئەندازەی قەرزەکەی لێ بکا. ئەگەر کەسێك قەرزێکی دایەوە لەجیاتی قەرزارێك بە بێ ئیزنی ئەو و بە بێ زەمانەت، ئەوە حەقی نییە بگەڕێتەوە بۆسەر ئەو قەرزارە؛ بەڵێ، ئەگەر ئیزنی دابوو قەرزەکەی بۆ بداتەوە بەشەرتی گەڕانەوە بۆسەری، ئەوە حەقی گەڕانەوەی هەیە؛ هەروەها، ئەگەر ئیزنەکەی بە بێ شەرتی گەڕانەوە بێ و ئەم شەخسەیش کە قەرزەکەی دایەوە، نیازی خێرو پیاوەتی نەبوو، ئەوە هەر حەقی گەڕانەوەی هەیە؛ فەرموودەی راستتر ئەوەیە سوڵحکردنی ئەم شەخسە رێگادراوە لەگەڵ خاوەن قەرزەکەدا لەسەر غەیری جینسی قەرزەکە، نابێ بە مانیعی ئەوەکە بگەڕێتەوە بۆسەر قەرزارەکە بۆ داوای بەدەلی ئەوەی داویەتی بە خاوەن حەقەکە. هەروەها ئەگەر کەسێك بڵێ بە کەسێکی تر: مەسرەفی رۆژانەی ژنو مناڵەکەم بدە، یاخود دیلێك بڵێ بە یەکێك: ئەوەندە پارە بدە بە فڵانکەس بۆ ئەوە رزگار ببم، یاخود بڵێ بە یەکێك: ئاڵف و ئالێك بدە بە وڵاخەکەم، ئەوە لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، دروستە بۆ ئەو کەسە کە مەسرەفەکەی کردووە، بگەڕێتەوە بۆسەر کابرا.

بزانن! پێویستە بۆ گەڕانەوەی زامن بۆسەر قەرزار، ئەمە کە دوو پیاو یا پیاوێکو دوو ژن بکا بە شاهید لەسەر تەسلیمی حەقەکە بە خاوەن حەق، هەروەهایە ئەگەر تەنها شاهیدێك بگرێ وە لە وەختی خۆیا ئەگەر کابرا باوەڕی نەکرد بە دانەوەی حەقەکە، سوێندی لەگەڵ بخوا، ئەگینا مادام ئەم شەخسە زامنەو شەخسی قەرزەوبژێر شاهید نەگرن، وکابرای قەرزار حازر نەبێ وە باوڕ نەکا بەمان کە ئەو حەقەیانە داوەتەوە، ئەوە حەقی گەڕانەوەیان نییە؛ هەروەها ئەگەر قەرزارەکە باوەڕیشیان پێ بکا، چونکە مادام

شاهید لەسەر تەسلیمی حەقەکە نییە، ئەم قەرزارە قازانجی دەس نەکەوتووە لەوە کە ئەوان حەقەکەیان تەسلیم کردووە؛ بەڵێ، ئەگەر کابرای خاوەن حەق باوەڕیان پێبکا لە دانەوەی حەقەکەدا، یاخود بە حوزووری قەرزارەکە حەقەکەیان دابێتەوە، ئەوە حەقیان هەیە بگەڕێنەوە بۆ سەریو هەر ئەندازەیەکیان داوە، وەریبگرنەوە.

## باسی شەراکەت

شەراکەت، چەند جۆرە:

یەکەم: شەریکایەتییە بە لەش؛ مەسەلا، چەند کۆڵ هەڵگرێك یا چەند دارتاشێك، بین بە شەریك لەسەر ئەو ئەساسە کە کاسبییەکەیان کە بەلەشی خۆیان ئەیکەن، شەریکی بێ لەبەینیانا، خواه کاسبییەکەیان ئەوەندەی یەك بێ یا کەم و زیاد بێ، و سنعاتەکەیان یەك جۆر بێ ـ وەك وتمان ـ یا چەند جۆری جیاجیابێ؛

دووهەم: شەراکەتی «مُفاوَضة»یە کە بریتییە لەوە چەند کەسێك بڕیار بدەن کە کاسبییەکەیان لەبەینیانا بێ، و هەر قازانجو زیانێکیان هەبێ، بەیەکەوە وەریبگرن یا بیبژێرن؛

سێهەم: شەراکەتی وجووهە، بەمنەوعە کە دوو پیاوی خاوەن شانوشکۆ بین بە شەریك لەسەر ئەو ئەساسە کە هەردووکیان ماڵ بکڕن بە حازر یا بە قەرز و کاتێك کە ماڵەکەیان فرۆشت، هەرچی زیاد بوو لە قیمەتی ئەو ماڵە، لەبەینیانا بێ؛ ئەم سێ جۆرە، هەرسێکیان بەتاڵن و هەرکەس لەمشەریکانە، کاسبی خۆی بۆ خۆیەتی و قازانجی ئەو ماڵەی کە کڕیویەتی بۆ خۆیەتی و هەرکەسیان ماڵی کەسێکی تری لابێ، بە ئەمین ئەناسرێ لەسەر ئەو ماڵە، چونکە عەقدی دانەمەزراو حوکمی عەقدی دامەزراوی هەیە لە زەمانەت و ئەمانەتاو مەعلوومە کە شەریك بە شەراکەتی راستی، بە ئەمین دائەنرێ؛ هەروەها، ئەگەر ئەم دوو شەریکە یا یەکێکیان، هەندێك ماڵ بداتە دەستی کەسێك کە موعامەلەی پێبکاو قازانجی پێ پەیدا بکا، ئەوە عامیلەکە حەقی کرێی هاوچەشنی خۆی هەیە لەو ماوەیەدا کە ئیش ئەکاو هەر قازانجێك ببێ هی خاوەنماڵەکەیە؛

**چوارەم: شەراکەتی عینانە؛** ئەم شەراکەتە، بریتییە لەوە کە چەندکەس ماڵێکی وێنەدار (مِثلی)یان ببێ و تێکەڵی بکەن بۆ موعامەلە پێ کردن؛ ئەم شەراکەتە دروستەو چوار روکنی هەیە: «عاقد» کە شەریکەکانە و «مَعقودٌ علیه» کە ماڵە تێکەڵ کراوەکەیە و «عَمَل» کە موعامەلەو کڕین و فرۆشتنە لەو ماڵەدا و «صیغة» کە ئەو لەفزەیە شەراکەتەکە ئەگەیەنێ.

شەرتی عەقدکەر (عاقد)ەکان، ئەوەیە لایق بن بۆ وەکیل گرتن و بۆ ئەوە کە ببن بە وەکیل. و شەرتی ماڵەعەقد لەسەر کراو (معقودٌ علیه)ەکە، ئەوەیە وێنەدار (مِثلی) بێ، وەك پارەی نەخت و گەنم و رۆن و تێکەڵ بکرێن بەجۆرێك کە لەیەك جیا نەبنەوەو فەرقیان نەخرێ، یاخود هەر لەبنچینەدا تێکەڵ بن، وەك ماڵێك کە بە میرات بگاتەوە بە چەند میراتگرێك و بە شەراکەت موعامەلەی پێ بکەن وە ئەگەر ماڵێکی قیمەت بۆ دانراو (متقوِّم) هەبێ، وەك حەیوانات و پیتاك، ئەوە رێگەی شەراکەت لەو جۆرە ماڵەدا، ئەوەیە هەرکام لە شەریکەکان هەندێك لە ماڵەکەی بفرۆشێ بە شەریکەکەی بە هەندێك لە ماڵەکەی ئەو و هەروەها تا هەموو ئەو جەماعەتە ببن بە خاوەن ماڵ لە بەشی شەریکەکانیشیانا؛ «عمل»یش، بریتییە لەوە کە لەناو عەقدی شەراکەتەکەدا باسی ئەکەن و هەرکام لەشەریکەکان ئیزنی ئەوانی تریان ئەدات کە بیکەن.

شەرتی لەفزی عەقدەکەیش، ئەوەیە لەفزێك بێ ئەوە بگەیەنێ کە هەرکام لە شەریکەکان رێگای شەریکەکانی تر بدات بۆ تەسەڕوف کردن لەو ماڵەدا و بۆ موعامەلە پێ کردنی؛ ئیتر پێویست نییە ئەندازەی ماڵی شەریکەکان ئەوەندەی یەك بێ؛ هەروەها، پێویست نییە لەکاتی عەقدی شەراکەتەکەدا، ئەو شەریکانە بە ئەندازەی ماڵەکەیان بزانن، بەو شەرتە قابیل بێ پاش عەقدەکە بەوئەندازەیە بزانن، بەهۆی تەماشاکردنی دەفتەر یا بەیانکردنی وەکیل یا هەر هۆیەکی ترەوە.

هەرکام لەو شەریکانە کە موعامەلە ئەکا بەوماڵە، پێویستە تەسەڕوفەکەی بێ زیان بێ؛ کەواتە، موعامەلە بە قەرز، یا فرۆشتن بە غەیری نەختی ئەو وڵاتە، یا بەزەرەر، یا سەفەر کردن بەوماڵەوە بە بێ ڕێگادانی هەموو شەریکەکان، دروست نییە.

ئەم شەراکەتە، هەڵئەوەشێتەوە بەمردن یا شێتی یا بێهۆشی هەموویان یا بەعزێکیان؛ هەروەها بەتاڵ ئەبێتەوە بەوە کە مەنعی یەکتر بکەن لە تەسەڕوف کردن لەو ماڵەدا وە ئەگەر یەکێکیان مەنعی تەسەڕوفی کرد لە شەریکەکەی، ئەوە تەسەڕوفی شەریکەکەی بەتاڵە، بەڵام تەسەڕوفی ئەم شەخسە خۆی دروستە هەتا شەریکەکەی مەنعی ئەکا.

کاتێك کە شەریکەکان موعامەلەیان کردو قازانج پەیدا بوو، ئەو قازانجە بەش ئەکرێ لەبەینیانا بەپێی ئەندازەی سەرمایەکەیان، خواه شەریکەکان ئەوەندەی یەك ئیشیان کردبێ، یانە وە ئەگەر شەرتی ئەوەیان کرد کە قازانج بەپێی ماڵەکەیان نەبێ، ئەوە شەراکەتەکەیان بەتاڵە و هەرکامیان قازانجی بەپێی ماڵەکەی دەسگیر ئەبێ و ئەچێتە سەر شەریکەکانی تر بۆ داوای کرێی ئەو ئیشە کە لەبەشی ئەوانا کردوویەتی و هەر تەسەڕوفێکیشان لەو ماڵەدا کردبێ دروستە، چونکە هەرچەند عەقدی شەراکەتەکەیان بەتاڵ بێ، بەڵام هەرکامیان ڕێگای ئەوی تریانی داوە تەسەڕوف بکا لە ماڵەکەدا.

بزانن! دەستی شەریك لەسەر ماڵی شەریکەکەی، دەستی ئەمانەتە و قسەی قەبووڵ ئەکرێ لە ئیددیعای ناردنەوەی ماڵەکەدا بۆ خاوەنەکەی وە لە زەرەر کردنو فەوتانی ماڵەکەدا وە ئەگەر ئیددیعای فەوتانی ئەو ماڵەی کرد بەهۆی بەڵایەکی دیارییەوە، ئەوە داوای شاهیدی لێ ئەکرێ بۆ ئیسپاتی ئەو بەڵایە لەو شوێنەدا و پاش ئەوە، سوێندیشی ئەدرێ لەسەرئەوە کە ماڵەکە بەهۆی ئەو بەڵایەوە فەوتاوە وە ئەگەر ئەو شەریکەیان کە ماڵەکەی لەدەستایە، وتی: فڵانەشت ماڵی خۆمەو شەریکەکەی تر وتی: هی هەردووکمانە، یا بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەوە باوەڕ، بە خاوەندەستەکەیان ئەکرێ بە سوێند وە ئەگەر خاوەن دەستەکە، وتی: ماڵەکەمان بەش کردووە و ئەم ماڵەی کە بەدەستمەوەیە بووە بە ماڵی خۆم و ئەویشیان وتی: بەشمان نەکردووەو هەمووی تێکەڵە، ئەوە باوەڕ بەویانە ئەکرێ کە ئینکاری بەشکردنی ماڵەکە ئەکاو سوێندێکی ئەدرێ وە ئەگەر یەکێکیان شتێکی کڕیو ئیددیعای کرد کە بۆ خۆی کڕیوە یا بۆ شەراکەتی کڕیوە و ئەو شەریکەکەیان باوەڕی پێ نەکرد، ئەوە باوەڕ بەویانە ئەکرێ کە ماڵەکەی کڕیوە وە سوێندێکی ئەدرێ.

ئەگەر کۆمەڵێك براو خوشك میراتێکیان بۆ بەجێما و بەعزێکیان تەسەڕوفیان کرد لەو میراتەدا، ئەوە ئەگەر ئەو تەسەڕوفاتە بە ئیزنی میراتگرەکانی تر بوو لە حاڵەتی روشددا، ئەوە ئەم ئیزندەرانە حەقیان نییە بەشە ماڵە سەرفکراوەکەی خۆیان وەربگرنەوە لەوانەکە تەسەڕوفیان تیاکردووە وە ئەگەر بەعزێك لە میراتگرەکان منداڵبوون، یاخود گەورە بوون بەڵام رێگای ئەو تەسەڕوفەیان نەدابوو، یا رێگایاندابوو بەڵام لەسەر ئەساسی ئەوەکە ئەمانیش وەختی خۆی ئەو جۆرە تەسەڕوفە لەو ماڵەدا بکەن بۆ خۆیان، وەك ئەوە براو خوشکە پێشووەکان مەسرەفی ژن هێنانو شووکردنیان لەو ماڵەدا کردبوو لەسەرئەوەکە پاشان براو خوشکەکانی تریش عەینی مەسرەف لەو ماڵەدا بکەن، ئەوە لەمسوورەتانەدا، هەرکام لەمانەکە مەسرەفیان نەکردووە لە ماڵە میراتییەکەدا، حەقیان هەیە بە ئەندازەی بەشە فەوتاوەکەیان لەو میراتە هەڵ بگرنو ئەوسا چی مایەوە، هەموویان بەشی بکەن لەبەینی خۆیانا بەگوێرەی شەرع وە ئەگەر ماڵە میراتییەکە تەواو بووبوو، بۆیان هەیە بەشی فەوتاوی خۆیان بەتەواوی وەربگرنەوە لەوانەی کە تەسەڕوفیان تیاکردووە.

## باسی وەکالەت

وەکالەت لە شەرعدا، ئەوەیە کەسێك لە ماوەی ژیانیا ئیشێك بداتە دەستی کەسێکی تر لەجیاتی ئەو بیکا لە ماوەی ژیانیا و ئیشەکە لەوانەبێ جێنشین بتوانێ جێبەجێی بکا.

ئەرکانی وەکالەت، چوارە:

«مُوكِّل»، یەعنی ئەو کەسە کە وەکیل ئەگرێ،

وە «وَكيل»، یەعنی ئەو کەسە کە ئیشەکەی ئەدرێتە دەست،

وە «مُوكَّل فيه»، یەعنی ئەو ئیشە کە وەکیلەکەی بۆ ئەگیرێ،

وە «صيغة» کە ئەو لەفزەیە وەکالەتەکەی پێ جێبەجێ ئەبێ.

شەرتی وەکیلگر، ئەوەیە کە تەسەڕوفی خۆی دروست بێ لەو ئیشەداکە وەکیلی بۆ ئەگرێ بەهۆی ئەوەوە کە خاوەن ماڵ بێ یاخود بەهۆی ویلایەتی شەرعییەوە، وەك

باوکی منداڵ کە ویلایەتی هەیە بەسەر ماڵی منداڵی خۆیەوە؛ کەواتە، دروست نییە منداڵو شێتو نەفام، بە بێ ئیزنی وەلی ئەمریان، وەکیل بگرن لە هیچ موعامەلەیەکدا؛ هەروەها، دروست نییە بۆ کەسێك کە لە ئیحراما بێ وەکیل بگرێ ژنی بۆ مارە بکا، یاخود کچی بدا بەشوو وە مارەی ببڕێ لەکاتی ئیحرامەکەدا، بەڵام ئەگەر کردی بە وەکیل کە لەپاش بەسەرچوونی ماوەی ئیحرامەکە عەقدەکەی بۆ بکا، یاخود وەکالەتەکە موتڵەق بێ و وەکیلەکەیش لەپاش بەسەرچوونی ماوەی ئیحرام ئەو ئیشەی بۆ کرد، ئەوە دروستە؛ هەروەها، دروست نییە ژن وەکیل بگرێ کە لەجیاتی خۆی مارەی بکا لەکەسێك، چونکە خۆی ناتوانێ خۆی مارە ببڕێ؛ بەڵێ، دروستە وەلی ئەمری منداڵ وەکیل بگرێ بۆ ئەوە کە ئیش بکا لە ماڵی ئەو منداڵەدا؛ هەروەها دروستە کوێر وەکیل بگرێ بۆ کڕین یا بۆ فرۆشتن، چونکە ئەو کوێرە خۆی شت نابینێ، و ناچارە بۆ ئەم وەکیلگرتنە.

شەرتی وەکیلیش، ئەوەیە بتوانێ ئەو ئیشە بکا بۆ خۆی کە کراوە بە وەکیل تیایا؛ کەواتە؛ دروست نییە منداڵو شێتو نەفامو حیجرلەسەردانراو بکرێن بە وەکیل لە هیچ موعامەلە و تەسەڕوفێکدا و دروست نییە ژن بکرێ بە وەکیل بۆ نیکاح کردن یا قەبووڵی نیکاح؛ بەڵام فەرموودەی راستتر، ئەوەیە پشت بە قسەی منداڵ ئەبەسترێ بۆ رێگادانی چوونە ژوورەوەی میوانو بۆ بانگکردنی میوانو بۆ دیاری ناردن بۆ کەسێك و بۆ هەر ئیشێکی تری لەمچەشنە.

شەرتی ئیشە وەکیل تیاگیراوەکەیش، چەند شتە:

یەکەم، ئەوەیە ئەو شتەکە وەکیلی بۆ ئەگیرێ لەژێر تەسەڕوفی وەکیلگرەکەدا بێ یا بەوەکە موڵکی بێ یا ویلایەتی شەرعی بەسەریەوە هەبێ؛ کەواتە، دروست نییە کەسێك وەکیل بگرێ بۆ فرۆشتنی حەیوانێك کە سبەینێ ئەیکڕێ یا بۆ تەڵاقدانی ژنێك کە لەمەولا مارەی ئەکا، یا بۆ مارەبڕینی کچەکەی لەپاش بەسەرچوونی «عِدّة»ی؛ بەڵام شێخی «ابن حجر»، لەم مەسئەلانەدا لەو باوەڕەدایە هەرچەند وەکالەتەکە بەتاڵە، بەڵام تەسەڕوفی کابرای وەکیل لەپاش هاتنەدی شەرتەکە، دائەمەزرێ، چونکە رێگای ئەو تەسەڕوفەی دراوە.

دووهەم، ئەوەیە ئەو ئیشە قابیل بێ بۆ ئەوە جێنشینی تیا بگیرێ؛ کەواتە، دروست نییە وەکیلگرتن بۆ عیبادەت، وەك نوێژو رۆژوو غوسڵی مردوو و نوێژی جەنازە؛ هەروەها، دروست نییە وەکیلگرتن بۆ شەهادەتدانو پێ‌لێنان (إقرار)و سوێند خواردن، و لە «إيلاء» و «ظِهار»و نەزرکردنو تەعلیقی تەڵاقدا؛ مەسەلا، ئەگەر کەسێك بکا بە وەکیل بۆ تەعلیقی تەڵاقی ژنەکەی، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵێ، دروستە وەکیلگرتن لە حەجکردنا بۆ کەسێك کە خۆی پەکیکەوتبێ و توانای هاتوچۆی نەمابێ؛ هەروەها، دروستە وەکیلگرتن لە دەس‌نوێژگرتنو تەیەمموم کردن و وەقفکردنا و لە سەربڕینی حەیوانی قوربانیو حەوتمو حەیوانی «هَدي»و کەفارەتی حەجدا و دروستە وەکیلگرتن لە زەکاتدانو زەکاتوەرگرتن‌دا بەو شەرتە ئەوکەسەی کە ئەبێ بە وەکیل، نیازی ئەوەی ببێ وەریبگرێ بۆ ئەوکەسەی کردوویەتی بە وەکیل؛ دروستە وەکیلگرتن لە ئیجابو قەبووڵی هەموو موعامەلەیەکا، وەك بەیعو سەلەمو ئیجارە و قیراز و هیبە و لە قەرزدانو وەرگرتنەوەی قەرزی حازر یا وەعدەدارا، بەو شەرتە [بەوەکیلەکە] بڵێت: لەو کاتەدا کە وەعدەی هات داوای بکە؛ هەروەها، دروستە وەکیلگرتن لە سوڵحو ئیبراءو حەواڵەو زەمانەتو شەراکەتو وەکالەتو شوفعەدا؛ هەروەها، لە دەعواو جوابی دەعوادا و لە بەموڵككردنی شتی موباحا، وەکوو ئاواکردنەوەی چۆڵیو نەچیرکردن و دارهێنان و لە غەیری ئەمانەدا، وەك هەڵوەشاندنەوەی بەیعو نیکاحو مارەیی؛ هەروەها، دروستە لە وەرگرتنی «دیە» (خوێن)دا و لە لێدانی داری حەددی بوختان بۆکردنا (حدُّ القَذْف).

سێهەم، ئەوەیە ئەو ئیشەی وەکیلی تیا گیراوە (موکَّل فیە) لە هەندێ رووەوە مەعلووم بێ، بەڵام پێویست نییە لە هەمووسەرێکەوە مەعلووم بێ؛ کەواتە، ئەگەر وەکیلی گرت بۆ کڕینی حەیوانێك، ئەوە پێویست نییە هەر وەسفێك لەسەلەمدا بەیان ئەکرێ لەم‌وەکالەتەدا بەیان بکرێ؛ هەروەها، دروست نییە ئەو ئیشە کە وەکیلی تیائەگیرێ گشتی (عام) بێ، چونکە ئەم‌جۆرە تەسەڕوفە مەجالی زەرەرو زیانێکی زۆرە؛ کەواتە، ئەگەر بڵێت: وا تۆم کرد بە وەکیلی خۆم لە هەرئیشێکا کە پەیوەندی

بەمنەوە بێ لەکەم و زۆر، یا: تۆم کرد بە وەکیل لە هەمووجۆرەتەسەڕوفێکا لە ماڵی خۆما، ئەوە بەتاڵە، بەڵام ئەگەر بڵێ: وا تۆم کرد بە وەکیل لە هەموو جۆرە فرۆشتنێکا لە ماڵی خۆما، ئەوە دروستە. ئەگەر کەسێك وەکیلی گرت بۆ حەیوان کڕین، پێویستە باسی ئەو سیفەتانە بکاکە مەبەستیان پێ ئەگۆڕێ، بەڵام بەجۆرێك کە نەکێشێتەوە بۆ نایاب بوونی ئەو شتەکە ئەیانەوێ بیکڕن؛ لەم جۆرە وەکالەتەدا، پێویست نییە باسی هەموو ئەو شتانە بکرێ کە لەسەلەمدا پێویستە باس بکرێن، چونکە وەکالەت ڕەوا دراوە بـۆ لابـردنی ئیحتیاجی، لەبەر ئەوە جێگەی چاوپۆشی و لێبوردنەوە ئەگەر کەسێك کەسێکی کرد بە وەکیل بۆ کڕینی خانوویەك، پێویستە باسی گەڕەك و کۆڵانی خانووەکـە بکـا، بـەڵام ئەندازەی قیمەتەکە پێویست نییە و بە تەبیعەت، واجبە کابرای وەکیل لە قیمەتی وێنەی خۆی زیاتر سەرف نەکا؛ بەڵێ، ئەگەر کابرای وەکیل گر وتی: بە هەر قیمەتێك بێ، کەم یا زۆر، بۆم بکڕە، ئەوە دروستە بەزیاتر لە قیمەتی عادەتی ئەو شتە بکڕێ.

شەرتە لەلایەنی وەکیل گرەوە لەفزێکی وا کە دەلاڵەت بکا لەسەر ڕەزامەندی ئەو بە تەسەڕوف کردنی وەکیلەکەی لەو ئیشەدا کە ئەیەوێ بیکا، وەکوو ئەوە بڵێ: وا تۆم کرد بە وەکیل لەو موعامەلەیەدا، یاخود بڵێ: تۆ وەکیلی منی لەو ئیشەدا، یاخود: ئەو کڕینەم دایە دەس تۆ وە ئەگەر هەر بڵێ: ماڵم بۆ بکڕە، ئەوە ئیزن دانەکە دێتەجێ.

شەرت نییە قەبووڵی وەکیل، تـەنها ئـەوەندە پـێویسـتە کـە ڕەددی نـەکـاتەوە و دروستنییە تەعلیق کردنی وەکالەت بە شەرتەوە وە ئەگەر هات و شەرتێکـی پـێوە بەست؛ مەسەلا، وتی: هەر کاتێك جەژنی ڕەمەزان هات، تۆم کرد بە وەکیلی خۆم لە کڕینی فڵان خانوودا، ئەوە ئەو وەکالەتە بەتاڵە وە ئەگەر کابرای وەکیل تەسەڕوفی کرد لە ئیشەکەدا، پاش بەجێ هاتنی شەرتەکە؛ مەسەلا، کردبووی بە وەکیل لە تەڵاقی ژنێکا کە لەمەولا مارەی ئەکا، یا لە بەشوودانی کچەکەیا، پاش ئەوەی تەڵاقدراو، «عِدّة»ی تەواوبوو، ئەویش لەسەر ئەو بڕیارە ژنەکەی تەڵاقدا یا کچەکەی مـارە کـرد، ئـەوە دروستە لای «ابن حجر» لەبەر ئەوە کە ئیزنەکە بە موتڵەقی هـەیە، هـەرچـەند ئـیزنە خوسووسییەکە لە ڕێگای وەکالەتەوە بەتاڵە؛ بەڵام لای «رَملي» و «خطیب»، بـەتاڵە.

ئەگەر كەسێك یەكێكی بە بێ‌قەیدو شەرت كرد بە وەكیل، بەڵام شەرتێكی بڕیاردا بۆ تەسەڕوفەكەی؛ مەسەلا، وتی: وەكیلی من بە لە فرۆشتنی حەیوانەكانما، بەڵام لە فڵان مەیدانا نەبێ مەیانفرۆشە، ئەوە ئەو وەكالەتە دروستە و ئەو تەسەڕوفەی ئەیكا لەسەر بڕیاری كابرا، دروستە و غەیری ئەوە، بەتاڵە. ئەگەر یەكێك بە كەسێكی وت: وا تۆم كرد بە وەكیل بۆ فرۆشتنی فڵانەشت و هەروەختێك عەزلم كردی هەر وەكیلم بی، ئەوە وەكالەتەكەی ئێستە دروستە، بەڵام لە گەڕانەوەی وەكالەتەكەدا پاش عەزلكردنی، دوو قسە هەیە؛ راستتریان ئەوەیە نابێتەوە بە وەكیل.

## هەندێك لە حوكمەكانی وەكیل

كەسێك كە وەكیل بێ بۆ فرۆشتنی ماڵێك و وەكالەتەكەی بێ‌قەید و شەرت بێ، دروست نییە ماڵ بفرۆشێ بە غەیری پارەی نەختینەی ئەو وڵاتەكە رێگای دراوە ماڵی تیا بفرۆشێ؛ هەروەها، ناتوانێ، بە قەرز یا بە زەرەری زۆر بیفرۆشێ؛ ئەگەر هاتو بە جۆرێك لەمجۆرانە ماڵەكەی فرۆشت، ئەوە ئەو فرۆشتنە بەتاڵە وە ئەگەر ماڵە فرۆشراوەكەی تەسلیم كردبوو بە كابرای كڕیار، ئەوە ئەبێ بە زامنی ئەو ماڵە.

ئەگەر كەسێك شەخسێكی كرد بە وەكیل لە فرۆشتنی ماڵێكدا بە قەرز و وادەی قەرزەكەی مەعلووم كرد، ئەوە باشە وە ئەگەر وەعدەكەی مەعلووم نەكرد، ئەوە دروستە، بەڵام پێویستە وەكیلەكە تەماشای ئوسوولی ئەو وڵاتە بكا بۆ وەعدەی ماڵ فرۆشتن؛ مەسەلا، ئەگەر ئوسوول وابوو شت بە وەعدەی نوخشەی گەنمو جۆ ئەفرۆشرا، نابێ ئەم وەكیلە لەو وەعدەیە زیاتر دابنێ وە ئەگەر لەو وڵاتەدا ئوسوولێكی تایبەتی نەبوو بۆ وەعدەدانان، ئەوە پێویستە ئەم وەكیلە وەعدەیەك دابنێ كە قازانجی ئەو كەسەی تیابێ كە ئەمی كردووە بە وەكیل.

دروست نییە بۆ ئەو كەسەی كە كراوە بە وەكیل بۆ فرۆشتنی ماڵێك ئەو ماڵە بفرۆشێ بە خۆی یا بە منداڵی نابالغی خۆی، یا بە كوڕی سەفیهی، لەبەرئەوەكە لەمسوورەتانەدا هەرخۆی ئەیفرۆشێو هەرخۆی قەبووڵی بەیعەكە ئەكا و ماڵفرۆشو ماڵكڕ ئەبن بە

یەك كەس، ئەمەش بەتاڵە[1]؛ بەڵام فەرموودەی راستتر ئەوەیە ئەتوانێ ئەو ماڵە بفرۆشێ بە باوكی یا بە كوڕی باڵغ و خاوەن روشدی، هەروەها بە خزمانو دو ستانی، چونكە مادام پێویستە ماڵەكە بە قیمەتی عادەتی بفرۆشێ، ئیتر مەیدانی گومانی خراپ بەو وەكیلە نامێنێ. فەرموودەی راستتر، ئەوەیە دروستە بۆ وەكیلی ماڵ فرۆشتن، قیمەتی ئەو ماڵە وەربگرێ لە ماڵەكڕەكەو ماڵەكەی تەسلیم بكا، بەڵام ناتوانێ ماڵەكە تەسلیم بكا تا قیمەتەكەی وەرنەگرێ وە ئەگەر لەپێش وەرگرتنی قیمەتەكەدا ماڵەكەی تەسلیم كرد، ئەبێ بە زامنی قیمەتەكە. ئەگەر كەسێك شەخسێكی كرد بە وەكیل بۆ ماڵ كڕین و بە لەفز پێی وت: ماڵی بێ‌عەیبم بۆ بكڕە، ئەوە بەقەتعی دروست نییە ماڵی عەیبداری بۆ بكڕێ، وە ئەگەر ماڵی عەیبداری بۆ كڕی، بەیعەكە بەتاڵە وە ئەگەر هەر وتی: ماڵم بۆ بكڕە، ئەوە نابێ وەكیلەكە ماڵی عەیبداری بۆ بكڕێت؛ جا ئەگەر هاتو ماڵی عەیبداری كڕی، خواه ئەو ماڵە بە عەیبەكەیەوە ئەو قیمەتە بكا یا نەیكات؛ مادام وەكیلەكە بە عەیبەكە نەزانێ، ئەوە ئەو ماڵە دائەمەزرێ بۆ وەكیل‌گرەكە؛ جا ئەگەر ئەو ماڵە بە عەینی ماڵی وەكیل‌گرەكە كڕرابوو، ئەوە هەر بۆ ئەو دروستە ئەو ماڵە عەیبدارە بداتە دواوە وە ئەگەر بە ماڵێك كڕرابوو كە لە ئەستۆدابوو، ئەوە بۆ ئەویش‌و بۆ وەكیلەكەیشی دروستە بیدەنە دواوە وە ئەگەر وەكیلەكە بە عەیبەكەی زانیبوو، ئەوە ئەو فرۆشتنە هەر بۆ نەفسی وەكیلەكە دائەمەزرێ‌و حەقیشی نییە بیداتە دواوە بۆ سەر خاوەنەكەی، چونكە بە عەیبەكەی زانیوەو كەمتەرخەمی تیا كردووەو كڕیویەتی.

هەركەسێ كرابوو بە وەكیل لەسەر ئیشێك كە قابیل بوو خۆی بیكا، دروست نییە بە بێ‌ئیجازەی ئەو كەسەی كردوویە بە وەكیل، وەكیل بگرێ بۆ جێ‌بەجێ كردنی ئەو ئیشە، مەگەر ئیشەكە ئەوەندە زۆر بێ بەتەنها خۆی نەكرێ، ئەوكاتە دروستە وەكیل بگرێ لەو ئیشانەدا كە خۆی فریایان ناكەوێ وە ئەگەر ئەو ئیشە قابیل نەبوو بۆ ئەو وەكیلە لەبەر ئەوەكە نەیئەزانی یاخود لایقی شانی نەبوو، ئەوە دروستە وەكیل بگرێ،

---

١. مەگەر لەشوێنێكا كە وەلی‌ئەمری منداڵەكە لەلایەن خۆیەوە ئەسیل‌و لەلایەنی منداڵەكەوە وەلی‌ئەمر بێ.

چونکە بەپێی عورفو عادەت، مەبەست لە وەکیلیوا ئەوە نییە خۆی ئەو ئیشەبکا، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە وەکیلی بۆ بگرێو خۆی تەماشای بکا وە ئەگەر وەکیلگرەکە ئیزنی وەکیلەکەیدا وەکیل بگرێ، تەماشا ئەکەین، ئەگەر وتبووی وەکیل بگـرە بـۆ خۆت، ئەوە ئەوکەسەکە ئەگیرێت بە وەکیل، وەکیلی وەکیلەکەیە، هەرکاتێ ئارەزووی لێبوو ئەتوانێ عەزلی بکا و هەروەختێ ئەم خۆی عەزل بکرێ، ئەویش عەزل ئەبێ، چونکە فەرع تابیعی ئەسڵە وە ئەگەر وتبووی وەکیل بگرە بۆ من، یا هەر وتبووی وەکیل بگرە، ئەوە لەم سوورەتەدا، هەر وەکیلێك بگرێ، وەکیلی کابرای وەکیلگری یەکەمە و ئەم دوو وەکیلە هیچکامیان ناتوانێ ئەویان عەزل بکا و هـیچکامیان بـە عـەزلبوونی ئەویان عەزل نابێ.

لە هەرکاتێکدا دروست بێ وەکیلبگرێ، شەرتە کە ئەم وەکـیلەیش ئـینسانێکـی ئەمینو کارلێهاتوو بێ، مەگەر وەکیلگری یەکەم کەسێکی تایبەتی دیاری بکا بۆی، ئەوە دروستە بیگرێ بە وەکیل، هەرچەند نائەمینیش بێ، مەگەر لەکاتێکا ئەم شەخسە دڵنیابێ لەوە کە ئەوکابرا دیاری کراوە، نائەمینو پیاوخراپەو وەکیلگری یەکەم بەوەی نەزانیبێ، لەمحاڵەتەدا، تا خەبەر نەدا بەو، دروست نییە بیکا بە وەکیل، چونکە وادیارە کە وەکیلگری یەکەم بەم نائەمینییەی ئەم شەخسەی نەزانیوە و لەسوورەتێکا پیاوێکی ئەمینو پاکی کرد بەوەکیل، لەپاشا فاسقی بەسەراهات یا نەئەمینی لێدەرکەوت، ئەوە ئەگەر وەکیلی خوێەتی، ئەتوانێ ـبەڵکوو واجبە ـ لەسەری گورج عەزلی بکـات وە ئەگەر لەلایەنی وەکیلگری یەکەمەوە کردبووی بە وەکیل، ئەوە بە بێئیزنی ئەو ناتوانێ عەزلی بکات.

## باسی هەندێك حوکمی وەکالەت

ئەگەر کابرای وەکیلگر، وتی بە وەکیلەکەی: ماڵ بفرۆشە بە فڵانکەس، یاخود لە فڵان وەختدا یا لە فڵان شوێنا ماڵ بفرۆشە، ئەوە شەرتە ئەو وەکیلە لەسەر فەرمانی ئەو کەسە بجووڵێتەوە و هەر تەسەڕوفێك بە پێچەوانەی قسەی ئەوەوە بکا، بەتاڵە. ئەگەر

وتی: ئەو ماڵە بفرۆشە بە دە دینار، دروست نییە بە کەمتر بیفرۆشێ، بەڵام دروستە بە زیاتر بیفرۆشێ، مەگەر بەتایبەتی مەنعی کردبێ لەوە. ئەگەر وتی: بەم دینارە مەڕێك بکڕە کە سیفەتی وەها بێ، ئەوە دروست نییە مەڕێك بکڕێ ئەو سیفەتەی تیا نەبێ؛ جا ئەگەر مەڕێکی کڕی کە ئەو سیفەتەی تیابوو، ئەوە باشە وە ئەگەر بەو دینارە دوو مەڕی لەسەر ئەو سیفەتە کڕی، ئەگەر هیچ کامیان یەکە یەکە، دینارێك نەئەژیان، ئەوە ئـەو فرۆشتنە بەتاڵە وە ئەگەر یەکێکیان دینارێك ئەژیاو ئەویان کەمتر، یاخود هەردووکیان یەکی دینارێك ئەژیان، ئەوە فەرموودەی راستتر، ئـەوەیە ئـەو فـرۆشـتنە دروسـتەو دائەمەزرێ بۆ وەکیلگرەکە، چونکە مەبەستەکەی هاتووەتەدی بەزیادەوە وە ئەگـەر کەسێك ماڵێکی دیاری کراوی تەسلیمی وەکیلەکەی کردو فەرمانی پێدا حەیوانێکی پێبکڕێو بەیانی سیفاتی ئەو حەیوانەی بۆکرد، ئەویش ئەو حەیوانەی بە ماڵێك کڕی لە ئەستۆی خۆیدا، یاخود فەرمانی پێدابوو حەیوانێك بکڕێ بە قیمەتێك لەئەستۆی خۆیدا ئەوسا عەینەکە بدا بە فرۆشیارەکە، ئەویش بەوماڵە دیاری کراوە حەیوانەکەی کڕی، ئەوە لە هەردوو سوورەتەکەدا، ئەو فرۆشتنە دانامەزرێ بۆ وەکیلگرەکە، بەڵام لەسوورەتی یەکەمدا، ئەگەر وەکیل نیازی کڕینی هەبوو بۆ خۆی، ئەوە دائەمەزرێ بۆ خۆی.

هەرکاتێك وەکیل بەپێچەوانەی مووەکیلەکەی جووڵایـەوە لە فـرۆشـتنی مـاڵیـا؛ مەسەلا، ئەو وتی: ئەو ئەسپەم بۆ بفرۆشە بە دە دینار، کەچی ئەم بە هەشت دیـناری فرۆشت، یاخود ئەو وتی: بەم عەینە بیکڕە، کەچی ئەو بەقیمەتێك کڕی لە ئەستۆیدا، ئەوە تەسەڕوفی وەکیلەکە بەتاڵە؛ بەڵێ، لەسوورەتی موخالەفەکردنی عەیندا، بەئەستۆ کڕینەکە دائەمەزرێ بۆخۆی، خواه ناوی ئەوکەسە بباکە کردوویەتی بە وەکیل یا نە و ناوبردنەکەی ئەو بەهیچ دەرئەچێ، لەبەر ئەوەکە لەئەساسدا ناوبردنی وەکیلگر شەرت نییە بۆ دامەزرانی موعامەلە و مادام بە پێچەوانەی ئیزنی ئەو موعامەلەی کردووە، بۆ ئەو دانامەزرێ؛ بەڵێ لە هەندێ شوێندا پێویستە وەکـیل نـاوی وەکـیلگر بـبا، وەك لەشوێنێکا کە بیکا بە وەکیل بۆ قەبوولێ هیبە یا وەقف یا نەزر یا وەسیەت یا عاریە؛

مەسەلا، كابرا ئەڵێت: وا ئەو شتەم بەخشی یا وەقفم كرد یا نەزرم كرد لە فڵانكەس، وەكیلەكەیش بڵێت: وا قەبووڵم كرد بۆی، ئەگەر هاتو ناوی نەبرا، بەتاڵە مەگەر هەردووكیان نیازی ئەو كەسەیان بێ.

پێویستە بۆ دروستبوونی فرۆشتن لەگەڵ وەكیلدا و بۆ دامەزرانی بۆ وەكیلگرەكە، كابرای فرۆشیار قسە لەگەڵ وەكیلەكەدا بكا، و وەكیلەكەیش لەكاتی قەبوولا ناوی ئەو كەسە بباكە كردوویەتی بە وەكیل یاخود نیازی ئەوی بێ؛ تەفسیلی ئەمباسە، ئەوەیە كە موعامەلە لەگەڵ وەكیلدا چەند سوورەتی هەیە:

یەكەم، ئەوەیە هەردوولایان ناوی وەكیلگرەكە ببەن، فرۆشیار بڵێت: وا ئەمماڵەم فرۆشت بە تۆ بۆ فڵانكەس، ئەویش بڵێت: وا قەبووڵم كرد بۆ فڵانكەس؛

دووهەم، ئەوەیە هیچكامیان ناوی نەبەن، بەڵام هەردووكیان نیازی ئەویان هەبێ، وەك ئەوەكە فرۆشیار بڵێت: وا ئەمماڵەم فرۆشت پێت، ئەویش بڵێت وا قەبووڵم كرد و هەردوولا نیازی كەسێكی تایبەتیان بێ؛

سێهەم، ئەوەیە فرۆشیار ناوی بباو وەكیل نیازی ئەوی بێ، وەك ئەوەكە فرۆشیار بڵێت: ئەم ماڵەم پێ فرۆشتی بۆ فڵانكەس، وەكیلیش بڵێ: وا قەبووڵم كرد؛

چوارەم، ئەوەیە فرۆشیار ناوی كابرا ئەباو وەكیل ناوی ناباو نیازی كەسیشی نییە، یەعنی قەبووڵەكەی موتڵەقە؛

پێنجەم، ئەوەیە فرۆشیار ناوی نابا، بەس نیازی ئەوی هەیە،بەڵام وەكیل ناوی ئەبا، وەك ئەوە كابرا ئەڵێ: وا ئەم ماڵەم فرۆشت پێت. و وەكیلەكە ئەڵێ: قەبووڵم كرد بۆ فڵانكەس؛

شەشەم، ئەوەیە فرۆشیار نیازی وەكیلگرەكەی بێ و وەكیل، قەبووڵەكەی موتڵەق بێ؛ لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، ئەو موعامەلەیە دائەمەزرێ بۆ وەكیلگرەكە؛

حەوتەم، ئەوەیە فرۆشیار ناوی وەكیلگر بباو وەكیل ناوی خۆی ببا؛

هەشتەم، ئەوەیە فرۆشیار ناوی وەكیلگر بباو وەكیل نیازی خۆی بێ؛

نۆهەم، ئەوەیە فرۆشیار نیازی وەكیلگرەكەی بێو وەكیل ناوی خۆی ببا؛

دەهەم، ئەوەیە فرۆشیار نیازی وەکیلگرەکەی ببێ‌و وەکیل ناوی کەس نەباو نیازی خۆی ببێ؛ لەم چوار سوورەتەیشدا، بەیعەکە بەتاڵە؛ هەروەها، لە هەموو سوورەتێکا کە جیاوازی ببێ لە بەینی فرۆشیارو وەکیلدا لە ناوبردنی شەخسدا یا لەنیازدا، بەیعەکەهەر بەتاڵە؛

یازدەهەم، ئەوەیە کە هیچیان ناوی کەس نەبەن‌و نیازی کەسیشیان نەبێ؛ مەسەلا، فرۆشیار بڵێ: وا ئەم‌ماڵەم فرۆشت پێت و وەکیلەکە بڵێ: وا قەبووڵم کرد؛

دوازدەهەم، ئەوەیە فرۆشیار نیازی وەکیلەکەی ببێ‌و وەکیل نیازی کەسی نەبێ و هەر بە موتڵەقی قەبووڵی بکا؛

سیانزەهەم، ئەوەیە فرۆشیار نیازی کەسی نەبێ، بەڵام وەکیلەکە نیازی خۆی ببێ؛ لەم سێ سوورەتەیشدا، ئەو بەیعە لەسەر زاهیری لەفزەکە هەر بۆ وەکیلەکە دائەمەزرێ وە ئەگەر فرۆشیارەکە قسەی لەگەڵ وەکیلەکەدا نەبوو؛ مەسەلا وتی وا ئەم ماڵەم فرۆشت بە وەکیلگرەکەت و وەکیلەکەیش وتی: وا قەبووڵم کرد، یا وتی: قەبووڵم کرد بۆ ئەو، ئەم سوورەتەیش بەتاڵە، چونکە رووی قسە نەکراوەتە کڕیارەکە.

بزانن! دەستی وەکیل بەسەر ئەو عەینەی بەلایەوەیە، دەستی ئەمانەتە، خواه بە کرێ وەکالەت بکا یا بە خۆڕایی؛ کەواتە، ئەگەر ئەو عەینە فەوتا بەلایەوە بە بێ‌قوسووری ئەو، ئەوە نابێ بە زامن وە ئەگەر قوسووری هەبوو، ئەوە ئەبێ بە زامن، وەکوو زەمانەتی ماڵی زەوتکراو، بەڵام لە وەکالەتەکەیش عەزل نابێ؛ بەقوسوور دائەنرێ ئەمە کە ئەو ماڵە بفەوتێ‌و وەکیلەکە نەزانێ چۆن فەوتاوە یاخود لەبیری چووبێ‌و فەوتابێ، چونکە ئەمە لەبەر کەمتەرخەمی ئەو بووە؛ هەروەها، بە دەس‌درێژی‌و قوسوور دائەنرێ ئەمە کە سواری ئەو وڵاخە ببێ کە پێی‌دراوە بیفرۆشێ، یا ئەو جلەی کە بردوویە بیفرۆشێ بیکاتەبەری؛ بەڵێ، ئەگەر کابرای خاوەن ماڵ رێگای دابوو، یاخود عادەتی وڵات وابوو کە وەکیل سواری ئەو وڵاخە ببێ، یاخود ئەو جلە بکاتە بەری، وەکوو دەلاڵ سواری ئەسپی فرۆشتەنی ئەبێ یا پاڵتۆی فرۆشتەنی ئەکاتەبەری، ئەوە ئەو بەکارهێنانە بە قوسوور و دەس درێژی ناناسرێ.

بێداربن! عەزل نەبوونی وەكیل لەبەر خەیانەت، بەسراوە بەوەوە كە وەكیلی «ولي أمر»ی هەتیوو منداڵی ورد، یاخود وەكیلی «وصيّ» نەبێ، ئەگینا فەرموودەی راستتر، ئەوەیە كە وەكیلی ئەوانە بە خەیانەت كردن لە وەكالەت ئەكەوێ، وەك «ولي أمر»ەكەو «وصي»ەكە خۆیان چۆن بە خەیانەت كردن لە وەكالەت ئەكەون.

بزانن! ئەحكامی ئەو عەقدەی كە وەكیل ئەیكا، بەسراوە بە وەكیلەوە؛ مەسەلا، چاوپێ كەوتنی ماڵی فرۆشراو و دامەزرانی عەقدەكە بە جیابوونەوەی عەقدكەرەكان لە یەكتر لە مەجلیسی موعامەلەدا و حەق‌وەرگرتنی هەردوولایان لە مەجلیسی موعامەلەدا؛ ئەگەر عەقدەكە بۆ شتێك بێ كە سوودی تیابێ لەلایەنی وەكیلەوە، بەسراوە بە شەخسی وەكیلەوە.

كاتێ كە وەكیل ماڵێكی كڕی، ئەوە ئەگەر وەكیل‌گرەكە قیمەتەكەی تەسلیم كردبێ، فرۆشیار داوای ئەو قیمەتە لە وەكیلەكە ئەكا وە ئەگەر قیمەتەكەی تەسلیم نەكردبێ، ئەوە ئەگەر قیمەتەكە دیاری كرابوو، داوای لە وەكیل‌گرەكە ئەكا وە ئەگەر لەئەستۆدا بوو و فرۆشیار ئینكاری وەكالەتی ئەو شەخسەی ئەكرد، یا ئەیوت: نازانم بە وەكالەتەكەی، ئەوە هەر داوای لە وەكیلەكە ئەكاو ئەگەر ئاگای لە وەكالەتەكەی هەبوو، ئەتوانێ داوای بكا لە وەكیل‌و لە وەكیل‌گریش و لەم‌وەختەدا، وەكیلەكە وەكوو زامن و وەكیل‌گرەكە وەكوو ئەسیل وایە، یەعنی ئەگەر وەكیلەكە قیمەتەكەی دا بە فرۆشیار، ئەتوانێ بگەڕێتەوە بۆسەر وەكیل‌گرەكەو پارەكەی لەو بستێنێ. ئەگەر وەكیل ماڵێكی فرۆشت‌و پارەكەی وەرگرت، كەچی ماڵەكە بە موڵكی غەیر دەرچوو، ئەوە كابرای كڕیار ئەتوانێ داوای ئەو پارەیە لە وەكیلەكە یا لە وەكیل‌گرەكە بكا، هەرچەند دانیش بنێ بە وەكالەتەكەیدا؛ جا ئەگەر وەختی خۆی پارەكەی دابوو بە وەكیل‌گرەكە، ئێستە ئەتوانێ ئەو پارەیەی داویە بە كڕیارەكە وەری‌بگرێتەوە لە وەكیل‌گرەكە.

## هەندێك[ی تر] لە حوكمەكانی وەكالەت

وەكالەت، ئیختیارییە لە هەردوولاوە؛ كەواتە، هەموو كاتێك وەكیل‌گر ئەتوانێ وەكیلەكەی عەزل بكا، هەروەها وەكیلیش ئەتوانێ خۆی عەزل بكا؛ جا ئەگەر وەكیل‌گر

وەکیلەکەی عەزل کرد، ئەوە هەر بە وتنی لەفزی عەزلکردنەکە عەزل ئەبێ، خواه خۆی لەویا بێ یا لەویا نەبێ و هەر تەسەڕوفێك بکا لەپاش عەزل کردنەکەی، بەتاڵەو دانامەزرێ؛ بەڵام قازی دادگای ئایین، هەرچەند خەلیفەی موسوڵمانانیش عەزلی بکا، تا خەبەری عەزلەکەی پێنەگا عەزل نابێ و لەوبەینەدا هەر حوکمێکی دەرکردبێ، دروستو دامەزراوە.

هەروەها، وەکالەت تێك ئەچێ بەوەکە وەکیلو وەکیلگر یەکێکیان لەوە بکەون کە لایقی تەسەڕوف کردن بن لە ماڵی خۆیانا بەهۆی مردنەوە یا بەهۆی شێتییەوە، هەروەها بەهۆی بێهۆشی یەکێکیانەوە، بەو شەرتە کە ئەو بێهۆشییە ئەوەندە ماوەی بەسەرا هاتبێ نوێژی وەختێکی پێ بچێ. ئەگەر کەمتر بوو لەوە، نابێ بەهۆی عەزلبوونی وە تەسەڕوفاتی وەکیل بە دروستی ئەمێنێتەوە.

هەروەها، وەکالەت تێكئەچێ بەهۆی ئەوەوە ئەو شتە کە وەکیل گیراوە بۆ تەسەڕوف تیاکردنی، لە تەسەڕوفی وەکیلگرەکە دەربچێ؛ مەسەلا، کابرای وەکیلگر ئەو ماڵە بفرۆشێ یا وەقفی بکا یا بیدا بە کرێ یا نەزری بکا لە کەسێك، بەڵام وەکالەت بەتاڵ نابێتەوە بەوە کە وەکیلەکە ئینکاری وەکالەتی خۆی بکا لەبەرئەوە کە لەبیری چووبێ یا لەبەر مەبەستێکی عەقڵگرتوو؛ بەڵێ، ئەگەر بە دەسەنقەست بە بێمەبەست، ئینکاری وەکالەتەکەی خۆی کرد، ئەوە وەکالەتەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە.

هەرکاتێك وەکیلو وەکیلگر ناکۆکییان کەوتە بەین لە ئەسڵی وەکالەتەکەدا؛ مەسەلا، وەکیلەکە وتی: من وەکیلی تۆمو وەکیلگر ئینکاری کرد، یا لە سیغەی وەکالەتەکەدا؛ مەسەلا، وەکیلەکە وتی، من وەکیلی تۆم بۆ ئەوە ئەسپەکەت بفرۆشم بە دە دینار بە قەرز، ئەویش وتی: وەکیل بووی بۆ ئەوە بە پارەی حازر بیفرۆشی، ئەوە لەمسوورەتانەدا، وەکیلگرەکە سوێند ئەدرێو باوەڕی پێئەکرێ.

ئەگەر کەسێك ئەسپێکی کڕی بە بیست دینار و وتی: وەکیلگر ئەمری کردووە پێم، ئەویش وتی: من وتوومە بە دە دینار بیکڕێت و سوێندی خوارد، ئەمە ئەگەر ئەم ئەسپەی بە عەینی ماڵی وەکیلگرەکە کڕیوە وە لە عەقدەکەدا ناوی بردووە، یا لەپاش

عەقدەکە وتبووی: بۆ فلانکەسم کڕیوە و ماڵەکە ماڵی ئەوە و فرۆشیارەکەیش باوەڕی پێ کرد، ئەوە لەم سوورەتەدا، بەیعەکە بەتاڵە وە ئەگەر فرۆشیارەکە باوەڕی پێ نەکرد، پێویستە سوێند بخوا لەسەر ئەوە کە ئاگای لە وەکالەتەکە نییە؛ جا مادام سوێندی خوارد، ئەو بەیعە دائەمەزرێ بۆ وەکیلەکە؛ هەروەها، ئەگەر بە قیمەتێك کڕیبێتی لەئەستۆداو ناوی وەکیلگرەکەی نەبردبێ، یا ناوی بردبێ، بەڵام فرۆشیار بڵێ: ناوت نەبردووەو سوێند بخوا، ئەوە هەر بۆ وەکیلەکە دائەمەزرێ وە ئەگەر باوەڕی پێ کرد کە ماڵەکەی بۆ وەکیلگرەکە کڕیوە، ئەوە لەم سوورەتەدا، بەیعەکە بەتاڵە، چونکە فرۆشیارەکە باوەڕی پێ ئەکا کە ئەو موعامەلەیەی بۆ وەکیلگرەکە کردووە؛ جا هەرکاتێك حوکمکرا بەوەکە ئەو بەیعە دامەزراوە بۆ وەکیلەکە، سوننەتە قازی بە خۆشی بڵێت بە وەکیلگرەکە: مادام وایە، تۆ بڵێ بە وەکیلەکەت، ئەگەر وەکیلی منیش بووبێ و من ئەمرم کردبێ پێت بیکڕی بە بیست دینار، وا پێم فرۆشتیتەوە بەو بیست دینارە و وەکیلەکەیش قەبووڵی ئەو بەیعە بکا، بۆ ئەوە لە واقیعدا ببێ بە ماڵی وەکیلەکە وە ئەگەر وەکیلەکە وتی: ئەو تەسەڕوفەی کردوومە لەو ماڵەدا بە ئیزنی تۆ بووە و وەکیلگرەکە ئینکاری کرد، ئەوە باوەڕ بە وەکیل گرەکە ئەکرێ بە سوێند، بەڵام قسەی وەکیلەکە قەبووڵ ئەکرێ لە ئیددیعای فەوتانی ئەو ماڵەدا کە تیایا کراوە بە وەکیل، هەروەها لە ئیددیعای ناردنەوەیا بۆلای وەکیلگرەکە وە ئەگەر ئیددیعای کردو وتی: داومەتەوە دەستی ئەو شەخسەی ناردبووت و ئەو شەخسە ئینکاری کرد، ئەوە تەسدیقی ئەو شەخسە ئەکرێ بە سوێند و واجب نییە لەسەر وەکیلگرەکە باوەڕ بکا بە وەکیلەکەی لە دانەوەیدا بەوکەسەی کە ناردوویەتی بۆلای؛ کەواتە، واجبە بە شاهید ئیسپاتی بکا کە دوایەتە دەستی، ئەگینا کاتێ کە فروستادەکە سوێندی خوارد، ئەبێ بیبژێرێ بۆ وەکیلگرەکە.

وە ئەگەر وکیلەکە وتی: ماڵەکەم فرۆشتووەو پارەکەم وەرگرت، بەڵام فەوتا و وەکیلگر وتی: نەخەیر پارەکەت وەرنەگرتووە، ئەمە، ئەگەر لەپێش تەسلیمکردنی ماڵە فرۆشراوەکەدایە بەکڕیار، باوەڕ بە وەکیلگرەکە ئەکرێ، وە ئەگەر لەپاش تەسلیم کردنە بەو، باوەڕ بە وەکیلەکە ئەکرێ.

ئەگەر کەسێك یەکێکی کرد بە وەکیل بۆ دانەوەی قەرزێك و وەکیلەکە هاتەوەو وتی: قەرزەکەم دایەوە و خاوەن قەرزەکە ئینکاری کرد، ئەوە باوەڕ بە خاوەن قەرزەکە ئەکرێ بە سوێند. فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە واجب نییە وەکیلگر باوەڕ بە وەکیلەکە بکا لە ئیددیعای دانەوەی ئەو قەرزەدا، مەگەر دوو شاهیدی ببێ، یا شاهیدێکی ببێ و خۆیشی سوێندی لەگەڵ بخوا. هەروەها، ئەگەر «قَیِّم» ئیددیعای کرد کە لەپاش بالغبوونی هەتیوەکان، ماڵەکەم داونەتەوە، ئەوە واجبە ئیسپاتی بکا بە شاهید، چونکە ئەسڵ ئەوەیە تەسلیمی نەکردبنەوە و بەزەیی و میهرەبانی «قَیِّم»، بە هیچ جۆرێ ناگا بە میهرەبانی باوك‌و باپیرەی ئەو منداڵە تا بە بێ‌شاهید باوەڕی پێ‌بکرێ.

دروست نییە بۆ وەکیل و بۆ هەرکەسێ ماڵێکی بە ئەمانەت لەلادانرابێ، لەو کاتەداکە خاوەن ماڵەکە داوای ماڵەکەی لێ بکاتەوە، بڵێ: بە بی ئەوە شاهیدت لەسەر بگرم، ماڵەت نادەمەوە؛ بەڵێ، دروستە بۆ کەسێك کە ماڵێکی زەوت کردبێ، هەرکاتێك خاوەن ماڵەکە داوای ماڵەکەی لێ کردەوە، ئەم قسەیە بکا، چونکە قسەی زەوتکەر لە دانەوەی ماڵە زەوتکراوەکەدا، جێگەی بڕوا نییە. هەروەها، دروستە بۆ کەسێك کە ماڵی بە رهن وەرگرتبێ، یا بە کرێی گرتبێ، یا خواست بێتی، ئەو ماڵە نەداتەوە بە خاوەنەکەی تا شاهیدی لەسەر نەگرێ، چونکە هەر کاتێك ئیددیعای دانەوەی ئەو ماڵە بکا، شەرع داوای شاهیدی لێ ئەکا.

ئەگەر کەسێك هات بە کەسێکی وت: فڵانکەس کردوومی بە وەکیل فڵانە قەرز یا فڵانە شت کە لەلاتە، وەریبگرم و بۆی بەرمەوە، ئەمە ئەگەر کابرا باوەڕی پێ کرد، دروستە بیداتە دەستی، بەڵام بە بێ ئەوە کە کابرای تر ئیسپاتی وەکالەتەکەی بکاو شاهید پیشان بدا، واجب نییە ئەم بیداتەوە. ئەگەر پێی وت: فڵانکەس حەواڵەی کردووم بۆسەر تۆ ئەو ئەندازە قەرزەی کە لەسەرتە بمدەیتەوە، کابرایش باوەڕی پێ کرد، ئەوە واجبە بیداتەوە؛ هەروەها، ئەگەر کەسێك هات وتی: بە تەنها من میراتگری فڵانکەسم و هاتووم بۆ ئەو قەرزەی لەسەرتە و کابرایش باوەڕی پێ کرد، ئەوە واجبە ماڵەکەی بداتە دەست.

## باسی پێ‌لێنان (إقرار)

پێ‌لێنان له شه‌رعا، بریتییه له‌وه که‌سێك پێ له حه‌قی که‌سێکی‌تر بنێ که له‌سه‌ری بێ؛ پێ‌لێنان، دروسته له هه‌ر که‌سێکه‌وه که رێگای ته‌سه‌روف کردنی نه‌گیرابێ، یه‌عنی ته‌کلیفی له‌سه‌ر بێ و خاوه‌ن روشد بێ، یاخود سه‌فیهی به‌ره‌ڵڵا (حیجر له‌سه‌ر دانه‌نراو) بێ؛ که‌واته، پێ‌لێنانی منداڵ و شێت، که‌ڵکی نییه؛ ئه‌گه‌ر ئه‌و منداڵه که پێ‌لێ‌ئه‌نێ، ئیددیعای کرد که باڵغ‌بووه به ئیحتیلام یا به‌که‌وتنه حه‌یز و له ته‌مه‌نێکدا بوو که بۆ ئه‌وه ده‌ستی ئه‌دا ئینسانی تیا باڵغ ببێ به ئیحتیلام و حه‌یز، ئه‌وه به بێ‌سوێند باوه‌ڕی پێ‌ئه‌کرێ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئیددیعای ئه‌وه‌ی کرد که پانزه ساڵی ته‌واو کردووه، ئه‌وه ئه‌بێ به شاهید ئیسپاتی بکا.

پێ‌لێنانی نه‌فام و لات، له‌مه‌وپێش باس‌کرا. دروسته پێ‌لێنانی نه‌خۆش له نه‌خۆشی مردنیا به‌وه که عه‌ینێکی لایه یا قه‌رزێکی له‌سه‌ره هی که‌سێکی بێگانه؛ که‌واته، پاش مردنی، ئه‌و عه‌ینه ئه‌درێته‌وه به‌و که‌سه که ئه‌و وتوویه هی ئه‌وه و قه‌رزه‌که‌ش له میراته‌که‌ی جێ به جێ ئه‌کرێ و ئه‌درێته‌وه به خاوه‌ن قه‌رزه‌که؛ به‌ڵێ، دروسته میراتگره‌کان سوێندی ئه‌و که‌سه بده‌ن له‌سه‌رئه‌وه که موسته‌حه‌قی ئه‌و عه‌ینه یا ئه‌و قه‌رزه‌یه؛ هه‌روه‌ها، دروسته پێ‌لێنانی نه‌خۆش به عه‌ینێك یا به‌قه‌رزێك بۆ یه‌کێك له میراتگره‌کان، هه‌رچه‌ند میراتگره‌کانی‌تر باوه‌ڕی پێ‌نه‌که‌ن، ئه‌وه‌نده هه‌یه ئه‌توانن سوێندی بده‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه که موسته‌حه‌قی ئه‌و شته‌یه پێی‌لێ‌نراوه بۆی. به پێ‌لێنان دائه‌نرێ بۆ میراتگر ئه‌مه که ژنی نه‌خۆش پێ له‌وه بنێ که وه‌ختی خۆی ماره‌ییه‌که‌ی وه‌رگرتووه له مێرده‌که‌ی. ئه‌گه‌ر که‌سێك له ساغیدا یا له‌نه‌خۆشیدا پێی له قه‌رزێك نا بۆ یه‌کێك و میراتگریش له‌پاش مردنی کابرا پێی له قه‌رزێك نا بۆ که‌سێکی‌تر، ئه‌وه ئه‌و دوو حه‌قه وه‌کوو یه‌کن و پێ لێنانی کابرا ناخرێته پێش پێ‌لێنانی میراتگره‌که، چونکه میراتگر جێگه‌داری مردووه‌که‌یه. دروست نییه پێ‌لێنان به زۆر؛ که‌واته، ئه‌گه‌ر ئازاری موته‌هه‌مێك درا بۆ ئه‌وه که پێ‌لێ‌بنێ، ئه‌ویش له‌تاو ئازار، دانی به هه‌ندێ شتانا، ئه‌وه

ئەو پێ‌لێنانە بێ‌سوودە. بەشەرت گیراوە ئەوکەسەی ئیقرارەکەی بۆ ئەکرێ، تێکڕا بناسرێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك وتی: یەکێك لە خەڵکی ئەم شارە دینارێکی لامە، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵام ئەگەر وتی: یەکێك لەم دە کەسە دینارێکی لای منە، ئەوە دروستە، چونکە یەکێکی لەچەندکەسی لە ژمارە هاتوو، تێکڕا دیارە. هەروەها بەشەرت گیراوە ئەو کەسەی ئیقرارەکەی بۆکراوە، لایق بێ بۆ ئەوە ماڵەی بدرێتێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك ئیقراری کرد وتی: دە دیناری ئەو حەیوانەم لەسەرە، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: بەهۆی ئەو وڵاخەوە دە دینارم لەسەرە، ئەوە دروستەو مەعنای ئەوەیە کە ئەو وڵاخەی بەکرێ گرتووە و بەهۆی ئەوەوە، دە دیناری خاوەن وڵاخەکەی کەوتووەتە سەر. دروستە پێ‌لێنان بۆ مزگەوت‌و قوتابخانەو تەکیەو نەخۆش‌خانەو هەرجێگایەکی تر کە بۆ قازانجی گشتی دامەزرابێ وەك گۆڕستان و ئەو شتە پێ‌لێنراوە، سەرف ئەکرێ بۆ سوودی ئەو شوێنانە وە ئەگەر وتی: سکی ئەو ژنە دە دیناری لەسەرمە، ئەگەر بە موتڵەقی وتی، یاخود بەستی بە حاڵەتێکەوە کە ڕێی تێ‌بچێ؛ مەسەلا، بڵێت: بەهۆی ئەو قەرزەوە کە باوکی هەیەتی لەسەر من، دە دیناری کەوتووەتە سەرم، ئەوە دروستە وە ئەگەر بەستی بە حاڵەتێکی ناڕەواوە؛ مەسەلا، بڵێ: قەرزی لەسەرمە، ئەوە بەتاڵە. ئەگەر کەسێك ئیقراری کرد بە عەینێك یا بە قەرزێك بۆ کەسێك، ئەویش خستیەوە بەدرۆدا، ئەوە ئەو ماڵە لەلای ئیقرارکەرەکە ئەهێڵرێتەوە؛ جا ئەگەر پەشیمان بووەوە لە ئیقرارەکەی‌و وتی: بە هەڵەدا چووبووم لەو ئیقرارەدا و ئەو ماڵە هەر ماڵی خۆمە، ئەوە قسەکەی قەبووڵ ئەکرێ‌و ماڵەکە بە ماڵی ئەو ئەناسرێ وە ئەگەر ئیقرار بۆکراوەکە پەشیمان بووەوە لە ئینکارەکەی و شاهیدی هێناکە ئەو ماڵە ماڵی خۆیەتی، لێی قەبووڵ ناکرێ؛ بەڵێ، لەم شوێنەدا «علي الشّبراملسي»، فەرموویەتی: بەقیاس لەسەر هاوچەشنی ئەم مەسئەلەیە، ئەگەر کابرا بیانوویەکی عەقڵ گرتووی هێنایەوە بۆ ئینکارەکەی، ئەوە وادیارە لێی قەبووڵ ئەکرێ‌و ماڵەکە بە هی ئەو ئەناسرێ.

## باسی سیغەی پێ‌لێنان (إقرار)

شەرتە بۆ پێ‌لێنان لەفزێكی وەها كە ئەوە بگەیەنێت ئەو كەسە عەینێك یا ماڵێكی كەسێكی دیاری لەسەرە، هەروەهایە نووسینیش لەگەڵ نییەتدا؛ كەواتە، ئەگەر بلێ: گومانم‌وایە فلانكەس دینارێكی لەسەرمە، ئەوە بەتاڵە، بەڵام ئەگەر بلێ: شەهادەت ئەدەم یا ئەزانم فلانكەس دینارێكی لەسەرمە، ئەوە پێ‌لێنانە. جا ئەگەر بلێ: لەلامە یا بەلامەوەیە، ئەوە پێ‌لێنانە بە عەین و ئەگەر بلێت: لەسەرمە یا لە گەردنمایە، ئەوە بۆ شتێكە لەئەستۆدا بێ. ئەگەر كەسێك وتی بە كەسێكی‌تر: دە دینارم لەسەرتە، ئەویش وتی: كێشانەی بكە، یا: وەری‌بگرە یا: بیكەرە كیسەكەتەوە، ئەوە بەتاڵە، بەڵام ئەگەر وتی: بەڵێ، یا: راستە، یا: بەڵێ راستە، ئەوە پێ‌لێنانە وە ئەگەر وتی: راستەكەی لەسەرم بوو، بەڵام دامەوە، ئەوە پێ‌لێنانە لە حەقەكە، بەڵام بۆ دانەوەكەی پێویستی بە شاهیدە؛ جا ئەگەر شاهیدی بوو باشە وە ئەگەر شاهیدی نەبوو، كابرای پێ‌بۆلێ‌نراو، سوێند ئەخواكە وەری نەگرتووەتەوە، ئەوجا ئەتوانێ لێی بسێنێتەوە. ئەگەر كەسێك بە پرسیار، وتی: دە دینارم لەسەرت نییە؟ ئەویش، وتی: بەڵێ، ئەوە ئەبێ بە پێ‌لێنان؛ هەروەها، ئەگەر وتی: سبەینێ ئەتدەمەوە، یا: دوو رۆژ مۆڵەتم بدە، یا باشە با دانیشم، یاخود كیسەكەم بكەمەوە، یا: با كلیلی سندووقەكەم بدۆزمەوە، ئەبێ بە پێ‌لێنان.

## هەندێك لە شەرتەكانی پێ‌لێنان

شەرتە ئەو ماڵەی كە كابرای پێ‌لێنەر پێی لێ‌ئەنێ، موڵكی كابرای پێ‌لێنەر نەبێ؛ كەواتە، ئەگەر وتی: ئەم خانووە كە كڕیومە بۆخۆم لە فلانكەس، یا بەمیرات لە باوكمەوە بۆم‌هاتووەتەوە، ماڵی فلانكەسە، یا: ئەوقەرزەم كە لەسەر ئەحمەدە، هی مەحموودە، ئەوە بەتەنها ئەو قسەیە نابێ بە پێ‌لێنان، بەڵكوو بە «وەعدە» مەعنای لێ‌ئەدرێتەوە، چونكە زاهیری قسەكە لەگەڵ پێ‌لێنان ناگونجێ؛ بەڵێ، ئەگەر نیازی پێ‌لێنانی هەبوو، ئەوە بە پێ‌لێنان دائەنرێ، چونكە رێی تێ‌ئەچێ وەختی خۆی ئەو خانووەكە بەمیرات

بۆی هاتووەتەوە یا ئەو خانووە کە خۆی کڕیویەتی بۆخۆی، فرۆشتبێتی بە کابرای ئیقرار بۆکراو و بووبێ بە ماڵی ئەو، یاخود ئەو قەرزەی کە لەسەر ئەحمەد بوویەتی، نەزری کردبێ لە مەحموود و ئێستە لەسەر ئەو ئەساسە ئیقرار بکا؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: ئەم عەینە، ماڵی ئەحمەدە و موڵکی خۆم بوو تا ئەو کاتە کە پێم‌لێنا، ئەوە سەرەتای قسەکەی بە پێ‌لێنان دائەنرێ‌و ئەوی‌تری هیچ‌و پووچ‌و بەتاڵە.

هەرکاتێ کەسێك پێی‌لێ‌نا بە عەینێك بۆ کەسێك و ئەو عەینە لای خۆی بوو، ئەوە ئەبێ دەس‌بەجێ بیدا بەو کەسە وە ئەگەر لای نەبوو وە لەپاشا کەوتە دەستی، ئەوە لەو کاتەدا ئەیداتێ.

دروستە پێنان لە شتی نامەعلووم؛ جا ئەگەر کەسێك وتی: فڵانکەس شتێکی لەسەرمە، ئەوە پێنانە لەشتی نامەعلووم وە داوای روون کردنەوەی ئەو شتەی لێ ئەکرێ و بە هەرچی مەعنای لێ‌بداتەوە ـ هەرچەند کەمیش بێ ـ لێی قەبووڵ ئەکرێ، هەروا ئەگەر مەعنایشی لێ بداتەوە بە شتێکی‌وا کە لە جینسی ماڵ بێ، بەڵام قیمەتی نەبێ، وەك دەنکێکی گەنم، هەروا ئەگەر مەعنایشی لێ بداتەوە بە حەیوانێکی پیس یا بەشتێکی پیسی‌وا کە دروستبێ رابگیرێ، وەك سەگی پاس یا وەك تەپاڵە، بەڵام قەبووڵ ناکرێ مەعنای لێ‌بداتەوە بەشتێکی پیسی‌وا کە راگرتنی دروست نەبێ، وەك بەرازو سەگی بێ‌سوود، یاخود مەعنای لێ‌بداتەوە بە عەیادەتی نەخۆش، یا بە جوابی سەلام.

ئەگەر ئیقراری کرد بە ماڵ یا بە ماڵێکی گەورە یا زۆر، ئەوە قەبووڵ ئەکرێ مەعنای لێ‌بداتەوە بە ماڵێکی کەم، لەبەرئەوە کە ماڵی کەمیش بۆ حیسابی پاشەڕۆژ زۆرو گەورەیە، بەڵام قەبووڵ ناکرێ مەعنای لێ‌بداتەوە بە سەگ هەرچەند سەگی راویش بێ، یا بە تەپاڵە یا بە پێستی مردارەوەبوو ـ هەرچەند قابیلی دەباغی کردنیش بێ ـ چونکە ئەمانە ماڵ نین. ئەگەر وتی: فڵانکەس شتێ شتێکی لەسەرمە، ئەوە هەر بەتەنها یەك‌شت دائەنرێ وە ئەگەر وتی: شتێك‌و شتێکی لەسەرمە، ئەوە مەعنای لێ‌ئەدرێتەوە بە دووشت وە ئەگەر وتی: فڵانکەس هەزارو یەك لیرەی لەسەرمە، ئەوە لێی قەبووڵ ئەکرێ مەعنای هەزارەکە بە غەیری لیرە لێ بداتەوە، وەك دینار، بەڵام ئەگەر وتی: بیست‌و پینج لیرەی لەسەرمە، ئەوە هەمووی هەر بە لیرە ئەدرێتە قەڵەم.

ئەگەر کەسێك پێی‌نا لە چەند دەرمێك بۆ کەسێك و لەپاشا، وتی: ئەو درەمانەی کە پێم‌لێ‌نان، سەنگیان لە درەمی عادەتی کەمترە، ئەوە ئەگەر درەمی ئەو شوێنەی ئیقرارەکەی تیا کراوە سەنگی تەواو بێ‌و کابرا ئەم قسەیەی لەگەڵ ئیقرارەکەدا کردبێ، ئەوە قەبووڵ ئەکرێ وە ئەگەر ماوەیەك لەپاش ئیقرارەکە بوو، ئەوە قەبووڵ ناکرێ وە ئەگەر درەمی ئەو شوێنە سەنگی کەم بێ، ئەوە ئەم دەعوایەی لێ قەبووڵ ئەکرێ، چ لەگەڵ ئیقرارەکەدا بێ‌و چ لەپاش ئیقرارەکەبێ و ماوەی کەوتبێ، هەروەها ئەگەر لەپاش ئیقرار بەدرەمەکان، وتی: ئەو درەمانە هەموویان غەشیان تیابووە، ئەوە ئەگەر درەمی وڵاتەکە بێ‌غەش بێ، ئەم قسەیەی لێ قەبووڵ ئەکرێ، بەو شەرتە بەینی نەکەوێ لەگەڵ ئیقرارەکەدا، ئەگینا قەبووڵ ناکرێ وە ئەگەر درەمی ئەو وڵاتە غەشی تیابوو، ئەم دەعوایەی لێ قەبووڵ ئەکرێ هەرچۆن بێ. ئەگەر کەسێك وتی: فڵانکەس لە درەمێکەوە تا دە درەمی لەسەرمە، ئەوە پێی‌ناوە لە نۆ درەم وە ئەگەر وتی، فڵانکەس درەمێك لە دە درەمی لەسەرمە، ئەوە ئەگەر مەبەستی لێکدان «ضَرب» بێ بە ئوسوولی عیلمی حیساب، ئەوە پێ‌لێنانە بە دە درەم، ئەگینا پێ‌لێنانە بە تەنها یەك درەم.

## باسی هەندێك پێ‌لێنان (إقرار)

ئەگەر کەسێك وتی: فڵانکەس شمشێرێکی لامە لەکێلانایە، یاخود جلێکی لامە لەسندووقایە، ئەوە پێ‌لێنانە بۆ تەنها شمشێرەکەو تەنها جلەکە و پێ‌لێنان نییە بۆ کێلانەکەو سندووقەکەیش وە ئەگەر وتی: فڵانکەس هەیەتی لەلام وڵاخێك بە زینەوە، یا جلێکی قەیتان لێ‌دراو، ئەوە پێ‌لێنانە بۆ ئەسپەکەو زینەکەیش‌و بۆ جلەکەو قەیتانەکەیشی. ئەگەر وتی: هەزار دینار لە میراتی باوکم بۆ فڵانکەسە، ئەوە وەعدەیە بە بەخشینی هەزار دینار بەوکەسە و نابێ بەماڵی تا پێی نەبەخشێ. ئەگەر وتی: بۆ فڵان هەیە بەسەرمەوە درەمێك درەمێك، ئەوە پێ لێنانە بۆ تاقە درەمێك وە ئەگەر وتی: درەمێك و درەمێك ئەوە بە لەفزی یەکەم‌و دووهەم دوو درەمی ئەکەوێتەسەر، جا ئەگەر مەبەستی لە لەفزی سێهەم، دووپات (تأکید) کردنەوە بوو، ئەوە هیچ وە ئەگەر مەبەستی

سەربەخۆیی بوو، درەمێکی تری ئەکەوێتە سەر، هەروەها، ئەگەر لە خۆڕاییەوە، بە بێ‌نیاز بەدەمیا هات، یاخود مەبەستی دووپات کردنەوەی درەمی یەکەم بوو، چونکە لەفزی یەکەم بە سێهەم دووپات ناکرێتەوە وە ئەگەر ئیقراری کرد بە شتێکی نامەعلووم، وەك «شتێك»، «جلێك»، «ماڵێك» و داوای لێ‌کرا مەعنای لێ‌بداتەوە بەڵام ئەو مەعنای لێ‌نەدایەوە، ئەوە فەرموودەی ڕاست وایە ئەخرێتە بەندیخانەوە تا بەیانی ئەکا وە ئەگەر ڕوونی کردەوە، بەڵام کابرای ئیقرار بۆکراو باوەڕی پێ‌نەکرد، ئەبێ ئەم ئیددیعاکەی خۆی ڕوون بکاتەوە؛ جا پاش‌ئەوە، ئەگەر بە شاهید ئیسپاتی کرد، ئەوە باشە، ئەگینا پێ‌لێنەرەکە سوێند ئەدرێ لەسەر ڕوونکردنەوەکەی.

ئەگەر کەسێك ئیقراری کرد بە هەزار درهەم بۆ کەسێك، هەروەها ڕوژێکی تریش ئیقراری کرد بە هەزار درهەم هەر بۆ ئەو کەسە، هەر هەزار درهەمی ئەکەوێتەسەر وە ئەگەر ئەندازەی درهەمەکان کە پێیان‌لێ‌ئەنێ لەو دوو پێ‌لێنانەدا زیادوکەمی کرد، ئەوە زۆرەکەیان حیساب ئەکرێ‌وکەمەکە ئەخرێتە ناو زۆرەکەوە؛ بەڵێ، ئەگەر درهەمەکانی بە دووجۆری جیاواز باس کرد، مەسەلا، بۆ هەزار درهەمی یەکەم، وتی: هەزار درهەمی ساغ، وە بۆ هەزار درهەمی دووهەم، وتی: هەزار درهەمی شکاو، یاخود بۆ هەر هەزارێکیان سەبەبێکی تایبەتی باس کرد؛ مەسەلا، بۆ هەزار درهەمی یەکەم، وتی: لە حەقی خانوودا و بۆ هەزار درهەمی دووهەم، وتی: لە حەقی کرێ دووکانا، یاخود وتی: ڕۆژی شەممە هەزار درهەمم وەرگرت و پاش ئەوە، ڕۆژی یەکشەممە هەزار درهەمم وەرگرت، ئەوە پێ‌لێنراوەکە ئەبێ بە دووشت و هەردوو هەزار درهەمەکەی ئەکەوێتەسەر. ئەگەر وتی: هەزار دینارم لەسەرە لە حەقی شەرابدا، یا لە حەقی سەگدا، یا بژاردمەوە، ئەوە ئەو هەزار دینارەی ئەکەوێتەسەر. ئەگەر وتی: هەزار دیناری لەسەرمە لە حەقی عەینێکدا هەروەختێ عەینەکەی پێ‌دام پارەکەی ئەدەمێ، ئەوە قەبووڵ ئەکرێ و دائەنرێ بە قیمەتی ئەو ماڵە وە ئەگەر وتی: فڵانکەس هەزار دیناری لەسەرمە «إن شاءَ اللّٰه»، ئەوە هیچی ناکەوێتەسەر. ئەگەر وتی: فڵانکەس هەزار دیناری لەسەرمە کە هێشتا سابت نەبووە بۆی، ئەوە بە ئەوەڵی قسەکەی، ئەو هەزار دینارە

ئەکەوێتە سەری. ئەگەر وتی: هەزار دیناری لەسەرمە و پاش ئەوە، هەزار دیناری هێناو وتی: ئەو هەزار دینارەی کە پێم‌لێ‌نا، ئەمەیە کە هێناومە و بەسوورەتی ئەمانەت دانابوو لام،کابرای ئیقرار بۆکراویش وتی: نەخەیر، ئەم هەزارە ئەمانەت بووەو بێجگە لەمە هەزار دیناری‌ترت لەسەرە، ئەوە کابرای ئیقرارکەر سوێند ئەدرێ و مادام لێی قەبووڵ کرا مەعنای ئەو لەسەربوونە بە ئەمانەت لێ‌بداتەوە، ئەوە فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەو ماڵەی بە سوورەتی ئەمانەت لەلایە و باوەڕی پێ‌ئەکرێ ئەگەر ئیددیعای کرد ماڵەکە لە پاش پێ لێنانەکەی فەوتاوە، یا ئەگەر وتی: ناردوومەتەوە بۆ خاوەنەکەی و سوێندێکی ئەدرێ وە ئەگەر ئیقرارکەرەکە وتبووی هەزار دیناری لەئەستۆمدایە، ئەوە قەبووڵ ناکرێ لێی مەعنای لێ‌بداتەوە بە ئەمانەت و باوەڕ بە ئیددیعای کابرای ئیقراربۆکراو ئەکرێ وە ئەگەر وتی: هەزار دیناری فڵانکەسم لایە، یا لە گەڵمە، ئەگەر ئیددیعای ئەوەی کرد ئەو ماڵە بە ئەمانەت لای بووە و ناردوویەتیەوە بۆ خاوەنی، یا فەوتاوە لای خۆی، ئەوە باوەڕی پێ‌ئەکرێ بە سوێند، چونکە ئەم لەفزەکە ئەڵێ: لامە یا لە گەڵمە، ئەوە ناگەیەنێ کە لە ئەستۆیدا بێ؛ کەواتە، بە سوێند باوەڕی پێ‌ئەکرێ کە ئەو ماڵەی بە ئەمانەت لەلابووە.

ئەگەر ئیقراری کرد بە فرۆشتنی ماڵێك یا بە بەخشینی بەکەسێك و بە تەسلیم کردنی، لەپاشا وتی: ئەو بەخشینە دانەمەزراوە و ئیقرارەکەی من لەسەر گومانی ئەوە بووە کە دامەزراوە، ئەوە قەبووڵ ناکرێ لێی؛ بەس ئەوەندە هەیە ئەتوانێ کابرای ئیقرار بۆکراو سوێند بدا لەسەر ئەوە کە بەخشینەکەی دروست بووە، ئەوسا ماڵەکە ببا وە ئەگەر نکوولی کرد لە خواردنی سوێند، ئەوە کابرای ئیقرارکەر سوێند ئەخوا لەسەر ئیددیعاکەی خۆی و لە حەقی کابرا رزگاری ئەبێ.

ئەگەر کەسێك، وتی: ئەم خانووە ماڵی ئەحمەدە، نەخێر هی مەحموودە، ئەوە لەسەر قسەکەی پێشووی، ئەدرێ بە ئەحمەد و فەرموودەی دیاریتر، ئەوەیە ئەبێ قیمەتەکەشی بدا بە مەحموود بەهوێ پێ‌لێنانی دواییەوە.

بزانن! دروستە جیاکردنەوە «استثنا»ی بەشێك لەو شتەی کە ئیقراری پێ کردووە بە چەند شەرت:

یەکەم: ئەوەیە لەپێش لێبوونەوەدا لە ئیقرارەکـە، ئـەو جـیاکـردنەوەیەی لەدڵدا بووبێ؛

دووهەم: ئەوەیە ئەو جیاکردنەوەیە بلکێ بە ئیقرارەکەوە و بە غەیری راوەستانی هەناسەدانو زمانگرتنی، بەینی نەکەوێ؛

سێهەم: ئەوەیەکە ئەم جیاکراوەیە هەموو پێ‌لێنانەکە دانەگرێ؛کەواتە ئەگەر وتی: فڵانکەس دە دیناری لەسەرمە، دە دینار نەبێ، ئەوە ئەو جیاکردنەوەیە بەتاڵە و تەواوی دە دینارەکەی ئەکەوێتەسەر وە ئەگەر وتی: فڵانکەس دە دیناری لەسەرمە دوو دینار نەبێ، ئەوە دروستەو ئەبێ بە پێ‌لێنان لە هەشت دینار وە ئەگەر وتی: فـڵانکـەس دە دیناری لەسەرمە، نۆ دینار نەبێ، هەشت دینار نەبێ، ئەوە دروستەو ئەبێ بە پێ‌لێنان لە نۆ دینار، لەبەرئەوەکە جیاکردنەوە لە ئیسبات، نەفیە، و جیاکردنەوە لە نەفی، ئیسباتە، یەعنی جیاکردنەوە لە بوون، ئەبێ بە نەبوون و جیاکردنەوە لە نەبوون، ئەبێ بە بوون؛ کەواتە،کە وتی: نۆ دینار نەبێ، لە دە دینارەکە نۆ دیناری لائەچێو دینارێکی ئەمێنێتەوە و کە وتی: هەشت دینار نەبێ، لەو نۆ دینارەکە لاچووە، هەشت دیناری ئەمێنێتەوە و لەگەڵ دینارە پێشووەکەدا ئیقرارەکەی بەسەرا ئەڕوا؛ کەواتـە، وای لێ‌دێتـەوە کـابرا وتبێتی: نۆ دیناری فڵانکەسم لەسەرە وە ئەگەر چەند جیاکردنەوەیەك بەدوای یەکا هاتن، زۆر رێگا هەیە بۆ دۆزینەوەو دیاری کردنی ئەوەی ئەمێنێتەوەکە ئاسانترینیان، ئەوەیە لە جیاکردنەوەی دواییەوە دەس بکرێ بە دەرکردن؛ ئێستا، لەم میسالەدا ئێمە هەشت لە نۆ دەرئەکەین، یەکێ ئەمێنێتەوەو ئەو یەکە لە دە جیائەکەینەوە، نۆ ئەمێنێتەوە، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد.

جیاکردنەوە لە غەیری هاوجینسیش دروستە، وەك ئەوەکە بڵێ: فڵانکەس هەزار قرانی لەسەرمە عابایەك نەبێ و عاباکە مەعنای لێ ئەدرێتەوە بە عابایەك کە قیمەتی لە هەزار قران کەمتر بێ، بۆ ئەوەکە جیاکردنەوەکە هەموو ئەوەی لەپێشیەوەیە داینەگرێ. هەروەها، جیاکردنەوە دروستە لە شتێکی دیاری، وەك ئەوەکە بڵێ: ئەم خانووە هی فڵانکەسە هۆدەی سەردالانەکەی نەبێ، یا: ئەم لیرانە هی فڵانکەسن ئەو لیرەیەیان نەبێ

وە ئەگەر وتی: ئەم حەیوانانە هی فڵانکەسن یەکێکیان نەبێ، قەبووڵ ئەکرێ و بۆ بەیانکردنی ئەو تاقە حەیوانە، لە خۆی ئەپرسین؛ جا ئەگەر ئەو حەیوانانە هەموو فەوتان یەکێکیان نەبێ و کابرای پێ‌لێنەر لای‌وابوو ئەو حەیوانە، جیاکراوەکەی خۆیەتی، ئەوە باوەڕ بە سوێندی ئەکرێ، چونکە خۆی ئاگادارە لە نیازی دڵی خۆی «واللّٰهُ أَعْلم».

## باسی ئیقرار کردن بە نەسەب

ئەگەر کەسێ ئیقراری کرد بە نەسەبی کەسێك، ئەگەر ئەو کەسەی بەست بەخۆیەوە، مەسەلا، وتی: ئەم کەسە باوکمە یا کوڕمە، شەرتە بۆ دامەزرانی ئەم ئیقرارە، چەند شت:

**یەکەم:** ئەوەیە کە چاوو عەقڵ ئەم کابرا نەخاتەوە بەدرۆدا، ئەگینا ئەگەر ئەو کوڕە تەمەنی لەوانە نەبێ کە کوڕی ئەم پێ‌لێنەرە بێ، ئەوە بەتاڵە؛

**دووهەم:** ئەوەیە شەرع بەدرۆی نەخاتەوە، بەم رەنگە نەسەبی لە شەخسێکی‌تر مەعلووم بێ؛

**سێهەم:** ئەوەیە ئەو شەخسە کە نەسەبی ئەبەستێ بەخۆیەوە، باوەڕی پێ‌بکا، ئەگەر لایق‌بێ بۆ باوەڕ پێ‌کردن؛

**چوارەم:** ئەوەیە کەس هەرای لەگەڵدا نەکا لەسەر ئەو ئیقرارە؛ ئەگەر هات‌و کەسێك کەوتە هەرا لەگەڵیا لەم رووەوە، ئەوە پێویستە بە شاهید؛ جا ئەگەر شاهیدی نەبوو، یا هەردوولایان شاهیدیان بوو، ئەوە پێویستە بە باوەڕکردنی ئەو کەسە کە ئیقرار بە نەسەبی کراوە؛ ئەنجا ئەگەر ئەم کەسە هەردووکیانی خستەوە بەدرۆدا، ئەوە نەسەبی نابەسرێ بەکەسیانەوەو نیشانی قیافەت شوناسیش نادرێ وە ئەگەر باسی باوەڕکردنی بەکەس نەکرد، یاخود باوەڕی بە هەردووکیان کرد، ئەوە پێویستە بە قیافەت شوناس؛ جا ئەگەر ئەو قیافەت شوناسە نەسەبی بەست بە یەکێکیانەوە، ئەوە نەسەبی ئەبەسرێ بەویانەوە وە ئەگەر ئەویش سەرگەردان بوو، ئەوە نەسەبی بۆ کەسیان ئیسپات نابێ.

هەروەها، دروستە نەسەبی منداڵێکی دۆزراوەش بلکێنرێ بە کەسێکەوە؛ جا ئەگەر موسوڵمانێکی ئازاد کردی بە کوڕی خۆی، ئەوە ئەلکێ بەو کەسەوە و ئەو کەسە ئەو

منداڵە پەروەردە ئەکا. هەروەها، دروستە نەسەبی ئینسانێکی مردوویش، گەورە بێ یا بچووك بێ، بلکێنرێ بە کەسێکەوە و تەماشای ئەوە ناکرێ لەوانەیە ئەم کابرایە توهمەتی داواکردنی میرات رووی تێبکا. ئەگەر کەسێك نەسەبی کەسێکی لکاند بە کەسێکی ترەوە؛ مەسەلا، وتی: ئەم شەخسە برامە، یەعنی کوڕی باوکمە، یاخود وتی: ماممە، یەعنی کوڕی باپیرمە، ئەوە نەسەبی ئەم کەسە ئەلکێ بەو کەسەترەوە، بەو شەرتانەی کە لەوەپێش باسمان کردن کە بریتین لەوە چاو و شەرع بەدرۆیا نەخەنەوە و ئەو کەسەی کە نەسەبی لکێنراوە بە کەسێکی ترەوە، باوەڕ بکا بەم شەخسە پێلێنەرە؛ بێجگە لەمشەرتانە، دوو شەرتی تریش لازمە؛ یەکەم ئەوەیە ئەم کەسە کە نەسەبی ئەم کەسەی پێوە ئەلکێنرێ مردوو بێ وە ئەگەر زیندوو بێ پێویستە خۆی باوەڕی پێبکا و ئەو کەسە بە کوڕی خۆی بزانێ، ئیتر شەرت نییە زوو نەسەبی ئەم کوڕەی ئینکار نەکردبێ؛ دووهەمیش، ئەوەیە کابرای پێلێنەر لە وەختی پێلێنانەکەیا میراتبەرێك بێ کە هەموو میراتەکە ببا، خواە «عَصَبة» بێ، وەك ئەوە کە کوڕێك ئیقرار بکا فلانکەس برایەتی، یا «ذُو الفَرض» بێ، وەك کچێك کە میراتی باوکی بە فەرزو گەڕانەوە «رَدّ» وەربگرێ؛ ئەگینا، مادام ئەو پێلێنەرە میراتبەر نەبێ، ئەوە بە بێگانە ئەناسرێو پێلێنانەکەی بێسوودە؛ هەروەها، ئەگەر میراتگر بێ، بەڵام هەمووی نەبا، وەك کوڕێك لە دوو کوڕ، ئەوە بەبێئەوەی هەردووکیان رێكبکەون، سوودی نییە تەنها یەکێکیان ئیقرار بکا بە برایەکی سێهەم و بەتەنها ئەو، نەسەبی ئەم شەخسە ئیسپات نابێ؛ جا ئەگەر برایەکی تاقانە نەسەبی کەسێکی لکاند بە باوکیەوە، ئەوە واجبە میراتەکەی لەبەینی هەردووکیانا بەش بکەن بە نیوەیی وە ئەگەر یەکێك لە دوو کوڕ ئیقراری کرد بە برایەکی سێهەم و براکەی تری ئینکاری کرد، ئەوە نەسەبی ئەو کەسە ئیسپات نابێ؛ کەواتە، میراتیش وەرناگرێ و هەروەك چۆن بێبەش ئەبێ لە بەشی کوڕە ئینکار کەرەکە، بێبەش ئەبێ لە بەشی کوڕە ئیقرارکەرەکەیش؛ بەڵێ، لە حەقیقەتدا، ئەگەر ئیقرارکەرەکە راست بکا، ئەوە پێویستە سێ یەکی بەشەکەی خۆی بدا بەو کوڕە سێهەمە وە ئەگەر برائینکارکەرەکە مرد و میراتگری تەنها برا ئیقرارکەرەکە بوو، یاخود

میراتگری تری هەبوو بەڵام ئەوانیش ئیقراریان بە نەسەبی ئەم کەسە کرد، ئەوە نەسەبی ئیسپات ئەبێ و بەشی خۆی ئەبا لە میراتی باوکی، هەروا لە میراتی برا مردووەکەیش، ئەگەر میراتگریوای نەبێ ڕێی میراتگرتنی لێبگرێ.

ئەگەر تاقانە کوڕێکی میراتگر ئیقراری کرد بە برایەتی کەسێکی نەسەب نەناسراو، ئەوە نەسەبی ئەو کابرایە ئیسپات ئەبێ وە ئەگەر لەو وەختەدا ئەو کەسە ئینکاری نەسەبی ئەو ئیقرارکەرە بکا، ئەوە بێسوودەو قسەکەی بەتاڵە، چونکە ئەگەر نەسەبی ئیقرارکەرەکە تێك‌بچێ، ئەوە نەسەبی ئەم کابرایە ئیسپات نابێ و مادام نەسەبی ئەم ئیسپات نەبێ، قسەی بە بێسوود ئەڕواو نەسەبی ئیقرارکەرەکە بە سابتی ئەمێنێتەوە، چونکە ئینکاری بێگانە بێسوودە.

ئەگەر میراتگرێك ئیقراری کرد بە نەسەبی کەسێکیوا کە لە ئیسپاتبوونی نەسەبی ئەوەوە ئەم لە میرات بێبەش ببێ، وەك ئەوە کە برای مردوویەك ئیقرار بکا بە نەسەبی کوڕێك بۆ براکەی، ئەوە نەسەبەکەی ئیسپات ئەبێ، بەڵام نابێ میرات وەربگری، چونکە ئەگەر میرات ببا، ئەبێ میرات نەبا، لەبەرئەوە کە ئەگەر میرات ببا، مامەکەی لە میرات بەری ئەبێ و مادام ئەوە لە میرات بەری بوو، ئیقرارکردنی بە نەسەبی ئەم کوڕە بێسوود دەرئەچێ و ئەم شەخسە نابێ بە کوڕی مردووەکەو میرات نابا؛ ئەنجامیش ئەوە ئەبێ ئەگەر میرات ببا، ئەبێ میرات نەبا، ئەمەیش مەحاڵە.

## باسی خواستن (عاریة)

خواستن لە شەرعدا، بریتییە لە عەقدێك کە ئەبێ بەهۆی ئەوەکە دروست بێ یەکێك قازانج لە شتێك وەربگرێ؛ خواستن، هەرچەند لە خۆیدا سونەتە، بەڵام جارجاریش واجب ئەبێ، وەك دانی جلو بەرگ بە کەسێکی داماو بۆ ئەوەی عەورەتی خۆی داپۆشێ تا نوێژ بکا.

لە «عاریة»دا، پێویست هەیە بە «مُعیر» کە ئەو کەسەیە ماڵ ئەدابە کەسێکی تر بۆ سوود لێوەرگرتنی و «مُستَعیر» کە ئەو کەسەیە ماڵەکە ئەخوازێ و «مُستَعار» کە ماڵە خوازراوەکەیە و «صیغة» کە ئەو لەفزەیە بە بەینیانا ئەڕوا؛

شەرتی «مُعیر»، چەند شتە:

یەکەم: ئەوەیە لایقی بەخشینو پیاوەتی کردن بێ؛ کەواتە، دروست نییە منداڵو شێتو نەفامی حیجر لەسەر دانراو ماڵ بدەن بە کەسێك بە عاریە؛

دووهەم: ئیختیارە؛ کەواتە، عاریەدان بەزۆر، بەتاڵە؛

سێهەم: ئەوەیە خاوەنی قازانجی ماڵەکەبێ، خواه خاوەنی ماڵەکەش بێ، یا هەر خاوەنی قازانجەکەی بێ، وەك ئەو کەسەی کە ماڵێکی بەکرێ گرتبێ؛ کەواتە، دروستە ئەو کەسەی ماڵ ئەدا بە عاریە، کرێچی بێ، یاخود وەسیەتی بۆ کرابێ بە قازانجی ماڵە خوازراوەکە، یاخود وەقف کرابێ لێی، مەسەلا، کەسێك کتێبێکی لێ وەقف کرابێ، ئەتوانێ بە عاریە بیدا بە کەسێك ئەگەر وەقفکەرەکە بە شەرتی نەگرتبێ نەدرێ بەکەسبە عاریە؛ بەڵام دروست نییە بۆ کەسێك کە شتێکی لە کەسێك خواستبێ بە عاریە، خۆیشی بیداتەوە بە عاریە، چونکە وەك خاوەن ماڵ نییە، خاوەنی قازانجیش نییە، بەڵکوو تەنها خاوەنی قازانج وەرگرتنە. دروستە بۆ ئەو کەسەی کە ماڵێکی لە کەسێك خواستبێ، جێنشینێك بۆخۆی بگرێ بۆ سوود وەرگرتن لەو ماڵە؛ مەسەلا، ئەو جووتەگایە کە خواستوویەتی بۆ جووت پێ کردن، بیدا بە کەسێك کە جووتی پێ بکا بۆی، یا بکا بۆی، یا ئەو ئەسپەی کە خواستوویەتی بۆ سواری، یەکێکی تری سوار بکاو بینێرێ بۆ ئیشەکەی، یا ژنەکەی یا خزمەت کارەکەی سوار بکا.

شەرتی «مستعیر»یش، چەند شتە:

یەکەم، ئەوەیە خاوەن روشد بێ؛ کەواتە، ماڵ خواستنی منداڵو شێتو نەفام، دروست نییە و هەر ماڵێ بە عاریە بدرێ بەمانەو بفەوتێ، پێیان نابژێررێتەوە؛ هەروها، دروست نییە سەرپەرشتیکەری کاروباری منالێش لەبەر ناچاری نەبێ، ماڵی بۆ بخوازێ، وەك سەرمایەکی سەخت، یاخود لەو ماڵ خواستنەدا زەمانەتی نەیەتەسەر، وەكئەوە شتێك لە کرێچی بخوازن؛

دووهەم، ئەوەیە خاوەن ئیختیار بێ؛ کەواتە، ئەگەر زۆر بکرێ لە کەسێك بۆ خواستنی ماڵێكو ماڵەکەی خواست، ئەوە بەتاڵە؛

سێهەم، ئەوەیە مەعلووم بێ کێیە: کەواتە، ئەگەر خاوەن ماڵێك بڵێت: وا ئەم فەرشەم بە عاریەدا بە هەرکەس لەسەری دائەنیشێ، ئەوە بەتاڵە، یەعنی ئەوە بە عاریە دانانرێ، بەڵکوو بۆ حەڵاڵ کردنە (إباحة)، یەعنی ئەو کابرا فەرشەکەی حەڵاڵ کردووە بۆ هەر کەس لەسەری دابنیشێ.

شەرتی ماڵی «**مُستعار**» (خوازراو)یش، ئەوەیە قازانجێکی شەرعی لێوەربگیرێ لەگەڵ ئەوەیشاکە عەینەکەی بمێنێتەوە؛ کەواتە، دروست نییە بە عاریەدانی وڵاخێك کە کەڵکی باربردنی پێوە نەبێ، هەروەها بە عاریەدانی جاشوولکەیەك کە هێشتا نەخرابێتە ژێربارو وای لێنەهاتبێ بۆ باربردن دەس بدا. دروست نییە بەعاریەدانی مۆم بۆ داگیرساندن، یا چێشت بۆ خواردن، چونکە قازانجی ئەمانە بەسراوە بە فەوتانیانەوە؛ بەڵێ، دروستە بەعاریەدانی جل بۆ لەبەرکردن و قەڵەمو دەوات بۆ پێنووسین و کلتوور بۆ چاوپێڕشتن، چونکە ئەمانە هەرچەند بە قازانج لێوەرگرتن تەواو ئەبن، بەڵام ماوەیەکی زۆر عەینەکەیان لەگەڵ ئەو مەنفەعەتەدا ئەمێنێتەوە؛ هەروەها، دروستە بە عاریەدانی خشڵ بۆ خۆپێجوانکردن.

ئەگەر کەسێك مەڕی شیردار بدا بە یەکێ بۆ ئەوەکە شیرو ڕۆنەکەی بخوا، ئەوە نابێ بەشێوەی عاریە بێ، چونکە قازانجی شیرو ڕۆنەکەی لەوەدایە کە بخورێن؛ کەواتە، پێویستە کابرا ئەو شیرو ڕۆنە نەزر بکا لەو کەسە کە ئەیداتێ. هەروەها، شەرتە ئەو ماڵە خوازراوە ئەدرێ بە کەسێك، بەرامبەر بە کرێ نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك وتی: وا ئەو ئەسپەم پێدای بۆ ئەوەکە ئاڵفی بدەیتێ، یا بۆ ئەوەکە تۆیش ئەسپەکەی خۆتم بدەیتێ، ئەوە عاریە نییە بەڵکوو بەکرێدانە، چونکە کرێی تیا خراوەتە پێش چاو، بەڵام بەکرێدانێکی نادروستە، چونکە ماوە (مُدّة)ی بەکرێدانەکەو بریتی (عِوَض)ەکەی هەردووکیان، نادیارین.

هەرماڵێك بەهۆی عاریەی دانەمەزراوەوە بکەوێتە دەستی کەسێك، ئەگەر ئەو کەسەی داویە بە خواستن، لایقی پیاوەتی کردن بێ، ئەو کابرای ماڵ خواز نابێ بە زامنی قازانجی فەوتاوی ئەو ماڵەو کرێیشی ناکەوێ؛ هەروەها، نابێ بە زامنی

عەینەکەیشی، ئەگەر لەپێش بەکارهێنانا فەوتا، یاخود لەپاش بەکارهێنانی روخسەت بۆدراو فەوتا وە ئەگەر بەهۆی بەکارهێنانی روخسەت بۆ نەدراوەوە فەوتا، ئەوە ئەبێ بە زامنی وە ئەگەر ئەوکەسەکە ماڵەکەی داوە بە خواستن، لایقی پیاوەتی کردن نەبێ، ئەوە ئەو کەسەی کە خواستوویەتی، ئەبێ بە زامنی عەینو قازانجی و بۆ ماوەی مانەوەشی لەلای ماڵخوازەکە کرێی ئەکەوێتەسەر بۆ خاوەنەکەی، بەو شەرتە ئەو کەسەی وەریگرتووە خاوەن روشد بێ. بەڵام ئەگەر منداڵ بوو یا شێت بوو، ئەوە نە ئەبێ بە زامنی عەینی ماڵەکەو نە مەنفەعەتی و نەکرێی ئەکەوێ، چونکە کابرای خاوەنماڵ خۆی کەمتەرخەمی کردووە.

شەرتی «صیغة»یش، ئەوەیە لەفزێك بێ مەعنای ئەوە بگەیەنێ کە خاوەنی مەنفەعەتی ماڵەکە رێگای کابرای ماڵخوازی داوە بە پێی عورفو عادەت قازانج لەو ماڵە وەربگرێ، وەك ئەوە کە بڵێت: ئەوکەوامە پێدای بۆ ئەوە ئەمرۆ بیکەیتە بەرت، یا مەعنای ئەوە بگەیەنێ کە کابرای ماڵخواز داوای روخسەتدان بکا بۆ قازانج وەرگرتن لەو ماڵە، وەك ئەوە کە بڵێت: ئەو ماڵەم بە عاریە بدەرێ؛ بەڵێ، ئەوە بەسە یەکێکیان لەفزەکەی بەدەما بێت و ئەویان بە کردەوە جوابی بداتەوە، یەعنی کە خاوەن ماڵ لەفزەکەی بە دەما هات، ئەویتر ماڵەکە وەربگرێ، یاخود کە ماڵخواز لەفزەکەی بەدەما هات، خاوەنماڵ ماڵەکەی بداتە دەست، هەرچەند هەندێکیش بەین بکەوێ لەنێوان لەفزی خاوەن ماڵو ماڵ خوازەکەدا یا لەبەینی قسەی یەکێکیانو کردەوەی ئەویانا، چونکە عاریە وەك گۆڕینەوە نییە تاوەکوو قەبوولێ زووبەزوو پێویست بێ.

وایش ئەبێ عاریە بە بێلەفز دێتەجێ، وەك ئەوە کەسێك فەرشێك رابخا بۆ یەکێ کە لەسەری دابنیشێ، یاخود حەیوانێك بداتە دەستی ژنێك شیرەکەی بدۆشێو بیخواتەوە، ئەوە حەیوانەکە، لەو ماوەیەدا بە عاریە دائەنرێ؛ یاخود وەك ئەوە کە ماڵ فرۆش ماڵەکەی بدا بە کڕیار لەناو شتێکا، ئەوە ئەو شتەکە ماڵەکەی تێخراوە، عاریەیە.

ئەگەر هاتو لەفزی عاریەکەی بەست بە «کرێ»وە؛ مەسەلا، وتی: وا ئەو ئەسپەم پێدای سواری ببی بەو شەرتە بەخێوی بکەیو ئالێکی باشی بدەیتێ، ئەوە لەبەر بەیان

کردنی ئەو عیوەزە، ئەبێ بە ئیجارەی دانەمەزراو، و هەر عاریەیەك بەم جۆرە بێ، ئەبێ بەهۆی ئەوە کە «أُجرةُ المِثل» بکەوێتە سەر کابرای ماڵ خواز،بەو شەرتە ماوەیەکی وا تێبپەڕێ کە بەعادەت ئەو شتە کرێی هەبێ لەو ماوەیەدا و لەم وەختەدا، ئەگەر ماڵەکە بفەوتێ بە بێ کەمتەرخەمی کردن لەلایەن ماڵ خوازەوە، ئەوە ئەو ماڵ خوازە زامن نابێ، وەك لە ئیجارەدا.

**بزانن!** مەسرەفی ماڵی خوازراو لەسەر ماڵ خوازەکە نییە، بەڵکوو لەسەر خاوەنەکەیەتی، خواه بە عاریەدانەکە دامەزرابێ یان دانەمەزرابێ؛ کەواتە، ئەگەر ماڵ خواز مەسرەفی بۆ ماڵەکە کرد، ناتوانێ داوای بکاتەوە لە خاوەنەکەی، مەگەر حاکمی وەخت ڕێگای دابێ ئەو مەسرەفە بکا یاخود شاهیدی گرتبێ لەسەر نیازی گەڕانەوە بۆسەری.

دەستی ماڵخواز بەسەر ماڵەخوازراوەکەوە، دەستی زەمانەتە و رزگار نابێ لەو زەمانەتە تا ئەو ماڵە تەسلیم ئەکاتەوە بە خاوەن ماڵەکە خۆی یا بە وەکیلی، یا تا ئەیباتەوە بۆ ئەو جێگەیە کە دەری کردووە لێیەوە؛ مەسەلا، وەك تەوێڵەی وڵاخ، بەو شەرتە خاوەنماڵەکە خۆی ئاگادار بێ لەوە کە ماڵەخوازراوەکە برایەوە بۆ شوێنی خۆی؛ ماڵخواز لە زەمانەت ناکەوێ بە بردنەوەی ماڵی خوازراو بۆلای ژنی یا کوڕی یا خزمەتکاری خاوەنماڵەکە. هەروەختێك خاوەنماڵ داوای ماڵەکەی کردەوە، یاخود مرد، یا حیجری نرایەسەر، واجب ئەبێ لەسەر ماڵخوازەکە دەسبەجێ ئەو ماڵە بباتەوە بۆ خاوەنەکەی یا بۆ میراتگرەکانی یا بۆ ئەوکەسەی کە سەرپەرەشتی کاروباری ئەکا؛ ئەگەر هاتو بە عەمدی تەفرەیداو توانایشی بوو بیباتەوە، ئەبێ بە زامنی عەینەکەیو کرێی ئەو ماوەی تەفرەدانەشی ئەکەوێتەسەر، هەروەها مەسرەفی بردنەوەی بۆلای خاوەنەکەی، ئەگەر لەخۆی وەرگرتبوو، یا بۆلای کرێچی ئەگەر لەوی وەرگرتبوو؛ بەڵام ئەگەر لە کرێچی وەرگرتبوو و بردیەوە بۆلای خاوەن ماڵەکە خۆی لەپاش تەواوبوونی ماوەی بەکرێدانی، ئەوەمەسرەفەکەی ئەکەوێتەسەر خاوەنماڵەکە، چونکە ئەم ماڵخوازە لەم حاڵەدا وەك وەکیلی کرێچییەکە وایە و کرێچی هەر تەنها کرێی لەسەرەو مەسرەفەکانی تری لەسەر نییە، بەڵکوو لەسەر خاوەنماڵەکەیە.

ئەگەر عەینی ماڵە خوازراوەکە یا بەشێکی فەوتا، یا زین‌و لەغاوی ئەسپ‌و هەوسارو کورتانی وڵاخ فەوتا بەهۆی بە کار هێنانێکی‌واوە کە رێگای درابێ، وەك بە کارهێنانی گا بۆ جووت پێ کردن و بە کارهێنانی ئەسپ بۆ سواری یا وڵاخ بۆ بارکێشان، ئەوە ماڵ خوازەکە زامن نابێ وە ئەگەر بە بێ بەکار هێنان فەوتا، وەك ئەوە وڵاخەکەی لە تەوێڵەدا بەستبێتەوەو تەوێڵەکە برووخێ بەسەریا یا وڵاخێکی‌تر لەقەی لێبدا، یاخود بەهۆی بە کارهێنانێکەوە کە رێگای نەداربێ بۆی، وەك بەکارهێنانی گاجووت بۆ بارکێشان، یا هێستری بارکێشان بۆ جووت‌پێ‌کردن، یاخود لەکاتی بەکارهێنانا، بێ بەکارهێنان فەوتا، وەك ئەوە کە لەکاتی سواربوونی وڵاخەکەو بەڕێ‌رۆیشتنی‌دا، مارێك پێیەوەبدا، یا بکەوێتە بیرێکەوە، یاخود لە کاتی بار کردنا دارێك بدا لە چاوی‌و کوێری بکا، یا دارێك بڕوا بە سکیا، ئەوە کابرای ماڵ‌خواز زامن ئەبێ؛ بەڵام ئەگەر بەهۆی پێ‌هەڵکەوتنیەوە بفەوتێ، ئەوە زامن نابێ، چونکە زیاتر وایە وڵاخ سەرسم ئەدا، بەو شەرتە ئەو پێ‌هەڵکەوتنە بەهۆی قورسی بارەکەیەوە نەبێ، یاخود لەبەر لێ خوڕینی بە پەلە نەبێ، ئەگینا زامن ئەبێ. ئەگەر ماڵ خوازو خاوەن ماڵ بوو بە هەرایان لەسەر ئەوەکە ئاخۆ ماڵە خوازراوەکە بەهۆی بەکارهێنانی رێگادراوەوە فەوتاوە یا نە، ئەوە باوەڕ بە خاوەن ماڵەکە ئەکرێ‌و سوێند ئەدرێ، چونکە لەئەساسدا دەستی ماڵ‌خواز دەستی زەمانەتە.

بە عاریە دائەنرێ ئەمەکە خاوەن وڵاخێك لە رێگەیەکدا ئینسانێکی داماو سوار بکا، هەرچەند خۆی داوای وڵاخەکەی نەکردبێ و لەرێگەکەدا مارێك بدا بە وڵاخەکەوەو بمرێ، ئەوە ئەو داماوە ئەبێ بە زامنی قیمەتی وڵاخەکە؛ بەڵێ، ئەگەر کابرای خاوەن وڵاخ خۆیشی لەگەڵیا سوار بوو، ئەوە ئەو زەمانەتە لەسەر نیوەییە، یەعنی نیوەی ئەکەوێتە سەر خاوەن وڵاخەکەو ئەو نیوەکەی ئەکەوێتەسەر ئەو داماوەکە سوار کراوە.

ئەگەر کەسێك کەل‌وپەلی کەسێکی نایەسەر وڵاخی خۆی بە خۆڕایی، ئەوە ئەگەر کەل‌وپەلی خاوەن وڵاخەکە یا کەسێکی‌تری لەسەر نەبوو، ئەو کابرایە بە «مُستعیر»ی وڵاخەکەی ئەناسرێ؛ جا ئەگەر بە بەکارهێنانی رێگانەدراو وڵاخەکە فەوتا، ئەوە زامنی

هەموویەتی وە ئەگەر کەل‌وپەلی کەسێکی تری لەسەر بوو، ئەوە بەنیسبەتی ئەو کەل‌وپەلە ئەبن بە زامن.

ئەگەر کەسێك وڵاخێکی خواست بۆ سەفەرێك، ئەوە ئەتوانێ لەو سەریشەوە کە ئەگەڕێتەوە هەر سواری وڵاخەکە ببێ، چونکە ڕێگادان بۆ سواربوونی وڵاخ بۆ ڕۆیشتن بۆ شۆێنێك، ڕێگادانە بۆ سواربوونی لەو سەریشەوە، بە هەر ڕێگەیەکدا بێتەوە و لەو ماوەیەدا، ئەگەر بەهۆی بەکارهێنانی ڕێگادراوەوە وڵاخەکە فەوتا، زامن نابێ وە ئەگەر بەهۆی بەکارهێنانی ڕێگا نەدراوەوە فەوتا، ئەبێ بە زامنی. ئەگەر کەسێك لەڕێگەیەکدا وڵاخێکی خواست سواری ببێ تا ئەگاتە جێی خۆی و سواری وڵاخەکە بوو و گەیشتەجێ، ئەوجا وڵاخەکەی ناردەوە، تەماشا ئەکەین، ئەگەر لەگەڵ وەکیلی خاوەن وڵاخەکەدا ناردیەوە، ئەوە لە زەمانەت دەرئەچێ وە ئەگەر بە پیاوی خۆیا ناردیەوە، ئەوە هەر وا لە زەمانەتی ماڵخوازەکەدا تا ئەگاتەوە دەستی خاوەنەکەی؛ ئەگەر ئەو کەسە لەڕێدا سواری وڵاخەکە بوو و ئەو وڵاخە فەوتا، ئەگەر ئەم کەسەکە سواری بووە حیجری لەسەر بێ، ئەوە هەر ماڵخوازەکە زامنەو بژاردنەوەی ئەکەوێتەوە سەر ئەو وە ئەگەر کابرا روشدی هەبوو، ئەویش‌و ماڵخوازەکەیش هەردووکیان زامنن، زەمانەتی ماڵ خوازەکە دیارە لە بەرچییە، زەمانەتی ئەمیش لەبەرئەوەیە بە بێ‌ئیزنی خاوەن ماڵەکەو بە بێ‌ڕوخسەتی شەرع سواری بووە و بژاردنەوە ئەکەوێتە سەر ئەم کابرایە کە لە ڕێدا سواری بووە. ئەگەر کەسێك وڵاخێکی دایە دەستی یەکێك‌و ناردی بۆ ئیشێکی خۆی، یاخود تەسلیمی کەسێکی کرد تا مەشقی پێ‌بکا و ئەو وڵاخە لەو ئیشەدا یا لەو مەشق پێ‌کردنەدا فەوتا، بە بێ‌ئەوەی ئەو کەسەی وەری گرتووە کەمتەرخەمییەکی کردبێ، ئەوە زامن نابێ، چونکە درێغی نەکردووەو وڵاخەکەشی بۆ سوودی خۆی وەرنەگرتووە. فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ماڵخواز زامن نابێ بۆ ئەو ئەندازەیەی جلی خوازراو کە بپرتووکێ یا کۆن ببێ، چونکە ئەم جۆرە فەوتانە لە حوکمی ئەوەدایە خاوەن‌ماڵەکە روخسەتی بۆ دابێ.

بزانن! ئەگەر کەسێك وڵاخێکی خواست‌و نۆماکەی کەوتە شوێنی دایکەکەی، ئەمە ئەگەر خاوەن وڵاخەکە پێی‌زانی‌و دەنگی نەکرد، کابرای ماڵ خواز نابێ بە زامنی وە

ئەگەر پێی نەزانی، ئەوە واجبە گورج خەبەر بدا بە خاوەنەکەی؛ ئەگەر خەبەری پێ نەداو نۆماکە لەرێگەدا فەوتا، ئەوە ئەبێ بە زامنی وە ئەگەر کەسێك ولاخێکی خواستو خاوەنەکەشی لەگەڵیاهات، ئەوە هەر وا لە زەمانەتی ماڵخوازەکەدا؛ بەڵام ئەگەر ولاخێکی زەوتکردو خاوەنەکەی لەگەڵیا هات و ولاخەکە لە دەستی خاوەنەکەیا فەوتا، ئەوە کابرای زەوتکەر نابێ بە زامنیوەکوو لە باسی زەوت کردنا بەیان ئەکرێ.

ئەگەر کەسێك ماڵێکی خواست لە کەسێك کە ئەو ماڵەی بە کرێ گرتبوو، یا لە کەسێك کە موستەحەقی قازانجی ئەو ماڵە بوو بەهۆی ئەوەوە کە وەسیەتی بۆ کرابوو، یا بەهۆی سوڵحەوە، یا بەهۆی مارەییەوە، یا بەهۆی سەلەمە وە، یا لە کەسێك کە ئەو ماڵەی لەسەر وەقف کرابوو، ئەوە ئەم شەخسە نابێ بە زامن، چونکە دەستی ئەم، جێنشینی دەستی کەسێکە کە موستەحەقی قازانجی ئەو ماڵەیە؛ کەواتە، بە بێ کەمتەرخەمی و خەیانەت زامن نابێ؛ بەڵێ، ئەگەر کرێچییەکە بە بەکرێ گرتنێکی دانەمەزراو ئەو ماڵەی وەرگرتبێ، ئەوە ئەم کەسەی کە ماڵەکەی خواستووە ئەبێ بە زامن، هەرچەند کەسێك کە بە بەکرێ گرتنێکی دانەمەزراو ماڵێکی بە کرێ گرتبێ، زامنی نابێ.

دروستە بۆ ماڵخواز سوود وەربگرێ لە ماڵە خوازراوەکە بە گوێرەی ئەو روخسەتەی کە پێیدراوە؛ کەواتە، ئەگەر زەوییەکی خواست بۆ ئەوەی گەنم یا جۆی تیا بوەشێنێ، ئەوە دروستە ئەو شتە بوەشێنێ لەو زەوییەدا کە روخسەتی بۆ دراوە، هەروەها هەر تووێکیوا کە زیانی بۆ زەوییەکە زیاتر نەبێ لە زیانی ئەو تووە کە روخسەتی دراوە، دایچێنێ وە ئەگەر هەروەها پێیدرابوو زەراعەتی تیابکا و ناوی هیچ تووێك نەبرابوو، یاخود پێی وترابوو: هەرچی تیائەوەشێنی، ئارەزووی خۆتە، ئەوە ئەتوانێ بە ئارەزووی خۆی تووی تیا دابچێنێ وە ئەگەر زەوییەکی خواست بۆ ئەوەی داری تیا بنێژێ یا خانووی تیا دروست بکا، دروستە لەجیاتی ئەوە زەراعەتی تیا بکا، بەڵام پێچەوانەی ئەمە دروست نییە، یەعنی کەسێك زەوییەکی خواست بۆ زەراعەت، دروست نییە داری تیا بنێژێ یا خانووی تیا بکاتەوە؛ فەرموودەی راست ئەوەیە

کەسێك زەوییەك بخوازێ بۆ ئەوە کە خانووی تیا بکاتەوە، دروست نییە درەختی تیا بنێژێ وە ئەگەر بۆ دار تیاناشتنی خواست، نابێ خانووی تیا بکاتەوە.

دروستنییە بە عاریە دانی زەوی بە بێباس کردنی جۆری قازانجەکەی بۆ ئەو کەسەی کە ئەیخوازێ، بەڵکوو پێویستە بڵێت: بۆ دار تیا ناشتن یا خانوو تیاکردنەوە یا زەراعەتی فڵان جۆرە کشتوکاڵ.

## باسی هەندێ حوکمی «عارية»

دروستە بۆ ئەوەی ماڵ ئەخوازێ لە کەسێكو بۆ ئەوەی ماڵ ئەدا بە کەسێك، هەر کاتێك ئارەزوویان بوو، ئەو عاریەیە تێكبدەن، خواه وەعدەی بۆ دانرابێ یا نە وە ئەگەر ماڵ خواز ماڵەکەی بەکارئەهێنا لەپاش ئەوەی کە خاوەنەکەی پەشیمان بووەوە، بەڵام ئاگای لەو پەشیمان بوونەوەیە نەبوو، ئەوە کرێی ماڵەکەی ناکەوێتەسەر، چونکە وەختی خۆی خاوەنماڵەکە رێگای داوە بۆ بەکارهێنانی بەخۆڕایی؛کەواتە، تا خەبەری پەشیمانییەکەی پێئەگا، ئەتوانێ ئەو ماڵە بەکاربێنێ. ئەگەر کەسێك وڵاخێکی بە عاریە دا بە کەسێك کەلوپەلی پێبیا بۆ جێگەیەك و لە ناوەڕاستی ڕێگەدا پەشیمان بووەوە، واجبە لەسەری کەلوپەلەکەی بۆ بگەیەنێتە جێگەیەکی ئەمین کە خەتەرەی نەبێ، بەڵام ئەتوانێ کرێی لێبسێنێ بۆ ئەو ماوەیە وە ئەگەر لەپاش پەشیمان بوونەوەی خاوەن ماڵ، ئەم کابرای ماڵخوازە مرد، واجبە لەسەر میراتگری گورج ماڵەکە بنێرێتەوە بۆ خاوەنەکەیو مەسرەفی ناردنەوەیشی بدا؛ ئەگەر لەبەر کەمتەرخەمی دەستی بەسەر ماڵەکەدا گرتو نەیناردەوە، ئەوە بێجگە لەوە کە زامنی ماڵەکەیە، کرێی ئەو ماوەیشی ئەکەوێتەسەر.

بەڵێ، ئەگەر کەسێك زەوییەکی بە عاریە دا بۆ قەبری مردوویەك و مردووەکەی تیا نێژراو داپۆشرا، یا خرایە ئەڵحەدەوەو ئەڵحەدەکە قایم کرا، یا هێشتا قایم نەکرابوو بەڵام ئەگەر مردووەکەی لێ دەربکرایە، هەندێ لە ئەندامانی لەشی تێك ئەچوو، ئەوە لەم سوورەتانەدا، دروست نییە کابرای خاوەنزەوی کە زەوییەکەی داوە بە عاریە

،پەشیمان ببێتەوە تا ئەوەندە وەختی بەسەرا ئەچێت مردووەکە بڕزێو ببێ بە خۆڵ، بەڵام ئەگەر لاشەی مردووەکە لە قەراغی قەبرەکەدا بێ یا لەناو قەبرەکەدا دانرابێو ئەگەر بگوێزرێتەوە، هیچ کام لە ئەندامانی لەشی تێكنـەچێ، ئـەوە دروسـتە کـابرای مـاڵ بەعاریەدەر پەشیمان ببێتەوەو مردووەکە ببرێتە شوێنێکیتر بنرێتـە قـەبر؛ بـەڵام لەم سوورەتەدا، واجبە لەسەر ماڵ بەعاریەدەرەکە کرێی قەبر هەڵکەندنەکە بدا، چـونکە لەسەر رێگادانی ئەو، قەبرەکەیان هەڵکەندووە. هەروەها، ئەگەر کەسێك زەوییەکی بە عاریەدا بە کەسێکیتر بۆ ئەوەی بیرێکی تیاهەڵکەنێ، و لەپاش هەڵکەندنی بـیرەکـە پەشیمان بووەوە، ئەوە واجبە لەسەری کرێی هەڵکەندنی بیرەکە بدا.

ئەگەر کەسێك زەوییەکی دا بە عاریە بۆ خانوو تیاکردنەوەیا بۆ دار تیا ناشتن و ناوی ماوەیەکی نەبرد و لەپاش ئەوەکە ماڵخوازەکە خانووەکەی کردەوە یا دارەکەی ناشت، خاوەن زەوییەکە پەشیمان بووەوە، ئەمە، ئەگەر وەختی خۆی شەرتی ئەویانە کردبوو کە لەکاتی پەشیمان بوونەوەدا ئەو دارە بە بێقـیمـەت هـەڵبکـەنرێو ئـەو خـانووە بڕووخێنرێ، ئەوە بەگوێرەی ئەو شەرتە ئەکرێ، ئەگینا ئەگەر ماڵ خوازەکە لە خۆیەوە دارەکەی هەڵکەندو خانووەکەی رووخاند، ئەوەیش چاکـە و لەموەخـتەدا، واجـبە لەسەری زەوییەکە تەختبکاتەوە وە ئەگەر خۆی دەستی لێنەدان، ئەوە بە خۆڕایی دارەکە هەڵناکەنرێو خانووەکە ناڕوخێنرێ، بـەڵکـوو بـە ئـارەزووی کـابرای مـاڵ بەعاریەدەرە هەرکام لەم سێ شتە ئەکا: یا دارو خانووەکە بهێڵێتەوەو کرێ لە ماڵخواز بستێنێ؛ یا دارو خانووەکە لابەرێو کەرەستەکانیان بداتەوە بە ماڵ خوازەکە لەگەڵ بژاردنەوەی ناتەواویدا؛ یا هەڵیانبگرێ بۆ خۆیو قـیمەتێکـی راسـتیان بـۆ دابـنێو قیمەتەکە بدا بە ماڵ خوازەکە؛ ئەگەر خاوەن زەوییەکە یەکێك لە مانەی نەکرد، ناتوانێ داروخانووەکە بە خۆڕایی لاببا، خواه ماڵ خوازەکە کرێ بدا یا نە؛ فەرموودەی راستتر ئەوەیە لەموەختەدا قازی حەقی نەبێ بەسەریانەوە تا ئەوان لە بـەینی خـۆیـانا رێك ئەکەونو شتێك دیاری ئەکەن و لەو ماوەیەدا کە قازی لێیان گەڕاوە تیایداو ئەوانیش هێشتا رێكنەکەوتوون، خاوەنماڵەکە ئەتوانێ بڕوا بۆ ناو زەوییەکەو خەریکی ببێ،

بەڵام بۆ ماڵخوازەکە دروست نییە هاتوچۆی پیا بکا، مەگەر بۆ ئاودانی درەختەکانی و خزمەت کردنی خانووەکەی، هەرچەند ناتوانێ بەکەرەستەی تازە ئاوەدانی بکاتەوە، بۆ ئەوەی زیاتر لەوەی کە هەیە، قیمەت و مەسرەف نەکەوێتە سەر خاوەن زەوییەکە؛ هەروەها، ئەتوانن هەرکامیان بەشە موڵکی خۆی بفرۆشێ بەکەسێکی تری بێگانە، جا خواه خاوەن زەوی، زەوییەکەی بفرۆشێ، یا ماڵ خواز درەخت و خانووەکەی بفرۆشێ.

ئەگەر کەسێك زەوییەکی بە عاریە دا بە کەسێك یا بە کۆمەڵێك بۆ ئەوەی مزگەوتی تیابکەنەوەو مزگەوتەکەیان کردەوەو بیناکەیان وەقفکرد، ئەوە خاوەن زەوییەکە ئەتوانێ پەشیمان ببێتەوە، بەڵام پێویستە بە پێی توانا بەکەرەستەکەی مزگەوتێکی تر بکرێتەوە. عاریەیەکیش کە بۆ ماوەیەکی تایبەتی بێ، وەك عاریەی موتڵەق وایە لەبارەی پەشیمان بوونەوەوە؛ یەعنی کابرای خاوەن ماڵ ئەتوانێ پێش تەواوبوونی ماوەی عاریەماوەدراوەکە، پەشیمان ببێتەوەو حوکمی پێشووی تیا جێبەجێ ئەکرێ.

ئەگەر کەسێك زەوییەکی دا بە عاریە بۆ کشتوکاڵ تیاکردن و پێش ئەوە کە کشتوکاڵەکە پێ بگا، پەشیمان بووەوە، ئەوە قسەی راست ئەوەیە واجبە لەسەری واز لەو کشتوکاڵە بێنێ تا کاتی درەو کردنی دێت؛ بەڵێ، ئەگەر لەوانەبوو کە بە سەوزی ببڕێتەوە، وەك پاقلەو لۆبیا، دروستە خاوەن کشتوکاڵەکە ناچار بکا لای ببا و لەو کاتەوە کە خاوەن زەوی پەشیمان ئەبێتەوە تا کاتی درەو کردن و هەڵگرتنی کشتوکاڵەکە حەقی کرێی زەوییەکەی ئەکەوێتە سەر خاوەن کشتوکاڵەکە؛ ئەگەر خاوەن زەوی ماوەیەکی دیاری کردبوو بۆ کشتوکاڵەکە و لەو ماوەیەدا لەبەر کەمتەرخەمی کابرای ماڵخواز، کشتوکاڵەکە پێ نەگەیشت؛ مەسەلا، وەختی خۆی، کێڵانی زەوی و داچاندنی تووی دواخستبوو، یاخود بەهۆی کشتوکاڵەکە خۆیەوە، لەبەرئەوە کە زەوییەکە بەفری تیابوو، یا لافاو داگیری کردبوو، یا شتێکی وای تیا داچێنرابوو کە درەنگ پێ ئەگەیشت، ئەوە لەم سوورەتانەدا، خاوەن زەوییەکە ئەتوانێ کشتوکاڵەکە هەڵبکەنێ بەخۆڕایی وە ئەگەر ماڵ خوازەکە کەمتەرخەمی نەکردبوو؛

مەسەلا، لە وەختی خۆیا زەوییەکەی کێڵابوو، بەڵام ئەو ساڵە دەغڵودان درەنگ پێ گەیشتبوو، ئەوە خاوەن زەوی ناتوانێ کشتوکاڵەکە بەخۆڕایی هەڵکەنێ، بەڵکوو ئەبێ یا رازی ببێ بە کرێی زەوییەکە لەو کاتەوە کە پەشیمان ئەبێتەوە تا دەغڵودانەکە هەڵئەگیرێ بەپێی عادەت، یاخود کشتوکاڵەکە هەڵبکەنێ و تۆڵەی هەر زیانێك بداتەوە کە بکەوێ لە خاوەنی ئەو کشتوکاڵە. ئەگەر لافاو تووێکی لە شوێنێکەوە هێنا بۆ زەوی کەسێك و سەوز بوو، ئەوە هەر بەروبوومێکی ببێ، هی خاوەنی ئەو تووەیە؛ فەرموودەی راستتر ئەوەیە خاوەن زەوییەکە ئەتوانێ ئەگەر خاوەنی تووەکەی ناسییەوە، زۆری لێ بکا ئەو کشتوکاڵە سەوزبووە هەڵبگرێ، وە ئەگەر نەیناسییەوە، ئەتوانێ خۆی زەوییەکەی پاك بکاتەوە و ناتوانێ داوای کرێ لە خاوەن تووەکە بکا، چونکە ئەو ئەو تووەی نەهێناوەتە ئەو زەوییەوە، بەڵام ئەگەر دەستی هەبوو لە گەیشتنی ئەو تووەدا، بۆ ئەو شوێنە، وەك، ئەوە کە دابێتی بەدەم لافاوەکەوە و گەیشتبێتە زەوییەکەی ئەم کابراو روابێ، ئەوە کرێی ئەو ماوەیەی ئەکەوێتە سەر تا هەڵ ئەگیرێتەوە؛ دروستیشە رێك بکەون لەسەر هێشتنەوەی ئەو کشتوکاڵەی لەو شوێنەدا سەوز بووە تا کاتی دوورینەوەی دێت و بەرابەر بەوە، خاوەن توو، کرێیەك بدا بە خاوەن زەوی. هەروەها، ئەگەر خاوەن باخێکیش درەختی باخێکی تر بێ بەسەر باخەکەیاو سێبەری لەسەر بکا، ئەگەر خاوەنەکەی نەیبڕی، ئەم ئەتوانێ، بیبڕێ.

ئەگەر کەسێك سواری وڵاخێك بوو و وتی بە خاوەن وڵاخەکە: بە عاریە پێت داوم و خاوەنەکەی وتی: بەکرێ پێم داوی، یاخود خاوەن کشتوکاڵێك هەرایەکی لەم چەشنەی هەبوو لەگەڵ خاوەن زەوییەك، ئەوە خاوەنی وڵاخەکەو خاوەنی زەوییەکە، سوێند ئەدرێن و باوەڕ بە سوێنەکەیان ئەکرێت و کرێی وڵاخەکەو زەوییەکە وەرئەگرن وە ئەگەر لەپاش فەوتانی وڵاخەکە، بوو بە هەرایان، خاوەن وڵاخەکە ئەیوت: بە عاریە سواری بوویت، بۆ ئەوەکە ببێ بە زامن و قیمەتەکەی بدا و کابرای سوار ئەیوت: بەکرێ سواری بووم بۆ ئەوەکە نەبێ بە زامن بە بێ کەمتەرخەمی، ئەوە باوەڕ بە قسەی سوارەکە ئەکرێ، چونکە ئەسڵ زامن نەبوونە؛ ئەگەر خاوەن دەست وتی: بە عاریە پێت داوم، بۆ

ئەوە کە کرێ نەدا بە خاوەن وڵاخ و خاوەن ماڵ وتی: زەوتت کردووە، بۆ ئەوە کە کرێ وەربگری، و ماوەیەکیوا رابورد کە کرێی بکەوێو عەینەکەیش مابوو، ئەوە باوەڕ بە خاوەنوڵاخەکە ئەکرێو کرێی؛ وڵاخەکە وەرئەگرێ ئەگەر ئەم یەکنەکەوتنی قسەیە لەپاش فەوتانی عەینەکە بوو بە بەکارهێنانی لەغەیری ئەو شتەدا کە رێگەی بۆ دراوە، ئەوە هەردوولایان هاودەنگن لەسەرئەوە کە ئەو کابرای ماڵخوازە زامنە؛ بەڵام ئەگەر عاریە بێ، ئەوە راستتر ئەوەیە ئەو وڵاخە بە قیمەتی رۆژی فەوتانی ئەبژێررێتەوە نەك بە قیمەتی گرانتری لەماوەی بەینی وەرگرتنو فەوتانیا و نەك بە قیمەتی رۆژی وەرگرتنی؛ جا لەم سوورەتەدا، ئەگەر ئەو پارەیە کە خاوەن ماڵەکە داوای ئەکا، ئەوەندەی ئەوەبوو لە عاریەکەوە پەیدا ئەبێ یا کەمتر بوو، ئەوە وەریئەگرێ وە ئەگەر زیاتر بوو، ئەوە پێویستە خاوەنماڵەکە سوێند بخوا لەسەرئەوە کە موستەحەقی ئەو زیادەیەیەو ئەوجا وەریئەگرێ.

## باسی زەوت کردن (غَصْب)

زەوت کردن لەشەرعدا، بریتییە لەوە کەسێك شتێك بە ناحەق و بە شێوەی زۆر داگیر بکا کە حەقی کەسێکی تر بێ، خواە ئەو شتە لە جینسی «اختصاصات» بێ، وەك سەگی پاسو تەپاڵە، یا لە جینسی ماڵ بێ، کەم بێ یا زۆر، یا لە جینسی عەین بێ، وەك وتمان. یا لە جینسی مەعنەوی بێ، وەك ئەوە کە نەهێڵێت کەسێك لەشوێنێکا دابنیشێ کە حەقی خۆی بێ لەو شوێنەدا دابنیشێ، وەك مەنعی نوێژکەر لە بە کارهێنانی جێگە نوێژی خۆی، یا مەنعی قوتابی لە بەکارهێنانی شوێنی خوێندنەکەی، «ئیمامی غەزالی»، فەرموویە: هەرکەس بە رووگیری ماڵێك لە کەسێك وەربگرێو ئەویش لەشەرمدا بیداتێ، ئەوەیش حوکمی زەوت کردنی هەیە و کابرا نابێ بە خاوەنی ئەو ماڵەو حەرامە تەسەڕوفی تیا بکا؛ کەواتە؛ ئەگەر کەسێك سواری وڵاخی کەسێکی تر بوو، یا لەسەر فەرشی کەسێکی تر دانیشت کە نیشانەی حاڵ وانەگەیەنێ ئەو کەسە رازییە بەوە، ئەوە ئەم کەسە بە زەوتکەر دائەنرێ، خواە وڵاخەکە یا فەرشەکەی لەجێگەی خۆیدا

جووڵاندبێ یا نە و گواستبێتیەوە لەو شوێنەوە بۆ شوێنێکی تر، یانە، هەروەها لە هەرشتێکی ترا کە قابیلی گواستنەوەبێ. بۆ ئەوەی راست بێ بڵێین فڵانکەس، فڵانە شتی زەوت کردووە، هەر ئەوەندە بەسە داگیری بکا، ئیتر بیگوێزێتەوە یا نە.

ئەگەر کەسێك بەشێوەی زەوت کردن لەسەر فەرشێك دانیشت و لەپاش لاچوونی ئەو، کەسێکی تر هاتەسەر فەرشەکە، ئەوە ئەمیش هەر بە زەوتکەر ئەناسرێ، هەروەها ئەگەر چەندکەس بەرودوا بەشێوەی زەوت کردن لەسەر ئەو فەرشە دابنیشن؛ جا ئەگەر لەپاش ئەوە کە کابرای دووهەمیش رۆیشت، ئەو فەرشە فەوتا، ئەوە هەردووکیان بە زامن ئەناسرێن و لە بژاردنی ئەو فەرشەدا، هەرکامیان نیوەی قیمەتەکەی ئەدەن بە خاوەنەکەی؛ بەڵێ ئەگەر لەگەڵ خاوەن فەرشەکەدا بەیەکەوە لەسەر فەرشەکە دانیشتن و فەرشەکە فەوتا، یاخود لەگەڵ خاوەن وڵاخەکەدا سواربوو بەشێوەی زەوت کردن و وڵاخەکە فەوتا، ئەوە ئەبێ بە زامنی نیوەی قیمەتەکەی.

ئەگەر کەسێك پیاوێکی بە بێگار گرت لەگەڵ وڵاخەکەیدا و وڵاخەکە بەدەستی خاوەنەکەیەوە فەوتا، ئەوە زۆردارەکە کە خاوەن وڵاخەکەی بەسوخرە گرتووە، هەرچەند کرێی وڵاخەکەی ئەکەوێتە سەر، بەڵام نابێ بە زامنی ئەو وڵاخە، چونکە لە دەستی خاوەنەکەیدا بووە؛ بەڵێ، ئەمە لە وەختێکا وایە کە بارو کەلوپەلی کابرای زۆردار بەسەر وڵاخەکەوە نەبێ، ئەگینا ئەبێ بە زامن، چونکە بەهۆی ئەوکەلوپەلانەوە ئەم زۆردارە ئەبێ بە خاوەن دەست بەسەر ئەو وڵاخەوە؛ هەروەها، لەکاتێکا کە ماڵی کابرای زۆردار لەسەر وڵاخەکە نەبێ، ئەگەر بە زۆر فەرمانیدا بە خاوەن وڵاخەکە بەرێگەیەکی نابارا برۆنو وڵاخەکە بەهۆی ئەوەوە هەڵدێرا، یاخود دایان لە ئاوێك و ئاوەکە وڵاخەکەی برد، ئەوە ئەو زۆردارە بێجگە لەو گوناهە گەورەیە کە تووشی ئەبێ، زامنیش ئەبێ، چونکە لەم کاتەدا، لەراستیدا کابرا زۆردارەکە وڵاخەکەو خاوەن وڵاخەکە ئەبا بە رێوە و دەستی خاوەنوڵاخەکە بەسەر وڵاخەکەوە تەنها بە دیمەنەو لەراستیدا هیچ دەستێکی نییە.

ئەگەر کەسێك ماینێکی زەوتکردو نۆمای ماینەکە کەوتە شوێنی دایکی، ئەوە هەر بە زەوتکەری ماینەکە ئەناسرێ تا دەس ئەخاتە سەر نۆماکەیش بەهۆی ئەوەوەکە لێی

بخورێ یاخود بیکاتە ژوورەوە وە ئەگەر حەیوانێك بکەوێتە دوای شوانێك، ئەوە شوانەکە نابێ بە زامنی تا وەری نەگرێ یا لێی نەخورێ و ئەم حوکمە، بۆ وەختێکە شوانەکە باڵغ بووبێو خاوەن روشد بێ، بەڵام ئەگەر منداڵ یا نەفام بوو، ئەوە بەقەتعی نابێ بە زامنی ئەو حەیوانانە کە ئەدرێنە دەستی ـ هەرچەند وەریشیان بگرێ ـ چونکە منداڵو نەفام، دروست نییە ماڵیان بدرێتە دەست.

ئەگەر کەسێك بە پێ شتێکی جووڵاندو بەرزی کردەوە، بەڵام لە زەوی جیا نەبووەوە، ئەوە نابێ بە زامنی؛ هەروەها، ئەگەر بە پێ لەشوێنی خۆی لای‌بدا، یا بەدەست رای‌بکێشێ لە جێگەی خۆی بە بێ‌ئەوە کە بەرزی‌بکاتەوە و ئەگەر کەسێك رۆیشتە ماڵێکەوەو خاوەنەکەی دەرکرد، ئەوە بە زەوتکەری ئەو خانووە ئەناسرێ؛ هەروەها، ئەگەر خۆی نەرۆیشتە ناو خانووەکەوە، بەڵام هەر لەدەرەوە خاوەن ماڵەکەی لە خانووەکەی دەرکردو نەیهێشت بڕواتە خانووەکەی خۆی وە ئەگەر رۆیشتە ناو هۆدەیەکی خانووەکەو رێگای لە خاوەن ماڵەکە نەگرت لە هۆدەکانی تری ئەو خانووە، ئەوە هەر بە زەوتکەری ئەو هۆدەیە ئەناسرێ وە ئەگەر بە نیازی داگیر کردن، رۆیشتە خانوویەکەوەو خاوەنەکەی لەوێ‌بوو، ئەوە هەر بە زەوتکەر ئەناسرێ وە ئەگەر خاوەنەکەی لەوێ‌بوو بەڵام ئەم دەری نەکرد، ئەوە ئەگەر خاوەنەکەی تەنها کەسێك بوو، ئەو بە زەوتکەری نیوەی خانووەکە دائەنرێ. وە ئەگەر خانووەکە دوو خاوەنی هەبوو، بە زەوتکەری سێ‌یەکی دائەنرێ وە ئەگەر ئەم کابرا کە ئەچێتە خانووەکەوە ئەوەندە بێ‌دەسەڵات بوو بە داگیرکەری خانووەکە نەئەناسرا، ئەوە بەپێی شەرع بە زەوتکەر دانانرێ، خواه مەبەستی داگیر کردن بێ یا نە.

ئەگەر کەسێك حەیوانی برادەرێکی یا کەسێکی‌تری بە دەستی زەوتکەرێکەوە، یا بە دەمی گورگەوە دی‌و رزگاری کردو هێنایەوە بۆ ماڵەوە و پێش ئەوەی بۆی رێك‌کەوێ بیداتەوە بە خاوەنەکەی، فەوتا، ئەوە زامن نابێ وە ئەگەر توانی‌بووی بیداتەوە، بەڵام کەمتەرخەمی کردبوو تا فەوتابوو، ئەوە ئەمیش بە زەوتکەر دائەنرێ‌و زامن ئەبێ.

بە پێی شەرع، واجبە لەسەر ماڵ زەوتکەر، ماڵە زەوتکراوەکە بداتەوە بە خاوەنەکەی بە هەرچی زیادەیەکیەوە کە هەیە، چ ئەوەی پێیەوە بێ‌و چ ئەوەی لێی جیا

بێ و مەسرەفی ئەم دانەدواوەیەش لەسەر ئەو زەوتکەرەیە، هەرچەند زۆریشی تێبچێ وە ئەگەر زەوتکراوەکە لەوانەبێ کرێیشی ببێ، وەك وڵاخی باری، واجبە کرێی ئەو ماوەیەشی بدا کە لای‌بووە، ئیتر ئیشی پێ کردبێ یا نە؛ جا ئەگەر ئەو ماڵەی لە خاوەنەکەی زەوت کردبێ، واجبە بیداتەوە بە خۆی یا بە وەکیلی ماڵ وەرگرتنەوەی، یا بیبا لەنزیکیەوە بەجێی بهێڵێ، بەو شەرتە کە ئەو پێی بزانێ‌و هیچ‌شتێك نەبێ رێگای لێبگرێ کە وەری بگرێتەوە وە ئەگەر لە کەسێکی تری زەوت کردبێ، ئەوە دروستە بۆ خاوەنەکەی بەرێتەوەو دروستیشە بۆ ئەو کەسەی بەرێتەوە کە لێی‌وەرگرتووە، خـواه دەستی ئەمانەتی ببێ، وەك وەکیل‌و ماڵ بەئەمانەت لادانراوو کرێچی‌و رەهـن‌وەرگر، یاخود دەستی زەمانەتی هەبێ، وەك ماڵ خوازو هەرکەس کە ماڵەکەی لەسەر ئەساسی سەوداو مامەڵە وەرگرتبێ.

ئەگەر ماڵی زەوتکراو لای زەوتکەرەکە فەوتا، ئەبێ بەزامنی خۆی‌و هەر زیادەیەك کە لێی پەیدابووبێ، ئیتر هەرچۆن بێ وە ئەگەر کەسێك سەری خیگەیەکی کردەوە کە لەسەر زەوی دانرابوو و هەرچی تیابوو رژا، ئەوە ئەبێ بە زامنی ئەو ماڵە، هەروەها ئەگەر خیگەکە بەپێوە راوەستێنـرابـوو و بـەهۆی ئـەوەوە کـە ئـەم‌شەخسە دەرگابینەکەی کردووەتەوە، کەوت‌و رژا، ئەوە هەر زامن ئەبێ، هەرچەند خاوەنەکەی لەلای بێ‌و بتوانێ چاری بکاکەچی چاری نەکا وە ئەگەر لەوکاتەداکە دەمی خیگەگەی کردەوە، بایەکی بەهێز هات‌و هەرکە دەمی خیگەکەی کردەوە، باکە لێی‌داوکەوت‌و رژا، کابرا زامن ئەبێ، بەڵام ئەگەر لەو وەختەدا با نەبوو و لەپاشا با خستی، ئەوە زامن نابێ.

ئەگەر پەلەوەرێك لە قەفەزێکا بوو و کەسێك دەرگای قەفەزەکەی کردەوە وختەی داو پەلەوەرەکە دەرچوو لە قەفەزەکەو فڕی، یاخود لەخـۆیـەوە لەپـاش کـردنەوەی دەرگای قەفەزەکە هاتەدەرەوەو هەڵفڕی، یا پشیلەیەك لای قەفەزەکەدا بوو پەلاماری پەلەوەرەکەی داو ئەویش هەڵفڕی‌و رای‌کرد، ئەوە لە هەموو ئـەم سـوورەتانەدا، ئـەو کابرایە زامن ئەبێ.

**بزانن!** هەر دەستێك ماڵە زەوتکراوەکە لە دەستی زەوتکەر وەربگرێ، دەسـتی زەمانەتە، هەرچەند ئەو خاوەن دەستەیش بە زەوت کردنەکە نەزانێ و لەزاتی خۆیـا

دەستی ئەمانەت بێ، وەك وەكیلی زەوتکەرەکە یا ئەمینداری ئەو، چونکە دروستە بڵێیت: ئەمشەخسە، دەستی ناوەتە سەر ماڵی خەڵك بە بێڕێگادانێکی شەرعی و نەزانینەکەیش، هەر گوناهـ لائەبا ئیتر مەنعی زەمانەت ناکا؛ بەڵێ، ئیمامی «سبْكي»، تەرجیحی ئەوەیداوە ئەگەر کەسێك ماڵێك لەدەستی زەوتکەرێك وەربگرێ لەکاتێکا کە ئەو ماڵە لە مەیدانی فەوتانا بێ، پاشان لای ئەم شەخسە بە بێ کەمتەرخەمیو خەیانەت بفەوتێ، ئەوە زامن نابێ؛ جا ئەگەر کابرای دووهەم بەوە بزانێ کە شەخسی یەکەم زەوتکەر بووە، ئەوە وەك زەوتکەر لە زەوتکەر وایە و ئەو شتە ئەگەر لەلای فەوتا، ئەبێ بەزامنیو زامنییەکە قەرار ئەگرێ لەسەری و هەرشتێ کە داوا لە شەخسی یەکەم بکرێ، داوای لەمیش ئەکرێ، مەگەر زیادە قیمەتێکی ماڵەکە کە لای شەخسی یەکەم بووبێ، ئەوە هەر لەم داوا ئەکرێ؛ هەروەها، ئەگەر نەزانێ بەوەکە شەخسی یەکەم زەوتکەرە، بەڵام دەستی خۆی دەستی زەمانەت بێ، وەك ئەوە کە ئەو ماڵەی بەهۆی عاریە یا فرۆشتن یا قەرز یا قازانج بەشەراکەت لە زەوتکەرەکە وەرگرتبێ و ئەگەر نەزانێ بەوەکە ئەوکابرایە زەوتکەرەو دەستیشی لەئەساسدا دەستی ئەمانەت بێ، وەك وەکیلو ئەمیندار و ماڵەکە بە بێقوسوور لای فەوتابێ، ئەوە قەرار لەسەر زەوتکەرەکەیەو لەسەر ئەم شەخسە نییە؛ کەواتە، ئەگەر زەوتکەرەکە ئەو ماڵە بیژێرێ، ناتوانێ هیچ لەم شەخسە بسێنێ وە ئەگەر بەم شەخسەیان بژارد، ئەتوانێ هەرچی داوە بە خاوەن ماڵەکە، لەم زەوتکەرەی بستێنێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر کەسێك بەشێوەی بەخشش ئەو ماڵە زەوتکراوەی لەلایەنی زەوتکەرەکەوە دەسکەوت، ئەوە هەرچەند دەستی، دەستی ئەمانەتە، هەر حوکمی زەمانەتی هەیە، چونکە ئەو ماڵەی بۆ ئەوە وەرگرتووە ببێ بە موڵکی خۆی.

تا ئێستا، قسەمان لەوەبوو ئەو ماڵە بەلای شەخسی دووهەمەوە بفەوتێو ئەم شەخسە خۆی سەربەخۆ نەیفەوتێنێ وە ئەگەر هاتو ئەم کابرا خۆی سەربەخۆ ئەو ماڵەی فەوتاند؛ مەسەلا، حەیوانەکەی سەربڕی و یا مەنجەڵەکەی فرۆشت، ئەوە لەم وەختەدا قەراری زەمانەت هەر لەسەر ئەمە؛ ئەگەر شایەد ئەو ماڵەیان بە شەخسی یەکەم

بژارد، ئەو ئەتوانێ هەرچی داوە، لەم شەخسی دووهەمەی وەربگرێتەوە، خواه دەستی ئەمانەتی هەبێ یا دەستی زەمانەت.

بەڵام ئەگەر سەربەخۆ نەیفەوتاند؛ مەسەلا، زەوتکەرەکە هەڵینا بۆ فەوتاندنی، ئەمە ئەگەر ئەم فەوتاندنە بۆ مەبەستی زەوتکەرەکەی بێ، وەکوو ئەوەکە زەوتکەر فەرمان بدا بەم شەخسە ئەو حەیوانە سەرببڕێ بۆی، یاخود فەرمان بدا ئەو جلەی بۆ ببڕێ بە کەواو جلەکە زەوتکراو بێ، ئەوە لەم وەختەدا، بڕیار هەر لەسەر زەوتکەرە، یەعنی شەخسی یەکەم وە ئەگەر بەم شەخسی دووهەمەیان بژارد، ئەتوانێ هەرچی داوە لەوی وەربگرێتەوە وە ئەگەر بە بێمەبەست یاخود بۆ مەبەستی شەخسی دووهەم بێ؛ مەسەلا، بڵێ: ئەو حەیوانە سەرببڕە بۆخۆت، ئەوە بڕیار لەسەر کابرای دووهەمە، چونکە خۆی فەوتاندوویەتی بۆ مەبەستی خۆی یا بە بێمەبەست؛ جا لەسەر ئەم ئەساسە، ئەگەر زەوتکەر خۆراکێکی زەوت کرد لەکەسێك و بەڕێکەوت دانیایەوە لە بەردەمی خاوەنەکەیداو [خاوەنەکە] خواردی، ئەوە قەرار لەسەر خۆیەتی و زەوتکەر لە حەقەکەی رزگار ئەبێ؛ هەروەها، ئەگەر بە فرۆشتن یا بە قەرز بیداتەوە بە خاوەنەکەی، یا دایبنێ لەپێش دەمیاو بزانێ ماڵی خۆیەتی؛ هەروەها، ئەگەر بەئەمانەت دایبنێ لەلای، یا بە رەهن، یا بە ئیجارە، یا بە قازانج بەشەریکی، بەڵام بزانێ ئەوماڵە ماڵی خۆیەتی؛ لە هەموو ئەم سوورەتانەدا، ئەم کابرایە دەستی ئەگاتەوە بە ماڵەکەی خۆی. بەڵام پێویستە ئەو ماڵە زەوتکراوە کە ئەکەوێتەوە دەستی خاوەنەکەی، لەسەر شێوەی پێشووی بێ، ئەگینا کەسێك گەنم یا حەیوان لە کەسێك زەوتبکاو گەنمەکە بهاڕێو بیکا بە نان، یا حەیوانەکە سەرببڕێو بەوگۆشتو نانە خۆراکێك دروستبکا و لەپێش دەستی خاوەنەکەیا دایبنێو ئەویش بیخوات، زەوتکەرەکە لە حەقی کابرا رزگاری نابێ، لەبەرئەوە کە بەهۆی ئەو تەسەروفاتە کە کابرا کردوویەتی لە ماڵە زەوتکراوەکەدا، ئەو حەقە بووەبەقیمەت و چووەتە ئەستۆی زەوتکەرەکەوە و هەر حەقێك بوو بە قیمەت، بە بێئاگای خاوەن ماڵو بە بێرەزامەندی ئەو، ئەستۆی بەری نابێو بەدەڵەکەی لەجیاتی ئەودا دانامەزرێ.

ماڵی زەوتکراو، یا وێنەدار (مِثلي)یە یا نرخ بـۆدانـراو (مـتقوّم)ە، فـەرموودەی راستتر ئەوەیە لە بابەتی زەوتکردنا، وێنەدار ئەوەیە بە پێوانەو کێشانە موعامەلەی تیا بکرێو سەلەمیشی تیا دروست بێ و هەرچی بە پێوان یا بە ژمـارە مـوعامەلەی تـیا بکرێ، ئەوە بە نرخ بۆدانراو دائەنرێ. وێنەدار، وەك ئـاوو گـڵو لمو مسو شـووشی ئاڵتوونو زیوو میسكو کافوورو لۆکەو ترێو خـورماو هـەر مـیوەیەکـی تری تـەڕ، هەروەها ئاردو دانەوێڵە، وەك گەنمو جۆو زەڕاتو برنج و ماستو ڕۆنو شیرو دۆیەك کە ئاوی تیا نەبێ؛ نرخ بۆدانراویش، وەك حەیوانو دارو پارچەی پۆشاكو فـەرشو نوێنو سندووقو کەوشو ئەم جۆرە شتانە و مادام بڕیارماندا کە وێنـەدار لەبـابەتی زەوت کردنا ئەبێ سەلەمی تیا دروستبێ، گەنمو جۆی تێکەڵ کراو بە وێنەدار دانانرێو بەر نرخبۆدانراو ئەکەوێ، هەروەها هەرشتێ کە تێکەڵ بێ لە چەند بەشێکی وێنەدار.

جا ئەگەر ماڵە زەوتکراوەکە بە عەینی خۆی مابێتەوە، ئەوە واجبە بدرێتـەوە بـە خاوەنەکەی وە ئەگەر فەوتابوو یا فەوتێنرابوو، مادام وێنەدار بێ، ئەبێ هاوچەشنەکەی بدرێ بە خاوەنەکەی، لەجیاتی گەنم، گەنم و لەجیاتی ڕۆن، ڕۆن،...، مەگەر لەگـەڵ خاوەنەکەیدا ڕێ بکەوێ لەسەر قیمەتی ماڵەکە وە ئەگەر هاوچەشنی ئـەو شـتە لەو شوێنەدا نەبوو بە نەبوونی «حِسّي»، وەکوو ئەوە کە لەو شوێنەداو لە دەوروبـەریا تـا مەسافەی دوو مەنزڵ دەس نەکەوێت، یاخود بە نەبوونی شەرعی، وەك ئەوە کە شتەکە ببێ، بەڵام بەزیاتر لە قیمەتی وێنەی خۆی بیفرۆشن، ئەوە لەو سوورەتەدا، قیمەتی ماڵە زەوتکراوەکە تەسلیم ئەکرێ؛ فەرموودەی راستتر ئەوەیە ئەو قیمەتەی کە ئەدرێ بە خاوەنی ماڵی زەوتکراو، ئەبێ بەرزترین قیمەتی بێ لەکاتی زەوت کردنیەوە تا کاتی دەسنەکەوتنی ئەو شتە زەوتکراوە.

وە ئەگەر ئەو ماڵە زەوتکراوە وێنەدارە، گوێزرابووەوە بۆ وڵاتێکی تر، ئەوە خاوەن ماڵەکە ئەتوانێ داوا بکا ئەو ماڵەی بۆ بهێنـنەوە، ئـەیشتوانـێ داوای لای ژووروی قیمەتی ئەو ماڵە بکا لەو شوێنەداو قیمەتەکەی وەربگرێتەوە؛ جا هەر کاتێك کـابرای زەوتکەر ماڵەکەی هێنایەوە، ئەمیش قیمەتەکەی ئەداتەوە؛ ئەگەر ماڵەزەوتکراوەکە

فەوتابوو لەو وڵاتەدا کە بۆیبراوە، خاوەنەکەی ئەتوانێ داوای هاوچەشنی بکا لە هەرکام لەو دوو شۆینەدا، یەعنی لە شوێنی زەوت کردنەکەو لەو شوێنەدا کە ماڵەکەی تیا فەوتاوە؛ جا ئەگەر هاوچەشنی لە هیچ لایەکیانا نەبوو، ئەتوانێ قیمەتی لە کام لایاندا زۆرترە، داوای ئەویانە بکا لە زەوتکەرەکە.

ئەگەر خاوەن ماڵ گەیشت بە ماڵ زەوتکەرەکە لە غەیری ئەو شوێنەدا کە ماڵەکەی تیا فەوتاوە، ئەوە فەرموودەی راست ئەوەیە ئەگەر گواستنەوەی ماڵەکە لەشوێنی فەوتانیەوە بۆ ئەو شوێنە، زەحمەتی تیا نەبوو؛ مەسەلا، نەخت بوو، ئەتوانێ لە هەمان شوێندا کە تیا گەیشتووە بە کابرای زەوتکەر، هاوچەشنی ماڵە زەوتکراوەکەی لێبسێنێ وە ئەگەرگواستنەوەی لەو شوێنەوە زەحمەت بوو، وەك گەنمو برنجو شتیوا، ئەوە داوای هاوچەشنی نەکا، بەڵکوو گرانترین قیمەتی ماوەی زەوتکرانی ماڵەکەی لێبسێنێ وە ئەگەر ماڵە زەوتکراوەکە نرخ بۆدانراو بوو، ئەوە واجبە لای سەرووی قیمەتی بدا لە رۆژی زەوتکرانیەوە تا رۆژی فەوتانی. هەرشتێ کە لە زەمانەتی خاوەن دەستا فەوتابێ بە بێزەوتکردن، وەك ماڵی خواستەمەنی کە بە غەیری بە کارهێنانی رێگادراو فەوتابێ، ئەویش، ئەگەر وێنەدار بوو، واجبە هاوچەشنەکەی بداتەوە وە ئەگەر نرخ بۆدانراو بوو، واجبە قیمەتی رۆژی فەوتانەکەی بدا بە خاوەنەکەی لەو شوێنەدا کە تیا فەوتاوە، ئەگەر ئاوەدانی بێ. وە ئەگەر ئاوەدانی نەبوو، تەماشای نرخی نزیکترین ئاوەدانییەك ئەکرێ لەو شوێنەوە.

وە ئەگەرکەسێك حەیوانێکی زامدارکرد کە بەدەستی خاوەنەکەیەوە بوو، وە بەهۆی ئەو زامەوە مرد، واجبە لای سەرووی قیمەتی ئەو حەیوانە بدا لەکاتی فەوتانیەوە.

**بزانن!** هەر سەرخۆشکەرێکی وشك، وەك «حەشیشە»، لای هەرکەسێ بێ، کەس حەقی ئەوەی نییە بیفەوتێنێو لەکیسی خاوەنەکەی بدا، چونکە پاکەو فرۆشتنی دروستە، مەگەر کابرا بە ئاشکرا و بەپێچەوانەی ئوسوولی ئایین، بیخوا، ئەوکاتە، بە فەرموودەی حاکمی شەرع، دەسی بۆ ئەبرێ.

هەر سەرخۆشکەرێکی تەڕ، ئەگەر حورمەتی شەرعی هەبێ، وەك ئەو شەرابەی کە خاوەنەکەی بۆ سرکەی ئەوێ، ئەوە بە قەتعی دروست نییە کەس دەسی بۆ بەرێ وە

ئەگەر حورمەتی نەبوو، وەك شەرابی ئەهلی زیممە، ئەوە ئەگەر شەرابی تایبەتی خۆیان بوو کە دوور بێ لە موسوڵمانان، ئەویش کەس حەقی نییە دەسی بۆبەرێ وە ئەگەر بێتە ناو موسوڵمانانەوە بۆ فرۆشتنو خواردنەوەی بەئاشکرا، ئەوە ئەگەر کەسێك رژاندی، نابێ بە زامنی، چونکە پیسەو قەدری نییە، بەڵام لایق نییە بە بێ‌فەرمانی قازی کەس دەسیان بۆبەرێ، چونکە ئیمامەکانی دین، قسەو بیروباوەڕیان جیاوازە لەبارەی سەرخۆش‌کەرەکانەوە، هەتاوەکوو ئەگەر کەسێك عەینی شەرابەکەی وەرگرتبووە لای خۆی، ئەبێ بیداتە دواوە بۆ خاوەنەکەی.

ئالاتی رابواردن (لَهو)یش، وەك تارو تەموورەو زوڕناو شتی‌وا، ئەگەر کەسێك تێکیان بدا، هیچی لەسەر واجب نابێ، چونکە بە کارهێنانیان حەرامە، بەڵام نابێ بەجۆرێکی وا بیان شکێنێ کە بەتەواوی لەکەڵك بکەون، بەڵکوو بەشەکانی وەك پێش دروست کردنو یەك خستن، لەیەك بکاتەوە وە ئەگەر ئەوکەسە کە قایل نابێ بە مانەوەی ئەم ئالەتانە، نەیتوانی بەمجۆرە لەیەکیان بکاتەوە، ئەوە بۆی هەیە هەرچۆن پێی‌کرا بیان‌شکێنێو دەفعی ئەو حەرامە بکا؛ ئەمانەی کە وتمان، حوکمێکن وەختی خۆی جێ‌بەجێ کراون، بەڵام لەم‌وەختەدا کە قانوونی مەدەنی لە وڵاتا دامەزراوەو هەر شتێك ئوسوولێکی تازەی هەیە، بەقەتعی، دروست نییە بە بێ‌فەرمانی قازی شەرعو کاربەدەستانی حوکوومەت دەس بردن بۆ ئەم جۆرە وەزعانە، چونکە ئەبێ بەهۆی تێکچوونی نیزامو بڵاوبوونەوەی ئاشووب لەناو ئەفرادی میللەتدا و واجبە لەسەر موسوڵمان هەمیشە ئاگاداری پاراستنی ئەمن‌و ئاسایش بکا و ئاگای لەم جۆرە واجباتە بێ تافیتنەو ئاشووب لەناو موسوڵمانانا پەیدا نەبێ.

بزانن! زەوت‌کەر هەرشتێکی زەوت کرد وەك دووکانو خانوو و ئەرزو ئاو و باخ و حەیوانات، وەك ئەبێ بە زامنی عەینی ئەو شتانە، ئەبێ‌بە زامنی قازانجو سوودیشیان؛ مەسەلا، ئەو دووکانو خانووە هەرچەند بەپێی عادەت کرێیان هەبێ، ئەو کرێیەیان رۆژبەرۆژ حیساب ئەکرێ، هەروەها ئەرزو ئاوو سەمەری باخیش و هەر قازانجێك لە حەیوانەوە بێ، وەك کرێی وڵاخی باری و خوری و موو و شیرو رۆنی حەیوانی وردەو

بەرزە، هەمووی حیساب ئەکرێ لەسەری، خواە کابرای زەوتکەر خۆی ئەو قازانجە وەربگرێ یا هەروەها بەهۆی زەوتکردنەکەوە بفەوتێن، بەبێ ئەوەی کەڵکیان لێ وەربگیرێ.

فەرموودەی راستتر، ئەوەیە لەشی ئینسانی ئازاد ناکەوێتە بەر زامن بوون، مەگەر بەهۆی بەکارهێنانەوە، یەعنی زەوتکەرەکە ئیشی پێبکا؛ مەسەلا، کەسێك پیاوێکی گرتو مانگێك ماتڵی کرد، ئەگەر لەو ماوەیەدا ئیشی پێنەکرد، ئەوە بێجگە لەگوناهی ئەم کردارە ناپارە، هەرکاتێك بەرەڵڵای کرد، کرێی ئەوکەسەی ناکەوێتە سەر وە ئەگەر ئیشی پێ کرد، ئەوە کرێی عادەتی هاوچەشنی خۆی ئەکەوێتە سەر بۆ ئەو ماوەیەی کە ئیشی پێ کردووە تیابدا؛ بەڵێ، ئەگەر کەسێك کەسێکی بردو دووری خستەوە، هەرکاتێك بەرەڵڵای کرد، واجبە لەسەری مەسرەفی گەڕانەوەی بدا تا ئەگاتەوە جێی خۆی وە ئەگەر کەسێك کچێکی کون کرد بە شوبهە، یا بەزۆر بە «زینا»، ئەوە بێجگە لە حەددی شەرعی، واجبە «مهرُ المِثل»ی بێوەژنێکی وەك خۆی پێبدا لەگەڵ تۆڵەی کچێنییەکەیدا لەگەڵ حیسابی قیمەتو دانانی ئەو ئافرەتە ئازادە (حُرّة) بە کەنیزەك (جارية)؛ بەڵام چوونە لای بێوەژن، تەنها ئەبێ بەهۆی واجب بوونی «مهرُ المِثل»و بەس.
قازانجی مزگەوتو قوتابخانەو تەکیەو میوانخانەو وەقفکراوی تری لەم چەشنە، وەك قازانجی لەشی ئینسانی ئازاد وایە؛ جا ئەگەر کابرا هەمووی بەکار هێنا، واجبە لەسەری کرێی عادەتی هەموو شوێنەکە بدا وە ئەگەر گۆشەیەکی بە غەیری ئیستیحقاقی شەرعی داگیر کرد، ئەوە پێویستە لەسەری کرێی ئەو گۆشەیە بدا و ئەم کرێیە سەرف ئەکرێ بۆ مەسڵەحەتی ئەو شۆینە وەقف کراوە.

هەر کاتێك ماڵێکی زەوتکراو بە بێ بەکارهێنان ناتەواوییەکی ماددی یا مەعنەوی بەسەراهات؛ مەسەلا، کەسێك قاترێکی باریی زەوت کرد و ئەو قاترە لای زەوتکەرەکە کوێر بوو، یا شەل بوو یاخود شێت بوو، ئەوە واجبە لەسەر زەوتکەرەکە کرێی ئەو ماوەیەی زەوت کردنەکە بداو تۆڵەی ناتەواوییەکەشی بکاتەوە بۆ خاوەنەکەی؛ هەروەها، ئەگەر بەهۆی بەکارهێنانەوە ناتەواو بوو، وەك ئەوە کابرایەك کەوایەك

زەوتبكاو لەبەری‌بكا تاكۆن ئەبێ، ئەویش، كرێو حەقی بژاردنەوەی ناتەواوییەكەی لەسەر واجب ئەبێ.

## باسی یەك نەكەوتنی قسەی خاوەن ماڵو زەوتكەر و هەندێ وردەبابەتی تر

ئەگەر زەوتكەر ئیددیعای فەوتانی ماڵە زەوتكراوەكەی كرد و بەیانی سەبەبێكی وایشی كرد بۆ فەوتانەكە كە ئاشكرا بوو و تێكرای شوێنی ماڵە زەوتكراوەكەو دەوروبەری ئەگرتەوە، وەك ئاگرێك كەكەوتبێتەوەو خەڵك پێی بزانن‌و ئاگرەكەش عام بووبێ، یاخود هیچ بەیانی سەبەبی نەكرد، یا بەیانی سەبەبێكی نهێنی كرد، یا بەیانی سەبەبێكی وای كرد كە خەڵك پێیان ئەزانی، بەڵام بەوەیان نەئەزانی كە ئەو شوێنەی گرتبێتەوە كە ماڵە زەوتكراوەكەی تیا بووە و لەم سێ سوورەتەی دوایدا، خاوەن ماڵەكە باوەڕی پێ‌ئەكرد، ئەوە ئەو زەوتكەرە بە بێ‌سوێند باوەڕی پێ‌ئەكرێ، وە ئەگەر خاوەن ماڵ باوەڕی پێ نەكرد، ئەوە زەوتكەرەكە سوێند ئەدرێ؛ جا كە سوێندی خوارد، ئەمجار خاوەن‌ماڵەكە ئەو ماڵە فەوتاوەی پێ ئەبژێرێ؛ ئەگەر وێنەدار بوو، وێنەكەی لێ‌ئەسێنێ وە ئەگەر نرخ بۆدانراو بوو، نرخی لای ژووروویی لێ وەرئەگرێ لە رۆژی زەوت كردنیەوە، وەك باسمان كرد. وە ئەگەر ناكۆكییان لە قیمەتی ماڵە زەوتكراوەكەدا بوو، یا لە قیمەتی جلی وڵاخەكەدا، یا لە زینی ئەسپە زەوتكراوەكەدا، یا لە كۆنی عەیبەكەیدا؛ مەسەلا، زەوتكەرەكە ئەیوت: ئەو حەیوانەت كە من زەوتم كرد، هەر لە سكومادا كوێر بووە و خاوەن ماڵیش، ئەیوت: هەر لەئەساسەوە بێ‌عەیب بووە، یاخود: لای تۆ عەیبدار بووە، ئەوە باوەڕ بە سوێندی زەوتكەرەكە ئەكرێ وە ئەگەر هەردووكیان هاودەنگ بوون لەوەدا كە عەیبێكی تازە پەیدابووە بە وڵاخەكەوە، بەڵام خاوەن ماڵ ئەیوت: لای زەوتكەرەكە پەیدا بووەو زەوتكەرەكەش، ئەیوت: هەر لای خاوەنەكەی بووە، ئەوە سوێندی خاوەن ماڵ جێگای باوەڕە.

ئەگەر زەوتكەرەكە ماڵەكەی ناردەوە، بەڵام لەو كاتەدا قیمەتی كەمتر بوو لە قیمەتی زووی، ئەوە زەوتكەرەكە هیچی لەسەر نییە. ئەگەر كەسێك جلێكی زەوت كرد كە بایی

دە درەم بوو و بەهۆی هەرزانییەوە بوو بە پێنج درەم و زەوتکەرەکەیش لە بەری کردو کۆنی کرد تا قیمەتی بوو بە نیو درەم، جا ناردیەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەوە پێنج درەمی ئەکەوێتە سەر کە بریتییە لە بەشی ئەوەی کە فەوتاوە لە قیمەتی لای سەرووی ئەوماڵە زەوتکراوە. ئەگەر کەسێك جووتێ کەوشی زەوت کرد کە قیمەتی دە درەم بوو، پاشان تایەکیان فەوتاو ئەو تاکەی ناردەوە کە دوو درەم ئەژیا، ئەوە ئەو زەوتکەرە هەشت درەمی ئەکەوێتەسەر، پێنج درەمی حەقی تا فەوتاوەکەو سێ درەمیشی تۆڵەی ناتەواوی ئەو تایەیە کە قیمەتی بەتەنها بووە بە دوو درەم، هەروەها ئەگەر ئەو تایە بەهۆی زەوت کرانەوە بفەوتێنێ یا هەر لەدەستی خاوەنەکەیا بیفەوتێنێ، ئەوە عەینی حوکمی پێشووی هەیە؛ ئەم حوکمەی لە جووتە کەوشا بەیانکرا، بۆ هەموو شتێکی تریشە کە دوو تاکی هەبێ و تاکێکیان بێ ئەویان بەکارنەیەت، وەك دوو تاکی پەنجەرە و وەك پەلەوەرێك کە بێ هاورێکەی نەیکرێ.

ئەگەر ماڵە زەوتکراوەکە ناتەواوییەکی وای تیا پەیدابوو کە بوو بەهۆی فەوتانی ماڵەکە، وەك ئەوە کە گەنمێك زەوت بکاو بیکا بە گەنمە کوتاوو لێی بنێ بە چێشت، یا ئاوی کردە ناو زەیتو ئاوەکە دەرنەچوو، یا گەنمەکەی لە جێگایەکی تەڕدا دانا تا بۆگەنی کرد، یاخود حەیوانێکی زەوت کردو سەری بڕی و گۆشتەکەی کرد بە چێشت، ئەوە ئەو ماڵە زەوت کراوە وەك فەوتاوی لێ دێ و واجبە لەسەر زەوتکەرەکە یا ماڵێکی وەك ئەو ماڵە زەوتکراوە بدا بە خاوەن ماڵەکە، ئەگەر وێنەدار بوو، یا قیمەتەکەی بداتێ، ئەگەر قیمەت بۆدانراو بوو و لەم وەختەدا، زەوتکەرەکە ئەبێ بە خاوەنی ئەو ماڵە، چونکە قیمەتەکەی لەئەستۆیدا دامەزراوە، بەڵام دروست نییە هیچ جۆرە تەسەڕوفێك بکا لەو ماڵەدا تا هاوچەشنی یا قیمەتەکەی ئەدا بە خاوەنەکەی، ئەگەر خۆی لەو شوێنەدا بوو، یا بە قازی شەرعی ئەو شوێنە، ئەگەر خۆی دیار نەبوو و بەقەتعی تا هاوچەشنەکەی یا قیمەتەکەی نەدرێ بە خاوەنەکەی یا بە قازی، دروستنییە نە خۆی و نە کەسێکی تر لەو ماڵە بخۆن و دروست نییە هیچکەس لەو ماڵە وەربگرێ، چونکە شتی وا بێجگە لەوەکە ئەبێ بەهۆی ئەوە خەڵك دەمسوور ببن لەسەر

زەوت كردنی ماڵی خەڵكی تر، ئەسڵی ماڵەكەش لە حوكمی ئەوەدایـە كـە لە رەهـنی قیمەتەكەیدا بێ.

وە ئەگەر ئەو ناتەواوییە بەبێ ئیشی زەوتكەرەكە پەیدا بووبێ، وەك ئەوە كە ماڵە زەوتكراوەكە خواردەمەنییەك یا میوەیەك بێو دابنرێ لە جێی خۆیاو بۆن بكا، ئـەو پێویستە خاوەنەكەی ئەو ماڵە بەوجۆرە وەربگرێتەوەو تۆڵەی ناتەواوییەكەی وەربگرێ.

ئەگەر كەسێك زەوییەكی زەوت كردو گڵەكەی گواستەوە بۆ شوێنـێكـی تر، ئـەوە خاوەنەكەی ئەتوانێ ناچاری بكائەو گڵە بگێڕێتەوە بۆ ئەو شوێنە كە لێی وەرگیراوە و زەوییەكەش وەك پێش لابردنی گڵەكە لێ بكاتەوە، هەروەها دروستە بۆ زەوتكەرەكەش كە گڵەكەی گواستووەتەوە لەخۆیەوە بیهێنێتەوە، هەرچەند خاوەنەكەیشی پێی نـەڵێ مادام مەبەستێكی شەرعی هەبێ، وەك چۆڵ كردنی موڵكی خـۆی، ئـەگـینا بـە بـێ ڕێگادانی خاوەنەكەی دروست نییە بیباتەوە بۆ ئەو شوێنە؛ هەروەها، هەڵكەندنی بیرو پڕكردنەوەی، یەعنی ئەگەر خاوەنماڵەكە فەرمانیدا، پێویستە پڕی بكاتەوە؛ ئـەگـەر خۆی مەبەستێكی شەرعی هەبوو لە پڕ كردنەوەیدا؛ مەسەلا، بـۆ ئـەوە كـە خـەڵكـی تێنەكەوێ، ئەوە بۆی دروستە كە پڕی بكاتەوە، ئەگینا بەبێ ڕێگادانی خاوەنەكـەی دروست نییە؛ جا هەر كاتێ ئەو زەوتكـەرە زەوییـەكـەی وەك خـۆی لێ كـردەوەو ناتەواوی پێوە دیار نەبوو، ئەوە هیچی لەسەر نییە، بەڵام كرێی ماوەی پڕ كردنەوەكەی ئەكەوێتە سەر وە ئەگەر ناتەواوییەكی پێوەما، كرێی پڕكردنەوەكەی ئەكەوێتەسەر.

ئەگەر كەسێك ڕۆنێكی زەوتكردو گـەرمی كـرد و بـەهۆی ئـەو گـەرم كـردنەوە كێشانەی كەمی كرد، بەڵام قیمەتی وەك خۆی مایەوە، پێویست ئەبێ لەسەری ڕۆنەكەی بداتەوەو چەندی كەم كردووە بیداتەوە وە ئەگەر هەر قیمەتی كەمی كـردبوو، ئـەبێ تۆڵەی ناتەواوییەكەی بدا وە ئەگەر قیمەت و سەنگی هـەردووكیان كـەمی كـردبوو، پێویستە وێنەی ئەوەی كە فەوتاوە بیدا بە خاوەنەكەی لەگەڵ تۆڵەی ناتەواوییەكەیدا؛ ئەگەر ناتەواوی قیمەتەكەی زیاتر بوو لە كەمبوونەوەی عەینەكەی، وەك ئەوە كە دوو كیلۆ ڕۆن زەوت بكاكە قیمەتەكەی دوو دینار بێ وگەرمی بكا تا ببێ بە كیلۆیەك، بەڵام

نرخەکەی ببێ بە نیو دینار، ئەوە پێویستە لەسەری لەگەڵ دانەوەی ماڵە زەوتکراوەکەدا یەك کیلۆ ڕۆن و نیو دینار بدا وە ئەگەر ناتەواوی قیمەتەکەی ئەوەندی کەم بوونەوەی عەینەکەی بوو، یاخود کەمتر بوو، ئەوە هەر تەنها ئەوە ئەبژێرێ کە فەوتاوە؛ مەسەلا، کە دوو کیلۆ، ڕۆنی زەوت کرد کە بایی دوو دینار بوو و گەرمی کرد تا بوو بە کیلۆیەكو قیمەتەکەی بوو بە یەك دینار، ئەوە پێویستە ئەو کیلۆ ڕۆنە کە ماوە بیداتەوە لەگەڵ کیلۆیەکی وەك کیلۆ فەوتاوەکەدا.

ئەگەر کەسێك حەیوانێکی زەوت کرد، ئەوجا حەیوانەکە لەڕیو لاوازییەکی وای بەسەراهات کە دەیەکی قیمەتی کەم کردەوە و پاش ئەوە قەڵەو بووەوە، جا کابرای زەوتکەر حەیوانەکەی دایەوە، ئەوە پێویستە تۆڵەی ناتەواوی ئەو لەڕیو لاوازییەی بداتەوە وە ئەگەر کەسێك دۆشاوێکی ترێی زەوت کرد و پاشان دۆشاوەکە بوو بە شەرابو ئەوجا بوو بە سرکە، ئەوە ڕاستتر ئەوەیە ئەو سرکەیە ماڵی خاوەنەکەیەتی و پێویستە لەسەر زەوتکەرەکە تۆڵەی ناتەواوی قیمەتەکەی بداتەوە، ئەگەر قیمەتەکەی کەمتر بێ لە قیمەتی دۆشاوی ترێکە وە ئەگەر کەسێك هێلکەی لە کەسێك زەوت کردو پاشان مریشك هێلکەکەی هەڵهێناو کردی بە جووجکە، یاخود تووێکی زەوت کردو چاندیو تووەکە ڕوا، ئەوە ئەگەر ئەم هێلکە هەڵهاتووە یا ئەم تووە ڕواوە، قیمەتیان وەك جاران وابوو یا زیاتر بوو، ئەوە باشە، ئەگینا ئەگەر کەمی کردبوو، ئەوە ئەبێ زەوتکەرەکە قیمەتی ناتەواوییەکەی بداتەوە بە خاوەنەکەی وە ئەگەر کەسێك شەرابێکی زەوت کردو شەرابەکە پاشان بوو بە سرکە، یا پێستی مرداربووەوەیەکی زەوت کردو دەباغی کرد، ئەوە فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە ئەو شەرابەو ئەو پێستەدەباغی دراوە، هی خاوەنەکەیانن.

## باسی هەندێ حوکمی زەوت کردنو زەوتکراو

هەرچی زیاد ببێ لەسەر ماڵی زەوتکراو، ئەوە ئەگەر عەین نەبێ بەڵکوو سیفەت بێ، وەك گازری کردنی خامی زەوتکراو، یەعنی کابرایەك خامێك زەوت بکاو گازری بکا، یا وەك هاڕینی گەنم، ئەوە هیچی لێ پەیدا نابێ، یەعنی واجبە زەوتکەرەکە ئەو

ماڵە بەوجۆرە بداتەوە بە خاوەنەکەی و خۆی هیچی دەس‌ناکەوێ، بەڵکوو خاوەن ماڵەکە ئەتوانێ داوای ئەوەی لێ‌بکا کە ماڵە زەوت‌کراوەکە وەك زەمانی پێشووی لێ‌بکاتەوە، ئەگەر شتیٚ‌وای لەتوانادا بێ، وەك ئەوە کە گڵێك زەوت بکاو بیبڕێ بە خشت، لەم حاڵەدا، خاوەن ماڵ ئەتوانێ ناچاری بکا ئەو خشتە کاڵانە بشکێنێ‌و وەك جاران بیان‌کاتەوە بە گڵ، هەروەها، ئەتوانێ داوای تۆڵەی ناتەواویشی لێ‌بکاتەوە ئەگەر ئەو ماڵە بەو دەست‌لێدانە ناتەواوی بەسەر قیمەتەکەیدا هاتبێ. ئەتوانێ کرێیشی لێ‌بستێنێ ئەگەر کرێی ببێ، وەك جلێك کە زەوت‌کەرەکە بە دەزووی خاوەن‌ماڵەکە بیدووریٚ‌و بیکاتە بەری.

وە ئەگەر ئەو زیادەیە عەین بوو، وەك خانوویەك کە لە ئەرزی زەوت‌کراوا بکرێتەوە و دارێك کە لەو ئەرزەدا بنێژرێ، ئەوە خاوەن ماڵەکە ئەتوانێ داوای ئەوە بکا ئەو خانووە بڕووخێنێ‌و ئەو درەختانە هەڵکێشێ‌و زەوییە زەوت‌کراوەکەیش وەك ئەوسا لێ‌بکاتەوە، بەڵام لە خاوەن ماڵەکە بەولاوە کەس ناتوانێ خانووەکە بڕووخێنێ‌و درەختەکان هەڵکێشێ و هەرکەس دەسیان بۆ ببا، ئەبێ ئەگەر ناتەواوییەکیان تیا پەیدا بوو، بیبژێرێ بۆ زەوت‌کەرەکە؛ بەڵێ، ئەگەر کەرەستەی ئەو خانووەو ئەو درەختە نێژراوانە هی ئەو کەسە بێگانەیە بوون و کابرای زەوت‌کەری زەوییەکە ئەوانەیشی زەوت‌کردبوو، ئەوە بەشەرع بۆی دروستە ئەو درەختانە هەڵکێشێ، هەتاوەکوو ئەگەر کەرەستەی خانووەکە بەو بەکارهێنانە قیمەتی کەمی کردبوو، واجبە کابرای زەوت‌کەر تۆڵەی ناتەواوی ئەوانەیش بدا بە خاوەنەکەیان وە ئەگەر ئەو کەرەستەو درەختانەش هی خاوەنی زەوییەکە بوون و رازی بوو بەوە کە وەك خۆیان بهێڵرێنەوە، ئەوە زەوت‌کەرەکە بە هیچ جۆرێ ناتوانێ خانووەکە بڕووخێنێ‌و درەختەکان هەڵکێشێ و بەرابەر بەو رەنجە، بە هیچ جۆرێ هیچی ناکەوێ.

بەڵێ، ئەگەر خاوەن ماڵەکە داوای لە زەوت‌کەرەکە کرد ئەو خانووە بڕووخێنێ‌و درەختەکان هەڵکێشێ، لەم کاتەدا، ئەگەر ئەم کابرایە مەبەستێکی قەبووڵ کراوی هەبوو، وەك ئەوەکە زەوییەکە بە چۆڵی کرێی زیاتری ئەکرد، یا خانووی باشتری تیا ئەکردەوە،

ئەوە پێویستە ئەو زەوتکەرە خانووەکە برووخێنێو درەختەکان هەڵکێشێو تۆڵەی ناتەواوی ئەو کەرەستەو درەختانەش بدا بە خاوەنەکەیان.

ئەگەر زەوتکەری زەوییەکە تویشی لە کەسێکی تر زەوتکرد و دایچاند لەو زەوییەدا، ئەوە خاوەنی ئەو زەویو تووە ئەتوانن داوای ئەوە بکەن ئەو تووە لە زەوییەکە هەڵبگرێتەوە، ئەگەر ئەوە لەتوانادا هەبوو و تۆڵەی ناتەواوی زەویو تووەکەشی لێ وەربگرن، بەڵام ئەگەر خاوەن زەویو خاوەن توو رازی بوون بەوەکە ئەو تووە لەو زەوییەدا بمێنێتەوە، زەوتکەرەکە ناتوانێ ئەو تووە دەربکا لە زەوییەکە.

ئەگەر خاوەن زەوی ئەیویست ئەو خانووەو ئەو درەختانە وەکوو خۆیان بمێننەوەو زەوتکەرەکە ئەیویست هەڵیانبگرێ بۆ ئەوەی کەرەستەی خانووەکەو درەختەکان بفرۆشێ، ئەوە بۆی دروستە، چونکە ماڵی خۆیەتی؛ بەڵام ئەوەندە هەیە واجبە لەسەری، زەوییەکە وەکوو خۆی لێ بکاتەوە وە ئەگەر کەسێك خانوویەکی زەوت کرد، و بۆیەی کرد و رازاندیەوە، ئەوە ئەگەر عەینێك لەو بۆیەوە پەیدا بوو، زەوتکەرەکە ناتوانێ لای ببا، بەڵام خاوەن ماڵەکە خۆی ئەتوانێ و کرێی لابردنی بۆیەکەو هەر ناتەواوییەك کە لە ماڵەکەدا پەیدا ببێ ئەکەوێتە سەر زەوتکەرەکە.

ئەگەر کەسێك تووی لە زەوییەکدا داچاند بەسەر تووی کەسێکی ترا کە پێشان دایچاندبوو، ئەمە، ئەگەر کابرای دووهەم بەزۆردار دانرا بەسەر کابرای یەکەمدا، یاخود تووەکەی بەهێزتر بوو، ئەوە بەروبوومەکە بۆ کابرای دووهەمەو واجبە تووەکەی کابرای یەکەمیش ببژێرێ وە ئەگەر بە زۆردار دانەنرا بەسەر ئەودا، ئەوە بەروبوومەکە بۆ هەردووکیان ئەبێ بەگوێرەی ئەندازەی تووی داچێنراوی هەرکامیان.

ئەگەر کەسێ جلێکی زەوتکردو رەنگی کرد بە رەنگەکەی خۆی، ئەوە ئەگەر ئەتوانرا ئەو رەنگەی لێبکرێتەوە بەونەوعە کە عەینێکی دیاری هەبوو و خاوەنماڵ داوای کرد ئەو رەنگەی لێبکاتەوە، ئەوە ئەبێ لێیبکاتەوە، هەرچەند ئەو زەوتکەرەزیانێکی زۆریشی لێبکەوێو قیمەتی رەنگەکە کەم بکا؛ هەروەها، بۆ زەوتکەرەکەیش دروستە بە زۆر ئەو رەنگەی لێبکاتەوەو لەپاشا ناتەواوی جلەکە ببژێرێ وە ئەگەر نەئەتوانرا

ئەو رەنگەی لێبکرێتەوە، ئەوە ئەگەر قیمەتی جلەکە بەو رەنگە کەم بـووبوو، ئـەبێ تۆڵەی ناتەواوییەکەی بدا بە خاوەن ماڵەکە وە ئەگەر قیمەتی کەمو زیادی نەکرد، ئەوە هیچ وە ئەگەر زیادی کرد بەهۆی رەنگەکەوە، ئەوە زەوتکەرەکە ئەبێ بە هـاوبەشی خاوەن جلەکە لەو زیادەیەدا.

ئەگەر زەوتکەر ماڵە زەوتکراوەکەی تێکەڵێ شتێکی تر کرد، یاخۆی تێکەڵی بوو و لەتوانادا بوو جیا بکرێتەوە لێی، ئەبێ جیای بکاتەوە وە ئەگەر لەتوانادا نەبوو، ئەوە ئەو ماڵە وەك فەوتاوی لێدێتو ئەبێ بە موڵکی زەوتکەرەکە ئەگەر لەتوانادا بوو بکرێ بە موڵك و ئەیبژێرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر وێنەدار بوو، وێنەیەکی ئەداتێ وە ئەگەر نرخ بۆدانراو بوو، نرخەکەی ئەداتێ، ئەوەندە هەیە ناتوانێ تەسەروفی تیا بکا تا حەقی خاوەنەکەی جێبەجێ نەکا وە ئەگەر لەتوانادا نەبوو بکرێ بە موڵك، وەك گڵی زەوی وەقفکراو کە زەوتکەرەکە تێکەڵی زبڵی بکاو بیکا بە خشتو لە کوورەدا سـووری بکاتەوە، ئەوە پێویستە ئەو خشتە سوورەوەکراوانە بدا بـە سـەرپەرەشتیکەری مـاڵە وەقف کراوەکە، چونکە ئەو گڵەی خشتەکانی لێ دروست کراوە، گڵی وەقفە و تەماشای ئەو زبڵە ناکرێ کە تێکەڵی گڵەکە کراوە، چونکە بەهۆی ئاگرەکەوە سووتاوە و پێویستە وێنەی گڵە زەوتکراوەکەیش بکاتەوە ناو زەوییە وەقفەکە، بەڵام ئەگەر لە وێنەی ئەم سوورەتەدا، ئەو گڵە هی کابرایەکی عادەتی بێ، ئەوە کابرای زەوتکەر لەپاش تێکەڵ کردنی لەگەڵ زبڵەکەدا، ئەبێ بە خاوەنیو خشتەکان بۆ خۆی ئەبێ؛ بەڵام ئەوەندە هەیە ئەبێ وێنەی ئەو گڵە بداتەوە بە خـاوەنەکـەی وە ئـەگـەر کـابرای زەوتکـەر، مـاڵە زەوتکراوەکەی تێکەڵی ماڵێکی زەوتکراوی تر کرد، ئـەوە هـەرگیز نـابێ بـە مـاڵی زەوتکەرەکە، بەڵکوو هەر هی ئەو دووکەسە ئەبێ کە لێیان زەوتکراوە؛ جا لەکاتێکاکە بەشی هەر کامیان دیاری بێ، مەسەلا، وەك مێوژو گوێز، ئەوە، هەرکەس بەشی خۆی وەرئەگرێتەوە وە ئەگەر دیاری نەبێ، بەڵام بەشی هەردووکیان وەك یەك بێ، وەك دوو تەغار گەنم، ئەوە هەرکامیان ئەوەندەی بەشەکەی خۆی لێ هەڵئەگرێتەوە وە ئەگەر وەك یەك نەبێ، وەك تەغارێك گەنم و تەغارێك جۆ، ئەوە بە ئـارەزووی خـۆیـانە چـۆن رێئەکەون.

وە ئەگەر چەند ماڵێکی زەوتکراو تێکەڵی یەکتر بوونو خاوەنەکەیان دیار نەبوو، ئەوە ئەگەر نائومێد نەبووین لە دۆزینەوەیان، واجبە ئەو ماڵە بدرێتە دەستی پێشەوای موسوڵمانان لەو شوێنەدا بۆیان هەڵبگریَ وە ئەگەر پێشەوا نەبوو، یاخود ستەمکار بوو، ئەبیَ بدرێتە دەستی کەسێکی یا چەند کەسێکی دادپەروەر بۆیان هەڵبگرن و شاهید بگیریَ لەسەریان، نەوەك لەپاشەڕۆژا ئینکاری بکەن وە ئەگەر بەعادەت، نائومێد بووین لە دۆزینەوەیان، ئەوە ئەبیَ بە ماڵی «بیتُ المال»ی موسوڵمانان و بۆ پێشەوای موسوڵمانان دروستە سەرفی بکا بۆ ئەوانەکە خاوەن حەقن لە «بیتُ المال»دا وە ئەگەر پێشەوا نەبوو، دروستە بۆ پیاوچاکانی ئەو شوێنە ئەو ماڵە سەرف بکەن بۆ ئەوانەی کەبەپێی شەرع موستەحەقینی؛ هەروەها، دروستە بۆ هەر موستەحەقێکیش کە دەستی بگاتیَ، ئەوەندەی حەقی خۆی لیَ هەڵ بگریَ و بۆ خەڵکی تریش دروستە لێی هەڵبگرنو بیدەن بە خاوەنحەقەکان. «ابنُ عبدالسّلام»، فەرموویەتی: ئەگەر حەرام عام بوو، دروستە هەر موحتاجێك ئەوەندەی ئیحتیاجەکەی خۆی لیَ وەربگریَ.

ئەگەر کەسێك ماڵێکی زەوتکراوی تێکەڵ کرد بە ماڵێکی تری وەها، خواهلە چاكو خراپیدا وەك ئەو وابیَ یا چاکتر بیَ یا خراپتر بیَ، ئەوە ئەتوانیَ ئەندازەی ماڵە زەوتکراوەکە جیابکاتەوە لەو ماڵە تێکەڵە، ئەوجا تەسەڕوف لەویتریا بکا کە بە هینەکەی خۆی دائەنریَ: ئەگەر کەسێك دارێکی زەوت کردو خانووی لەسەر کردەوە، ئەوە ئەگەر ئەو دارە لەژێر خانووەکەدا رزیبوو، پێویستە قیمەتەکەی بدا بە خاوەنەکەی وە ئەگەر ساغ بوو، خاوەنەکەی ئەتوانیَ دەریبکا لەژێر ئەو خانووەدا، هەرچەند خانووەکەش بەهۆی ئەوەوە بڕووخیَ و ببیَ بە مایەی زیان بۆ کابرای زەوتکەر، مادام ترسی فەوتانی ماڵو نەفسی بیَ گوناه نەبیَ؛ هەروەها، ئەگەر ئەو دارە خرابێتە ژێر کەشتییەوە، هەر دەرئەهێنریَ، بەو شەرتانەی کە ئێستا بەیانمان کرد.

ئەگەر کەسێك ماڵێکی زەوتکراوی لە زەوتکەرەکەی کڕی و ئەو ماڵە لای کڕیارەکە فەوتاو بژاردی بۆ خاوەنەکەیو لای سەرووی قیمەتەکەی دایە لە ڕۆژی زەوت کردنەکەیەوە تا ڕۆژی فەوتانی، ئەوە هەر ئەوەندە هەیە کڕیارەکە ئەتوانیَ ئەو

پارەیەی داویە بە زەوتکەرەکە لە حەقی ماڵەکەدا، لێی وەربگرێتەوە، ئیتر حەقی ئەوەی نییە ئەو ئەندازە پارەیەی کە بژاردوویەتی بۆ خاوەنماڵەکە، لە زەوتکەرەکەی بسێنێتەوە، هەرچەند وەختی خۆی نەیزانیبێ ئەو ماڵە زەوت کراوە، چونکە ماڵی فرۆشراو پاش ئەوەی کڕیار وەری گرت، ئەکەوێتە زەمانەتی خۆیەوە وە ئەگەر ئەو ماڵە بە تاوانی کڕیارەکە فەوتا، ئەوە باشتر لە زەمانەتیا ئەبێ؛ یەکەم، لەبەرئەوە کە ماڵەکەی کڕیوەو وەریشی گرتووە؛ دووهەمیش لەبەرئەوە کە خۆی ماڵەکەی فەوتاندووە.

هەروەها ئەگەر ئەو ماڵە عەیبداریش ببێ لای کڕیارەکە، هەر واجبە تۆڵەی ناتەواوییەکەی بدا بە خاوەنماڵەکە و ناتوانێ لە فرۆشیارەکەشی بسێنێتەوە کە وەختی خۆی زەوتی کردووە و پێویستیشە لەسەر ئەم کڕیارە هەر قازانجێکی وەرگرتبێ لەو ماڵە کراوە، وەك میوە و کرێ و رۆن و دۆو غەیری ئەمانە، بیبژێرێتەوە بۆ خاوەن ماڵەکە و نایشتوانێ وەری بگرێتەوە لە فرۆشیارە زەوتکەرەکە، بەڵام ئەو قازانجانەی کە لای کڕیارەکە فەوتاونو خۆی کەڵکی لێوەرنەگرتوون، ئەتوانێ، لەپاش بژاردنەوەیان بۆ خاوەن ماڵەکە، داوایان بکاتەوە لە فرۆشیارەکەو بیانسێنێتەوە لێی، چونکە هیچی لێ دەس نەکەوتوونو فرۆشیارە زەوتکەرەکەیش بووە بەهۆی ئەوە ئەم زیانەی لێ بکەوێ.

ئەگەر کەسێك ئەرزێکی زەوتکراوی لەکەسێك کڕی و خانووی تیا کردەوە، پاشان خاوەن ئەرزەکە ئەو خانووەی تێكداو تۆڵەی ناتەواوی زەوییەکەشی لە کڕیارەکە وەرگرت، ئەوە ئەو کڕیارە ئەتوانێ ئەو تۆڵەی ناتەواوییە لە فرۆشیارە زەوتکەرەکە بسێنێتەوە، چونکە ئەو بووە بەهۆی ئەم زیانە کە کەوتووە لەم.

**بزانن! یەکەم:** هەرشتێکی وا کە ئەگەر کڕیار بژاردی، بیسێنێتەوە لە زەوتکەرەکە، وەك میوەی باخێك کە نەگەیشتبێتە دەستی کڕیارەکە، ئەگەر لەئەساسا فرۆشیارەکە بژاردبیەوە، ناگەڕێتەوە بۆسەر کڕیارەکە بۆی.

**دووهەم:** هەرشتێ کە ئەگەر کڕیار بژاردی نەیسێنێتەوە لە فرۆشیار، وەك ئەو قازانجانەی کە خۆی وەریگرتوون، ئەگەر فرۆشیاری زەوتکەر بژاردنیەوە، ئەگەڕێتەوە بۆسەر کڕیارەکە.

سێهەم: هەر دەستێك كە دامەزرابێ لەسەر دەستی زەوتكەر و لە ئەساسیشدا دەستی زەمانەت بێ، وەكوو یەكێك ماڵەكەی لێ‌خواستبێ، یاخود بە سەودا كردن وەری گرتبێ، ئەوە دەستی وەك دەستی كڕیارەكەیە لەم حوكمانەدا كە بەیانمان كردن؛ بەڵام ئەگەر دەستی، دەستی ئەمانەت بێ وەك ئەوە كە یەكێك بەكرێ لێی وەرگرتبێ، یاخود بە سوورەتی ئەمانەت دایناب‌ێ لای، ئەوە حوكمی دەستی زەوتكەرەكە خۆی هەیە لەوەدا كە ڕێگەی زەمانەتە، بەڵام لەئەنجاما مەسەلەكە ئەگەڕێتەوە سەر زەوتكەرەكە، یەعنی ئەگەر ئەمان ئەو ماڵەیان بژارد، ئەگەڕێنەوە سەر زەوتكەرەكە هەرشتێكیان داوە بە خاوەن‌ماڵ، وەری‌ئەگرنەوە لە زەوتكەرەكە، مەگەر كەسێك كە ئەو ماڵە زەوتكراوەی بە بەخشش لە زەوتكەرەكە وەرگرتبێ، ئەمە هەرچی بژارد، مەسەلەكە لەسەر خۆیەتی‌و ناگەڕێتەوە سەر زەوتكەرەكە، چونكە ئەو ماڵەی بەخۆڕایی و بۆ قازانج‌و بوون بە موڵكی خۆی، وەرگرتووە.

## باسی «شُفعة»

شوفعە، بریتییە لەوە بەشە موڵكی هاوبەشێكی كۆن كە بەرابەر بە شتێك دابێتی بە كەسێكی تازە، بە زۆر نەهێڵرێ ببێ بە هی ئەم‌كەسە تازەیەو بكرێ بە موڵكی هاوبەشی خاوەنە پێشووەكەی، لەبەر نەهێشتنی ڕوودانی ئەو زیانەی كە لەم هاوبەشییە تازەیەوە پەیدا ئەبێ، بەو شەرتە كە ئەو موڵكە قابیلی دابەش كردن بێ‌و نەیش‌گوێزرێتەوە؛ كەواتە، حەقی شوفعە نییە بۆ كەسێك كە شەریك نەبێ لەو ماڵە فرۆشراوەدا، ئیتر چ دوور بێ لێی‌و چ دراوسێی بێ؛ هەروەها، شوفعە نییە لە موڵكێكا كە بەخۆڕایی درابێ بە كەسێك، وەك ئەوە كەسێك بەشەخانووی خۆی نەزر بكا لە كەسێك. وەك، شوفعە نییە لە موڵكێكی فرۆشراوی‌وادا كە قابیلی دابەش كردن نەبێ، یاخود بگوێزرێتەوە، مەگەر بە تەبەعیەتی شتێكی نەگوێزراو، وەك لەمەوپاش باسی دێت.

شوفعە، پێویستی بە چوار شت هەیە: شوفعە وەرگر؛ كابرای موڵك لێ‌وەرگیراو؛ موڵكی وەرگیراو؛ سیغە. حەقی شوفعەهەیە لە ئەرزو ئاوو باخدا و لە هەرچی لەو

ئەرزەدا بێ لە خانوو و دەرگاو داری تەڕو بنی درەختێك کە سەرەکەی بڕابێتەوە؛ هەروەها، حەقی شوفعە هەیە لە دیواری باخێکدا کە لەگەڵ باخەکەدا بفرۆشرێ و لە میوەی باخەکەدا، بەو شەرتە لە کاتی فرۆشتنەکەدا گۆپکەی نەکردبێ.

لە سەرەتاوە، شوفعە نییە لە شتێکا کە بگوێزرێتەوە، وەك قاپو قاچاخو فەرشو داری وشكو شتیوا، بەڵام ئەگەر خانوویەکی هاوبەشی فرۆشراو حەقی شوفعەی تیا هاتەجێ و بەرلەوە کە بە شوفعە وەربگیرێت، رووخاو دارو بەردەکەی کەوت، ئەوە شوفعە لەو کەرەستە گوێزراوەدا دروستە، چونکە لە سەرەتاوە لەناو خانووەکەدا بەشێك نەبووە لەو شتانەی کە ئەگوێزرێنەوە.

شوفعە نییە لە حوجرەیەکدا کە لەسەر سەقفێك بێ، خواه ئەو سەقفە هاوبەشی بێ یا هاوبەشی نەبێ، چونکە لەڕاستیدا ئەو حوجرەی سەرخانە قەرارگایەکی دامەزراوی لە زەویدا نییە؛ بەڵێ، ئەگەر دووکەس هاوبەش بن لە ژێر خانێکداو سەرخانێکیش ببێ کە هی تەنها یەکێکیان بێ و لەگەڵ بەشە ژێرخانەکەی خۆیدا بیفرۆشێ، ئەوە ئەو هاوبەشەکەیان ئەتوانێ ئەو بەشە ژێرخانە بە شوفعە وەربگرێ و ئیتر حەقی بەشوفعە وەرگرتنی سەرخانەکەی نییە، چونکە شەریك نییە تیایدا.

هەروەها، ئەگەر زەوییەك بە شەریکی بێ لە بەینی دووکەسدا و چەند بنداریکیشی تیابێ کە موڵکی یەکێکیان بێ، ئەم کەسە ئەگەر بەشە ئەرزەکەی خۆی فرۆشت لەگەڵ درەختەکانا، هاوبەشەکەی هەر حەقی شوفعەی بەشەزەوییەکەی هەیە، ئیتر ناتوانێ درەختەکانیش بە شوفعە وەربگرێ، چونکە شەریك نییە تیایاندا.

شوفعە نییە لەماڵێکی موشتەرەکی وەهادا کە ئەگەر بەش بکرێ، قازانجی ئەو شتە هەڵوەشێتەوە، وەك حەمامێکی بچووك، یا ئاشێك یا دووکانێك، یا تەنووربانێکی بچووك کە قابیلی بەش کردن نەبن، یەعنی ئەگەر دابەش کران، بە کاری دوو حەمام یا دوو ئاش یا دوو دووکان یا دوو تەنووربان نەیەن.

شوفعە نییە تەنها بۆ هاوبەش نەبێ؛ کەواتە، ئەگەر هاتو خانوویەك هاوبەشی بوو لە بەینی سێ برادا و یەکێك لەوان مرد و بەشە خانووەکەی فرۆشرا بۆ دانەوەی قەرزێك کە

لەسەری بوو، ئەوە ئەم دوو برایە حەقی شوفعەیان نییە، چونکە لە ژیانی براکەیاندا هاوبەش بوون و ئێستە خۆیان خاوەنی میراتەکەن، چونکە قەرزاریی مردووەکە رێگا لەوە ناگرێ کە میراتگر ببێ بە خاوەنی میراتەکە.

ئەگەر کەسێك خانوویەکی هەبوو کە تەنها هی خۆی بوو، بەڵام رێگوزەرێکی موشتەرەکی هەبوو و ئەو خانووەی فرۆشت، ئەوە کەس حەقی شوفعەی لەو خانووەدا نییە، بەڵام لە رێگوزەرەکەدا حەقی شوفعە بۆ شەریکەکان هەیە، بەو شەرتەکە کڕیارەکە لەلایەکی ترەوە رێگای هاتوچۆی ببێ، یاخود بتوانێ دەرگایەك لەو خانووە بکاتەوە بۆ سەرجادە، ئەگینا حەقی شوفعەیان نییە، بۆ ئەوە کە رێگای هاتوچۆی ئەو کڕیارە نەبڕرێ؛ بەڵێ، ئەگەر رێگوزەرەکە ئەوەندە پان بوو ئەیانتوانیبەشی گوزەری کڕیارەکە جیا بکەنەوە و هێشتا ئەیمایەوە، ئەوە حەقی شوفعەیان هەیە لەوەیدا کە ماوەتەوە. هەروەها، حەقی شوفعە هەیە لە حەوشی خانوویەکدا کە تێکەڵ بێ، بەڵام هۆدەکانی ماڵی تایبەتی بن و لە جۆگە ئاوێکدا کە تێکەڵ بێو ئەرزەکەی موڵکی تایبەتی کەسێك بێ و لە تەنووربانێکدا کە خۆی هاوبەشی بێ، بەڵام ئەوی تری ماڵەکە بەتایبەتی هی کەسێك بێ.

حەقی شوفعەی هاوبەش، لە موڵکێکی وەهادا ئەبێ کە بەگۆڕینەوە کرابێ بە موڵك و موڵکەکەیش دامەزرابێ، وە کەوتبێتیشە پاش سابتبوونی موڵکی کابرای شوفعە گرەوە، خواە ئەو گۆڕینەوەیە، گۆڕینەوەی رووت بێ، وەك ماڵی فرۆشراوو کرێی کرێکارو سەرمایەی سەلەمو سوڵح لەسەر ماڵ، یاخود گۆڕینەوەی رووت نەبێ، وەك مارەیی ژنو تۆڵەی خولع کردن لەگەڵ ژن یا لەگەڵ بێگانەدا و تۆڵەی سوڵح کردن لەسەر خوێن؛ کەواتە، شوفعە نییە لەو موڵکەدا کە بە بێ گۆڕینەوە دەستکەوتبێ، وەك میرات یا بەخشش یا نەزرێك کە بەرابەری نەبێ وە وەك وەسیەت وە ئەگەر ماڵێکی تێکەڵ لە بەینی دووکەسدا فرۆشرا، ئەوە شوفعەگرەکە لە ماوەی حەقی پەشیمان بوونەوەی مەجلیسدا حەقی شوفعەی نییە، هەروەها، لەپاش ماوەی حەقی پەشیمان بوونەوەی مەجلیسیش، ئەگەر حەقی پەشیمان بوونەوەی سێ رۆژە ببێ بۆ هەردوولا

(کڕیارو فرۆشیار)، یا بۆ کەسێکی بێگانە لێیان، یا هەر بۆ فرۆشیارەکە، یا بۆ کەسێکی بێگانە لە فرۆشیارەکە؛ هەروەها، ئەگەر حەقی پەشیمان بوونەوە تەنها بۆ کڕیارەکە هەبێو بڵێین کە موڵك لەماوەی پەشیمان بوونەوەدا بۆ فرۆشیارە، یا راوەستێنراوە؛ بەڵام ئەگەر موڵك لەو ماوەیەدا بۆ کڕیارەکە بوو، ئەوە حەقی شوفعەی هەیە.

ئەگەر کڕیار ویستی بەهۆی عەیبەوە ئەو بەشەی کە کڕیویە بیداتە دواوە بۆ فرۆشیارەکە و شوفعەگرەکە ئەیویست بەو عەیبەوە وەری‌بگرێ، ئەوە بەقسەی شوفعە وەرگرەکە ئەکرێ، چونکە حەقی ئەو لەپێشە، لەبەرئەوە کە هەر بە فرۆشتنەکە حەقی شوفعەوەرگرەکە جێ‌گیر بووە لە شوفعە وەرگرتندا، هەروەها ئەگەر کڕیار بیەوێ موعامەلەکە هەڵوەشێنێتەوەو شوفعە وەرگرەکە بیەوێ دابمەزرێو خۆی بە شوفعە وەری‌بگرێ وە ئەگەر دووکەس بە شەریکی خانوویەکیان کڕی، ئەوە کەسیان حەقی شوفعەیان لەسەر ئەویان نییە، چونکە حەقی هەردووکیان بەیەکەوە پەیدا بووە.

وە ئەگەر یەکێك لە دوو هاوبەش، بەشە خانووی خۆی فرۆشت بەکەسێك بەشەرتی پەشیمانی بۆخۆیو هاوبەشەکەی‌تر، بەشەکەی خۆی فرۆشت لەو ماوەی پەشیمان بوونەوەیدا بە فرۆشتنی یەگجاریو بێ پەشیمان بوونەوە، ئەوە حەقی شوفعە بۆ کڕیاری یەکەم هەیە لە فرۆشتنی بەشی دووهەمدا، ئەگەر فرۆشیارەکەی شوفعە نەگرێ، چونکە سەبەبی موڵکی ئەو پێش‌کەوتووە لە سەبەبی موڵکی کڕیاری دووهەمو حەقی شوفعە نییە بۆکڕیاری دووهەمو حەقی شوفعە نییە بۆ کڕیاری دووهەم، چونکە لەپاش کڕیاری یەکەم بووە بە خاوەن موڵك؛ هەروەها، حەقی شوفعە بۆکڕیاری دووهەم هەیە، ئەگەر بەرودوایش فرۆشتیان، بەشەرتی ئەوە حەقی پەشیمان بوونەوە هەر بۆ ئەوان بێو بۆ کڕیارەکە نەبێ.

ئەگەر یەکێك لە سێ شەریك، بەشە موڵکی خۆی فرۆشت بە یەکێك لە شەریکەکان، ئەوە شەریکەکەی‌تر حەقی شوفعەی نیوەی ئەو بەشە فرۆشراوەی هەیەو بەس؛ هەروەها، ئەگەر ئەو شەریکە بەشە موڵکەکەی خۆی بفرۆشێ بە بێگانەیەك، ئەوە هەر حەقی شوفعەی نیوەی هەیە، بۆ ئەوە حەقی شەریکەکەی‌تر نەفەوتێ؛ بەڵێ ئەگەر

شەریکی سێهەم شوفعەی نەگرت، ئەوە شەریکی دووهەم بەشەکەی ئەویش بە شوفعە وەرئەگرێ.

شەرت نییە لە شوفعەدا حوکمی حاکم یا حازر بوونی کڕیار یا رازی بوونی بەو شوفعەیە، چونکە ئەم شوفعەیە حوکمێکی ناچاریی وایە بە «نَصّ» دامەزراوە؛ بەڵێ، بەشەرت گیراوە کە لەگەڵ هاتنەجێی موستەحەق بوونی شوفعەدا لەفزێکی وا [بوترێ] کە مەعنای کردن بە موڵکی ئەو بەشە موڵکە بگەیەنێت؛ مەسەلا، بڵێت: ئەو بەشە فرۆشراوەم کرد بە موڵك، یا: وا وەرم گرت بە شوفعە بۆ خۆم؛ هەروەها، شەرتە ئاگای لەوە بێ کە ئەو بەشە چەندە و خۆی چاوی پێ کەوتبێ؛ بەڵێ، ئەگەر وەکیلی گرتبوو لە وەرگرتنی حەقی شوفعەدا، ئەوە چاوپێ کەوتنی ئەو بەسە؛ هەروەها پیوێستە بزانێ بە چەند فرۆشراوە و پێویستە هەر بەو ئەندازەیە وەری بگرێ بە شوفعە و لەگەڵ ئەم شەرتانەدا، یەکێك لەم سێ شتە پێویستە:

یەکەم: تەسلیم کردنی عیوەزەکە بە کڕیارەکە، جا کە ئەویش وەری گرت یا قازی ناچاری کرد وەری‌بگرێ، ئەوکاتە کابرای بەشوفعە وەرگر ئەبێ بە خاوەنی ئەو بەشە؛

دووهەم: رەزامەندیی کڕیارەکە بەوە کە ئەو عیوەزە لە ئەستۆی بە شوفعە وەرگرەکەدا بمێنێ؛

سێهەم: ئەوەیە کابرای بە شوفعەوەرگر بڕوا بۆ مەجلیسی قازی‌و داوای حەقی شوفعە بکا لەو بەشە موڵکەدا کە فرۆشراوە و ئیسپاتی موستەحەقیەتی خۆی بکا لای قازی و حوکمی بۆ بدا بەوە کە ئەو بەشە موڵکە بووە بە هی ئەو بەو قیمەتەی کە پێی فرۆشراوە؛ جا کابرای بەشوفعەوەرگر، ئەبێ بە خاوەنی بەشەکە، لەبەرئەوە کە ئیختیاری کردن بە موڵکی ئەو بەشە، بە حوکمی حاکم هێز پەیدائەکا؛ جا لەم کاتەدا، ئەگەر قیمەتەکە حازربوو، تەسلیمی کڕیارەکە ئەکرێ وە ئەگەر حازر نەبوو، سێ رۆژ مۆڵەت ئەدرێ، ئەگەر لەو سێ رۆژەدا حازری کرد، باشە، ئەگینا قازی ئەو بە موڵك کردنەی، فەسخ ئەکاتەوە.

## باسی بەدەڵی ئەو بەشە کە بە شوفعە وەرئەگیرێ و هەندێ بابەتی تر

ئەگەر کڕیار ئەو بەشەی بە شتێکی وێنەدار «مِثلی» کڕی، وەك پارەی نەختوگەنمو شتیوا، ئەوە کابرای بەشوفعە وەرگر ئەو بەشە وەرئەگرێ بەو شتە وە ئەگەر ئەو شتە وێنەدارە وێنەی لەو وڵاتەدا نەمابوو، ئەتوانێ قیمەتەکەی بدا؛ جا ئەگەر ویستی لەجیاتی ئاڵتوون زیو بدا بەکریارەکە، پێویستە لەپێشا موعامەلەی شوفعەکە بە ئاڵتوون بکا، جا پاش ئەوە لەجیاتی ئاڵتوونەکە بەقیمەتی خۆی زیوی بداتێ وە ئەگەرکڕیارەکە ئەو بەشە موڵکەی بە شتێکی نرخ بۆدانراو «متقوّم» کڕیبوو، ئەوە بە شوفعە وەرگرەکە ئەو ماڵە وەرئەگرێ بە قیمەتی ئەو شتە نرخ بۆ دانراوە لە رۆژی فرۆشتنەکەیدا و باوەڕ بە سوێندی کڕیار ئەکرێ لەبارەی ئەو قیمەتەوە.

ئەگەر وا رێکەوت بەشوفعە وەرگرەکە بوو بە خاوەنی عەینی ئەو ماڵە کە کڕیار داویەتی لە قیمەتی ئەو شتەدا کە کڕیویەتی، ئەوسا ئاگادار بوو لە شوفعەکە، ئەوە واجبە بە عەینی ئەو ماڵە شوفعەکە وەربگرێ وە ئەگەر ئەندازەیەك لە قمیەتەکە لابرا لەسەر کڕیارەکە لەپێش دامەزرانی موعاملەکەدا، ئەو ئەندازەیە لەسەر ئەم بە شوفعە وەرگرەیش لائەچێ وە ئەگەر هەموو قیمەتەکە لاچوو، ئەوە ئیتر مەجالی شوفعە نامێنێ، چونکە ئەسڵی فرۆشتنەکە بەتاڵ ئەبێتەوە، چونکە ئەبێ بە فرۆشتنی بێبریتی، جا کە فرۆشتەکەیش دانەمەزرا، ئیتر مەجالی شوفعە نامێنێ.

وە ئەگەر بەدەڵی ئەو بەشەی کە کڕیارەکە کڕیویە، وەعدە بۆ دانراو «مُؤَجَّل» بوو، ئەوە کابرای بەشوفعە وەرگر بەئارەزووی خۆیەتی ئێستە گورج پارەکە بداو ماڵەکە بە شوفعە وەربگرێ، یاخود سەبر بکا تا وەعدەی قیمەتەکە دێتە پێشەوە، ئەو کاتە شوفعەکە وەربگرێو پارەکە تەسلیم بکا وە ئەگەر لەسەرەتاوە کابرای بەشوفعە وەرگر بڕیاریدا راوەستێ تا وەعدەکە دێتە پێشەوە و پاشان پەشیمان بووەوە لەم بیرەو وای بەباش زانی هەر لە ئێستاوە شوفعەکە وەربگرێو پارەکەی بدا، ئەتوانێ وابکا؛ بەڵێ، ئەگەر کڕیارەکە رازی ئەبوو بەوەکە پارەکە لەئەستۆی بەشوفعە وەرگرەکەدا بمێنێتەوە، ئەوە پێویستە هەر ئێستا شوفعەکە بکا، ئەگینا حەقی بەشوفعە وەرگرتنی ئەفەوتێ.

ئەگەر کابرای فرۆشیار بەشێکی لە ماڵی هاوبەشی فرۆشت لەگەڵ شتێ‌تردا، ئەوە دروستە بەشوفعە وەرگرەکە ئەو بەشە بەقیمەتی خۆی وەربگرێ بەوئەندازە قیمەتە کە لە بەرابەریایەتی؛ مەسەلا، قیمەتی هەموو ماڵەکە سەد دینار بوو بەشەکە بەتەنها پەنجا دیناری ئەکرد و ئەوی‌تری سەد دیناری ئەکرد، ئێستە سێ‌یەکی قیمەتی هەمووی قیمەتی بەشەکەیەو ئەوی‌تری قیمەتی ماڵەکەی‌ترە.

هەر بەشێك لە ماڵی شەریکی درابێ لە مارەیی ژنێکدا، وەرئەگیرێتەوە بە «مَهرُ المِثل» بۆ ئەوە ژنە؛ هەروەها، هەر بەشێك کە درابێ لە تۆڵەی خولعدا، ئەویش وەرئەگیرێ بە «مَهرُ المِثل». ئەگەر کڕیار بە قیمەتی زیادو گران ئەو بەشەی کڕی‌و ماڵەکەیش فەوتا بەرلەوەی بزانن چەندێکە، ئەوە قابیل نییە بەشوفعە وەرگرتن لەم سوورەتەدا وە ئەگەر بەشوفعە وەرگرەکە وتی: قیمەتی ماڵەکە تەغارێك گەنم بووەو کڕیاریش وتی: مەعلووم نییە، ئەو کڕیارە سوێند ئەخوا لەسەر بێ‌ئاگایی خۆی و شوفعەکە بە بەتاڵ ئەمێنێتەوە وە ئەگەر کابرای بەشوفعە وەرگر ئیددیعای کرد کە ئەو کڕیارە ئەزانێ بەدەڵەکە چەندە، بەڵام ئەندازەکەی ناونەبرد، ئەوە ئەو ئیددیعایە نابیسرێ؛ بەڵێ، بۆ بە شوفعە وەرگرەکە هەیە ناوی ئەندازەیەك بباو سوێندی کڕیارەکەی لەسەر بدا و جارێکی‌تر ناوی ئەندازەیەکی‌تر بباو سوێندی لەسەر بدا تا ئەو پێ لە قیمەتەکەی ئەنێ، یاخود نکوول ئەکا لە سوێند، جا لەم‌وەختەدا، ئەتوانێ ئەو نکوولییە بکا بە دەلیل لەسەر ئەوە کە ئەو ئەندازەیە عەینی قیمەتەکە بووە، جا کە گومانی هاتەسەر ئەوە، سوێند بخوا لەسەری‌و تەسلیمی بکا.

وە ئەگەر ئەو قیمەتەی کە کڕیار ماڵەکەی‌پێ کڕیوە، بەماڵی کەسێکی‌تر دەرچوو، ئەوە ئەگەر وەختی خۆی بە عەینی ئەو قیمەتە موعامەلەکەکراوە، ئەوە دەرئەکەوێ ئەو فرۆشتنە بەتاڵ بووە، هەروەها شوفعەکەیش هەر بەتاڵە، چونکە هەرچی لەسەر بەتاڵ دابمەزرێ، بەتاڵە وە ئەگەر بە قیمەتی لەئەستۆدا بووکڕراوە و عەینەکە دراوە لەجیاتیدا، ئەوە هەر ئەوەندە پێویستە عەینەکە بگۆڕێ بە قیمەتێکی حەڵاڵ، ئیتر فرۆشتنەکەو شوفعەکە بە ساغی ئەمێنێتەوە.

وە ئەگەر کابرای بەشوفعەوەرگر ماڵی کەسێکی تری دا لە تۆڵەی ئەو بەشەدا کە بەشوفعە وەریگرتووە، ئەوە شوفعەکە بەتاڵ نابێتەوە، خواهوەختی خۆی زانیبێتی ئەو ماڵەی کە ئەیدا بە حەقی شوفعەکەدا ماڵی کەسێکی ترە یا نەیزانیبێ؛ بەڵێ، ئەگەر شوفعەکەی بەو عەینە حەرامە کرد، مەسەلا، وتی: وا ئەو بەشەم بەمعەینەکرد بە ماڵی خۆم بە شوفعە، ئەوە شوفعەکە بەتاڵەو پێویستە دووبارە بە ماڵێکی حەڵاڵ یا بە بەدەڵی لەئەستۆدا بوو شوفعەی بگرێتەوە، ئیتر عەیبی تیا نامێنێ.

ئەگەر کڕیار لەپێش شوفعەی بەشوفعە وەرگرەکەدا تەسەڕوفی کرد لەو بەشەدا کە کڕیویەتی، ئەوە حەقی شوفعەکە بەتاڵ نابێتەوە، بەڵکوو بە شوفعە وەرگرەکە تەماشا بکا، ئەگەر ئەو تەسەڕوفە شوفعەی تیا نەبوو، وەك وەقفو بەخشینو نەزر، پێویستە لەپێشا ئەو تەسەڕوفە بەتاڵ بکاتەوە؛ مەسەلا، بڵێت: وا بە هۆی حەقی شوفعەکەمەوە، ئەو وەقفەم بەتاڵ کردەوە، ئەوجا بەشەکە بە شوفعە وەربگرێ وە ئەگەر ئەو تەسەڕوفە شوفعەی تیابوو؛ مەسەلا، کڕیارەکە فرۆشتبووی بە کەسێکی تر، ئەوە بەشوفعە وەرگرەکە ئارەزووی خۆیەتی ئاخۆ ئەو تەسەڕوفە هەڵئەوەشێنێتەوە جا لەسەر موعامەلەی پێشوو بە شوفعە وەریئەگرێ، یاخود هەر لەسەر ئەم موعامەلە دواییە بە شوفعە وەریبگرێتەوە.

ئەگەر بەشوفعە وەرگرەکە لەگەڵ کڕیارەکەدا بوو بەهەرایان لە قیمەتی ماڵەکەدا، ئەوە کڕیار سوێند ئەدرێ لەسەر ئەندازەی ئەو قیمەتە وە ئەگەر نکوولی کرد لە سوێند خواردن، بەشوفعە وەرگرەکە، بەشێوەی پێشوو خۆی رزگار ئەکا وە ئەگەر ئەیزانی موعامەلەکە بە چەند کراوە، هەر لەسەر ئەوە سوێند بخواو قیمەتەکەی تەسلیم بکا؛ هەروەها، ئەگەر کڕیار وتی: ئەو بەشەم نەکڕیوە، یا وتی بە کابرای بە شوفعەوەرگرتوو: شەریك نیت، ئەوە باوەڕ بە سوێندی کریارەکە ئەکرێ؛ بۆ مەسئەلەی یەکەم، سوێند بخوا بڵێ: ئەو ماڵەم نەکڕیوە و بۆ دووهەمیان، سوێند بخوا بڵێ: نازانم بەوە کە تۆ شەریکی. جا ئەگەر نکوولی کرد لە سوێند، کابرای بەشوفعەوەرگر سوێند بخوا لەسەر ئیددیعاکەی خۆی.

ئەگەر لە مەسئەلەی ئینکاری کڕینەکەدا، هاوبەشی پێشوو پێی لە موعامەلەکە نا، ئەوە راستتر ئەوەیە شوفعەکە ئیسپات ئەبێ، جا ئەگەر وتی: قیمەتەکەم وەرنەگرتووە، کاتێ کە ئەم بەشوفعە وەرگرە شوفعەکەی گرت، پارەکەی تەسلیم بکا وە ئەگەر وتی: پارەکەم لە کڕیارەکە وەرگرتووە، ئەمجار جێگەی قسەیە: ئایا ئەو پارەی بەدەڵی شوفعەیە، لەدەستی بەشوفعە وەرگەکەدا ئەمێنێ، یاخود قازی وەری ئەگرێو هەڵی ئەگرێ لای خۆی؟ فەرموودەی راستتر، ئەوەیە هەر لەدەستی بەشوفعە وەرگرەکەدا ئەمێنێتەوە، وە لەگەڵ ئەمەدا، بۆیشی دروستە هەموو تەسەڕوفێکی شەرعی لەو بەشەدا بکا، لەبەرئەوە عوزری هەیە ئەگەر پارەکە نەدا بە کڕیارەکە.

ئەگەر کۆمەڵێك شەریك بوون لەماڵێکدا، ئەوە هەرکامیان بەپێی بەشی خۆی حەقی هەیە شوفعە وەربگرێ. ئەگەر یەکێك لە دوو شەریك نیوەی بەشەکەی خۆی فروشت بە کەسێك وە نیوەکەی تری فرۆشت بە کەسێکی تر، ئەوە حەقی شوفعە لە موعامەلەی یەکەمدا هەر بۆ شەریکە کۆنەکەیە، چونکە لەوەختی موعامەلەکەدا، هیچ کەسی تر، لە فرۆشیارەکە بەولاوە، شەریکی نەبووە و ئاشکرایە فرۆشیارکە بەشی خۆی فرۆشت، لەوە ئەکەوێ کە حەقی بەشوفعە وەرگرتنی ببێ. جا ئەگەر ئەم بەشوفعە وەرگرە کڕیاری یەکەمی عەفو نەکردو نیوەی یەکەمی بە شوفعە وەرگرت، ئەوە ئەو کڕیاری یەکەمە لەبەینا دەرئەچێو حەقی شوفعەی نیوەی دووهەمیش هەر بەتەنها بۆ ئەوە وە ئەگەر عەفوی کرد لە شوفعە و بە خاوەن بەش مایەوە، ئەوە ئەم کڕیارەیش ئەبێ بە هاوبەشی ئەو هاوبەشە قەدیمە بۆ شوفعە وەرگرتنی نیوەی دووهەم و هەرکام؛ بە نیسبەتی بەشیخۆیان حەقی شوفعەیان هەیە، خواه ئەو عەفو کردنە پێش لە فرۆشتنی نیوەی دووهەم بووبێ یا پاش فرۆشتنی، فەرقی نییە.

ئەگەر ماڵێك لەبەینی سێ کەسدا بوو و یەکێك لەوان بەشەکەی خۆی فرۆشت بەکەسێك و یەکێك لەم دوو هاوبەشە ئەوکڕیارەی عەفو کرد لە شوفعە، ئەوە حەقی شوفعەی نامێنێ و لەم کاتەدا، شەریکەکەی تر بە ئارەزووی خۆیەتی یا بەتەواوی هەمووی بە شوفعە وەربگرێ یاخود بە قەتعی ئەمیش تەرکی شوفعە بکا، ئیتر ناتوانێ

ئەوەندەی بەشەکەی خۆی شوفعە بگرێت‌و بەشی برادەرەکەی بەجێ‌بهێڵێ بۆ ئەوە ئەو موعامەلەیە بەش‌بەش نەبێ لەسەر کڕیارەکە وە ئەگەر یەکێك لەم دوو شەریکە دەس‌بەردار بوو لە شوفعەی نیوەی حەقەکەی، ئەوە حەقی شوفعەکەی بەتەواوی لائەچێ، چونکە حەقی شوفعە لەبەشێکدا قابیل نییە بەش‌بەش بکرێ، بەڵکوو ئەبێ یا بەتەواوی بەشەکەی بە شوفعە وەربگرێ یا ئەبێ دەس بەرداری هەمووی ببێ.

وە ئەگەر لەکاتی موعامەلەکەدا، یەکێك لە شەریکەکان حازر بوو و ئەوانی‌تریان دیار نەبوون، یاخود یەکێکیان باڵغ‌و خاوەن روشد بوو و ئەوانی‌تریان منداڵ یا بێ‌روشد بوون، ئەوە ئەم شەریکە، سێ رێگەی لەبەردەمدایە:

یەکەم: ئەوەکە تەرکی حەقی خۆی بکاو شوفعە وەرنەگرێ؛

دووهەم: ئەوەکە سەبر بکا تا شەریکە نادیارەکەی پەیدا ئەبێ و تا منداڵەکان باڵغ ئەبن، ئەوجا بەیەکەوە بیری لێ‌بکەنەوە ئاخۆ شوفعە وەرئەگرن یاخێر، یا هەندێکیان وەری بگرن‌و هەندێکیان وەری نەگرن؛

سێهەم: ئەوەکە ئێستە هەموو بەشەکان بە شوفعەوەربگرێ، جاکە شەریکەنادیارەکان پەیدا بوون‌و مناڵەکانیان باڵغ بوون، ئەگەر شوفعەیان ویست، هەرکەس بەشی خۆی وەربگرێ وە ئەگەر نەیانویست، هەمووی بۆ ئەم ئەمێنێتەوە وە ئەگەر هەندێکیان ویستیان‌و هەندێکیان نەیانویست، ئەوە ئەم ماڵە کە بەش ئەکا لەگەڵ ئەوانەیان کە ئەیانەوێ، هەرکامیان بەپێی بەشی خۆی، ئیتر ئەم شەریکە حازرە حەقی ئەوەی نییە هەر بەشەکەی خۆی بە شوفعە وەربگرێ تا ماڵەکە پارچە پارچە نەبێ لەسەر کڕیارەکە؛ ئەگەر شایەد ئەم شەریکە حازرە، وتی: من هەر بەشی خۆمم ئەوێ‌و بەشی‌تر بە شوفعە وەرناگرم، ئەوە حەقی لەبەشەکەی خوێشیدا نامێنێ، مەگەر نەزان بێ، ئەو کاتە وادائەنرێ کە عوزری هەیە و دووبارە حەقی هەڵبژاردنی یەکێك لە سێ رێگەپێشووەکەی هەیە و هەر کاتێك هەمووی بە شوفعە وەرگرت، ئەوە تا شەریکەکانی‌تر پێ ئەگەن، هەموو ماڵەکە ماڵی ئەم ئەبێ‌و هەموو سوودو میوەو قازانجێکی بۆخۆی ئەبێ‌و کەس حەقی نابێ بەسەریەوە تا ئەوانیش بەشە شوفعەی خۆیان وەرئەگرن.

**بزانن!** وەلی ئەمری منداڵو نەفامی حیجر لەسەر دانراو، ئەتوانێ شوفعە وەربگرێ بۆ ئەو منداڵە یا بۆ ئەو حیجر لەسەر دانراوە، بەڵکوو ئەگەر بزانێ لە شوفعە وەرنەگرتنا بۆیان، زیانیان پێ ئەگا، واجبە لەسەری بۆیان وەربگرێ وە ئەگەر کۆمەڵە هەتیوێك هاوبەشی کەسێك بوون و ئەو کەسە بەشەکەی خۆی فرۆشت، ئەوە ئەو منداڵانە حەقیان لە شوفعەدا ئەمێنێتەوە تا باڵغ ئەبن. هەروەها، سەرپەرشتیکەری ئەوقافیش حەقی شوفعە وەرگرتنی هەیە بۆ ماڵە وەقف کراوەکەی ژێردەستی، بەپێی مەسڵەحەت، خواە وەقفەکە لەسەر مزگەوت وەقف کرابێ، یا لەسەر شوێنێکی تر.

ئەگەر بە دووکەس، بەشێك لە شەریکێك بکڕن، ئەوە بەشوفعە وەرگرەکە ئەتوانێ بەشی هەردووکیان بەشوفعە وەربگرێ و ئەیشتوانێ بەشی تەنها یەکێکیان وەربگرێو هی ئەویان تەرك بکا وە ئەگەر کەسێك بەشی دووکەسی لە موڵکێکی تێکەڵدا کڕی، بەشوفعە وەرگرەکە، ئەتوانێ بەشی خۆی لە هەردوو کڕیارەکە بە شوفعە وەربگرێ و ئەیشتوانێ لە یەکێکیانی وەربگرێو لەویان ببوورێ.

قسەی دیاریتر، ئەوەیە ئەبێ داواکردنی حەقی شوفعە دەس‌بەجێ بێ، هەرچەند کردن بەموڵكو بەدەماهاتنی سیغە دوابکەوێ، یەعنی کابرا هەر ئەوەندە دەربڕێ کەوا ئەیەوێ ئەو ماڵە بە شوفعە وەربگرێ؛ بەڵێ، لە هەندێ شوێنا داواکردنی حەقی شوفعە بە دەس‌بەجێ نابێ؛ ئەمەش ئەو شوێنانە:

یەکەم: ئەگەر کابرایەك بەشی خۆی بە نرخێکی وەعدەدار فرۆشت، کابرای بەشوفعە وەرگر ئەتوانێ قسە نەکا تا وەعدەی قیمەتەکە دێتە پێشەوە؛

دووهەم: ئەگەر یەکێك لە شەریکەکان حازر نەبوو یا منداڵ بوو، وەکوو لەپێشەوە باسمان کرد.

سێهەم: ئەگەر خەبەری پێدرابوو کە قیمەتی ماڵەکە زۆرەو ئەویش نەتوانێ بەو قیمەتە وەری‌بگرێ، کەچی لەپاشاندا دەرکەوێ قیمەتەکەی ئەوەندە نییەو کەمترە، ئەوە هەرچەند دوایش بکەوێ، هەر حەقی بەشوفعە وەرگرتنی ئەمێنێ؛

چوارەم: دواخستنە لەبەرئەوە کە کابرای بە شوفعە وەرگر چاوەڕوانی ئەوە بکا کە کشت‌وکاڵی هاوبەشە پێشووەکەی پێ‌بگاو درەوی بکرێو زەوییەکە خاڵی ببێتەوە؛

پێنجەم: ئەگەرشوفعەکەی دواخستبێ لەبەرئەوە نەزانێ قیمەتەکەی چەندە؛

شەشەم: ئەگەر شوفعەکەی دواخستبێ لەبەرئەوە کە خۆی بەشێکی زەوت‌کراوی هەبێ بیەوێ رزگاری بکا، ئەوجا ماڵەکە بەشوفعە وەرگرێ؛

حەوتەم: ئەگەر لەبەرئەوە دوای‌خستبێ کە نەزانێ حەقی شوفعەی هەیە؛

هەشتەم: ئەگەر لەبەرئەوە دوای‌خستبێ کە نەزانێ ئەم داواکردنە ئەبێ دەس‌بەجێ بێ؛

نۆهەم: ئەگەر لەبەرئەوە دوای‌خستبێ کە بیەوێ ماوەی پەشیمان بوونەوە لە موعامەکەدا تەواو ببێ؛

دەهەم: ئەگەر لەبەرئەوە دوای‌خستبێ کە لە وەختی موعامەلەکەدا منداڵ بووبێ‌و وەلی‌ئەمری نەبووبێ، یاخود وەلی‌ئەمری بووبێ، بەڵام بۆی وەرنەگرتبێ بە شوفعە؛ ئەم خۆی پاش باڵغ‌بوونی، حەقی هەیە داوای وەرگرتنی ئەو ماڵە بکا بە شوفعە.

جا هەرکاتێ بەشوفعە وەرگر بە فرۆشتنەکەی زانی، ئەبێ پەلەپەل بکا بۆ داوای شوفعە، بەپێی عادەت؛ ئەگەر لەو کاتەدا کە خەبەری زانی نەخۆش بوو، یا لە وڵاتی کڕیارەکەدا نەبوو، یا لەبەر ترسی ستەمگەرێك نەیتوانی بڕوا بۆ جێگەی شوفعەکە، ئەوە قەیدی نییە خۆی نەڕوا، بەڵکوو وەکیلێك بنێرێ داوای شوفعەکەی بۆ بکا؛ ئەگەر بۆی رێ‌نەکەوت وەکیل بگرێ، ئەتوانێ هەر لە شوێنی خۆیەوە داوای شوفعە بکا، بەو شەرتەکە شاهید بگرێ لەسەر ئەم داواکردنەی؛ ئەگەر یەکێ لەو شتانەی تەرك‌کرد کە قابیلە بیانکا، ئەوە حەقی شوفعەی نامێنێ وە ئەگەر کە خەبەری فرۆشتنی ئەوماڵەی بیست، لە نوێژدا بوو، یا خۆی ئەشۆرد، یا نانی ئەخوارد، بۆی دروستە ئەو ئیشە تەواو بکا ئەوجا بڕوا داوای شوفعەکە بکا؛ ئەگەر دوای خست لەبەرئەوە کە ئەیوت باوەڕم نەبوو بەوکەسە کە خەبەرەکەی بۆ هێنام، تەماشا ئەکەین، ئەگەر خەبەرهێنەرەکە دوو ئینسانی بەعەداڵەت بوون، یا یەك‌کەسی بەعەداڵەت بوو، یا یەك فاسقی باوەڕ پێ‌کراو بوو، ئەوە عوزرەکەی لێ قەبووڵ ناکرێ‌و حەقی نامێنێ وە ئەگەر خەبەرگەیێنەکە غەیری ئەمانە بوو، ئەوە عوزرەکەی لێ قەبووڵ ئەکرێ‌و حەقی ئەمێنێ. ئەگەر کابرای

بەشوفعەوەرگر گەیشت بەکڕیارەکەو سەلامی لێ کرد، یا پێی وت: موعامەلەکەت پیرۆز بێ، بەوە حەقی شوفعەکەی بەتاڵنابێتەوە وە ئەگەر لەپاش موعامەلەی هاوبەشەکەی، هەموو بەشەکەی خۆی فرۆشت بەکەسێك ئەوە ئیتر حەقی نامێنێ وە ئەگەر هەندێکی لێفرۆشتو هەندێکی هێشتەوە، بەهۆی ئەم هەندەیەوە حەقی شوفعەکەی ئەمێنێ.

## باسی قازانج بەشەراکەت (قِراض)

قازانج بەشەراکەت، لەشەرعدا، بریتییە لەوە کەسێك ماڵی خۆی بدا بە کەسێکی تر بۆ ئەوە کە بازرگانی پێوە بکاو پێیبکڕێو بفرۆشێو قازانجەکەی بەشەریکی بێ لەنێوانیانا؛ ئەرکانی قازانج بەشەراکەت، شەش شتە؛ «خاوەنماڵ؛ ئیشکەر؛ ماڵ؛ ئیش؛ قازانج؛ سیغە».

شەرتی عەقدەکەرەکان ئەوەیە تەسەڕوفو موعامەلەیان دروستبێ و شەرتی خاوەنماڵ ئەوەیە حەقی تەسەڕوفی ببێ لەو ماڵەدا و شەرتی ئیشکەر ئەوەیە چاوی ببینێو ئیشەکەی بازرگانی بێ، یەعنی کڕینوفرۆشتن، یا شتێك بێ کە پێویستی بازرگانییە، وەك بڵاوکردنەوەو پێچانەوەی قوماش؛ کەواتە، ئەگەر قازانج بەشەراکەتی بۆ ئەوە لەگەڵدا کرا کە گەنم بکڕێو بیهاڕێو بیکا بە نانو نانەکە بفرۆشێ، ئەوە قازانج بەشەراکەتێکی بەتاڵە؛ هەروەها، پێویستە کە تەسەڕوفی ئیشکەرەکە بەرەڵڵا بێ و خاوەنماڵەکە کڕینو فرۆشتنی جۆرە پارچەیەکیوای بەسەرا فەرز نەکا کە دەستکەوتنی نایاب بێ، یاخود زۆری لێنەکاکە ئەبێ موعامەلە لەگەڵ تەنها یەك کەسدا بکا، چونکە ئەم جۆرە وەزعانە ئەبن بەهۆی ئەوە کە کابرا ئیشی پێنەکرێ بەباشی.

شەرتی ماڵەکەیش چەند شتە:

یەکەم، ئەوەیە کە درهەمو دیناری زیوو ئاڵتوونو بێغەشو سکەدار بێ؛ کەواتە، قازانج بەشەراکەت دروست نییە لەسەر شووشی ئاڵتوونو زیو، هەروەها لە خشڵی ژنانەدا و لە پیتاکدا وەك حەیواناتو پۆشاكو قاپو قاچاخو شتیتر؛ بەڵام گەلێ لە پێشەوایانی ئایین، وتوویانە: قازانج بەشەراکەت دروستە لە پارەی سکە لێدراوی

مەغشووشدا، چونکە رەواجیان هەیە؛ بەتایبەتی ئەم شەرتە بۆ ئەمڕۆ کە بەشی هەرەزۆری موعامەلە بە کەلوپەل و پارەی کاغەزە، زۆر زەحمەتە؛ بەڕاستی، ئەگەر ئیمامی شافیعی لەمزەمانەدا بوایە، فەتوای ئەدا کەوا قازانج بەشەراکەت دروستە هەرچەند ماڵەکەیش، دینارو نیکلو کەلوپەلی رەواجدار بێ.

ئەمڕۆ، چاری موعامەلەی قازانج بەشەراکەت بەوەیە خاوەنماڵ کابرای ئیشکەر بکا بە وەکیل لەو موعامەلانەدا کە ئەیەوێ بیانکات و تێکڕا جینسی موعامەلەکەی بۆ دەربخات و بە «نەزری بیرڕی» هەر قازانجێك لەو بازرگانییە پەیدا ببێ، نیوەی نەزر بکا لەو وەکیلە کە بازرگانییەکەی بۆ ئەکات.

**شەرتی دووهەمی** ماڵەکە، ئەوەیە جینسو ئەندازەو سیفەتی دیاری بێ، هەروەها بەدەستەوە بێ؛ کەواتە، قازانج بەشەراکەت دروست نییە لەسەر قەرزێك کە لە گەردنی ئیشکەرەکەدایە یا لە گەردنی کەسێکی ترایە؛ بەڵێ، ئەگەر قەرزەکەی وەرگرتەوەو پاش ئەوە دایەوە دەستی موعامەلەی پێبکاو عەقدی قازانج بەشەراکەتی لەگەڵ کرد، ئەوە دروستە.

هەروەها دروست نییە بڵێ: وا ئەو کیسە پارەیەم پێدای بۆ قازانج بەشەراکەت، مادام دیاری نەبێ ئەو کیسە چییەو چەندی تیایە، یاخود بڵێت: وا یەکێك لەو دوو کیسەیەم پێدای بۆ قازانج بەشەراکەت؛ بەڵێ، ئەگەر لە هەمان مەجلیسدا دیاری بکا کامیانی ئەداتێو ئیشکەرەکەیش بزانێ کە جینسو سیفەتو ئەندازەی چییەو چۆنە، ئەوە دروستە.

**شەرتی سێهەمی** ماڵەکە، ئەوەیە ئەو ماڵە لە دەستی ئیشکەرەکەدا بێ؛ کەواتە، دروست نییە ماڵەکە لەدەستی خاوەنماڵەکەدا بێ، هەروەها دروست نییە خۆیشی ئیشی لەگەڵ بکا؛ بەڵێ، دروستە شەرتی ئەوە بکرێ خاوەن ماڵ، وڵاخێك یاخود ئۆتۆمۆبیلێك لە ماڵی خۆی بدا بە ئیشکەرەکە باری پێبکێشێ، وەك دروستە کەسێك بکا بە هاوڕێی لەسەر ئەساسی ئەوە کە هاوبەشی بێ لە قازانجەکەدا بە ئەندازەیەکی دیاری و لەڕاستیدا، ئیشکەرێکی دووهەم بێ لەگەڵ ئیشکەرەکەیدا.

لە قازانج بەشەراکەتدا، ناوبردنی ماوە «مُدّة» شەرت نییە، یەعنی پێویست ناکا بوترێ ماوەی قازانج بەشەراکەتەکە چەند بێ؛ کەواتە، ئەگەر خاوەن ماڵ ناوی ماوەی ساڵێکی برد، ئەمە تەماشا ئەکەین، ئەگەر بۆ وەخت دانان بێ؛ مەسەلا، وتبێتی: «وا قازانج بەشەراکەتم لەگەڵ کردی بەو شەرتەکە ماوەی ئیشکردنەکەت تەنها یەك ساڵ بێ»، ئەوە ئەو قازانج بەشەراکەتە بەتاڵە، خواە بهێڵێ یا نەهێڵێ ئیشکەرەکە پاش ماوەی ساڵەکەئیش بکا وە ئەگەر بۆ ماوەدانان نەبێ؛ مەسەلا، بڵێت: «وا قازانج بەشەراکەتم لەگەڵ کردی بۆ ماوەی ساڵێك»، ئەوە لەم سوورەتەدا، ئەگەر لەپاش ساڵەکە مەنعی تەسەرووف کردنی ئیشکەرەکە بکا، ئەوە قازانج بەشەراکەتەکە بەتاڵە؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: لەپاش ساڵەکە، شت مەکڕە، ئەوە قەیدی نییە.

شەرتی قازانجەکەیش ئەوەیە خاوەنماڵو ئیشکەر هاوبەش بن تیایدا؛ کەواتە، ئەگەر قازانج بەشەراکەتی لەگەڵ کرد لەسەر ئەو ئەساسەکە قازانجەکە هەر بۆ خۆی بێ یا هەر بۆ ئەو بێ، ئەوە بەتاڵە.

دووهەم: ئەبێ ئەو قازانجە بەتایبەتی بۆ ئەو دووکەسە بێ؛ کەواتە، ئەگەر بەشەرتی گرت کە کەسێکی تریش لەگەڵیانا ببێ بە هاوبەش، ئەوە بەتاڵە.

سێهەم: ئەوەیە بەشە قازانجەکەیان دیاری بێ بە شکاندنەوە (کَسر)، یەعنی بە نیوەیی یا بە سێیەك، یەعنی لە سێبەش بەشێکی بۆ ئیشکەرەکەو دووبەشی بۆ خاوەن ماڵەکە، یا بە پێچەوانەوە؛ کەواتە، ئەگەر وتی: وا قازانجبەشەراکەتم لەگەڵ کردی لەسەر ئەو بڕیارە شتێکت ببێ لە قازانجەکە، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵێ؛ ئەگەر وتی: لەسەر ئەو بڕیارە قازانجەکەی لەبەینمانا بێ، ئەوە دروستەو مەعنای بە نیوەیی لێ ئەدرێتەوە وە ئەگەر خاوەن ماڵ وتی: نیوەی قازانجەکەی بۆ من بێو ئیتر باسی هیچی نەکرد، ئەوە بەتاڵە وە ئەگەر وتی: نیوەی قازانجەکەی بۆ تۆبێو باسی خۆی نەکرد، ئەوە دروستە و ئەو نیوەکەی قازانجەکەی بۆ خاوەن ماڵ ئەبێ، چونکە قازانج ئەچێتە سەر سەرمایە.

ئەگەر خاوەنماڵ وتی: وا قازانج بەشەراکەتم لەگەڵ کردی لەسەر ئەوەکە ـ مەسەلا ـ دە دینار لە قازانجەکەی بۆ تۆ بێ، ئەوە بەتاڵە، چونکە مەعلووم نییە ئەوەندەی قازانج

ئەبێ یا نە وە ئەگەر ئەوەندەیش قازانجی ببێ، نیسبەتی بۆ ئەسڵی ماڵەکە مەعلووم نییە، یەعنی نازانین ئەو دەدینارە نیوەی قازانجەکەیە یا سێ یەکیەتی یا چەندیەتی. هەروەها، ئەگەر وتی: لەسەر قەراری ئەوە قازانجی ئەو جۆرە ماڵەیان بۆ تۆ بێو قازانجی جۆرەکانی تری بۆ خۆم بێ، ئەوەش بەتاڵە، چونکە نازانین ئاخۆ ئەو جۆرەیان ئەفرۆشرێ یا نە و قازانجی ئەبێ یا نە وە ئەگەر قازانجیشی ببێ، نیسبەت چەند ئەبێ بەتێکڕای هەموو قازانجی ماڵەکە.

لە سیغەی عەقدی قازنج بەشەراکەتدا، ئیجاب و قەبووڵ پێویستە؛ مەسەلا، کابرای خاوەنماڵ بڵێ: وا قازانج بەشەراکەتم لەگەڵ کردی لەم ماڵەداکە وا لەپێش چاوتا لەسەر ئەو قەرارە کە قازانجەکەی ـ مەسەلا ـ بەنیوەیی‌مان بێ و ئەم دوو کەسە کە ئەم موعامەلەیە ئەکەن، وەك وەکیل و وەکیلگر وان؛ جا ئەگەر کابرای ئیشکەریش ئیشکەرێکی گرت بە ئیزنی خاوەنماڵەکە، ئەوە بەتاڵە، بەڵام ئەو ئیشکەری دووهەمە، ئەگەر تەسەڕوفی کرد لە ماڵی قازانج بەشەراکەتەکەدا، ئەوە دروستە، چونکە هەرچەند سیفەتی ئیشکەری نییە، بەڵام ڕێگای دراوە بۆ تەسەڕوف کردن، ئەوەندە هەیە هەموو قازانجێکی هەر موعامەلەیەك کە بیکا، بۆ خاوەن ماڵەکەیەو بەشی ئیشکەری یەکەمی تیا نییە، چونکە ئیشی نەکردووە لەو موعامەلەیەدا و موستەحەقی قازانج نییە لەسەر ئیش کردنەکەی؛ جا ئەگەر خاوەنماڵەکە لەکاتی ڕێگا دانەکەیدا تەماعی قازانجی خستبووە پێش چاوی، ئەوە کرێی ئەکەوێتە سەر خاوەن موڵك، ئەگینا هیچی ناکەوێ.

وە ئەگەر بە بێ‌ئیزنی خاوەنماڵ ئیشکەرێکی بۆ خۆی گرت، ئەمە خراپتر لە سوورەتی پێشوو بەتاڵە و هەر تەسەڕوفێکیش بکا لەو ماڵەدا، وەك تەسەڕوفی زەوتکەر وایە؛ جا ئەگەر ئەم ئیشکەری دووهەمە شتێکی کڕی، ئەوە ئەگەر لەسەر حیسابی ئەستۆی خۆی کڕی و پاشان ماڵی خاوەن ماڵەکەی‌دا لە حەقیا، ئەوە لەسەر فەرموودەی تازەی ئیمامی شافیعی کە ئەفەرموێت: زەوتکەری ماڵ هەر موعامەلەیەك لەسەر حیسابی ئەستۆی خۆی بکا، قازانجەکەی بۆ خۆیەتی، قازانجەکەی بۆ ئیشکەری یەکەمە، چونکە کابرا لێرەدا ئەم ئیشەی بەئیزنی ئیشکەری یەکەم کردووەو

وەکیلی ئەوەو کرێیش لەسەر ئەوە وە ئەگەر بە عەینی ماڵی قازانج بەشەراکەتەکە کڕیبووی، ئەوە موعامەلە لە ئەساسەوە دانەمەزراوە.

دروستە یەك کەس قازانج بەشەراکەت بکا لەگەڵ دوو ئیشکەردا لەسەر ئەساسی هاوسانی یا زیادو کەم لە قازانجی ماڵەکەدا؛ هەروەها، دروستە دووکەس قازانج بەشەراکەت بکەن لەگەڵ یەك کەسدا و هەر قازانجێکی هەبوو، پاش ئەوەی ئیشکەرەکە بەشی خۆی وەرگرت، خاوەن ماڵەکان بەشی بکەن لە بەینی خۆیانا بەپێی ئەندازەی ماڵەکەیان.

هەرکاتێك قازانج بەشەراکەت دانەمەزرا بەهۆی فەوتانی شەرتێك یا چەند شەرتێك لە شەرتەکانیەوە، ئەوە تەسەڕوفی کابرای ئیشکەر بە دامەزراوو دروست دائەنرێ، چونکە رێگای تەسەڕوف کردنی دراوە و قازانجیش هەمووی بۆ خاوەن ماڵەکەیەو ئیشکەرەکە تەنها حەقی «أُجرَةُ المثل»ی هەیە بەسەر خاوەن ماڵەکەوە، یەعنی کرێی ئیشکەرێکی وەك خۆی لە ئیشێکی لەو چەشنەدا.

ئەگەر خاوەنماڵەکە وتبێتی: وا قازانج بەشەراکەتم لەگەڵ کردی لەسەر ئەوەی کە هەرچی قازانجەکەیە هەمووی بۆ خۆم بێ، ئەوە ئیشکەرەکە مادام بەوقسەیە رازی بووبێ، کرێی هیچی ناکەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر وتی: نەمزانیوە بەمقسەیە هەموو حەقێکم ئەفەوتێ، ئەوە کرێی ئەکەوێ.

بزانن! پاش دامەزرانی موعامەلەی قازانج بەشەراکەت، واجبە لەسەر ئیشکەرەکە بە پارێزو ئیحتیات تەسەڕوف بکا لەو موعامەلەیەدا؛ مەسەلا، نابێ بیفرۆشێ بە زیانێکیواکە بەعادەت قەبووڵ نەکرێ و نابێ بە بێ ئیزنی خاوەنماڵ بیدا بە قەرز وە ئەگەر ئیزنی وەرگرت کە بیدا بە قەرز، ئەبێ هەرکاتێك دای بەقەرز، شاهیدی بۆ بگرێ کەوا ئەو موعامەلەیەی بەقەرزکردووە، بۆ ئەوەکە کابرای کڕیار مەیدانی ئینکارکردنی نەبێ لەپاشەڕۆژدا، ئەگینا ئەبێ بە زامنی هەر ماڵێك کە دابێتی بە قەرز، مەگەر موعامەلەکە زۆر مەسڵەحەت بێو تا شاهید پەیدا بکا لەسەر بەقەرزدانی ماڵەکە، لە دەستی دەرچێ، لەم حاڵەدا، ئەتوانێ بە بێشاهید ماڵ بدا بە قەرز.

بەڵام بۆی دروستە ماڵ بفرۆشێ بە کەلوپەل، هەروەها بۆی هەیە ئەگەر ماڵێکی عەیبداری کڕی، بیداتەوە بەسەر خاوەنەکەیا ئەگەر سوود لە گێڕانەوەکەیدا بێ، ئەگینا بەپێی مەسڵەحەت بیهێڵێتەوە، هەروەها خاوەنماڵەکەیش ئەتوانێ ئەو ماڵە عەیبدارە بگێڕێتەوە ئەگەر خاوەن ماڵو ئیشکەر قسەیان یەك نەکەوتو خاوەنماڵ ئەیویست ماڵەکە بداتە دواوەو ئیشکەرەکە بەپێچەوانەی ئەوەوە، ئەوە پێویستە قازی یا پیاوچاکێك ڕێگایان بۆ دانێو ئەوانیش بەپێی قسەی ئەو بجووڵێنەوە.

ئیشکەری قازانج بەشەراکەت، بۆی دروست نییە شت بفرۆشێ بە خاوەن ماڵەکە، بەڵام دروستە لێی بکڕێ. هەروەها، ئەگەر دوو ئیشکەری هەبوو، دروستە یەکێکیان لەگەڵ ئەویاندا موعامەلە بکا، هەرچەند هەردووکیشیان ئیشکەری یەك خاوەن ماڵن.

دروست نییە بۆ ئیشکەری قازانج بەشەراکەت زیاد لە ئەندازەی دەسمایەو قازانجەکەی ماڵ بکڕێ بۆ موعامەلە پێ کردن و دروست نییە بە بێ ئیزنی خاوەن ماڵەکە، لەگەڵ خۆی بیبا بۆ سەفەر، هەرچەند سەفەرەکەشی کورت بێو ڕێگەکەی ئەمین بێو بە بێمەسرەف بۆی ببرێ لەگەڵ خۆیدا، چونکە سەفەر مەجالی بەڵاو زەحمەتە؛ بەڵێ، ئەگەر خاوەنماڵ ڕێگای دا، ئەوکاتە دروستە سەفەر بکا، جا ئەگەر جێگایەکی دیاری کرد، پێویستە لانەدا بۆ جێگایەکی تر وە ئەگەر جێگای دیاری نەکرد، دروستە لەسەر ئوسوولو پەیڕەوی بازرگانی ئەو وڵاتە سەفەری پێوە بکا.

دروست نییە ئیشکەری قازانج بەشەراکەت پارە خەرج بکا لەوەی کە دراوە پێی بۆ قازانج بەشەراکەت، چ لە سەفەرو چ لە شوێنی خۆیا و پێویستە لەسەری هەر ئیشێك کە بەگوێرەی عادەت ئیشی ئەو بێ، وەك پێچانەوەو کردنەوەی قوماشو کێشانەو پێوانەی شتی سووك، بیکا و ئەوەی واجب نەبێ بیکا، دروستە کرێکاری بۆ بگرێ لەسەر حیسابی ماڵی قازانج بەشەراکەتەکە، چونکە شتیوا لە مەسڵەحەتی قازانج بەشەراکەتەکەدایە.

«بێداری» ئیشکەری قازانج بەشەراکەت، هەر موعامەلەیەکی کرد بە بێ ئیزنی خاوەن ماڵ، ئەگەر بە عەینی ماڵی قازانج بەشەراکەتەکە کردی، ئەوە بەتاڵە و نابێ بە

ماڵی قازانج بەشەراکەت یا نابێ بە ماڵی ئەو کەسە کە پێی ئەفرۆشێ وە ئەگەر لەسەر حیسابی ئەستۆی خۆی کردی، ئەوە بۆخۆی دائەمەزرێ.

قسەی ئاشکراتر، ئەوەیە ئەو قازانجەی لە پارەی قازانج بەشەراکەت پەیدا ئەبێ، هیچی نابێ بە بەشی ئیشکەرەکە تا دابەش نەکرێ لەبەینی ئـەوو خـاوەنماڵەکـەدا، چونکە لەوانەیە پاشان زیانیان تووش ببێ و لەو حاڵەدا، ئەو زیانە بە پارەی قازانجەکە پڕ ئەکرێتەوە.

قسەی راستتر، ئەوەیە هەر قازانجێك لەپارەی قازانج بەشەراکەت پـەیدا بـبێ بـە بێزەحمەت پێوەکێشانی ئیشکەرەکە، وەك میوەی باخ و بەچکەی حەیوانێ کەکڕابێ بۆ بازرگانی، ئەوە بۆ خاوەنماڵەکەیە؛ بەڵێ، ئەگەر لەکاتی موعامەلەکەدا ئەوەو حەیوانە ئاوس بوو یا میوەیباخەکە پەیدا بووبوو، ئەوە هەمووی ئەکەوێتە بەر ماڵی قـازانـج بەشەراکەتەکە. هەر ناتەواوییەك پەیدا ببێ لە ماڵی قازانج بەشەراکەتدا بەهۆی کـزیی قیمەتی بازاڕەوە، یا بەهۆی ناردنەوەی ماڵی عەیبدارەوە، یا بەهۆیترەوە، هـەمووی حیساب ئەکرێ لە قازانجو بە قازانجەکەیش پینە ئەکرێ، ئەگەر لەتوانادا هەبێ؛ بەڵێ، ئەگەر خاوەنماڵ هەموو ماڵی قازانج بەشەراکەتەکەی فەوتاند، ئەوە هەرچـەند ئـەو عەقدی قازانج بەشەراکەتە نامێنێ، بەڵام بەشی قازانـجی ئـیشکەرەکـە لە ئـەستۆی خاوەنماڵەکەدا ئەبێو ئەتوانێ لێی بستێنێ؛ هەروەها، ئـەگـەر لەپـاش تـەسەڕوفـی ئیشکەرەکە هەندێك لە ماڵی قازانج بەشەراکەتەکە بەهۆی ئافەتو نەخۆشیو دزیو زەوت کردنەوە، یا بەهۆیتری لەم چەشنەوە فەوتا، ئەوەیش لە قازانجەکە دائەشکێنن، بەڵام ئەگەر لەپێش تەسەڕوف تیاکردنی ئەودا فەوتا، ئەوە لە سەرمایەکە دائەشکێ.

## باسی هەڵوەشاندنەوەی قازانج بەشەراکەت و هەندێ حوکمی تر

دروستە بۆ خاوەنماڵو بۆ ئیشکەر، موعامەلەی قازانج بەشەراکەت هەڵوەشێننەوە وە ئەگەر یەکێکیان مرد، یاخود شێت بوو، ئەوە موعامەلەکە لەخۆیەوە هەڵئەوەشێتەوە وکە هەڵوەشایەوە، پێویست ئەبێ لەسەر ئیشکەرەکە هەموو سەرمایەکە بداتـەوە بـە

خاوەنەکەی وە ئەگەر کەل‌وپەلیش بوو، نەختی بکاتەوە، هەروەها هەر قەرزێکی لەسەر خەڵك هەبێ، وەری‌بگرێتەوە وە ئەگەر خاوەن‌ماڵەکە هەندێکی لە ماڵی قازانج بەشەراکەتەکەی بردەوە لەپێش دەرکەوتنی سوودو زیاندا، ئەوە ئەو ئەندازەیە لە سەرمایەکە دائەشکێ وە ئەگەر پاش دەرکەوتنی سوودو زیان بوو، ئەوە حیساب ئەکرێ لە سەرمایەو قازانج بەنیسبەتی خۆیان؛ مەسەلا، ئەگەر سەد دیناری دایە دەستی ئیکشەرەکە و ئەو سەد دینارە بیست دیناری قازانج کرد، دیارە قازانجی پارەکە شەش‌یەکە؛ جا ئەگەر خاوەن‌ماڵ بیست دیناری وەرگرتەوە، ئەوە شەش‌یەکی ئەو بیست دینارە ـکە سێ دینارو سێ یەکە دینارێکە «٣٣٣ فلس‌و سێ‌یەکە فلسێك» ـ قازانجەو ئەوی‌تری سەرمایەیە؛ کەواتە، لەو شەش‌یەکەدا، ئیشکەر بەشی خۆی ئەباکە بریتییە لە دینارێك‌و دوو سێ‌یەکە دینار وە ئەگەر لەپاش زیان بردیەوە، ئەوە زیانەکەیش دابەش ئەکرێ بەسەر ئەو ئەندازە پارەیەدا کە خاوەن‌ماڵەکە ئەیباتەوە و بەسەر ئەو ئەندازەیەدا کە لای ئیشەرەکە ماوە؛ کەواتە، ئەگەر لەوەوپاش قازانجی کرد، ئەوە ئەو بەشە زیانە کە تابیعی ئەوە بووە کە کابرا بردوویەتییەوە، تۆڵەی ناکرێتەوە؛ مەسەلا، سەرمایە سەد دینارەو زیان بیست دینارە، لەوەوپاش بیست دیناری بردەوە، ئەوە چواریەکی ئەو بیست دینارە، بەشە زیانی بیست دینارەکەیە و سەرمایەکە ئەگەڕێتەوە سەر حەفتاو پێنج دینار، وەك ئەوەکە کابرا بیست‌و پێنج دیناری بردبێتەوە.

**بزانن!** باوەڕ بە سوێندی کابرای ئیشکەر ئەکرێ، ئەگەر ئیددیعای کرد کە هیچ قازانجی نەکردووە بەڵێ، ئەگەر وتی: دە دینار قازانجم کردووە، پاشان پەشیمان بووەوە، ئەوە لێی وەرناگیرێ، بەڵام ئەتوانێ سوێندی خاوەن‌ماڵەکە بدا لەسەرئەوەکە ئەوەندە قازانجی کردووە، جا ئەگەر خاوەن ماڵەکە نکوولی کرد، ئەوسا ئیشکەرەکە ئەتوانێ سوێند بخوا؛ هەروەها، باوەڕ بە سوێندی ئیشکەرەکە ئەکرێ، ئەگەر سوێندی خوارد فلان شتی بۆ قازانج بەشەراکەت کڕیوە، هەرچەند زیانیش بکا، یا ئەگەر وتی: بۆ خۆمم کڕیوە، هەرچەند قازانجیش بکا، بەو شەرتە بە ماڵێك کڕیبێتی کە لەئەستۆی خۆیدا بێ، ئەگینا ئەگەر بەعەینی ماڵی قازانج بەشەراکەتەکە کڕیبێتی، ئەوە هەر ئەبێ بە

ماڵی بازرگانی، هەرچەند نیازی خۆیشی بووبێ؛ کەواتە، ئەگەر خاوەنماڵ شاهیدی هێنا لەسەرئەوەکە بە عەینی ماڵی بازرگانییەکە کڕیویەتی، ئەوە سابت ئەبێ بۆ ئەو ماڵەو دائەنرێ بۆ قازانج بەشەراکەت.

هەروەها، باوەڕ بە ئیشکەر ئەکرێ ئەگەر بڵێ: تۆ مەنعت نەکردووم لە کڕینی فڵانە ماڵ و خاوەنماڵەکە بڵێت: مەنعم کردوویتو شاهیدی نەبێ؛ هەروەها، باوەڕ بە ئیشکەرەکە ئەکرێ لەوەدا کە خاوەنماڵەکە بڵێ ڕێگای کڕینی هەندێ شتم نەداوە و ئیشکەرەکە بڵێ: شتیوای نەوتووە. هەروەها، باوەڕی پێئەکرێ لە جینسو نەوعو ئەندازەو سیفەتی سەرمایەکەدا و لە ئیددیعای فەوتانی ماڵەکەدا، ئەگەر ناوی هۆی فەوتانەکە نەبا، یا ناوی هۆیەکی نهێنی ببا وە ئەگەر ناوی هۆیەکی ئاشکرای برد کە بوونی ئەو هۆیەو بڵاویی زیانەکەشی ئاشکراو دیاری بن، ئەوە هەر سوێندی ناوێ؛ بەڵێ، ئەگەر ئیددیعای مردنی حەیوانی ماڵی قازانج بەشەراکەتی کرد، ئەوە ئەگەر لە دەشتی دوور لە ئاوەدانیدا بێ، بە سوێند باوەڕی پێئەکرێ وە ئەگەر لەناو ئاوەدانیدا بێ، ئەبێ بە شاهید ئیسپاتی بکاو هەروەها باوەڕی پێئەکرێ لە ئیددیعای ئەوەدا کە ماڵەکەی داوەتەوە بە خاوەنەکەی؛ بەڵێ، ئەگەر کابرای ئیشکەر ئەوەندەی ماڵ وەرگرت کە لەتواناییدا نەبوو هەمووی بەڕێوەبەرێ و هەندێکی لێ فەوتا لەپاش کەوتنەئیش، ئەوە ئەبێ بە زامنی ئەو ماڵە فەوتاوە، هەرچەند درێغیشی نەکردبێ لە مەسەلەی فەوتانەکەیدا؛ لەم مەسئەلەیەدا، حوکمی وەکیلو وەسیو ماڵ بە ئەمانەت لادانراو، وەك حوکمی ئیشکەری قازانج بەشەراکەت وایە.

وە ئەگەر لەپاش فەوتانی ماڵەکە، خاوەن ماڵ وتی: بە قەرز داومەتێ و ئیشکەر وتی: بە قازانج بەشەراکەت هێناومە، ئەوە باوەڕ بە ئیشکەرەکە ئەکرێ.

وە ئەگەر ناکۆکییان کەوتە بەینەوە لەبارەی ئەندازەی ئەو قازانجەوەکە بڕیار دراوە بۆ ئیشکەرەکە ئەوە پێویستە هەردوولا سوێند بخۆن بە جۆرێکیوا کە «بوون»و «نەبوون»ی تیا کۆببێتەوە؛ مەسەلا، خاوەن ماڵەکە بڵێت: قەسەم بەخوا بەشە قازانجەکەت نیوە نییە، بەڵکوو سێیەکە و ئیشکەرەکەیش سوێند بخوا بڵێ: سێیەك

نییەو نیوەیە، بەمە، عەقدەکە هەڵئەوەشێتەوە، ئەوجا هەرچی قازانج هەبێ، هـەمووی ئەبێ بە هی خاوەن ماڵەکەو ئیشکەرەکە «أُجرةُ المثل»ی پێ ئەبڕێ.

## باسی باخەوانی «مُساقاة»

باخەوانی لەشەرعا، بریتییە لەوە کەسێك موعامەلە لەگەڵ کەسێکی‌ترا بکا لەسەر خزمەت کردنی باخی دارخورماو رەزەمێو بە ئاودانو شتی‌تر، بەرابـەر بـە بـەشێکـی دیاری لەمیوەی ئەو باخە، وەك نیوە یا چواریەك مەسەلا.

ئەرکانی ئەم موعامەلەیە، شەش شتە: هەردوو عەقدکەرەکە؛ بـاخەکـە؛ مـیوەکـە؛ ئیشەکە؛ سیغەی عەقدی موعامەلەکە. ئەم باخەوانییە، دروستە لە ئینسانێکی وەهاوەکە تەسەڕوفاتاتی دروستو دامەزراو بێت، یەعنی خاوەن روشدو ئیختیار بێ؛ بۆ باخی منداڵو شێتیش، دروستە وەلی ئەمری شەرعییان لەبەر مەسڵحەتی ئەوان، باخەوانی بۆ بگرێ؛ بۆ باخی «بیتُ المال»یش، لەلایەنی کاربەدەستی موسوڵمانانەوە و بۆ بـاخی مەوقووفەیش، لەلایەن نازری وەقفەوە باخەوان ئەگیرێ.

ئەو باخەی کە عەقدی باخەوانی بەسەرا ئەڕوا، ئەبێ باخی دارخورما یا باخی رەز بێ، بەڵام بە فەرموودەی کۆنی ئیمامی شافیعی -خوای لێ رازی بێ- دروستە عەقدی باخەوانی بەسەر هەموو جۆرە باخێکی خاوەن میوەدا بڕوا، چونکە خەڵك موحتاجی ئەم جۆرە موعامەلەیەن و لەلایەنی گەلێك لە زانایانی دینەوە، ئەم فەرموودەیە پەسەند کراوە و تەقلید کردنی ئەم فەرموودەیە زۆر باشەو دروستە بۆ ئێمـە، چـونکە بـەشی زۆری باخاتی وڵاتی ئێمە، باخی هەنارو هەنجیرو گوێزو هەڵووژەو قەیسیو شتی‌وایە وە باخی خورمای هیچ تیا نییەو خەڵقیش پێویستیان بە ئیشو کاسبی کردنە.

## باسی «مُخابَرَة»و «مُزارَعَة»

موخابەرە، دروست نییە کە ئەوەتە خاوەن زەوی رێك بکەوێ لەگەڵ کەسێك ئیش بکا لە زەوییەکەیدا بەرابەر بە هـەندێ لە واریـداتـی ئـەو زەویـیەو تـوویش لەسـەر

ئیشکەرەکە بێ؛ هەروەها، موزارەعەیش دروست نییە کە بریتییە لەوە خاوەنزەوی رێكبکەوێ لەگەڵ کەسێکدا ئیش بکا لە زەوییەکەیدا بەرابەر بە هەندێ لە واریداتی زەوییەکەو توویش لەسەر خاوەن زەوییەکە بێ، بەڵام هەندێ لە زانایانی شافیعی، رێگای ئەم دووجۆرە موعامەلەیەیان داوە، چونکە خەڵك پێویستیان پێیانەو دروستیشە ئینسان بۆ خۆی تەقلیدی فەرموودەی زانایەك بکا.

**بزانن!** ئەگەر لەبەینی دارخورماکانا یا لەتەنیشتیانا، یا لەناو رەزەکەدا یا لەقەراغیانەوە ئەرزی پاك هەبوو، دروستە موزارەعە لەسەر ئەو ئەرزە بکرێ بەشێوەیەك کە تابیعی عەقدی باخەوانییەکەبێ، بەو شەرتە ئیشکەری باخەوانی یەکەو موزارەعەکە یەك کەس بێ و زەحمەت بێ بەجیا لە خورماکە یا لە رەزەکە ئەو ئەرزە ئاو بدرێ‌و بەروبوومی لێوەربگیرێ؛ لەم سوورەتەدا، شەرتە عەقدی باخەوانی‌و موزارەعەکە یەك عەقد بێ‌و باخەوانییەکە لەپێشەوە بێ؛ ئیتر ئەو بەشەی باخەوانییەکە لەگەڵ بەشی موزارەعەکەدا وەرئەگیرێ، خواه ئەوەندەی یەك بن یا فەرقیان هەبێ و ئەرزەکە کە لەگەڵ ئەو داری خورماو باخی رەزەدایە، کەم بێ یا زۆر بێ، بەڵام موخابەرە لەو ئەرزەدا بە تەبەعیەتی باخەوانییەوە، بەتاڵە.

جا ئەگەر کەسێك موزارەعەی کرد لەگەڵ ئیش‌کەرێکدا، ئەوە هەرچی بەروبوومە بۆ خاوەن زەوییەکەیە، چونکە تووەکە ماڵی خۆیەتی و کابرای ئیشکەریش کرێی خۆی‌و مەسرەفی هەرچی کردووە، هەمووی ئەکەوێتە سەر خاوەن زەوییەکە وە ئەگەر موخابەرەی لەگەڵیا کرد، ئەوە هەرچی بەروبوومە بۆ ئیشکەرەکەیە، چونکە تووەکە هی ئەوە و خاوەن زەوی تەنها کرێی زەوییەکەی ئەکەوێ.

رێگای ئەوە کە لە موزارەعەدا بەروبووم بە شەریکی بێ لە بەینی خاوەن زەوی‌و زەرعاتکاردا، ئەوەتە خاوەنزەوی نیوەی تووەکە بدا بە زەرعاتکارەکە لەکرێی ئەوەدا کە بەشە تووەکەی خۆی بۆ داچێنێ بەنیوەی زەوییەکەدا و ئەو بەشە زەوییەکە کە زەرعاتکارەکە بۆ خۆی دائەچێنێ، بە عاریە بیداتێ، یاخود کابرای زەرعاتکار بگرێ بەکرێ بەنیوەی تووەکەی و بە قازانجی نیوەی زەوییەکەی لە ماوەی شەش مانگدا، بۆ ئەوەکە نیوە تووەکەی ئەو لە نیوە زەوییەکەیدا داچێنێ‌و خزمەتی بکا تا پێ ئەگا.

لە موخابەرەیشدا ڕێگای شەریكی لە بەروبوومدا ئەوەیە ئیشكەرەكە نیوە تووەكەیو قازانجی ئیشەكەی خۆی -كە وەشاندنی ئەو نیوە تووەیە لە نیوەی ئەرزی خاوەن ئەرزەكەدا- بكا بەكرێی ئەو نیوە زەوییەكە نیوەی تووەكەی خۆی پیا دائەچێنێ، ئەوجا لەم سوورەتانەدا، هەرچی بەروبووم پەیدا بوو لە زەوییەكە، ئەبێ بە تێكەڵ لەبەینی هەردووكیانا؛ ئەمە، بۆ سوورەتی نیوەیی؛ هەروەها، بە قیاسی ئەمە بۆ سوورەتی غەیری نیوەییش، ئەگەر وایان بڕیار دابوو لەبەینی خۆیاندا.

ئەگەر كەسێك ڕێگای كەسێكیدا بۆ كێڵانی زەوییەك، ئەویش زەوییەكەی كێڵاو ئامادەی كرد بۆ تووداچاندن تیایدا و بەهۆی ئەم ئیشەوە قیمەتی زەوییەكە زیادی كرد، ئەمجار خاوەن زەوییەكە ویستی بیفرۆشێ یا بیخاتە ڕەهنەوە، ئەوە بەبێ ڕەزامەندیی ئیشكەرەكە دروست نییە چونكە زەوییەكە وەكوو ئەوە وایە كە لە حەقی ئیشی ئیشكەرەكەدا بێ بەهۆی ئەو ئیشەوەكە بە ئیزنی خاوەنەكەی كردوویە تیایدا.

## باسی هەندێك لە حوكمەكانی باخەوانی

شەرتە ئەو میوەیە بە تایبەتی، بۆ خاوەن باخەكەو باخەوانەكە بێ و بەشی كەسی تری تیا نەبێ؛ هەروەها، پێویستە تێكەڵ بێ لە نێوان ئەو دووكەسەدا، نە بەتەنها بۆ باخەوانەكەو نە بە تەنها بۆ خاوەن باخەكە بێ بەنیسبەتێكی دیاری كراو وە ئەگەر باخەوانی كەوتە پاڵ موزارەعەوە، پێویستە بەروبوومی هەردووكیان تێكەڵ بێ و دروست نییە بڕیاری ئەوە بدەن كە بەروبوومی كشتوكاڵەكە بۆ یەكێكیان و بەروبوومی باخەكەیش بۆ ئەوی تریان بێ.

فەرموودەی ئاشكراتر، ئەوەیە كە عەقدی باخەوانی دروستە لەپێش دەركەوتنی میوەی باخەكەو پاش دەركەوتنیشی، بەڵام بەو شەرتە كە بەر لە دەركەوتنی كەڵكو مەسڵەحەتی میوەكە بێ، چونكە ئیتر لەمكاتەدا ڕەنجو زەحمەتێكی بەقیمەت نامێنێتەوە بۆ باخەوانەكە.

جا ئەگەر عەقدەكە لەپاش دەركەوتنی سەمەرەكە بوو، ئەوە بەتەنها عەقدەكە،

باخەوانەکە ئەبێ بە خاوەنی بەشە میوەی خۆی وە ئەگەر بەر لە دەرکەوتنی میوەکە بوو، لەگەڵ دەرکەوتنیا، ئەبێ بە خاوەنی بەشی خۆی.

ئەگەر کەسێك عەقدی باخەوانی کرد لەگەڵ کەسێکا بۆ ئەوەی چەند نەمامە خورمایەك بنێژێ لەسەر ئەو بڕیارەکە ئەو درەختانەی پەیدا ئەبن نیوەیی بن لەبەینیانا ـمەسەلاـ ئەوە دروست نییە وە ئەگەر خاوەن باخ خۆی نەمامەکانی ناشت، بەڵام باخەوانی گرت بۆ خزمەت کردنیان بەرامبەر بە بەشێك لە میوەکەیان، ئەوە ئەگەر ماوەیەکی وای داناکە میوەی درەختەکان پێ بگات، ئەوە دروستە، ئەگینا دروست نییە. هەروەها، دروستە ئەگەر لەوانەبوو لەوماوەیەدا میوەکە پەیدابێ.

بزانن! هەروەك چۆن عەقدی باخەوانی دروستە لەگەڵ بێگانەدا، دروستیشە لەگەڵ هاوبەشی موڵکی باخەکەدا، لەسەر ئەوە کە بەشێك لە حەقی خۆی زیاتری پێبدا. بەشەرت گیراوە لەباخەوانیدا ئیشێکی وا نەدرێ بەسەر باخەوانەکەداکە لە واجباتی ئەو نەبێ؛ هەروەها، ئەبێ ئەو باخەوانە سەربەخۆ بێ لە ئیش کردنا و باخەکە لەدەستی خوێدا بێ و ماوەی ئیش کردنەکەی دیاری بکرێ بەئەندازەیەك کە لەوانەبێ لەوماوەیەدا میوەی باخەکە پێبگا، بەڵام نابێ وادەی بۆ دابنرێ بە وەختی پێ گەیشتنی میوە، چونکە پێ گەیشتنی میوە بەگوێرەی ساڵ ئەگۆڕی؛ کەواتە، ئەو ماوەیە بەڕاستی دەرناکەوێ.

سیغەی عەقدی باخەوانی، وەکوو ئەوە کە بڵێت: وا باخەوانیم لەگەڵ کردی لەسەر ئەم ڕەزە، یا: وا ئەم ڕەزەم دایەدەستت بۆ ئەوەی خزمەتی بکەی و کابرای باخەوانیش قەبووڵی بکا. جا هەر باخەوانییەك کە ناوی ئیشەکانی بەتایەتی تیا نەبرابوو، ئەوە بەسەر ئەو جۆرە ئیشانەیدا ئەبڕین کە زۆرتر بووە بەعادەت لەو وڵاتەدا؛ کەواتە، پێویستە لەسەر باخەوانەکە هەرجۆرە ئیشێك کە بۆ چاکبوونو زیادبوونی میوە پێویستە، لەوەی کە هەمووساڵێ دووپات ئەبێتەوە، وەك کێڵانی زەویو جۆماڵ کردنو ئاودانی دەرختەکانو چاك کردنەوەی چاڵاوی دەوریانو پاك کردنەوەیان لە خەوشو خاڵو بڕینی هەر لقێك کە بڕینی عادەت بێ و وەك ساوینی کەفی دار خورمای نێرۆك

بە دار خورمای مێچكەدا و وەك هەرزاڵ دروست كردن بۆ ئەومیوانەی كە ئەخرێنە سەر هەرزاڵ[1] و بڕینو وشك كردنەوەی میوەو غەیری ئەم ئیشانە؛ بەڵام ئەو ئیشانەی كە مەبەست لێیان پاراستنی باخەكەیەو هەموو ساڵێ دووبارە نابنەوە، وەك دیوار كردن بە دەوری باخەكەداو هەڵكەندنی جۆگەو ئامادەكردنی تەورو تەوراسو داسو مەقەستو گاجووت بۆ كێڵانی زەوییەكە و هەرشتێكی لەمجۆرە، ئەوە لەسەر خاوەن باخەكەیە.

عەقدی باخەوانی، بە عەقدێكی دامەزراو ئەناسرێ پێش دەركەوتنی میوەكەو پاش دەركەوتنی، وەكوو عەقدی ئیجارە؛ كەواتە، ئەگەر یەكێك لە دوو عەقدكەرەكە مرد، میراتگرەكەی لەشوێنیا دائەنیشێ وە ئەگەر باخەوانەكە بەر لە تەواو بوونی ئیشەكە رایكردو خاوەن باخەكە لەجیاتی ئەو تەواوی كرد بە پیاوەتی، ئەوە باشە و لەمكاتەدا، حەقی باخەوانەكە لەجێی خۆیایەتی؛ ئەگینا، پێویستە قازی باخەوانێك لەسەر حیسابی ئەو بگرێ وە ئەگەر قازی لەو شوێنەدا نەبوو، خاوەن باخەكە خۆی باخەوانی بۆ ئەگرێو شاهید لەسەرئەوە رائەگرێ كەوا چی مەسرەف كردووە وە ئەگەر ئارەزووی بوو، ئەو مەسرەفە لە كابرای باخەوانی یەكەم ئەسێنێتەوە وە ئەگەر باخەوانەكە مردو میراتێكی لەپاشبەجێما، ئەوە ئەگەر باخەوانییەكە لەسەر عەینی شەخسی باخەوانەكە كرابوو، ئەوە فەسخ ئەبێتەوەو هەڵئەوەشێتەوەو باخەوانەكە كرێی ئەو ئەندازە ئیشەی ئەكەوێ كە كردوویەتی وە ئەگەر لەسەر ئەستۆ (ذِمّة)ی كرابوو، میراتگرەكانی ئەتوانن لەجیاتی ئەو، باخەوانییەكە بكەنو ئەو ئیشانە بكەن كە ئەو ئەیكرد، خواه لە ماڵی خۆیان یا لە ماڵی ئەو.

وە ئەگەر سابت بوو كە باخەوانەكە خەیانەتی كردووە، بە پێلێنانی خۆی یا بە شاهید، یا بە سوێندێك كە گەڕابێتەوە سەری، ئەوە خاوەن باخەكە ئەتوانێ سەرپەرشتیكەری لەسەر دانێو لە ماڵی ئەو كرێی بدا وە ئەگەر بەمەیش چار نەكرا، ئەتوانێ باخەوانەكە دەربكا و باخەوانێكی ئەمین لە ماڵی ئەو بەكرێ بگرێ. ئەگەر

---

١. مەبەست ئەوەیە كە مەسرەفی هەرزاڵ بەستن ئەكەوێتە سەر خاوەن باخەكە و ئەوەی لەسەر باخەوانەكەیە ئەوەیە دارەكان رێكبخاو لارەكانیان لابباو هەر ئیشێكیتری لەم جۆرە هەبوو، بیكا.

میوەی باخەکە بە ماڵی یەکێکی تر دەرچوو، باخەوانەکە کرێی ئیشەکەی ئەدرێتێ لە ماڵی ئەو کەسەی عەقدەکەی لەگەڵ کردووە، چونکە بە تەماعی میوە ئەو ئیشەی کردووەو وای زانیوە باخەکە هی ئەو کەسەیە.

ئەگەر خاوەنباخ و باخەوان بوو بەهەرایان لەبارەی ئەندازەی ئەوبەشەوەکە دانراوە بۆ باخەوانەکە، ئەوە ئەگەر هەر یەکێکیان شاهیدی هەبوو، بەگوێی شاهیدەکەی ئەو ئەکرێ وە ئەگەر هەردوولایان شاهیدی پێچەوانەی یەکتریان هەبوو، یاخود هیچیان شاهیدیان نەبوو، ئەوە پێویستە هەردوولایان یەکێ سوێندێك بخۆن لەسەر ئیسپاتی قسەی خۆیانو هەڵوەشاندنەوەی قسەی ئەولایان، پاش ئەوە، عەقدەکە هەڵئەوەشێتەوەو کابرای باخەوان کرێی کەسێکی وەك خۆی ئەکەوێ بەرابەر بە ئیشێکی لەو جۆرەی کە کردوویەتی، بۆماوەی ئیشەکەی.

ئەگەر خاوەن باخ گەلێك ئیشی بڕیار دا لەسەر باخەوانەکە کە بیانکات، لەوانەی کە واجبی سەرشانی باخەوانن و میوەی باخەکە پێ گەیشت و باخەوانەکە تەنها هەندێکی لەو ئیشانە کردبوو، ئەوە هەر موستەحەقی بەشی خۆیەتی، چونکە بەهۆی عەقدەکەوە بووە بە هاوبەش لەگەڵ خاوەن باخەکەدا.

## باسی بەکرێدان (إجارة)

ئیجارە لەشەرعدا، بریتییە لەوەکەسێك قازانجی شتێك بکا بە مولکی یەکێك بەرابەر بە عیوەزێك بەپێی ئەو شەرتانەی کە لەمەولا باسیان ئەکەین.

ئەرکانی ئیجارە، شەش شتە: بەکرێدەر «مؤجِر»؛ بەکرێوەرگر «مُستأجِر»، بەکرێ دراو «مُؤجَّر»؛ قازانج؛ کرێ؛ سیغەی عەقدەکە، وەك ئەوەکە بلێت: وا ئەو خانووەم دا بە تۆ بەکرێ بۆماوەی مانگێك بە چوار دینار. شەرتی ئەوکەسانەی کە عەقدی ئیجارەکە ئەکەن، وەك شەرتی کریارو فرۆشیار وایە؛ کەواتە، پێویستە ئەم دووکەسە خاوەن روشدو خاترخۆ بن؛ بەڵێ، ئیجارەی کافر دروستە ـ هەرچەند ئیجارەی عەینیش بێ ـ وەك لەجێی خۆیدا بەیانکراوە. شەرتی سیغەی عەقدیش، ئەو شەرتانەیەکە لە سیغەی فرۆشتنو کڕیندا پێویستن، تەنها وەختداری نەبێ، چونکە ئیجارە بۆ وەختێکی

تایبەتییە و راستتر ئەوەیە ئیجارە دائەمەزرێ بەوە کە بڵێت: وا قازانجی ئەو خانووەم دایتێ بە ئیجارە بەوەندەو، ئەویش قەبووڵی بکا، بەڵام ئەگەر بڵێت: واکەڵك (مَنفَعة)ە کەیم پێ فرۆشتی، ئەویش بڵێ: وا قەبووڵم کرد، ئەوە ئەو ئیجارە دانامەزرێ، چونکە فرۆشتن بەسەر عەیندا ئەڕوا نەك بەسەر کەڵكدا.

ئیجارە، دوو جۆرە؛

یەکەم: بەسەر عەیندا ئەڕوا، وەك بەکرێدانی خانوو و دووکانو زەویو شتیوا؛

دووهەم: بەسەر کەڵکێکدا ئەڕوا کە لەئەستۆی کەسێکدا بێ، وەك ئەوە کەسێك داوای وڵاخێکی ناوونیشان دراو و تەعریف کراو بکات لەکەسێك کە بیداتێ بەکرێ و ئەویش بڵێ: وا وڵاخێکیوەهام پێدای بەکرێ، ئەمیش قەبووڵی بکات؛ جا لەپاش عەقدەکە، واجب ئەبێ لەسەر کابرا وڵاخێکی بەو سیفەتو نیشانانە بۆ ئامادە بکاو بیداتێ وە ئەگەر ئەو وڵاخە مرد، پێویست ئەبێ لەسەری وڵاخێکیتری بەو سیفەتو نیشانانە بداتێ؛ یاخود وەك ئەوە ئیشێك بسپێرێ بە کەسێك، وەك ئەوەکەوایەکیبۆ بدوورێ یا خانوویەکی بۆ بکاتەوە لە سەر ئەو شەرتانەی لەمەولا باس ئەکرێن؛ واتە: بڵێ: وا بڕیارمدا لەسەر تۆ ئەم کەوایەم بۆ بدووری بە دە پەنجایی، ئەویش بڵێ: وا قەبووڵم کرد، ئیتر بەوە واجب ئەبێ لەسەرکابرا ئەوکەوایە بدوورێ، ئیتر خواە خۆی بیدوورێ یاخود بیدا بە بەرگدروویەکیتر بیدوورێ.

شەرتی بەکرێدانی لەئەستۆدا (إجارةٌ في الذِّمة)، ئەوەیە کابرای بەکرێوەرگر لە هەمان مەجلیسدا بەدەڵی ئیجارە کە تەسلیم بکا؛ حوکمی ئەم بەدەڵی ئیجارەی «في الذمة»یە وەك حوکمی سەرمایەی سەلەم وایە، بەڵام لە بەکرێدانی عەیندا تەسلیم کردنی بەدەڵ لە هەمان مەجلیسدا شەرت نییە. کرێ لە بەکرێدانی عەینا، ئەگەر دیاری کرابوو، دواناخرێ وە ئەگەر لەئەستۆدابوو، دروستە سیغەی بەکرێدانەکە بە حازر یا بە وەعدەدار بێ وە ئەگەر سیغەی بەکرێدانەکە ناوی حازریو وەعدەداری تیا نەبرا، ئەبڕێ بەسەرئەوەدا کە کرێکە حازری بێ وە ئەگەر کرێکە دیاری کرابوو، ئەوە تەنها چاوپێکەوتنی بەسە وە ئەگەر لە ئەستۆدا بوو، پێویستە جینسو ئەندازەو سیفەتی

دیاری بێ؛ کەواتە، دروست نییە بەکرێدانی خانوو بەرابەر بە ئاوەدان کردنەوەی، یا بەکرێدانی وڵاخ بەرابەر بە ئاڵف پێدانی یا بەخێو کردنی، یا بەکرێ گرتنی کەسێك بۆ ئەوەی حەیوانێك سەربڕیێ و بیگورویێ بەرابەر بە پێستەکەی، یا بە کرێ گرتنی ئاشەوان بۆ ئەوەی تەغارێك گەنمت بۆ بهاڕێ بەرابەر بە ئەندازەیەك لە ئاردی ئەو گەنمە، چونکە کرێکە لەم‌سوورەتانەدا بەتەواوی دیاری نییە؛ مەسەلا، مەعلووم نییە حەیوانەکە ئاڵفی چەند ئەوێ، یا ئاردەکە چەندە، یا لە وردیو درشتیو نەرمییا چۆنە، یا باریکیو ئەستووریی پێستەکەی چەندە؛ بەڵێ، ئەگەر بەر لە هاڕینی گەنمەکە، مزە ئاشەکەی لێ‌جیا کرایەوە بە حیسابێکی دیاری، ئەوە دروستو بەجێیە.

کەڵکی بەکرێ گیراو، چەند شەرتی هەیە:

یەکەم، ئەوەیە قیمەتی ببێ؛ کەواتە دروست نییە یەکێك بەکرێ بگیرێ بۆ کردنی قسەیەك کە هیچ زەحمەتێکی نەبێ، هەرچەند ئەو قسەیە ببێ بەهۆی قازانجێکی زۆر بۆ کابرای بەکرێ‌گر؛ بەڵێ، ئەگەر قسەکە زۆر بوو، وەك بانگ‌دانو دەرس‌وتنەوەو نوێژ فێرکردنو شتی‌وا، یا وەك فێرکردنی تەقلید کردنی زانایانی شەرع لە مەسئەلەی ژن مارەبڕینو شتی‌وادا لەگەڵ فێر کردنی ئەرکانی ئیمانو ئیسلامو بەدەما هێنانی سیغەی عەقدی مارەبڕینەکە، ئەوە دروستە کابرای بەکرێ‌گیراو کرێی ئەو جۆرە ئیشانە وەربگرێ، وەك هەر کەسێکی تر کە ئەو کرێیەی وەرگرتبێ.

هەروەها، ئەگەر شمشێرێك یا سەعاتێك یا چەکێکی ئاگرین، تێك‌بچێ و وەستا بەتەنها دەس‌بزواندنەوەیەك چاکیان بکاتەوە، ئەوە دروستە کرێی لەسەر وەربگرێ، چونکە ئەو جۆرە ئیشە سەنعەتەو بەزەحمەت فێری بووە، بەڵام [بۆ] تاقە وشەیەك [دروست نییە]، هەرچەند بەفێربوون فێری بووە، بەڵام زەحمەتێکی‌وای نەدیوە لە فێربوونەکەیا.

هەروەها بەکرێدانی لیرەو قران بۆ خۆڕازاندنەوە، دروست نییە، بەڵام دروستە بەکرێدانی خشڵی ژنانە، وەك کرمەكو گوارەو کەمەرەو قەتارەو شتی‌وا بۆ خۆجوان کردن و دروست نییە بەکرێدانی سەگ بۆ راو، بەپێی فەرموودەی راستتر.

**دووهەم،** ئەوەیە کابرای بەکرێوەرگر توانای تەسیلم کردنی کەڵکەکەی ببێ بە حیس و بە شەرع؛ کەواتە، دروست نییە بەکرێدانی وڵاخێکی راکردوو کە نەگیرێتەوە، یا ماڵێك کە زەوتکرابێ و دەس نەکەوێتەوە، یا بەکرێ گرتنی کوێر بۆ پاسەوانی، یا زەوی بێ ئاو بۆ کشت‌وکاڵ تیاکردن، ئەگەر بە ئاوی بارانو بەفرو لافاوی بەهاران تێراو نەبێ، چونکە دیارە ئەم جۆرە شتانە کەڵکیان لێوە دەسگیر نابێ. هەروەها، دروست‌نییە بەکرێ گرتنی کەسێك بۆ دەرکێشانی دانێکی ساغ، یا بەکرێ گرتنی ئافرەتێك کە لە حەیزا بێ بۆ پاك کردنەوەی مزگەوتێك، یا بەکرێ گرتنی ژنی مێردداربۆ بەخێو کردنی منالی کەسێك، یابۆ خزمەت کردنی ماڵێك بەبێ ئەوەی مێردەکەی رێگای دابێ، چونکە بەشەرع، مەحاڵە لەم سوورەتانەدا کابرای بەکرێوەرگر کەڵکەکەی دەسگیر ببێ.

**بزانن!** دروستە دواخستنی کەڵك لە بەکرێدانی لە ئەستۆدا، وەك ئەوە کە بڵێت: واجبم کرد لە ئەستویێ تۆدا کە پاش بیست رۆژی تر ئەم بارەگەنمە ببەی بۆ فلان شوێن بەوەندە پارەو ئەویش قەبووڵی بکا؛ بەڵام لە بەکرێدانی عەیندا، دروست نییە کەڵك دوابخرێ؛ بەڵێ، ئەگەر کەسێك بەکرێ گیرا بۆئیشێك لەم ساڵی ئێستاداو هێشتا ساڵەکە تەواو نەبووبوو، دووبارە بەکرێ گیرا بۆ ساڵی دواییش، ئەوە دروستە؛ بەڵام ئەم جۆرە بەکرێدانە لە ماڵی وەقفدا دروست نییە؛ مەسەلا، ئەگەر وەقف‌کەرەکە بەشەرتی گرتبوو ئەو ماڵە وەقف کراوە لە ساڵێك زیاتر نەدرێ بەکرێ، ئەوجا سەرپەرشتی‌کەری ئەو ماڵە وەقف‌کراوە هات‌و دای بەکرێ بۆ ساڵێك و لەپێش تەواوبوونی ساڵەکەدا دایەوە بەکرێ بۆ ساڵی دوایی، ئەوە بەتاڵە، لەبەر ئەوە دوو بەکرێدان لە حوکمی یەك بەکرێداندایە و هەرچەند لە غەیری ماڵی وەقف کراودا چاوپۆشی کراوە لەمە، بەڵام لە ماڵی وەقف کراودا چاوپۆشی لێ‌ناکرێ، بۆ ئەوەی مەسڵەحەتی ماڵە وەقف کراوەکە نەفەوتێ.

دروستە تەنها وڵاخێك بدرێ بەکرێ بە کەسێك بۆ ئەوەی لەنیوەی رێگەکەیدا سواری ببێ، یا بە دوو کەس بۆ ئەوەی ئەو دووکەسە یەك لەدواییەك سواری ببن.

**شەرتی سێهەم،** ئەوەیە ئەو کەڵکەی کە مەبەستە لە بەکرێ‌گرتنەکە، دیاری بێ، هەروەکوو شەرتە ئەو شتەی عەقدەکەی لەسەرکراوە، واتە ئەوەی دراوە بەکرێ، دیاری

بێو لەبەرچاو بێ لە بەکرێدانی عەیندا و دیاری کرابێ بە باس کردنی سیفەتەکانی لە بەکرێدانی لەئەستۆدا، یەعنی ئەگەر حەیوانێکی تایبەتی یا خانوویەکی تایبەتی درا بەکرێ، پێویستە باش تەماشا بکرێو سنووری خانووەکە لای کابرای بەکرێوەرگر دیاربێ وە ئەگەر بەکرێدانی لە ئەستۆدا بوو؛ مەسەلا، کابرای بەکرێ وەرگر وڵاخێکی ئەویست باری پێبکێشێ بۆ شوێنێك، ئەبێ ئەو کەسەی کە وڵاخەکەی ئەداتێ بەکرێ و وڵاخەکەی لەو شوێنەدا حازرنییە، باسی سیفاتو ناوو نیشانی وڵاخەکەیی بۆ بکا، بۆ ئەوەی ئەگەر ئەو وڵاخە لەرێگادا فەوتا، وڵاخێکی تری لەو چەشنەی بۆ بێنێ ئیشەکەی پێ تەواو بکا.

دەرکەوتنی کەڵکی ماڵی بەکرێدراو، وائەبێ بە «وەخت» ئەبێ، چونکە بە «ئیش» زەبت ناکرێ، وەك بەکرێدانی وڵاخێك بۆ سواربوونی لەماوەی دە رۆژدا. وە وائەبێ بە وەخت و بە ئیش ئەبێ ئەگەر ئەوکەڵکە بە ئیش زەبت بکرێ، وەك بەکرێدانی وڵاخێك بۆ سواربوونی لە ماوەی دە رۆژدا، یا خود بۆ سواربوونی لە شوێنێکی دیارییەوە بۆ شوێنێکی تری دیاری و وەك بەکرێ گرتن بۆ دوورینی پارچەیەك لەماوەیەکی دیاریکراودا، ئەمە بە هەرجۆرێ دیاری بکرێ، دروستە، بەڵام ئەگەر «وەخت»و «ئیش»یشی تیا دیاری بکرێ، وەك بەکرێ گرتن بۆ دوورینی کەوایەك لە رۆژێکدا، ئەوە بەتاڵە، چونکە تەواوبوونی ئەو ئیشە لە ماوەیەکی دیاری کراودا شتێکی نایابە.

تەقدیری مەنفەعەت ئەکرێ لە بەکرێ گرتنا بۆ فێرکردنی قورئان بە «وەخت» وەك ساڵێك، یا بە «ئیش» وەك فێرکردنی دە سوورەتی یەکەمی قورئان: هەروەها دروستە بەکرێ گرتنی کەسێك بۆ خزمەت کردن لەماوەی ساڵێکدا ـ مەسەلا ـ جا ئەگەر خزمەتێکی دیاری کرد، ئەوە باشە وە ئەگەر هیچ خزمەتێکی دیاری نەکرد، ئەوە بەپێی عورفو عادەت تەماشای مەسەلەکە ئەکرێ، واتە: تەماشای ئەو ئیشانە ئەکرێ کە بەپێی عادەت مەبەستن لە مەعنای «خزمەت»؛ مەسەلا، ئەگەر ژنێك بەکرێ گیرا بۆ خزمەت لەماڵێکدا، ئەوە مەبەست لەو خزمەتە، گسك‌دانو نانکردنو چێشت لێنانو فەرش راخستنو جل‌شتنو شتیوایە وە ئەگەر کەسێك بەکرێ گیرا بۆ دروست کردنی

خانوویەك، پێویستە کەوا جێگە خانووەکەو ژمارەی هۆدەکانو پانیو درێژییانو باریکیو ئەستووریو بەرزی دیوارەکانیو چۆنیەتی دابەشکردنی هۆدەکانو شوێنی پەنجەرەو دەرگاو کەرەستەی کردنەوەی خانووەکەو هەرشتێکی تری لەم جۆرە، باس بکرێ.

ئەگەر کەسێك زەوییەکیدا بەکرێ کە بۆ کشتوکاڵ تیاکردنو باخ تیاناشتن دەستی ئەدا، پێویستە باسی بکا کە کابرای بەکرێ وەرگر، چ جۆرە کەڵکێکی لێوەربگرێ وە ئەگەر وتی: هەرجۆرە کەڵکێکی لێ وەرئەگری، ئارەزووی خۆتە، ئەوەیش هەر دروستە، هەروەها ئەگەر وتی: کشتوکاڵی تیا ئەکەی باشەو درەختی تیا ئەنێژی باشە.

بەڵێ، لە هەندێ بەکرێدانا بەیان کردنی جۆری کەڵك وەرگرتن پێویست نییە، بەهۆی راگرتنی عورفو عادەتەوە؛ مەسەلا، هەموو زانایانی شەرع لەسەر ئەوەن کە دروستە ئینسان بڕواتە حەمام بەکرێ، هەرچەند مەعلووم نییە چەند لەو حەمامەدا ئەمێنێتەوە، بەڵام حەرامە زیاتر لە عادەت تیا بمێنێتەوە، وەك چۆن حەرامە زیاد لە پێویست ئاو بەکاربێنێ، کابرای حەمامچیش نابێ بە زامنی ئەو بەرگو پۆشاکەی کە کابرای حەمامکەر داینـاوە لەحەمامەکەدا، مەگەر بەتایبەتی دابێتیە دەستی حەمامچییەکەو ئەویش قەبوولی کردبێ.

لە بەکرێدانی وڵاخدا بۆ سواری، شەرتە ناسینی سوارەکە بە عەین، ئەگەر بەکرێدانی عەین بوو و بە بەیانی سیفەت، ئەگەر بەکرێدانی لەئەستۆدا بوو، هەروەها، بەیانی ئەوە کە ئەخرێتە سەر وڵاخەکە بۆ سوار بوون، ئاخۆ کەژاوەیە یا زینە یا جلە یا بارگەیە، ئەگەر وڵاخەکە بدرێتە دەستی بەکرێوەرگرەکە وە ئەگەر بڕیاری هەڵگرتنی پاشکۆ یا توورەکە بدەن، پێویستە تەماشا بکرێن یاخود سیفەتیان و وەزنیان بەیان بکرێ؛ ئەگەر بەیانی ئەمانە نەکرا، ئەوە دروست نییە، چونکە ئەوسافی ئەم جۆرە شتانەو وەزنیان ئەگۆڕێ وە ئەگەر بڕیاری هەڵگرتنی ئەمانە نەدرابێ، دروست نییە بخرێنەسەر ئەو وڵاخە؛ هەروەها، چاوپێ کەوتنی وڵاخەکەیش پێویستە، ئەگەر بەکرێدانی عەین بێ، بەڵام ئەگەر بەکرێدانی لەئەستۆدا بوو، پێویستە بەیانی جینسی

وڵاخەکە بکرێ، ئاخۆ ئەسپە یا حوشترە یا بارگیرە یا چییە و نەوعەکەی و ئاخۆ نێرە یا مێیە، هەروەها بەیانی مەسافەی ڕێگە ڕۆیشتنی ئەو وڵاخە، ئەگەر بڕیاری مەنزڵ نەدرابوو لەو ڕێگەیەدا، ئەگینا بەکرێدانی، لەسەر ئەو جۆرە ئەڕوا کە بڕیاریان داوە.

هەروەها پێویستە لەبەکرێدانی وڵاخدا بۆ هەڵگرتنی بار، بارەکە بناسرێ، یەعنی ئەگەر حازر بوو، تەماشای بکرێو بەراوردی بکرێ لە بارەی سەنگو سووکییەوە بەدەست، ئەگەر لەناو توورەکەدا بوو وە ئەگەر بارەکە لەو شوێنەدا نەبوو، پێویستە بە کێشانە یا بە پێوانە سەنگەکەی یا ئەندازەکەی ڕاگیر بکرێ، جا کە زانرا سەنگەکەی چەندە، پێویستە بزانرێ چییە،گەنمە یا جۆیە یا هەرچییەکی ترە وە ئەگەر بە پێوانە زانرا چەندە، پێویست ناکا بزانرێ چ‌ماڵێکە؛ بەڵام پێویست نییە بەیانی جینسی وڵاخەکە، مەگەر کەل‌وپەلەکەی کە پێی‌هەڵئەگیرێ، ناسك بێ، وەك شووشە، ئەوە پێویستە بەیانی جینسی وڵاخەکە بکرێ بۆ ئەوەی ئاگاداریی کەل‌وپەلەکە بکرێ.

## باسی ئەوکەڵکانەی کە بەکرێدانیان دروستە یا دروست نییە

دروست نییە بەکرێ گرتنی موسوڵمان بۆ ئیشێك کە پێویست بێ لەسەری، وەك بەکرێ‌گرتنی بۆ غەزا، چونکە هەر موسوڵمانێك کەوتە مەیدانی شەڕەوە لەگەڵ کافران، پێویستە لەسەری شەڕ بکا؛ هەروەها دروست نییە بەکرێ گرتن بۆ هەر عیبادەتێك کە نییەت هێنانی پێویست بێ، وەك بەکرێ گرتن بۆ نوێژو ڕۆژوو، چونکە ئەم جۆرە عیبادەتانە بۆ ئەوە دانراون ئینسان بە نەفسی خۆی بیانکا؛ کەواتە، غەیری خۆی لەجێگەیدا دانانیشێ، مەگەر بۆ حەج‌و عومرە بۆ مردوو یا بۆ زیندوو، بەو شەرتە کابرا خۆی پەکی کەوتبێ و بۆ بەش کردنەوەی زەکات بەسەر موستەحەقاندا و بۆ بەش کردنەوەی کەفارەت‌و قوربانی کردن‌و بەش کردنەوەی گۆشتی قوربانی‌و ڕۆژووگرتن لەجیاتی مردوو.

هەروەها، دروست نییە عەقدی بەکرێ‌گرتن لەسەر پێش‌نوێژی (إمامة) و هەرشتێ بڕیار بدرێ بۆ پێش‌نوێژ، بەخێرو حەسەنات دائەنرێ و کرێ نییە، چونکە پێش‌نوێژەکە

خۆی نوێژی لەسەرە و هەرچۆن بێ ئەو نوێژەی هەر ئەکا؛ رێگای راپەڕانـدنی ئـەم مەسئەلەیە، ئەوەیە ئەو کەسانەی پێش‌نوێژ ئەگرن نوێژیان بۆ بکا لە مـاڵی خـۆیـان، ئەندازەیەك پارە نەزر بکەن لەو پێش‌نوێژە بەرابەر بەو چاکەیە کە لەناویانا دائەنیشێ‌و نوێژیان بۆ ئەکا. بەڵام دروستە بە عەقدی «جَعالة» پارەیەك قەرار بدەن بۆ ئەو کەسەی پێنج فەرزە لە جێگەیەکی تایبەتی‌دا یا لە مێحرابی مزگەوتدا حازر ئەبێ بۆ پێش‌نوێژی؛ جا ئەگەر ئەم پێش‌نوێژە یەکێك لەجێگەی خۆیدا دابنێ بەرابەر بەئەندازەیەك پـارە، ئەوە دروستە، بەڵام ئەبێ ئیزنی ئەو کەسەی لەسەربێ کە ئەمیشی داناوە و ئەو کابرا چ پارەیەکی بۆ دانراوە، ئەیکەوێ، هەروەکوو خۆیشی موستەحەقی ئـەو پـارەیەیە کـە بەهۆی جەعالەوە بۆی دانراوە. تێکڕا، هەر عیبادەتێك پێویستی بە نییەت بێ‌و واجب نەبێ، بەکرێ گرتنی تیا دروستە؛ کـەواتـە، دروسـتە بـەکـرێ گـرتن بـۆ بـانگ‌دان‌و سەڵەوات‌دان لە پێغەمبەرﷺ لەدوای بانگەوە لە هەموو فەرزەکاندا، تەنها پاش نوێژی مەغریب نەبێ، چونکە ماوەکەی کەمەو مەترسی ئەوە ئەکرێ کە وەختەکەی تێپەڕێ.

دروستە بەکرێ گرتن، بۆ خوێندنەوەی خوتبەی جومعە و بۆ ئامۆژگاری کـردنی موسوڵمانان‌و فێرکردنی ئادابی دین‌و نیشان‌دانی واجب‌و سوننەت‌و وتنەوەی دەرسی قورئان. هەروەها، دروستە بـەکـرێ گـرتن بـۆ راپـەڕانـدنی مـردوو، وەك شـۆردن‌و کفن‌کردن‌و ناشتنی و بۆ دەرس‌وتنەوەی عولوومی دین بەمەرجێ کە قوتابییەکان دیاری بن‌و ئەوەش دیار بکرێ کە مامۆستا بەکرێ گیراوە کە دەرسی چییان پێ‌بڵێ، چونکە ئەم جۆرە دەرس‌وتنەوەیە، نە نییەتی ئەوێ‌و نە واجبە لەسەر مامۆستا؛ ئەگەر هات‌و ئەو شەرتانە نەهاتنەدی، ئەوە بە ئیجارەو بەکرێ گرتن ناژمێررێ، چونکە دەرس‌وتنەوە، تێکڕا زەبت ناکرێ و بۆ ئیجارە دەس نادا، بەڵکوو بە جەعالە ئەدرێتە قەڵەم، یەعنی ئەو کەسانەی کە ئەو قوتابخانەیە ئەبەن بەڕێوە، یا حوکوومەتی سەردەم، بڕیار ئەدەن هەر کەسێك رۆژی ئەوەندە سەعات لەو قوتابخانەیەدا دانیشێت دەرس بڵێتەوە بـە هـەر کەس کە بیەوێ بخوێنێ، ئەوکەسە مانگی ئەوەندە دیناری ئەدرێتێ بۆ ژیاندنی خۆی‌و خێزانی؛ ئەوەش دروستە؛ چونکە مەودای جەعالە فراوانترە لە مەودای بەکرێ گرتن و

مادام ئەو مامۆستایە هەموو رۆژێ لەو قوتابخانەیەدا دانیشێت و ئامادە بێ بۆ دەرس وتنەوە، موستەحەقی ئەو مانگانەیە ئەبێ، خواه کەس بیێ دەرس بخوێنێ یا نەبێ.[١]

هەروەها، دروستە بەکرێ گرتن بۆ خوێندنی قورئان بۆ زیندوو و بۆ مردوو لەماوەیەکی دیاری کراودا، یا بە ئەندازەیەکی دیاری کراو بە جوزء یا بە سوورەت؛ جا ئەگەر قورئان خوێندنەکە بۆ مردوو بوو، ئەبێ ئەو قورئانخوێنە، یا قورئانەکە لەسەر قەبری مردووەکە بخوێنێ، یاخود لەپاش خوێندنەکەیەوە، بڵێ: خوایە! خێری ئەم قورئان خوێندنە بگەیەنە بەو مردووە؛ ئەگەر بۆ زیندوو بوو، ئەبێ یا کابرای بەکرێ گر خۆی حازر بێ لەکاتی قورئان خوێندنەکەدا، یا قورئان خوێنەکە لەکاتی خوێندنەکەیدا، نییەتی ئەوەی لەدڵدابێ کە خێری خوێندنەکەی بۆ ئەو بەکرێ گرە بێ وە ئەگەر ئەو قورئان خوێنە کە قورئان بۆ مردوو ئەخوێنێ، لەکاتی خوێندنەکەیدا ئەوەی لە دڵدابێ کە بۆ ئەو مردووەی ئەخوێنێ و لە ئاخریشەوە دوعای خێری بۆ بکا، ئەوە گەلێ باشترە.

**بزانن!** لە سوورەتی بەکرێ گرتنی کەسێکدا بۆ قورئان خوێندن، پێویستە ئەو بەکرێ گیراوە قورئان بزانێ وە ئەگەر ئەندازەیەکی بەهەڵە خوێندەوە، ئەبێ بە رەوانی دووبارەی بکاتەوە وە ئەگەر بە لەشی پیسەوە خوێندی، قەرزار ئەبێ، چونکە لەش پیس گوناهی ئەگا قورئان بخوێنێ؛ دروست نییە بەکرێ سێ جار سوورەتی ﴿قُلْ هوَ اللّٰه أَحد﴾ بخوێنێ و بڵێ: ئەوە خێری خەتمێکی قورئانی هەیە، چونکە ئەو بۆ خوێندنی هەموو قورئان بەکرێ گیراوە.

بەکرێ گرتن دروستە بۆ پەروەردەکردن و دایەنی کردنی مناڵ و بۆ شیر پێدانی، بەیەکەوە یا جیاجیاو یەکێك لەم دوانە نابێ بە هۆی بەکرێ گرتن بۆئەویان؛ مەبەست لە پەروەردەکردن و دایەنی کردن، خزمەت کردن و پاراستن و شۆردنی گیان و جل و بەرگ و دەسرازەو پەڕۆو تەماشاکردنی بێشکەو پێچانەوەوکردنەوەی و هەرجۆرە کردارێکی ترە

---

١. گەلێك لە زانایانی شەرع، لایان وایە دروستە بەکرێ گرتن بۆ بەجێ هێنانی فەرزی کیفایە، وەك نوێژی مردوو، بە دەلیلی ئەوەداکە کۆ کەرەوەی زەکات بەشێکی بۆ دیاری کراوە و فەرموودەی راستتر، ئەوەیە ئەو بەشە لەجیاتی کرێیەتی.

کە لەگەڵ منداڵدا بکرێ؛ ئەگەر کەسێك کەسێکی بەکرێ گرت بۆ شیردان بە منداڵێك بە ئیجارەی عەین و ئەو کەسە بەکرێ گیراوە شیرەکەی وشك بوو، لەو کاتەوە بەکرێ گرتنەکە هەڵئەوەشێتەوە، هەروەها ئەگەر بەکرێی گرت بۆ تێکرای دایەنیو شیرپێدانو شیرەکەی وشکی کرد وە ئەگەر بەکرێ گرتنی لەئەستۆدا بوو، ئەوە قەیدی نییە، چونکە ئەو کەسە بەکرێ گیراوە، ئەتوانێ شیری بۆ بکڕێو بیکا بە قوڕگیا.

فەرموودەی راستتر ئەوەیە لە بەکرێ گرتندا بۆ نووسینو دروومانو ئەم جۆرە شتانە، تەماشای عورفو عادەت ئەکرێ و هەرچی پێویست بێ لەسەر بەکرێ گر، واجبە بیداتێ و هەرچی واجب بێ لەسەر بەکرێ گیراوەکە، ئەبێ خۆی جێبەجێی بکا وە ئەگەر عورفو عادەت بە یەك جۆر نەبوو، بەڵکوو لە هەرشوێنێکدا بەجۆرێك بوو، ئەبێ بەیانی ئەوە بکرێ کە چی پێویستە لەسەر بەکرێ گرەکە و چی پێویستە لەسەر بەکرێ گیراوەکە وە ئەگەر بەیانی ئەو شتانە نەکرا، بەکرێ گرتنەکە بەتاڵەو دانامەزرێ.

## باسی هەندێ حوکمی بەکرێ دان

پێویستە لەسەر ئەوکەسەی خانوو ئەدا بەکرێ، کلیلی خانووەکە بدا بەکرێچییەکە و هەر شوێنێکی خانووەکە پێویستی بە ئاوەدان کردنەوە بێ، ئاوەدانی بکاتەوە؛ جا ئەگەر دەس و بردی کرد و خانووەکەی ئاوەدان کردەوە، ئەوە باشە، ئەگینا کرێچییەکە حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە و کرێی ئەو ماوەیە ئەدا کە لەماڵەکەدا بووە. لابردنی بەفر لەسەر بانی خانووەکە، لەسەر خاوەن ماڵەکەیە و پاك کردنەوەی حەوشەکەی لە بەفرو لە هەرچیتر، لەسەر کرێچییەکەیە.

ئەگەر کەسێك ولاخێکی دا بەکرێ بۆ سواری، ئەبێ کورتانو ژێرکورتانو تەنگەو پاڵوو و حەڵقەی لووتی حوشترو ئەم جۆرە پێویستییانەشی لەگەڵدا بداتێ، بەڵام کەژاوە و چەتری کەژاوەو رایەخی ناوکەژاوەو ئەو پەردەیەی ئەدرێ بەسەریا، ئەوە لەسەر کرێچییە.

فەرموودەی راستتر، ئەوەیە بۆ زینی ئەسپو ماین، تەماشای عورفو عادەت ئەکرێ، ئاخۆ لەسەر کامیانە. هەندێ لە زانایان، وتوویانە: ئەو شتانەیتریش کە ئێستا باسمان کردن، هەر تەماشای عورفو عادەتیان تیا ئەکرێ.

لە بەکرێدانی لە ئەستۆدا، شتێك کە ماڵەکەی تێ بخرێ، لەسەر خاوەن وڵاخەکەیە و لە بەکرێدانی عەینی دا، لەسەر کرێچییەکەیە. واجبە لەسەر خاوەنوڵاخ لە بەکرێدانی لە ئەستۆبوودا، لەگەڵ وڵاخەکەیدا بڕوا بۆ ئەو شوێنە کە وڵاخەکەی بۆ ئەبەن تا ئاگای لێبێ‌و یارمەتی کرێچییەکە بدا، بەپێی توانا، لە سوار بوونو دابەزینو باربار کردنو بارداگرتندا؛ بەڵام لەبەکرێدانی عەیندا هیچکام لەم ئیشانەی ناکەوێتە سەر، تەنها ئەوەندە هەیە ئەبێ وڵاخەکە بدا بەدەس کرێچییەکەوە.

عەقدی بەکرێ دان، هەڵئەوەشێتەوە بەنیسبەت بۆ لەمەوپاشەوە، بەهۆی فەوتانی حەیوانە بەکرێ دراوەکەوە لە بەکرێدانی عەیندا، بەڵام لە بەکرێدانی لەئەستۆدا بەوە هەڵناوەشێتەوە، چونکە کابرای خاوەن وڵاخ ئەتوانێ وڵاخێکی تری لەجیاتی وڵاخە فەوتاوەکە بۆ بهێنێ؛ حەقی پەشیمان بوونەوەی دەس‌بەجێیش جێ‌گیر ئەبێ بەهۆی دەرکەوتنی عەیبێکەوە لە ماڵە بەکرێدراوەکەدا.

## باسی ئەو ماوەیەکە کەڵکی ماڵی بەکرێدراوی تیا دیاری ئەکرێ و باسی ئەمانەتی کرێچی‌و هەندێ شتی تر

دروستە عەقدی بەکرێدان بۆ ماوەیەك کە ئەو ماڵە بەکرێدراوە زیاتر وابێ لەو ماوەیەدا نەفەوتێ‌و بمێنێتەوە، وەك ئەوە کە جل‌وبەرگێکی تازە بۆ چەند مانگێکی‌وا بدرێ بەکرێ کە بەعادەت لەو چەند مانگەدا ئەو جلە نەدڕێ، یا بەکرێدانی وڵاخێك بۆ چەند ساڵێك کە زیاتر وابێ ئەو وڵاخە لەو چەندساڵەدا نەمرێ؛ خانوویش ئەدرێ بەکرێ بۆ ئەوەندە ساڵ کە ئەندازیارو شارەزایان بڵێن: ئەو خانووە لەو چەند ساڵەدا ناڕووخێت؛ زەویش ـ مادام وەقف کراو نەبێ ـ دروستە بدرێ بەکرێ بۆ هەرچەند ساڵ کە خاوەنەکەی ئارەزووی لێ بێ.

بەڵام خانوو یا زەوی وەقف‌کراو، ئەگەر وەقف‌کەرەکە بەشەرتی گرتبوو بۆ ماوەیەکی تایبەتی نەبێ نەدرێ بەکرێ، ئەوە واجبە لەسەر بڕیارەکەی ئەو بدرێ بەکرێ‌و بێ گوێیی نەکرێ وە ئەگەر شتی‌وای بەشەرت نەگرتبوو، تەماشای مەسڵەحەتی

ماڵە وەقف کراوەکە ئەکرێ و بەپێی ئەو مەسڵحەتە ئەدرێ بەکرێ، بەو شەرتە ماوەی بەکرێدانەکەی نەگاتە رادەیەك کابرای کرێچی بتوانێ دەس بەسەر ماڵە وەقف کراوەکەدا بکێشێ و بیکا بە ماڵی خۆی.

**بزانن!** لە بەکرێدانا چەند شت هەیە؛ «مُستَوفي» یەعنی ئەو کەسە کە قازانج لە ماڵە بەکرێ گیراوەکە وەرئەگرێ؛ «مُستَوفَى مِنه»، ئەو شتە بەکرێدراوەی کە قازانجەکەی لێ وەرگیراوە، وەك خانوویەك کە درابێ بەکرێ؛ «مُستَوفَى فيه» ئەو شوێنەی کە کەڵك و قازانجەکەی تیا وەرئەگیرێ لە ماڵە بەکرێ گیراوەکە، وەك ئەو رێگایەی کە وڵاخە بەکرێ گیراوەکەی پیا ئەبرێ؛ «مُستَوفَى بِه» ئەو شتەی کە بەهۆی ئەوەوە قازانجی ماڵە بەکرێ گیراوەکە وەرئەگیرێ، وەك ئەو منداڵەی کە ژنێك گیراوە بەکرێ بۆ ئەوە شیری پێبدا و جلێك کەوا بەرگدروویەك بەکرێ گیراوە بۆ ئەوەی بیدوورێ.

لە بەکرێدانا، دروستە گۆڕینی ئەو کەسە کە قازانج لە ماڵە بەکرێ گیراوەکە وەرئەگرێ؛ مەسەلا، کەسێك خانوویەکی بەکرێ گرتبێ بۆخۆی، دروستە کەسێکی تری تیا دابنێ، مادام لەخۆی زیاتر زیان نەگەیەنێ بەو خانووە، خواه کابرای خاوەن ماڵ رازی بێ یا نە، هەتا وەکوو ئەگەر لە بەکرێدانا شەرتی ئەوە کرابوو کرێچییەکە ماڵەکە نەدا بە کەسی تر، ئەوە ئەو شەرتە دانامەزرێ؛ مەسەلا، دروستە بۆ دارتاشێك کە دووکانێکی گرتبێ بەکرێ، دارتاشێکی تر لەجیاتی خۆی دابنێ، بەڵام دروست نییە ئاسنگەرێك یا دەباغێك لەجیاتی خۆی دابنێ لەو دووکانەدا.

کەسێك کە وڵاخێکی گرتبێ بەکرێ سواری ببێ بۆ جێگایەك، دروستە کەسێکی تری سوار بکا لەجیاتی خۆی، بەو شەرتە سەنگی ئەوەندەی خۆی یا لەخۆی سووکتر بێ، بەڵام دروست نییە کەسێکی لەخۆی قەڵەوتری سوار بکا و یەکێك جووتێ گای بەکرێ گرتبێ بۆ ئەوەی جووتیان پێبکا، یا وڵاخێکی بەکرێ گرتبێ بۆ ئەوەی داری پێبهێنێ، دروستە بیداتە دەستی کەسێکی تر جووتیان پێبکا یا داری پێبهێنێ، مادام شوێن جووتەکەی ئەم کابرا لە شوێن جووتەکەی ئەو رەقەنتر نەبێ و رێگەی دارەکەی ئەم لەرێگای دارەکەی خۆی سەختتر نەبێ، یا دوورتر نەبێ؛ خۆ ئەگەر کابرای دووهەم وەکیلی کابرای یەکەم بوو، ئەوە دیارە باشترە لەوە کە بەخۆڕایی دابێتیە دەستی.

ئەو شتەش کە بەکرێ گیراوە بۆ ئەوەی قازانجەکەی لێوەرگیرێ وەك خـانوو یـا وڵاخ، ئەگەر بەشێوەی عەینی بەکرێ گیرابوو، دروست نییە بگۆڕرێ بە هاوچەشنی خۆی وە ئەگەر فەوتا، بەکرێدانەکە هەڵئەوەشێتەوە وە ئەگەر بەکرێدانی لەئەستۆدا بوو، دروستە و هەرکاتێکیش فەوتا، پێویستە بگۆڕرێ بە یەکێکی تری وەك فەوتاوەکە.

ئەو شوێنەش کە قازانجەکەی تیا وەرئەگیرێ، وەك ڕێگەی سـەفەری کـاروانـی، دروستە بگۆڕێ بە ڕێگەیەکی تر، بەو شـەرتە لەبـارەی دووریو نـزیکیو ئـەمینیو ئاسایشو ڕەحەتییەوە، لەوەی پێشوو کەمتر نەبێ. ئەو شتەش کە بەهۆی ئەوەوە قازانج لە ماڵە بەکرێ گیراوەکە وەرئەگیرێ، وەك منداڵێك کە درابێ بە دایەن، ئەمیش گۆڕینی دروستە، بەو شەرتە کە لە عەقدەکەدا نەگۆڕینی بەشەرت نەگیرابێ؛ کەواتە دروسـتە لەجیاتی منداڵەدایەن بۆگیراوەکە منداڵێکی تر بهێنرێو ئافرەتەکەی بۆ بکرێ بە دایەن.

ئەگەر کەسێك وڵاخێکی بەکرێ گرتو باری لێناو لەڕێگادا بارەکە فەوتا، دروستە کابرای کرێچی بارێکی تری وەکی ئەوەی پێشوو بنێ لە وڵاخەکە، یا ئەگەر کەسێکی سوار کردو لەڕێگەدا سوارەکە مرد، دروستە کەسێکی تری سوار بکا کە لەوی پێشوو قورستر نەبێ، بەڵام دروست نییە لەجیاتی بارە فەوتاوەکە کەسێکی سوار بکا، یـا لە جیاتی سوارە مردووەکە بارێکی لێبنێ.

**بزانن!** دەستی بەکرێ وەرگر بەسەر ماڵی بـەکـرێ گـیراوەوە، دەسـتی ئـەمانەتە لەماوەی بەکرێ گرتنەکەدا و لەپاش ئەو ماوەیەش، مادام بەکاری نەهێنێو خەیانەتی لێنەکا و واجبە لەسەری پاش تەواوبوونی بەکرێدانەکە، خەبەر بدا بە خاوەنماڵەکە تا خۆی یا وەکیلی بێنو ماڵەکە وەربگرنەوە، ئیتر لەسەر ئەم بەکرێوەرگرە واجب نییە خۆی بیباتەوە یا بە وەکیلی خۆیدا ڕەوانەی بکاتەوە، بەڵکوو ئەگەر کابرای خاوەن ماڵ ئەوەی بەشەرت گرتبێ کە بەکرێوەرگرەکە خۆی بیباتەوە، ئەوە بەکرێدانەکەی بەتاڵە.

بەڵام ئیمامی «سبکي» فەرموویەتی: ماڵی بەکرێ وەرگیراو، وەك ئەمانەتی شەرعی وایە، یەعنی وەك شتێکە با بیخاتە ناو حەوشی ماڵی کەسێکەوە و خاوەنەکەی دیـار نەبێ، چۆن واجبە ئەو شتە ببرێتەوە بۆ خاوەنەکەی یاخود خەبەری بـدرێتـێ بـێت

وەری بگرێتەوە، بەوجۆرە پێویستە ماڵی بەکرێ وەرگیراویش پاش تەواوبوونی ماوەی بەکرێدانەکەی، کرێچییەکە بیباتەوە بۆ خاوەنەکەی یا خەبەری بۆ بنێرێ تا بێت وەری بگرێتەوە.

جا ئەگەر خۆی بردیەوە، پێویستە یا لێی بخورێ یاخود رای بکێشێ و نابێ سواری ببێ، ئەگینا ئەبێ بە زامنی، مەگەر ئەوەندە سەرکێش بێ بە بێ سواربوونی نەبرێتەوە وە ئەگەر وڵاخەکە سەرکێش نەبوو، دروست نییە سواری ببێ، هەرچەند لایقی شانی ئەم کابرایە نەبێ بە پێ بڕوا بەشوێنی وڵاخەکەدا و ئەم سوورەتە، وەك سوورەتی ئەوە نییە کەسێك ماڵێکی کڕیبێ و عەیبدار بێ و بەهۆی عەیبەکەیەوە بیباتەوە بۆ فرۆشیارەکەی، بۆ ئەو دروستە سواری ببێ، چونکی هێشتا لە خاوەن ماڵی نەکەوتووە، بەڵام کرێچی خاوەن ماڵ نییە و بردنەوەی وڵاخی بەکرێ گیراویش واجب نییە لە سەر کرێچی و بە ئارەزووی خۆی ئەیباتەوە؛ بەڵام دانە دواوەی وڵاخی عەیبدار پێویستە لەسەر کڕیار؛ کەواتە، ئەگەر کڕیار کابرایەکی خاوەن شان و شکۆ بوو، دروستە سواری وڵاخەکە ببێ.

ئەگەر کرێچی بەبێ عوزر خەبەری نەدا بە خاوەنی ماڵە بەکرێ وەرگیراوەکە، ئەبێ بە زامنی ئەو ماڵەو بە زامنی کەڵك و قازانجەکەشی؛ هەروەها، ئەگەر بەکرێ گرتنەکە لەبەر هۆیەك هەڵوەشایەوەو کرێچی خەبەری نەدا بە خاوەن ماڵەکە، ئەوە ئەبێ بە زامنی ماڵەکەو کەڵك و قازانجیشی.

ئەگەر کەسێك وڵاخێکی بەکرێ گرتبوو بۆ بار یا بۆ سواری و قازانجی لێ وەرنەگرت و بەستیەوە، نابێ بە زامنی ئەو وڵاخە، مەگەر بەجێی بهێڵێ و گوێی نەداتێ و خانوو بڕووخێ بەسەریا، لە کاتێکا کە ئەگەر بیبردایە بۆ ئیش، نەفەوتایە، وەك ئەوە کە خانوو رووخانەکە لە رۆژا و لە کاتی ئیش کردنی عادەتیدا بێ.

ئەگەر کەسێك کرێکارێکی گرتبوو بۆ ئیش پێ کردن، وەك دوورینی کەوایەك و بە بێ کەمتەرخەمی لەم بەکرێ گیراوەوە، ماڵەکە لەدەستیا فەوتا، ئەوە زامن نابێ؛ بەڵێ، ئەگەر کەمتەرخەمی کرد، ئەبێ بە زامنی؛ بە کەمتەرخەمی دائەنرێ ئەوە کە شوانی بەکرێ گیراو بۆ لەوەڕاندنی ران، بە بێ ئیزنی خاوەن حەیوانەکان بیانداتە دەستی کەسێکی تر، ئەوە هەردووکیان زامن ئەبن و بڕیار لەسەر ئەویانەیە کە ماڵەکەی لەدەستدا فەوتاوە.

بەڵام پێویستە بزانرێ شوان بەو شەرتە ئەبێ بە زامن کە باڵغو خاوەن روشد و فام بێ، ئەگینا شوانی ناباڵغ، یا باڵغی نەفام، ئەوە بە هیچ جۆرێ نابێ بە زامن، مەگەر بەدەستی خۆی حەیوانەکان بفەوتێنێ.

ئەگەر ماڵی کابرای خاوەنماڵ بەدەست کابرای بەکرێ گیراوەوە فەوتا بە بێ‌ئەوە کەمتەرخەمی تیا کردبێ، وەك ئەوە کەسێك بەرگدروویەك بەکرێ بگرێ جلێکی بۆ بدوورێو قوماشەکەی لای ئەو بەرگدرووە بسووتێ یا بدزرێ بەبێ ئەوە کەمتەرخەمی کردبێ تیایا، ئەوە زامن نابێ، بەڵکوو کرێی ئەو ئەندازە ئیشەشی ئەکەوێ کە کردوویە؛ بەڵێ، گێڕاویانەتەوە بە دەم «ئیمامی نەوەوی»و «ئیمامی رافعی»یەوە کەوا فەرموویانە: ئەگەر کەسێك کەسێك بگرێ بەکرێ بۆ ئەوە گۆزەیەکی بۆ هەڵبگرێو ئەویش هەڵیبگرێ و بشکێ بە دەستیەوە، ئەوە هیچ کرێی ناکەوێتە سەر خاوەن گۆزەکە، چونکە هیچ ئیشێکی نەکردووە بۆی؛ بەڵام ئەم قسەیە ـ وەك هەندێ لەزانایان لێکیان داوەتەوە ـ مەعنای وایە ئەو کرێکارە کە گۆزەکەی هەڵگرتووەو گورج بەدەستیەوە شکاوە، بۆیە هیچی ناکەوێ چونکە ئیشێکی‌وای نەکردووە کرێی بکەوێ لەبەرابەریا؛ کەواتە، ئەگەر ماوەیەکی زۆر گۆزەکەی برد ئەوجا شکا، ئەوە بەپێی ئیشی لەو ماوەیەدا کرێی ئەکەوێ تا رەنجی ئەو کرێکارە بەزایە نەڕوا، کەڵکی کابرای خاوەن گۆزەیش ئەوەیە کە ئەو ماوەیە ماندوو نەبووە بە هەڵگرتنی گۆزەکەیەوەو ئازاری پێ‌نەگەیشتووە و بەپێی ئوسوولی ئەو شوێنە قەدری کەم نەبووەتەوە بەهۆی ئەوەوە کە خۆی گۆزەیەك بگرێ بە دەستیەوە.

ئەگەر کەسێك بەکرێ گیرا بۆ پاسەوانی کردنی ماڵێك و ئەو ماڵە دزرا، ئەوە ئەو کەسە بەبێ‌خەیانەتو کەمتەرخەمی زامن نابێ وە ئەگەر لەگەڵ خاوەنماڵەکەدا بوو بەهەرایان لەبارەی ئەوەوە ئاخۆ کەمتەرخەمی کردووە یا نەیکردووە و شاهید نەبوو لەسەر ئەوە کەوا کەمتەرخەمی کردووە، ئەوە ئەو پاسەوانە بە سوێند باوەڕی پێ‌ئەکرێ.

ئەگەر کەسێك قوماشێکی دا بە بەرگدروویەك بۆی بدوورێ و ناوی کرێیان نەبرد، ئەگەر کابرا ناوبانگی بە بەرگدروو دەرنەچووبوو، هیچی ناکەوێ وە ئەگەر ناوبانگی

بەوجۆرە دەرچووبوو، ئەوە لەسەر عادەتی ئەو شوێنە کرێی ئەکەوێ وە ئەگەر کرێچی غەدری کرد لە ماڵەکەدا؛ مەسەلا، زیاتر لەعادەت دای لە وڵاخەکە، یاخود لەغاوەکەی کوتایە دەمی، یا زیاتر لە عـادەت بـاری نـایە سـەری، یـا خـانوویەکـی بـۆخـۆی بەکرێ گرتبوو کەوا بەرگی تیا بدوورێ، کەچی ئاسنگەرێکی تیادانا، ئەوە زامن ئەبێ.

هەروەها، ئەگەر کەسێك وڵاخێکی بەکرێ گرت بۆ هەڵگرتنی دە تـەنەکـە گـەنم ـمەسەلا ـکەچی دە تەنەکە جۆی لێنا، ئەوە زامن ئەبێ، چونکە جۆ لە گەنم زیاتر جێ ئەگرێ، یا ئەگەر بۆ دە تەنەکە جۆ بەکرێی گرت و دە تەنەکە گەنمی لێ نا، چونکە گەنم لە جۆ قورسترە، یاخود ئەگەر لە کێشانەدا لەجیاتی گەنم جۆی لێنا، لەبەرئەوە کە جـۆ جێگەی زۆرتری ئەوێ، بەڵام ئەگەر لەم حاڵەدا لەجیاتی جۆ گەنمی لێ نا، ئەوە زامن نابێ، لەبەرئەوە کە سەنگ هەمان سەنگەو گەنمیش جێگەی کەم ئەگرێت.

ئەگەر کەسێك وڵاخێکی گرت بۆ ئەوە کە دە تەنەکە گەنمی لێ بنێ، کەچی یازدە تەنەکەی لێ نا، ئەوە کرێی زیادەکەی ئەکەوێتە سەر وە ئەگەر بەهۆی ئەو زیادەوە فەوتا، ئەوە زامنیشی ئەبێ، بەو شەرتە خاوەنی وڵاخەکەی لەگەڵ نەبێ وە ئەگەر لەگەڵیا بوو، ئەوە هەر زامنی بەشی زیادەکەی ئەبێ، یەعنی زامنی یانزەیەکی قیمەتی وڵاخـەکـە ئەبێ؛ ئەگەر کابرای کرێچی لەجیاتی دە تەنەکە، یازدە تەنەکەی دایە دەستی خاوەن وڵاخەکە تا بینێ لێی، ئەویش نەیزانی زیاترە لەوەی بڕیاریان داوەو نای لە وڵاخەکەی، ئەوە ئەگەر وڵاخەکە فەوتا، کابرای کرێچی ئەبێ بە زامنی، هەروەها ئەبێ بـە زامـنی کرێی ئەو ئەندازە زیادەیشە وە ئەگەر کابرای خاوەن وڵاخ بارەکەی کێشانە کرد و بە زانست و ئاگاداریی خۆی نای لە وڵاخەکەی و بەهۆی ئەوەوە وڵاخەکەی فەوتا، ئەوە کرێی زیادەکەی ناکەوێ و کابرای کرێچیش زامن نابێ، چونکە کەمتەرخەمی لە کابرای خاوەن وڵاخ خۆیەوە بووە وە ئەگەر کەسێك قوماشێکی دا بـە بـەرگدروویەك بـۆی بدوورێ و پاشان بوو بەهەرایان لەسەرئەوە کە کابرای خاوەن قوماش ئەیوت: پێم داوی بۆ ئەوەی بۆم بدووری بە فڵان بەرگ و بەرگدرووەکەیش ئەیوت: وتووتە بۆم بکە بە فیسار بەرگ، لەم حاڵە دا، فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە بـاوەڕ بـە سـوێنـدی خـاوەن

قوماشەکە ئەکرێ و ئەبێ بەرگدرووەکە تۆڵەی ناتەواوییەك کە پەیدا بووە لە قوماشەکەدا، بیداتەوە بە خاوەنەکەی.

## باسی هەڵوەشاندنەوەی بەکرێدان

بزانن! بەکرێدان لە عەیندا بێ یا لەئەستۆدا بێ، هەڵناوەشێتەوە لەبەر عوزرێك نەبێ کە ببێ بەهۆی تێکچوونی ئەو شتەی عەقدەکەی لەسەر کراوە؛ کەواتە، بەکرێدان هەڵناوەشێتەوە بە دەس نەکەوتنی سووتەمەنی بۆ حەمام، یا بە نەخۆش‌کەوتنی ئەو کەسە کە وڵاخێکی بەکرێ گرتووە بۆ ئەوەی سەفەری پێ بکا و بەهۆی ئەوەوە کە بەڵایەك بەسەر کشت‌وکاڵدا بێت، بەکرێ گرتنی زەوییەکەی هەڵناوەشێتەوەو کابرای کرێچیش حەقی هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەکرێ گرتنەی نابێ، چونکە ئەم کابرا ماڵی بەکرێگرتووە، هەرچەند قازانج بکا بۆ خۆیەتی‌و هەرچەندیش زیانی تووش‌ببێ ئەکەوێتە ئەستۆی خۆی، هەتاوەکوو ئەگەر لە عەقدەکەدا شەرتی ئەوەکرابوو کە ئەگەر بەڵایەك پەیدابوو، کرێکە کەم بکرێتەوە، ئەو شەرتە عەقدی بەکرێدانەکە هەڵئەوەشێنێتەوە و ئەم بڕیارەی ئەمڕۆ لەبەینی خەڵکا هەیە، هەر عادەتی رووتەو لەسەر پیاوەتی، زیانی کرێچی ئەخەنە ئەستۆی خۆیان‌و نایەڵن زیانی لێ بکەوێ، ئەگینا بەپێی شەرع واجب نابێ.

بەڵێ، ئەگەر جیا لە عەقدی بەکرێدانەکە کابرای خاوەن زەوی نەزری کرد لەسەر خۆی چاوپۆشی بکا لە زیانی کرێچییەکە، ئەوە دروستە، بەو شەرتە نەزرەکەی شەرعی بێ؛ مەسەلا، بڵێت: مادام تۆ ئارەزووت لە بەکرێ گرتنی زەوی منەو حەزت لەوەیە لێمەوە نزیك بی، وا منیش نەزرم کرد لەسەر خۆم هەر زیانێك لەم بەکرێ گرتنەدا تووش ببێ، بۆت بژێرم، لە حاڵی‌وادا، ئەم بژاردنەوەیە دروستە.

عەقدی بەکرێدان هەڵئەوەشێتەوە بە نەمانی ئەو شتە کە عەقدەکەی لەسەر کراوە بەتایبەتی، وەك ئەوە کە خانوویەکی بەکرێدراو بڕووخێ، یا وڵاخێکی بەکرێدراو بمرێ، یا زەوییەکی بەکرێدراو بۆ زەراعەت‌تیاکردن، لافاو پڕی بکا لە بەردو کەڵکی

کشت‌وکاڵ تیا کردنی پێوە نەمێنێ، بەڵام ئەم هەڵوەشانەوەیە تەنها بۆ ماوەی پاشەوەی بەکرێ دانەکەیە، نەك بۆ لەوەوپێشی، چونکە هۆیەك نییە بۆ هەڵوەشانەوەی ماوەی لەوەپێشی و بەکرێدانەکە بۆ ئەو دەمە دامەزراوەو کرێی ئەو ماوەی، بە پێی نیسبەتی بۆ هەموو ماوەکە ئەژمێررێ‌و ئەدرێ بە خاوەن ماڵەکە؛ ئیتر لە بەکرێ دانێکاکە لە ئەستۆدا بێ، ئەوە هەرچەند بەکرێدراوەکە بفەوتێ، بەکرێدانەکە هەڵناوەشێتەوە، چونکە بەکرێوەرگر ئەوەی ئەوێ ئیشەکەی بۆ جێبەجێ ببێ و حەقی ئەوەی نییە لەوە بکۆڵێتەوە کابرای بەکرێدەر ئەو ئیشەی چۆن و بەچی بۆ جێبەجێ ئەکا.

هەروەها بەکرێدان هەڵناوەشێتەوە بە مردنی عەقدەکەرەکان، بەڵکوو میراتگریان لەجێگایانا دائەنیشێ بۆ وەرگرتنی کرێ‌و قازانج وەرگرتن لە شتە بەکرێ دراوەکە، بەڵام ئەگەر کەسیان میراتگری نەبوو، عەقدەکە هەڵئەوەشێتەوە.

هەروەها، عەقدی بەکرێدان هەڵناوەشێتەوە بە مردنی سەرپەرشتی کەری ماڵی وەقف و ئەو کەسەی کە بەپێی شەرع ئەبێ بەجێگری ئەو سەرپەرشتی‌کەرە مردووە، لەجێگای ئەوا دائەنیشێ؛ جا ئەگەر سەرپەرشتی‌کەری پێشوو لەوەختی خۆیا کرێکەی وەرگرتبێ‌و خەرجی کردبێ بۆ خاوەن حەقەکان، ئەوە باشە وە ئەگەر بۆ خۆی خەرجی کردبێ، جیا ئەکرێتەوە لە میراتەکەی‌و ئەدرێ بەو خاوەن حەقانە.

ئەگەر چینی یەکەم لەوانەی کە زەوییەکەیان لەسەر وەقف کراوە، زەوییەکەیان دابوو بەکرێ بۆ ماوەی دە ساڵ ـ مەسەلا ـ وە لەپێش تەواوبوونی ئەو ماوەیەدا مردن‌و وەقفەکە گەیشتە دەستی چینی دووهەم، ئەوە بەکرێدانەکەی چینی یەکەم هەڵئەوەشێتەوە، چونکە زیاتر لە ماوەی ژیانی خۆیان تەسەروفیان تیا کردووەو حەقی ئەوەشیان نییە؛ جا ئەگەر وەختی خۆی کرێی هەموو دە ساڵەکەیان وەرگرتبوو، ئەوە هەرچەندی زیادبێ لە ماوەی ژیانی خۆیان، لە میراتەکەیان دەرئەکرێ‌و ئەدرێتەوە بەو کەسانەی کە زەوییەکەیان بەکرێ گرتووە.

ئەگەر سەرپەرشتی‌کەری کاروباری منداڵ، ماڵەکەی بۆ دابوو بەکرێ بۆماوەیەك کە ئەکەوێتە پاش باڵغ‌بوونی منداڵەکە، ئەوە ئەو بەکرێدانە بۆ لەوەپاشیش هەر بەردەوام

ئەبێ؛ جا ئەگەر ئەو سەرپەرشتیکەرە کرێی هەمووی وەرگرتبوو بۆ سەرفکردنی بۆ منداڵەکە، ئەوە باشە، ئەگینا کورەکە خۆی وەریئەگرێ. فەرموودەی راستتر ئەوەیە عەقدی بەکرێدان هەڵناوەشێتەوە بە وشك بوونی ئاوی ئەو زەوییەی بۆکشتوکاڵ تیا کردن بەکرێ گیراوە، بەڵکوو کرێچی ئارەزووی خۆیەتی ئاخۆ هەڵیئەوەشێنێتەوە یاخێر وە ئەگەر هەڵیوەشاندەوە، کرێی لەمەوپاشی نادا وە ئەگەر هێشتیەوە، ئەوە هەروەکوو پێشوو بەردەوام ئەبێ.

ئەگەر حەمام یاخود ئاش، بەهۆی بێئاوییەوە وەستان، ئەوە ئەگەر قابیل نەبوو لەماوەیەکی کەمدا ئاویان بۆ پەیدا بکرێ، بەکرێدانەکەیان هەڵئەوەشێتەوە وە ئەگەر قابیل بوو، ئەوە کرێچییەکە ئارەزووی خۆیەتی بەکرێ گرتنەکە هەڵئەوەشێنێتەوە یانە؛ جا ئەگەر هەڵیوەشاندەوە، کرێی تەنها ماوەی لەوەپێشی ئەدا وە ئەگەر هێشتیەوە، ئەوە بەکرێ گرتنەکە هەروەك جاران بەردەوام ئەبێ. هەروەها، زەوت کردنی ماڵێکی بەکرێ گیراو ئەبێ بەهۆی ئەوە کە کرێچی حەقی پەشیمان بوونەوەی ببێ؛ بەڵام لە بەکرێ گرتنێکدا کە بەکرێ گیراوەکە لە ئەستۆدا بێ، عەقدەکە ئەمێنێ و پێویستە خاوەنماڵ یەکێکی تری لە چەشنی بەکرێ گیراوە زەوتکراوەکە بۆ ئامادە بکا.

ئەگەر کەسێك چەند وڵاخێکی دا بەکرێ و خۆی رای کرد، ئەوە پێویستە لەسەر کرێچییەکە بچێتە لای قازی بۆ ئەوەکە مەسرەفی ئەو وڵاخانە لە ماڵی کابرای هەڵاتوو دەربکا، ئەیشتوانێ مەسرەفیان بۆ قەرز بکا لەسەر حیسابی خاوەنەکەیان، جا ئەگەر متمانەی بەکرێچییەکە ئەکرد، مەسرەفەکە بداتە دەستی ئەو تا بۆیان سەرف بکا، ئەگینا بیداتە دەستی کەسێکی متمانە پێکراو؛ هەروەها، قازی ئەتوانێ چەند دانەیەك لەو وڵاخانە بفرۆشێ بۆ مەسرەفی ئەوانی تریان و ئەیشتوانێ رێگای کرێچییەکە بدا لە ماڵی خۆی مەسرەفیان بۆ بکا و حیسابی بکا لە سەر خاوەنەکەیان وە ئەگەر ئەو وڵاتە قازی تیا نەبوو، کابرای کرێچی ئەتوانێ لە ماڵی خۆی مەسرەفیان بۆبکاو شاهید لەسەر ئەو مەسرەفە بگرێ و شاهیدەکان ئاگادار بکا کەوا هەرکاتێ کابرای خاوەن وڵاخەکان هاتەوە، داوای ئەو مەسرەفەی لێ ئەکاتەوە.

ئەگەر کەسێك خانوویەکی بەکرێ گرت بۆ ماوەی ساڵێك و لەو ساڵەدا نەڕۆیشتە ناوی، ئەوە کرێکەی لەسەر ئەبێ بەماڵ. هەروەها، ئەگەر وڵاخێکی بەکرێ گرت بۆ سەفەرێکی یەك ڕۆژی‌و لەو ڕۆژەدا سەفەرەکەی نەکرد، ئەوە هەمان کرێی لەسەر دائەمەزرێ، خواە بەکرێ گرتنەکە بەکرێ گرتنی عەین بێ، یا لەئەستۆدا بێ، بەڵام وڵاخەکەی وەرگرتبێ، ئەگینا ئەگەر لە سوورەتی دووهەمدا، وڵاخەکەی وەرنەگرتبوو، ئەوە کرێی ناکەوێتەسەر تا وڵاخەکە وەرئەگرێ.

ئەگەر کەسێك وڵاخێکی‌دا بەکرێ لەکاتی بەکرێ دانەکەوە تا دە ڕۆژ و لەو ماوەیەدا وڵاخەکەی تەسلیم‌نەکرد، ئەوە ئەو بەکرێ‌دانە هەڵئەوەشێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر ماوەی وەختیان مەعلووم نەکردبوو و تەنها ئەوەندە هەبوو وڵاخێکی لەئەستۆدابووی کابرای خاوەن وڵاخی بەکرێ گرتبوو بۆ ئەوە لەو شوێنەوە کە تیایەتی تاشوێنێکی‌تری تایبەتی سواری ببێ، ئەوە هەرکاتێك وڵاخەکە وەربگرێ دروستە و عەقدی بە کرێ گرتنەکە هەڵناوەشێتەوە بەهۆی تێپەڕبوونی وەختەوە.

«بزانن» دروستە فرۆشتنی ماڵێك کە درابێ بەکرێ، خواە بیفرۆشێ بەکرێچییەکە خۆی یا بە کەسێکی‌تر و بە هەرکامیانی فرۆشت بەکرێ دانەکە لەسەر وەزعی خۆی ئەمێنێتەوە تا ماوەکەی بەسەرئەچێ. هەر بەکرێ‌دانێك بەهۆی فەوتانی مەرجێکیەوە بەتاڵ بووبێ‌و دانەمەزرابێ، ئەوە هەمان کرێی بڕیاردراوی تیا دائەمەزرێ، وەك چۆن لەبەکرێ‌دانی دامەزراوا دائەمەزرێ، چونکە عەقدی دانەمەزراو حوکمی عەقدی دامەزراوی هەیە لەم‌جۆرە حوکمانەدا.

## باسی «جَعالة»

«جەعالە» لەشەرعدا، بریتییە لەوە کەسێك ماڵێکی دیاری بڕیار بدا بۆ کەسێك کە ئیشێکی تایبەتی بۆ بکا، وەك ئەوە بڵێت: هەرکەس ئەو ئەسپەم بۆ بگرێ‌و بۆم بهێنێتەوە، دینارێکی لە ماڵی مندا هەیە، خواە ئەو ئیشە دیاری بێ یا دیاری نەبێ و حەڵاڵ بێ یا سوننەت بێ یا واجب بێ لەسەر کابرای ئیشکەر.

ئەرکانی جەعالە، پێنج شتە: «جاعِل؛ عامِل؛ عَمَل؛ جَعل؛ سیغە»، واتە: خاوەنماڵ؛ ئیشکەر؛ ئیش؛ ماڵ؛ قسەی نێوان خاوەنماڵ و ئیشکەر. خاوەنماڵ، ئەو کەسەیە ماڵەکە ئەدا بەرامبەر بە ئیشەکە و شەرتی ئەوەیە باڵغ و خاوەنفام بێ و بە ئارەزووی خۆی ئەو موعامەلەیە بکا؛ شەرتی ئیشکەریش ئەوەیە بە نەفسی خۆی یا بەهۆی کەسێکی ڕێگادراوەوە ئیشەکە بکا؛ ئەمە، لەحاڵێکا کە کابرای ئیشکەر دیاری کرابێ وە ئەگەر دیاری نەکرابوو؛ مەسەلا، کابرا وتی: هەرکەس ئەو ئیشە بکا، ئەوە ئەبێ کابرای ئیشکەر بە نەفسی خۆی ئیشەکە بکا؛ شەرتی ئیشەکەیش ئەوەیە کە بەگوێرەی عادەت، زەحمەت و مەینەتێکی وای تیابێ بۆ ئەوە دەس بدا بەراورد بکرێ بەکرێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك وتی: هەرکەس کتێبەکەی هێنامەوە، دینارێکی لە ماڵی مندا هەیە و پیاوێك لەلایا کتێبەکەی دا بە دەسیەوە، ئەوە هیچی ناکەوێ، چونکە ئیشێکی وای نەکردووە کە قیمەتی ببێ؛ بەمیسال، ئەو ئیشە، وەك هێنانەوەی حەیوانێکی گومبوو یا شتێك کە لە شوێنێکدا بێ کە مەسافەیەکی باش دووربێ لە شوێنی کابرای خاوەنیەوە، یا تیمار کردنی برینێك یا خوێندنی دوعایەك یا چەند ئایەتێك بەسەر نەخۆشێکدا؛ جا ئەگەر لەم سوورەتەدا دانی ماڵەکەی بەست بە چاكبوونەوەی برینداره‌کە یا نەخۆشەکەوە، ئەوە ئەگەر لە پاش تیمارکردنی برینەکە و خوێندنی دوعاکە بەسەر نەخۆشەکەدا چاك بوونەوە، ئەوە کابرای ئیشکەر پارەکەی ئەکەوێ، ئەگینا هیچی ناکەوێ وە ئەگەر تەنها بڕیاری خوێندنی دوعاکە یا تیمار کردنەکەی دابوو، ئەوە پاش ئەو ئیشانە، کابرای ئیشکەر پارەکەی ئەکەوێ؛ هەروەهایە بڕیاردانی ماڵێك بۆ کەسێك قسەیەکی بۆ بکا لای گەورەیەك بۆ ڕزگار بوونی لە مەینەتێك.

شەرتی ئەو پارەیەش کە بەرابەر بە ئیشەکە ئەدرێ، ئەوەیە دیاری بێ؛ شەرتی ئەو قسەیەش کە لە بەینی خاوەنماڵ و ئیشکەردا تێئەپەڕێ ئەوەیە لەفزێك بێ مەعنای داواکردنی ئیشێك بگەیەنێ بەرابەر بە پارەیەکی دیاریکراو کە کابرای خاوەن ئیش لە ئەستۆی خۆی گرتبێ.

لەمەوە کە ڕابورد، دەرئەکەوێ جەعالە دروستە لەسەر ئیشی دیاری و نادیاری، هەرچەند ماوەی ئەو ئیشەیش نادیاری بێ، بەڵام بەکرێ گرتن یا ئەبێ لەسەر ئیشێکی

دیاری بێ، یا ئەگەر ئیشەکە نادیاری بوو، پێویستە ئەو سەردەمەی کە ئیشەکەی تیا ئەکرێ دیاری بێ؛ مەسەلا وەك دە سەعات بەرگ دروون؛ جەعالە لەگەڵ ئیشکەری دیاریو نادیاریدا دروستە هەرچەند وەسفیشی باس نەکرابێ کە جیا ببێتەوە لە کەسی‌تر ـ مەسەلا ـ بەڵام لە بەکرێدراوی نادیاردا، پێویستە وەسفی وەها باس بکرێ کە جیا ببێتەوە لە هی‌تر؛ مەسەلا، کرێچی لە بەکرێدراوی غەیرە عەیندا، وڵاخێك ئەگرێ بە کرێ بڕیار ئەدا لەگەڵ کەسێکا کە وڵاخێکی وای بۆ بێنێ کە ئەو سیفەتانەی تیابێ.

جەعالە، عەقدێکی دروستە و هەرکاتێ هەردوو عەقدکەرەکە یاخود یەکێکیان پەشیمان بووەوە، دروستە؛ بەڵام ئەگەر خاوەن‌ماڵەکە پەشیمان بووەوە پاش دەس کردن بە ئیشەکە، ئەبێ کرێی هاوچەشنی ئەو ئیشە بدا بە ئیشکەرەکە. لە بەکرێ دانا کابرای بەکرێ گیراو حەقی وەرگرتنی ماڵەکەی ئەبێ لە سەرەتای ئیشەکەوە، هەرچەند تا ئیشەکە نەکا حەقەکەی جێگیر نابێ، بەڵام ئیشکەری جەعالە تائیشەکە بەتەواوی جێبەجێ نەکا، موستەحەقی ئەو ماڵە نابێ کە بڕیاردراوە، بەڵکوو ئەگەر شەرتی ئەوە کرا ماڵەکە لەپێش ئیشەکەدا تەسلیم بکرێ، ئەوە ئەو جەعالەیە بەتاڵە کابرای ئیشکەر موستەحەقی «أُجرةُ المِثل» ئەبێ. لە جەعالەدا دروستە ئیشەکە فەرز بێ. ئەگەر کەسێك ئیشێکی بۆ کەسێك کرد بەبێ ئیزنی ئەوکەسە، یاخود ئەوکەسە ئیزنی کەسێکی دابوو و یەکێکی‌تر ئەو ئیشەی کرد، لەم سوورەتانەدا، ئەو ئیشکەرە هیچی ناکەوێ. ئەگەر کەسێکی خاریج وتی: هەرکەسێ گا جووتەکەی فڵانکەس بێنێتەوە دینارێکی ببێ لە ماڵی من، وە یەکێك چوو هێنایەوە، ئەوە دینارەکەی ئەکەوێتە سەر ئەم کابرا خاریجییە و ئەگەر کەسێك بەدرۆ، وتی: فڵانکەس ئەڵێ: هەرکەس ئەسپەکەم بۆ بگرێتەوە، دینارێکی هەیە و یەکێك چوو گرتیەوە، هیچی ناکەوێ، نە لە خاوەن ئەسپەکەو نە لەم‌کەسە.

ئەگەر کەسێك وتی: هەرکەس ئەو ئەسپەم بۆ بگرێتەوە، شتێکی ئەدەمێ، یاخود: رازی ئەکەم و یەکێك ئەسپەکەی بۆ هێنایەوە، ئەوە «أُجرةُ المثل»ی ئەکەوێ، چونکە

مادام ماڵەکە دیاری نەکراوە، جەعالەکە دانەمەزراوەو دێتەسەر حیسابی کرێی ئیشێکی لەچەشنی ئەو ئیشە وە ئەگەر وتی: هەرکەس دەرمانم بکا تا خۆش ئەبمەوە، دە دیناری ئەدەمێ و کابرایەك دەرمانی کرد تا خۆش بووەوە، دە دینارەکەی ئەکەوێ، ئیتر بە هەرچەند رۆژ چاك بوویێتەوە وە ئەگەر وتی: هەر کەس ئەسپەکەم لە فلان شوێن بۆ بهێنێتەوە، دوو دیناری ئەدەمێ، کابرایەکیش رۆیشت بەدوایا و لە شوێنێکی نزیکتر لەو شوێنەکە ئەو وتبووی گرتیەوەو هێنایەوە، ئەو پارەیە بەش ئەکرێ بەسەر ئەو رێگەیەدا و کابرا بەشی خۆی وەرئەگرێ.

ئەگەر کەسێك وتی: هەرکەس ئەو قوماشەم لە فلانە شوێن بۆ بهێنێتەوە، چوار دیناری ئەدەمێ و دوو کەس چوون هێنایانەوە، بە شەریکی پارەکەیان ئەدرێتێ وە ئەگەر یەکێك بە یەکێکی وت: ئەو حەیوانەم بۆ بێنیتەوە دینارێکت ئەدەمێ، ئەویش رۆیشت بەدوایا و شەخسێك خۆی کرد بە شەریکیو یارمەتی دا، ئەمە ئەگەر مەبەستی یارمەتیدانی کابرای ئیشکەر بێ، ئەوە هەموو پارەکە بۆ ئەوە وە ئەگەر مەبەستی ئیش کردن بێ بۆ خاوەن ماڵەکە، ئەوە کابرای ئیشکەر نیوەی کرێکەی ئەدرێتێو ئەو نیوەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەن ماڵەکەو کابرای یارمەتیدەریش هیچی ناکەوێ.

دروستە بۆ خاوەن موڵك لەپێش تەواوبوونی ئیشەکەدا ئەو پارەیەی کە دایناوە بۆ ئیشکەرەکە زیادی بکا یا کەمی بکا؛ جا ئەگەر ئیشکەرەکە بەم زیادو کەم کردنەی نەزانی، بەپێی شەرع عەینی ماڵە بڕیار دراوەکەی ئەکەوێ وە ئەگەر پێیزانی، لە ئەنجامدا «أُجرةُ المثل»ی ئەکەوێ.

هەرکاتێك ئیشکەرەکە ئیشەکەی تەواو کرد، ماڵەکەی ئەدرێتە دەست و ئەم حەقی ئەوەی نییە شتەکە لای خۆی رابگرێ تاپارەکەی ئەدرێتێ، چونکە تا ئیشەکە تەواو نەکا، حەقی هیچی نییە، بەڵام بەرگدرووی بەکرێ گیراو ـ مەسەلا ـ ئەتوانێ پارچە دووراوەکە نەداتەوە تا حەقدەستەکەی ئەدرێتێ.

ئەگەر خاوەن موڵکەکە وتی: هیچم بڕیار نەداوە بیدەم بەرابەر بەوئیشە و ئیشکەرەکە وتی: بڕیارت داوە، ئەوە باوەڕ بە خاوەن موڵکەکە ئەکرێ بە سوێند؛ هەروەها، ئەگەر

ئینکاری ئەوەی کرد کە ئیشکەرەکە ئیشی کردبێ لە گێڕانەوەی ئەو ماڵەدا وە ئەگەر قسەیان ناکۆك بوو لە ئەندازەی پارە بڕیاردراوەکەدا، ئەبێ هەردوولایان سوێند بخۆن، ئەوجا جەعالەکە هەڵئەوەشێتەوەو کابرای ئیشکەر، «أجرةُ المثل»ی ئەکەوێ.

بزانن! دەستی کابرای ئیشکەر بەسەر ئەو شتەوە کە ئەیهێنێتەوە، دەستی ئەمانەتە تا کەمتەرخەمی تیا ئەکا و مەسرەفی ئەو شتەش کە ئەیهێنێتەوە لەسەر خاوەنەکەیەتی؛ جا ئەگەر کابرای ئیشکەر بەبێ ئیزنی خاوەنماڵ مەسرەفی بۆ کرد لە ڕێگەدا، ئەمە ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبوو وەری بگرێتەوە لە خاوەنەکەی هیچی ناکەوێ، وە ئەگەر مەبەستی ئەوەبوو هەرچی سەرف کردووە وەری بگرێتەوە، ئەوە وەری ئەگرێتەوە.

ئەگەر کەسێك بەشێوەی جەعالە دانرابوو لەسەر ئیشێك، وەك پێشنوێژی یا دەرس وتنەوە و بە زۆر تەرکی ئیشەکەیان پێ کرد، هەموو ئەو پارەیەی ئەکەوێ کە بوێ بڕیار دراوە؛ هەروەها، ئەگەر بە ناحەق ئەوکەسەیان لەسەر ئەو ئیشە دەرکرد، یاخود مامۆستایەك کە لە وەختی دەرس وتنەوەدا لە قوتابخانەکەیدا حازر بێ، بەڵام قوتابییەکانی نەیەن بۆ خوێندن، ئەویش حەقی ئەو پارەیەی هەیە کە بۆی دانراوە.

دروستە ئیشکەری جەعالە وەکیل بگرێ ئیشەکەی لەجیاتی تەواو بکا؛ کەواتە، دروستە پێشنوێژ یا مامۆستا یا خوتبەخوێن، جێنشین بۆ خۆیان بگرن ئەو ئیشە لەجیاتی ئەوان جێبەجێ بکا بەو شەرتە کە جێنشینەکە، یا چاکتر بێ لە خۆیان، یا وەك ئەوان وابێ. ئەگەر کۆمەڵێك ئیشێکیان پێ سپێررابوو لە مزگەوتێك یا قوتابخانەیەك یا نەخۆشخانەیەکدا و ئەو شوێنە رووخا ـ مەسەلا ـ ئەوان حەقی مانگانەی خۆیانیان هەیە تا ئەو شوێنە چاك ئەکرێتەوەو کەڵکی ئەوە پەیدا ئەکاتەوە کە ئیشی تیا بکرێ.

## باسی ئاوەدان کردنەوەی وێرانە (إحياءُ المَوات)

بزانن! هەرشوێنێکی وێرانی واکە لەسەردەمی ئیسلامییەتدا نە لەلایەنی موسوڵمانانو نە لەلایەنی ئەهلی زیممەوە ئاوەدان نەکرابێتەوە و لە حەریمی ئاوەدانیش نەبێ و لە حوقووقی تێکڕای موسوڵمانانیش نەبێ، وەك گۆڕستانو ڕێگاوبانو قەراغ چەم، ئەوە

ئەو شوێنە ئەگەر لە وڵاتی ئیسلامدا بێ کە بریتییە لەو شوێنانە کە موسوڵمان دروستی کردوون، وەك «شاری بەغدا»، یاخود ئەهلەکەی موسوڵمـان بـووبن لەسـەری وەك «مەدینەی مونەووەرە»، یاخود بە زۆری ئیسلام داگیر کرابێ، «میسر و ڕەشایی عێراق (سَوادُ العِراق)»، یاخود بە سوڵح داگیرکرابێ و زەوییەکەی هی ئیسلام بێ، ئەوە تەنها بۆ موسوڵمان دروستە ئاوەدانی بکاتەوە و هەرکاتێك ئاوەدانی کردەوە، ئەبێ بە موڵکی وە ئەگەر لە وڵاتی کافراندا بێ، دروستە بۆ کافر ئاوەدانی بکاتەوە؛ هەروەها، بۆ ئێمەیش دروستە، بەو شەرتە کە ئەو کافرانەی نزیکن لەو شوێنـەوە، دەرمـاننەکـەن، ئـەگـینا دروست نییە ئێمە ئاوەدانی بکەینەوە، چونکە پاشان ئەبێ بەهۆی نزم بوونەوەی پایەی موسوڵمانان.

هەر شوێنێ وەختی خۆی ئاوەدان بووبێ، ئەوە موڵکی خاوەنەکەیەتی ـ هەرچەند ئێستەیش وێرانبێ ـ خواه خاوەنەکەی موسوڵمان بووبێ یا کافری زیممی بووبێ، بەو شەرتە ئەو خاوەن موڵکە بناسرێتەوە کێیە، وە دروست نییە بۆ کەس ئاوەدانی بکاتەوە وە ئەگەر خاوەنەکەی نەئەناسرایەوە و نیشانەی وڵاتەکە نیشانەی وڵاتی ئیسلام بوو بەهۆی پاشماوەی مزگەوت یا گۆڕستان یا شتیواوە، ئەوە حوکمی ماڵی گـومبووی هەیەو مەسەلەکە ئەدرێتە دەستی پێشەوای موسوڵمانان و ئەتوانێ بیهێڵێتەوە، یاخود بیفرۆشێو قیمەتەکەی هەڵبگرێ یا قەرزی بکا بۆ «بیتُ المـال»ی مـوسوڵمـانان تـا خاوەنەکەی پەیدا ئەبێ؛ ئەمە، لەحاڵێکا کە هیوای ئەوە بکرێ ئەو خاوەنە پەیدابیێتەوە، ئەگینا ڕاستەوخۆ ئەبێ بە هی «بیتُ المال».

وە ئەگەر نیشانەی ئەو شوێنە، نیشانەی ئاوەدانـی زەمـانی کـافران بـوو، یـاخود گومانمان لەوەدا بوو کە ئاخۆ هی زەمانی کافرانە یا هی زەمانی موسوڵمانانە، ئـەوە فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە دروستە ئاوەدان بکرێتەوە و هەرکەس ئاوەدانی کـردەوە، ئەبێ بە خاوەنی شەرعی ئەو ئاوەدانییە.

هەرشوێنێك بوو بە موڵکـی کـەسێك، ئـەوە حـەریمی ئـەو شـوێنـەیش بـەهۆی ئاوەدانییەکەوە ئەبێ بە موڵکی ئەو کەسە. «حەریم»، بە گوێرەی ئەسڵەکەی ئەگۆڕێ؛

مەسەلا، حەریمی دێ، بریتییە لەو شوێنەی کە خەڵکی ئەو دێیەی تیا کۆئـەبنەوە بـۆ قسەکردن، یا هەرزەکارو منالی دێ گەمەو یاری تیا ئەکەن، یا غارغارێنی تیا ئەکەن بۆ تەعلیم دادانی ولاخ، یا ران و گاگەلی تیا مۆڵ ئەدەن، یا زبڵ و خۆڵەمێشی تێ ئەرێژن، یا هاتوچۆی پیائەکەن، هەروەها بە حەریمی دێ دائەنرێ ئەو شوێنانەی کە داری لێوە ئەهێنن بۆ سووتاندن و گیای لێوە دێنن بۆ حەیوانات و مالاتیان، یا گـیای لێ ئـەبڕن و وشکی ئەکەنەوە بۆ زستانی ئاژەڵیان و ئەو شوێنانەی کە لەوەڕگای مەڕو بزن و گارانی ئەهلی ئەو دێیەیە، خواه ئەم شوێنانە نزیك بن یاخود دوور بن، هەرچەند سالی چەند رۆژێك موحتاجی ئەو شوێنانە ببن، چونکە مادام ژیواری سالانـەیان بـەسراوە بـەو شوێنانەوە، ئەو شوێنانە بە حەریمی ئەو دێیە دائەنرێن. جا ئەگەر کەسێك تەنها ماڵە، ئەو شوێنانە ئاوەدانبکاتەوە، ئەوە دیارە وە ئەگەر چەند کەسێك ئاوەدانی بکـەنەوە، ئەوە هەموویان بەپێی سەر و بەگوێرەی پێویست لەو حەریمە ئەبێ بەموڵکیان؛ بەلام ئەم حەریمە، لەبەرئەوە کە تابیعی دێیەکەیە بەتەنها نافرۆشرێ و ئەبێ لەگەڵ پارچەیەك لە دێکەدا بفرۆشرێ، وەك چۆن حەقی ئاو خواردنەوەی باخ، تابیعی باخەکەیە؛ بەڵێ، ئەگەر بفرۆشرێ بە یەکێك کە لە دێکە خۆیدا جێگەو رێگەیەکی هەبێ، ئەوە دروستە.

ئەگەر لە حەریمی ئاوەدانییەکا گیاو دار زیاتر بـوو لە پـێویسـتی خـەڵکـی ئـەو ئاوەدانییە، ئەوە دروست نییە بۆیان رێگە لە خەڵکی شوێنی تر بگرن کە داری لێ ببڕن و حەیوانی تیادا بلەوەڕێنن، چونکە ئەم جۆرە شوێنانە لە ئەساسدا بۆ قازانجی گشتییە وە ئەگەر کەسێك بەناحەق لە حەریمی دێیەکدا کشت وکاڵی کرد، ئەوە رێی لێ ئەگیرێ و کشت وکاڵەکەی لائەبرێ و بۆیشی نابژێررێتەوە. ئەگەر کەسێك لە نزیکی شوێنێکـی ئاوەدان کراوەوە شوێنێکی ئاوەدان کردەوە، ئەوە ناتوانـێ دەس بـەرێ بـۆ حـەریمی ئاوەدانییە پێشووەکە، چونکە حەقی ئەوان پێش کـەوتووە وە ئـەگـەر چـەند دێـیـەك لەیەکەوە نزیك بوون و نەمانئەزانی کامیان لەپێشترە، ئەوە بەوجۆرە ئەبێ مـوعامەلە بکەن کە لەوەپێش کردوویانە و تەماشای زاهیری دەسەلات ئەکەین؛ کەواتە، هەر دێیەك هەرچەندی بەدەستەوە بووبێ، بەدەستیەوە ئەمێنێ، مەگەر بە دەلیلێکی شەرعی بۆمان

ئیسپات ببێ کە ئەو تەسەڕوفە بە ناحەق دامەزراوە و لەسەر ئەمئەساسە، لە هەرلایەکەوە ڕێگای گوزەر بۆ ماڵێك بەسەر ماڵێکا بڕوا و بۆ باخێك بەناو باخێکی ترا تێبپەڕێ، ئەوە بە حەق ئەزانین.

ئەگەر کەسێك چەند پارچەیەك گیاجاڕو ئاڵفجار داگیر بکا کە لەوەپێش بەدەستیەوە نەبووبێ، ئەوە نابێ بە خاوەنیو پێویستە لێیوەربگرێتەوە، چونکە ئەگەر بە دەستی کەسێکیترەوە بووبوو، ئەوە موڵکی ئەو کەسەیە و ئەگەر بەدەستی کەسەوە نەبووبوو، ئەوە دیارە زیادە لە حەقی خەڵکی ئەو شوێنەو بۆ قازانجی گشتییە و کەس ناتوانێ داگیری بکا بۆ خۆی. هەتاوەکوو ئەگەر کۆمەڵێك شوێنێك ئاوەدان بکەنەوەو ببن بە خاوەنی ئەو موڵکە، ئەوە هەر ئەوەندە لە حەریمی ئەو شوێنە ئەبێ بە موڵکیان کە بەگوێرەی عادەت موحتاج بن پێی، وە هەرچی لەوە زیاتر بێ، بۆ قازانجی گشتییە.

حەریمی خانوو، بریتییە لە ڕێگای هاتوچۆ بۆ ئەو خانووە لەلای دەرگاکەیەوە و جێگەی داپەڕینی پلووسکی بانە لەکاتی باران بارینا و ئەو شوێنەیە کە بەفری سەربانەکەی تێ فڕێئەدرێ و شوێنی خەوشوخاڵ داکردنو ڕشتنی ئاوی پیسو بەردەرگای ماڵەکەیە؛ کەواتە، هەر خانوویەك لەناو چەند خانوویەکدا بێو لکابن بەیەکەوە، ئەوە بەتەنها خۆی حەریمێکی نییە، بەڵکوو لەگەڵ خانووەکانیتردا هاوبەشن لەحەریمدا، هەرکامیان هەرچۆن بۆی ڕێبکەوێ.

حەریمی چەم، ئەو شوێنانەیە کە پێویستی خەڵکن بۆ قازانج وەرگرتن لەو چەمە لەکاتی جلشتنو فەرششتنو جۆگە هەڵگرتنو ماسی گرتنو ئەم جۆرە ئیشانەدا و حەریمی بیری کارێز، ئەو شوێنانەیە کە ئەگەر هەڵبکەنرێن، کارێزەکە بڕووخێ یاخود ئاوی کەم ببێتەوە و حەریمی بیر لە دەشتو دەردا، شوێنی ڕاوەستانی ئاوهەڵکێشە لەگەڵ شوێنی دۆڵابو دۆڵچە و ئەو حەوزەیە کە ئاوی تێئەکرێ بۆ حەیوان و شوێنی هاتوچۆی حەیوانەکانە و ئەو شوێنانەیشە کە ئەگەر هەڵبکەنرێن، ئاوی ئەم بیرە کەم ببێتەوە یا بیرەکە بڕووخێ. حەریمی جۆگایش، ئەمبەرو ئەوبەری جۆگاکەو ئەو شوێنەیەکە لەکاتی جۆماڵکردنداگڵو خەوشوخاڵی ناو جۆگەکەی تێ فڕێ ئەدرێ.

فەرموودەی راستتر ئەوەیە هەر خاوەن موڵکێك ئەتوانێ تەسەڕوف بکا لە موڵکی خۆیدا بەپێی عادەت؛ کەواتە ئەگەر خانوویەك لەناو چەند خانوویەکدا بوو، خاوەنەکەی بۆی هەیە بیکا بە مزگەوت یا بە حەمام یا بە دووکان؛ بەڵام ناتوانێ بیکا بە دەباغ‌خانە کە بۆنەکەی ببێ بەهۆی نەخۆش‌کەوتنی مناڵانی دەرو دراوسێ و ناتوانێ بیکا بە دووکانی ئاسنگەری یا بە ئاشەمەکینەی ئارد هاڕین، ئەگەر هاتو دیواری خانووی دراوسێکانی ناقایم بێ‌و ترسی رووخانی بکرێ بەهوێ ئاسن کوتاندنەوەو ئاشە مەکینەکەوە. ئەو قسەیە کە مەشهوورەو ئەڵێ: مەنعی خاوەن موڵك ئەکرێ لە هەر تەسەڕوفێك کە زیانی ببێ بۆ موڵکی دراوسێکانی، بەڵام مەنعی ناکرێ لە تەسەڕوفێك کە زیانی بۆ دراوسێکان خۆیان هەبێ، بە موتڵەقی وانییە، بەڵکوو هەر تەسەڕوفێك کە بەعادەت زیانی ببێ بۆ ئەو دراوسێیانە خۆیشیان، ئەوەیش رێگای نادرێ؛ کەواتە، ئەگەر خانوویەك نووسابوو بە خانوویەکی‌ترەوە، دروست نییە ئەم خانووە ئەوەندە بەرز بکرێتەوە مەنعی هەوای خاوێن بکا لە خانووەکەی‌تر، چونکە خەڵکی ئەم خانووەی‌تر، بە بێ هەتاوو هەوای خاوێن، نەخۆش ئەکەونو ئیسراحەتیان لێ تێك ئەچێ.

ئاوەدان کردنەوەی هەرشوێنێك بەپێی مەبەست ئەگۆڕێ؛ ئەگەر مەبەستی کردنەوەی خانوو بوو، ئەبێ دیواری بۆ بکاو سەری هەندێکیشی بگرێ‌و دەرگاو پەنجەرەی تێ‌بخا وە ئەگەر مەبەستی پەچەی حەیوان بوو، لە هاوینا، هەر حەسار یا پەرژینی ئەوێ و لەزستانا، پێویستە چەند هۆدەیەك بکاتەوەو سەریان بگرێ بە گوێرەی ئیحتیاجی حەیوانەکان وە ئەگەر مەبەستی کشت‌وکاڵ تیا کردن بوو، ئەبێ زەوییەکە تەخت‌بکا وە ئەگەر بە باراناو تێراو نەئەبوو، ئەبێ جۆگەی بۆ هەڵبگرێ، ئیتر شەرت نییە بیکێڵێ‌و تووی تیا دابچێنێ دەس‌بەجێ وە ئەگەر مەبەستی باخ ناشتن بوو، ئەبێ حەساری بەدەورا بکاو ئاوی بۆ رێك‌بخاو چەند نەمامێکیشی تیا بنێژێ.

جا هەرکام لەم ئیشانە، ئەگەر بەعادەت تەنها بۆ موڵکییەت دەستی‌ئەدا، ئەوە نییەتی ناوێ وە ئەگەر بۆ موڵکیش‌و بۆ خێرو حەسەناتیش دەستی‌ئەدا، ئەوە نییەتی ئەوێ، یەعنی بۆ هەرشتێکی ئەوێ لە موڵك یا لە خێرو حەسەنات، ئەبێ نیازی ئەوەی ببێ وە

ئەگەر کەسێك دەستی کرد بە ئاوەدان کردنەوەی شوێنێك، بەڵام ئیشەکەی تەواو نەکرد، یاخود هەر شوێنەکەی نیشانە کردو ئیشی تیا نەکرد، ئەوە نابێ بە خاوەن مولْك و دروست نییە بیفرۆشێ وە ئەگەر کەسێك هات دەستی کرد بە ئاوەدان کردنەوەی ئەو شوێنەو ئاوەدانی کردەوە، ئەوە ئەبێ بە خاوەنی، بەڵام هەر شەخسی یەکەم موستەحەقترە و لایقی ئەوەیە ئەم جێگایە ئاوەدان بکاتەوە، چونکە لەپێشا رۆیشتووە گرتوویەتی بۆ خۆی وە ئەگەر کەسێك شوێنێکی نیشانە کرد بۆخۆیو ماوەیەکی زۆر وازی لێهێنا، پێویستە گەورەی وەخت پێیبڵێ یا ئاوەدانی بکاتەوە، یا دەستی لێهەڵبگرێ، کابرایش بۆی هەیە داوای مۆڵەت بکاو گەورەی وختیش بۆی هەیە بۆ ماوەیەکی کەم مۆڵەتی بدا.

ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان وێرانەیەکی دا بە کەسێك و ئەو وێرانەیە پەیوەندی کەسی پێوە نەبوو جگە لە «بیت المال»ی موسوڵمانان، ئەوە ئەگەر بۆ ئەوە پێیدابوو کە ببێ بە مولْکی، ئەوە ئەبێ بە مولْکی ئەو کەسە و ئەگەر هەر بۆ ئاوەدان کردنەوە پێیدابوو، ئەوە نابێ بە هی ئەو کەسە، بەڵام ئەم موستەحەقترە لە هەرکەس بۆ کەڵك وەرگرتن لەو شوێنە. دروست نییە پێشەوای موسوڵمانان زەوی وێرانەی «بیتُ المال» بدا بەکەس، مەگەر کەسێك کە بتوانێ ئاوەدانی بکاتەوە، ئەبێ ئەوەندەشی بداتێ کە دەسەڵاتی بەسەریا بشکێ. فەرموودەی راستتر ئەوەیە دروستە بۆ پێشەوای موسوڵمانان وڵاتێکی وێرانە قەدەغەو قورخ بکا بۆ ئەوەی ببێ بە لەوەڕگەی حەیوانی «بیتُ المال»و حەیوانی زەکاتو گومبوو و حەیوانێ کە لەبەر لەڕیو لاوازی نەتوانێ بڕوا بەدەشتا بۆخۆی بلەوەڕێ، هەروەها پێشەوای موسوڵمانان بۆی هەیە ئەو قەدەغەیەش تێكبدا.

دروست نییە پێشەوای موسوڵمانان قەدەغە بکا بۆخۆی، بەڵام خەڵکی دێیەك کە پێکەوە دێکەیان ئاوەدان کردبێتەوە بۆخۆیان، ئەتوانن ئەوەی حەریمی دێکەیە بەشی بکەن لەنێوانی خۆیانا و هەر کەس بەشی خۆی قەدەغە بکا، بەڵام بەمجۆرە نەبێ، بە هیچ جۆرێ کەس ناتوانێ ئەندازەیەك لەو حەریمە قەدەغە بکا بۆخۆیو مەنعی خەڵکی لێبکا.

## باسی هەندێ قازانجی تێکەڵ

کەڵکی جادەو ڕێگا ئەوەیە خەڵکی بەخۆیانو باریانەوە هاتوچۆی بەسەرا بکەن. دروستە بۆ هەرکەس بەبێ ئیزن وەرگرتن لە پێشەوای موسوڵمانان لە جادەدا دانیشێ بۆ ئەوەی بحەسێتەوە یا بۆ هەر مەبەستێکی تر، بەو شەرتە ڕێگا لە خەڵکی تر تەنگ نەکا، هەروەها ئەگەر ڕێگای لەخەڵك تەنگ نەئەکرد، ئەتوانێ چەترێك هەڵدا بەسەر خۆیا یا سووکەکەپرێك بکا بۆخۆی بۆ سێبەر. ئەگەر دووکەس بەرودوا هاتن بۆ جێگایەك، ئەوە حەقی ئەویانەیە کە زووتر گەییوەتە ئەو جێگەیە وە ئەگەر بەیەکەوە هاتن، ئەبێ دەوی لێبکەن (قورعە)، جا بۆ هەر کامیان دەرچوو، ئەوەیان تیا دائەنیشێ. ئەگەر کەسێك لەشوێنێکا دانیشت بۆ مامەڵە کردن و پاش ماوەیەك شوێنەکەی بەجێ‌هێشت لەبەر عوزرێك لەسەر خەیاڵی ئەوە کە دووبارە بێتەوە، ئەوە حەقەکەی نافەوتێ، مەگەر ئەوەندەی پێ‌بچێ کە بەعادەت بڵێن: وازی لەو شوێنە هێناوە وە ئەگەر بەتەواوی بەجێی هێشت، ئەوە ئیتر حەقی نامێنێ.

ئەگەر کەسێك ئولفەتی گرتبوو بەشوێنێکەوە لە مزگەوتا، بۆ فەتوادان یا دەرس‌وتنەوە یا بۆ قورئان خوێندنو شتی‌وا، ئەوە تا بەتەواوی خۆی بەجێی نەهێڵێ، کەس ناتوانێ دەری‌بکا؛ بەڵێ، واجبە لەسەری لەکاتی نوێژکردنا نەبێ بەهۆی سەرلێ‌تێکچوونی نوێژکەرەکان. وتنەوەی دەرسی قورئان یا کتێبە وردە بە منداڵی نەفام، دروست نییە لە مزگەوتا، چونکە زۆرتر وایە هاتنی منداڵی‌وا بۆ ناو مزگەوت، ببێ بەهۆی پیس‌بوونی مزگەوتەکە.

ئەگەر کەسێك لەمزگەوتێکدا لە شوێنێکی تایبەتیدا دانیشت بۆ نوێژکردن، ئەوە ئەبێ بە خاوەن حەق لەو شوێنەدا بۆ ئەو نوێژە و کەس ناتوانێ دەری‌بکا؛ بەڵێ، بۆ نوێژێکی‌تر حەقی نامێنێ، مەگەر پێش خەڵکی‌تر بڕوا ئەو جێگایە بگرێتەوە و مادام حەقی شوێنەکەی هەبوو لەماوەی ئەو نوێژەدا، ئەگەر هاتو بۆ پێویستییەك چووە دەرەوە، حەقەکەی نافەوتێ، هەرچەند بەرماڵیشی لەو جێگەی خۆیەدا

بەجێنەهیشتبێ؛ بەڵێ، ئەگەر نەهاتەوە تا خەڵك ریزی نوێژیان بەست لە پشتی پێش نوێژەوە، ئەوە حەقەکەی نامێنێ. جا بەرماڵەکەی بە خشە لەو شوێنە لائەدرێ و کەسێك لەشوێنەکەیا رائەوەستێ بۆ نوێژ.

ئەگەر فەقێیەك یا چەند فەقێیەك لە حوجرەیەکدا ئەیانخوێندو مانگانەیەکیان هەبوو پێی ئەژیان، ئەوە بەبێ عوزرێکی شەرعی کەس ناتوانێ دەریان بکا وە ئەگەر بەعادەت بۆ پێویستییەکی خۆیان ئەچوونە دەرەوە، حەقی هاتنەوەیان هەیە، هەروەها قەیدی نییە لەرۆژانی ئیسراحەتی عادەتیدا، وەك رۆژانی جومعە ،برۆن بۆ شوێنێکی تر، یا لەبەر نەخۆشی برۆن بۆ خەستەخانە، یاخود برۆن بۆ سەرلێدانی کەس و کاریان و کە هاتنەوە، حەقەکەیان لەجێی خۆیا ئەبێ.

ئەگەر مانگانەی ئەو فەقێیانە بۆ ژمارەیەکی تایبەتی بوو، دروست نییە لەسەریان زیاد بکرێ و وەزعی ژیانی ئەمان تێك بدرێ؛ بەڵێ، ئەگەر یەکێکیان یا چەندکەسێکیان رۆیشتن بۆ شوێنێك، دروستە تا ئەوان دێنەوە هی‌تر لەجێیان دابنرێ، بەو شەرتە ئەوە پێچەوانەی شەرتی وەقفکەرەکە نەبێ وە ئەگەر رۆیشتنەکەیان ئەوەندەی پێ چوو کە بەپێی عادەت بوترێ ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە، ئیتر حەقی هیچیان نامێنێ.

هەروەها ئەو کەسانە کە بۆ خواپەرستی لە خانەقاو تەکیەی وەقف کراوا دائەنیشن، بەم جۆرە موعامەلەیان لەگەڵ ئەکرێ. دروست نییە سۆفی برواتە حوجرەی فەقێ و جێگەی فەقێ بگرێتەوە، بەڵام فەقێ ئەتوانێ برواتە تەکیەو خانەقاو خەریکی خواپەرستی بێ و حەقیشی هەیە وەك سوفێ و دەرویش بژی، چونکە فەقێیەتیش خواپەرستییەو بەمیش ئەڵێن: خواپەرست.

## باسی کان و کانی و چەم و بیر و کارێز

ئەو کان (معدن)انەی کە بەدەرەوە بن و بە بێ زەحمەتی کەس کەرەستەکەیان لێ وەربگیرێ، هەرچەند زەحمەت لە کوڵاندن و دەرکردنیا بێ، وەکوو نەوت و گۆگردو قیرو مۆمیاو بەردی مەرمەڕو بەردی یەشم و بەردی بەرداش، ئەمانە نابن بە موڵکی

کەس بەهۆی ئاوەدان کردنەوەی ئەو شوێنەوە کە ئەم کانانەی تیایە و بەهۆی نیشانە کردنەوە پەیوەندی تایبەتی بەکەسەوە پەیدا ناکەن بەجۆرێك کـە لەدەسـتی خـەڵك دەربچن، چونکە ئەمانە بەپێی شەرع، بۆ قازانجی گشتین و هەموو کـەسێ ئـەتوانـێ ئەوەندەی پێویستی خۆی سوودیان لێ‌وەربگرێ؛ بەڵێ ئەگەر حاسڵانەکەیان کەم بوو، ئەوە هەر کەسێ زوو رۆیشتە سەری‌و گرتی بۆخۆی، ئەوە بۆ ئەوەیەو کەس ناتوانـێ رێی لێ بگرێ، بەڵام ئەگەر داوای زیاتری لە پێویستی خۆی کرد، ناهێڵرێ وە ئەگەر لە وەختی کەم‌و کووڕیدا دووکەس هاتنەسەری‌و کانەکەش بەشی هەردووکیانی نەئەکرد، ئەوە ئەبێ قورعە بخەن لە بەینی خۆیانا و بۆ هەرکامیان دەرچوو، حەقی ئەویانەیە.

هەرکانێ کە لەناوەوە بێ‌و بەبێ‌زەحمەت دەرنەکەوێ‌و شتی لێ پەیدا نـەبێ، وەك ئاڵتوون‌و زیوو ئاسن‌و مس‌و مەفرەق‌و قورقوشم‌و شتی‌وا، ئەوە شوێنـەکـەی بـەهیچ جۆرێ نابێ بە موڵکی کەس، نە بە ئاوەدان کردنەوەو نە بە هۆی هـەڵکـەندن‌و ئـیش تیاکردن‌و شتی‌واوە و لەسەر حاڵی خۆی ئەمێنێتەوە کە قازانجی گشتییە و خەڵکی ئەبێ بە تێکڕایی قازانجی لێ وەربگرن؛ حوکوومەتیش ئەتوانێ دەری بکا و سەرفی بکا بۆ قازانجی گشتی میللەت؛ بەڵێ، ئـەگـەر هـات‌و کـەسێك بـەهۆی ئـیش‌تیاکـردنەوە، ئەندازەیەکی لێ‌وەرگرت، ئەوە لێی ناسەنرێتەوە.

ئەگەر کەسێك زەوییەکی بە سوورەتێکی شەرعی ئاوەدان کردەوە و لەو کاتەدا هیچ مەعدەنێکی تیانەدۆزرایەوەو لەپاشا دەرکەوت پارچەیەك لەو زەوییە ئاوەدان کراوەیە مەعدەنە، ئەوە ئەبێ بە موڵکی ئەو کەسە کە ئەو زەوییەی ئاوەدان کردووەتەوە.

ئاوی بەرەڵڵا (مُباح)یش، وەك ئاوی چەم‌و کانیاوی شاخەکان، بۆ قازانجی گشتین و پێشەوای موسوڵمانان حەقی نییە بیدا بەکەس بەتایبەتی، نە بەشێوەی موڵك و نە بۆ قازانج لێ‌وەرگرتنی ماوەیەکی تایبەتی و دروستە بۆ هەرکەس بەپێی توانا قـازانـجی لێ‌وەربگرێ؛ جا ئەگەر تاقمێك هەبوون لەسەر ئەو ئاوە، زەوی‌و باخاتی خۆیان بەو ئاوە ئاو ئەدا، ئەوانە حەقیان نییە رێگای کەسی‌تر بگرن؛ بەڵێ، ئەگەر ئاوەکە هەر بەشی ئەوانی ئەکرد، ئەوانە حەقیان هەیە نەیدەن بەکەسی‌تر، مادام باخەکەیان تازە دانەنابێ،

یەعنی لەپاش تەسەڕوف کردنی ئەوانــە کــە وان لە خــواریــانەوە، ئــەگــینا رێگــایان لێ ئەگیرێ وە ئەگەر بەشی هەموو ئەوانیشی نەئەکرد لە بەرئەوە کە ئاوەکە کزبووبوو، ئەوە حەقی ئەوەیە کە لە ژوورترەوەیە یا زووتر خاوەن حەق بووە وە ئەگــەر بــەشی هەموویانی ئەکردو زەوییەکان بەرزو نزم بوون، ئەوە هەرکام لەو خاوەن زەوییانە بەشە ئاوی خۆی بەتایبەتی پێ ئەدرێ.

هەرکەس ئەندازەیەك لەو ئاوە بەرەڵلایە بکاتە قاپێکەوە، ئەبێ بە خاوەنی؛ هەروەها، ئەگەر بە جۆگەلەیەکدا بیهێنێ و بیکاتە ناو حەوزێکەوە کە ئاوی لێ نەڕوا، ئەویش ئەبێ بە موڵکی تایبەتی ئەو بەڵام بە ئاوی بەرەڵلا دانانرێ. ئاوێ کە نەزانرێ وەختی خۆی کارێزی لێ دراوە یا هەر خۆی دەرچووە و ئێستا بە دەستی کۆمەڵێکــەوە بــێ ئــاوی زەوی و باخی پێ بدەن، بەڵکوو بە موڵکی ئەوان ئەناسرێ، چونکە تەسەڕوف نیشانەی موڵکییەتە و دروست نییە بۆ یەکێك لەم تاقمە بە بێ ئیزنی هاوڕێکانی، زەوییەکی تر بکا بە باخ وە یا بە کشت وکاڵ و بەو ئاوە ئاوی بدا، چونکە ئەوە وائەگەیەنێ لە پاشەڕۆژا ببێ بە خاوەنی حەقی ئاو وەرگرتنێکی زیاتر لەوەی کە موستەحەقیەتی و ئەوەش بۆ ئەمان زەرەرە؛ هەروەها، دروست نییە بۆ کەسێکی بێگانە لەم تاقمە بە بێ ئیزنی ئەوان باخێك دابنێ و بەو ئاوە ئاوی بدا، چونکە حەقی ئاو وەرگرتنی لەمەوپاش بۆخۆی ئیسپات ئەکا، لە کاتێکا کە حەقی وای نییە.

هەرکەس بیرێك هەڵبکەنێ لە زەوییەکی وێرانەدا، ئەگەر بۆ خێر بێ، ئەوە هەتا خۆی لەویادا بێ، موستەحەقی ئاو خواردنەوەیە لەو ئاوە و ئەخرێتە پێش خەڵکــی ترەوە و بیرەکەیش نابێ بە موڵك، بەڵکوو بۆ قازانجی گشتییە وە ئەگەر بیرەکەی بۆ کردن بــە موڵك، هەڵکەند، یاخود لە زەوی موڵکی خۆیا هەڵی کەند وە یا کانی و ئاوێك لە موڵکی خۆیدا پەیدا ببێ، ئەوە بەتەنها موڵکی خۆیەتی و واجبە لەسەری ئەوەی زیاد بــێ لە خواردنەوەی خۆی، بەخۆڕایی بیدا بە خەڵك، بۆ ئەوە کە بیخۆنەوە و هەرچی زیاد بێ لە خواردنەوەی حەیوانی خۆی و لەکشت و کاڵی خۆی، بە خۆڕایی بیدا بە خەڵك بۆ خواردنەوەی حەیوانەکانیان، بەڵام واجب نییە لەسەری هەرچی زیاد بێ لە حەیوان و

زه‌راعه‌تی خۆی به خۆڕایی بیدا به خه‌ڵك بۆ كشت‌و كاڵیان، هه‌روه‌ها واجب نییه له‌سه‌ری ئه‌وه‌ی زیاد بێ له حه‌یوانی خۆی‌و پێویستی بێ بۆ كشت‌وكاڵ، بیدا به خه‌ڵك بۆ حه‌یوان یا بۆ كشت‌وكاڵ‌و كشت‌و كاڵه‌كه‌ی خۆی وشك بكا، چونكه هه‌روه‌ك خه‌ڵك موحتاجن به حه‌یوان‌و كشت‌و كاڵ بۆ ژیانیان، ئه‌میش هه‌روه‌ها موحتاجه به زه‌راعه‌ته‌كه‌ی خۆی بۆ ژیان‌و به‌ڕێوه‌چوونی خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی.

جا مادام بیرو كانیاوێ كه له موڵكی كه‌سێكدا بێ به هی ئه‌و كه‌سه ناسرا، ئه‌توانێ رێگا له خه‌ڵك بگرێ له‌وه‌كه جۆگه‌یه‌كی لێوه رابكێشن بۆ سه‌رباخ‌و زه‌راعه‌تی خۆیان، چونكه بۆ سبه‌ینێ ئه‌و كه‌سه به‌خۆڕایی حه‌قی خواردنه‌وه له‌و ئاوه په‌یدا ئه‌كا، به‌بێ ئه‌وه له رێگایه‌كی شه‌رعییه‌وه ئه‌و حه‌قه‌ی ده‌سگیر بووبێ.

ئه‌گه‌ر كه‌سێك ئاوی به جۆگه له كانیاوێكی موڵكه‌وه راكێشاو ئاوی زه‌وی‌و كشت‌وكاڵی خۆی لێ‌دا و پاشان ئیدیعای كرد وتی: حه‌قی ئاو وه‌رگرتنم له‌و كانیاوه هه‌یه، ئه‌وه ئه‌گه‌ر وتی: كڕیومه، یا: به‌كرێم گرتووه، ئه‌بێ به شاهید ئیسپاتی بكا، ئه‌گینا باوه‌ڕ به سوێندی خاوه‌ن ئاوه‌كه ئه‌كرێ‌و ئه‌م كابرایه ده‌رئه‌كا وه ئه‌گه‌ر ته‌نها ئیدیعای ئه‌وه‌ی كرد كه له سه‌رده‌مێكی كۆنه‌وه حه‌قی ئاو وه‌رگرتنی هه‌یه‌و باسی سه‌به‌به‌كه‌شی نه‌كرد و خاوه‌ن ئاوه‌كه ئینكاری كرد، پێویسته ئه‌و كابرا ئیسپاتی ئه‌وه بكا به شاهید كه له‌مه‌وپێش به‌وئاوه زه‌وی‌و باخی خۆی ئاو داوه؛ جا پاش ئیسپات كردنی ئه‌مه، ئه‌گه‌ر خاوه‌ن ئاوه‌كه وتی: به زۆر ئاوی‌لێ‌سه‌ندووم، یا: به‌كرێ وه‌ری‌گرتبوو، یا: به خواستن، ئه‌وه ئه‌بێ به شاهید ئیسپاتی بكا و ئه‌گه‌ر ئیسپاتی نه‌كرد، ئه‌م شه‌خسه سوێند ئه‌خوا له‌سه‌ر ئه‌وه‌كه حه‌قی ئاو وه‌رگرتنی له‌و كانیاوه هه‌یه و ئه‌و حه‌قه‌ی بۆ قه‌رار ئه‌درێ.

هه‌ر كانی‌و كارێزێك كه تێكه‌ڵ بێ له‌نێوان تاقمێكا، ئه‌و تاقمه ئه‌توانن له‌سه‌ر حیسابی به‌شه‌كان، به سه‌عات ئه‌و ئاوه وه‌ربگرن‌و ئیشی پێ‌بكه‌ن و ئه‌یشتوانن دارێكی درێژ له به‌رده‌می ئه‌و كانی‌و كارێزه‌دا داچه‌قێنن و ئه‌وه‌نده‌ی به‌شه‌كان كونی تێ‌بكه‌ن و له به‌رده‌می كونه‌كانا جۆگا هه‌ڵبه‌ستن، تا له‌و كونانه‌وه ئاو بێته‌ده‌رو به‌و جۆگه‌لانه‌دا بڕوا بۆ ئه‌و خاوه‌ن به‌شانه؛ جا ئه‌گه‌ر به‌شه‌كان ئه‌وه‌نده‌ی یه‌ك بوون، ئه‌بێ كونه‌كانیش

ئەوەندەی یەك بن وە ئەگەر فەرقیان هەبوو، ئەبێ کونەکانیش بەو ئەندازیە فەرقیان هەبێ بۆ ئەوە کە هەرکەس بگا بە بەشی حەقی خۆی.

## باسی ئەوەکە چۆن نەچیر ئەبێ بە موڵك

نەچیری غەیری مەککەی «مُکرّمة» ئەبێ بە موڵك بۆ کەسێ کە لە ئیحراما نەبێ بە چەند شت:

یەکەم، بەوە کە ئەو نەچیرە بە دەست بگرێ، با نیازی ئەوەیشی نەبێ کە بیکا بە موڵکی خۆی، خواه ئەو کەسە باڵغ بووبێ یا منداڵ بێ، تەمیزی پەیدا کردبێ یا نە؛ بەڵێ ئەگەر منداڵێکی بێتەمیز بوو و کەسێك ئەمری پێ کرد ئەو نەچیرەی بۆبگرێو ئەویش گرتی، ئەوە ئەبێ بە موڵکی ئەو کەسە، هەروەها ئەگەر فەرمانیدا بە کەسێکی بێشوعووریوا کە بەگوێ کردنی ئەو بە پێویست بزانێو ئەویش بەگوێی بکا؛

دووهەم: بە بریندار کردنێکیوا زووبەزوو گیانی حەیوانەکەی پێدەربچێ؛

سێهەم: بە لێدانێکیوا کە لە جووڵەی بخا لەگەڵ ئەوەدا کە مـەبەستی لەم لێدانـە ئەوەبێ بیکا بە موڵك؛

چوارەم: بەوە کە باڵی یا پێیبشکێنێ یا باڵی هەڵپاچێ؛

پێنجەم: بەوە کە بکەوێتە داوێکەوە کە ئەم شەخسە دایِنابێ بە نیازی نەچیر گرتن و داوەکە لە راکردنو خۆ رزگار کردنی بخا؛ کەواتە، نەچیر نابێ بە موڵك ئەگەر بکەوێتە داوێکەوە کە ئەم نەینابێتەوە، یاخود ئەم نابێتیەوە بەڵام نەك بە نیازی ئەوەکەچی پێوە بوو بیکا بە موڵکی خۆی یاخود بکەوێتە داوێکەوە کە بتوانێ پێیـەوە رابکـاو خـۆی رزگار بکا؛

شەشەم: بەوە کە رێی لێبگرێ لە تەنگەبەرییەکی وادا کە نەتوانێ لێیدەرچێ، بەو شەرتە کە بە ئاسانی بگیرێ، ئەگینا تا دەرینەهێنێ، نابێ بە موڵکی وە ئەگەر لە داو دەرباز بوو، هەرکەس گرتیەوە، ئەبێ بە موڵکی ئەو کەسە،

حەوتەم: بەوە کە نەچیرەکە بکەوێتە ئەرزی ئەوەوەو ئەمیش بە نیازی گرتنی ئەو نەچیرە، ئاو بەربداتە ئەرزەکە تا ببێ بە قوڕو حەیوانەکە پەکی بکەوێ؛

**هەشتەم:** بەوەکە هانەهانەو شتەی سەگ یا باز یا ویز یا هەرحەیوانێکی تری راو بدا بۆسەر ئەو نەچیرەو ئەویش بیگرێ یا وای لێبکا کە لە راکردن بکەوێ؛

**نۆهەم:** بەوەکە ئەو نەچیرە خۆی فڕە بداتە خانوویەکەوەو خاوەنی خانووەکەیش دەرگای ئەو خانووە بگرێ لەسەر نەچیرەکە، ئیتر هەرچەند ئەو خاوەن خانووە بە داگیر کردن تیابێ؛ بەڵێ، ئەگەر غەیری ئەو خاوەن ماڵە بەبێ ئیزنی خاوەنماڵەکە دەرگاکەی گرت، ئەوە کەسیان نابێ بە خاوەنی؛ خاوەنماڵەکە نابێ بە خاوەنی نەچیرەکە، لەبەرئەوە کە دەرگاکەی نەگرتووە، کابرای بێگانەیش نابێ بە خاوەنی ئەو نێچیرە، چونکە نە بەڕاستیو نە بە داگیر کردن، خاوەنی ئەو خانووە نییە، کەوابوو، ئیشەکەی بێسوودە؛

**دەهەم:** بەوەکە هێلانە دروست بکا بۆ پەلەوەر؛ ئەوە، هەرکاتێك کە ئەو پەلەوەرە هێلکەی کرد، یاخود بەچکەی هەڵهێنا، بە خۆیو هێلکەو بەچکەیەوە، ئەبێ بە موڵکی ئەو کابرا، مادام ئەو هێلانەیەی بەم نیازە دروست کردبێ بۆ پەلەوەرەکە.

ئەگەر کەسێك رای کرد بە دوای حەیوانێکداو حەیوانەکە ماندوو بوو و راوەستا، ئەوە ئەو کابرا نابێ بە خاوەنی ئەو حەیوانە تا نەیگرێ، چونکە ئەو وەستانە هێزی ئەداتێ بۆ راکردنێکی تازە وە ئەگەر هەنگێکی دۆزییەوە لەناو دارێکی بۆشا، یا لە کونەبەردێکا، ئەوە هەنگەکە ئەبێ بە موڵکی ئەگەر دەرگای کونەکەی توند گرت بە جۆرێك کە هەنگەکە نەتوانێ دەرچێ، بەڵام هەنگوینەکەی نابێ بە موڵکی تادەری‌ئەهێنێ و وەری‌ئەگرێ؛ کەواتە، نیشانە کردنی دارێك کە هەنگی تیابێ، شتێکی بێسوودەو نە ئەبێ بەهۆی موڵکییەتی هەنگەکەو نە هی هەنگوینەکەی؛ ئەو قسەیەش کە مەشهوورە ئەڵێ: «هەنگوین هی ئەو کەسەیە کە تەوری تیژە»، مەبەست لێی ئەوەیە کابرا دارەکە ببڕێو هەنگوینەکە دەربهێنێ، نەك تەنها دارەکە نیشانە بکاو ئیتر بەس.

هەر حەوانێك کە بوو بە موڵکی کەسێك، لە موڵکی ئەو کەسە دەرناچێ بەوە کە بەرەڵڵای بکا؛ کەواتە، حەرامە بەری‌بدا، چونکە لەوانەیە یەکێك بیگرێو بیخوا، مەگەر لەکاتێکا کە بڵێ: وا ئەمحەیوانەم بەرەڵڵا کردو حەڵاڵم کرد بۆ هەرکەس کە بیگرێ

بۆخۆی؛ بەڵێ جاروبار واجبە ئەو حەیوانە بەرەڵلا بکا، وەك ئەوە نەچیرێك لە موڵکی کەسێکا بێو ئەو کەسە بکەوێتە ئیحرامەوە بۆ حەج یا بۆ عەمرە، چونکە لەم کاتەدا واجبە ئەو کابرا حەیوانەکە بەرەڵلا بکا؛ هەروەها، بەرەڵلاکردنی حەیوان واجبە ئەگەر ئەو حەیوانە بەچکەیەکی هەبێو بەچکەکەی نەگیرابێ، یاخود بەچکەکە گیرابێو دایکەکەی نەگیرابێ، یاخود لەکاتێکا کە ئەو نەچیرە گۆشتی حەڵاڵ بێو کابرایش چەقۆی پێنەبێ سەری ببڕێو هیچیشی نەبێ بیداتێ بیخوا، یاخود گۆشتی نەخورێ، وەك پەرەسێلکە؛ بەڵام ئەگەر حەیوانی گۆشت نەخوراو رابگرێ لەبەر جوانی یا لەبەر خۆشی دەنگی، ئەوە عەیبی نییە.

ئەگەر کۆتری برجی کەسێك هات بۆ برجی کەسێکی تر و لەگەڵ کۆتری ئەم برجەکەدا تێکەڵبوو، ئەوە ئەگەر لەیەك جیا ئەکرانەوە، واجبە جیایان بکاتەوە و کۆتری برجەکەی تر بداتەوە بە خاوەنی وە ئەگەر جیانەئەکرانەوە، ئەوە خاوەنی ئەم برجەکە ناچار ناکرێ بۆ ناردنەوەیان، چونکە نازانرێ کامەن تا جیایان بکاتەوە، بەڵام دروستیش نییە هیچیان لێ بفرۆشن یا ببەخشن بەغەیری خۆیان، بەڵام دروستە یەك بەیەکی بفرۆشێ یا ببەخشێ؛ بەڵێ ئەگەر هەردوولایان کۆترەکانیان تێکڕا فرۆشت بەکەسێکی تر و ژمارەیان دیاریو نرخیشیان وەك یەك بوو، ئەوە دروستە، ئەگینا دروست نییە.

ئەگەر دووکەس یەك لەدوای یەك نەچیرێکیان بریندار کرد، ئەوە ئەگەر دووهەمیان نزیکی کردەوە لە مردن یاخود لە راکردنی خست، نەك یەکەمیان، ئەوە ئەو حەیوانە ئەبێ بەماڵی دووهەمیان وە ئەگەر یەکەمیان نزیکیکردەوە لە مردن یا پەکی خست، ئەوە هەر بۆ ئەوە؛ جا ئەگەر لەم سوورەتەدا، دووهەمیان گیانی حەیوانەکەی دەرکرد بە بڕینی قورقوڕاچکەو سوورێچکەی، ئەوە گۆشتی حەڵاڵە، بەڵام واجبە لەسەری تۆڵەی ناتەواوییەکەی بدا بە کابرای یەکەم، ئەگەر بەم سەربڕینەکەمی کردبوو؛ ئەو تۆڵەیەش، بریتییە لە فەرقی قیمەتی ئەو حەیوانە لەکاتی سەربڕاویو کاتی پەك کەوتوویدا وە ئەگەر بە بڕینی غەیری ئەو دوو شوێنە گیانی دەرکرد، یا نزیکی نەخستەوە لە مردن، بەڵام بە هەردوو برینەکە مرد، ئەوە حەرامەو کابرای دووهەم ئەبێ بە زامنی وەختی

پەك کەوتوویی حەیوانەکە بۆ کابرای یەکەم، چونکە بووە بەهۆی مردنی ئەو حەیوانە بەمجۆرە.

وە ئەگەر هەردووکیان پێکەوە برینداریان کردو نزیکیان خستەوە لە مردن، یاخود بە هەردووکیان پەکیان خست، ئەوە ئەو حەیوانە بۆ هەردووکیانە وە ئەگەر هەر یەکێکیان نزیکە مردنی کردەوە یا پەکی خست، ئەوە هەر ماڵی ئەو کەسەیە وە ئەگەر یەکێکیان پەکی خستو یەکێکیان نزیکی خستەوە لەمردن و نەئەزانرا کامیان پێش کەوتووە، ئەوە حەرامەو گۆشتی ناخورێ وە ئەگەر کەسێك نەچیرێك یا حەیوانێکی خانەکی مردار کردەوەو کابرایەك پێستەکەی بردو دەباغی کرد، ئەوە ئەبێ بە موڵکی، چونکە خاوەن حەیوانەکە دەس‌بەرداری پێستەکە بووە؛ هەر لەسەر ئەساسی ئەم دەس‌بەردار بوونە، دروستە بۆ بێگانە گوڵی گەنمی پاش دەستی وەرزێر بچێنێتەوە، یا ئەگەر تاكوتەرا میوە بەدارێکەوە مابوو لێی بکاتەوە؛ هەروەها، دروستە هەر میوەی درەختێك کە کەوتبێتە ئەودیوی پەرژینی باخ یا دیوارەکەیەوە، هەڵی گرێو بیخوا.

## باسی هەڵگرتنی شتی داکەوتوو «لُقْطة»

«لُقطة» لەشەرعدا، بریتییە لە ماڵێك یا لە ئیختیساسێکی حورمەتو قیمەت‌دار کە بەهۆی بێ‌ئاگاییەوە بەجێ‌مابێ لە شوێنێکا کە شوێنی عادەتی ئەو شتە نەبێ، بەو شەرتە ئەو کەسەکە شتەکە ئەدۆزێتەوە خاوەنەکەی نەناسێو شتەکەیش بەهێز خۆی پێ نەپارێزرێ؛ کەواتە، شتێك کە با فڕەی‌دابێ بۆ ناو حەوشی ماڵێك، یاخود ئەمانەتێك کە دانرابێ لای کەسێكو ئەو کەسە بمرێو وەسیەت نەکا بۆ میراتگرەکانی، ئەوە بە ماڵی فەوتاو دائەنرێ.

سوننەتە هەڵگرتنی داکەوتوو بۆ هەرکەس کە باوەڕی بە ئەمانەتی خۆی بێ، بەڵکوو لەسەر فەرمودەی گەلێ لە زانایانی شەرع، ئەگەر ئەمکەسە لەو باوەڕەدا بوو ئەگەر ئەو شتە هەڵنەگرێ ئەفەوتێ، واجبە هەڵی بگرێ؛ بەڵێ، ئیمامی غەزالی فەرموویە: هەڵگرتنی ماڵی دۆزراوە بەو شەرتە واجبە ئەگەر ئەم هەڵگرتن‌و پاراستنەی زەحمەت

نەبێ لەسەر ئەو کەسە، ئەگینا پێویست نییە هەڵی‌بگرێ. سونەت نییە بۆ کەسێك متمانەی نەبێ بە ئەمینی خۆی، ماڵی دۆزراوە هەڵبگرێ؛ بەڵکوو بۆ ئینسانی فاسق کەراهەتی هەیە و شاهید گرتن لەسەر هەڵگرتنی ماڵی دۆزراوە، واجب نییە.

فەرموودەی راستتر، ئەوەیە دروستە شت هەڵگرتنی موسوڵمانی فاسق‌و منداڵ‌و ئەهلی زیممە لە وڵاتی موسوڵمانانندا، بەڵام فەرموودەی دیاریتر، ئەوەیە شتەکە لەدەستی ئەو فاسقە وەرئەگیرێ‌و ئەدرێتە دەستی ئینسانێکی دادپەروەر و متمانە ناکرێ بە بەیان‌و تەعریف کردنی ئەو شتە لەلایەن فاسقەکەوە، بەڵکوو ئەخرێتە ژێر چاودێرییەوە. فەرموودەی راستتر ئەوەیە سەرپەرشتی‌کەری کاروباری منداڵ شتی دۆزراوە لە دەستی منداڵ‌ئەسێنێ‌و خۆی ئاگاداری ئەکا؛ جا ئەگەر پاش هەڵدانی ناوونیشانی لەلایەن خۆی یا وەکیلیەوە، خاوەنی دەرنەکەوت، بەگوێرەی مەسڵەحەت ئەیکا بە ماڵی ئەو منداڵە وە ئەگەر کەمتەرخەمی کردو ماڵەکەی بەدەستی منداڵەکەوە هێشتەوە، ئەبێ بە زامنی ئەو ماڵە.

## باسی ماڵە هەڵگیراوەکە

ماڵی هەڵگیراو، ئەگەر حەیوانێك بێ کە موڵك بێت‌و خۆی نەدا بەدەستی وردە دڕوندەوە، لەبەرئەوە کە ئەوەندە هێزو توانای ببێ خۆی بپارێزێ، وەك ئەسپ‌و حوشترو ئێسترو گاجووتی بەهێز، یا بەهۆی راکردن‌و هەڵاتنەوە، وەك کەروێشك، یا بەهۆی فڕینەوە، وەك کۆتر، ئەوە ئەگەر لەبیابانا دۆزرایەوە، دروستە بۆ قازی‌و غەیری قازی دەستی بەسەرا بگرێ بەنیازی پاراستن‌و بۆ کردن بەموڵکیش.

هەر حەیوانێکیش خۆی پێ رانەگیرێ‌و گۆشتیشی بخورێ، وەك مەڕو بزن، ئەوە دروستە هەڵگرتنی بۆ ئەوە کە بکرێ بە موڵك، چ لە دێ‌و چ لە حەسارو بیابانا و ئەو کەسەی ئەم حەیوانە هەڵئەگرێ، ئارەزووی خۆیەتی لە هەرکام لەم سێ شتەدا:

یەکەم: ئەوە تا ساڵێك ناوونیشانی هەڵداو پاش ئەوە، بیکا بەموڵك؛

دووهەم: ئەوەیە دەس‌بەجێ بیفرۆشێ‌و قیمەتەکەی هەڵبگرێ، ئەوجا ناوونیشانی هەڵبدا؛

سێهەم: ئەوەیە ئێستە دەس‌بەجێ بیخواو قیمەتەکەی بیژێرێ تا هەرکاتێك کە خاوەنەکەی دەرئەکەوێ وە ئەگەر لەناو ئاوەدانییا هەڵیگرت، ئەوە بە ئارەزووی خۆیەتی ڕێگای یەکەم یا دووهەم بگرێ و بۆی نییە ڕێگای سێهەم بگرێ. دروستە بۆ ئینسان غەیری گیانلەبەریش هەڵبگرێ؛ جا ئەگەر دۆزراوەکە شتێ بوو کە زوو خراپ بێ، وەك چێشت‌و میوەی زۆر گەیشتوو، ئەوە دوو چارەی لەبەردەمایە؛ یا بیفرۆشێ‌و پارەکەی هەڵبگرێ‌و لەپاش ناوونیشان هەڵدان ئەگەر خاوەنەکەی دەرنەکەوت، بیکا بە موڵکی خۆی؛ دووهەم، ئەوەیە هەر ئێستە بیکا بە موڵك‌و بیخوا؛ بەڵێ، ئەگەر قابیلی ئەوەبوو بەدەس‌لێ‌دان چار بکرێت، وەك روتابێ کە بکرێ بە خورما، ئەوە ئەگەر قازانج لە فرۆشتنیا بوو، بیفرۆشێ وە ئەگەر قازانج لە وشك کردنەوەیا بوو وە کەسێك بە پیاوەتی وشکی ئەکردەوە، وشکی بکاتەوە، ئەگینا، هەندێکی لێ‌بفرۆشێ بۆ مەسرەفی وشك کردنەوەی.

جا ئەگەر کابرا ئەو ماڵە دۆزراوەی هەڵگرت بەنیازی ڕاگرتن‌و پاراستنی، ئەوە ئەمانەتە بەلایەوە، هەروەها هەر شتێکیش کە لێیەوە پەیدا ببێ، وەك شیرو دۆ و ڕۆن‌و بەچکەی ئەو حەیوانە؛ کەواتە، هەرکاتێك کەمتەرخەمی تیا کرد، ئەبێ بە زامنی وە ئەگەر لەم وەختەدا دایە دەستی قازی، واجبە لەسەر قازی وەری‌بگرێ بەشی زۆری زانایانی شەرع لەم‌وەختەدا بە واجبیان دانەناوە ناوونیشانی ماڵە دۆزراوەکە هەڵدات، بەڵام قسەی پشت پێ‌بەسراوتر ئەوەیە کە لەم وەختەیشا هەر لەبەر پاراستنی ماڵە دۆزراوەکە پێویستە ناوونیشانی هەڵبدات بۆ ئەوە کە ئەو ماڵە بەهۆی ناو نەبردنەوە نەفەوتێ، چونکە لەوانەیە خاوەنەکەی بەهۆی سەفەرەوە یا بەهۆی نەخۆشییەوە یا بەهۆی شتێکی‌ترەوە، بۆی نەکرێ بگەڕێ بەدوای شتە گوم‌بووەکەیداو باسی بکا و ماڵەکەی بفەوتێ؛ جا لەسەر ئەم فەرموودەیە، ئەگەر کابرای ماڵ دۆزەرەوە بێ‌دەنگ بوو و ماڵەکە فەوتا، ئەوە ئەبێ بە زامنی ئەو ماڵە.

لەم حاڵەدا کە کابرای ماڵ‌دۆزەرەوە بەنیازی پاراستن هەڵیگرتووە، بەپێی شەرع بە ئەمین دائەنرێ و تا خەیانەتی لێ‌نەکەوێتەوە، بە خائین ناناسرێ وە ئەگەر بەنیازی

خەیانەت هەڵیگرت، هەر لەو دەقیقەوە ئەبێ بە زامنو حەقی ئەوەی نامێنێ لەوەپاش ناوونیشانی هەڵداو پاشان بیکا بە موڵکی خۆی و لەکاتێکا کە بـە نـیازی پـاراستن هەڵیبگرێ، ئەو ماڵە ئەمانەتە لای چ لەپێش ناوونیشان هەڵدانو چ پاش ئەوە، تا ئەیکا بە موڵکی خۆی.

واجبە لەسەر ئەو کەسە کە ماڵێك ئەدۆزێتەوەو ئەیەوێ ناوونیشانی هەڵبدا، جینسو نەوعو سیفەتو ئەندازەی ئەو ماڵە بزانێ، هەروەها تـوورەکـەو دەرگـابینی، ئـەوجا ناوونیشانی هەڵبدا لە دەرگای مزگەوتو بازاڕو شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکدا، ڕۆژی دووجار تا ماوەی حەفتەیەك، پاشئەوە ڕۆژی جارێك تا ماوەی حەفتەیەك، ئـەوجا حەفتەی دووجار، پاش ئەوە مانگی جارێك تا ساڵەکە تەواو ئەبێ وە ئەگەر ئەم یەك ساڵی ناوونیشان هەڵدانە بەشبکا بەسەر دوزادە ساڵا، هەر ساڵێ مانگێك، ئـەوەیش دروستە.

بەڵێ واجب نییە دەنگ بەرز بکاتەوە، بەڵکوو پێویستە بەدەنگی عادەتی قسەبکا بۆ خەڵك کەوا شتێکیوای دۆزیوەتەوە، چونکە دەنگ بەرزکردنەوە بە خیلافی عادەت یا حەرامە یا کەراهەتی هەیە.

**بزانن!** ناوونیشان هەڵدان، کاتێك پێویستە ئەگەر کابرا لەو باوەڕەدا نەبێ بەهۆی ئەو جاڕدانەوە ستەمکارێك ماڵەکە داگیر ئەکا، یاخود خۆی تووشی دەردو مەینەتێك ئەبێ، ئەگینا حەرامەو واجبە لەسەری بێدەنگ، شتەکە هەڵبگرێ تا هەر کاتێك مـەیدانـی ناوونیشان هەڵدانی ئەبێ وە لەکاتی ناوونیشان هەڵدانیشا، ئـەبێ تـەنها هـەندێك لە ناوونیشانەکانی هەڵدا، ئەگینا یەکێکی درۆزن لەولاوە ڕاست ئەبێتەوەو بەدرۆ ئەیکا بە ماڵی خۆی. مەسرەفی ئەم ناوونیشان هەڵدانە لەسەر کابرا ماڵدۆزەرەوە نییە ئەگـەر بەنیازی پاراستن هەڵیگرتبێ، بەڵکوو لەسەر خاوەن ماڵەکە خۆیەتی؛ کەواتـە، ئـەبێ قازی مەسرەفی بۆ بکا لە «بیتُ المال» یا لەسەر خاوەنەکەی، جا ئەگەر ئەو شوێنە قازی تیا نەبوو، کابرای خۆی مەسرەفی بۆ بکا بەونیازەکە پاشان لە خاوەنەکەی بسێنێتەوە و شاهید لەسەر ئەو نیازەی بگرێ؛ مەسەلەی مەسرەف کردنیش بۆ ماڵە دۆزراوەکە ئەگەر

مەسرەفی بویێ، ئەویش هەر بەم جۆرەیە وە ئەگەر بە نیازی ئەوە شتەکەی هەڵگرتبوو کە بیکا بە موڵکی خۆی، ئەوە مەسرەفی ناوونیشان هەڵدانو مەسرەفی حەیوانەکـەیش لەپێش کردنیدا بە موڵك، هەر لەسەر کابرای مـاڵ دۆزەرەوەیـە. فـەموودەی راسـتتر، ئەوەیە شتی بێقابیلەت تا ساڵێك ناوونیشانی هەڵنادرێ، بەڵکوو هەر ئەوەندە پێویستە کە بەپێی عادەت، ناوونیشانی هەڵبدرێ تا ماوەیەك کە خاوەنەکەی دەسی لێ شوردبێتەوە.

کاتێك کە کابرای ماڵ دۆزەرەوە ویستی ماڵەکە بکا بە ماڵی خۆی، پاش تێپەڕبوونی ساڵەکە، ئەوە ئەبێ بەدەم بڵێ: وا ئەم ماڵەم کرد بە موڵکی خۆم و بەتەنها تێپەڕ بوونی ساڵەکە نابێ بە هی خۆی؛ جا ئەگەر پاش ئەوە خـاوەنەکـەی دەرکـەوت، ئـەوە لەم سوورەتەدا، ئەگەر خاوەن ماڵ داوای عەینی ماڵەکەی ئەکردو ئەمیش قیمەتەکەی ئەدایە، ئەوە ئارەزووی خاوەن ماڵەکە جێبەجێ ئەکرێ وە ئەگەر ئەو عەینە فەوتابوو، واجبە ئەم کابرا لە ماڵی وێنەدارا، وێنەی و لە ماڵی قیمەت بۆ دانراوا، قیمەتەکەی بداتەوە وە ئەگەر عەینی ماڵەکە مابوو، بەڵام بەهۆی شتێکەوە عەیبدار بووبوو، ئەوە خاوەنەکەی بۆی هەیە عەینەکەی بەرێتەوەو ناتەواوییەکەشی ببژێرێ بەوەی کە دۆزیویەتەوە.

ئەگەر کەسێك هاتو ئیددیعای موڵکییەتی ماڵێکی دۆزراوەی کرد و نە شاهیدی هەبوو و نە ناوونیشانی ماڵەکەی بەتەواوی هەڵدا، دروست نییە ئەوماڵەی بدرێتێ وە ئەگەر ناوونیشانی هەڵداو ماڵ دۆزەرەوەکە باوەڕی پێ کرد، دروستە ماڵەکەی بداتێ، بەڵام بەگوێرەی مەزهەبی ئیمام، واجب نییە وە ئەگەر پاش ئەوە کە ماڵەکەی دایەوە، یەکێکی تر هات ئیددیعای کرد کە هی ئەوەو شاهیدی هێنا، ئەوە لە کـابرای یـەکـەم ئەسەنرێتەوەو ئەدرێ‌بەم وە ئەگەر لای ئەو فەوتابوو، ئەوە خاوەن شاهیدەکە ئەتوانێ پێی ببژێرێ یاخود بیبژێرێ بە کابرای یەکەم و لە هەمووحاڵێکا مەسەلەکە ئەگەڕێتەوە سەر ئەو کابرای یەکەمە.

بزانن! هەڵگرتنی ماڵێکی فڕێدراو لە حەرەمی «مەککەی موکەڕڕەمە»دا دروست نییە بەبێ‌نیازی هیچ، یا بەنیازی کردنی بە هی خۆی؛ بەڵام بە نـیازی پـاراسـتنی تـا خاوەنەکەی پەیدا ئەبێ، ئەوە دروستە.

## باسی منداڵی فڕێدراو

فەرزی کیفایەیە هەڵگرتنی منداڵێکی بێ‌تەمیز یا خاوەن تەمیز، یا باڵغێکی شێت، ئەگەر لەو وڵاتەدا کەسێکی تر هەبێ هەڵی‌بگرێ، ئەگینا فەرزی عەینە لەبەر پاراستنی نەفسی ئەو منداڵە یا ئەو شێتە و ئەبێ ئەو کەسەی هەڵی ئەگرێ، شاهید بگرێ لەسەر ئەو هەڵگرتنە، نەوەك کابرا لەوەپاش ئیددیعای موڵکییەتی ئەو منداڵە هەڵگیراوە بکا.

حەقی ئەم هەڵگرتنە نییە مەگەر بۆ موسوڵمانێکی باڵغی عاقڵی ئازادی خاوەن فام وە ئەگەر دووکەس بەجارێك چوونە سەر منداڵێك، ئەوە واجبە لەسەر قازی لای ئەوەیانی دانێ کە مەسڵەحەتی مناڵەکەی تیابێ وە ئەگەر یەکێکیان پێش‌کەوت لە هەڵکرتنی مناڵەکەدا، ئەوە هەر حەقی ئەویانەیە وە ئەگەر بە یەکەوە هەڵیان‌گرت‌و هەردووکیشیان لایق بوون بۆ ئەوە، ئەوە فەرموودەی راستتر ئەوەیە لەم حاڵەدا دەوڵەمەند ئەخرێتە پێش فەقیرەوە و ئینسانی دین‌داری لەدینا گەیشتوو ئەخرێتە پێش کەسێکەوەکە نەزانرێ حاڵی چۆنە؛ ئەگەر دووکەسەکە یەك بوون لەم سیفەتانەدا، قورعە ئەخرێ لەبەینیانا.

ئەگەر شارستانییەك مناڵێکی هەڵگرت لەشارا، دروست نییە بیبا بۆ دەشت یابۆ لادێ، بەڵام ئەتوانێ بیبا بۆ شارێکی تر، بە تایبەتی، ئەگەر غەریب بێ، ئەتوانێ بیباتەوە بۆ شارەکەی خۆی وە ئەگەر لەدەشتا لە ناو دەوارا یاخود لەلادێدا دۆزییەوە، بۆی هەیە بیبا بۆ شار وە ئەگەر دەشتەکی مناڵێکی لە شارا هەڵگرت، حەقی نییە بیبا بۆ دەشت وە ئەگەر لە دەشتا هەڵیگرت، ئەوە لای خۆی ئەهێڵرێتەوە.

مەسرەفی ئەم مناڵە لە ماڵی تایبەتی خۆی ئەکرێ، ئەگەر بووی، وەك پارەیەك خرابێتە توورەکەیەك‌و لایا دانرابێ، یا کەل و پەلێك کە خرابێتە ژێری یا ژێر سەری یا هەرشتێك کە لەدەوروبەریا دانرابێ وە ئەگەر شتی وای نەبوو، مەسرەفی لە ماڵی گشتی بۆ ئەکرێ، وەك ماڵێك کە وەقف کرابێ لەسەر مناڵی فڕێدراو وە ئەگەر ماڵی‌وا نەبوو، مەسرەفی لەسەر «بیتُ المال»ی موسوڵمانانە؛ ئەگەر «بیتُ المال»یش رێك و پێك

نەبوو، مەسرەفی لەسەر دەوڵەمەندانی موسوڵمانانی ئەو شوێنەیە، بەڵام فەرز نییە لەسەریان بە پیاوەتی مەسرەفی بۆ بکەن، بەڵکوو ئەتوانن بە شێوەی قەرز مەسرەفی بۆ بکەن تا گەورە ئەبێ، ئەوجا لێی وەربگرنەوە؛ ئەو کەسەش کە منداڵەکە هەڵئەگرێ، دروستە بۆی هەر ماڵو پارەیەکی لەگەڵدابوو، هەڵی‌بگرێ و ئەبێ شاهید بگرێ لەسەر ئەو ماڵو پارەیە، بەڵام دروست نییە بە بێ ئیزنی قازی لەو ماڵە سەرف بکا بوێ.

ئەگەر کەسێك ئەو منداڵەی کرد بە منداڵی خۆی، ئەبێ بە منداڵی و ئەویش لایق ئەبێ بۆ پێ‌گەیاندنو پەروەردە کردنی؛ بەڵام ئەگەر ژنێك منداڵێکی کرد بە منداڵی خۆی، ئەوە بە بێ شاهید هێنان لەسەر ئەوە کە لەو بووە، نابێ بە منداڵی وە ئەگەر دوو ژن منداڵێکیان دایە پاڵ خۆیان و هیچیان شاهیدیان نەبوو، نادرێ بە کەسیان وە ئەگەر هەردووکیان شاهیدیان هەبوو، ئەوە نیشانی قیافەشوناس ئەدرێ، بە هەرکامیانی بدا، هی ئەویانەیە وە ئەگەر قیافەت شوناس نەبوو، یاخود نەیزانی هی کامیانە، رائەوەستین تا منداڵەکە باڵغ ئەبێ، ئەوجا خۆی بە منداڵی هەرکامیان دانا، ئەدرێتە پاڵ ئەویانە؛ جا کە بوو بە منداڵی یەکێکیان، ئەوە نەسەبی ئەلکێنرێ بە مێردی ئەو ژنەوە، بەو شەرتە شاهید، شاهیدی بدا کە ئەو منداڵە لەسەر «یاتاخی» ئەم کابرایە بووە و بە گوێرەی حیسو شەرعیش قابیل‌بێ لەو کابرایە بووبێو کابرایش ئینکاری نەکا.

## باسی موسوڵمانەتی و کافریی منداڵ

هەر منداڵێك لە وڵاتی ئیسلاما بدۆزرێتەوە، هەرچەند وڵاتەکە ئەهلی زیممەیشی تیابێ، یا لە وڵاتێکا بێ کە ئیسلام گرتبێتی بەزۆر، بەڵام لەدەستی کافرەکاندا هێشتبێتیەوە و موسوڵمانیشی تیابێ، ئەوە حوکم ئەکرێ بەوە کە موسوڵمانە وە ئەگەر منداڵەکە لە وڵاتی کافرانا دۆزرایەوە (دارُ الكُفْر)، ئەوە بە کافر ئەناسرێ، ئەگەر وڵاتەکە موسوڵمانی تیا نەبێ وە ئەگەر موسوڵمانی تیا بێ، بە موسوڵمان دائەنرێ. هەر منداڵێکی دۆزراوەکە بڕیار بدرێ موسوڵمانە بەهۆی ئەوەوە کە لە وڵاتی ئیسلاما دۆزرابێتەوە و پاشان کەسێکی ئەهلی زیممە شاهید بێنێ کەوا ئەو منداڵە هی ئەوە، ئەدرێ بە ئەو و نەسەبی

ئەلکێنرێ بەوەوە وە ئەگەر هەر داوای کرد، ئەوە ئەیدرێتێ، بەلاّم بە موسوڵمان ئەناسرێ.

دوو ڕێگای تر هەیە بۆ حوکم کردن بە موسوڵمانەتی منالّ؛

یەکەم، ئەوەتە منالّەکە لە دایك و باوکی موسوڵمان پەیدا بووبێ، واتە کاتێك کە نوتفەی منالّەکەی لە منالّدانی دایکیا جێگیر بووە، دایكو باوکی موسوڵمان بووبن وە ئەگەر لە دایكو باوکێکی کافر پەیدا بوو و پاشان یەکێکیان موسوڵمان بوو، ئەویش هەر بە موسوڵمان دائەنرێ؛ لە هەردوو سوورەتدا، ئەگەر منالّەکە پاش بالّغبوونی، کوفری بەدەما هات، بە «مُرتَدّ» ئەناسرێ.

دووهەم، ئەوەیە کەسێکی موسوڵمان منالێکی لە وڵاتی کافرانەوە بە دیل هێنابێ، ئەو منالّەش بەهۆی ئەم موسوڵمانەوە کە هێناویەتی، بە موسوڵمان دائەنرێ، بەو شەرتە کە باوكو دایکی لەگەڵ نەبێ، ئەگینا لەسەر دینی دایكو باوکیەتی.

## باسی ماڵی ئەمانەت (وديعة)

ئەو کەسەی ماڵی ئەمانەتی پێ نەپارێزرێ حەرامە وەریبگری وە ئەگەر بتوانێ، بەلاّم باوەڕی بەوە نەبێ کە خۆی ئەمینە، کەراهەتی هەیە وەری بگرێ وە ئەگەر بتوانێ بیپارێزێو باوەڕیشی بە ئەمێنی خۆی هەبێ، ئەوە سونەتە وەریبگرێ، هەرچەند کرێیش لە خاوەن ماڵەکە وەربگرێ بۆ خۆیو ئەو شوێنەی ماڵەکەی تیا دائەنێ، چونکە فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە دروستە کرێوەرگرتن هەتاوەکوو لەسەر واجبی عەینیش، وەکوو ڕزگار کردنی کەسێك لە ئاووئاگر و فێرکردنی سوورەتی «فاتِحة».

ئەرکانی ئەمانەت دانان، چوارە؛

یەکەم، ماڵی بەئەمانەت دانراو؛

دووهەم، ئەو کەسە کە ماڵ بە ئەمانەت دائەنێ؛

سێهەم، ئەو کەسە کە ئەمانەتەکەی لا دائەنرێ؛

چوارەم، ئەو لەفزە کە بەدەمادێت لەکاتێکا کە کابرای خاوەن ماڵ ماڵەکەی بە ئەمانەت لای کەسێك دائەنێ.

شەرتی ماڵی بە ئەمانەت دانراو، ئەوەیە ماڵێکی موحتەرەم بێ، خواه قیمەتی ببێ، وەك تەغارێ گەنم، یا نەیبێ، وەك دەنکێ گەنم، یا ئیختیساسات بێ، وەك تەپاڵەو سەگی پاس‌و سەگی راو، نەك سەگی خوێری‌و هۆی رابواردنی حەرام، ئەوانە بەئەمانەت دانانرێن‌و بەپێی شەرع، پاراستنیان واجب نییە شەرتی ماڵ بە ئەمانەت دانەرو ماڵ بە ئەمانەت لادانراویش، وەك شەرتی وەکیل گرو وەکیل وایە؛ لە واقیعدا، کابرای خاوەن ماڵ کابرای ماڵ لادانراوی کردووە بە وەکیلی خۆی بۆ پاراستنی ماڵەکەی؛ کەواتە، ئەمانەت دانان دروست نییە لەلایەن منداڵ‌و شێت‌و کەسێکەوە کە لەبەر نەفامی حیجری لەسەر دانرابێ وە ئەگەر کەسێك لەمانە شتێکی هێنا بۆ ئەوە بە ئەمانەت لای کەسێك دای‌بنێ، دروست نییە وەری بگری لێی وە ئەگەروەری گرت، ئەبێ بە زامنی، چونکە وەرگرتن لەم جۆرە کەسانە بەتاڵە، هەروەکوو چۆن ئەگەر کەسێك بە ناوی بەکرێ‌گرتنەوە شتێك لە کوڕ یا ژنی خاوەنی ئەو شتە وەربگرێ، ئەویش ئەبێ بە زامنی ئەو شتە، چونکە ئەو ئیشە لە راستیدا بەکرێ وەرگرتن نییەو شتێکی بەتاڵە، ئەم سوورەتەیش بە ئەمانەت دانان نییە.

هەروەها ئەگەر پیاوێك شتێکی دایە دەستی منداڵێك یا شێتێك و ماڵەکە فەوتا، ئەوە نابێ بە زامنی ئەو ماڵە هەرچەند کەمتەرخەمیشی کردبێ لە پاس کردنی ئەو ماڵەدا، چونکە شت دانە دەستی منداڵ دروست نییە، بەڵام ئەگەر منداڵەکە، خۆی دا لە شتەکەو شکاندی، ئەوە ئەبێ بە زامن، چونکە بووە بەهۆی راستەوخۆی فەوتانی ئەو شتە.

سیغەی ماڵ بەئەمانەت دانانیش، ئەبێ لەفزێك بێ ئەوە بگەیەنێ کە ماڵەکە دانراوەلای کابرای ماڵ‌بەئەمانەت لادانراو، یاخود ئیشارەتێك بێ کە مەعناکەی دیاری بێ، وەك ئەوە کە کابرا بڵێت: وا ئەم ماڵەم دایە دەستی تۆ بەئەمانەت، ئیتر فەرموودەی راستتر ئەوەیە قەبووڵ کردن بە لەفز شەرت نییە لە لایەن ئەو کەسەوە کە ماڵەکەی لا دانراوە، بەڵکوو یا بە لەفز قەبووڵی بکا یاخود ماڵەکە لەدەست کابرا وەربگرێ. هەروەها، ئەگەر کابرای ئەمیندار وتی: ئەو ماڵەم بدەرێ بەئەمانەت بۆت هەڵبگرم و خاوەن ماڵەکەیش بەبێ‌قسە ماڵەکەی تەسلیم کرد، ئەمەیش دروستەو بە ئەمانەتی شەرعی دائەنرێ.

ماڵ وەرگرتنی ئەو کەسەی ماڵی بەئەمانەت لادائەنرێ، جارجار راستییەو جارجار حوکمییە؛ مەسەلا، ئەگەر کەسێك ماڵێکی هێنا بۆلای کەسێك‌و ئەویش پێی‌وت: دای‌بنێ لەوێدا و کابرا داینا، ئەوە حوکمی وەرگرتنی هەیە؛ هەروەها، خاوەن دووکانێك کە دەرگای دووکانەکەی کرابێتەوە، ئەگەر بە کەسێکی وت: ئاگات لەو دووکانەم بێ، ئەویش بڵێ: باشە، ئەمە وەك ئەوە وایە کە دووکانەکەی لە خاوەنەکەی وەرگرتبێ؛ جا ئەگەر ئەم شەخسە تەماشای ئەو دووکانە نەکاو شتێکی لێ بفەوتێ، ئەبێ بە زامنی، بەڵام ئەگەر دەرگای دووکانەکە داخرابوو و وتی بە کەسێك: ئاگات لەو دووکانە بێ، ئەویش وتی: باشە و بێ‌ئاگا بوو لێی تادەرگاکەی کرایەوەو شتێکی لێ‌دزرا، ئەوە نابێ بە زامن، چونکە مادام دەرگاکەی داخراو بووە، نەدراوەتە دەستی کابراو حوکمی وەرگرتنی نییە؛ بەڵێ، ئەم کەسە گوناهبار ئەبێ، چونکە خاوەن دووکانەکەی دەس خەڕۆ کردووە.

ئەگەر منداڵێکی خاوەن تەمیز مەڕی کەسێکی برد بۆلای شوانێك‌و وتی: ئەمە، مەڕی فڵانکەسە ناردوویەتی بیلەوەڕێنی بۆی، شوانەکەیش وتی: باشە با بلەوەڕێ، ئەمەیش حوکمی وەرگرتنی ئەو شوانەی هەیە لە خاوەن‌ماڵەکە، چونکە ئەو منداڵە تەنها قسەکەی گەیاندووە.

هەروەها ئەگەر کەسێك بە کەسێکی وت: ئەو ماڵە لەلای من دابنێ‌و ئەویش داینا، ئەمەیش حوکمی وەرگرتنی هەیە وە ئەگەر ئەمیندارەکە نە بە دەم قەبووڵی کرد و نە ماڵەکەی بەراستی وەرگرت و نە شتێکی وایش هەبوو کە حوکمی وەرگرتنی ببێ، ئەوە بێ‌سوودە؛ مەسەلا، کەسێك شتێکی دانا لای کەسێك‌و وتی: ئەم ماڵەم بۆ هەڵبگرە، ئەویش قسەی نەکرد و لەپاش رۆیشتنی ئەو، خاوەن ماڵەکە شتەکەی بەجێ هێشت‌و فەوتا، ئەوە نابێ بە زامن، بەڵام ئەم کەسە گوناهبار ئەبێ، لەبەرئەوە کە بە ئاشکرا شتەکەی نەداوەتە دواوەو خاوەن‌ماڵەکە دەس‌خەڕۆ بووە پێی.

**بزانن!** حوکمی ماڵی بەئەمانەت دانراوی هەیە بەچکەی حەیوانێکی بە ئەمانەت دانراو کە ئاوس بێ‌و لای ئەمین‌دارەکە بزێ، بەڵام ئەو بەچکەیە کە لە پێش دانانی دایکەکەیا لەدایك بووبێ، ئەوە پێویستە خاوەنەکەی بە تایبەتی ناوی ببا، ئەگینا بە ماڵی بەئەمانەت دانراو ناناسرێت.

ئەمانەت تەواو ئەبێ بە مردنی خاوەن ماڵو ماڵ لەلادانراوو بـە شـێت بـوونیانو بێهۆش کەوتنیان بە جۆرێکیوا کە وەختی نوێژێکی فەرز بگرێتـەوە، هـەروەها بـە دانانی حیجر لەسەر ماڵ بەئەمانەت لا دانراوەکە بەهۆی لات کەوتنیەوە و بـەوە کـە خاوەن ماڵەکە عەزلی بکا لە ئەمینداری، یا کابرا خۆی عەزل بکـا و بـەوە کـە بـەبێ مەبەستێکی شەرعی ئینکاری ئەمانەتەکە بکا و بە خەیانەت کردن لە ماڵەکـەدا و بـە دەرچوونی ماڵەکە لە موڵکی خاوەنەکەی بەهۆی فرۆشتنی یا بەخشینیەوە ـمەسەلاـ لەمکاتەدا پێویستە کابرای ماڵ بەئەمانەت لادانراو دەس بەجێ ئەو ماڵە بنێرێتەوە بـۆ ئەوکەسەکە بووە بە ماڵی ـهەرچەند ئەوکەسە داوایشی نەکاـ وە ئەگەر دیار نەبوو، بیبا بۆلای قازی.

لەهەموو کاتێکا دروستە بۆ خاوەن ماڵ ئەمانەتەکە وەربگرێتەوە لەوکەسەی دایناوە لای و بۆ ئەویش دروستە هەر کاتێك ئارەزووی لێ بـوو مـاڵەکـە بـنێرێتـە دواوەبـۆ خاوەنەکەی.

ئەسڵی دەست لە ماڵی ئەمانەتیدا دەستی ئەمانەتە و ماڵ لادانراو بەبێ کەمتەرخەمیو خەیانەت کردن، زامن نابێ؛ بەڵێ، ئەبێ بە زامن بەهۆی چەند شتێکەوە، وەك ئەوەکە بە بێ ئیزنی خاوەن ماڵو بە بێ بیانوویەکی وەك سەفەرکردنو نەخۆش کەوتنو شتیوا، ماڵەکە بداتە دەستی کەسێکیتر، جا لەمسوورەتەدا کە دایە دەستی کەسێکیتر، ئەگەر لای ئەو کەسە فەوتا، ئەوە بڕیار ئەگەڕێتەوە سەر ئەو، هەرچەند خاوەن ماڵ ئەتوانێ داوای لە هەرکامیان بکا.

بزانن هیچ شتێك ڕێناگرێ لەوەکە ئەوکەسەی ماڵەکەی بە ئـەمانەت لادانـراوە داوای یارمەتی لە کەسێکیتر بکا بۆ ئەوەکە ماڵە ئەمانەتییەکـەی بـۆ هـەڵبگـرێ تـا ئەیباتەوە بۆ ماڵەوە. هەرکاتێك کابرای ماڵ بەئەمانەت لادانراو چوو بۆ سەفەرێك، ئەبێ ماڵەکە بداتەوە بە خاوەنەکەی، ئەگەر خۆی حازر بوو، ئەگینا لای وەکیلەکەی دایبنێ وە ئەگەر نە خۆی دیار بوو نە وەکیلیشی هەبوو، بیبا بۆلای قازی وە ئەگەر ئەو شوێنە قازیی تیا نەبوو، بیداتە دەستی کەسێکی ئەمین. لەم زەمانەدا، ئەوە چاکـترە بـیداتـە

دەستی کەسێکی ئەمین لەوە کە بیبا بۆ قازی؛ بەڵام کە تەسلیمی کەسە ئەمینەکە کـرا، ئەبێ شاهید بگرێ لەسەر ئەو تەسلیم کردنە؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو کابرای ماڵ بەئەمانەت لادانراوە ماڵەکەی شاردەوە لەشوێنێکا و خەبەری دا بە کەسێکی باوەڕ پێ کراو کە لەو شوێنەدا بێ، ئەوە هیچی ناکەوێتە ئەستۆو زامن نابێ.

وە ئەگەر ئەو کەسەی ماڵی بە ئەمانەت لادانراوە ماڵەکەی لەگەڵ خۆیدا بـرد بـۆ سەفەر، ئەوە زامن ئەبێ، مەگەر لە شوێنەکەی خۆیدا ئاگرێك کەوتبێتـەوە یـا لافـاو هەڵسابێ، یا خانووەکەی نزیکە رووخان بێ و کابرای ئەمین چاری نەبێ و کەسی وای دەس نەکەوێ ماڵەکەی بداتە دەست و هەرکاتێ کە نەخۆش کەوت بە نەخۆشییەکی وا کە ترسی مردنی لێ بکرێ، ئەبێ ماڵەکە بنێرێتەوە بۆ خاوەنەکەی یا بۆ وەکیلی یا بیداتە دەستی پیاوێکی ئەمین و شاهیدی لێ بگرێ، ئەگەر مەجالی ئەمانەی نەبوو، وەسیەت بکا بۆ میراتگرەکانی کە ئەم ماڵە، ماڵی فلانکەسە، ئەگینا زامن ئەبێ، مەگەر مەیدانی هیچ شتێکی نەبێ، وەك ئەوە کە کوت و پڕ بمرێ.

ماڵ بە ئەمانەت لادانراو، زامن ئەبێ بەوە کە ماڵەکە بگوێزێتەوە بۆ شوێنێ کە وەك شوێنی پێشووی مەحکەم نەبێ، یاخود شتێ بێ بەسەریا بۆ فەوتاندنی و ئەمیش بتوانێ نەیەڵێ و گوێ نەداتێ؛ کەواتە، ئەگەر حەیوانی بە ئەمانەت دانراو خەریك بێ مردارەوە بێ، واجبە لەسەر کابرای بەئەمانەت لادانراو سەری بـبڕێ و شـاهید بگـرێ لەسـەر سەبەبی سەربڕینەکەی، ئەگەر لەگەڵ بوونی شاهیددا سەری نەبڕێ ئەبێ بە زامنی ئەو حیوانە، چونکە موبالات نەکردن بەوەزعی وا، بەخەیانەت دائەنرێ؛ بەڵێ، ئەگەر کەس نەبوو بیگرێ بە شاهید و ئەترسا لەوە کە کابرای خاوەن ماڵ باوەڕی پێ نەکا، ئەوە لەو حاڵەدا ئەگەر سەری نەبڕێ، زامن نابێ.

وە ئەگەر کەسێك وڵاخێکی بەئەمانەت دانا لای کەسێك و ئەو کەسەیش ئـاڵفـی نەدایە، ئەوە زامن ئەبێ، مەگەر کابرا وتبێتی: ئاڵفی مەدەرێ، ئەوە لەم حاڵەدا ئەو زامن نابێ، بەڵام بۆی هەیە بچێتە لای قازی شکـاتی لابکـا کـەوا خـاوەنی ئـەو مـاڵە کـە بەئەمانەت دانراوە لام، نایەڵێ ئاڵف بدەم بەو بێ زمانە، بۆ ئەوە کە قازی ناچاری بکا

ئالف بدا بە حەیوانەکە یا ڕێگای ئەو کابرا بداکە حەیوانەکەی بەئەمانەت لاداناوە ئالفی بداتێ، ئەگینا زۆر گوناهبار ئەبێ.

ئەگەر کەسێك حەیوانێکی دایە دەستی کەسێك بەئەمانەت، ئەوە ئەگەر ئالفیشی لەگەڵدا دایە بۆ حەیوانەکە، ئەوە باشە وە ئەگەر نەیدایە، پێویستە بچێتە سەر خاوەن حەیوانەکە یا وەکیلەکەی وە ئەگەر ئەوان نەبوون، بچێتە لای قازی، ئەگەر ئەویش نەبوو، لە ماڵی خۆی مەسرەفی بۆ بکا بە نیازی گەڕانەوە وە ئەگەر لەتوانادا بوو، شاهید بگرێ لەسەر ئەوەکە نیازی داواکردنەوەی ئەو مەسرەفەی بووە وە ئەگەر شاهید نەبوو، قەیدی نییەو هەر ئەوەندە مەبەستە کە خۆی نیازی داواکردنەوەی ئەو مەسرەفەی بووە.

ئەگەر لەو شوێنەدا عادەت وابوو وڵاخ بە بێ‌شوان بەرەڵڵا ئەکرا بۆ لەوەڕان و ئەمیش لەسەر ئەو ئوسووڵە وڵاخەکەی بەرەڵڵاکردو فەوتا، ئەوە زامن نابێ، مادام وڵاخ بەرەڵڵا کردنەکەی لەعادەت دەرنەچێ وە ئەگەر وڵاخەکەی لەگەڵ کەسێکی ئەمینی باوەڕ پێ‌کراودا نارد بۆ سەرئاو و لە ڕێگەدا وڵاخەکە فەوتا، ئەوە زامن نابێ، بەڵام ئەگەر بەمناڵێکا ناردی بۆ ئاو خواردنەوە و لەڕێگەدا وڵاخەکەیان لێ‌سەند، ئەوە زامن ئەبێ.

لەو شتانەیە کە ئەبن بەهۆی زامن بوونی کەسێ کە ماڵی بە ئەمانەت لا دانرابێ، ئەمە کە کابرای ئەمین‌دار لابدا لەو پارێزگارییە کە بەپێی شەرع ئەمری پێ‌کراوە و بەهۆی ئەوەوە، ئەو ماڵە بفەوتێ؛ کەواتە، واجبە لەسەری ئەگەر جلی خوری، وەك فاسۆن‌و شتی‌وای درایە دەست بۆ پاراستنی، بەین بەین بیداتە بەرهەتاو، یا بەعادەت بیکاتە بەری بۆ ئەوە کە مۆرانە نەیخوا.

ئەگەر کەسێك سندووقێکی دایە دەست کەسێك‌و پێی‌وت: لەسەری مەنوە و ئەویش لەسەری نووست‌و شکا، ئەوە ئەبێ بە زامنی، ئەگەر لەبەر قورسی کابرا شکابێ، هەروەها ئەبێ بە زامنی ئەو شتانە کە لەناو سندووقەکەدان، ئەگەر بەهۆی نووستنەوە لەسەر سندووقەکە فەوتان؛ بەڵام ئەگەر دز هاتە ماڵەوەو کەل‌وپەلی ناو سندووقەکەی بردو ماڵەکەیش مەحکەم بوو، ئەوە زامن نابێ، چونکە وەزعی کابرای ماڵ لادانراو گەلێ باشتر بووە بۆ پاراستنی ماڵەکە لەوەی کە کابرای خاوەن‌ماڵ ویستوویەتی.

هەروەها ئەگەر وتی: دوو قوفڵ مەدە لەو دەرگایە، ئەویش دوو قوفڵی لێداو دزکردیەوەو شتێکی برد، هەر زامن نابێ، چونکە دوو قوفڵ لە قوفڵێك قایمترە وە ئەگەر هەندێك پارەی دایەدەستیو وتی: بیبەسە قۆڵی کراسەکەت، ئەویش لەناو دەستیا رایگـرتو فەوتا، ئەمە ئەگەر بە هۆی نووستن یابێ ئاگاییەوە بوو، ئەوە زامن ئەبێ، چونکە ئەگەر لەقۆڵیا بوایە، نەئەفەوتا وە ئەگەر کەسێك بەزۆر لێیسەندبوو، ئەوە زامن نابێ، چونکە ئەوکەسە کە لە دەستی دەرهێنا، ئەیتوانی لە قۆڵیشی دەربێنێ وە ئەگەر وتی: بـیبەسە بەقۆڵتەوە، ئەویش خستیە باخەڵی و فەوتا، ئەوە زامن نابێ. وە ئەگەر بە پێچەوانـەی ئەمەوە بوو زامن ئەبێ

ئەگەر کەسێك لە بازارا چەند پەنجاییەکی دایە دەستی کەسێك و باسی چۆنیەتی پاراستنی نەکرد ئەویش بەستنی بە قۆڵیەوە و گرتنی بە دەستیەوە، یا خود خستنیە ناو کیسەیەکەوە و نایە بەر باخەڵی و فەوتا ئەوە زامن نابێ وە ئەگەر لەدەستیا رایگرتو فەوتا، ئەوە ئەگەر لەبەر بێئاگایی فەوتابوو، ئەوە زامن ئەبێ وە ئەگەر سـتەمکارێك بەزۆر لێی سەند، ئەوە زامن نابێ وە ئەگەر وتی: بیبە بۆ ماڵەوەو هەڵیبگرە، ئەوە ئەگەر بە بێعوزر تەفرەی هاتنەوەی خۆیدا بۆ ماڵەوەو فەوتا، زامن ئەبێ، ئەگینا زامن نابێ.

لە ئەسبابی زامن بوونە دانانی ئەو ماڵە لە غەیری جێگەی لایقی پـاراسـتنی ئـەو شتەدا، یاخود دزێك ئاگادار بکا لە شوێنی ئەو شتە، یاخود خەبەر بدا بەوکەسانە کە موسادەرەی ئەو جۆرە ماڵە ئەکەن، هەروەها ئەگەر زۆردارێك هات رووتی بکاتەوە، ئەمیش لەترسانا ماڵەکەی فڕێدایە شوێنێك کە شوێنی پاراستنی ئەو جۆرە ماڵە نەبوو و ماڵەکە فەوتا لەو جێگەیەدا، ئەوە زامن ئەبێ، چونکە ئەگەر بەلای خۆیەوە بوایەو ببرایە، زۆر چاکتر بوو لەوە کە لەو شوێنەدا بـفەوتێ، چـونکە دیـار ئـەبوو و ئـەزانـرا کـێ بردوویەتی تا رۆژی خـۆی وە ئـەگـەر کـەسێك کـلیلی دووکـانەکـەی دایـەدەستی کەسێکیترو ئەمیش دای بە یەکێکیترو ئەم یەکە دەرگاکەی کردەوەو هـەندێ مـاڵ فەوتا، ئەوە ئەم کەسە زامن نابێ؛ بەڵێ، ئەگەر کلیلەکەی لەسـەر ئـەو ئـەساسە پـێدا وتبووی: ئاگات لە ماڵەکەم بێ و کلیلەکەشت با لابێ بۆ وەختی ناچاری، وەك ئاگرێك یا

ئاوێك یاشتێكی وا، كەچی ئەویش كلیلەكە بداتە دەستی كەسێكی ترو هەندێك لەو ماڵە بفەوتێ، ئەوە زامن ئەبێ.

وە ئەگەر زۆردارێك زۆری لێ كردو ئەمیش ئەمانەتەكەی دایە دەستی، ئەوە زامن ئەبێ، بەڵام لەپاش ئەوە كە بژاردی بۆ خاوەنەكەی، ئەتوانێ بچێتەسەر زۆردارەكـەو لێی بسێنێتەوە وە ئەگەر ئەمكەسە ماڵەكەی نەدایە دەستی زۆردارەكە، بەڵكوو ئەو هەر بەزۆری خۆی لێی سەند، ئەوە بە هیچ جۆری زامن نابێ و واجبە لەسەر كابرای ماڵ بە ئەمانەت لادانراو، بە هەرجۆرێ كە پێی بكرێ، دەفعی زۆردار بكـا لەو مـاڵە كـە لای دانراوە، هەتاوەكوو بە عەیب‌دار كردنی ماڵەكەیش وە ئەگەر رزگار نەئەبوو لە دەستی زۆردار بە سوێند خواردن نەبێ، ئەبێ سوێند بخوا كە ئەو ماڵەی لا نییە، بەڵام پێویستە پاشان كەفارەتی سوێندەكە بدا، چونكە سوێندەكەی درۆبووەو كەوتووە.

هەروەها، لە ئەسبابی زامن بوونی ئـینسانی مـاڵ بـەئەمانەت لادانـراوە، قـازانـج وەرگرتن لەو ماڵە؛ مەسەلا، ئەگەر جل بێ لەبەری بكا وە ئەگەر وڵاخ بێ سواری ببێ، هەتاوەكوو تەنها بەوەندەیش كە جلەكە لە سندووق دەربهێنێ بە نیازی لەبەركردن، یا پارەكە لەكیسەكەی دەربهێنێ بە نیازی خەرج كردن؛ لە سوورەتی یەكەمو دووهەمدا، لەبەرئەوە كە ماڵە ئەمانەتییەكەی بەكارهێناوە بۆخۆی و لە حاڵەتی سێهەمو چوارەمدا، ئەبێ بە زامنی ئەو ئەندازەیەی كە دەسی لێ داوە؛ كەواتە، ئەگەر كەسێك دوو پەنجایی لە كیسەیەك پارەی ئەمانەت دەرهێنا، ئەوە هەر زامنی ئەو دوو پەنجاییە ئەبێ، مەگـەر لەحاڵێكا كە بەهۆی دەرهێنانی ئەو ئەندارە پاریەوە ئەویشی بفەوتێ، وەك ئـەوە كـە لەكاتی دەرهێنانی دوو پەنجاییەكەدا دزێك بە جێگەی پارەكە بزانێو پاشان بیدزێ، ئەوە لەم حاڵەدا ئەبێ بە زامنی هەمووی، هەتاوەكوو ئـەگـەر دوو پـەنجاییەكـەشی خستەوە جێی خۆی، بـەوە رزگـاری نـابێ لە زەمـانەتەكـە تـا نـەیداتـەوە دەسـتی خاوەنەكەی.

زەمانەت لە شتی وێنەدارا، بەشتێكی وەك خۆی و لە شتی قیمەت بـۆدانـراوا، بـە قیمەتەكـەی دائـەنرێ وە ئـەگـەر ئـەو شـتە كـە كـابرای مـاڵ بـەئەمانەت لادانـراو

وەری‌گرتووەو بووە بە زامنی، بەرگێك بێ لەبەری کردبێ یا وڵاخێك بێ‌سواری بووبێ، ئەوە جگە لە زامن بوونی، کرێی ماوەی بەکارهێنانەکەشی ئەکەوێتەسەر.

ئەگەر کابرای ماڵ بەئەمانەت لادانراو نیازی کرد ماڵەکە لە جێگەکەی دەربهێنێ، بەڵام دەری‌نەهێنا، ئەوە نابێ بە زامنی وە ئەگەر ئەو ماڵە ئەمانەتییەی تێکەڵی ماڵی خۆی کرد بە جۆرێك کە لەیەك جیا نەکرێنەوە، ئەبێ بە زامنی هەمووی؛ هەروەها، ئەگەر دوو ماڵی ئەمانەتی تێکەڵی یەك کرد بە جۆرێك کە لەیەك جیا نەکرێتەوە وە فەرقی نییە هەردوو ماڵەکە هی یەك کەس بن یا هی دووکەس بن.

کابرای ماڵ بەئەمانەت لادانراو کە بوو بە زامن، لەو زەمانەتە دەرناچێ بەهۆی ئەوەوە کە دەس بەرداری کەمتەرخەمی ببێ دەربارەی ماڵەکە، وەك چۆن ئەگەر کابرای خاوەن‌ماڵ داوای ماڵەکەی بکاتەوەو کابرای بەئەمانەت لادانراو ئینکاری بکاو لە پاشان بێتەوە و پێ لە ماڵەکە بنێ، ئەمیش بەو ئینکار کردنە ئەبێ بەزامنی ئەو ماڵەو بە پێ‌لێنانەکە نابێتەوە بە ئەمین‌و لە زەمانەت دەرناچێ؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش خەیانەت‌و زەمانەت، خاوەن ماڵەکە سەر لەنوێ کابرای کردەوە بە ئەمینی خۆی لەسەر ئەو ماڵە، یاخود بە دەم، ئازادی کرد لە خەیانەتە پێشووەکە، ئەوە لە زەمانەت دەرئەچێ، بەڵام ئەگەر لە پێش خەیانەتا، خاوەن ماڵەکە بڵێت: وا تۆم ئازاد کرد لە هەرچی هۆی خەیانەتە، ئەوە بەوە ئازاد نابێ، چونکە ئازاد کردن لە شتێ کە هێشتا پەیدا نەبووبێ، مەعنای نییە، جا ئەگەر کابرا ئەیەوێ ئەو شەخسە تووشی خەیانەت‌و زەمانەت نەبێ، هەر لە ئەوەڵەوە رێگای بدا تەسەڕوف لەماڵەکەیا بکا، بۆ ئەوە هەرچی کرد لەسەر ئیزنی خاوەن ماڵەکە بووبێ.

هەر وەختێ خاوەن‌ماڵ داوای ماڵەکەی کردەوە لەو کابراکە بەئەمانەت دانراوە لای، واجبە لەسەر ئەم، دەس‌بەجێ بیداتەوە وە ئەگەر بێ‌عوزری شەرعی تەفرەی‌دا، ئەبێ بە زامنی وە ئەگەر ئیددیعای کرد کەوا ماڵەکە فەوتاوەو نەیوت بەهۆی چییەوە فەوتاوە، یاخود باسی هۆیەکی نهێنی ئەو فەوتانەی کرد، ئەوە بە سوێند باوەری پێ‌ئەکرێ وە ئەگەر باسی هۆیەکی دیاری کرد، وەك ئاگر یا لافاو، ئەوە ئەگەر ئەو ئاگرە یا ئەو لافاوە

دیار بوو ئەو شوێنەی گرتووەتەوە، بە بێ سوێند باوەڕی پێ ئەکرێ وە ئەگەر دیار نەبوو ئەو شوێنەی گرتبێتەوە، باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند وە ئەگەر ئەو هۆیە کە ئەو باسی ئەکرد دیار نەبوو لەناو خەڵکا، پێویستە لەپێشا بە شاهید ئیسپاتی بکا کە ئەو هـۆیـە رووی‌داوە، ئەوجا سوێند بخوا لەسەر ئەوە کە ئەو ماڵە بەوهۆیە فەوتاوە.

وە ئەگەر ئیددیعای کرد کەوا ماڵەکەی ناردووەتەوە بۆ لای ئەوکەسە کەکردبووی بە ئەمین و ماڵەکەی لادانابوو، ئەوە باوەڕی پێ ئەکرێ بەسوێند، یا ئەگەر ئیددیعای کرد کە بۆلای غەیری ئەوکەسەی ناردووەتەوە، مەسەلا، وتی: داومەتەوە بە میراتگری ئەو کەسە کە دایناو لام، یا ئەگەر میراتگری ئەم، وتی: بردوومەتەوە بۆ خاوەنەکەی، یاخود کەسێك لەکاتی سەفەرێکا ماڵێکی لای کابرایەك دانابوو بەئەمانەت وە ئەوکەسە ئیددیعای کرد کەوا ناردوویەتیەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەوە لە هەموو ئەم سـوورەتانەدا پێویستە ئیددیعاکەرەکە بە شاهید ئیسپاتی ئیددیعاکەی بکا، ئەگینا باوەڕ بە سوێندی خاوەن ماڵەکە ئەکرێ.

## باسی دابەش کردنی دەسکەوتی موسوڵمانان (فَيْىء)

«فَيْىء» لەشەرعا، بریتییە لە ماڵێك کە بەبێ شەڕو شۆڕ دەسی موسوڵمانان کەوتبێ لەلایەن کافرانەوە، وەك ماڵی سەرانەو خەرجی بازرگانی، دەیەك بێ یا زیاتر و هەر ماڵێ کە کافران بەجێی بهێڵن لەترسی دوژمنێکی خۆیان و ماڵی هەرکافرێکی ئەهلی زیممە کە بمرێ‌و میراتبەری ماڵ‌داگیرکەری نەبێ، یەعنی هەر میراتبەری نەبێ، یـاخود میراتبەرەکەی بەشێکی‌وای ببێ کە هەموو ماڵەکە نەگرێتەوە و ماڵی لە دین‌هەڵگەڕاو (مُرتَد)ێکی‌وا کە کوژرابێ یا مردبێ.

ئەم‌ماڵانە کە باسمان کردن، هەموو ئەکرێن بە پێنج بەشەوە، بەشی یەکەمی تێکەڵاوە لە بەینی پێنج خاوەن‌بەشا:

یەکەم: «مَصالِح»ی ئیسلامی، وەك گرتنی سنووری وڵاتی ئیسلام بە چەك‌و سوپاو هەرچی بە گوێرەی رۆژ پێویست بێ بۆ خۆڕاگرتن‌و وڵات پاراستن لە شەڕی بێگانە و

بۆ مەسرەفی ئەو قازییانە کە لە دادگای شەرعدا ئیش ئەکەن بۆ بڕینەوەی دەعواو هەراو ناکۆکیی ناو موسوڵمانان و بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام حوکم ئەدەن، بەڵام مەسرەفی قازیی سوپاییو پێشنوێژو بانگدەری سوپا، ئەوە لەو چوار پێنجیەکەکەی تردایە؛ هەروەها ئەم پێنجیەکی بەشی مەسالیحی موسوڵمانانە، بۆ ئەوکەسانەشەکە مەشغووڵن بەدەرسی قورئانو حەدیسەوە و بە دەرسی علوومی دینییەوە، چ لە بابەتە موهیممەکانی وەك علمی فیقھ و ئوسولی فیقھ و ئوسولی دینو تەفسیر و ئوسولی حەدیس، وە چ لە بابەتە ناموهیممەکانی کە بە سەرەتا دائەنرێن بۆ عیلمە موهیممەکان، وەك سەرف و نەحو و زوبانو عەرووز و قافیە و ئاداب و بەلاغەو مەنتیقو تاریخو ئینشا و غەیری ئەمانە، خواه ئەوکەسانەی کە خەریکی ئەم خوێندنانەن، مامۆستا بن یا موفتی یا فەقێ و فەقێکان سوختە بن یا موستەعید، هەروەها بۆ ئیمامی مزگەوتەکانو خەتیبی جومعەو بانگدەرو ئەوکەسانەکە ئامۆژگاری موسوڵمانان ئەکەن بۆ کاروباری دینو خووڕەوشت و بۆ هەموو ئەو کەسانەیە کە بەهۆی خزمەتکردنی مەسڵەحەتی ئیسلامو موسوڵمانانەوە مەجالی کاسبییان نییە، وەك ئەوکەسەی کە هەر خەریکی هەڵکەندنی قەبر بێ بۆ موسوڵمانانی مردوو، ئەمانە هەموو خاوەن بەشن لەم پێنجیەکەی مەسالیحدا، هەرچەند خۆیان دەوڵەمەند بن، بۆ ئەوە کە خەڵك پشتیان سارد نەبێتەوە لەم عیلمانەو لەم ئیشە بەرزانە، هەروەها شەلو کوێرو نەخۆشو پیری لێکەوتوویش، ئەگەر فەقیر بن، لەوانەن کە خراونەتە سەر بەشی مەسالیح.

بزانن! هەرچەند بەشی ئەهلی عیلم ئەدرێ ئیتر فەقیر بن یا دەوڵەمەند بن، بەڵام واجبە لەناو ئەوانەشدا تەماشای ئەوە بکرێ کە کامیان موستەحەقترە و کامیان قازانجی بۆ موسوڵمانان زۆرترە بەهۆی زانایی و زۆریی خزمەتو چالاکیو دەوامو بڵاو کردنەوەی عیلمو ئەخلاقی بەرزەوە لەناو موسوڵمانانا و هەرکام؛ بە پێی پایەی خۆی بەشی بۆ دائەنرێ.

«بێداری» وەختێ بەشی ئەمانە لە پێنجیەکی مەسالیح ئەدرێ ئەگەر لە وەقفی تایبەتییەوە مانگانەیان نەبێ، ئەگینا ئەگەر مانگانەیان هەبوو بەئەندازەی ئەوەی بەشیان

بکاو بەپێی ئەو زەحمەتەی کە ئەیکێشن لە ڕێگای ئیسلامەتی دا، ئەوە لەم پێنج یەکە بەشیان نادرێ، مەگەر مانگانەکەیان بەشیان نەکا، یا بەپێی زەحمەتەکەیان نەبێ، لەم حاڵەدا لە پێنج یەکی مەسالیح پێویستی ژیانیان بۆ تەواو ئەکرێ.

**بزانن!** شێخی «ابن حجر» لە «تُحفة»دا، ئەڵێ: ئەگەر گەورەی موسوڵمانان مەنعی حوقووقی عولەماو هەر خاوەن حەقێکی تری کرد لە «بیتُ المال»دا، ئەوە لەوکاتەدا فەرموودەی پشت پێ بەستراو ـ وەك «ئیمامی غەزالی» لە «احیاءُ علومِ الدّین»دا فەرموویە ـ ئەوەیە هەر خاوەن حەقێك دەستی گەیشت بە ماڵی «بیت المال»، دروسە بۆی بەئەندازەی پێویستی خۆی و خێزانی لێ وەربگرێ و خەرجی بکا و پێویستیش نییە کە لەگەڵ خاوەن حەقەکانی تردا دابەشی بکا، چونکە ئەم ئەندازە حەقە حەقی خۆیەتی و خەڵکەکانی تر لەلایەن سوڵتانەوە بەشیان فەوتاوە.

دووهەم: بۆ موسوڵمانانی ئەولادی «هاشِم»ی باپیری دووهەمی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ و ئەولادی «مُطّلِب»ی برای «هاشم»ە، لە پیاوو ژن و گەورەو بچووك و دەوڵەمەندو فەقیر، هەموویان وەکوو یەك، لەسەر ئوسووڵی میرات، بۆ نێرینە دوو بەش و بۆ مێنیە یەك بەش: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾ بەشیان ئەدرێ، ئەگەر ئەو پێنج یەکە بەشی هەموویان بکا وە ئەگەر بەشی نەکرد، پێشەوای موسوڵمانان ئەتوانێ لەپێشا بەشی هەژارەکانیان بدا، جا ئەگەر لێی مایەوە، بیدا بەوانی تریان.

سێهەم: بۆ هەتیوە کە بریتییە لە منداڵێکی نابالغ کە باوکی نەبێ و باپیرەی دەوڵەمەندیشی نەبێ، هەرچەند باپیرەی هەژاری هەبێ؛ ئەمانە لەم پێنج یەکەیان ئەدرێتێ، بەو شەرتە ئەولادی موسوڵمانان بن و خۆیان ماڵیان نەبێ بەئەندازەیەك کە بەشیان بکا، بەڵام پێویستە بە شاهید ئیسپاتی ئەوە بکەن کە موسوڵمانن و هیچیان نییە.

چوارەم: ئینسانێکە لات بێ یا هەژار بێ، یەعنی هەر هیچی نەبێ، یا ئەگەر شتێکی بوو، ئەوەندە نەبێ بەشی گوزەرانی خۆی و خێزانی بکا؛ ئەمانە وەك لەم پێنج یەکی «فَیء»ە بەشیان هەیە، لە کەفارەت و زەکاتیشدا بەشیان هەیە، بەو شەرتە کە موسوڵمان بن و لە ئیددیعای لاتی و هەژاریدا بە بێ سوێند باوەڕیان پێ ئەکرێ؛ بەڵێ

ئەگەر لەوەپێش وامەشهوور بووبن کە خاوەن ماڵن و ئێستا ئیددیعای فەوتانی ئەو ماڵەیان بکەن پێویستە بە شاهید ئیسپاتی ئەوە بکەن.

**پێنجەم:** بۆ سەفەرەکە، بە شەرتی ئیسلامەتی و فەقیری.

واجبە لەسەر پێشەوای موسوڵمانان ئەم ماڵە بگەیەنێ بە هەموو ئەم چوار بەشەی دواییدا و بە هەموو یەکێك لە هەرکام لە بەشەکانی ئەم چواربەشەدا و وەکوو یەکیش بە بەشەکانو هەرکام لە هەر بەشێك بدا، هەروەها وەکوو یەك بەشی خزمەکانی حەزرەتﷺ بدا؛ بەڵێ، واجب نییە هاوسانی بکا لەنێوان ئەفرادی بەشی هەتیوو هەژارو رێبواردا؛ هەروەها ئەگەر ماڵەکە بەشی هەموو بەشەکانو هەرکام لە ئەفرادی ئەو بەشانەی نەئەکرد، دروستە بۆ پێشەوای موسوڵمانان کام بەشیانو کام شەخسیان بە موحتاجتر ئەزانێ، بەشی ئەوەیان بداو ئەوانی تریان بخاتە پشت گوێ.

ئەو چوار پێنج یەکەکەی تریش، ئەدرێ بەو سەربازانەی کە داوتەڵەب بوون و هاتوون بۆ غەزا بۆ پاراستنی وڵاتی ئیسلام، بەرامبەر بە مانگانەیەك کە پێشەوای موسوڵمانان بیان داتێ؛ ئەمانە، لەشەرعا پێیان ئەوترێ: «مُرتَزَقَة» و پێویستە پێشەوای موسوڵمانان فەرمان بدا ناوی ئەمانە لە دەفتەری تایبەتی دا بنووسرێ بۆ ئەوە لەبیر نەچنەوەو بەشیان نەفەوتێ، هەروەها ئەبێ سەرلەشکریان بۆ دابنێو ئەویش چەند ئەفسەرێك لە خواری خۆیەوە دابنێو هەر ئەفسەرێ چەند چاوەشێکی لەژێردەستا بێ، بەگوێرەی وەزع؛ ئەبێ هەرکام لەو چاوەشانە سەرپەرشتی کاروباری کۆمەڵێك لەو سەربازانە بکا بۆ ئەوە کە مردنو ژیانو کاروباری خێزانیان لەبەرچاو بێ و ئەبێ ئەوەندەی کە بەشیان بکا، بەگوێرەی وەزعی ئەو وڵاتەو باری هەرزانیو گرانیو دەسکەوتی ئەو سەردەمە، مەسرەفی خواردنو جلو بەرگو خانووی تیادانیشتنو هەر پێویستییەکی تریان بۆ جێبەجێ بکا؛ جا ئەگەر ئەم چوار پێنج یەکە بەشی مەسرەفی ئەمانەی نەکرد، ئەبێ لە بەشی «في سَبيل اللّه» ـکە بریتییە لە زەکات ـ بۆیان تەواو بکرێ.

سوپایی، بەشی خۆی ئەدرێتێ، خواه دەوڵەمەند: بێ یا هەژار بێ وە ئەگەر دەوڵەمەند بوو، فەرقی نییە هەرچی هەبێ، چونکە مەبەست لە دانی ئەم بەشە، دڵگەرم

کردنی خەڵکە بۆ غەزا وە ئەگەر گوێ نەدرێ بە حاڵی ئەمانە، وەزعی وڵاتی ئیسلام لەوانەیە تێكبچێ. لە ناونووسینی ئەم سەربازانەدا، هەروەها لە بەش‌دانی خەڵکیشا، ئەبێ «قورەیشی»یەکان پێش بخرێن و لەناو ئەوانیشا، «بنَي هاشم»و «بَني مُطلِّب» ئەوجا ئەولادی «عبدُ الشَّمس»، جا ئەولادی «عبدُالعُزّی»، جا تیرەکانی تری قورەیشی هەرکامیان زۆرتر نزیك بێ لە پێغەمبەرەوەﷺ، ئەوجا «ئەنسار»، ئەوجا باقی عەرەب، ئەوجا عەجەم و دروست نییە ناوی شەل‌و کوێرو ئیفلیج‌و هەرجۆرە بێ کەڵك‌و بێ کارەو پەك کەوتوویەکی تر بنووسرێ [لە ناوی ئەمانەدا، چونکە ئەوان خراونەتە سەر بەشی مەسالیح].

ئەگەر هەندێك لەوانە کە ناویان نووسراوەو وەرگیراون، نەخۆش کەوتن یا شێت بوون، بەشی دیاری کراوی خۆیانیان هەر ئەدرێتێ، ئیتر هیوای چاكبوونەوەیانمان ببێ یانە، هەروەها پاش مردنیشیان، هەرکەس لە حەیاتا نەفەقەی لەسەریان بووە، وەك ژن‌و منال‌و باوك‌و دایك، هەریەك بەشی خۆیانیان ئەدرێتێ، هەر بەو شەرتە کە موحتاج بن، جا بۆ ژن، تا شوو ئەکا یا ئەمرێ و بۆ منال، تا گەورە ئەبێ‌و خۆی ئەژێنێ و بۆ باوك‌و دایك، تا ئەمرن.

لە «تُحفة»دا، ئەفەرموێت: ئیمامی «سُبْكي»، لەم حوکمە شەرعییەوە وەری‌گرتووە هەروەختێ «موجتەهید و مامۆستاو دووبارەکەرەوەی دەرس وەفاتیان کرد، پێویستە لەو شوێنەوە کە مانگانەیان لێوە دراوەتێ، مەسرەف بۆ ژن‌و منالیان بکرێ هەتا لە ئیحتیاج ئەکەون، چونکە ئەگەر وانەبێ، خەڵك دڵیان سارد ئەبێتەوە لە خەریك‌بوونی عیلم‌و دەرس‌وتنەوەو ئەم‌جۆرە خزمەتانە.

ئەگەر ئەم چوار پێنج یەکە زیاتر بوو لە پێویستی لەشکر، زیادەکەشی بەپێی ئیحتیاج دابەش ئەکرێتەوە بەسەریانا. فەرموودەی راستتر ئەوەیە دروستە هەندێ لەم زیادەیە سەرف بکرێ بۆ قایم‌کردنی سنووری وڵات بە جۆرێ کە بێگانە مەجالی خراپەکردنی نەبێ، هەروەها بۆ کرینی چەك‌و وڵاخی سواری‌و بارکێشان‌و ئەم جۆرە ئەرکانە.

تا ئێستا هەرچیمان وت، بەش بەحاڵی ئەو ماڵە دەسکەوتوانە بوو کە بگوێزرێنەوە، بەڵام ئەو ماڵەی کە نەگوێزرێتەوە وەك زەوی‌و ئاوو خانوو و دووکان‌و خان‌و شتی‌وا،

ئەوە بەگوێرەی مەزهەب، وەقفی عام ئەکرێو هەمووساڵێ بەرهەمەکەی خەرج ئەکرێ بەوجۆرە کە ماڵی دەسکەوتووی گوێزراوە خەرج ئەکرێ.

**بزانن!** ئەو کەسانەی کە بە پیاوەتی خۆیان هاتوون بۆ غەزا، ئەوانە حەقیان لە پێنج یەکی «فَیْء» (ماڵی دەسکەوتی موسوڵمانان)ا نییە، بەڵکوو ئەبێ لە بەشی «فی سَبیل اللّه»و لە زەکات بەشیان بدرێ.

## باسی ماڵی تالانی کافران (غَنیمة)

غەنیمە لەشەرعا، بریتییە لەو ماڵە کە لە کافرەوە ئەکەوێتە دەستی موسوڵمانان بەهۆی شەڕەوە. جا لە شەڕی نێوانی موسوڵمانانو کافراندا، هەر موسوڵمانێك کافرێکی بە ئازایی خۆی کوشت، هەر کەلوپەلێك بەو کافرەوە بێ ئەبێ بە ماڵی ئەو موسوڵمانە، لە جلوبەرگو چەکی شەڕو وڵاخی سواریو زینو بەرگی وڵاخو هەرچی لەباخەڵیا بێ، هەروەها وڵاخێکیش کە بۆ ئیحتیات لەگەڵ خۆی هێنابێ نەوەك وڵاخەکەی لە شەڕەکەدا بکوژرێ، بەڵام ئەگەر بوخچەیەك یا خورجێکی کردبوو بە پاشکۆی وڵاخەکەیەوەو کەلوپەلی زیادەی تێخستبوو، ئەوە نابێ بە هی موسوڵمانە بکوژەکە.

شەرتی ئەوە کە موسوڵمانی بکوژ ببێ بە خاوەنی کەلوپەلی کافرە کوژراوەکە، ئەوەیە ئەو کافرە کوژراوە ئیشێکی مەترسیداری کردبێ؛ مەسەلا، هاتبێ بۆ مەیدانی جەنگو کابرای موسوڵمانیش لێی چووبێتە پێشەوەو کوشتبێتی، یاخود کابرای کافر ناوبانگی ئازایەتی دەرچووبێو موسوڵمانەکەیش رۆیشتبێ خۆی لێداگرتبێ یا کەوتبێتە دوایو فرسەتی لێهێنابێو کوشتبێتی؛ کەواتە، ئەگەر ئەم موسوڵمانە لە قەڵاوە تەقەی کردبێ یا لەناو ریزی سوپادا بووبێ، یا لەکاتی نووستنا کوشتبێتی، یا بەدیل هاتبێو کوشتبێتی، یاخود لەکاتی راکردنی کافرانا کوشتبێتی، ئەوە حەقی کەلوپەلەکەی ئەو کوژراوەی نییە و هەر کەلوپەلێك لەم حاڵانەدا بە کوژراوەکەوە بێ، ئەخرێتە ناوماڵی تاڵانەوەو دابەش ئەکرێ بەسەر هەموو سوپاکەدا.

هەر لە حوکمی کوشتنایە بۆ موستەحەق بوونی کەل‌وپەلی کافرەکە، ئەمە کە موسوڵمانەکە پەکی ئەوکافرە بخاو دەفعی شەڕی بکا لە موسوڵمانان؛ مەسەلا، هەردوو چاوی دەرکا، یا هەردوو دەست‌و پێی ببڕێتەوە، یا هەر دەستی، یا هەر پێی ببڕێتەوە، یا بیگرێ بەدیل، یا کوتەکێك بدا بە تەپڵی سەریاو لە کەڵکی بخا!

پاش ئەوەکە کەل‌وپەلی کافرەکەمان دا بە موسوڵمانەکە، هەرچی مەسرەف چووەتە ئەو ماڵە تاڵانییە بۆ هەڵگرتن‌و گواستنەوەو پاس کردن‌و کرێی جێگاو شتی‌وا، هەمووی جیائەکەینەوە و هەرچی مایەوە ئەیکەین بە پێنج بەشەوە؛ بەشێکیان بۆ ئەو پێنج مەسرەفەیە کە لە «فِیْیء»دا باس‌کرا کە بریتییە لە «مَصالِح»و ئەولادی «هاشِم»و «مطلّب»و هەتیوو فەقیرو سەفەرکەر، بەگوێرەی ئەو شەرتانەی کە باس‌کران؛ چوار بەشەکەی تریشی، لە گوێزراوەو نەگوێزراوە، بەش ئەکرێتەوە لەنێوانی ئەفرادی سوپادا و بەسەر ئەو کەسانەدا کە حازری شەڕەکە بوون‌و بۆ شەڕ هاتوون، خواه هەموویان شەڕیان کردبێ یا نە وکافرەکان لەترسانا رایان کردبێ‌و تاڵانەکەیان لەپاش بەجێ‌مابێ، یا هەندێکیان شەریان کردبێ‌و هەندێکیان شەڕیان نەکردبێ.

بەشی ئەو کەسانە نادرێ کە لەپاش تەواوبوونی شەڕەکە هاتوون؛ بەڵێ، ئەگەر لەپاش تەواوبوونی بەیەکادان‌و پێش دابەش کردنی تاڵانەکەدا گەیشتن، وەجهێك هەیە ئەڵێ بەشیان ئەدرێ؛ لەڕاستیدا، ئەمە بەسراوە بە فکری پێشەوای موسوڵمانانەوە. ئەگەر کەسێك لەوانەی کە موستەحەقی [وەرگرتنی] تاڵانن، لەپاش ڕووداوەکەو پێش دابەش کردنی تاڵانەکەدا مرد، ئەوە حەقەکەی ئەڕوا بۆ میراتبەرەکانی بەپێی ئوسوولی دابەش کردنی میرات وە ئەگەر لەناوشەڕەکەدا مرد بەرلەوەی شەڕ تەواو ببێ یا شەهید کرا، ئەوە حەقی نییە لە ماڵە تاڵانییەکەی بدرێتێ. ئەوکەسانەش کە بۆکاسبی هاتوونەتە ناو لەشکرەوە، یاخود بەکرێ گیراون بۆ خزمەت کردنی وڵاخ یا بۆ هەر خزمەتێکی‌تر، ئەوانە ئەگەر بەشدارییان کرد لەشەڕدا، بەشدار ئەبن، ئەگینا نایان‌درێتێ.

ئوسوولی دابەشکردنی ماڵی تاڵان، بەم‌جۆرەیە: بۆ پیادە بەشێك‌و بۆ سوار سێ بەش دائەنرێ، بەڵام هەر بەشی یەك وڵاخی بۆ دائەنرێ، ئەسپەکەی عەرەبی بێ یا غەیرە

عەرەبی و بەش دانانرێ بۆ ئەسپی لەڕو لاوازو بێسوود. ئەگەرکەسێکی زیممی یا ژنو منداڵی موسوڵمان، هاتنە شەڕەوە، ئەوە سووکە بەشێکیان ئەدرێتێ کە کەمتر بێ لە بەشی عادەتی، بەپێی ئەوە کە عەقڵی پێشەوای موسوڵمانان بیبڕێ؛ ئەم سووکەبەشە لە چوار پێنج یەکە جیا ئەکرێتەوەو پەیوەندی نییە بە پێنج یەکی یەکەمەوە و ئەگەرکابرای زیممی بەکرێ گیرابوو، هیچی نادرێتێ.

**بزانن!** دروستە زیادە بەش دابنرێ بۆ کەسێك کە ئیشێکی بە ئەهمیەت بکا، وەك ئەوە کە باش بسرەوێنێتە کافرەکان، یا قەڵایەك بگرێ، یا کەلێنێك بدۆزێتەوە بۆ ئەوە کە موسوڵمانان خۆیانی لێوە بکەن بەناو دوژمنا، یا تۆپێکی کاریگەر بێدەنگ بکـا، یـا فڕۆکەیەك بخاتە خوارەوە، یا چەند دیلێك رزگار بکا، یا کۆمەڵێك موسوڵمان گەمارۆ درابن و لەوانەبێ بگیرێن یا بکوژرێن و ئەم رزگاریان بکا؛ پێشەوای موسوڵمانان یـا فەرماندەری سوپا، ئەم زیادە بەشە دائەنێ بۆ ئەو کەسەی ئازایەتییەکی وای کردووەو ئەیدرێتێ؛ ئەم زیادە بەشە، لە پێنج یەکی «مصالح» جیا ئەکرێتەوە.

## باسی وەقف

وەقف لەشەرعدا بریتییە لە راگرتنی ماڵێك کە قابیلی ئەوەبێ قازانـجی لێبکـرێ لەگەڵ مانەوەی عەینەکەیدا و مەبەست لە راگرتنەکەی، خەرجکردنی بەرهەمەکەی بێ بۆ مەبەستێکی مەباح. بەڵگەو دەلیلی وەقف لەشەرعدا، بریتییە لەم ئایەتە: ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ واتە: «ناگەن بە خێری تەواو، تا لە رێگەی خوادا خەرج نەکەن هەندێك لەو ماڵەتان کە خۆشتان ئەوێ» و ئەو حـەدیسەیە کـە پـێغـەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِذاْ مَاتَ ابْنُ آدَمَ اِنْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلاَّ عَنْ ثَلاْثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِه، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَه». یەعنی: «کە ئـادەمیزاد مـرد، ئـەو کـردەوانـەی ئەبڕێنەوە کە ئەبن بەهۆی پاداشی باش بۆی، مەگەر لە سێ رێگەوە: حـەسەناتێکـی نەبڕاوە، یا زانستێك کە بەجێی هێشتبێ لەسەر لاپەڕەی کتێب یا لە سنگی خوێندەوارانا، یا منداڵێکی بیروباوەڕ باش و کردەوە پاك کە بۆی بپاڕێتەوە لەخوا»، واتە: ئەم سێ شتە، وەك کردەوەی نەفسی خۆی وان، مەبەستیش لە سەدەقەی نەبڕاوە، وەقفە.

یەکەم وەقفێك کە کراوە لە ئیسلاما، وەقفەکەی حەزرەتی «عُمَر ابـن الخـطّاب»ە -خوای لێ ڕازی بێ -؛ ئەم زاتە، بەشێکی بەرەڵلای لە «ئەرزی خەیبەر» دەس‌کەوت و وەقفی کرد لە موسوڵمانان، بەو شەرتە کە نەفرۆشرێ‌و نەبرێ بە میرات و نەبەخشرێ و هەرکەسێکیش کە بەرێوەی ئەبا، بەعادەت لێی بخوا؛ هەندێك ئەڵێن: یەکەم وەقـف، وەقفی حەزرەتﷺ بووە: ئەم زاتە، لەلایەن «مُخیرقُ النّفری» یەوە، بەشێوەی وەسیەت حەوت باخی دەس کەوت و هەر حەوت باخەکەی وەقف کرد؛ هەندێکـیش ئـەڵێن: یەکەم وەقف، وەقفی «أبوطَلحة»یە؛ ئەم زاتە، باخێکی بووە لە مەدینەی مـنەووەرەدا مەشهوور بووە بە «بَیرُجاء» و لە هـەموو مـاڵێکـی خـۆشـەویستر بـووە لەلای؛ کـە ئایەتەکەی لە پێشەوە باسمان کرد، هاتە خوارەوە، وتی: خۆشەویسترین مـاڵم ئـەو باخەیە، وا لە ڕێی خوادا کردم بە سـەدەقە. زانـایان، وتـوویانە: پـاش ئـەم وەقـفانە، هەرکەس لە ئەسحابە دەستی ڕۆیشتبێ ئەوەندەی حاڵی خۆی ماڵی وەقف کردووە.

دروستە وەقف کردنی شتی نەگۆیزراوە، وەك پارچـە زەوی‌و بـاخ‌و ئـەرزو ئـاوو خانوو و دووکان‌و ئەم‌جۆرە شتانە و دروسـتە وەقـف کـردنی شـتی گـوێزراوە، وەك فەرش‌و نوێن‌و قاپ‌و قاچاخ‌و کتێب؛ هەتاوەکوو دروسـتە وەقـف‌کردنی فـەرش یـا بەرماڵ‌و کردنی بە هی مزگەوت، بەو شەرتە کە لەکاتی وەقف کردنەکەیا بە بزمار یا بە دەرزی‌و دەزوو قایم بکرێ، یەعنی بە بـزمار بکـوترێ بـە زەویـدا یـا بـدووری بـە فەرشێکداو فەرشەکە بە بزمار بکوترێ بەزەویدا وە ئەگەر لەپاش داکـوتان‌و وەقـف کردنی، هەڵ بگیرێ‌و ببرێ بۆ شـوێنـێکـی‌تر، ئـەوە هـەر لەسـەر وەقـفیەتی خـۆی ئەمێنێتەوە، چونکە وەقف، کە دامەزرا، تێك‌ناچێ.

دروستە وەقف کردنی بەشێك لەناو چەند بەشدا، خواه بزانرێ ئەو بەشە چەندێکە یا نەزانرێ؛ بەڵێ، دروست نییە وەقف کردنی جلێ یا حەیوانێکی «موصوف في الذِّمة» و وەقف کردنی یەکێ لەو دوو باخە یا لەو دوو حەیوانە، چونکە وەقف، لابردنی موڵکی شەخسییە لە شتێکی دیاری‌کراو و ئەم سـوورەتانەی بـاسمان، کـردن دیـاری نـین؛ هەروەها، دروست نییە کەسێکی ئازاد خۆی وەقـف بکـا بـۆ خـزمەتی مـزگەوتێك،

مەسەلا، چونکە ئینسانی ئازاد نابێ بە موڵك و دروست نییە وەقف کردنی سەگی پاس یا سەگی راو، چونکە «إختصاصات»، موڵك نییە.

ئەگەر کەسێك زەوییەکی بەکرێ گرت و خانوویەکی تیاکردەوە، یا داری تیا ناشت و وەقفی کردن، ئەوە ئەو وەقفە دروستە، چونکە تا ماوەی بەکرێ گرتنەکە تەواو ئەبێ کەڵکیان لێوەرئەگیرێ، پاش تەواوبوونی ماوەی بەکرێ گرتنەکەش، کابرای خاوەن زەوی ئەتوانێ خانووەکە برووخێنێ یا درەختەکە هەڵکێشێ. ئەوجا ئەگەر ئەو دارو پەردوو و لق‌وپۆپە ئەتونرا بفرۆشرێن‌و بە قیمەتەکەیان پارچە زەوییەك یا خانوویەك بکڕرێ، ئەبێ بیکڕن‌و وەقفی بکەن وە ئەگەر قیمەتیان نەکرد یا قیمەتەکەیان بەشی ئەوەی نەکرد، ئەبن بە موڵکی ئەو کەسانە کە وەختی خۆی لەسەریان وەقف کرابوو؛ بەڵێ، لەسەر فەرموودەی خاوەنی «مُغني»و «نِهاية»و «مَنْهَج»، خانوویەك کە لە زەوی زەوتکراودا کرابێتەوە یا دارێك کە لە زەوی زەوتکراودا نێژرابێ، دروست نییە وەقف بکرێن، چونکە لە بنچینەوە لەسەر ناحەق دامەزراون، بەڵام بەلای هەندێ زانای ترەوە، دروستەو قەیدی نییە.

وەقف لەسەر کراو، یا شەخسە یا جیهەتە؛ ئەگەر شەخس بوو، شەرتی ئەوەیە لەکاتی وەقف کردنەکەدا ببێ‌و دیاری بێ‌و بۆ ئەوە بشێ کە قەبووڵی موڵك بکا، ئیتر تەنها کەسێك بێ یا زیاتر، ئەوە قەیدی نییە؛ کەواتە، دروست نییە وەقف کردن لەسەر منداڵێك کە لەمەولا پەیدا ئەبێ، یا لەسەر هەژارانی منداڵی فلانکەس کە لەو کاتەدا منداڵی هەژاری نەبێ، یا لەسەر مزگەوتێ کە لەمەوپاش دروست بکرێ، یا لەسەر یەکێك لە دوو کەس، یا لەسەر مزگەوتێ کە روونی نەکاتەوە کامەیە و لەسەر منداڵێ کە لە سکی دایکیابێ، چونکە وەقف کردن بەموڵکە لە ئێستەدا و منداڵێکیش کە هێشتا لەدایك نەبووبێ، قابیلی ئەوە نییە ببێ بە خاوەن موڵك.

هەروەها دروست‌نییە وەقف کردن لەسەر وڵاخ، ئەگەر مەبەستی خاوەنەکەی نەبێ و وەقف لەسەر مردوو، ئەگەر مردووەکە پێغەمبەرێك یا یەکێك لە ئەولیاکانی خوا نەبێ، ئەویش بەو شەرتە عورفی ئەو وڵاتە وابێ کە مەبەست لە وەقف بۆ مردوو، وەقف بێ بۆ

قازانجی مەرقەدی ئەو مردووەو بۆ نانوئاودان بەوکەسانە کە دێن بۆ زیارەتی؛ لەحاڵیوادا، وەقف بۆ مردوو دروستە، چونکە لەڕاستیدا وەقفە لەسەر جیهەت، نەك لەسەر شەخسێك کە قابیل نەبێ ببێ بە خاوەن موڵك.

دروست نییە ئینسان وەقف بکا لەسەر خۆی، چونکە قابیل نییە ئینسان شتێك کە هی خۆیەتی جارێکیتر بیکاتەوە بە هی خۆی. وەقف بەتاڵ ئەبێتەوە ئەگەر شەرتێکیوای لەگەڵدابێ کە ببێ بەهۆی گەڕانەوەی قازانجێك بۆ وەقفکەرەکە، وەك وەقف کردنی باخێك لەسەر مزگەوتێك بەو شەرتە هەرچی وشکەڵە داری هەیە بێتەوە بۆ ماڵی کابرای وەقفکەر؛ بەڵێ، دروستە وەقف کردن لەسەر موسوڵمانێك بەشەرتی ئەوەکە ئەو موسوڵمانە قوربانییەکی بۆ بکا یا حەجێکی بۆ بکا، چونکە لەم سوورەتەدا تەنها حەسەناتەکەی بۆ ئەگەڕێتەوە؛ بەڵام دروستە وەقف بەشەرتی ئەوە سەرپەرشتی کردنی ئەو ماڵە وەقف کراوە بەدەس خۆیەوە بێ هەرچەند بەرابەر بەکرێی ئیشی لەو چەشنەیش بێ. گەلێ لە زانایانی شەرع، لایانوایە دروستە وەقفێکیوەها کە وەقفکەرەکە خۆیشی بەربکەوێ، وەك ئەوەکە بڵێ: ئەم باخەم وەقف کرد لەسەر ئەو قوتابییانە کە ئێستا عیلمی نەحو ئەخۆینن و خۆیشی یەکێكبێ لەوانە کە «فِعلاً» (ئێستا) نەحو ئەخوێنن.

دروستە وەقف کردن لە ئەهلی زیممە، یەکێك بێ یا زیاتر، بەو شەرتە کە نیازی گوناهـ لەو وەقف کردنە دەرنەکەوێ؛ کەواتە، ئەگەر وتی: وا ئەو باخەم وەقف کرد لە هەژارانی ئەهلی زیممە، ئەوە دروستە وە ئەگەر وتی: وەقفم کرد لەو زیممییە کە خزمەتی فلان کەنیسە ئەکا، ئەوە بەتاڵە.

ئەگەر وەقفەکە لەسەر جیهەت بوو، شەرتی ئەوەیە جیهەتەکە گوناهـ نەبێ، وەك وەقف لەسەر ئاوەدانکردنەوەی کەنیسە؛ ئیتر ئەوە مەبەست نییە ئاخۆ حەسەنات لەو جیهەتەدا دیار بێ، وەك وەقف لەسەر مزگەوتو فەقێو مەلاو هەتیوو ڕێبواری ڕێی چاکەو فەقیرو هەژارو ئەم جۆرە جیهەتانە، یاخود چاکەو خراپەی دیار نەبێ، وەك وەقف لەسەر دەوڵەمەندانی موسوڵمانان!

شەرتی سیغەی وەقفیش ئەوەیە لەفزێك بێ مەعنای راگرتنی ئەو ماڵە وەقف کراوە بگەیەنێ بەشێوەیەکی هەمیشەیی بۆ ئەوە کە قازانجەکەی خەرج بکرێ بەوجۆرە کە وەقفکەرەکە بڕیاری داوە؛ ئەم لەفزانە، هەیانە سەریحو بێ پێچو پەنان و هەیانە مەبەست بە کینایە ئەگەیەنن؛ سەریحەکانیان وەك ئەوە کە وەقفکەرەکە بڵێ: وا ئەو زەوییەم وەقف کرد، یا: ئەو زەوییەم وەقف کراوە، هەروەها ئەگەر بڵێ: وا فلانە شتم کرد بە سەدەقە، بەسەدەقەیەکی نەبڕاوە، یا: بە سەدەقەیەکی وەقف کراو، یا: بە سەدەقەیەك کە هەرگیز نەفرۆشرێو نەبەخشرێ، ئەمانە هەموو وەقفی سەریحو بێ پێچوپەنان.

وەقف نایەتەجێ بە تەنها ئەوەکە بڵێ: وا سەدەقەم کرد، هەرچەند نیازی وەقفیشی بێ، مەگەر بیبەستێ بە جیهەتێکی گشتییەوەو نییەتی وەقفیش بێنێ وە ئەگەر بڵێ: وا ئەو زەوییەم کرد بە مزگەوت، ئەوە ئەو زەوییە ئەبێ بە مزگەوت.

جا ئەگەر وەقفەکە لەسەر یەك کەس یا کۆمەڵێکی دیاری بوو، بەشەرت گیراوە قەبووڵی وەقفەکە بکا، ئەگەر لایق بێ بۆ قەبووڵ کردن، ئەگینا ئەوکەسەی کە سەرپەرشتی کاروباری ئەکا، ئەبێ ئەو بۆی قەبووڵ بکا و ئەم قەبووڵە لەپاش ئەوە ئەبێ کە وەقفکەرەکە سیغەی وەقفەکەی بەدەمدا بێت، ئەگەر خۆی لەو شوێنەدا بوو، ئەگینا پاش ئەوە کە خەبەری وەقفەکەی پێ بگات.

شەرتی سیغەی وەقف ئەوەیە هەمیشەیی بێ؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك وتی: وا ئەو باخەم وەقف کرد لە فلانکەس بۆ ماوەی ساڵێك، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵێ، ئەگەر وەقفەکە بشوبهێ بە ئازاد کردنی بەندە، یەعنی جیهەتی خێرو ئیحسانی دیاری بێ، وەك ئەوە کە بڵێ: وا ئەو زەوییەم کرد بە مزگەوت بۆ ماوەی دوو ساڵ، ئەوە دروستە؛ هەروەها، دروستە وەختدانان بۆ وەقف بە ماوەیەکی وا کە چەند سەدەیەك بگرێتەوە، وەك ئەوە کە بڵێ: ئەو ماڵەم وەقف کرد بۆ هەزار ساڵ؛ هەروەها، ئەگەر وەخت دانانەکەی لە سیغەی وەقفەکەوە دەربکەوێ، وەك وەقفی دوابڕاو «مُنْقَطِعُ الآخَر»؛ مەسەلا، بڵێت ئەو ماڵەم وەقف کرد لە مناڵەکانم، یاخود بڵێت: ئەو ماڵەم وەقف کرد لە فلانکەس و پاش ئەو، لە مناڵەکانی، ئەوە فەرموودەی دیاریتر ئەوەیە ئەو وەقفە دروستە؛ جا کاتێك کە

ئەوانە کە ناوی هێناون فەوتان، ئەوە شتەکە بە وەقف کراوی ئەمێنێتەوەو ئـەدرێ بـە نزیکترین کەسێك لەو وەقفکەرە لە رووی خزمایەتییەوە، نەك لە رووی مـیراتـەوە؛ کەواتە، ئەگەر کچی کوڕێكو کوڕی کچێکی بوو، ئەوە ماڵەکە ئەدرێ بە هەردووکیان وەك یەك، هەروەها ئەگەر مامو خاڵی هەبوو، یا ئەگەر خوشکی باوكو خوشکی دایکی هەبوو، ئەوە ئەو ماڵە ئەدرێ بە هەردووکیان وەك یەك، چـونکە لەنـزیکییا لە وەقـف کەرەکەوە وەك یەك وان؛ جا ئەگەر کابرا خزمی نەبوو، یاخود خزمی هـەبوو، بـەڵام هەموو دەوڵەمەند بوون، ئەوە پێشـەوای مـوسوڵمـانان ئـەتوانـێ خـەرجـی بکـا لە مەسڵەحەتی موسوڵمانانا، بەڵام گەلێك لە زانایانی شەرع، وتوویانە؛ خەرج ئەکرێ بۆ هەژار و لاتی شاری ئەوانە کە وەقفکراوە لەسەریان.

شەرتێکی سیغەی وەقفە ـکە پەیوەندی بە کاتی وەقف کردنەکـەوە هـەیە ـ ئـەمە کەسێك یا جیهەتێکی دیاری دابنێ بۆ ئەوەکە ماڵە وەقف کراوەکەی بۆ خەرج بکرێ؛ کەواتە، ئەگەر وتی: وا ئەمماڵەم وەقف کردو ناوی کەسی نەبرد، یاخود وتی: وا ئەمماڵەم وەقف کرد لەسەر پیاوێك، یاخود بەشێوەی وەقفی پێشبڕاو (مُنقَطِع الأوَّل) وەقـفی کردو وتی: وا ئەمماڵەم وەقف کرد لەسەر ئەوانەی لەمەولا لە من پەیدا ئەبن، یاخود: وائێستا ئەم ماڵەم وەقف کرد لەسەر کەسێك کە پاش مردن لەسەر قەبرەکەم ئەخوێنێ، یا: وەقفم کرد لەسەر مزگەوتێك کە لەمەولا ئەکرێتەوە، ئەوە بەتاڵە؛ بەڵێ، ئەگەر وەقفەکە ناوەند بڕاو (مُنقَطِع الوَسَط) بوو، وەکوو ئەوە کە بڵێت: ئەو خانووەم وەقف کرد لەسەر کوڕەکانم و پاش ئەوان لەسەر پیاوێك و پاش ئەو، لەسەر هەژاران، ئەوە دروسـتە و لەپاش کوڕەکانی سەرف ئەکرێ بۆ هەژاران.

شەرتێکی تری وەقفە ئەمە کە ئەو سیغەیە نەبەسرابێ بەشتێکەوە، ئەگەر لایەنی خێرو حەسەناتی تیا دەرنەکەوێ؛ کەواتە، ئەگەر وتی: هەروەختێ فلانکەس لە حەج هاتەوە، ئەو ماڵە وەقفبێ لەسەر تۆ، ئەوە بەتاڵە، بەڵام ئەگەر لایەنی خێرو حەسەناتی تیا دیار بوو، وەك ئەوە کە بڵێ: هەرکاتێك مانگی رەمەزان هات، ئەو زەوییەم وەقـف بـێ بـۆ مزگەوت، ئەوە دروستە و کە مانگی رەمەزان هات، زەوییەکەی ئەبێ بە مزگەوت.

بەڵێ، ئەگەر وەقفەکەی بەست بە مردنی خۆیەوە، وەك ئەوەکە بڵێ: هەرکاتێك مردم، ئەو ماڵەم وەقف بێ لە فڵان مزگەوت، ئەوە دروستەو حوکمی وەسیەتی هەیە، بۆیە ئەگەر ئەو کابرا ئەو ماڵەی برد بۆ بازاڕ بۆ فرۆشتن، ئەوە بە پەشیمان بوونەوە دائەنرێ لە وەقفەکە؛ هەروەها، ئەگەر وەقفەکە هەر لەئێستاوە بکا بە «وَقف مُنجَّز»، بەڵام بەدەستەوەدانی ماڵە وەقف کراوەکە بخاتە پاش مردنی، ئەوەش دروستەو هەر حوکمی وەسیەتی هەیە وە ئەگەر هاتو وەقفەکەی بەشەرتی ئەوە کرد کە خۆی حەقی پەشیمانبوونەوەی ببێ، ئەوە بەتاڵە، چونکە نە سیغەکە دەس بەجێیی «تَنجیز»ی تیایە و نە لەشێوەی ئازاد کردنی بەندەیشە[1].

هەروەها بەشەرت گرتنی شتێك کە پێچەوانەی شەرع بێ، وەك بەشەرت گرتنی ژننەهێنانی ئەو فەقێیانە کە لەو خوێندنگایەدا ئەخوێنن کە ماڵەکەی لەسەر وەقف کراوە، یا بەشەرت گرتنی حەقی بەتاڵ کردنەوەی وەقفەکە، یا گۆڕینی سیفەتێك کە بڕیار دراوە لە وەقفەکەدا، وەك گۆڕینی جەماعەتی حەنەفی بە شافیعی لەو مزگەوتەداکە بڕیار دراوە حەنەفی نوێژی تیا بکەن، یا شەرتی کەمکردنەوەی ماڵە وەقفکراوەکە، یا لێ زیادکردنی، ئەمانە هەموو ئەبن بەهۆی بەتاڵ بوونەوەی وەقفەکە؛ بەڵێ، دروستە بەشەرت گرتنی ئەوە کە ئەو قوتابخانەیە کە وەقف ئەکرێ، تەرخانبێ بۆ خوێندنی عیلمێکی تایبەتی، یا ئەو مزگەوتە تەرخانبێ بۆ پەیڕەوانی فڵانە مەزهەب، یا ئەو تەکیە یا ئەو خانەقایە تەنها بۆ فڵان کۆمەڵ بن.

هەروەها، دروستە بەشەرت گرتنی ئەوە کە ئەو ماڵە وەقف کراوە نەدرێ بەکرێ، یا ماوەی بەکرێدانی لە ساڵێك ـ مەسەلا ـ زیاتر نەبێ، یا نەدرێ بە کەسێکی خاوەن دەسەڵاتیواکە ترسی ئەوەی لێبکرێ داگیری بکا، یا بە شەرت گرتنی ئەوە کە ئەو کەسەی لە ماڵە وەقفکراوەکەدا دائەنیشێ، تەعمیر کردنەوەی لەسەر خۆی بێ؛ ئەم شەرتانە دروستن، بەڵام گوێ پێنەدانیشیان لەکاتی ناچاریدا هەر دروستە؛ مەسەلا،

---

١. هەر وەقفێك کە کرابێ لەسەر جیهەتێکی گشتی، ناوئەبرێ بە وەقفی «مُضاهِي التَّحرير»، واتە: هاوچەشنی ئازادکردنی بەندە و ئەو جۆرە وەقفە، ئەگەر بیشبەسرێ بەشتێکەوە، هەر دروستە.

وەك ئەوە کە ئەگەرماڵەوەقف کراوەکە نەدرێ بەکرێ، زەوت بکرێ، یا ئەگەر بۆ دوو ساڵ نەدرێ، بەکرێ، وێران بێ، یاخود ئەو تاقمەشافیعی مەزهەبەکەوا مزگەوتەکەیان بۆ وەقف کراوە، نەمان لە وڵاتەکەداو لە حەنەفی بەولاوەکەس نەبوو نوێژی تیا بکا؛ لەم حاڵانەدا، دروستە لادان لە شەرتی کابرای وەقفکەر.

هەروەها ئەگەر کۆمەڵێك کتێبی ئایینی وەقف کرا لەسەر خوێندنخانەیەك، بەو شەرتەکە ئەو کتێبانە نەگوێزرێنەوە لەو خوێندنخانەیە و لەئەنجاما، ئەو خوێندنخانەیە نەما، یاخود پێویستی بە هەندێ لەو کتێبانە نەبوو، ئەوە لەو حاڵانەدا، گواستنەوەی ئەو کتێبانە دروستە بۆ خوێندنخانەیەکی نزیك، چونکە دیارە وەقفکەرەکە مەبەستی ئەوە نەبووە سوود لەو کتێبانە وەرنەگیرێو بێ کەڵك دابکەون وە ئەگەر باخێك وەقف کرا لەسەر دووکەس کە پاش ئەوان بدرێ بە لاتو هەژاری ئەو شوێنە، ئەوە دروستە و لەم سوورەتەدا، ئەگەر یەکێکیان مرد، بەشەکەی ئەدرێ بەوی تریان وکە ئەویش مرد، بەشی هەردووکیان ئەدرێ بە هەژارەکان.

## باسی کۆکردنەوەو ڕێکخستن (جَمْع و تَرتیب) لەوەقفدا

ئەگەر کەسێك ماڵی وەقف کرد لە مناڵەکانی خۆی ـ مەسەلا ـ لەمسوورەتەدا، ئەگەر بەئاشکرا بڕیاری داکە بەتەرتیب بدرێ بەومناڵانە، وەك ئەوەکە بڵێ: وا ئەم ماڵەم وەقف کرد لەسەر مناڵەکانم و پاش ئەوان لەسەر مناڵی ئەوان، تا یەك کەس لە مناڵی پشتی خۆی مابێ، نادرێ بە مناڵی مناڵەکانی وە ئەگەر وتی: وا وەقفم کرد لەسەر مناڵمو مناڵی مناڵم لەوانە کە نەسەبیان ئەگاتەوە بە من، ئەوە ئەدرێ بە کوڕو کچی خۆی و بە مناڵی کوڕیشی لە کوڕو کچ، وەك یەك، با ژمارەیشیان زۆر بێ و بەشی مناڵی کچەکانی لێ نادرێ، چونکە نەسەبیان ناچێتەوە سەر کابرای وەقفکەر وە ئەگەر وتی: وا وەقفم کرد لەسەر مناڵمو مناڵی مناڵم بەپێی میرات، ئەوە ئەگەر یەکێك لەو کوڕانە یا لەو کچانەی خۆی مردن، بەشەکەیان ئەدرێ بەو ئەولادانە کە میراتیان لێ وەرئەگرن لە کوڕو لە کچ، بۆ نێرینە دوو بەشو بۆ مێینە بەشێك وە ئەگەر وتی: وەقفم کرد لەسەر

ماڵی نێرینەم‌و ماڵی نێرینەی ماڵم بە ئوسوولی میرات، ئەوە ئەدرێ بە کوڕی کوڕی و نادرێ بە کچی کوڕی و نایشدرێ بە کچی خۆی و بە ئەولادی کچی، خواه کچ بن یا کوڕ وە ئەگەر وتی: وەقفم کرد لەسەر ئەولادم‌و ئەولادی ئەولادم و بەم‌پێیە، ئەوە بەپێی سەر،وەك یەك، ئەدرێ بە هەموو ئەفرادی چینی ئەولادەکانی لەکوڕو لەکچ، چ لەکوڕی خۆی پەیدا ببن، یا لەکچی پەیدا ببن.

وە ئەگەر هەر وتی: وا ئەم ماڵەم وەقف کرد لە ئەولادم، ئیتر لەوە زیاتری نەوت، ئەوە وەقفی دوابڕاو (مُنقطِع الآخَر)ی پێ ئەڵێن و ئەو ماڵە ئەدرێ بە ئەولادەکانی پشتی خۆی، لەکوڕو لەکچ و کاتێ هەموو ئەمانە مردن، وەك‌یەك ئەدرێ بەوکەسانەکە نزیکن بەوەقف‌کەرەکە لەناو میرات‌بەرەکانا و لە غەیری میراتبەرەکان، وەك کچی کوڕو کوڕی کچ وە کوڕی کوڕو کچی کچ، وەك‌یەك؛ هەروەها، تەماشای سیفەتی نزیکی ئەکرێ لە وەقف‌کەرەکە؛ بەڵێ ئەگەر دەلیل هەبوو لەسەر ئەوەکە ئەولادی ئەولادیشی مەبەست بووە؛ مەسەلا، لەکاتی وەقفەکەدا، وتی: با ئەم ماڵە لە نەسەبی خۆم دەرنەچێ، ئەوە ئەدرێ بە ئەولادی کوڕیشی، بەڵام نادرێ بە ئەولادی کچی، چونکە نەسەبی ئەولادی کچ نایەتەوە سەر ئەم.

ئەگەر وتی: ئەم‌ماڵەم وەقف کرد لەسەر وەچە (ذُرِيّة)ی خۆم، یا: لەسەر نەتەوەی خۆم، یا: نەسڵی خۆم، یا: پاشماوەی خۆم، ئەوە ئەدرێ بە ئەولادو ئەولادی ئەولادی، لە کوڕو لە کچ وە لە کوڕو لە کچ و لە کوڕەزاو کچەزا و لەوەیش بەرەوخوارتر، مەگەر بڵێت: بۆئەوانەیان کە نەسەبیان ئەگاتە سەر خۆم. ئەگەر وتی: وەقفم کرد لە نێرینەی ئەولادو ئەولادی ئەولادم، ئەوە نادرێ بە کچی خۆی، هەروەها بە کچی کچیشی چونکە مادام بە لەفزی نێرینە کچەکانی دەرچوون، دیارە بە «طَـرِيقُ الأَوْلَـى» کچی کچیشی دەرئەچێ، بەڵام کوڕی کچی دەرناچێ، مادام بە قەرینەیەك دەرنەکەوێ کە مەبەستی ئەولادی نەسەبی خۆیەتی.

هەر سیفەتێك کە بخرێتە پێش چەند موفرەد، یا چەند جوملەیەك کە بەسرابن بەیەکەوە بەهۆی حەرفێکی عەتفی‌واوەکە بەرودوا نەگەیەنێ، ئەوە، مەعنای ئەو سیفەتە

ئیش ئەکا لە هەموو ئەوانەداکە کەوتوونەتە دوای؛ مەسەلا، ئەگەر وەقفکەر وتی: وا ئەم ماڵەم وەقف کرد لە خوێندەوارانی کوڕو کوڕەزاو کوڕەزازام، یاخود وتی: ئەم ماڵەم وەقف کرد لە پیاوچاکانی ئەو پێشنوێژانە کە لەم مزگەوتەدا نوێژ ئەکەن و ئەو مامۆستایانە کە لەم خوێندنخانەیەدا دەرس ئەڵێنەوە و ئەو ئامۆژگارانەی کە لەو تەکیەدا ئامۆژگاری خەڵك ئەکەن، ئەوە ئەو سیفەتە تەماشا ئەکرێ لە کوڕو کوڕەزاو کوڕەزازاو پێشنوێژو مامۆستاو ئامۆژگاریکەرەکاندا، هەروەها ئەگەر ئەو سیفەتە لە ناوبەیندا یا لەدوای هەموو ئەو موفرەدو جوملانەدا بێ کە باسمان کردن. هەروەها جیاکردنەوە (استثناء)یش، وەك ئەوە کە بڵێت: ئەو ماڵەم وەقف کرد لە پێشنوێژی ئەم مزگەوتەو لە مامۆستای ئەو خوێندنخانەیەو لە فەقێ کانی، ئەوانەیان نەبێ کە دەوڵەمەندن.

بەڵام ئەگەر حەرفی عەتفەکە، مەعنای دواکەوتنی بێ مۆڵەت یا دواکەوتن و مۆڵەتی پێکەوە ئەگەیاند، ئەوە ئەو سیفەتە یا ئەو جیاکردنەوەیە هەر بۆ ئەوەیە کە کەوتووەتە پاش حەرفی عەتفەکەو هیچیان نەکەوتووەتە بەین و لەسوورەتی پێشکەوتنیا لەسەر هەموویان، ئەوە هەر بۆ پێشووەکەیانە؛ مەسەلا، ئەگەر وتی: ئەم ماڵەم وەقف کرد لە ساڵحانی ئەم فەقێ یانە و پاش ئەوان لە کوڕەکانی خۆم و پاش ئەوان لە برازاکانم، ئەوە سەلاحەتەکە هەر بۆ فەقێکان دائەنرێ وە ئەگەر وتی: ئەم باخەم وەقف کرد لە کوڕەکانی خۆم وە پاش ئەوان، لە برازاکانم و پاش ئەوان، لە خوشکەزاکانم، مەگەر تەرکی نوێژ بکەن، ئەوە جیاکردنەوەکە هەر بۆ خوشکەزاکانە.

بزانن! هەرشتێ وەقفکرا لە قورئان خوێن، یا لە فەقێ، یا لە مامۆستا، ئەوە ئەگەر وەقفکەرەکە بە ئاشکرا باسی شەرتێکی کرد، وەك ئەوە کە قورئانخوێنەکە ڕۆژی چوار جوزء قورئان بخوێنێ ـ مەسەلا ـ یا فەقێکە ڕۆژی چوار سەعات خەریکی خوێندن بێ، یا مامۆستاکە ڕۆژی چوار سەعات دەرس بڵێتەوە، ئەوە دیارە وە ئەگەر باسی نەکرد، ئەوە بەپێی عورفی دامەزراوی وڵاتی کابرای وەقفکەر مەعنای لێ ئەدرێتەوە وە ئەگەر لە وڵاتەکەی ئەودا عورف نەبوو، یاخود نەزانرا عورفیان چۆنە، بە عورفی وڵاتی ئەوانە مەعنای لێ ئەدرێتەوە کە وەقفەکەیان لەسەر کراوە.

وە ئەگەرفەقێکان دەسیان هەڵگرت لە خوێندن، ئەوە ئەگەر ڕۆژانی نەخوێندنەکەیان ڕێکەوتی ڕۆژانی ئیسراحەتی عادەتی بوو، وەك جومعەو سێ‌شەممەو ڕۆژانی ڕەمەزانو جەژن، ئەوە حەقی خۆیانیان هەرئەکەوێ وە ئەگەر غەیری ئەو ڕۆژانە بێ، ئەوە بۆ ئەو ڕۆژانە هیچیان ناکەوێ، مەگەر وەقفکەرەکە وەختی نەخوێندنی ـلەبەر عوزر ـ جیا کردبێتەوە.

وە ئەگەر مامۆستا یا دووبارەکەرەوەی دەرس، بەبێ‌عوزر خۆی گوم کرد، ئەویش هیچی ناکەوێ، هەروەها ئەگەر لەبەر عوزرێکیش خۆی گوم کردبێ، بەڵام کەسێکی لێهاتووی لەجێگەی خۆیا دانەنابێ، بەڵام ئەگەر بەعوزر خۆی گوم کردبێ‌و کەسێکی شایانی لەجێی خۆیا دانابێ، ئەوە حەقی نافەوتێ.

## باسی موڵکییەتی گەردنی ماڵەوەقف کراوەکە

موڵکییەتی گەردن (رَقَبة)و شەخسیەتی ماڵی وەقف کراو، بۆ خوای گەورەیەو پەیوەندی ئادەمیزادی پێوە نییە، ئیتر ئایا لەسەر کەسێکی دیاری وەقف کرابێ یا لەسەر جیهەتێك، بەڵام مەنافیعی مەوقووفە موڵکی ئەوکەسانەیە کە وەقفەکەیان لەسەر کراوە و ئەو کەسانە ئەتوانن ئەو مەنفەعەتانە وەربگرن، چ بە نەفسی خۆیانو چ بەهۆی کەسی ترەوە، بە ئیعارە یا بە ئیجارە؛ هەروەها ئەبن بە خاوەنی کرێی ماڵە وەقف کراوەکەو هەموو سوودێکی، وەك میوەی باخ‌و موو و خوری‌و ڕۆن‌و شیرو دۆی حەیوان‌و بەچکەکانی؛ بەڵێ، ئەگەر لەکاتی وەقف کردنی باخەکەدا سەمەری دەرکەوتبوو، ئەوە ماڵی وەقفکەرەکەیە وە ئەگەر ئەوکەسەکە باخەکەی لەسەر وەقف کراوە، لەپاش دەرکەوتنی سەمەرەکە مرد، ئەوە ئەو سەمەرە موڵکی خۆیەتی‌و بە میرات ئەگاتەوە بە میراتبەرەکانی. ئەمەی کە باسمان کرد، بۆ وەقفێکە کە موتڵەق بێ، یاخود شەرتی هەموو فائیدەکانی بۆ وەقف لەسەر کراوەکە کرابێ، بەڵام ئەگەر کەسێك وڵاخێکی وەقف کرد لەکەسێ بۆ سواربوونی، ئەوە هەرچی فائیدەی هەیە، بۆ ئەو کەسەیە کە وەقفی کردووە.

ئەگەر حەیوانی وەقف کراو نزیك بووەوە لە مردن، ئەوە واجبە سەرببڕرێو بە قیمەتی گۆشتەکەی حەیوانێك یا بەشە حەیوانێك بکڕرێو لەجێگەیا دابنرێ وە ئەگەر ئەوەندە قیمەتی نەبوو، دروستە بۆ وەقفلەسەر کراوەکە کە سەرفی بکا بۆخۆی، هەروەها پێستی ماڵی وەقف کراو هی ئەوکەسەیە کە ماڵەکەی لەسەروەقف کراوە. ئەگەر درەختێکی وەقف کراو وشكبوو، لە وەقف کراوی ناکەوێ؛ بەڵێ، ئەگەر کەڵکی سوودلێوەرگرتنی نەما، ئەفرۆشرێو بە قیمەتەکەی درەختێکی سەوز ئەکڕرێو لەجێگەیا ئەکرێ بە وەقف. هەروەها، حەسیری مزگەوت لەپاش ئەوە کە کۆن بوو، یا داری بانی ماڵی مەوقووفە ئەگەر کۆن بوو، ئەفرۆشرێن؛ ئەمباسە، لەسەر ئەجزای ماڵی وەقف کراوە، بەڵام هەرشتێ کە سەرپەرشتیکەری ماڵی وەقف بە بەرهەمی وەقفەکە کڕیبووی‌و هێشتا وەقفی نەکردبوو، ئەوە بە بێشوبهە لە هەموو حاڵێکا فرۆشتن‌و گۆڕینەوەی بەشتێ‌تر، دروستە.

ئەگەر مزگەوتێك نزیك بوو لە رووخانەوە و بەرهەمەکەی بەشی ئاوەدان کردنەوەو موستەحەقەکانی نەئەکرد، ئەوە واجبە لەپێشا مزگەوتەکە ئاوەدان بکرێتەوە، چونکە مەسڵەحەتی ماڵە وەقف کراوەکە لەپێش مەسڵەحەتی ئەوکەسەوەیەکە ماڵەکەی لەسەر وەقف کراوە.

ئەگەر مزگەوتێك رووخاو ماوەی ئەوە نەبوو بکرێتەوە، ئەوە عەرسەکەی ئەهێڵرێتەوەو بە قەتعی دروست نییە بفرۆشرێ؛ جا ئەگەر ئومێدی ئەوە هەبوو کە لە پاشەڕۆژا بکرێتەوە، ئەوە بەروبوومەکەی هەڵئەگیرێ بۆ ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکەو مەسرەف بۆکردنی وە ئەگەر ئومێدی ئەوەمان نەبوو، سەرف ئەکرێ بۆ مزگەوتێك کە لە هەر مزگەوتێکی‌تر نزیکتر بێ لێیەوە وە ئەگەر چەند مزگەوتێك وەك یەك نزیك بوون لەو مزگەوتەوە، بۆ ئەوەیان سەرف ئەکرێ کە لەهەموویان موحتاجترە وە ئەگەر وەك یەك بوون لە موحتاجی‌دا، ئەدرێ‌بە یەکێکیان وە ئەگەر ئەوە ئەبوو بەهۆی هەرا، دابەش ئەکرێ لەنێوانیانا وە ئەگەر مزگەوتێکی ئاوەدان بەرهەمی لە مەسرەفی زۆرتر بوو، ئەوە زیادە بەرهەمەکەی ئەدرێ بە موڵك، وەك ئەرزو ئاوو باخ‌و دووکان‌و خانوو، بەپێی

ئەوەی کە سەرپەرشتیکەری ماڵی وەقفی ئەو مزگەوتە بە مەسڵەحەتی ئەزانێ و تا ئەو شتەکڕاوە نەکرێ بە وەقف، حوکمی موڵکی رووتی هەیەو تەسەڕوفی تیا ئەکرێ بە فرۆشتنو غەیری فرۆشتن.

ئەگەر کەسێك ماڵێکی وەقفکرد لە مزگەوت و بەیانی ئەوەی نەکرد کە چۆن بۆی سەرف بکرێ، ئەوە قسەی باوەڕ پێکراو ئەوەیە ئەو وەقفە دائەمەزرێو بەرهەمی ماڵە وەقفکراوەکە لەو شتانەدا سەرف ئەکرێ کە مەسڵەحەتی مزگەوتەکەی تیابێ، وەك ئاوەدان کردنەوەی و لەو شتانەدا کە پێویستن بۆ مزگەوتەکە، وەك فەرشو چراو سووتەمەنیو خادیمو ئاوو شتیوا و سەرفناکرێ بۆ لاتو هەژاری مزگەوتو دەورپشتی مزگەوت، هەروەها سەرف ئەکرێ بۆ بانگدەرو پێشنوێژ، وەك لە کتێبی «رَوضة»دا نەقڵ کراوە لە فەتاوای ئیمامی غەزالییەوە، چونکە نوێژو جەماعەت، بە بێ بانگدەر و پێشنوێژ ناکرێ.

ئەم تەفسیلاتە، بەنیسبەت ئەو شوێنانەوەیە کە عورفو عادەتێکی دیاریان نەبێ؛ ئەگینا، بە پێی ئەو عورفو عادەتە ئەجوولێینەوە، هەتاوەکوو ئەگەر عادەتی وڵاتێك وابوو نانی میوانی ئەو شوێنە لە بەروبوومی مزگەوت ئەدرا، یا خزمەت کردنی حەوزو ئاودەسخانە لەسەر حیسابی ماڵەوەقف کراوەکە جێبەجێ ئەکرا، یا مانگانەی ئەو کەسەی نوێژو رۆژوو بەخەڵك فێر ئەکاو ئامۆژگارییان ئەکا، لە مەسرەفی مزگەوت ئەدرا، ئەوە بەپێی ئەو عورفو عادەتە ئەجوولێینەوە.

ئەگەر زەوییەك وەقف کرا لە مزگەوتێك بۆ ئەوە کە بکرێ بە گەنمو بەرهەمەکەی خەرج بکرێ بۆ ئەو مزگەوتە، ئەوە پێویستە هەر گەنمی تیا داچێنن؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو دانەوێڵەیە کە کابرای وەقفکەر بڕیاری داوە هەر ئەو داچێنن، زۆر بێقیمەت بوو وە ئەگەر دانەوێڵەیەکیتریان داچاندایە بەرهەمی زۆرتر ئەبوو، ئەوە ئەو دانەوێڵەیە [ـکە بەرهەمی زۆرترە ـ] دائەچێنرێ و ئەم کردەوەیە بە گوێنەدان بەشەرتی وەقفکەر دانانرێ، چونکە لە وەقفەکەیدا بە ئاشکرا نەیوتووە: نابێ غەیری گەنم هیچیتر داچێنرێ لەو زەوییە وەقف کراوەدا، یاخود ئەڵێین: ئەم شەرتانە هەرچەند رووئەکەنە

شتێکی تایبەتی، بەڵام مەبەست لێیان بەروبووم وەرگرتنە بۆ مزگەوتەکە؛ کەواتە، مەبەست روو ئەکاتە هەرچی کە بەرهەمی زیاتر بێ.

له «تُحفة»دا، ئەڵێ: له «أَنوار»دا فەرموویەتی: هەرکاتێك قەبرستان کۆن ببێ، دروست نییە بۆ پێشەوای موسوڵمانان بیدا بەکرێ بۆ کشتوکاڵ تیا کردنو بەرهەمەکەی خەرج بکا بۆ سوودی موسوڵمانان، بەڵام ئەمە بە قەبرستانێك مەعنای لێ ئەدرێتەوە کە وەقف کرابێ بۆ شاردنەوەی مردوو، نەك قەبرستانێك کە موڵك بێ، چونکە قەبرستانی موڵك، موڵکی خاوەنەکەیەتی ئەگەر بناسرێ کێیە وە ئەگەر نەناسرێو نائومێد ببین له دۆزینەوەی، ئەوە بە ماڵی بێخاوەن دائەنرێو تەسەروف تیا کردنی، ئەگەرێتەوە سەر ئەوە کە پێشەوای موسوڵمانان بە مەسڵەحەتی ئەزانێ؛ هەروەها، هەر قەبرستانێکیش کە دیاری نەبێ ئاخۆ وەقفە یا موڵکە، ئەوەیش هەر بەدەستی پێشەوای موسوڵمانانە.

درەختێ کە له قەبرستانێکا روابێ، هەرمیوەیەکی هەبێ، حەڵاڵە بۆ خەڵك بە خۆڕایی و باشتر ئەوەیە بۆ مەسڵەحەتی قەبرستانەکە سەرف بکرێ، بەڵام درەختێ کە له حەوشی مزگەوتێکدا نێژرابێ، ئەوە ئەگەر بزانین کەسێکی تایبەتی ناشتوویەتی بۆ قازانجی گشتی، ئەوە میوەکەی حەڵاڵە بۆ هەمووکەس، هەروەها ئەگەر نەزانین نیازی ئەوکەسە چیبووەکە ناشتوویەتی وە ئەگەر زانراکە بۆ مزگەوتەکەی ناشتووە، ئەوە هی مزگەوتەکەیەو دروست نییە کەس بە خۆڕایی لێیبخوا.

## باسی سەرپەرشتیکەری ماڵی وەقفکراو

ئەگەر وەقفکەر بڕیاریدا کە خۆی سەپەرشتی ماڵە وەقفکراوەکە بکا، ئەوە باشە وە ئەگەر کەسێکی تری دانا، خواه ناوی ئەوکەسە بێنێ، یا باسی سیفەتەکانی بکا، وەك ئەوەکە بڵێ: فامیدەترینی مناڵەکانم، ئەوەیش بەپێی بڕیارەکەی ئەو ئەجووڵێینەوە وە ئەگەر کەسی دیاری نەکرد، ئەوە قازی ئەو شوێنە ئەبێ بە سەرپەرشتیکەر. شەرتی سەرپەرشتیکەر ئەوەیە دادپەروەرو بەکیفایەت بێ وە سەلیقەی بشکێ بەو تەسەروفاتەی

کە لە ماڵە وەقف کراوەکەدا ئەکرێت. ئیشی ئەم سەرپەرشتیکەرە، بریتییە لە ئاوەدان کردنەوەی ماڵە وەقفەکەو بەکرێدانی وکۆکردنەوەی بەرهەمی و دابەش کردنی لەنێوان ئەوانەداکە موستەحەقینی وە ئەگەر بەتایبەتی هەر هەندێك لەم ئیشانە درابووە دەستی، ئەبێ هەر ئەوە بکاو لێی لانەدا.

جا ئەگەر غەیری وەقفکەرەکە بوو بە سەرپەرشتیکەری ماڵە وەقف کراوەکە، تەماشا ئەکەین، ئەگەر وەقفکەرەکە کرێیەکی بۆ دانابوو، ئەوە وەری ئەگرێ، هەرچەند لەکرێی ئیشێکی وەك ئیشەکەشی زیاتر بێ وە ئەگەر بۆی دانەنابوو، ئەوە ئەگەر ئارەزووی هەبوو بەپیاوەتی ئەو ئیشەبکا، ئەوە باشە وە ئەگەر ئارەزوویشی نەبوو، بچێتە لای قازیو داوای کرێی لێبکا کە بۆی دیاری بکا؛ «ابنُ الصَّبّاغ»، فەرموویەتی: دروستە سەرپەرشتیکەری ماڵی وەقف بەبێ ئەوەی بچێتە لای قازی، خۆی لە بەروبوومی ماڵە وەقفەکە کرێی هاوچەشنی خۆی وەربگرێ، بەتایبەتی ئەگەر مەترسی لە جەوری قازی ئەکرا.

جا پاش ئەوە کە سەرپەرشتیکەرەکە دەسی کرد بە سەرپەرشتی، هەر مەسرەفێ بکا بۆ ماڵە وەقف کراوەکە لەسەر بەروبوومی ئەو ماڵە ئەبژێررێتەوە، ئەگەر وەقفکەرەکە خۆی ماڵێکی دیاری نەکردبێ بۆ ئەو جۆرە مەسرەفەو ئەگەر سەرپەرشتیکەرەکە جێگەدارێکی گرت بۆ خۆی بۆ ئیش کردن، ئەگەر سەرپەرشتیکەرەکە خۆی کرێی نەبوو، ئەوە کرێی جێگەدارەکەی لە ماڵە وەقف کراوەکە ئەدرێ وە ئەگەر کرێی بوو، ئەوە لەسەر خۆیەتی.

بزانن! هەر دەعوایەك کە بێتە سەر ماڵی وەقف، ئەوە کابرای سەرپەرشتیکەری ئەو ماڵە ئەبێ بە تەرەف لەو دەعوایەدا وە ئەگەر پێویست بێ ماڵە وەقفەکە دەعوای بۆ بکرێ بەرامبەر جیهەتێکی تر، ئەبێ سەرپەرشتیکەرەکە ئیقامەی ئەو دەعوایە بکا. سابت بوونی وەقف لەسەر کابرایەکی دیاری، وەك بە پێ‌لێنانی وەقفکەرەکە خۆی ئەبێ، بە شاهیدێكو سوێندێکی وەقف لەسەر کراوەکە خوێشی ئەبێ، بەڵام وەقف لەسەر جیهەت، یا ئەبێ بە پێ‌لێنان سابت ببێ یا بە دوو شاهید وە ئەگەر موستەحەقەکان لەگەڵ

سەرپەرشتیکەری وەقفەکەدا بوو بەهەرایان لەسەر بەدەستەوەدانی حوقووقی خۆیان، ئەوە ئەگەر سەرپەرشتیکەر شاهیدی هەبوو کە حەقیخۆیانی داونەتێ، ئەوە باشە، ئەگینا باوەڕ بە سوێندی ئەوان ئەکرێ لەسەر وەرنەگرتنی ئەو حەقەی کە داوای ئەکەن.

دروستە بۆ وەقفکەر، سەرپەرشتیکەری ماڵە وەقفکراوەکە عەزل بکا ئەگەر لە ئەسڵی وەقفەکەدا شەرتی نەکردبێ ئەم شەخسە سەرپەرشتیکەر بێ، هەروەها بۆی دروستە عەزلی ئەو کاربەدەستانە بکا کە دایانئەنێ، وەك مامۆستاو پێشنوێژو بانگدەرو هەروەها فەقێیش و بۆ سەرپەرشتیکەرەکەیش دروستە ئەمانە عەزل بکاو هیتریان لەجێگەدا دانێ کە یا باشتر بن لەوان یا وەك ئەوان وابن، بەڵام گوناهە هیوایان لەجێگەدا دانێ کە وەك ئەوان وابن، مەگەر لەبەر عوزرێك، وەك ئەوە کە کاربەدەستە عەزلکراوەکان لایق نەبن بۆ ئەو ئیشەی کە پێیان سپێررابوو و بەقەتعی حەرامە گۆڕینی کاربەدەستێك بە کاربەدەستێکیوا کە ئەوەندەی ئەو باش نەبێ، بەڵکوو بەم کردەوەیە کابرای سەرپەرشتیکەر ئەبێ بە فاسقو بەپێی شەرع لە سەرپەرشتی ئەکەوێ.

ئەگەر سەرپەرشتیکەر ماڵێکی وەقفیدا بەکرێ بە فاسقو بەپێی ئەندازەیەك پارە و لەپاش عەقدەکە کابرایەك پەیدابوو وتی: زیاتر ئەدەم لە کابرای کرێچی، لەم حاڵەدا سەرپەرشتیکەرەکە حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە، بەڵام بەو شەرتە لە ئەساسدا کەمتەرخەمی نەکردبێ.

## باسی بەخشین (هِبَة)

بەخشین (هِبة) لەشەرعدا، بریتییە لەوە کەسێك عەینێك یا قەرزێك یا کەڵکێك بکا بە موڵکی کەسێك بە خۆڕایی؛ جا ئەگەر کەسێك لە حەیاتی خۆیدا ماڵێکی کرد بە موڵکی کەسێکی موحتاج بەهیوای جەزای رۆژی قیامەت، ئەوە ناوی «سەدەقە»یە وە ئەگەر ناردی بۆی، ئەوە دیاری (هديَّة)یە؛ بینا لەسەر ئەم بەیانە؛ ئەبێ ئەوەی کە دائەنرێ بۆ میوان یا ئەو میوەیە کە بەئیزنی خاوەن باخ لە باخێکا ئەخورێ، ئەبێ بخرێتە بەر ئوسوولی «إِباحَة»، یەعنی حەڵاڵ کردنو رەوا بینین.

ئەرکانی بەخشین، چوارە «واهِب» ماڵ بەخش؛ «مَوهوبٌ لَه»: ماڵ پـێ‌بـەخشراو؛ «مَوهُوب»: ماڵەبەخشراوەکە؛ «صیغة»: ئەولەفزە کە عەقدەکەی پێ‌دائەمەزرێ. شەرتی بەخشندە، ئەوەیە باڵغو عاقڵ بێ‌و بەئارەزووی خۆی مـاڵەکـە بـبەخشێ؛ کـەواتـە، بەخششی منداڵو شێت‌و زۆر لێ‌کراو، بەتاڵە، هەروەها بـەخششی کـەسێ کـە لەبـەر عەیبەو رووگیری، شتێ بدا بەکەسێك و پێویستە تەسەڕوفاتی لە ماڵی خۆیدا دروست بێ؛ کەواتە کەسێك لەبەر لاتی حیجری لەسەر دانرابێ، دروست نییە تەسەڕوف لەو ماڵەیدا بکا کە حیجرەکەی لەسەر دانراوە.

شەرتی ماڵ پێ‌بەخشراوەکەیش، ئەوەیە قابیلی ئەوەبێ ببێ بە خاوەن موڵك؛ کەواتە بەتاڵە بەخشینی شتێ بە منداڵێ کە لە سکی دایکیا بێ و بەخشینی شت بە حەیوانات بە نیازی خۆیان؛ بەڵێ، دروستە بەخشین بە مزگەوت‌و خوێندنخانەو نەخۆشخانە و لەم حاڵەدلـەرپەرشتی‌کەری ئەو شوێنانە بەخشینەکە قەبووڵ ئەکا وە ئەگەر سەرپەرشتی‌کەریان نەبوو، قازی قەبووڵی ئەکا. هەندێ لە زانایان، وتـوویانە: قـەبووڵ پـێویست نـییە لە بەخشینا بە جیهەتێکی گشتی وەك مزگەوت‌و خوێندنخانەو ئەم جۆرە شوێنانە.

شەرتی ماڵە بەخشراوەکەیش، ئەوەیە ئەگەر عەین بێ، بینرابێ. کەواتە دروست نییە کوێر شتێك ببەخشێ یا پێی‌ببەخشرێ و بۆ موعامەلەی بەخشین لەگەڵ کوێردا، وەکیل پێویستە و هەرشتێ کە فرۆشتنی دروست بێ، بەخشینیشی دروستە؛ بەڵێ، لە چەندشوێنێکا فرۆشتن دروستە، کەچی بەخشین دروست نییە، وەك شتێ کە وەسف کرابێ لەئەستوێ فرۆشیارەکەدا، ئەوە فرۆشتنی دروستە، کە چی بەخشینی دروست نییە، هەرچەند لە هەمان مەجلیسدا پاشان بێتە بەرچاوو کابرای ماڵ پێ‌بەخشراو وەری‌بگرێ؛ هەروەها لە نەخۆشی مردنا، دروستە ئینسان ماڵی خۆی بفرۆشێ بە میراتگری خۆی بە قیمەتی عادەتی، بەڵام دروست‌نییە ببیەخشێ، بەڵکوو ئەوە ئەبێ بـە وەسـیەت و ئـەوەستێ لەسەر ئارەزووی میراتبەرەکان و باوكو باپیرە دروستە ماڵی منداڵی خۆیـان بـەپێی مەسڵەحەت بفرۆشن، بەڵام بە قەتعی دروست نـییە بـیبەخشن بـە کـەسێك؛ چـەند مادەیەکی‌تریش هەیە لەمچەشنە کە فرۆشتنیان تیا دروستە، بـەڵام بـەخشینیان تـیا دانامەزرێ.

هەرچی کە فرۆشتنی دروست نەبێ، بەخشینی دروست نییە، وەك شتی نامەعلوومو شتی زەوتکراو و شتی ونبوو؛ بەڵێ، کە وەقف کرابێ لە کۆمەڵێك و ئەندازەی بەشی هەرکام لەوانە مەعلووم نەبێ، ئەوە دروست نییە هەرکەس لەوان بەشەکەی خۆی بفرۆشێ، کەچی دروستە لەبەینی خۆیانا سوڵح بکەنو هەموویان وەك یەك یا زیادو کەم دابەشی بکەن و هەرکام لەمانە هەربەشێکی لای برادەرەکەی بێ، پێی ببەخشێ؛ هەروەها، شتی زۆر بێقابیلەتو بێسوود، وەك دوو دەنکە گەنم، فرۆشتنی دروست نییە، کەچی بەخشینی دروستە؛ هەروها، ئیختیساسات، وەك سەگی راوو سەگی پاسو پێستی مردارەوە بوو و تەپاڵەو وێنەی ئەمانە، فرۆشتنیان دروست نییەو بەخشینیان دروستە و پێستی قوربانی، فرۆشتنی دروست نییە، بەڵام بەخشینی دروستە و میوە لەپێش دەرکەوتنی کەڵکیا فرۆشتنی دروست نییەو بەخشینی دروستە و زەوییەك کە تووی تیا داچێنرابێ، یاخود کشتوکاڵێکی وای تیابێ کە بەتەنها نەفرۆشرێ، ئەوە زەویو تووەکە، یا زەویو کشتوکاڵەکە، بەیەکەوە نافرۆشرێن، کەچی بەیەکەوە ئەبەخشرێن و یەکەیەکەی تووەکە یاکشتوکاڵەکە بەتەنها نافرۆشرێن، کەچی بەتەنها ئەبەخشرێن.

«سیغە»یش، بریتییە لە «ئیجاب»، وەك: پێمبەخشیتو کردم بە موڵکتو بە پیاوەتی پێمدایو ئەم جۆرەشتانە وە «قەبوول»، وەك وا قەبووڵم کردو رازیم پێیو پێمباشەوئەم جۆرە قسانە. شەرتی ئەم ئیجابو قەبووڵە، ئەوەیە لەمەعنادا موافقی یەك بن و جیا نەبنەوە لەیەك بۆ ماوەیەکی زۆر. هەندێ لە زانایانی شەرع، فەرموویانە: بەخشین بە بێلەفز، واتە تەنها بە دانو وەرگرتن پێكدێو ئیجابو قەبووڵی ناوێ، بەڵام بە قەتعی لە سەدەقەو لەدیاریدا، لەفز پێویست نییە.

هەروەها شەرتە لە سیغەدا شەرتێکی وای تیا نەبێ کە بەخشینەکە تێكبدا، وەك بڵێ: وا پێم بەخشیت، بەو شەرتە هەرگیز لەموڵکت دەرنەچێ؛ هەروەها، نابێ سیغەی بەخشین بۆ ماوەیەکی تایبەتی بێ، وەك بڵێ: وا ئەممالەم پێبەخشیت بۆ ماوەی ساڵێك و نابێ بەسرابێ بە شتێکەوە، وەك ئەوە بڵێ: هەر وەختێ بەهار هات، ئەم ماڵەم

پێبەخشیت، تەنها لە سەدەقەی عومرو رەقەبەدا نەبێ سیغەی ماوەدار (مُوقَّت) دروستە، چونکە لەمەعنادا وەك هەمیشە وایە.

بزانن! وەك وتمان، لە سەدەقەو دیاریدا ئیجابو قەبووڵ پێویست نییە، بەڵکوو تەسلیم کردنی خاوەنماڵەکە، یا ناردنی بە کەسێکا و وەرگرتنی پێدراوەکە یا وەکیلەکەی بەسە، هەروەها دانانی ماڵەکە کافییە لە بەردەمی ئەوکەسەداکە سەدەقەکەی پێئەدرێ یا دیارییەکەی بۆ ئەنێررێ، قەناعەتیش ئەکرێ بە تەسلیمکردنی ماڵەکە بەدەستی منالێك کە خاوەن ماڵەکە ناردبێتێ.

ئەگەر کەسێك بەکەسێکی وت: وا ئەو خانوومە پێبەخشیت تا خۆت ماویت و کاتێ کە مردی، بۆ میراتبەرەکانت بێ، ئەوە دروستەو لەراستیدا کابرای بەخشندە بەیانی وەزعی بەخشینەکەی کردووە؛ هەروەها، دروستە ئەگەر کابرا بڵێ: وا ئەم ماڵەم پێدای لەسەر ئەساسی ئەوە تا عومرت هەیە بۆ خۆت بێو لەوە زیاتر نەڵێ وە ئەگەر وتی: کە مردیت، بگەرێتەوە بۆ خۆم، ئەوەیش هەر بەخشینەو دائەمەزرێو پاش مردنی کابرایش ناگەرێتەوە بۆیو ئەبێ بە هی میراتبەرەکانی کابرای پێبەخشراو.

بزانن! بەخشینی قەرزێك کە بەسەر کەسێکەوە بێ، ئەگەر بە غەیری ئەوکەسە خۆی بێ، بەتاڵە وە ئەگەر بەو بێ، ئەبێ بە «إِبْراء»، واتە: ئازادکردنی ئەو قەرزارە لە قەرزەکە؛ کەواتە، قەبووڵی ناوێ و مادام ئەم بەخشینە لەمەعنای ئازادکردنایە، ئەگەر ئەندازەی قەرزەکە دیاری نەبوو بۆ یەکێکیان، ئەوە ئەو بەخشینە بەتاڵە و رێگەی دامەزرانی بەخشینیوا، نەزرکردنە، چونکە مەجالی نەزر گوشادترە لە بەخشین و نەزری شتی نەزانراو دروستە.

ئەگەر کەسێك بەکەسێکی وت: هەرچی ماڵم هەیە بۆم حەڵاڵ کردی، ئەوە مەعنای لێئەدرێتەوە بە حەڵاڵ کردن بۆ خواردنو خواردنەوە، نەك بۆ فرۆشتنو بەخشینیو شتیوا و ماڵەکەیش، بەو ئەندازە مەعنا لێئەدرێتەوە کە لەو کاتەدا هەیە؛ جا ئەگەر سیغەی بەخشینی رووتبوو لەباسی بریتی (عوض)، ئەوە بەخشینی بێپاداشە، خواه نیازی بریتی لە دڵیا بووبێ یا نە وکابرای ماڵ پێبەخشراو بچووك بێ یا وەك ئەو وابێ

یا گەورەتر بێ؛ بەڵێ، کاتێك ئەم بەخشینە بێ پاداشە ئەگەر لەگەڵ بەخشینەکەدا بەڵگەیەك بە قسە یا بەقەرینەی شوێن‌نەبێ کە وابگەیەنێ کابرای بەخشندە داوای پاداش ئەکا، ئەگینا واجبە یا کابرای ماڵ پێ‌بەخشراو ماڵەکەی بداتەوە، یا پاداشەکەی پێ‌بدا. هەر لەسەر بنچینەی لەچاو گرتنی بەڵگەو دەرکەوتنی مەبەستی موسوڵمانانە، زانایانی شەرع وتوویانە: هەرکەسێ شتێ بدا بە یەکێك لەسەر ئەساسی ئەوەکە گومانی وابووە لەو شەخسەدا سیفەتێك هەیە و لەراستیدا، ئەو سیفەتەی تیا نەبێ، ئەوە حەرامە ئەو شەخسە ئەو شتە وەربگرێ وە ئەگەر وەری‌گرت، نابێ بە ماڵی‌و فەرزە بیداتەوە بەوکەسە کە پێی‌داوە.

ئەگەر سیغەی بەخشینەکە باسی پاداشی لەگەڵدا بوو، وەك ئەوەکە بڵێ: وا ئەو ماڵەم پێدای بۆ ئەوە ئەو ئیشەم بۆ بکەی یا ئەوکتێبەم بدەیتێ‌و ئەویش قەبووڵی کرد، ئەوە بە خشینی لەگەڵ پاداش (هِبة معَ الثّواب)ەو حوکمی فرۆشتنی هەیەو هەموو حوکمێکی فرۆشتنی تیا جاری ئەبێ، وەك حەقی پەشیمان بوونەوە لە مەجلیسداو شوفعەو دانەدواوە بەهۆی عەیبەوە؛ جا مادام ئەم بەخشینە حوکمی فرۆشتنی هەیە، ئەوە ئەگەر عیوەزەکەی نەئەزانرا چییە، بەخشینەکە بە بەتاڵ دائەنرێ.

بزانن! ماڵی بەخشراو بە ئیجاب‌و قەبووڵەوە وە یا سەدەقەو دیاری، نابن بە موڵکی کابرای پێ‌بەخشراو تا بە نەفسی خۆی یا وەکیلەکەی وەری‌نەگرێ وە ئەگەر یەکێکیان لەبەینی بەخشین‌و وەرگرتنا مرد، میراتگرەکەی لەجێی دائەنیشێ‌و هەرچی حەقی ئەو بووە دێ بۆ ئەم وە ئەگەر شتێك بەخشرا بە منداڵێ، ئەوە ئەبێ وەلی‌ئەمرەکەی بۆی وەربگرێ.

وەرگرتنی ماڵی بەخشراویش کەڵکی نییە، مادام بە ئیزنی ماڵ بەخشەکە یا وەکیلەکەی نەبێ؛ جا ئەگەر کابرا ئەو ماڵەی وەرگرت، بەڵام بەخشندەکە وتی: لەپێش وەرگرتنا پەشیمان بوومەتەوە لە ئیزنی وەرگرتنەکەی و ماڵ‌پێ‌بەخشراوەکەیش وتی: لەپاش وەرگرتنێکی راست پەشیمان بوویتەوە، ئەوە باوەڕ بە سوێندی کابرای ماڵ پێ‌بەخشراو ئەکرێ، چونکە مادام هەردوولا هاودەنگن لەسەرئەوە کە ماڵەکە وەرگیراوە، وادائەنرێ کە وەرگرتنەکە راست‌و شەرعی بووبێ.

وە ئەگەر بەخشندەکە ئیزنی‌دا بۆ وەرگرتنی ماڵەکە و لەپێش ئەوەداکە پێ‌بەخشراوەکە وەری‌بگرێ، کابرای بەخشندە مرد، یا شێت بوو، یا حیجری لاتکەوتنی بەسەرا هات، ئەوە ئیزنی وەرگرتنەکە بەتاڵەو بێ کەڵکە.

سوننەتە بۆ باوكو دایكو بەرەوژوورتر، هاوسانی بکەن لە نێوان مناڵو مناڵەزایانا لەو شتانەدا کە پێیان ئەبەخشن، بۆ ئەوە ناکۆکی‌و ناحەزییان لەناوا پەیدا نەبێ‌و بێ‌ئەدەب نەبن لەگەڵ باوكو دایکیانا، هەتاوەکوو سوننەتە بەشی کوڕو کچو کوڕو کوڕەزا وەكیەك بێت، مەگەر لەحاڵێکا کە یەکێك لەو مناڵانە مەسرەفی زۆرتری بوێ‌و میوانی زۆر رووی تێ‌بکا؛ بەڵکوو هاوسانی کردن سوننەتە لە بەینی خوشكو براو براو برازایشدا، بۆ ئەوە کە پەیوەندی خزمایەتی جێگیر ببێ لەنێوانیانا؛ هەروەها، سوننەتە ئەولادیش بە دادپەروەری بجووڵێنەوە لە خزمەتی باوكو دایکدا و وەكیەك خزمەتیان بکەن وە ئەگەر فەرقیان خست، ئەوە خزمەتی دایکیان زۆرتر بکەن.

بزانن! سەدەقەیەك کەتەنها بۆ ئیحسانو پیاوەتی بکرێ، بە سوننەتێکی گەورە دائەنرێ و لەگەڵێ ئایەت و حەدیسدا ئەمری پێ‌کراوە؛ یەکێ لەو حەدیسانە، ئەفەرموێت، «هەرکەس لە رۆژی قیامەتا لەژێر سێبەری سەدەقەی خۆیدایەتی تا خودا حوکم ئەدا لەبەینی ئەهلی حیسابدا»؛ بەڵێ، حەرامە سەدەقەدان بە کەسێ کە بزانرێ لەرێگای حەراما سەرفی ئەکا و واجبە، بەسوورەتی فەرزی کیفایە، نانو ئاوو جلوبەرگدان بە کەسێك کە لەحاڵەتی ناچاریدا بێ‌و هیچی نەبێ، ئەوەندە هەیە دروستە ئینسان بەرابەر بەشتێك ئەو مەسرەفەی بۆبکا؛ مەسەلا، ئیشی پێ‌بکا لەجیاتیدا، یا بەقەرز حیسابی بکا لەسەری؛ جا ئەگەر نیازی هەبوو لەوەپاش لێی بسێنێتەوە، ئەوە واجبە شاهیدی لەسەر بگرێ کەوا نیازی وایە، ئەگینا ئەگەر کابرای داماو لەوەپاش سوێند بخوا بڵێ: ئاگام لەو نیازە نەبووە، واجب نابێ لەسەری هیچی بداتەوە لەجیاتی ئەوەی کە بۆی خەرج کردووە.

دروستە سەدەقەدان بەپیاوی دەوڵەمەند و دروستە بۆ ئەویش کە وەری‌بگری، مەبەستیش لە دەوڵەمەند ئەوەیە کە زەکاتی پێ‌نەشێ، خواه بەوە کە ماڵی ببێ، یاخود

کاسبییەکی‌وا بزانێ کە لایقی شان‌و شکۆی بێ؛ بەڵێ، ئەوەندە هەیە کەراهەتی هەیە بۆ کەسێك کە نەفەقەی شەو و ڕۆژی خۆی ببێ، ماڵ لە دەستی خەڵك وەربگرێ، مەگەر بزانێ کە پاش ڕۆژەکە موحتاج ئەبێ بە داوا کردن، یاخود کابرا کەسێکی‌وا بێ هەموو وەختی خۆی سەرف بکا لە فێربوونی عیلمدا، یا لە دەرس وتنەوەو ئامۆژگاری کردنی خەڵکدا و کاسبییەکی وای نەبێ کە لایقی شانیبێ، یا ئەگەر خەریکی ئەو کاسبییە ببێ، مەجالی خوێندنەکەی نەمێنێ بەتەواوی؛ لە غەیری ئەم جۆرە حاڵانەدا، شت‌وەرگرتن لە خەڵك کەراهەتی هەیە و داوا کردن حەرامە، بەتایبەتی ئەگەر ببێ بـەهۆی شـەرم‌و خەجاڵەتی‌و کابرای داوا لێ‌کراو لەبەر ڕووگیری شتەکە بدا؛ بەڵێ، داوا کـردنی ئـەو شتانەی کە داواکردنیان عادەت بێ لەناو برادەرانا، ئەوە قەیدی نییە و نە حەرامەو نە کەراهەتی هەیە.

دروستە سەدەقە بە کافریش ئەگەر نەبێ بەهۆی سووکی بۆ موسوڵمانان‌و بۆ دینی ئیسلام، چونکە حەزرەت‌ﷺ، فەرموویە: «ئەجرو سەواب هەیە لە خزمەتی هەرشتێکا کە گیانلەبەر بێ‌و جگەری تەڕ بێ».

تەسلیم کردنی سەدەقە بە پەنامەکی و لە مانگی ڕەمەزانا، بە تایبەتی لە دەی ئاخریا، خێری زۆرە؛ بەڵێ، ئەگەر لەوانە بووکابرا چاوی لێ‌بکرێ، ئەوە خێر لەوەدا زۆرترە کە بەئاشکرا سەدەقە بکا. خێر بۆ خزم‌و خوێش‌و دراوسێ، ئەجری زۆرترە لە خـێر بـۆ بێگانەو لەوانە کە ماڵیان دوورە لە ماڵیەوە. خێر زۆر سەوابی زیاترە بۆ ئەو کەسانە کە پەکیان کەوتبێ، بەتایبەتی ئەوانە کە داوا کردنیان لا عەیب بێ و بۆ ئەو زەعیفانە کـە مەجالی ژیانیان نییە، وەك ژنی داماوو کچی هەتیوو، کوێرو ئیفلیج. بەکورتی، پێویستە ئینسانی موسوڵمان تەنها تەماشای ڕەزای خودا بکا لە خێر کردنا وە کێ زۆرتر داماو بێ، بەوە خێر زۆرتر بکا.

کەسێ کە قەرزار بێ، یا مەسرەفی خێزانی لەسەر بێ، تا لەوان نەمێنێتەوە، حەرامە ماڵەکەی بدا بە سەدەقەو خێرات، مەگەر لەلایەکی‌ترەوە ماڵ شك ببا کە قەرزەکەی لێ بداتەوە، یا مەسرەفی خێزانەکەی لێ‌بکا. هەرکەس زیادی ببێ لە پێویستی خۆی، ئەوە

ئەگەر لەوانەبوو سەبر بکا لە نەبوونیدا، سوننەتە ماڵەکەی بدا بە سەدەقەدا، هەرچەند بۆ خۆی نەمێنێتەوە، بەڵام ئیمڕۆ تەماشای حاڵی خۆی بکا، خێرترە.

دروستە بۆ باوکو لەو بەرەوژوور، پەشیمان ببنەوە لەو شتانە کە داویانە بە ئەولادی خۆیان، هەرچەند زۆر بەرەو خواریش بن، بەڵام ئەم پەشیمان بوونەوەیە، چەند شەرتی هەیە؛

یەکەم: ئەوەیە ئەو شتەی کە بەخشیویانە عەین بێ؛

دووهەم: ئەوەیە بەرامبەر بەو بەخشینە هیچیان وەرنەگرتبێ؛

سێهەم: ئەوەیە ئەو شتەی کە بەخشیویانە سەدەقەی واجب نەبێ؛

چوارەم: ئەوەیە پێدانەکەی بە نەزر نەبێ؛

پێنجەم: ئەوەیە عەینەکە لە موڵکی پێبەخشراوەکەدا مابێ.

کەوابوو، ئەگەر باوکێك قەرزێکی لەسەر کوڕەکەی بوو و گەردنی ئازاد کرد، ئەوە ئیتر حەقی پەشیمان بوونەوەی نامێنێ، هەروەها ئەگەر شتەکەی کە داویەتی شتێکی لە بەرابەریا وەرگرتبێ، وەك «هِبة معَ الثّواب»، یاخود سەدەقەی واجب بێ، وەك زەکات. میسالی ئەمە کە باوك زەکات بدا بە کوڕی خۆی، ئەوەتە کە باوکەکە لە زاتی خۆیا ئەوەندە دەوڵەمەند نەبێ مەسرەفی کوڕەکەی بکەوێتە سەری، لەگەڵ ئەوەیشا ئەوەندە ماڵی هەبێ کە زەکاتی تیا واجب ببێ، هەروەها بەوەیش ئەبێ کە کوڕەکەی ژنی ببێ، لەبەرئەوە باوکەکەی هەرچەند دەوڵەمەند بێ، هەر نەفەقەی کوڕەکەی لەسەرە، ئیتر نەفەقەی بووکەکەی لەسەر نییە؛ کەواتە، دروستە زەکات بدا بەکوڕەکەی بۆ ئەوە سەرفی بکا بۆ خێزانەکەی.

هەروەها، باوك حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە ئەگەر ئەو شتەی بەسوورەتی نەزر دابێ بە کوڕەکەی.

«بێداربن» شێخی «ابنُ حجر»، لەم مەسئەلەیەدا دووقسەی جیاوازی هەیە؛ ئەمزاتە، لە «تحفة»دا فەرموویەتی: باوك حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە و لە «فَتاویٰ»دا فەرموویەتی: حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە؛ لەبەرئەوە، هەندێ لە زانایان بەگوێرەی

قسەکەی «فتاوی» ئەجوولێنەوە، ئەڵێن: «فتوی» لەپێش «تَألیف»ەوەیەو هەندێکیان، بەپێی قسەکەی «تحفة» ئەجوولێنەوەو ئەڵێن؛ «تألیف»، لەپێش «فَتوی»وەیە و هەندێکیشیان، هەردوو قسەکە ئەخەنە یەكو ئەڵێن: بۆیە لە «تحفة»دا وتوویە: حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە، چونکە مەبەستی لە نەزری لەگەڵ بریتییە «نَذر مَعَ العِوض» و بۆیە لە «فَتاوی»دا وتوویە: حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە، چونکە مەبەستی لە نەزری بەخۆڕاییە. بەڵام ئەوەی کە زاناو لێکۆڵەرەوەکان پەسەندیان کردووە، ئەوەتە «تألیف»ی شەخس، لەپێش «فتوی»یەوەیەتی؛ کەواتە، بەپێی قسەکەی «تحفة» ئەجوولێینەوەو نەزرەکەیش هەر بەخۆڕاییەو هەرگیز باوك حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە لە نەزرکردن لە مناڵی، وەك چۆن لە بەخشینی بەبریتیدا حەقی نییە.

هەروەها، باوك حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە، ئەگەر ماڵە بەخشراوەکە لە موڵکی کوڕەکەی دەرچووبێ بە فرۆشتن یا بە وەقف کردن لەگەڵ قەبووڵی ئەو کەسەدا کە لەسەری وەقف کراوە و بە بەخشین لەگەڵ وەرگرتنی کابرای ماڵ پێبەخشراودا؛ بەڵێ، ئەگەر کوڕەکە ماڵەکەی دانابوو لە رەهندا، یا بەخشیبووی بە کەسێك، لەم دوو حاڵەدا، ئەگەر کابرای بە رەهن وەرگرو کابرای پێ بەخشراو ماڵەکەیان وەرنەگرتبێ، باوکی کوڕەکە حەقی پەشیمان بوونەوەی هەیە؛ هەروەها کشتوکاڵ تیا کردنی زەوی یا بەکرێدانی، رێگا ناگرێ لە حەقی پەشیمان بوونەوەی باوك وە ئەگەر پاش ئەوەکە ماڵە بەخشراوەکە لە موڵکی کوڕەکە دەرچوو، جارێکی تر گەڕایەوە بۆ موڵکی، ئەمجار باوکەکە حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە، چونکە ئەمجار ماڵەکە لەڕێگەی ئەوەوە نەبووە بە موڵکی کوڕەکەی.

هەروەختێ باوك ـ مەسەلا ـ حەقی پەشیمان بوونەوەی ببێ، ئەوە هەروەك عەینی ماڵەکە وەرئەگرێتەوە، هەر زیادەیەکیشی کە پێیەوە نووسابێ، وەری ئەگرێتەوە، بەڵام بۆ زیادەی جیاواز حەقی نییە، بەو شەرتەکە لە موڵکی کوڕەکەدا پەیدا بووبێ؛ بەڵێ، ئەگەر وەختی خۆی مەڕێکی ئاوسی دابێ بەکوڕەکەی و مەڕەکە لە ماڵی کوڕەکەدا زابێ، ئەوە باوکی حەقی هەیە بەرخەکەیش بەرێ، چونکە لە سکی دایکیا بووە لەو وەختەدا کە ئەم مەڕەکەی داوە بە کوڕەکەی.

بزانن! حەقی پەشیمان بوونەوە بۆ غەیری باوكو دایكو لەوان بەرەوژوورتر نییە و ئەم پەشیمانبوونەوەیە هەر بە لەفز ئەبێ، وەك ئەوە كە بڵێ وا پەشیمان بوومەوە لەو بەخشینە كە كردم و بەوە نابێ كە بڕوا ماڵە بەخشراوەكە بفرۆشێ، یا بیبەخشێ بە یەكێكی تر، یا وەقفی بكا.

ئەگەر كەسێك دیارییەكی نارد بۆ كەسێك لەناو زەرفێكدا، ئەوە ئەگەر عادەت وابوو ئەو زەرفە بنێررێتەوە بۆ خاوەن دیارییەكە، ئەوە واجبە لەپاش هەڵگرتنی دیارییەكە گورج زەرفەكە بنێرێتەوە و بەكارهێنانی بۆ مەبەستێكی تر، بە قەتعی، دروست نییە وە ئەگەر عادەت نەبوو بنێررێتەوە، ئەوە ئەویش بەدیاری دائەنرێ.

ئاگاداربن! ئەو دیارییانەی كە خەڵك ئەیانبەن بۆ ئاشنای خۆیان لەكاتی خەتەنە سووران‌و شایی‌و پرسەو شتی‌وادا، ئەگەر بەڵگەیەك هەبوو لەسەر ئەوە كەوا بۆیە بردوویەتی لەبەر شەرم و یا لەترسی كابرای دیاری بۆ براو، یا بۆ ئەوەكە خەڵك ناوی بە خراپ نەبەن، ئەوە وەرگرتنی دروست نییە وە ئەگەر كابرای دیاری بۆبراو وەری گرت، ئەبێ بینێرێتەوە وە ئەگەر لەسەر ئەساسی دەسەوام بۆی بردبوو، ئەوە وەرگرتنی دروستە، بەڵام پێویستە ئەمیش لەوەختی خۆیدا ئەوەندەی دیارییەكە شت بەرێ بۆ ئەو ئەگینا قەرزار ئەبێ.

ئەوكەسەكە دیاری ئەبا بۆ كەسێكی تر، ئەگەر نیازی ئەوەی ببێ دیارییەكەی بكا بە موڵكی كەسێكی تایبەتی، ئەوە ئەبێ بە موڵكی ئەوكەسە، خواه لە حاڵی خەتەنەسوورانا، كوڕەخەتەنەكراوەكە بێ یا باوكی یا دەلاكەكە و لە حاڵی شاییدا، زاوا بێ یا بووك یا گۆرانی‌بێژی شاییەكە وە ئەگەر مەبەستی كەسێكی تایبەتی نەبوو، ئەوە ئەگەر عورف‌و عادەتێكی دامەزراو هەبێ لەسەر ئەوەكە ماڵی دیاری لەو حاڵەتەدا بۆ كێ ئەبێ، ئەدرێ بەوكەسە وە ئەگەر عورف‌و عادەتێكی دامەزراو نەبوو، ئەوە زانایانی شەرع لەسەر ئەوەن لە حاڵی خەتەنەسوورانا، دیاری بۆ باوكی كوڕەو هەندێكیش، ئەڵێن: بۆ كوڕەكە خۆیەتی‌و پێویستە باوكی بۆی وەربگرێ و لەشاییا، ئەوەی كە پیاوان ئەیبەن، بۆ زاوایەو ئەوەی ژنان ئەیبەن، بۆ بووكەو ئەوەیش لە شاباشا هەڵی‌ئەدەن، بۆ گۆرانی بێژە.

هەر مەسرەفێ کە لەشیرینی خواردنەوەدا بکرێ، ئەگەر لەپاشان ئیشەکە رێکەوت ئەوە باشە وە ئەگەر رێنەکەوت، لەم وەختەدا، ئەگەر ئەو کەسەکە داوای ژنی کردووە، وەختی خۆی ماڵەکەی دابووە دەستی باوکی ژنەکە یا براکەی -مەسەلا- ئەتوانێ هەمووی لێ‌بسێنێتەوە وە ئەگەر بەدەستی خۆی سەرفی کردبوو، حەقی داواکردنەوەی هیچی نییە، هەروەها ئەگەر وتبێتیان: ئەو ماڵە، مەولوودی پێغەمبەرەﷺ و هەر خزمەتێکی بەلەش کە کابرای خوازبێنی‌کەر بیکا لەسەر ئەساسی هیوای رێکەوتنی ئیشەکە، ئەویش حەقی کرێی هەیە و هەرچی سەرف بکا بۆ ژنەکەو پاشان ئیشەکە رێ نەکەوێ، بەهۆی مردنی ژنەکەوە، یا بەهۆی پەشیمان بوونەوەی یەکێکیانەوە، ئەوە کابرای تەمادار ئەیکەوێتەوە. هەروەها، هەرشتێ کە بدرێ بە کابرای دەسەڵاتدار بەهیوای ئەوە ئیشەکەیان بۆ رێك بخا، ئەوە ئەگەر ئیشەکە سەری نەگرت، ئەبێ ئەو دەسەڵاتدارە بیداتەوە بە خاوەنەکەی، مەگەر ئەو شتەی تەنها لە بەرابەری قسەکردنەوە دابێتی و وەزعی قسەکردنیش لەمەسەلەی‌وادا، لەوانەبێ کرێی بکەوێ.

هەرچی بەدیاری ببرێ بۆ مەلایەك یا پیاوچاکێکی‌تر بەنیازی ئەوە کە ئەو مەلایە مەلایەکی چاکە، یا ئەو پیاوچاکە لەخوا ئەترسێ، ئەوە تەماشا ئەکەین، ئەگەر لە راستیدا وەهابوون، ئەوە دیارییەکەیان بۆ حەڵاڵە، ئەگینا حەرامە وە ئەگەر باوکی ژن، ژنەکەی نەدا بەدەستەوە تا ئەندازەیەك پارەی وەرگرت -کە پێی ئەڵێن: شیربایی- ئەوە ئەو پارەیە حەرامە بۆی و ئەبێ بیداتەوە بە خاوەن پارەکە وە ئەگەر مارەیی ژنەکەی لەسەر برا، ئەوە ئەو پارەیە ئەبێ بە ماڵی ژنەکەو ئەبێ بدرێتە دەستی خۆی، جا ئەگەر ئەو بە ئارەزووی خۆی بەشی باوك یا برا یا هەر کەسی لێ‌بدا، بەبێ‌ترس و رووگیری، ئەوە حەڵاڵە بۆیان، ئەگینا حەرامە وە ئەگەر بەڵگەیەك نەبوو لەسەر ئەوە کە ژنەکە بە ئارەزووی خۆی‌و بێ رووگیری ئەو پارەیەی داونەتێ، حەرامە بۆیان‌و ئەبێ بیدەنەوە.

ئەو بیدعەتە ناشیرینەیش کە هەندێ‌کەس ئەیکەن، دێن پارەی شیربایی ئەدەن بە کەسێکی‌تر بۆ ئەوە لەجیاتی ئەو پارەیە، پارەی حەڵاڵیان بداتێ، ئەوە هیچ سوودێکیان پێ‌ناگەیەنێ، چونکە هەرکەس شیربایی حەرامی وەرگرت، قەرزاری ئەو پارەیە ئەبێ،

ئیتر بیگۆڕێتەوە یا فڕەی بدا یا هەرچی لێبکا، لە قەرزاریی ئەو ماڵە رزگار نابێ تا ئەیداتەوە بە خاوەنەکەی یا ئەوگەردنی ئازاد ئەکا؛ بێجگە لەوەیش، ئەوکەسەکە پارەی حەڵاڵی خۆی بگۆڕێتەوە بە حەرام، موسوڵمان بێ یا ئەهلی زیممە، ماڵی بە حەڵاڵ ناناسرێ، چونکە عەقڵ وەری ناگرێ کەسێك ماڵ وا پەیدا بکا ماڵی حەڵاڵی خۆی بدا بە ماڵی حەرام، ئەوکەسە ماڵی حەڵاڵ بێ، کەوابوو، دروست نابێ بۆ ئینسان ئەو ماڵە حەرامە لەو کەسە وەربگرێو بە حەڵاڵی بزانێ؛ کەواتە، رێگای شەرعی، ئەوەیە ئەوکەسەکە کچ ئەدا بە شوو پارەی شیربایی لە کەس وەرنەگرێ وە ئەگەر وەری گرت، دەس بەجێ پەشیمان ببێتەوەولەگەڵ پەشیمانیو داوای لێخۆش بووندا، بیداتەوە بە خاوەنەکەی.

## باسی نەزرکردن

نەزر لەشەرعدا، بریتییە لە لەگەردن گرتنی کردنی شتێك، ئیتر خواه ئەو شتە خێر بێ یا حەڵاڵ بێ یا گوناه بێت، وەك لەمەولا بەدرێژی باسی ئەکەین.

نەزر، دوو بەشی هەیە؛ بەشێکیان، پێی ئەڵێن: نەزری «لَجاج»، واتە: رقەبەریو کەللەڕەقی؛ جا ئەگەر لەم نەزرەدا، کابرا خێرێکی لە گەردن گرت، وەك ئەوە کە بڵێ: ئەگەر قسەم لەگەڵ فلانکەسدا کرد، نەزر بێ لەسەرم دوو رۆژ بە رۆژوو بم، ئەوە ئەگەر هاتو قسەی لەگەڵ ئەوکەسەدا کرد، ئارەزووی خۆیەتی، یاکەفارەتی سوێندێك بدا بە هەژارو لاتی ئەو شوێنەکە نەزرەکەی تیا کردووە، یا دوو رۆژەکە بە رۆژووبێ وە ئەگەر کارێکی ناخێری لەگەردن گرت، وەك ئەوەکە بڵێت: ئەگەر قسەم لەگەڵ فلانکەسدا کرد، نەزربێ لەسەرم نان نەخۆم یا ئاو نەخۆمەوە، ئەوە هەر کەفارەتی سوێندێکی لەسەرەو بەجێ هێنانی ئەو شتە کە لەگەردنی گرتووە، قیمەتێکی نییە وە ئەگەر ئەو شتەی کە نەزرەکەی لەسەر کردووە گوناه بوو، وەك قسەنەکردن لەگەڵ باوكو دایکیا ـ مەسەلا ـ ئەوە واجبە جێبەجێی نەکاو کەفارەتی سوێندێك بدا وە ئەگەر وتی: هەرکاتێ چوومە ئەو خانووە، کەفارەتێکی سوێندم لەسەر بێ، یا: نەزرێکم لەسەر بێ، ئەوەکە چووە خانووەکەوە، هەر کەفارەتی سوێندێکی لەسەرە.

بەشی دووهەمیش، پێی ئەڵێن: نەزری «تَبَرُّرْ» وناویش ئەبرێ بە نەزری «بِرّی»؛ ئەم بەشەیش، بریتییە لەوە کابرای نەزرکەر خێریك بگرێتە ئەستۆی خۆی بە بێبەستنی بە هیچ مەرجێکەوە، وەك ئەوە کە بڵێت: نەزربێ لەسەرم دووجوزء قورئان بخوێنم، ئەوە هەرکە نەزری وای کرد، ئەبێ بەجێی بهێنێ؛ یاخود بیبەستێ بە دەسکەوتنی دەسکەوتێك، یا رزگار بوونەوە لەمەینەتێك، وەك ئەوە کە بڵێ: ئەگەر ئەمڕۆ کوڕەکەم هاتەوە لە فڵانشوێن، یا ئەگەر رزگارم بوو لەم نەخۆشییە، دە دینارم لەسەر نەزر بێ؛ لەم حاڵەدا، هەرکاتێك دڵخوازەکەی هاتەجێ، ئەبێ نەزرەکە جێبەجێبکا. ئەمەش کە لەناو کوردانا باوە ئەڵێن: شەرت بێ یا ئاد «عَهْد» بێ، ئەوەش هەر سیغەی نەزرە.

ئەرکانی نەزر، چوارە: نەزرکەر (نَاذِر)؛ ئەو شتەی کە نەزرکراوە (مَنذُور)؛ ئەوەی کە نەزری بۆکراوە (منذورٌلَه)؛ سیغەی نەزرەکە، وەکوو باسمان کرد. شەرتی نەزرکەرەکە، ئەوەیە باڵغ و عاقڵ بێ و بەئارەزووی‌خۆی نەزرەکە بکاو تەسەڕوفی دابمەزرێ لەو شتەدا کە نەزری ئەکا؛ کەواتە، دروست نییە نەزری منداڵ و شێت و سەرخۆش و زۆرلێکراو و نەزری کەسێ کە حیجری لات کەوتنی لەسەر دانرابێ لە ماڵە دانراوەکەیدا، هەروەها دروست نییە نەزری وەلی‌ئەمری منال یا شێت لە ماڵی ئەو منالە یا ئەو شێتەدا.

شەرتی نەزرکراوەکەیش، ئەوەیە عەینێك‌بێ یا کەڵکێك بێ قابیل‌بێ بۆ ئەوە کەبکرێ بە موڵکی غەیر؛ کەواتە، دروست نییە نەزرکردنی شتێ کە موڵکی نەزرکەرەکە نەبێ، یاخود موڵکی بێ بەڵام گوێزانەوەی قابیل نەبێ، وەك نەزر کردنی کەڵکی وڵاخێکی سواری کە وەقف کرابێ لە کەسێك بۆ ئەوەی سواری ببێ. فەرقی نییە ماڵی نەزرکراو ناسراو بێ یا نەناسراو و ئێستە ببێ یا لە مەوپاش پەیدا ببێ؛ کەواتە، دروستە کەسێك بڵێت: هەر پارەیەك هەمە لەو قاسەیەدا، یا هەر پارەیەك کە لەمەولا ئەمدەنێ لە کرێی ئیش کردنما لەم مانگەدا، یا هەر میوەیەك کە ئێستا هەمە لەو باخەدا، یا هەر میوەیەك کە ساڵی داهاتوو دەسم ئەکەوێ لەو باخەدا، نەزر بێ لە فڵانکەس؛ هەروەها، دروستە ژن هەر نەفەقەیەکی بکەوێ بۆ ماوەی «عِدّة»ی، نەزری بکا لەو پیاوە کە تەڵاقی داوە،

ئەیشتوانیٰ نەزری مارەییەکەی لیٰبکا، هەرچەند نەزانیٰ چەندە و چەند زەکاتی ئەکەویٰ لیٰی.

شەرتی ئەوەیش کە نەزرەکەی بۆکراوە، ئەوەتە قابیلی ئەوە بیٰ ببیٰ بە خاوەن موڵك، هەرچەند لەمەولایش بیٰ؛ کەواتە، دروستە نەزر لەشێتو لەمناڵو لە بەچکەیەك کەلەسکی دایکیابیٰ، بەڵام دروست نییە نەزرکردن لە حەیوان، بەنیازی خاوەنەکەی نەبیٰ، هەروەها بەتاڵە نەزرکردن لە مردوو. دروستە نەزرکردن لەو کەسانە کە لەسەر قەبری مردوویەك ئەخوێنن، یا لە مزگەوتێکی نزیکیقەبری مردوویەکدا خواپەرستی ئەکەن، یا بۆ ئاوەدان کردنەوەی سەری ئەو قەبرە، یا بۆ خانوویەك کە بە سوورەتێکی شەرعی کرابێتەوە بەسەر ئەو قەبرەوە و بەپێی مەبەستی کابرای نەزرکەر، ئیش ئەکریٰ.

هەروەها ئەگەر کابرای نەزرکەر مەبەستێکی تایبەتی نەبیٰ، بەڵام عورفێکی دامەزراو لەو وڵاتەدا بیٰ بۆ ئەمجۆرە نەزرانە وەك لەکوردەواریداکە ئەڵێن: فڵان شت مەولوودی پێغەمبەر بیٰﷺ، ئەوە مەعنای وایە ئەو شتە سەرف بکریٰ بۆ موسوڵمانان لە هەژارو دەوڵەمەند و خێرەکەی بۆ حەزرەتی پێغەمبەر بیٰ، یاخود وەك ئەوە کەسێك لە مانگی مەولوود «ربیعُ الاوّل»دا، بڵیٰ: ئەمماڵە مەولوود بیٰ، یەعنی بە شاییانەی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوەﷺ بخوریٰ وە ئەگەر کەسێك لە «مەدینەی منەووەرە»دا، وتی: فڵان شتم بڕیاردا بۆ پێغەمبەرﷺ، ئەوە مەعنای وایە سەرفی مەرقەدی موبارەکی پێغەمبەر بکریٰ.

هەروەها ئەمەیش کە لەکوردەواریدا باوەکە ئەڵێن: فڵانەشت نەزری «وەیس» بیٰ یا نەزری «حەزرەتی غەوس» یا «شاهی نەقشبەند» بیٰ، یەعنی بدریٰ بە هەژارو لاتو خێرەکەی بۆ ئەو زاتانە بیٰ، ئەوەیش دروستەو شتەکە سەرف ئەکریٰ بۆ هەژارو لاتی ئەو شوێنانە کە نەزرەکەی تیاکراوە. ئەگەرکەسێکیش نەزری شتیٰ بکا لە مزگەوت یا لە خوێندنخانە یا لە تەکیەو خانەقا، ئەوەیش بە پێی عورفی ئەو شوێنە مەعنای لیٰ ئەدرێتەوە کەواتە سەرف بکریٰ بۆ ئاوەدانکردنەوەو کڕینی فەرشو سووتەمەنی و هەر مەسرەفێکی تری پێویستی ئەو شوێنانە.

دروست نییە نەزر کردن لەشتێ کە ئێستە نەبێ، ئەگەر سەربەخۆ لەو شتە نەزر بکرێ، وەك ئەوە کە بڵێت: ئەم ماڵەم نەزر کرد لەو کوڕەم کە لەمەولا لەدایك ئەبێ، یاخود: لەو مزگەوتە کە لەمەوپاش ئەکرێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر نەبووەکە بخاتە ریزی بوانەوە، وەك ئەوە کە بڵێ: ئەو ماڵەم نەزرکرد لەو کوڕانەم کە ئێستا هەن‌و ئەوانەی لەمەوپاش لەدایك ئەبن، یا لەم مزگەوتەی کە ئێستا لەگەڕەکەکەمانایە و لەو مزگەوتانەی لەمەوپاش ئەکرێنەوە تیایا، ئەوە دروستەو نەزرەکە دائەمەزرێ.

شەرتی سیغەی نەزریش ئەوەیە لە نەزری «بِرّي»دا، لەئەستۆ گرتنی چاکەیەك بێ کە خۆی واجب نەبێ، بە بێ گۆڕینەوە، بەشێوەی «تَنجیز» (دەس بەجێیی)، یاخود لەسەر سوورەتی بەستنەوە بە پەیدابوونی دەسکەوتێك یا لاچوونی نارەحەتییەکەوە؛ کەواتە، نەزر بە وەعدەی رووت پەیدا نابێ، وەك ئەوە کە بڵێ: ئەو ماڵەت ئەدەمێ، بەڵکوو پێویستە بە سوورەتی لەئەستۆ گرتن بێ، هەروەها لە ئەستۆ گرتنی غەیری چاکە دروست نییە؛ کەواتە، دروست نییە یەکێك ئیشێکی حەرام لەئەستۆ بگری یا ئیشێکی حەڵاڵی واکە ببێ بەهۆی حەرام؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك هەرچی هەیە هەمووی نەزر بکا لە کەسێك‌و خۆیشی نەتوانێ بۆخۆی بژی، ئەوە دروست نییەو نەزرەکەی بەتاڵە؛ هەروەها، بەتاڵە نەزر کردنی رۆژوو گرتنی دوانزە مانگەی ساڵ بۆ کەسێ کە ئەو رۆژووە ببێ بەهۆی زیان گەیشتن بە گیانی، یا ببێ بەهۆی ئەوە کە کاسبی پێ‌نەکرێ و گوزەرانی بۆ ماڵ‌و منالی پێ پەیدانەکرێ؛ هەروەها، دروست نییە نەزر کردنی نوێژ کردن لەو وەختانەداکە نوێژکردن کەراهەتی هەیە تیایانا، یا لە شوێنێکی زەوتکراوا، یا لەسەر قەبران.

بزانن! زانایانی شەرع، خیلافیان لەبەینایە لە نەزرکردنی ماڵا لە هەندێ لە منال‌و بێ‌بەش کردنی هەندێکیان لێی؛ ئەم نەزرە، لای خاوەنی «مُغني»و «شَرح رَوض»و «شَرح مَنْهج»و هەندێکی‌تر لە زانایان بەتاڵە، چونکە ئەبێ بە مایەی هەراو ناکۆکی لە بەینیانا، هەرشتێکیش ببێ بەهۆی شتی حەرام، ئەویش حەرامەو نەزری حەرام بەتاڵە؛ بێجگە لەمە، سوننەتە ئینسان هاوسانی بکا لەبەینی منالی خۆیا و لە شوێنی‌وادا،

خیلافی سوننەت بەتایبەتی کەراهەتی هەیەو نەزری مەکرووهیش دانامەزرێ؛ بەڵام ئەو نەزرە بەلای شێخی «ابن حجر»ەوە دروستە، چونکە نەزرەکە لە زاتی خۆیا دانەمەرزاوییەکی تیا نییە و بەو نەزرە عەداڵەتی نەزرکەرەکە نافەوتێ، چونکە قابیلە شتێکی تریش بدا بە ئەولادەکانی و هەراو ئاژاوەیش شتێکە لە دەرەوەی نەزرەکەوە، هەندێ جار رووئەداو هەندێ جار روونادا.

هەندێ لە زانایان، لەم مەسئەلەیەدا تەفسیلیان داوەو فەرموویانە: ئەگەر باوکەکە حاڵی ئەولادەکانی بزانێ کە لەبەینی خۆیانا ئەیکەن بەهەرا، ئەوە نەزرکە دانامەزرێ، چونکە ئەبێ بەهۆی ئاژاوە و ئاژاوە لەم حاڵەتەدا، بە بەشێك لە نەزرەکە دائەنرێ، دیارە ئاژاوەو دووبەرەکیش حەرامە وە ئەگەر بزانرێ کە باوکە نەزرکەرەکە مەبەستی بێبەش کردنی هەندێ لە میراتگرەکانی بووە، ئەوە دانەمەزرانی نەزرەکە باشتر دیاری ئەدا وە ئەگەر منداڵەکان لەناوخۆیانا ئەحواڵیان باش بێ و بە بێبەشبوونی هەندێکیان بەینیان تێكنەچێ، ئەوە نەزرەکە دروستە، بەتایبەتی ئەگەر مناڵە نەزر بۆکراوەکە زانا یا پیاوچاك یا خێزاندار بێ.

حەرامە قەرزار شتێك نەزر بکا لە خاوەن قەرزەکەی، ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ «سوود»ی بداتێ؛ بەڵێ، ئەگەر خاوەن قەرزەکە داوای هیچ نەکاو کابرای قەرزار بەئارەزووی خۆی، بەرابەر بەو پیاوەتییەی کە لەگەڵی کردووە شتێکی لێ نەزر بکا، ئەوە دروستەو بەپێی شەرع، قەیدی نییە.

نەزری مەباح دروست نییە، وەك ئەوە کە بڵێ: نەزر بێ لە سەرم ئەم عابایە بکەمە بەرم؛ بەڵێ، ئەگەر ئەو شتەمەباحە ئەبوو بەهۆی واجبێك؛ مەسەلا، ئەگەر کابرا عاباکەی لەبەردا نەبوایە، سووك بوایە و بەهۆی لەبەر کردنی ئەو عابایەوە حورمەتی ئەپارێزرا، ئەوە نەزرەکەی دروستە.

واجبیش، ئەگەر فەرزی عەین بێ، نەزرکردنی بەتاڵە، چونکە لە زاتی خۆیا واجبە؛ کەواتە، نەزرکردنی کەڵکی هیچی نییە وە ئەگەر فەرزی کیفایە بێ، وەك نوێژی مردوو، ئەوە مادام ئەو فەرزی کیفایەیە تەنها لەئەستۆی یەك کەسدا نەبێ، نەزرکردنی دروستە

وە ئەگەر لەئەستۆی تەنها یەك کەسدا بوو، ئەوە نەزرکردنەکەی بێ سوودو بەتاڵە، چونکە لە زاتی خۆیا واجب بووەو ئەبێ بکرێ و دروستە نەزرکردنی بەجێ هێنانی فەرزی عەین بە جەماعەت؛ مەسەلا، بڵێت: نەزربێ لەسەرم ئەم فەرزە لە مزگەوتا یا لە فڵان مزگەوتا جێ‌بەجێ بکەم بە جەماعەت.

ئەوەندە هەیە لەپاش نەزری مەباح، ئەگەر کابرای نەزرکەر مەباحەکەی جێ‌بەجێ نەکرد، کەفارەتی سوێندێکی ئەکەوێتەسەر، بەڵام ئەگەر نەزری مەکرووە یا حەرام یاواجبی کردو شتەکەی نەکرد، ئەوە هیچی ناکەوێتەسەر.

ئەگەر کەسێك لەبەر موحتاجی شتێکی فرۆشت وکڕیارەکە نەزری کرد لەسەرخۆی هەرکاتێك کابرا پارەکەی بۆ هێنایەوە بەیعەکەی بۆ هەڵوەشێنێتەوە، ئەوە ئەم نەزرە دروستە وە ئەگەر کە پارەکەی بۆبرد، بەیعەکەی هەڵنەوەشاندەوە، دروستە بەڵکوو واجبە لەسەر قازییا خاوەن دەسەڵاتی ئەو شوێنە بەزۆر پێی هەڵوەشێنێتەوە، چونکە زۆرکردن لە حاڵی‌وادا، شتێکی بەجێیە، لەبەرئەوە کە ئەو کابرای کڕیارە وەختی خۆی نەزری کردبوو لەسەر خۆی کە لەکاتی وەرگرتنی پارەکەدا ئەو بەیعە هەڵوەشێنێتەوە.

هەروەها، دروستە بۆ خاوەن قەرز نەزر بکا لەسەر خۆی کە داوای قەرزار نەکاتەوە، بەو شەرتە کە قەرزارەکە دەستی بڕوا، بەڵام ئەگەر قەرزار دەستی نەئەڕۆیشت، ئەوە بە پێی شەرع واجبە کە مۆڵەتی بدا و لەم وەختەدا، مادام مۆڵەت واجبە، دروست نییە نەزری ئەوە بکا کە داوای ئەو قەرزەی‌لێ‌نەکاتەوە.

شەرتی سیغەی نەزر، ئەوەیە وەختی بۆ دانەنرابێ؛ کەواتە ئەگەر نەزرکەر وتی: وا ئەمماڵەم لێ نەزرکردی، ساڵێ یا دوو ساڵ یا دە ساڵ، یا: تا سەعاتێك پێش مردنت، ئەوە بەتاڵە وە ئەگەر وتی: وا ئەو ماڵەم لێ نەزرکردی تا ئەو سەعاتەی وا لەپێش نەخۆشی مردنتا، ئەوسا بگەڕێتەوە بۆخۆم، ئەوەیش هەر بەتاڵە، بەڵام ئەگەر وەختدانانەکە لەجێگەی هەمیشەیی‌دا بوو، ئەوە قەیدی نییە، وەکوو ئەوە کە بڵێ: ئەو ماڵەم لێ‌نەزرکردی تا لەدنیادای، چونکە نەزری‌وا وەك بەخشینی بەدرێژایی عومر وایە و پاش مردنی کابرایش، ئەبێ بە میرات بۆ میراتبەرەکانی.

هەروەها، نەزری مەنفەعەتیش بۆ ماوەیەکی دیاری دروستە؛ کەواتە، ئەگەر کەسێك وتی: وا مەنفەعەتی ئەو خانووەم لێ نەزرکردی بۆ ماوەی ساڵێك، یا: میوەی ئەو باخەم نەزر بێ لە تۆ لەماوەی ئەم ساڵەدا، ئەوە دروستە، لەبەرئەوە کە ئـەوە لەمـەعنادا وەك هەمیشەیی وایە، چونکە کە مەنفەعەتی ساڵێك، بوو بە موڵکی کابرای نـەزرلێ کـراو، جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ خاوەن ماڵەکە.

سیغەی نەزر ـ وەك وتمان ـ وائەبێ «مُنجَّز» ئەبێ، یەعنی نـابەسرێ بـەهیچەوە و وائەبێ «مُعلَّق» ئەبێ، یەعنی ئەبەسرێ بەشتێکەوە. جا ئەگەر نەزری «منجَّز» لە حاڵی لەش ساغی کابرای نەزرکەردا بوو، ئەوە دائەمەزرێ و کابرای نەزرکەر حەقی پەشیمان بوونەوەی نییە و بە هیچ جۆرێ تەسەڕوفی پێ ناکرێ لەو ماڵەداو ناتوانێ کەسی تر بکا بە هاوبەشی نەزر بۆ کراوەکەو ماڵە نەزرکراوەکەش لە سەرمایەی ئەو دەرئەچێ وە ئەگەر لە نەخۆشی مردنا بوو، ئەوە وەك وەسیەت وایەو لە سێ یەکی ماڵ دەرئەچێ.

وە ئەگەر «مُعلَّق»بوو، یەعنی بەسرابوو بەشتێکەوەو شتەکەش، نەخۆشی مردن یا مردن یا پاش مردن بوو، ئەوە حوکمی وەسیەتی هەیەو لە سێ یەکی ماڵ دەرئەچێ وە ئەگەر بەستبووی بە تاوێك پێش نەخۆشی مردنەوە، یاخود بە شتێکی ترەوە، ئەوە لە سەرمایەی دەستی دەرئەچێ، واتە لە هەموو داراییەکی کە بـیبێ، بـەڵام لە هـەردوو حـاڵەکـەدا حـەقی پـەشیمان بـوونەوەی هـەیە لەو نـەزرەو ئـەتوانـێ هـەمووجۆرە تەسەڕوفێك لەو ماڵەدا بکا بە فرۆشتن یا بەخشین یا نەزری بەهیچەوە نەبەسراو و لە هەردوو سوورەتەکەدا، ئەتوانێ لەو ماوەیەدا یەکێکی تر لەو ماڵە نـەزر کـراوەدا بکـا بەهاوبەشی کابرای نەزر بۆ کراو لە بەر موستەحەقیەتی ئەو؛ مەسەلا، کـەسێك وتـی: هەرچی ماڵم هەیە سێ رۆژ بەرلە نەخۆشی مردنم نەزر بێ لە فلانکەس، ئەوە دروستە و لەپاش ئەم نەزرە، ئەتوانێ کەسێکی تریش بکا بە هاوبەشی ئـەو کـەسەی پـێشـان ماڵەکەی لێ نەزر کردووە؛ هەروەها، ئەگەر بڵێ: رۆژێك بەر لە نەخۆشی مردنم ئەم ماڵەم نەزر بێ لە کوڕەکانم و لەپاش حەوت مانگ، ژنەکەی کوڕێکی بوو، ئەوە ئەتوانێ ئەم کوڕەیش بکا بە هاوبەشی ئەوان لەو ماڵەدا کە نەزرکراوە لێیان.

وە لە سوورەتی نەزریوادا کە بەسرابێ بە شتێکەوە، ئەگەر نەزر لێ کراوەکە بەر لە هاتنەدی پێوە بەسراو «مُعلَّقٌ عَلیه»یەکە مرد، ئەوە موستەحەقی ماڵە نەزرکراوەکە نابێ و ماڵەکە ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەن ماڵەکە.

دروست نییە نەزر ببەسرێ بەشەرتێکەوە کە لەگەڵ مەعنای نەزرەکە نەکەوێتە یەك، وەك ئەوەکە بڵێت: ئەم ماڵەم لێ نەزر کردی بەو شەرتەکە سەرفی نەکەی لە ئیحتیاجی خۆتا یا تەسەڕوفی تیا نەکەی، یا هەروەختێ ئارەزووم بوو پەشیمان ببمەوە، بەڵام دروستە بڵێت: لەسەرم بێ ئەم ماڵە نەزر بکەم، مەگەر خۆم موحتاج بم بە ماڵەکە و لەم سوورەتەدا، تا ماوە، ناچار ناکرێ بە نەزرکردنی ماڵەکەی، لەبەرئەوەکە قابیلە هەمیشە خۆی موحتاج بێ بەوماڵە؛ هەروەها، دروستە بڵێت: رۆژێك بەر لە نەخۆشی مردنم ئەم ماڵەم نەزربێ لە فڵانکەس، مەگەر خۆم لەمەولا منداڵێکم ببێ، ئەوە بۆ منداڵەکەی خۆم بێ، یاخود: مەگەر ئەو کەسە بەر لەخۆم بمرێ، ئەوە ماڵەکە بۆ خۆم بێ.

هەروەها، دروستە بەشەرت گرتنی شتێ کە نەگونجاو نەبێ لەگەڵ نەزرەکە، وەکوو ئەوە کە بڵێت: ئەم ماڵە نەزربێ لە فڵانکەس بەو شەرتە کە لە گوناها سەرفی نەکا، یاخود: تێکەڵی ماڵی فڵانکەسی نەکا، یاخود: خزمەتی مزگەوت‌و خوێندنخانەی لێ‌بکا، جا ئەگەر پاش ماوەیەك دەرکەوت کە شەرتەکەی بەجێ هێناوە، ئەوە باشە، ئەگینا دەرئەکەوێ کە ئەو نەزرە دانەمەزراوە، چونکە شەرتەکەی فەوتاوە.

ئەگەر کەسێك وتی: ئەو کتێبەم لێ نەزر کردی بەودینارە و کابرایش قەبووڵی کرد، ئەوە بەتاڵەو نابێ بەنەزر، چونکە نەزر بەمەعنا لە ئەستۆ گرتنی کردنی کارێکی خێرە و ئەمەش، لەگەڵ ئاڵوگۆڕدا ناکەوێتە یەك‌و نایشبێ بە فرۆشتن، چونکە فرۆشتن بە سیغەی نەزر نایەتەجێ.

بزانن! نەزر ئەگەر لە کابرایەکی دیاری کرا، قەبووڵ کردنی ناوێ، تەنها ئەوەندە شەرتە کابرا نەیداتە دواوە. ئەگەر کەسێك بە کەسێکی تری وت: ئەو دە دینارەم لێ‌نەزر کردی‌و ئەویش وتی: وا دامەدواوە، ئەوە نەزرەکە بەتاڵ ئەبێتەوە؛ بەڵێ، ئەگەر زووتر بە سوورەتی تەعلیق نەزرێکی کردبوو؛ مەسەلا، وتبووی: ئەگەر کوڕەکەم چاك بووەوە،

لەسەرم بێ نەزرێك بکەم لە فڵانکەس و پاشان، نەزرەکەی لێ کرد، ئەوە دائەمەزرێ و قەبووڵی ناوێ و بەناچاری، ئەو ماڵە نەزرکراوە ئەبێ بە هی ئەو کەسەکە لێی نەزر کراوە وە ئەگەر سووربوو لەسەر نەویستنی، ئەتوانێ بیداتەوە بە کابرای نەزرکەر.

ئەگەر کەسێك نەزری رۆژووی چەند رۆژێکی کرد بە موتڵەقی، یەعنی نە بڕیاری دا ئەو رۆژانە بە یەکەوە بن و نە بڕیاری داکە جیاجیا بن، ئەوە بە ئارەزووی خۆیەتی چۆن بن، بەڵام سوننەتە دەس‌وبرد بکاو زوو رۆژووەکە بگرێ وە ئەگەر دیاری کرد کە چۆن بەرۆژوو ئەبێ، پێویستە بەگوێرەی ئەو دیاری کردنە بجووڵێتەوە وە ئەگەر رۆژووی ساڵێکی مەعلوومی نەزر کرد لەسەر خۆی و بەورۆژووە تووشی زیان نەئەهات و واجباتی شەرعی نەئەفەوتا، پێویستە ساڵەکە بەڕۆژوو بێ، بەڵام رۆژانی جەژن و سێ ڕۆژەی پاش جەژنی قوربان ناگرێ و رۆژووی رەمەزانیشی لەجیاتی واجبی شەرعی ئەبێ و قەزای مانگێکی تری لەسەر نییە لەجیاتی رەمەزان، چونکە ئەم مانگ و چەند رۆژە شەرع جیای کردوونەتەوە لە ساڵەکە، هەروەها وەختی حەیز و زەیسانی ژنیشی بەرناکەوێ و قەزایشیان واجب نییە، چونکە ئەو رۆژانەیش بۆ رۆژوو گرتن دەس نادەن وە ئەگەر رۆژووی چەند رۆژێکی ئەوساڵەی بە بێ‌عوزر شکاند، ئەبێ قەزای بکاتەوە.

ئەگەر رۆژووی یەك‌ساڵەکەی بەیەکەوە نەزرکرد لەسەر خۆی، ئەبێ هەمووی بەیەکەوە بگرێ وە ئەگەر چەند رۆژێکی بە بێ‌عوزر شکاند، رۆژووی ئەو ساڵەی تێك ئەچێ و ئەبێ سەرلەنوێ بیگرێتەوە وە ئەگەر لەبەر عوزرێك ئەو رۆژووەی نەگرت، ئەوە تەنها قەزای ئەو چەند رۆژەی لەسەرە، یەك لەشوێنی یەك، بیانگرێتەوە و لەم سوورەتەدا هەر رەمەزان و جەژنەکان و سێ ڕۆژەی پاش جەژنی قوربان ئەکەونە بەر ئەو رۆژانە و قەزاکردنەوەیان واجب نییە، چونکە بەشەرع جیا کراونەتەوە.

وە ئەگەر رۆژووی ساڵێکی نامەعلوومی بڕیاردا و لە نەزرەکەیا شەرتی یەك لەشوێن‌یەکی کرد، واجبە یەك لەشوێن یەك، ساڵێك تەواو بکا و واجبە لە رۆژەکانی جەژن و سێ ڕۆژەی پاش جەژنی قوربانا بەرۆژوو نەبێ، هەروەها لە رۆژانی حەیز و

زەیسانیدا بەنیسبەت ژنەوە و واجبە مانگی رەمەزان لەجیاتی رەمەزان خۆی بگریّو پاش ساڵەکە مانگێکی‌تر بەرۆژوو بێ لەجیاتی رەمەزان، هەروها ئەوەندەی رۆژانی جەژنو سێ رۆژەی پاش جەژنی قوربانیش بەرۆژوو بێ تا ژمارەکانی ساڵەکە پڕ کاتەوە، بەڵام قەزای رۆژانی حەیزو زەیسانی بۆ ژن، پێویست نییە وە ئەگەر رۆژووی ئەو ساڵە نامەعلوومەی یەك لەشوێن‌یەك نەزر نەکرد، ئەتوانێ ساڵەکە لە چەند ساڵا تەواو بکا، لەسەر ژمارەی رۆژانی ساڵی شەرعی کە دوازدە مانگی عەرەبییە.

ئەگەر کەسێك نەزری کرد لەسەر خۆی کە رۆژانی دووشەمە بەرۆژوو بێ، ئەوە قەزای دووشەممەکانی رەمەزانو ئەو دووشەممانەی لەسەر نییە کە ئەکەونەبەر رۆژانی جەژنو سێ رۆژەی پاش جەژنی قوربانەوە، بەڵام قەزای ئەو دوو شەممانە واجبە کە ئەکەونە بەر رۆژانی حەیزو زەیسانییەوە وە ئەگەر لەم سوورەتەدا رۆژووی دوو مانگی کەوتەسەر، یەك لەشوێن‌یەك لەبەر کەفارەت، ئەوە واجبە ئەو دوو مانگە بەرۆژوو بێ و ژمارەی دووشەممەکانی ئەو دوو مانگە قەزا بکاتەوە، بەو شەرتە نەزرەکە پێش هۆی واجب بوونی کەفارەتەکە کەوتبێ.

ئەگەر کەسێك رۆژووی رۆژێکی تایبەتی نەزر کرد، نابێ لەپێش داهاتنی ئەو رۆژە تایبەتییەدا بەرۆژوو بێ، چونکە عیبادەت لە پێش داهاتنی وەختیا دروست نییە وە ئەگەر ئەو رۆژەی نەگرت لەبەر عوزرێك یا بە بێ‌عوزر، ئەوە قەزاکردنەوەی واجبە وە ئەگەر نەزری کرد کە فڵانە رۆژی حەفتەیەك بەرۆژوو بێ و رۆژەکەی لەبیر نەما، پێویستە رۆژی جومعە بەرۆژوو بێ، چونکە ئەگەر ئەو رۆژە جومعە بووە، ئەوە باشە، ئەگینا ئەبێ بەقەزای ئەو رۆژە کە لەپێش جومعەدا بووە.

ئەگەر کەسێك رۆژووی سونەتی گرتبوو وە لەماوەی رۆژەکەدا رۆژووی ئەو رۆژەی نەزرکرد، ئەبێ رۆژەکە تەواو بکا ئیتر رۆژووی رۆژێ‌تری لەسەر نییە وە ئەگەر نەزری کرد لە رۆژی گەڕانەوەی کەسێکدا لە سەفەرێك بەرۆژوو بێ، ئەگەر لەپێشا خەبەردار بوو کە ئەو رۆژە، کەیە، ئەبێ شەوەکەی نییەتی بۆ بهێنێ وە ئەگەر نەیزانی تا ئەو کەسە لە ناوقەدی رۆژێکا گەڕایەوە، ئەوە واجبە ئەو رۆژە بەقەزا بگێڕێتەوە وە ئەگەر

لە شەوا هاتەوە یا لە رۆژی جەژنا یا یەكێك لە سێ رۆژەی پاش جەژنی قوربانا، ئەوە هیچی لەسەر واجب نابێ، چونكە شەو، رۆژ نییە و رۆژی جەژن و سێ رۆژەی پاش جەژنی قوربانیش رۆژوو گرتنیان تیا دروست نییە وە ئەگەر كابرا بە رۆژ هاتەوە، بەڵام ئەم بەرۆژوو بوو، لەبەر هەر سەبەبێك، ئەوە ئەبێ قەزای رۆژە نەزرەكە بكاتەوە.

ئەگەر كەسێك وتی: ئەگەر فڵانكەس لە حەج گەڕایەوە، نەزربێ لەسەرم رۆژی پاش هاتنەوەی ئەو بەرۆژوو بم وە ئەگەر فڵانكەسی تریش هاتەوە، نەزر بێ لەسەرم ئەو پێنج شەممەیەی دێت بەدوای ئەو رۆژەدا، بەرۆژوو بم، ئەوە ئەگەر سێ شەممە هاتەوە چوار شەممەو پێنج شەممە بەرۆژوو بێ و ئەگەر چوارشەممە هاتەوە، رۆژی پێنج شەممە لەجیاتی نەزری یەكەم بەرۆژوو بێ‌و قەزای رۆژووی پێنج شەممەیش بكاتەوە لە هەر رۆژێكا خۆی ئارەزووی لێ هەیە.

## نەزر كردنی رۆیشتن بۆ ماڵی كەعبەی پیرۆز، بە حەج یا بە عەمرە

ئەگەر كەسێك نەزری كرد لەسەر خۆی بە پێ بڕوا بۆ كەعبە، واجبە بە پێ بڕوا بۆ حەج یا بۆ عەمرە وە ئەگەر هەر نەزری رۆیشتنی كرد، واجب نییە بە پێ بڕوا وە ئەگەر نەزری كرد حەج بكا یا عەمرە بكا بە پیادە، واجبە بە پیادە بڕوا حەجەكە یا عەمرەكە بكا. وە ئەگەر وتی: نەزربێ حەج بكەم بە پیادە، ئەبێ لەو شوێنەوە كە ئیحرامی تیا ئەبەسترێ بە نیسبەت وڵاتی ئەو كەسەوە، بە پیادە بڕوا وە ئەگەر وتی: نەزر بێ بە پیادە بڕۆم بۆ كەعبە، ئەبێ هەر لە ماڵی خۆیەوە بە پیادە دەربچێ‌و بە پیادە بگاتە كەعبە؛ و لە هەر سوورەتێكا كە پیادەڕەوی واجب بێ، ئەگەر هاتو بە سواری رۆیشت، بە عوزر یا بە بێ‌عوزر، ئەوە كافییە، بەڵام فەرزە لەجیاتی كەفارەتی تەركی پیادەییەكە، حەیوانێك سەرببڕێ. ئەگەر كەسێك حەجێك یا عەمرەیێكی نەزر كرد لەسەر خۆی، واجبە خۆی بڕوا، بەڵام ئەگەر پەكی كەوتبوو، دروستە جێگەدارێك بگرێ حەجەكەی بۆ بكا.

سوننەتە ئەو كەسەكە حەجی نەزر كردووە لەسەر خۆی، ئەگەر پێی بكرێ لە یەكەم ساڵدا بڕوا وە ئەگەر نەیتوانی‌و نەڕۆیشت‌و مرد، واجبە ئەم حەجەی لە میراتەكەی بۆ

بکرێ وە ئەگەر نەزری کرد ئیمساڵ حەج بکا، واجبە بڕوا؛ ئەگەر نەخۆشی ڕێگەی لێ گرت، واجبە قەزای بکاتەوە وە ئەگەر دوژمن ڕێگەی لێ گرت، قەزای واجب نییە وە ئەگەر نوێژێ یا ڕۆژوویەکی نەزر کرد لە وەختێکی تایبەتیدا و نەخۆشی یا دوژمن لەو وەختەدا بوون بە کۆسپ، واجبە قەزایان بکاتەوە. ئەگەر نەزری کرد حەیوانێك بەدیاری بیا بۆ کەعبە، واجبە بیبا بۆئەوێو لەوێ سەری ببڕێو بیبەخشێتەوە بەوانـەی لەوێن. ئەگەر نەزری کرد کە خێر بکا بە ئەهلی شارێکی تایبەتی، واجبە خێرەکەیان پێ بکا.

ئەگەر واجبی کرد لە شوێنێکی تایبەتیدا بەڕۆژوو بێ، واجب نییە هەر لەو شوێنەدا بەڕۆژوو بێ و لە هەر جێگەیەکدا بەڕۆژوو بێ، دروستە؛ هەروەها، ئەگەر نەزری کرد نوێژ بکا لە شوێنێکی تایبەتیدا، ئەوە دروستە لە هەرکوێ ئارەزووی بێ نوێژەکەبکا، مەگەر ئەو شوێنە کە دیاری کردووە، مزگەوتی «بیتُ اللّٰه» یا مزگەوتی مەدینە یا «مسجِدُ الاقصی» بێ، لەو حاڵەدا، پێویستە لەو شوێنانە خۆیاندا نوێژەکە بکا، بەڵام ئـەمە بـۆ نوێژی موتڵەقە؛ ئەگەر نەزری نوێژی فەرزی کرد لە مزگەوتێکا بە جەماعەت، واجبە لەو مزگەوتەدا بە جەماعەت بیکا وە ئەگەر ژمارەی نوێژکەری مزگەوتێکی تر زیاتر بوو لە ژمارەی نوێژکەری ئەو مزگەوتە کە ناوی بردووە یا ئەوەندەی ئەو بوو، ئـەتوانـێ بڕواتە ئەو مزگەوتەو نوێژەکەی بکا بە جەماعەت.

ئەگەر کەسێك ڕۆژووی ڕۆژێکی نەزر کرد، واجبە ڕۆژێك بەڕۆژوو بێ وە ئەگەر ڕۆژووی چەند ڕۆژێکی نەزر کرد، واجبە دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێ وە ئەگەر گەلێ ڕۆژ یا زۆر ڕۆژی وت، ئەبێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ. ئەگەر نەزری کرد کە سەدەقەیەك بکـا، دروستە هەرچی بداو هەرچۆنی بدا وە ئەگەر نوێژی نەزر کردو نەیوت چەند، واجبە دوو رکات نوێژ بکا، بە راوەستانەوە، ئەگەر بتوانێ راوەستێ وە ئەگەر نەزری کردبوو کە بەپێوە نوێژ بکا، دروست نییە دابنیشێ وە ئەگەر نەزری کردبوو بە دانیشتنەوە بیکا، دروستە بە راوەستانیشەوە بیکا وە ئەگەر نەزری کرد درێژەبدا بە قورئان خوێندن لە نوێژا، یا سوورەتێکی تایبەتی بخوێنێ، یا بە جەماعەت بیکا، واجب ئەبێ؛ هەروەها، ئەگەر نەزری کرد کە لەگەڵ جەنازەیەك بڕوا یا سەر لە نەخۆشێك بدا، واجب ئەبێ بیکا؛ هەروەها، ئەگەر نەزری کرد سەلام لە کەسێك بکا یا لە جەماعەتێك، واجب ئەبێ بیکا.

**بزانن!** ئەگەر کەسێ نەزرێکی کردو نەیوت بدرێ بە کێ، ئەدرێ بەوکەسانە کە زەکاتیان پێ ئەشێ؛ کەواتە، بە ئەسڵی مەزهەبی شافیعی، نادرێ بە «بني هاشم»و «بني مُطلّب» مەگەر بە تەقلید کردنی ئەو زانایانە کە فەتوایان داوە لە وەختی بێبەش بوونی ئەوانەدا لە «پێنج یەك»، زەکاتو نەزرو کەفارەتیان پێ ئەدرێ بەڵام شوبهە لەوەدا نییە کە ئەگەر کەسێك ماڵێکی نەزر کرد لە فەقێی مزگەوتێك ـ مەسەلا ـ و لەناو ئەوانیشا لەم دوو تائیفەیە هەبوو، ئەوە ئەوانیش بەشدارن، هەروەکوو کەسێك بەتایبەتی ماڵ نەزر بکا لێیان، ئەوە حەقی خۆیانەو تەسلیمیان ئەکرێ.

لەسایەی خواوە لێبوومەوە لە نووسینی بەرگی دووهەمی کتێبی «**شەریعەتی ئیسلام**»، لە رۆژی سێشەممە دوانزەی مانگی شەعبانی ١٣٧٩ی هیجری، رێکەوتی نۆی شوباتی ١٩٦٠ی میلادی، لە ژووری دەرسوتنەوەم لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووك. و صلّى اللّهُ عَلى سيِّدنا محمَّدٍ و آله و صحبِه أَجمعين.

## سەرچاوەکانی ئەم کتێبە

«١» تحفةُ المحتاج، في شرح المنهاج، لابن حجر الهيتمي؛

«٢» فتحُ الوّهاب، في شرح منهج الطّلاب، للقاضي زكريا الأنصاري؛

«٣» حاشيةُ الشّيخ سليمان الجمل على شرح المنهج؛

«٤» إعانةُ الطّالبين، للشيخ ابي‌بكر شَطا البَكري؛

«٥» بُغية الطّالبين، لمفتي الديار المصرية؛

هەرکەس شوبهە لە بابەتێکی ئەم‌کتێبە بکا، بگەڕێتەوە سەر ئـەم‌کتێبـانەی نـاومان نووسیون وە ئەگەر هەڵەیەکی ئیمەی بۆ دەرکەوت، ئاگادارمان بکاو لێمان ببوورێ، چونکە کەس خاڵی نییە لە سەهو.

نووسەر لە چەند دێڕێکدا

▪ ناوی «عبدالکریم»ە و کوڕی «محمّد»ە و نازناوی «نامی» یە و ناسراوە بە «مدرّس»

▪ مانگی «ربیع‌الاول»ی ساڵی ۱۳۲۳ی کۆچی و بەهاری ۱۲۸۴ی هەتاوی و ۱۹۰۵ی زایینی لە دێی «تەکیە»ی خورماڵ (یان «گوێزە کوێرە»ی مەریوان) هاتۆتە دنیاوە.

▪ لە ۱۳۳۱ی کۆچیدا دەستی کردووە بە خوێندن لە حوجرەکانی ناوچەکانی کوردستاندا و لە ۱۳۴۳ی کۆچی ئیجازەی عیلمی (مەلایەتی) وەرگرتووە لە خزمەتی مامۆستای ناوداری کورد مەلا (عمر ابن القرەداغی) دا لە سلێمانی

▪ لە پاش ئیجازە تا نزیکەی فەوتی، لە (بیارە) (۲۴ ساڵ) و لە «کەرکووک» و «سلێمانی» و «بەغدا» دەرسی وتوەتەوە.

▪ نزیکەی ۶۰ کەسی ئیجازەی عیلمی (مەلایەتی) پێداوە لە ماموستایانی ناوچەکانی کوردستان و عێراق و ئێران.

▪ زیاتر لە ۸۰ کتێبی داناوە بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی لە بابەتە جۆر بە جۆرکانی ئایین و ئەدەب دا.

▪ ۸ ی خەرمانانی ۱۳۸۴ ی هەتاوی لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە و لە پاڵی مەرقەدی «عبدالقادری گەیلانی» دا نێژراوە.

شابک دوره
9 789649 926100
جلد اول
9 789649 926292

انتشارات پرتو بیان

انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج، پاساژ عزتی - تلفن: ۲۲۶۵۳۸۲